# الموطأ

للإمام مالك بن أنس إمام دار الهجرة

بەرگی دووەم

وەرگێرانی

د. زانا عیسا عەبابەکر




پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

# موطأ الإمام مالك

## بەکوردی

نووسینی: الإمام مالك بن أنس عبدالله الأصبحي
وەرگێڕانــی :د.زانــا عیســا عەبابکر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپــی یەکەم : ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز
٦١٥ لاپـــــەڕە
٢٤ × ١٧ ســـم
بابـەت : ئــایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (  )ـی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە












# پەرتووكی حەج[1]



---

(١) - كِتَابُ الْحَجِّ.




## ١- خۆشۆردن بۆ ئیحرام بەستن[١]

٨٩٨- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ ﵂، أَنَّهَا وَلَدَتْ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ بِالْبَيْدَاءِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ ﵁ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: مُرْهَا فَلْتَغْتَسِلْ ثُمَّ لِتُهِلَّ[٢].

واتە: لە ئەسمائی کچی عومەیســەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری لێ بە ویلادەت بوو لە بەیداء بوو، جا ئەبوبەکر ﵁ (کە مێردی بوو) ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێ بکە با خۆی بشۆرێ دواتر نیەتی ئیحرام بێنێ.

٨٩٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيْسٍ ﵂، وَلَدَتْ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَأَمَرَهَا أَبُو بَكْرٍ ﵁ أَنْ تَغْتَسِلَ ثُمَّ تُهِلَّ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): ئەسمائی کچی عومەیس ﵂ موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری لە زیل حولەیفە لێ بە ویلادەت بوو، جا ئەبوبەکر ﵁ (بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمانی پێکرد خۆی بشۆرێ دواتر نیەتی ئیحرام بێنێ.

٩٠٠- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَغْتَسِلُ لِإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِدُخُولِهِ مَكَّةَ، وَلِوُقُوفِهِ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ بەر لەوەی ئیحرام ببەستێ بۆ ئیحرامەکەی و، بۆ چونە ناو مەککە و، بۆ ڕاوەستانی ئێوارەی عەرەفەش خۆی دەشۆرد.

---

(١) ـ الْغُسْلُ لِلإِهْلَالِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٠؛ والحدثاني: ٤٨٣؛ والشيباني: ٤٧٠؛ وابن حنبل: ٢٧١٢٩؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٤، وفي: ٤٩٣٥؛ والقابسي: ٣٨٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣١؛ والحدثاني: ٤٨٣؛ وفي: ٤٨٣أ، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٢؛ والحدثاني: ٤٨٣ب، عن مالك به.





## ٢- خۆشۆردنی کەسی موحریم(١)

٩٠١- عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ ﷺ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ ﷺ: لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، قَالَ: فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﷺ أَسْأَلُكَ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ قَالَ: فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ ﷺ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ، فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ: اصْبُبْ، فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَفْعَلُ(٢).

واتە: لە ئیبڕاهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حونەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ لە ئەبواء گیرسانەوە و ڕاجیاییان لەگەڵ یەکتری دروست بوو، عەبدوڵڵا ﷺ گوتی: کەسی موحریم سەری دەشۆرێت، میسوەری کوڕی مەخرەمەش ﷺ گوتی: کەسی موحریم سەری ناشۆرێ، جا (عەبدوڵڵای کوڕی حونەین ﷺ دەڵێت): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ منی نارد بۆ لای ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ، جا (چووم) بینیم لە نێوان دوو دینگە و کۆڵەگەکانی بیر (کە پەقرەجی ئاو هەڵکێشانی بەسەرەوە پەیوەست کراوە) خۆی دەشۆرد لەکاتێکدا بە قوماشێك پەردەی بۆ کرابوو (تا دیارنەبێت و نەبینرێت)، جا سڵاوم لێ کرد، ئەویش گوتی: ئەوە کێیە؟ منیش گوتم: من عەبدوڵڵای کوڕی حونەینم عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ منی ناردووە بۆ لای تۆ تا پرسیارت لێ بکەم: کە ئاخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سەری شۆردووە لەکاتێکدا لە ئیحرامدا

---

(١) ـ غُسْلُ الْمُحْرِمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٣؛ والحدثاني: ٤٨٤؛ والشيباني: ٤٢٠؛ والشافعي: ٥٣٦؛ وابن حنبل: ٢٣٥٩٤؛ والبخاري: ١٨٤٠؛ ومسلم: المناسك: ٩١؛ والنسائي: ٢٦٦٥؛ وأبو داود: ١٨٤٠؛ وابن ماجه: ٢٩٦٦؛ وابن حبان: ٣٩٤٨؛ والقابسي: ١٧٩، كلهم عن مالك به.

بووە؟ دەڵێ: ئەبو ئەییوب ﷺ دەستی لەسەر قوماشەکە دانا و هێنایە خوارەوە تا سەری بۆم دەرکەوت، دواتر بەو کەسەی گوت کە ئاوی دەکرد بەسەر سەریدا: ئاو بکە بە سەرم، ئەویش ئاوی ڕشت بەسەر سەریدا، دواتر ئەبو ئەییوب ﷺ سەری هەڵپشاوت و لێکیدا و دەستەکاتی بردە پشتە سەری و هێنایەوە پێشە سەری و دواتر گوتی: بەو شێوەیە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئەنجامی دەدا (واتە بەڵێ کەسی موحریم خۆی دەشۆرێ و پێغەمبەری خواش ﷺ خۆی شۆریوە).

**٩٠٢-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ لِيَعْلَى بْنِ مُنْيَةَ وَهُوَ يَصُبُّ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ مَاءً، وَهُوَ يَغْتَسِلُ: اصْبُبْ عَلَى رَأْسِي، فَقَالَ يَعْلَى: أَتُرِيدُ أَنْ تَجْعَلَهَا بِي؟ إِنْ أَمَرْتَنِي صَبَبْتُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: اصْبُبْ، فَلَنْ يَزِيدَهُ الْمَاءُ إِلاَّ شَعَثًا[١].

واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە یەعلای کوڕی مونیەی وت ـ لەکاتێکدا ئاوی دەکرد بە سەریدا، عومەریش خۆی دەشۆرد ـ (پێی گوت): ئاو بکە بەسەرمدا، یەعلاش ﷺ گوتی: دەتەوێ فەتواکە بە من بدەی؟ ئەگەر بە فەرمان کردن فەرمانم پێ بکەی ئاوەکە پێدادەکەم (چونکە باوەڕم بە زانست و ئەمانەتی تۆ هەیە)، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: پێداکە، جا (پێی دادەکرد) و ئاوەکە لە قژ ئاڵۆزی زیاتر هیچی بۆ زیاد نەدەکرد.

**٩٠٣-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا دَنَا مِنْ مَكَّةَ، بَاتَ بِذِي طُوًى بَيْنَ الثَّنِيَّتَيْنِ حَتَّى يُصْبِحَ، ثُمَّ يُصَلِّي الصُّبْحَ، ثُمَّ يَدْخُلُ مِنَ الثَّنِيَّةِ الَّتِي بِأَعْلَى مَكَّةَ، وَلاَ يَدْخُلُ إِذَا خَرَجَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، حَتَّى يَغْتَسِلَ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ مَكَّةَ، إِذَا دَنَا مِنْ مَكَّةَ بِذِي طُوًى، وَيَأْمُرُ مَنْ مَعَهُ فَيَغْتَسِلُونَ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلُوا[٢].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ لە مەککە نزیك دەبویەوە، شەو لە «ذي طوا» لە نێوان دوو ڕێگەکەدا

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٤؛ والحدثاني: ٤٨٥؛ والشيباني: ٤٢١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٥؛ والحدثاني: ٤٨٥أ؛ والشيباني: ٤٧٢، كلهم عن مالك به.

دەمایەوە تا بەیانی دەکردەوە، دواتر نوێژی بەیانی دەکرد، دواتر لەو ڕێگەوەی کە دەکەوێتە سەرەوەی مەککە دەچووە ناو مەککە، جا نەدەچووە ناو مەککە کاتێ بە حاجی یان عومرەکار(لە ماڵەوە) دەردەچوو تا خۆی دەشۆرد پێش ئەوەی بچێتە ناو مەککە، کاتێ نزیك دەبویەوە لە مەککە و (هێشتا هەر) لە «ذي طوى» بوو (ئەو کات خۆی دەشۆرد)، وە فەرمانی بەو کەسانەش دەکرد کە لەگەڵیدا بوون (بەوەی خۆیان بشۆرن)، جا ئەوانیش خۆیان دەشۆرد پێش ئەوەی بچنە ناویەوە.

**٩٠٤**- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ لاَ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ إِلاَّ مِنَ الاِحْتِلاَمِ(١).

واتە: لە نافعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ سەری نەدەشۆرد لەکاتێکدا لە ژێر ئیحرامدا بوایە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ئیحتیلامی دەبوو.

**٩٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: سَمِعْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَغْسِلَ الرَّجُلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ بِالْغَسُولِ بَعْدَ أَنْ يَرْمِيَ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَقَبْلَ أَنْ يَحْلِقَ رَأْسَهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَقَدْ حَلَّ لَهُ قَتْلُ الْقَمْلِ، وَحَلْقُ الشَّعْرِ، وَإِلْقَاءُ التَّفَثِ، وَلُبْسُ الثِّيَابِ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتویەتی: گوێم لە زانایان بووە دەیانگوت: هیچی تێدا نیە و کێشە نیە لەوەی کەسی موحریم سەری خۆی بشۆرێت بەو شتانەی سەری پێ دەشۆردرێن (وەك: سیدر و صابون و شامپۆ و ...) دوای ئەوەی جەمەرەی عەقەبە ڕەجم دەکات پێش ئەوەی سەری بتاشێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کاتێ جەمەرەی عەقەبەی ڕەجم کرد ئەوە بۆی دروستە ئەسپێی سەری بکوژێت و سەری بتاشێت و چڵك و نارێکی لەخۆی بکاتەوە و جل بپۆشێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٦؛ والحدثاني: ٤٨٦؛ والشيباني: ٤١٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٧؛ وفي: ١٢٦٥؛ والحدثاني: ٤٨٦أ، عن مالك به.




## ٣- ئەوەی قەدەغەكراوە لە پۆشینی جل و بەرگ لە ئیحرامدا[١]

**٩٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ؛ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَلاَ الْوَرْسُ[٢].

واتە: لە ئیبن عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوتویەتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد (گوتی): پیاوی موحریم چ دەپۆشێت لە جل و بەرگ؟ فەرمووی: (بزانن ئەو شتانە): قەمیس و، بێجامە و شەڕوال (پانتۆڵ) و، مەندیل و، ڕۆب و كڵاو و، خوفی (درێژ)، لەبەر مەكەن (ئەو شتانە دروست نین)، تەنها كەسێك نەبێت كە جووتە نەعلەیەكی نەبێت و (دەستی نەكەوێت) ئەوە قەیدی نییە با جووتە خوفێك لەبەر بكات و دایانماڵێت (یان كورتیان بكاتەوە) بۆ خوار گۆزینگەكانی، وە (چ ژن چ پیاوی موحریم) هیچ جلێك لەبەر نەكەن كە وەڕس و زەعفەڕانی بەر كەوتبێت (واتە نابێت بۆن و گوڵاوی بەر كەوتبێت).

**٩٠٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَمَّا ذُكِرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا، فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، فَقَالَ: لَمْ أَسْمَعْ بِهَذَا، وَلاَ أَرَى أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمُ سَرَاوِيلَ، لأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ لُبْسِ السَّرَاوِيلاَتِ، فِيمَا نَهَى عَنْهُ مِنْ لُبْسِ الثِّيَابِ الَّتِي لاَ يَنْبَغِي لِلْمُحْرِمِ أَنْ يَلْبَسَهَا، وَلَمْ يَسْتَثْنِ فِيهَا كَمَا اسْتَثْنَى فِي الْخُفَّيْنِ[٣].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتویەتی: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ كرا لەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باس دەكرێت بەوەی فەرمویێتی: هەر كەسێك ئیزاری

---

(١) ـ مَا يُنْهَى عَنْهُ مِنْ لُبْسِ الثِّيَابِ فِي الإِحْرَامِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٨؛ والحدثاني: ٤٨٩؛ والشيباني: ٤٢٢؛ والشافعي: ٥٤١؛ وابن حنبل: ٥٣٠٨؛ والبخاري: ١٥٤٢، وفي: ٥٨٠٣؛ ومسلم: المناسك: ١؛ والنسائي: ٢٦٦٩، وفي: ٢٦٧٤؛ وابن ماجه: ٢٩٦١، وفي: ٢٩٦٤؛ وابن حبان: ٣٧٨٤؛ والدارمي: ١٨٠٠؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٨٠٥؛ والقابسي: ٢١٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٣٩؛ والحدثاني: ٤٨٩أ، عن مالك به.




نەبوو با بێجامە (و شەڕواڵ و هاوشێوەکانی لەبەر بکات)، ئەویش گوتی: گوێم لەوە نەبووە و پێشم وانیە کەسی موحریم بۆی دروست بێت بێجامە بکاتە بەری، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە لەبەرکردنی بێجامە لەناو ئەو شتانەی کە نەهی لێکردووە لە پۆشینی جل و بەرگ کە نابێ کەسی موحریم لەبەریان بکات، وە جیاکردنەوە و هەڵاوێردنیشی نەکردووە تیایدا وەك هەڵاوێردنی کردووە لە خوفەکاندا.

## ٤- پۆشینی جلی بۆیەکراو لە ئیحرامدا[١]

٩٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا بِزَعْفَرَانٍ، أَوْ وَرْسٍ، وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی کەسی موحریم جلێکی ڕەنگکراو بە زەعفەران یان بە وەرس لەبەر بکات و فەرمویەتی: هەر کەسێك جووتە نەعلەیەکی نەبوو، ئەوە با جووتە خوفێك لەبەر بکات و بیانبڕێتەوە تا خوار گۆزینگەکان.

٩٠٩- عَنْ نَافِعٍ ؒ، أَنَّهُ سَمِعَ أَسْلَمَ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵄ يُحَدِّثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ رَأَى عَلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﵁ ثَوْبًا مَصْبُوغًا وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: مَا هَذَا الثَّوْبُ الْمَصْبُوغُ يَا طَلْحَةُ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ ﵁: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّمَا هُوَ مَدَرٌ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: إِنَّكُمْ أَيُّهَا الرَّهْطُ أَئِمَّةٌ يَقْتَدِي بِكُمُ النَّاسُ، فَلَوْ أَنَّ رَجُلاً جَاهِلاً رَأَى هَذَا الثَّوْبَ، لَقَالَ: إِنَّ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ قَدْ كَانَ يَلْبَسُ الثِّيَابَ الْمُصَبَّغَةَ فِي الإِحْرَامِ، فَلاَ تَلْبَسُوا أَيُّهَا الرَّهْطُ شَيْئًا مِنْ هَذِهِ الثِّيَابِ الْمُصَبَّغَةِ[٣].

---

(١) ـ لُبْسُ الثِّيَابِ الْمُصَبَّغَةِ فِي الإِحْرَامِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٠؛ والحدثاني: ٤٨٧؛ والشيباني: ٤٢٣؛ والشافعي: ٥٤٢؛ وابن حنبل: ٥٣٣٦؛ والبخاري: ٥٨٥٢؛ ومسلم: المناسك: ٣؛ والنسائي: ٢٦٦٦؛ وابن ماجه: ٢٩٦٢، وفي: ٢٩٦٤؛ وابن حبان: ٣٧٨٧، وفي: ٣٩٥٦؛ والقابسي: ٢٨٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤١؛ والحدثاني: ٤٨٧أ؛ والشيباني: ٤٢٥، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بووە قسەی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەکرد (دەیگوت): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ جلێکی ڕەنگکراوی لەبەر تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﷺ بینی لەکاتێکدا موحریم بوو، جا عومەر ﷺ گوتی: ئەو جلە ڕەنگکراوە چیە ئەی تەڵحە؟ تەڵحەش ﷺ گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران ئەوە (ڕەنگی) گڵە سوورە، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: ئەی جەماعەتینە ئێوە کۆمەڵە پێشەواییکن خەڵك شوێنتان دەکەوێت، جا کەسێکی ناشارەزا ئەو جلە ببینێ دەڵێ: تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لە ئیحرامدا جلی ڕەنگکراوی لەبەر کردبوو (چوزانێ خۆرە سوورە، گڵە سوورە)، جا جەماعەت هیچ جلێك لەو جلە ڕەنگکراوانە لەبەر مەکەن.

٩١٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَاتِ الْمُشَبَّعَاتِ، وَهِيَ مُحْرِمَةٌ لَيْسَ فِيهَا زَعْفَرَانٌ[١].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی کراسی ڕەنگکراو بە عوصفوری لەبەر دەکرد لەکاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو (بەڵام) ڕەنگی زەعفەرانی پێوە نەبوو.

٩١١- قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ ثَوْبٍ مَسَّهُ طِيبٌ، ثُمَّ ذَهَبَ مِنْهُ رِيحُ الطِّيبِ، هَلْ يُحْرِمُ فِيهِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ صِبَاغٌ: زَعْفَرَانٌ أَوْ وَرْسٌ[٢].

واتە: یەحیا ﷺ گوتویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی جلێك کە گوڵاوی بەرکەوتبێت و دواتر بۆنی گوڵاوەکە نەمابێت، ئایا دروستە بەو جلەوە ئیحرام ببەستێت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، مادەم بۆیەی پێوە نەبێت: کە زەعفەران و وەڕسە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٢؛ والحدثاني: ٤٨٨، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٣؛ والحدثاني: ٤٨٨أ، عن مالك به.



## ٥- بەستانی کەمەربەند و پشبێند (پشتێن، پشدێن) و قایشی پشت بۆ کەسی موحریم[١]

**٩١٢-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ لُبْسَ الْمِنْطَقَةِ لِلْمُحْرِمِ[٢].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بەستانی پشبێند (و قایشی پشتی) پێ ناپەسەند بوو بۆ کەسی موحریم.

**٩١٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ فِي الْمِنْطَقَةِ يَلْبَسُهَا الْمُحْرِمُ تَحْتَ ثِيَابِهِ: أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ إِذَا جَعَلَ فِي طَرَفَيْهَا جَمِيعًا سُيُورًا يَعْقِدُ بَعْضَهَا إِلَى بَعْضٍ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ بووە بەستانی کەمەربەند و پشبێند و نێتاقی ناوقەد کە کەسی موحریم بیبەستێت لە ژێر جلەکەی دەیگوت: کێشەی تیا نیە ئەگەر لە هەردوو لاکانی لیچکی هەبێت لێکیان گرێ بدات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: ئەوە چاکترین و خۆشەویستترین شتە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

## ٦- داپۆشینی ڕوخسار بۆ کەسی موحریم[٤]

**٩١٤-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي الْفُرَافِصَةُ بْنُ عُمَيْرٍ الْحَنَفِيُّ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ بِالْعَرْجِ يُغَطِّي وَجْهَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ[٥].

---

(١) ـ لُبْسُ الْمُحْرِمِ الْمِنْطَقَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٥؛ والحدثاني: ٤٩٠؛ والشيباني: ٤٣٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٦؛ والحدثاني: ٤٩٠أ، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تَخْمِيرُ الْمُحْرِمِ وَجْهَهُ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٧؛ والحدثاني: ٤٩٤، عن مالك به.

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: فورافیصەی کوڕی عومەیری حەنەفی ﷺ هەواڵی پێدام بەوەی عوسمانی کوڕی عەففانی لە عەرج بینیوە (کە گوندێکە سێ مەرحەلە دورە لە مەدینە) ڕوخساری داپۆشی بوو لەکاتێکدا موحریم بوو[١].

**٩١٥-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَا فَوْقَ الذَّقَنِ مِنَ الرَّأْسِ فَلاَ يُخَمِّرْهُ الْمُحْرِمُ[٢].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: با کەسی موحریم لە ڕوخساری چەناگە بەسەرەوە دانەپۆشێت.

**٩١٦-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَفَّنَ ابْنَهُ وَاقِدَ بْنَ عَبْدِ اللهِ وَمَاتَ بِالْجُحْفَةِ مُحْرِمًا، وَخَمَّرَ رَأْسَهُ وَوَجْهَهُ، وَقَالَ: لَوْلاَ أَنَّا حُرُمٌ لَطَيَّبْنَاهُ[٣].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ واقیدی کوڕی خۆی کفن کرد لەکاتێکدا بە موحریمی لە جوحفە وەفاتی کرد، جا سەر و ڕوخساری داپۆشی و گوتی: ئەگەر موحریم نەباینە ئەوە گوڵاویشمان لێدەدا (بەڵام بۆ ئێمە دروست نیە دەست بدەین لە بۆنی خۆش، هەر چەندە بۆ مردوەکە دروستە، ئەوە بۆچونی ئەوە).

**٩١٧-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يَعْمَلُ الرَّجُلُ مَا دَامَ حَيًّا، فَإِذَا مَاتَ فَقَدِ انْقَضَى عَمَلُهُ[٤].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: مرۆڤ تەنها ئەو کاتە تەکلیفی لەسەرە و دەبێ خۆی لە حەڕامکراوەکان بپارێزێ (وەك بۆنخۆشکردن و داپۆشینی ڕوخسار) کاتێ

---

(١) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك نابێ ڕوخسار داپۆشرێ، هەندێ لە زانایانیش ڕێگەیان داوە، بەڵام دەربارەی داپۆشینی سەر بە کۆدەنگی زانایان داپۆشینی دروست نیە و کەفارەتی لەسەرە.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥١؛ والحدثاني: ٤٩٥أ؛ والشيباني: ٤١٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٨؛ والحدثاني: ٤٩٥؛ والشيباني: ٥٠٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٤٩، عن مالك به.

کە زیندووە، جا کاتێ مرد ئەوە کارەکەی کۆتایی پێ هاتووە (کەواتە کێشەی نیە بۆنخۆش بکرێت و ڕوخساری دابپۆشرێت، چونکە لە ئیحرامدا نەماوە و تەکلیفی لەسەر نەماوە).

٩١٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ: لَا تَنْتَقِبُ الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ[١].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: ئافرەتی موحریم نە نیقاب دەکات و نە دەستکێش دەکاتە دەستی.

٩١٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، أَنَّهَا قَالَتْ: كُنَّا نُخَمِّرُ وُجُوهَنَا وَنَحْنُ مُحْرِمَاتٌ، وَنَحْنُ مَعَ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە فاتیمەی کچی مونزیری گێڕاوەتەوە بەوەی گوتویەتی: ئێمە ڕوخساری خۆمانمان دادەپۆشی لەکاتێکدا لە ئیحرامدا بووین، لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبوبەکردا بوین[٣].

### ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی (بەکارهێنانی) بۆنی خۆش لە حەجدا[٤]

٩٢٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ ﷺ لإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[٥].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٢؛ والحدثاني: ٤٩٥ب؛ والشيباني: ٤٢٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٠؛ والحدثاني: ٤٩٤أ، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: لێرەدا باسی داپۆشینی ڕوخسار کراوە بۆ ئافرەتان، ئەوان حوکمیان جیایە لەگەڵ پیاوان، بۆیان هەیە قوماشێکی تەنك بە ڕوخساریاندا بەربدەنەوە و دروستە، هەروەها بۆیان دروستە جلی دوراویش لەبەر بکەن.

(٤) ـ مَا جَاءَ فِي الطِّيبِ فِي الْحَجِّ.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٣؛ والحدثاني: ٤٩١؛ والشيباني: ٤٩٣؛ والشافعي: 555؛ والبخاري: ١٥٣٩؛ ومسلم: المناسك: ٣٣؛ والنسائي: ٢٦٨٥؛ وأبو داود: ١٧٤٥؛ وابن حبان: ٣٧٦٦؛ والقابسي: ٣٨٦، كلهم عن مالك به.




واتە: لە حەزرەتی عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش دەکرد بۆ ئیحرامەکەی بەر لەوەی ئیحرام ببەستێ، وە (دووبارە بۆنخۆشم دەکرد) بۆ کاتی لە ئیحرام دەرچونی (واتە پاشی بەردباران کردن و) پێش ئەوەی تەوافی بەیت بکات.

**٩٢١- عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ ﵀، أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ بِحُنَيْنٍ، وَعَلَى الأَعْرَابِيِّ قَمِيصٌ، وَبِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ، فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي أَنْ أَصْنَعَ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: انْزَعْ قَمِيصَكَ، وَاغْسِلْ هَذِهِ الصُّفْرَةَ عَنْكَ، وَافْعَلْ فِي عُمْرَتِكَ مَا تَفْعَلُ فِي حَجِّكَ[١].**

واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبی ڕەباحەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێکدا لە حونەین بوو، پیاوە دەشتەکییەکەش کراسێکی لەبەردا بوو و شوێنەواری زەردی پێوەبوو و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نیەتی ئیحرامم بە عومرە هێناوە، جا چۆن فەرمانم پێ دەکەیت، چی بکەم؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: کراسەکەت داکەنە و ئەو زەردایەتیە لە خۆت بشۆرە و لە عومرەکەتدا هەمان ئەوە ئەنجام بدە کە لە حەجدا ئەنجامی دەدەیت.

**٩٢٢- عَنْ أَسْلَمَ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ وَجَدَ رِيحَ طِيبٍ وَهُوَ بِالشَّجَرَةِ، فَقَالَ: مِمَّنْ رِيحُ هَذَا الطِّيبِ؟ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﵁: مِنِّي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: مِنْكَ؟ لَعَمْرُ اللهِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ ﵁: إِنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ ﵂ طَيَّبَتْنِي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ عُمَرُ ﵁: عَزَمْتُ عَلَيْكَ لَتَرْجِعَنَّ فَلْتَغْسِلَنَّهُ[٢].**

واتە: لە ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتابەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ هەستی بە بۆنی گوڵاو کرد لەکاتێکدا لە شەجەرەی ذیل حولەیفە بوو، جا گوتی: ئەو بۆنە لە کێ دێت؟ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش ﵁ گوتی: لە من دێت ئەی گەورەی باوەڕداران، ئیمامی عومەریش

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٤؛ والشيباني: ٤٢٦، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٧؛ والشيباني: ٤٠٢، عن مالك به.

ﷺ گوتی: سوێند بە سیفەتی زیندوێتی خوای پەروەردگار ﷻ ئەوە لە تۆ دێت؟! (واتە زۆر پێی ناخۆش بوو)، موعاویەش ﷺ گوتی: ئەی گەورەی بڕواداران حەزرەتی ئوم حەبیبە ﷺ بۆنخۆشی کردووم، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: سورم لەسەرت دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ئوم حەبیبە ﷺ و خۆی بۆت بشوات (وەك چۆن بۆنخۆشی کردووی).

**٩٢٣-** عَنِ الصَّلْتِ بْنِ زُبَيْدٍ ﷺ، عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَجَدَ رِيحَ طِيبٍ وَهُوَ بِالشَّجَرَةِ، وَإِلَى جَنْبِهِ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: مِمَّنْ رِيحُ هَذَا الطِّيبِ؟ فَقَالَ كَثِيرٌ ﷺ: مِنِّي يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَأَرَدْتُ أَنْ أَحْلِقَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: فَاذْهَبْ إِلَى شَرَبَةٍ، فَادْلُكْ رَأْسَكَ حَتَّى تُنْقِيَهُ، فَفَعَلَ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ ﷺ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الشَّرَبَةُ، حَفِيرٌ تَكُونُ عِنْدَ أَصْلِ النَّخْلَةِ.

واتە: لە صەڵتی کوڕی زوبەیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە چەندین کەسی خانەوادەکەی گێڕاویەتیەوە (گوتویانە): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەستی بە بۆنی گوڵاو کرد لەکاتێکدا لە شەجەرەی ذیل حولەیفە بوو، جا کەسیری کوڕی صەڵتی لە تەنیشت بوو، عومەر ﷺ گوتی: بۆنی ئەو گوڵاوە لە کێ دێ؟ کەسیریش ﷺ گوتی: لە من دێت ئەی گەورەی باوەڕداران، قژم گلۆڵە کردووە و پێچاومە (بۆیە و شتم تێخستووە تا ئەسپێی نەچێتە ناو) و دەمەوێت بیتاشم، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: بڕۆ بۆ لای گۆلێك (واتە بچۆ بۆ لای ئەو ئاوەی بە شێوەی بازنەیی لە بن دار خورماکان گلدراوەتەوە و کراوەتە گۆل) و قژت هەڵپشێوە تا پاکی دەکەیتەوە، کەسیری کوڕی صەڵتیش ﷺ ئەنجامیدا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: الشَّرَبَةُ ـ گۆل ـ بریتیە لە چاڵێك کە دەکەوێتە ژێر دارخورما.

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٨؛ والحدثاني: ٤٩٢أ؛ والشيباني: ٤٠٣، كلهم عن مالك به.

**٩٢٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، وَعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، وَرَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷭، أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ عَبْدِ الْمَلِكِ ﷀ سَأَلَ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَخَارِجَةَ بْنَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷭ بَعْدَ أَنْ رَمَى الْجَمْرَةَ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ، وَقَبْلَ أَنْ يُفِيضَ عَنِ الطِّيبِ؟ فَنَهَاهُ سَالِمٌ ﷀ، وَأَرْخَصَ لَهُ خَارِجَةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷀ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعید و عەبدوڵلای کوڕی ئەبی بەکر و ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷭ گێڕدراوەتەوە (گوتویانە): وەلیدی کوڕی عەبدول مەلیك ﷀ پرسیاری لە سالمی کوڕی عەبدوڵلا و خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت ﷭ کرد دەربارەی بەکارهێنانی گوڵاو و بۆنی خۆش، دوای ئەوەی جەمەڕەی عەقەبەی ڕەجم کردبوو و سەری تاشی بوو، پێش ئەوەی تەوافی ئیفازە بکات؟ جا سالم ﷀ نەهی لێکرد (گوتی نابێ بەکاریبهێنی)، خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیتیش ﷀ ڕێگەی پێدا.

**٩٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷀ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَدَّهِنَ الرَّجُلُ بِدُهْنٍ لَيْسَ فِيهِ طِيبٌ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَقَبْلَ أَنْ يُفِيضَ مِنْ مِنًى بَعْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷀ گوتویەتی: هیچ کێشەی تیا نیە پیاو (سەر و ڕیش و موو و جەستەی) چەور بکات بە ڕۆنێك کە بۆن و گوڵاوی لەگەڵ نەبێت پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێت، وە پێش ئەوەی بگەڕێنەوە لە مینا دوای ڕەجمی عەقەبە (بە مەرجێك دوای ڕەجمی عەقەبە بێت).

**٩٢٦- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷀ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷀ عَنْ طَعَامٍ فِيهِ زَعْفَرَانٌ، هَلْ يَأْكُلُهُ الْمُحْرِمُ؟ فَقَالَ: أَمَّا مَا تَمَسُّهُ النَّارُ مِنْ ذَلِكَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ أَنْ يَأْكُلَهُ الْمُحْرِمُ، وَأَمَّا مَا لَمْ تَمَسَّهُ النَّارُ مِنْ ذَلِكَ، فَلاَ يَأْكُلُهُ الْمُحْرِمُ[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٩؛ والحدثاني: ٤٩٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٥، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٥٦، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی خواردنێك کە زەعفەرانی تیا بێت، ئایا کەسی موحریم بیخوات؟ ئەویش گوتی: هەرچی ئەو جۆرە خواردنەیە کە زەعفەرانی تیایە و بە ئاگر دەکوڵێنرێت، ئەوە هیچ کێشەی تیا نیە لەوەی کەسی موحریم بیخوات، وە هەرچی ئەو خواردنەیە کە ئاگر کاریگەری تێدا نەکردووە و زەعفەڕانی تیایە، ئەوە کەسی موحریم نابێ بیخوات.

## ٨- شوێنەکانی ئیحڕام بەستن[١]

**٩٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ.

قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خەڵکی مەدینە لە ذیل حولەیفە ئیحڕام دەبەستن، خەڵکی شامیش لە جوحفە ئیحڕام دەبەستن، خەڵکی نەجدیش لە قەڕن ئیحڕام دەبەستن (ئەوە شوێنەکانی ئیحڕام بەستنیانە).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتویەتی: (هەرچەندە خۆم لێم نەبیستوە، بەڵام ئەوەندەشم) پێگەیشتووە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خەڵکی یەمەنیش لە یەلەملەم ئیحڕام دەبەستن.

**٩٢٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَنْ يُهِلُّوا مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلَ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَأَهْلَ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ.

---

(١) ـ مَوَاقِيتُ الإِهْلَالِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٠؛ والحدثاني: ٤٩٦؛ والشيباني: ٣٨٠؛ والبخاري: ١٥٢٥؛ ومسلم: المناسك: ١٣؛ والنسائي: ٢٦٥١؛ وأبو داود: ١٧٣٧؛ وابن ماجه: ٢٩٤٦؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٨٠٣؛ والقابسي: ٢٢٠، كلهم عن مالك به.

قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: أَمَّا هَؤُلَاءِ الثَّلَاثُ، فَسَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأُخْبِرْتُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە: خەڵکی مەدینە لە ذیل حولەیفە ئیحرام ببەستن، خەڵکی شامیش لە جوحفە ئیحرام ببەستن، خەڵکی نەجدیش لە قەرن ئیحرام ببەستن.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ گوتویەتی: هەرچی ئەو سێ شوێنەیە خۆم لە پێغەمبەری خوام بیستووە، وە هەواڵیشم پێدراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خەڵکی یەمەنیش با لە یەلەملەم ئیحرام ببەستن.

**٩٢٩**- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ أَهَلَّ مِنَ الْفُرُعِ[2].

واتە: لە نافعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە فوڕوع (کە شوێنێکە لەلای مەدینە، لەوێ) نیەتی ئیحرامی هێنا[3].

**٩٣٠**- عَنْ مالِكٍ ﵀، عَنِ الثِّقَةِ عِنْدَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ أَهَلَّ مِنْ إِيلِيَاءَ[4].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە ئەویش لە کەسێکی جێی متمانە گێڕاویەتیەوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە ئیلیاء (واتە بەیتول مەقدیس) نیەتی ئیحرامی هێنا.

**٩٣١**- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَهَلَّ مِنَ الْجِعْرَانَةِ بِعُمْرَةٍ[5].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦١؛ والحدثاني: ٤٩٦أ؛ والشيباني: ٣٨١؛ والشافعي: ٥٢٢؛ وابن حبان: ٣٧٥٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٢؛ والحدثاني: ٤٩٦ب، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: کە باسی ئیحرام بەستن دەکرێت مەبەست پێی نیەت هێنانە نەك پۆشینی جلە سپیەکە کە خەڵکی بیریان بۆی دەچێ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٣، عن مالك به.

(٥) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٤، عن مالك به.




واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نیەتی عومرە ئیحرامی لە جیعرانە بەستاوە.

## ٩- کرداری ئیحرام بەستن[١]

**٩٣٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما؛ أَنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ: لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ.

قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يَزِيدُ فِيهَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە رضي الله عنهما گێڕدراوەتەوە، (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ تەلبیەی دەکرد دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ) واتە: ((لە خزمەتتدام پەروەردگارا وەڵامی بانگێشتەکەتم دایەوە، لە خزمەتتدام، هیچ هاوەڵێکت نیە، گشت ستایش و نیعمەتێك و موڵکێك هەر هی تۆیە، هیچ هاوەڵێکت نیە)).

(نافیعیش) گوتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما ئەم ڕستانەی بەسەر زیکرەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ زیاد دەکردن: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ). واتە: ((لە خزمەتتدام، لە خزمەتتدام، لە خزمەتتدام، شوێن فەرمانت دەکەوم و تەوفیق لەلای تۆیە، هەموو چاکەیەك لە ژێر دەستی تۆ دایە، لە خزمەتتدام، گشت نزا و کردەوەیەك بۆ لای تۆیە)).

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الإِهْلاَلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٥؛ والحدثاني: ٤٩٧؛ والشيباني: ٣٨٦؛ والشافعي: ٥٦٩؛ والبخاري: ١٥٤٩؛ ومسلم: المناسك: ١٩؛ والنسائي: ٢٧٤٩؛ وأبو داود: ١٨١٢؛ وابن حبان: ٣٧٩٩؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٨٠٤، وفي: ٥٨١٥؛ والقابسي: ٢٢١، كلهم عن مالك به.

**٩٣٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ رَحِمَهُ اللَّهُ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، فَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ أَهَلَّ(١).

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە رەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە رەزای خوای لێبێت گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتی ذیل حولەیفە دوو ڕەکعەت نوێژی کرد، جا کە وڵاغەکەی ڕاستی کردەوە و بە تەواوی هەڵسایەوە نیەتی ئیحرامی هێنا.

**٩٣٤-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تَكْذِبُونَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيهَا، مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ، يَعْنِي مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ(٢).

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە رەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە باوکی بووە دەیگوت: ئەو بەیدائەتان کە دەیدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵەیە (کە دەڵێن: لە بەیداء نیەتی ئیحرامی نەهێناوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتی ئیحرامی نەهێناوە تەنها لە مزگەوتەکە نەبێت، واتە: مزگەوتی ذیل حولەیفە.

**٩٣٥-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ رَحِمَهُ اللَّهُ؛ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا، لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا، قَالَ: وَمَا هُنَّ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ، أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلاَلَ، وَلَمْ تُهْلِلْ أَنْتَ، حَتَّى يَكُونَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَمَّا الأَرْكَانُ، فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمَسُّ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ، وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا، وَأَمَّا الصُّفْرَةُ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلاَلُ، فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ(٣).

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٦؛ والحدثاني: ٤٩٨، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٧؛ والحدثاني: ٤٩٨أ؛ والشيباني: ٣٨٥؛ وابن حنبل: ٥٣٣٧؛ والبخاري: ١٥٤١؛ ومسلم: المناسك: ٢٣؛ والنسائي: ٢٧٥٧؛ وأبو داود: ١٧٧١؛ وابن حبان: ٣٧٦٢؛ والقابسي: ١٨٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٨؛ والحدثاني: ٤٩٩؛ والشيباني: ٤٧٨؛ وابن حنبل: ٥٣٣٨، وفي:

واتە: لە عوبەیدی كوڕی جوڕەیجەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی بە عەبدوڵڵای كوڕی عومەری ﷺ گوتووە: ئەی ئەبو عەبدولڕەحمان تۆم بینیوە چوار شتت ئەنجامداون هیچێك لە هاوەڵانتم نەبینیوە ئەنجامی بدەن، ئەویش گوتی: شتەكان چین ئەی ئیبن جوڕەیج؟ گوتی: تۆ دەست نادەیت لە ڕوكن و زاویەكانی كەعبە تەنها دوو ڕوكنە یەمانیەكە نەبێ، وە تۆم بینیوە نەعلەی سبتیت كردبووە پێت، وە تۆم بینیوە بە بۆیە جلت ڕەنگ كردووە، وە تۆم بینیوە كاتێ لە مەككە بووی خەڵك كاتێ مانگیان بینی ئیحرامیان بەست بەڵام تۆ نەتبەست تا ڕۆژی تەڕویە هات، جا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ گوتی: هەرچی دەربارەی ڕوكنەكانە، لەبەر ئەوەیە من پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە دەست لە هیچێك لە ڕوكنەكان بدات جگە لە دوو ڕوكنە یەمانیەكە، وە هەرچی نەعلە سیبتیەكانیشە، لەبەر ئەوەیە من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ئەو جۆرە نەعلەیەی لەپێ كردووە، وە دەستنوێژی پێوە هەڵگرتووە، بۆیە من حەز دەكەم لەبەریان بكەم، وە هەرچی ڕەنگ و بۆیەكەشە، من بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ بەكاریهێناوە و منیش حەز دەكەم بەو صوفرەیە ڕەنگ بكەم، وە هەرچی دەربارەی ئیحرام بەستنیشە، لەبەر ئەوەیە من پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە ئیحرام ببەستێت تا ئەو كاتە نەبێت كە وشترەكەی ڕاستی دەكردەوە و هەڵدەستایەوە (واتە نەمبینیوە پێغەمبەری خوا خۆی بەستابێتەوە بە سەرەتای مانگەوە).

**٩٣٦-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيَرْكَبُ، فَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ أَحْرَمَ[1].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ لە مزگەوتی ذیل حولەیفە نوێژی دەكرد، دواتر دەردەچوو و سواری وڵاغ دەبوو، جا كاتێ ئاژەڵەكەی ڕاستی دەكردەوە و تەواو لەسەر پشتی ڕاست دەبویەوە نیەتی ئیحرامی دەهێنا.

٥٨٩٤؛ والبخاري: ١٦٦، وفي: ٥٨٥١؛ ومسلم: المناسك: ٢٥؛ وأبو داود: ١٧٧٢؛ وابن حبان: ٣٧٦٣؛ والقابسي: ٤١٨، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٦٩؛ والحدثاني: ٤٩٩أ؛ والشيباني: ٣٨٤، كلهم عن مالك به.

**٩٣٧- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ مَرْوَانَ ﵀ أَهَلَّ مِنْ عِنْدِ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ، حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، وَأَنَّ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ ﵀ أَشَارَ عَلَيْهِ بِذَلِكَ[1].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان ﵀ لەلای مزگەوتی ذیل حولەیفە نیەتی ئیحرامی هێناوە، کاتێ ئاژەڵەکەی ڕاستی کردۆتەوە لەسەر پشتی، جا ئەبانی کوڕی عوسمان ﵀ ڕێنیشاندەری بووە بۆ ئەوەی ئاوا بکات (چونکە هاوەڵ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بینیویەتی و بەوی ڕاگەیاندووە).

## ١٠- دەنگ بەرزکردنەوە بە ئیحرام بەستن[2]

**٩٣٨- عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ الأَنْصَارِيِّ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ ﵇ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي، أَوْ مَنْ مَعِيَ، أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ أَوْ بِالإِهْلَالِ، يُرِيدُ أَحَدَهُمَا[3].**

واتە: لە خەللادی کوڕی سائیبی ئەنصاریەوە ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵁ گێراویەتیەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: جیبریل ﵇ هات بۆ لام و فەرمانی پێکردم بەوەی فەرمان بە هاوەڵانم بکەم یان فەرمان بەوانە بکەم کە لەگەڵمن، بەوەی دەنگیان بەرز بکەنەوە بە تەلبیە یان ئیهلال مەبەستی یەکێکیان بوو (واتە: ڕاویەکە گومانی هەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ کام وشەی فەرموو: تەلبیە یان ئیهلال)[4].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٠، عن مالك به.

(٢) ـ رَفْعُ الصَّوْتِ بِالإِهْلَالِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧١؛ والحدثاني: ٥٠٠ب؛ والشيباني: ٣٩٢؛ والشافعي: ٥٧٣؛ وابن حنبل: ١٦٦١٦؛ وأبو داود: ١٨١٤، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: تەلبیە بریتیە لە گوتنی: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك...)، ئیهلالیش بریتیە لە نیەتی ئیحرام.




**٩٣٩-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ رَفْعُ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ، لِتُسْمِعَ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا(١).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: گوێم لە زانایان بووە دەیانگوت: ئافرەتان لەسەریان نیە دەنگیان بەرز بکەنەوە بە گوتنی تەلبیە (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك...) تا خۆی گوێبیست بکات و گوێی لە دەنگی خۆی بێت (ئەوەی لەسەر نیە).

**٩٤٠-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَرْفَعُ الْمُحْرِمُ صَوْتَهُ بِالإِهْلاَلِ فِي مَسَاجِدِ الْجَمَاعَاتِ لِيُسْمِعَ نَفْسَهُ وَمَنْ يَلِيهِ، إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ مِنًى، فَإِنَّهُ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فِيهِمَا(٢).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: کەسی موحریم دەنگی خۆی بەرز ناکاتەوە بە گوتنی (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك...) لە مزگەوتیك کە جەماعەتی تێدا ئەنجام بدرێت بەوەی خۆی و ئەوانەی دەوروبەری گوێیان لێ بێت، تەنها لە مزگەوتی حەڕام و مزگەوتی مینا نەبێت، لەو دوو شوێنانە دەنگی بەرز دەکاتەوە.

**٩٤١-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: سَمِعْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَسْتَحِبُّ التَّلْبِيَةَ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَعَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ(٣).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: گوێم لە هەندێك لە زانایان بووە پێیان چاك و سوننەت بووە دوای گشت نوێژەکان و لەسەر گشت بەرزاییەکی زەوی تەلبیە بکرێت (واتە بگوترێت: لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك ....).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٢، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٣، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٤، عن مالك به.

## ١١- نیەت هێنان تەنها بە حەج[١]

**٩٤٢**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَحَلَّ، وَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَلَمْ يُحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ[٢].

واتە: لە حەزرەتی عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا دەرچووین، جا هەندێك لە ئێمە تەنها نیەتی عومرەی هێنا، وە تیاشماندا بوو نیەتی حەج و عومرەی هێنا، وە تیاشماندا بوو تەنها نیەتی حەجی هێنا، جا پێغەمبەری خواﷺ تەنها نیەتی حەجی هێنا، جا هەرچی ئەوانە بوون کە نیەتی عومرەیان هێنا حەڵاڵ بوونەوە و لە ژێر ئیحرام چونە دەرەوە (دوای ئەنجامدانی: تەواف و صەفا و مەروە و سەر تاشین یان کورت کردنەوە)، وە هەرچی ئەوانەش بوون کە نیەتی حەجیان هێنا بوو یان حەج و عومرەیان بەیەکەوە کۆکردبویەوە، حەڵاڵ نەبونەوە و لە ژێر ئیحرام نەچونە دەرەوە تا ڕۆژی قوربانی.

**٩٤٣**-عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَفْرَدَ الْحَجَّ.

واتە: لە حەزرەتی عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خواﷺ نیەتی حەجی بە تەنها هێنا (واتە نیەتی حەج و عومرەی بەیەکەوە نەهێنا).

**٩٤٤**-عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَفْرَدَ الْحَجَّ[٣].

---

(١) ـ إِفْرَادُ الْحَجِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٥؛ وفي: ١٠٨٠؛ والحدثاني: ٥٠٥؛ والشيباني: ٣٩٣؛ والشافعي: ١٠٦٤؛ وابن حنبل: ٢٤١٢٢؛ والبخاري: ١٥٦٢، وفي: ٤٤٠٨؛ ومسلم: المناسك: ١١٨؛ وأبو داود: ١٧٧٩؛ وشرح معاني الآثار: ٣٦٤٩، وفي: ٣٩٠٩؛ والقابسي: ٨٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٧؛ والحدثاني: ٥٠٦أ؛ وابن حنبل: ٢٦١٠٥؛ وابن ماجه: ٢٩٩٨؛ وأبي يعلى الموصلي: ٤٣٦٢، كلهم عن مالك به.

واتە: (لەم ڕێگەیەشەوە) لە حــەزرەتی عـــائیشـــەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتی حەجی بە تەنها هێنا (واتە نیەتی حەج و عومرەی بەیەکەوە نەهێنا).

**٩٤٥- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يُهِلَّ بَعْدَهُ بِعُمْرَةٍ، فَلَيْسَ لَهُ ذَلِكَ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ الَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[1].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە دەیانگوت: هەر کەسێك بە تەنها نیەتی حەج بێنێت، دواتر ویستی نیەتی عومرەش بێنێت (واتە ویستی عومرەشی لەگەڵ ئەنجام بدات و نیەتەکەی زیاد بکات)، ئەوەی بۆ نیە.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتویەتی: ئەوە ئەو فەتوایەیە کە لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (مەدینە).

## ١٢- بەیەکەوە گرێدانی نیەتی حەج و عومرە[2]

**٩٤٦-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ ﵁ دَخَلَ عَلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ بِالسُّقْيَا، وَهُوَ يَنْجَعُ بَكَرَاتٍ لَهُ دَقِيقًا وَخَبَطًا، فَقَالَ: هَذَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﵁ يَنْهَى عَنْ أَنْ يُقْرَنَ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَخَرَجَ عَلِيٌّ ﵁، وَعَلَى يَدَيْهِ أَثَرُ الدَّقِيقِ وَالْخَبَطِ - فَمَا أَنْسَى أَثَرَ الدَّقِيقِ وَالْخَبَطِ عَلَى ذِرَاعَيْهِ - حَتَّى دَخَلَ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁، فَقَالَ: أَنْتَ تَنْهَى عَنْ أَنْ يُقْرَنَ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ؟ فَقَالَ عُثْمَانُ ﵁: ذَلِكَ رَأْيِي، فَخَرَجَ عَلِيّ ﵁ مُغْضَبًا، وَهُوَ يَقُولُ: لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًا[3].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٨؛ والحدثاني: ٥٠٦ب، عن مالك به.

(٢) ـ الْقِرَانُ فِي الْحَجِّ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٧٩؛ والحدثاني: ٥٠٧، عن مالك به.

ﷺ گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ لە سوقیا (کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە، لەوێ) چوو بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ لەکاتێکدا بەچکە وشترەکانی ئاودەدا و بە گەڵای دار و ئارد حەلەفی بۆ دروست دەکردن و لەگەڵ ئاو تێکەڵی دەکرد، (جا موحەممەدی باوکی جەعفەر) گوتی: ئەوەتا عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ نەهی دەکات لەوەی حەج و عومرە بەیەکەوە کۆبکرێتەوە، جا عەلی ﷺ دەرچوو لەکاتێکدا شوێنەواری ئارد و گەڵا کوتراوەکەی بە دەستیەوە دیار بوو ـ شوێنەواری ئارد و گەڵا کوتراوەکەم بیرناچێ لەسەر باسکەکانی ـ تا چووە ژورەوە بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ و گوتی: تۆ نەهی دەکەی لەوەی حەج و عومرە بەیەکەوە کۆبکرێتەوە؟ عوسمانیش ﷺ گوتی: ئەوە بۆچونی منە، جا عەلی ﷺ بە توڕەییەوە دەرچوو لەکاتێکدا دەیگوت: «لبيك اللهم لبيك» بە نیەتی حەج و عومرە بەیەکەوە (واتە بە شێوەی کرداری بەرەنگاری بۆچونەکەی ئیمامی عوسمانی کرد).

**٩٤٧**- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الْأَمْرُ عِنْدَنَا، أَنَّ مَنْ قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لَمْ يَأْخُذْ مِنْ شَعَرِهِ شَيْئًا، وَلَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ، حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيًا إِنْ كَانَ مَعَهُ، وَيَحِلُّ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە: هەر کەسێك نیەتی حەج و عومرە بەیەکەوە بێنێت، نابێ هیچ لە مووەکانی بتاشێت و دەستکاری بکات، وە لە هیچ شتێك حەڵاڵ نابێتەوە تاوەکو ئاژەڵەکەی سەردەبڕێ ئەگەر هێنابووی، (جا ئەگەر ئەوانەی ئەنجامدا) لە مینا حەڵاڵ دەبێت و لە ڕۆژی قوربانی لە ژێر ئیحرام دێتە دەرەوە.

**٩٤٨**- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ خَرَجَ إِلَى الْحَجِّ، فَمِنْ أَصْحَابِهِ مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، وَمِنْهُمْ مَنْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَلَمْ يَحْلِلْ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَحَلَّ[٢].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٢؛ وفي: ١٣٩٣، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه الحدثاني: ٥٠٨؛ والشيباني: ٣٩٣، عن مالك به.



خوا ﷺ لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا دەرچوو بۆ حەج، جا هەندێك لە هاوەڵەكانی نیەتی حەجیان هێنابوو، هەندێكیشیان حەج و عومرەیان بەیەكەوە كۆكردبویەوە (نیەتی هەردوكیان هێنا بوو)، وە هەشیان بوو تەنها نیەتی عومرەی هێنابوو، جا ئەوانەی نیەتی حەجیان هێنابوو، یان نیەتی كۆكردنەوەی حەج و عومرەیان بەیەكەوە هێنابوو، لە ژێر ئیحرام نەچونە دەرەوە و حەڵاڵ نەبونەوە (تا ڕۆژی قوربانی)، وە هەرچی ئەوانە بوون كە تەنها نیەتی عومرەیان هێنابوو لە ژێر ئیحرام چونە دەرەوە و حەڵاڵ بونەوە.

٩٤٩- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ سَمِعَ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ مَعَهَا، فَذَلِكَ لَهُ، مَا لَمْ يَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَدْ صَنَعَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄ حِينَ قَالَ: إِنْ صُدِدْتُ عَنِ الْبَيْتِ صَنَعْنَا كَمَا صَنَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا أَمْرُهُمَا إِلاَّ وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي أَوْجَبْتُ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە كە گوێبیستی هەندێك لە زانایان بووە دەیانگوت: هەر كەسێك نیەتی ئیحرامی عومرە بێنێت، دواتر پێی چاك بوو و ویستی نیەتی حەجیشی لەگەڵ بێنێت، ئەوەی بۆ هەیە و دەتوانێ، مادەم تەوافی بەیت و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوەی نەكردبێت، جا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ ئەوەی ئەنجامداوە ئەو كاتەی گوتی: ئەگەر ڕێگریم لێكرا لە چونە بەیت، ئەوە ئەو شتە دەكەین كە پێغەمبەری خوا ﷺ كردی، دواتر ئاوڕی دایەوە بۆ هاوەڵەكانی و گوتی: كرداری هەردوكیان (واتە كرداری حەج و عومرە) یەكە، (كەواتە) دەتانكەم بە شاهێد حەجم لەسەر خۆم واجب كرد لەگەڵ عومرەكە (واتە سەرەتا تەنها نیەتی عومرەی هەبوو دواتر حەجیشی وەگەڵ خست).

٩٥٠- قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَقَدْ أَهَلَّ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيُهْلِلْ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا[2].

---

(١) ـ صحيح. ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨١؛ والحدثاني: ٥٠٩، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨١؛ والحدثاني: ٥٠٩، عن مالك به.




واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا ئیحرامیان بە عومرە بەستا، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: هەر کەسێك ئاژەڵی قوربانی پێیە، با ئیحرام بە حەج و عومرە ببەستێت، دواتریش (بزانن) حەڵاڵ نابێتەوە و لە ژێر ئیحرام دەرناچێت تاوەکو لە کرداری حەج و عومرە نەبێتەوە.

## ١٣- پچڕاندن و کۆتایی هێنان بە تەلبیە (گوتنی: لبیك اللهم لبیك...)[١]

**٩٥١-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ وَهُمَا غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِي هَذَا الْيَوْمِ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: كَانَ يُهِلُّ الْمُهِلُّ مِنَّا فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری سەقەفیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ کرد لەکاتێکدا هەردوکیان بە کاتی بەیان لە میناوە دەچوون بۆ عەرەفە (گوتی): ئێوە چیتان دەکرد لەو ڕۆژەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (ئەنەس ﷺ) گوتی: لەناو ئێمەدا هەبوو تەلبیەی دەکرد (واتە: «لبیك اللهم لبیك...»ی دەکرد) و نەهی لێ نەدەکرا، وە هەشبوو تەکبیری دەکرد (واتە: «الله أكبر»ی دەکرد) نەهیشی لێ نەدەکرا.

**٩٥٢-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ كَانَ يُلَبِّي فِي الْحَجِّ، حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ قَطَعَ التَّلْبِيَةَ[٣].

قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ: وَذَلِكَ الأَمْرُ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا.

---

(١) ـ قَطْعُ التَّلْبِيَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٩؛ والحدثاني: ٥٠٢؛ والشيباني: ٣٨٧؛ والشافعي: ١١٣٧؛ وابن حنبل: ١٢٠٨٩، وفي: ١٣٥٤٥؛ والبخاري: ٩٧٠، وفي: ١٦٥٩؛ ومسلم: المناسك: ٢٧٤؛ والنسائي: ٣٠٠٠؛ وابن حبان: ٣٨٤٧؛ والدارمي: ١٨٧٧؛ والقابسي: ١٠٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٠؛ والحدثاني: ٥٠٢أ، عن مالك به.




واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ لە حەجدا تەلبیەی دەکرد (دەیگوت: لبيك اللهم لبيك...) تا کاتێ خۆر لە ڕۆژی عەرەفە لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا، ئەو کات تەلبیەکەی دەپچڕاند و چیتر نەیدەگوت.

یەحیا ﷺ گوتویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەوە ئەو کارەیە کە زانایانی شار و ناوچەکەمان بەردەوام لەسەری بوون.

**٩٥٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا كَانَتْ تَتْرُكُ التَّلْبِيَةَ إِذَا رَجَعَتْ إِلَى الْمَوْقِفِ[١].

واتە: لە حەزرەتی عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی (عائیشە ﷺ) تەلبیەی وازلێدەهێنا کاتێ دەگەڕایەوە بۆ ڕاوەستانی عەرەفە (دوای نیوەڕۆ).

**٩٥٤-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ فِي الْحَجِّ إِذَا انْتَهَى إِلَى الْحَرَمِ حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ يُلَبِّي حَتَّى يَغْدُوَ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، فَإِذَا غَدَا تَرَكَ التَّلْبِيَةَ، وَكَانَ يَتْرُكُ التَّلْبِيَةَ فِي الْعُمْرَةِ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ[٢].

واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ تەلبیە کردنی دەپچڕاند و کۆتایی پێدەهێنا لە حەجدا کاتێ دەگەیشتە حەرەم، (جا نەکردنەکە بەردەوام بوو) تا ئەو کاتەی تەوافی بەیتی دەکرد و ڕاکردنی صەفا و مەروەی ئەنجام دەدا، دواتر تەلبیەی دەکرد تا بەیانیەکەی لە میناوە دەچوو بۆ عەرەفە، جا کە دەچوو بۆ عەرەفە تەلبیەی نەدەکرد (ئەوە دەربارەی حەج بوو)، وە لە عومرەدا تەلبیەی دەپچڕاند و کۆتایی پێدەهێنا کاتێ دەچووە ناو حەرەم.

**٩٥٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ لاَ يُلَبِّي وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩١؛ والحدثاني: ٥٠٣؛ والشيباني: ٣٩٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٢؛ وفي: ١١٢١؛ وفي: ١١٢٢؛ والحدثاني: ٥٠٣أ؛ والشيباني: ٣٨٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٣؛ والحدثاني: ٥٠٣ب، عن مالك به.

واتە: لە ئیبن شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی دەیگوت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ تەلبیەی نەدەکرد لەکاتێکدا تەوافی بە دەوری بەیتدا بکردایە[١].

٩٥٦- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا كَانَتْ تَنْزِلُ مِنْ عَرَفَةَ بِنَمِرَةَ، ثُمَّ تَحَوَّلَتْ إِلَى الأَرَاكِ.

قَالَتْ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ ﵂ تُهِلُّ مَا كَانَتْ فِي مَنْزِلِهَا، وَمَنْ كَانَ مَعَهَا، فَإِذَا رَكِبَتْ فَتَوَجَّهَتْ إِلَى الْمَوْقِفِ تَرَكَتِ الإِهْلاَلَ، قَالَتْ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَعْتَمِرُ بَعْدَ الْحَجِّ مِنْ مَكَّةَ فِي ذِي الْحِجَّةِ، ثُمَّ تَرَكَتْ ذَلِكَ، فَكَانَتْ تَخْرُجُ قَبْلَ هِلاَلِ الْمُحَرَّمِ، حَتَّى تَأْتِيَ الْجُحْفَةَ فَتُقِيمَ بِهَا حَتَّى تَرَى الْهِلاَلَ، فَإِذَا رَأَتِ الْهِلاَلَ، أَهَلَّتْ بِعُمْرَةٍ[٢].

واتە: لە حەزرەتی عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە بەوەی لە عەرەفەوە دادەبەزیە نەمیرە، دواتر دەچوو بۆ ئەراك (كە شوێنێكە لە عەرەفە).

گوتویەتی: جا حەزرەتی عائیشە ﵂ ئیحرامی دەبەست مادەم لە شوێنەکەی خۆی بوایە، وە ئەوانەشی کە لەگەڵی بوون (ئیحرامیان دەبەست)، جا کاتێ سواری وڵاغ دەبوو و ڕووی دەکردە عەرەفە وازی لە تەلبیە (لبيك اللهم لبيك...) دەهێنا، دەڵێ: جا حەزرەتی عائیشە ﵂ عادەتی وابوو لەدوای حەج لە مانگی زیل حیجە عەمرەی دەکرد، دواتر وازی لەو کارە هێنا و لە مەککە دەردەچوو پێش مانگی موحەڕڕەم، تا دەچوو بۆ جوحفە و لەوێ دەمایەوە تاوەکو مانگی دەبینی، جا کە مانگی دەبینی ئەو کات ئیحرامی بە عومرە دەبەست.

٩٥٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ غَدَا يَوْمَ عَرَفَةَ مِنْ مِنًى، فَسَمِعَ التَّكْبِيرَ عَالِيًا، فَبَعَثَ الْحَرَسَ يَصِيحُونَ فِي النَّاسِ، أَيُّهَا النَّاسُ: إِنَّهَا التَّلْبِيَةُ[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ لە بەیانیەکەی ڕۆژی عەرەفە لە مینا بەڕێکەوت، جا بە

---

(١) ـ تێبینی: ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمەد پێیان وایە کردنی دروستە، بەڵام دەبێ بە بێ دەنگی ئەنجام بدرێت.

(٢) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٤؛ والحدثاني: ٥٠٤؛ والشيباني: ٣٩١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٥؛ والحدثاني: ٥٠٤أ، عن مالك به.

بەرزی گوێی لە دەنگی (الله أكبر) بوو، پاسەوانەكانی نارد لەناو خەڵكی هاواریان دەكرد: ئەی خەڵكینە دەبێ تەلبیە بێت (واتە دەبێ بگوترێت: «لبيك اللهم لبيك»، نەك «الله أكبر»).

## ١٤- ئیحرام بەستانی خەڵكی مەككە و ئەوانەی لە مەككەن لە خەڵكانی تر[1]

**٩٥٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ، مَا شَأْنُ النَّاسِ يَأْتُونَ شُعْثًا وَأَنْتُمْ مُدَّهِنُونَ؟ أَهِلُّوا إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ[2].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتویەتی: ئەی خەڵكی مەككە ئەوە بۆچی خەڵكی بە قژ ئاڵۆزی دێن (واتە خەڵك نیەتی ئیحرامیان هێناوە) لەكاتێكدا ئێوە قژتان چەور كردووە (خۆتان قۆز كردووە و نیەتی ئیحرامتان نیە، خەڵكی تر لە ئێوە پەیڕەوترە)؟ نیەتی ئیحرام بێنن كاتێ مانگی ذیل حیججەتان بینی.

**٩٥٩-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ أَقَامَ بِمَكَّةَ تِسْعَ سِنِينَ يُهِلُّ بِالْحَجِّ لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ، وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ مَعَهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ[3].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر ﷺ نۆ ساڵ لە مەككە ژیا و مایەوە، جا بە دەركەوتنی مانگی ذیل حیججە ئیحرامی بۆ حەج دەبەست، وە عوڕوەی كوڕی زوبەیریشی لەگەڵدا بوو ئاوای دەكرد.

---

(١) ـ إِهْلَالُ أَهْلِ مَكَّةَ وَمَنْ بِهَا مِنْ غَيْرِهِمْ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٣؛ والحدثاني: ٥٠٠؛ والشيباني: ٥١٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٤، عن مالك به.




٩٦٠- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يُهِلُّ أَهْلُ مَكَّةَ وَغَيْرُهُمْ بِالْحَجِّ إِذَا كَانُوا بِهَا، وَمَنْ كَانَ مُقِيمًا بِمَكَّةَ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهَا مِنْ جَوْفِ مَكَّةَ لاَ يَخْرُجُ مِنَ الْحَرَمِ(١).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: خەڵكی مەككە و خەڵكی تریش لە مەككە ئیحرام دەبەستن ئەگەر لە مەككە بوون، وە ئەو كەسەی موقیمە لە مەككە و خەڵكی ئەوێ نیە، ئەوە لە ناو مەككە ئیحرام دەبەستێت (بۆ حەڵاڵ بونەوەش) لە حەرەم دەرناچێت (چونكە دواتر بۆ عەرەفە دەردەچێت و حەڵاڵ دەبێتەوە).

٩٦١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ أَهَلَّ مِنْ مَكَّةَ بِالْحَجِّ، فَلْيُؤَخِّرِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ وَالسَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَتَّى يَرْجِعَ مِنْ مِنًى، وَكَذَلِكَ صَنَعَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ (٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: هەر كەسێك ئیحرام بۆ حەج ببەستێت لە مەككە، ئەوە با تەوافی بەیت و ڕاكردنی نێوان سەفا و مەڕوە دوابخات تاوەكو لە مینا دەگەڕێتەوە، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش ﷺ ئاوای كردووە.

٩٦٢- **[فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَمَّنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ أَوْ غَيْرِهِمْ مِنْ مَكَّةَ، لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ، كَيْفَ يَصْنَعُ بِالطَّوَافِ؟ قَالَ: أَمَّا الطَّوَافُ الْوَاجِبُ فَلْيُؤَخِّرْهُ، وَهُوَ الَّذِي يَصِلُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلْيَطُفْ مَا بَدَا لَهُ، وَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ كُلَّمَا طَافَ سُبْعًا، وَقَدْ فَعَلَ ذَلِكَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ مِنْ مَكَّةَ، فَأَخَّرُوا الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ، وَالسَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَتَّى رَجَعُوا مِنْ مِنًى، وَفَعَلَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، فَكَانَ يُهِلُّ لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ بِالْحَجِّ مِنْ مَكَّةَ، وَيُؤَخِّرُ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ، وَالسَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ حَتَّى يَرْجِعَ مِنْ مِنًى(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەو كەسانەی ئیحرام بە حەج دەبەستن لە خەڵكی مەدینە و جگە لەوانیش لە ناو مەككە لە مانگی ذیل حیججە، (كە ئاخۆ) چۆن تەواف دەكەن؟ گوتی: هەرچی دەربارەی تەوافی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٦، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٧، عن مالك به.



واجبه (كه بريتيه له تەوافى ئيفازه) با دوايبخا، كه بريتيه لەوەى دەبێ بيلكێنێ بە ڕاكردنى نێوان صەفا و مەڕوە، وە چەندى پێ دەكرێ با تەوافى (سوننەت) بكات، وە با هەر جارێك حەوت تەوافى ئەنجامدا دوو ڕەكعەت نوێژ بكات، چونكە ئەو هاوەڵانەى پێغەمبەرى خوا ﷺ كه له مەككە ئيحراميان بەستاوە ئاوايان كردووە، تەواف و ڕاكردنى نێوان صەفا و مەڕوەيان دواخستووە تاوەكو له مينا گەڕاونەتەوە، وە عەبدوڵڵاى كوڕى عومەريش ﷺ ئاواى كردووە، له مانگى ذيل حيججه له مەككە ئيحرامى بە حەج دەبەست و، تەواف و ڕاكردنى نێوان صەفا و مەڕوەى دوادەخست تاوەكو له مينا دەگەڕايەوە.

**٩٦٣- [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، هَلْ يُهِلُّ مِنْ جَوْفِ مَكَّةَ بِعُمْرَةٍ؟ قَالَ: بَلْ يَخْرُجُ إِلَى الْحِلِّ فَيُحْرِمُ مِنْهُ**[1].

(فەتوا): واته: ئيمامى ماليك ﷺ پرسيارى لێكرا دەربارەى كەسێكى خەڵكى مەككە، كه ئايا دەبێت ئيحرامى عومرە له ناو مەككە ببەستێت؟ گوتى: (نەخێر) بەڵكو دەبێت بچێتە دەرەوەى حەرەمى مەككە ئينجا ئيحرام ببەستێت (چونكە مەبەست بە عومرە زيارەت و سەردانى بەيتە، ئەوەش نايێتەجێ تا له دەرەوە بۆى نەچێت، ناكرێ له ناوەوە زيارەتى بكات).

## ١٥- ملپێچ كردنى ملى ئاژەڵى هەدى (واته ناردنى قوربانى بۆ حەرەم) ئيحرام واجب ناكات[2]

**٩٦٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ زِيَادَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَنْ أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عَلَيْهِ مَا يَحْرُمُ عَلَى الْحَاجِّ، حَتَّى يُنْحَرَ الْهَدْيُ، وَقَدْ بَعَثْتُ بِهَدْيٍ، فَاكْتُبِي إِلَيَّ بِأَمْرِكِ، أَوْ مُرِي صَاحِبَ الْهَدْيِ، قَالَتْ عَمْرَةُ ﷺ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: لَيْسَ كَمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَا فَتَلْتُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِيَدَيَّ، ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٨٨؛ وفي: ١١٢٩، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يُوجِبُ الإِحْرَامَ مِنْ تَقْلِيدِ الْهَدْيِ.




اللهِ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مَعَ أَبِي، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ شَيْءٌ أَحَلَّهُ اللهُ لَهُ حَتَّى نُحِرَ الْهَدْيُ(١).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەمرەی کچی عەبدولڕەحمانەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە بەوەی هەواڵی پێداوە (گوتویەتی): زیادی کوڕی ئەبو سوفیان نوسراوێکی بۆ حەزرەتی عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ نوسی (تیایدا نوسیبوی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گوتویەتی: هەر کەسێك هەدیێك (واتە ئاژەڵێکی قوربانی) پێشکەش بە بەیت بکات ئەو شتانەی لەسەر حەڕام دەبن کە لەسەر کەسی حاجی حەڕامن، تاوەکو قوربانیەکە سەر دەبڕدرێت، وە من هەدیم ڕەوانە کردووە، جا بۆچونی خۆتم بۆ بنوسە یان فەرمان بەو کەسە بکە کە هەدیەکە دەبات، عەمرە ﷺ دەڵێت: عائیشە ﷺ گوتی: ئاوا نییە کە ئیبن عەبباس گوتویەتی، (گوتی): من بە دەستەکانم ملپێچی ئاژەڵە هەدیەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ هۆنیوەتەوە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی کردیە ملی ئاژەڵەکە، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵەکەی لەگەڵ باوکم ڕەوانە کرد (بۆ بەیت)، جا هیچ شتێك کە خوا بۆی حەڵاڵ کردبوو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ حەڕام و قەدەغە نەبوو تا هەدیەکەش سەربڕا.

**٩٦٥- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَمْرَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ عَنِ الَّذِي يَبْعَثُ بِهَدْيِهِ وَيُقِيمُ، هَلْ يَحْرُمُ عَلَيْهِ شَيْءٌ؟ فَأَخْبَرَتْنِي أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: لاَ يَحْرُمُ إِلاَّ مَنْ أَهَلَّ وَلَبَّى(٢).**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: پرسیارم لە عەمرەی کچی عەبدولڕەحمان ﷺ کرد دەربارەی ئەو کەسەی هەدیەکەی دەنێرێت

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٦؛ والحدثاني: ٥١٠؛ والشيباني: ٣٩٨؛ وابن حنبل: ٢٥٥٠؛ والبخاري: ١٧٠٠، وفي: ٢٣١٧؛ ومسلم: المناسك: ٣٦٩؛ والنسائي: ٢٧٩٣؛ وأبو يعلى الموصلي: ٤٨٥٣؛ والقابسي: ٣٠٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٧؛ والحدثاني: ٥١١، عن مالك به.

(بۆ مەککە) و دەشمێنێتەوە (واتە خۆی ناچێت بۆ مەککە)، ئایا هیچی لەسەر حەڕام و قەدەغە دەبێت (بە ناردنی ئەو هەدیە)؟ جا عەمرە ﷺ هەواڵی پێدام بەوەی گوێی لە حەزرەتی عائیشە ﷺ بووە گوتویەتی: هیچی لەسەر حەڕام نابێ تەنها لەسەر ئەو کەسە نەبێت کە ئیحرام دەبەستێت و تەلبیە دەکات.

**٩٦٦-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْهُدَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً مُتَجَرِّدًا بِالْعِرَاقِ، فَسَأَلَ النَّاسَ عَنْهُ، فَقَالُوا: إِنَّهُ أَمَرَ بِهَدْيِهِ أَنْ يُقَلَّدَ، فَلِذَلِكَ تَجَرَّدَ، قَالَ رَبِيعَةُ ﷺ: فَلَقِيتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، فَذَكَرْتُ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: بِدْعَةٌ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ[١].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی هودەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پیاوێکی لە عێراق بینی جلی دوراوی لەخۆی داماڵی بوو (کە مەبەستی ئیبن عەبباسە، ئەو بۆچونی وابوو هەدی وەکو ئیحرام ئەژمار دەکرێت و شتە حەڕامکراوەکانی حاجی دەیگرێتەوە)، جا پرسیاری لە خەڵکی کرد (بۆچی وای کردووە)؟ خەڵکەکەش گوتیان: ئەو فەرمانی کردووە هەدیەکەی ملپێچ بکرێت و ببرێت بۆ مەککە، بۆیە خۆی لە جلی دوراو داماڵیوە، ڕەبیعە ﷺ دەڵێت: جا گەیشتم بە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ﷺ و ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش گوتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوە بیدعەیە[٢].

**٩٦٧- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مالكٌ ﷺ عَمَّنْ خَرَجَ بِهَدْيٍ لِنَفْسِهِ، فَأَشْعَرَهُ وَقَلَّدَهُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَلَمْ يُحْرِمْ هُوَ حَتَّى جَاءَ الْجُحْفَةَ؟ قَالَ: لاَ أُحِبُّ ذَلِكَ لَهُ، وَلَمْ يُصِبْ مَنْ فَعَلَهُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يُقَلِّدَ الْهَدْيَ، وَلاَ يُشْعِرَهُ، إِلاَّ عِنْدَ الإِهْلاَلِ، إِلاَّ رَجُلٌ لاَ يُرِيدُ الْحَجَّ، فَيَبْعَثُ بِهِ، وَيُقِيمُ فِي أَهْلِهِ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٨؛ والحدثاني: ٥١١أ، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بیدعە شتێکی نیسبییە و یەکلاکەرەوە نییە، چونکە هەر کەسێك بە پێی شارەزایی خۆی وشەی بیدعە بۆ ئەو شتانە بەکاردێنێ کە زانیاری دەربارەیان نییە کە هەبوبێت، ڕەنگە قسەکەی تەواو بێت و ڕەنگیشە خۆی هەڵە بێت و شتەکە بیدعە نەبێت، یان ئەگەر بیدعەش بێت مەرج نییە کەسەکە پێی تاوانبار بێت، وەك ئەو کردەوەی ئیبن عەبباس و دەیان کردەوەی تری هاوەڵان (کە پشتیوان بەخوا لە پەرتوکێکدا بیدعەی هاوەڵان لە کتێبەکانی فەرمووده کۆدەکەمەوە تا چەمکی بیدعە ڕونتربێتەوە).

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٠٩٩، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە لەگەڵ هەدیەکەی دەربچێت و لە زیل حولەیفە نیشانەی بکات و ملپێچی بکاتە مل و ئیحرام نەبەستێت تاوەکو دەچێتە جوحفە (لەوێ ئیحرام ببەستێت)؟ گوتی: ئەوەم پێ خۆش و باش نیە بۆی، ئەو کەسەی ئاوا بکات نەیپێکاوە، وە بۆی نیە هەدیەکەی ملپێچ بکات و نیشانەداری بکات تەنها لە کاتی ئیحرام نەبێت، (چونکە ملپێچ کردنی هەدی نابێ) تەنها بۆ کەسێك نەبێت کە مەبەستی حەجی نیە و هەدیەکەی دەنێرێت و خۆی لەناو خانەوادەکەی بمێنێتەوە (بۆ ئەو بەو شێوەیە تەواوە، بەڵام ئەو کەسەی باسکرا کە ئاژەلەکەی ملپێچ کردووە و خۆیشی لەگەڵی ڕۆیشتووە و دواتریش ئیحرامی بەستووە، ئەوە هیچێك لەو دوانە نیە، نە وەکو حاجی کردووە نە وەکو ئەو کەسەی لە ماڵ دەمێنێتەوە و تەنها ئاژەڵەکەی دەنێرێت، بەڵکو تێکەڵەی هەردوکیانە، ئاواش چاك نییە).

٩٦٨- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ: هَلْ يَخْرُجُ بِالْهَدْيِ غَيْرُ مُحْرِمٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا: ئایا کەسی جگە لە موحریم هەدی و قوربانیەکەی دێنێتە دەرەوە (واتە ئایا خۆی لەگەڵ هەدیەکەی دێت تا میقات)؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەوە هیچ کێشەی تیا نیە.

٩٦٩- **[فتوى]** وسُئِلَ أَيْضًا: عَمَّا اخْتَلَفَ فِيهِ النَّاسُ مِنَ الإِحْرَامِ لِتَقْلِيدِ الْهَدْيِ، مِمَّنْ لاَ يُرِيدُ الْحَجَّ وَلاَ الْعُمْرَةَ، فَقَالَ: الأَمْرُ عِنْدَنَا الَّذِي نَأْخُذُ بِهِ فِي ذَلِكَ، قَوْلُ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ بِهَدْيِهِ ثُمَّ أَقَامَ، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَيْهِ شَيْءٌ مِمَّا أَحَلَّهُ اللهُ لَهُ، حَتَّى نُحِرَ الهَديُ[2].

(فەتوا): واتە: هەروەها (ئیمامی مالیك ﷺ) پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو ڕاجیاییەی خەڵك هەیەتی دەربارەی ملپێچ کردنی هەدی بۆ ئەو کەسەی مەبەستی حەج و عومرەی نیە (واتە: ئایا تۆ کام بۆچوون پەسەند دەکەی لەو ڕاجیاییەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠١، عن مالك به.



خەڵك هەیەتی)، ئەویش گوتی: کارەکە لای ئێمە ئاوایە: قسەی حەزرەتی عائیشە ﵂ وەردەگرین لەو بارەیەوە (کە گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەدی نارد و خۆی مایەوە، جا هیچ شتێکی لەسەر حەرام و قەدەغە نەبوو کە خوا بۆی حەڵاڵ کردبوو، تا هەدیەکەش سەربڕا.

### ١٦- ئافرەتی حەیزدار لە حەجدا چی دەکات[1]

**٩٧٠-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَقُولُ: الْمَرْأَةُ الْحَائِضُ الَّتِي تُهِلُّ بِالْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، إِنَّهَا تُهِلُّ بِحَجِّهَا أَوْ عُمْرَتِهَا إِذَا أَرَادَتْ، وَلَكِنْ لاَ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَهِيَ تَشْهَدُ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا مَعَ النَّاسِ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلاَ تَقْرَبُ الْمَسْجِدَ حَتَّى تَطْهُرَ[2].

واتە: لە نافعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەیگوت: ئەو ئافرەتە حەیزدارەی دەیەوێ ئیحرام بە حەج و عومرە ببەستێت، بۆی هەیە ئیحرام بە حەجەکەی یان عومرەکەی ببەستێت ئەگەر ویستی، بەڵام نابێ تەوافی بەیت و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەروە ئەنجام بدات، جا لە گشت قۆناغ و ڕێکار و مەناسیکەکان ئامادە دەبێت لەگەڵ خەڵکی تەنها ئەوەندە نەبێت تەوافی بەیت و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەروە ئەنجام نادات و نزیکی مزگەوت ناکەوێتەوە تا پاك دەبێتەوە.

### ١٧- عومرە کردن لە مانگەکانی حەجدا[3]

**٩٧١-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اعْتَمَرَ ثَلاَثًا: عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَعَامَ الْقَضِيَّةِ، وَعَامَ الْجِعْرَانَةِ[4].

---

(١) ـ مَا تَفْعَلُ الْحَائِضُ فِي الْحَجِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٢؛ والحدثاني: ٥١٢؛ والشيباني: ٤٦٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ الْعُمْرَةُ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٣؛ والحدثاني: ٥١٧، عن مالك به.




واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار عومرەی کردووە: لە ساڵی حودەیبیە و، لە ساڵی قەزییە[١] و، لە ساڵی جیعرانە.

**٩٧٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمْ يَعْتَمِرْ إِلاَّ ثَلاَثًا: إِحْدَاهُنَّ فِي شَوَّالٍ، وَاثْنَتَانِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ[٢].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی نەکردووە تەنها سێ جار نەبێ: جارێکیان لە مانگی شەووال، دوو جاریشیان لە مانگی ذیل قەعدە.

**٩٧٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَرْمَلَةَ الأَسْلَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ فَقَالَ: أَعْتَمِرُ قَبْلَ أَنْ أَحُجَّ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: نَعَمْ، قَدِ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَحُجَّ[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەڕمەلەی ئەسلەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پیاوێك پرسیاری لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ کرد و گوتی: ئایا عومرە بکەم پێش ئەوەی حەج بکەم؟ سەعیدیش ﷺ گوتی: بەڵێ، بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ عومرەی کردووە بەر لەوەی حەج بکات.

**٩٧٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ اسْتَأْذَنَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أَنْ يَعْتَمِرَ فِي شَوَّالٍ، فَأَذِنَ لَهُ عَمَرُ ﷺ، فَاعْتَمَرَ، ثُمَّ قَفَلَ إِلَى أَهْلِهِ وَلَمْ يَحُجَّ[٤].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ داوای مۆڵەتی لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد بەوەی

---

(١) ـ تێبینی: ئەو ساڵە بۆیە ناوی لێتراوە ساڵی قەزییە، چونکە پێغەمبەری خوا دەربارەی ئەو ساڵە سوڵحی لەگەڵ قورەیش کرد کە ڕێگەی بدەن بێت بۆ بەیت، جا ناوەکە لەو قەزایەوە هاتووە کە بە مانای حوکم و صوڵح دێت، نەك ئەو قەزایەی بە مانای گێڕانەوە دێت (وەك لە شەڕحی زەرقانیدا هاتووە).

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٤؛ والحدثاني: ٥١٧أ؛ والشيباني: ٤٤٩، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٦؛ والحدثاني: ٥١٨أ، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٥؛ والحدثاني: ٥١٨؛ والشيباني: ٤٤٧، كلهم عن مالك به.

عومرە بكات لە مانگی شەووالدا، جا عومەر ﷺ مۆڵەتیدا و عومرەی كرد، دواتر گەڕایەوە بۆ لای خانەوادەكەی و حەجی نەكرد (كەواتە لای ئیمامی عومەر ﷺ دروست بووە عومرە بكرێت بەبێ حەج).

## ١٨- پچڕاندن و كۆتایی هێنان بە تەلبیە (لبيك اللهم لبيك...) لە عومرەدا[١]

**٩٧٥-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ فِي الْعُمْرَةِ إِذَا دَخَلَ الْحَرَمَ[٢].

واتە: لە هیشامی كوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە تەلبیە (واتا گوتنی: لبيك اللهم لبيك...)ـی وازلێهێناوە لە عومرەدا كاتێ چۆتە ناو حەرەم.

**٩٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِيمَنْ اعْتَمَرَ مِنَ التَّنْعِيمِ: أَنَّهُ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ حِينَ يَرَى الْبَيْتَ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی نیەتی عومرەی بەستووە لە تەنعیم (كە ئێستا بە مزگەوتی حەزرەتی عائیشە ﷺ بەناوبانگە) گوتویەتی: واز لە گوتنی (لبيك اللهم لبيك...) دێنێ لەو كاتەوەی بەیت دەبینێ.

**٩٧٧- [فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَعْتَمِرُ مِنْ بَعْضِ الْمَوَاقِيتِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ أَوْ غَيْرِهِمْ، مَتَى يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ؟ قَالَ: أَمَّا الْمُهِلُّ مِنَ الْمَوَاقِيتِ، فَإِنَّهُ يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ إِذَا انْتَهَى إِلَى الْحَرَمِ، قَالَ: وَبَلَغَنِي أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ[٤].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی ئەو كەسەی ئیحرامی عومرە دەبەستێت لە یەكێك لە میقات و شوێنەكانی ئیحرام بەستن لەكاتێكدا خەڵكی مەدینەیە یان خەڵكی شوێنێكی دیكەیە، كەی تەلبیە (لبيك اللهم لبيك

---

(١) ـ قَطْعُ التَّلْبِيَةِ فِي الْعُمْرَةِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢١، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٣، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٤، عن مالك به.




...) دەوەستێنێت؟ گوتی: هەرچی ئەو کەسەیە کە لە میقات و شوێنی دیاریکراوی ئیحرام ئیحرامی بەستووە، ئەوە واز لە تەلبیە دێنێت کاتێ گەیشتە حەرەم، گوتی: پێم گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ ئاوای دەکرد.

## ١٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەمەتتوع (واتە: ئەنجامدانی حەج دوای ئەوەی کەسەکە تەنها بۆ عومرە چووە دواتر دەمێنێتەوە تا کاتی حەج، ئینجا حەجیش ئەنجام دەدات)[١]

**٩٧٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ، وَالضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ ﷺ عَامَ حَجَّ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، وَهُمَا يَذْكُرَانِ التَّمَتُّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَقَالَ الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ ﷺ: لاَ يَصْنَعُ ذَلِكَ إِلاَّ مَنْ جَهِلَ أَمْرَ اللهِ ﷻ، فَقَالَ سَعْدٌ ﷺ: بِئْسَ مَا قُلْتَ يَا ابْنَ أَخِي، فَقَالَ الضَّحَّاكُ ﷺ: فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَدْ نَهَى عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ سَعْدٌ ﷺ: قَدْ صَنَعَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَصَنَعْنَاهَا مَعَهُ[٢].

واتە: لە ئیبن شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە بەوەی بۆی باس کردووە گوێی لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و زەححاکی کوڕی قەیس ﷺ بووە لەو ساڵەی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ حەجی کرد ئەو دووانە باسی تەمەتتوعی عومرەیان دەکرد بۆ حەج (واتە ئەنجامدانی حەج دوای عومرە)، جا زەححاکی کوڕی قەیس ﷺ گوتی: کەس شتی وا ناکات تەنها کەسێك نەبێت کە نەزان بێت بە فەرمانی خوا ﷻ، سەعدیش ﷺ گوتی: قسەیەکی خراپت گوت ئەی برازام، جا زەححاك ﷺ گوتی: (قسەکەم بۆ خراپە) خۆ عومەری کوڕی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي التَّمَتُّعِ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٧؛ والحدثاني: ٥١٩؛ والشيباني: ٣٩٦؛ والشافعي: ١٠٦٣؛ وابن حنبل: ١٥٠٣؛ والنسائي: ٢٧٣٤؛ والترمذي: ٨٢٣؛ وابن حبان: ٣٩٣٩؛ وأبو يعلى الموصلي: ٨٠٥؛ والقابسي: ٦٧، كلهم عن مالك به.





خەتتاب ﷺ نەهی لەوە کردووە، سەعدیش ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوە و ئێمەش لەگەڵ ئەو ئەنجامان داوە.

**٩٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: وَاللَّهِ، لأَنْ أَعْتَمِرَ قَبْلَ الْحَجِّ وَأُهْدِيَ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتَمِرَ بَعْدَ الْحَجِّ فِي ذِي الْحِجَّةِ(١).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتویەتی: سوێند بەخوا عومرە پێش حەج بکەم و ئاژەڵ سەرببڕم، لام خۆشەویستترە لەوەی عومرە لە دوای حەج بکەم لە مانگی ذیل حیججەدا.

**٩٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنِ اعْتَمَرَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ فِي شَوَّالٍ، أَوْ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، أَوْ فِي ذِي الْحِجَّةِ، قَبْلَ الْحَجِّ، ثُمَّ أَقَامَ بِمَكَّةَ حَتَّى يُدْرِكَهُ الْحَجُّ، فَهُوَ مُتَمَتِّعٌ، إِنْ حَجَّ، وَعَلَيْهِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ(٢).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ إِذَا أَقَامَ حَتَّى الْحَجِّ، ثُمَّ حَجَّ مِنْ عَامِهِ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك عومرە بەر لە حەج ئەنجام بدات لە مانگەکانی حەجدا، لە شەووال بێت یان لە ذیل قەعدە یان لە ذیل حیججە، دواتر بمێنێتەوە لە مەککە تا کاتی حەج دێت، ئەوە تەمەتتوعە، ئەگەر حەجی کرد ئەوە هەدی (قوربانی) لەسەرە بەگوێرەی بۆسوڕان و باری دارایی خۆی، جا ئەگەر نەیبوو ئەوە دەبێ سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت و حەوت ڕۆژیش کاتێ دەگەڕێتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: ئەوە لەوکاتەیە ئەگەر مایەوە تا کاتی حەج و لە هەمان ساڵدا حەجی کرد.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٨؛ والحدثاني: ٥١٩أ؛ والشيباني: ٤٤٨؛ والشافعي: ١٠٦٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٠٩؛ والحدثاني: ٥٢٠؛ والشيباني: ٤٥١، كلهم عن مالك به.




٩٨١- **[فتوى]** وَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ انْقَطَعَ إِلَى غَيْرِهَا، وَسَكَنَ سِوَاهَا، ثُمَّ قَدِمَ مُعْتَمِرًا فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، ثُمَّ أَقَامَ بِمَكَّةَ حَتَّى أَنْشَأَ الْحَجَّ مِنْهَا: إِنَّهُ مُتَمَتِّعٌ يَجِبُ عَلَيْهِ الْهَدْيُ أَوِ الصِّيَامُ إِنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا، وَأَنَّهُ لاَ يَكُونُ مِثْلَ أَهْلِ مَكَّةَ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك لە خەڵکی مەککە کە لە مەککە دەرچوبێت بۆ جێگەیەکی دیکە و لەو شوێنە نیشتەجێ بێ دواتر لە مانگی حەج بە عومرەکاری بێت، دواتر لە مەککە بمێنێتەوە تاوەکو دەست بە حەج دەکات تیایدا، گوتویەتی: ئەوە موتەمەتیعە هەدی لەسەر واجبە، یانیش ڕۆژووی لەسەر واجبە ئەگەر توانای هەدی و ئاژەڵی نەبوو، جا بە دڵنیایی ئەو وەکو خەڵکی مەککە نیە (حوکمی جیاوازە، چونکە لە شوێنێکی دیکە نیشتەجێیە).

٩٨٢- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ مِنْ غَيْرِ أَهْلِ مَكَّةَ، دَخَلَ مَكَّةَ بِعُمْرَةٍ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، وَهُوَ يُرِيدُ الإِقَامَةَ بِمَكَّةَ حَتَّى يُنْشِئَ الْحَجَّ، أَمُتَمَتِّعٌ هُوَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، هُوَ مُتَمَتِّعٌ، وَلَيْسَ هُوَ مِثْلَ أَهْلِ مَكَّةَ، وَإِنْ أَرَادَ الإِقَامَةَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ دَخَلَ مَكَّةَ، وَلَيْسَ مِنْ أَهْلِهَا، وَإِنَّمَا الْهَدْيُ أَوِ الصِّيَامُ عَلَى مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، وَأَنَّ هَذَا الرَّجُلَ يُرِيدُ الإِقَامَةَ، وَلاَ يَدْرِي مَا يَبْدُو لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ، وَلَيْسَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێکی غەیری مەککە کە بە نیەتی عومرە لە مانگەکانی حەجدا دەچێتە مەککە، لەکاتێکدا دەیەوێت لە مەککە بمێنێتەوە تاوەکو دەست بە حەج بکات، ئایا ئەوە موتەمەتیعە؟ گوتی: بەڵێ موتەمەتیعە و ئەو وەکو خەڵکی مەککە نیە هەر چەندە بشیەوێت بمێنێتەوە، چونکە ئەو هاتۆتە مەککە و خەڵکی مەککە نیە، جا هەدی یان ڕۆژوو لەسەر ئەو کەسانەیە کە خەڵکی مەککە نین، ئەو کەسەش (کە باس کرا) ویستویەتی بمێنێتەوە و نازانێ لەمەودوا چی بۆ دێتە پێش و خەڵکی مەککەش نیە (کەواتە حوکمی موتەمەتیع وەردەگرێت و حیسابی خەڵکی مەککەی بۆ ناکرێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١٢، عن مالك به.




**٩٨٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: مَنِ اعْتَمَرَ فِي شَوَّالٍ، أَوْ ذِي الْقِعْدَةِ، أَوْ ذِي الْحِجَّةِ، ثُمَّ أَقَامَ بِمَكَّةَ حَتَّى يُدْرِكَهُ الْحَجُّ، فَهُوَ مُتَمَتِّعٌ، إِنْ حَجَّ، وَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ(١).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ بووە دەیگوت: هەر کەسێك عومرە بکات لە مانگی شەووال یان مانگی ذیل قیعدە یان ذیل حیججە، دواتر لە مەککە بمێنێتەوە تاوەکو کاتی حەج دێت، ئەوە موتەمەتتیعە ئەگەر حەج بکات، (جا لەسەری واجبە) ئاژەڵێك بکاتە قوربانی کە بۆی بگونجێت (بە پێی دەرامەتەکەی بێت)، جا ئەوەی نەیبوو با سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت و حەوت ڕۆژیش کاتێ گەڕایەوە (کە دەکاتە دە ڕۆژ وەك لە ئایەتدا هاتووە).

## ٢٠- ئەو شێوازەی تەمەتتوعی تێدا نایەتەجێ(٢)

**٩٨٤-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اعْتَمَرَ فِي شَوَّالٍ، أَوْ ذِي الْقَعْدَةِ، أَوْ ذِي الْحِجَّةِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ، ثُمَّ حَجَّ مِنْ عَامِهِ ذَلِكَ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ هَدْيٌ، إِنَّمَا الْهَدْيُ عَلَى مَنِ اعْتَمَرَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، ثُمَّ أَقَامَ حَتَّى الْحَجِّ، ثُمَّ حَجَّ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: هەر کەسێك لە مانگی شەووال یان مانگی ذیل قەعدە یان ذیل حیججە عومرە بکات، دواتر بگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەکەی، دواتر حەج بکات لە هەمانساڵدا، ئەوە هەدی لەسەر نیە، چونکە هەدی تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە عومرە دەکات لە مانگەکانی حەجدا و دواتر دەمێنێتەوە تاوەکو کاتی حەج و حەج دەکات.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١٠؛ والحدثاني: ٥٢٠أ؛ والشيباني: ٤٥٤، كلهم عن مالك به.
(٢) ـ مَا لَا يَجِبُ فِيهِ التَّمَتُّعُ.




٩٨٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ مَنِ انْقَطَعَ إِلَى مَكَّةَ مِنْ أَهْلِ الآفَاقِ وَسَكَنَهَا، ثُمَّ اعْتَمَرَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، ثُمَّ أَنْشَأَ الْحَجَّ مِنْهَا، فَلَيْسَ بِمُتَمَتِّعٍ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ هَدْيٌ وَلاَ صِيَامٌ، وَهُوَ بِمَنْزِلَةِ أَهْلِ مَكَّةَ إِذَا كَانَ مِنْ سَاكِنِيهَا(١).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: گشت ئەو کەسانەی هاتوون بۆ مەککە لە خەڵکی شوێنە دورەکان و تیایدا دەمێننەوە (نایانەوێ چیتر مەککە جێبێڵن)، دواتر عومرە دەکەن لە مانگەکانی حەجدا، دواتر دەست بە حەج دەکەن تیایدا، ئەوە موتەمەتتیع نیە، نە هەدی و نە ڕۆژووشی لەسەر واجب نیە، ئەوە وەك خەڵکی مەککە وایە کە نیشتەجێیەتی (مادەم دەبێتە نیشتەجێی مەککە).

٩٨٦- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، خَرَجَ إِلَى الرِّبَاطِ أَوْ إِلَى سَفَرٍ مِنَ الأَسْفَارِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مَكَّةَ، وَهُوَ يُرِيدُ الإِقَامَةَ بِهَا، كَانَ لَهُ أَهْلٌ بِمَكَّةَ أَوْ لاَ أَهْلَ لَهُ بِهَا، فَدَخَلَهَا بِعُمْرَةٍ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، ثُمَّ أَنْشَأَ الْحَجَّ، وَكَانَتْ عُمْرَتُهُ الَّتِي دَخَلَ بِهَا مِنْ مِيقَاتِ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ دُونَهُ، أَمُتَمَتِّعٌ مَنْ كَانَ عَلَى تِلْكَ الْحَالَةِ؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَيْهِ مَا عَلَى الْمُتَمَتِّعِ مِنَ الْهَدْيِ أَوِ الصِّيَامِ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: {ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ}(٢).

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك لە خەڵکی مەککە کە دەربچێت بۆ حەڕەسیاتی دەوڵەتی ئیسلامی لە پێناوی خوا، یان بچێت بۆ سەفەرێك لە سەفەرەکان دواتر بگەڕێتەوە بۆ مەککە لەکاتێکدا دەیەوێت تیایدا بمێنێتەوە، جا (چۆنیەکە) خزم و کەسی لە مەککە هەبێ یان نەیبێ، جا بە نیەتی عومرە لە مانگەکانی حەجدا بچێتە ناو مەککە، دواتر دەست بە حەج بکات، جا ئەو عومرەی چۆتە ناویەوە لەو میقات و شوێنانە بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە یان نزیکتر بێت، ئایا کەسەکە موتەمەتتیع حیسابە بەو حاڵەتەوە؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەوەی لەسەر نیە کە لەسەر کەسی موتەمەتتیعە لە هەدی و ڕۆژوو، ئەوەش لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرمویەتی:

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١٦؛ وفي: ١١١٧؛ وفي: ١١٢٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١١٨، عن مالك به.

{ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ} واتە: [ئەمە بۆ کەسێکە کە خۆی و کەسوکاری دانیشتووی دەوروبەری «مسجد الحرام» نەبێت].

## ٢١- ئەوەی هاتووە دەربارەی عومرە[1]

٩٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: عومرە بۆ عومرەیێکی تر کەفارەتی تاوانەکانی نێوانیانە، حەجی مەبرووریش (کە ئەو حەجەیە بۆ ڕیایی و ناوبانگ نەبێت و قسەی پوچ و جنێوی تیا نەبێت و بە پارەی حەڵاڵ بێت) هیچ پاداشتێکی نیە جگە لە بەهەشت.

٩٨٨- عَنْ سُمَيٍّ، مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀ يَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ كُنْتُ تَجَهَّزْتُ لِلْحَجِّ، فَاعْتَرَضَ لِي، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: اعْتَمِرِي فِي رَمَضَانَ، فَإِنَّ عُمْرَةً فِيهِ كَحِجَّةٍ[3].

واتە: لە سومەیی خزمەتکاری ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێبیستی ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﵀ بووە دەیگوت: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: من خۆم ئامادە کردبوو بۆ حەج، جا بەربەستێکم هاتە پێش (ئێستا ناتوانم ئەنجامی بدەم، جا چی بکەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: لە ڕەمەزان عومرە بکە، چونکە عومرە لە ڕەمەزاندا (پاداشتەکەی) وەك حەجێك وایە.

---

(١) ـ جَامِعُ مَا جَاءَ فِي الْعُمْرَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٥؛ والحدثاني: ٥٢١؛ وابن حنبل: ٩٩٤٩؛ والبخاري: ١٧٧٣؛ ومسلم: المناسك: ٤٣٧؛ والنسائي: ٢٦٢٩؛ وابن ماجه: ٢٩٢٠؛ وأبو يعلى الموصلي: ٦٦٥٧؛ والقابسي: ٤٣٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٦؛ والحدثاني: ٥٢١أ؛ والشيباني: ٤٥٠، كلهم عن مالك به.




**٩٨٩**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: افْصِلُوا بَيْنَ حَجِّكُمْ وَعُمْرَتِكُمْ، فَإِنَّ ذَلِكَ أَتَمُّ لِحَجِّ أَحَدِكُمْ، وَأَتَمُّ لِعُمْرَتِهِ أَنْ يَعْتَمِرَ فِي غَيْرِ أَشْهُرِ الْحَجِّ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتویەتی: نێوان بخەنە بەینی حەج و عومرەکانتان، چونکە ئاوا تەواوتر و کامڵترە بۆ حەجی هەریەك لە ئێوە، وە تەواوتر و کامڵتر بۆ عومرەکەی ئەوەیە عومرە بکات لە جگە لە مانگەکانی حەجدا.

**٩٩٠- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﵁ كَانَ إِذَا اعْتَمَرَ، رُبَّمَا لَمْ يَحْطُطْ عَنْ رَاحِلَتِهِ حَتَّى يَرْجِعَ[٢].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ کاتێ عومرەی دەکرد، جاری وا هەبوو لە سواریەکەی نەدەهاتە خوارەوە تا دەگەڕایەوە (واتە لە مەککە نەدەمایەوە و دوای تەواوکردنی عومرە خۆی تاخیر نەدەکرد و زوو دەگەڕایەوە مەدینە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان).

**٩٩١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الْعُمْرَةُ سُنَّةٌ، وَلاَ نَعْلَمُ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَرْخَصَ فِي تَرْكِهَا[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتویەتی: عومرە سوننەتە و، نەشمزانیوە کەسێك لە موسوڵمانان ڕێگەی بە نەکردن و تەرککردنی دابێت.

**٩٩٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلاَ أَرَى لأَحَدٍ أَنْ يَعْتَمِرَ فِي السَّنَةِ مِرَارًا[٤].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتویەتی: فەتوا نادەم بۆ هیچ کەسێك بەوەی چەند جارێك عومرە بکات لە هەمان ساڵدا.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٧؛ والحدثاني: ٥٢١ب؛ والشيباني: ٣٩٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٢٨، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٠، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣١، عن مالك به.




**٩٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُعْتَمِرِ يَقَعُ بِأَهْلِهِ: إِنَّ عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ الْهَدْيَ، وَعُمْرَةً أُخْرَى، يَبْتَدِئُ بِهَا بَعْدَ إِتْمَامِهِ الَّتِي أَفْسَدَ، وَيُحْرِمُ مِنْ حَيْثُ أَحْرَمَ بِعُمْرَتِهِ الَّتِي أَفْسَدَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَحْرَمَ مِنْ مَكَانٍ أَبْعَدَ مِنْ مِيقَاتِهِ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُحْرِمَ إِلاَّ مِنْ مِيقَاتِهِ(١).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو عومرەكارەی توشی جیماع دەبێت لەگەڵ خێزانەكەی، گوتویەتی: لەو بابەتەدا هەدی و عومرەیێكی تری لەسەر واجبە، (عومرەكەش) دەستپێدەكات دوای تەواوكردنی ئەو عومرەی فاسیدی كردووە و هەڵیوەشاندۆتەوە (بەو جیماع كردنە)، وە لەو شوێنەوە ئیحرامی عومرەكەی دەبەستێت كە لێوەی ئیحرامی بەستبوو بۆ ئەو عومرەیەی كە فاسیدی كردووە، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە ئیحرامی بەستبێت لە شوێنێكی دورتر لە میقات و شوێنی ئیحرامبەستنی ڕەوای خۆی (كە لە فەرموودەكان باسكرا)، ئەو كات لەسەری واجب نیە ئیحرام ببەستێت تەنها لە شوێن و میقاتی خۆی نەبێت (كە دیاریكراوە).

**٩٩٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ دَخَلَ مَكَّةَ بِعُمْرَةٍ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَهُوَ جُنُبٌ أَوْ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ، ثُمَّ وَقَعَ بِأَهْلِهِ، ثُمَّ ذَكَرَ، قَالَ: يَغْتَسِلُ أَوْ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَعُودُ فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَيَعْتَمِرُ عُمْرَةً أُخْرَى، وَيُهْدِي، وَعَلَى الْمَرْأَةِ إِذَا أَصَابَهَا زَوْجُهَا وَهِيَ مُحْرِمَةٌ، مِثْلُ ذَلِكَ(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتویەتی: هەر كەسێك هاتە ناو مەككە و تەوافی بەیتی كرد و لە نێوان صەفا و مەڕوە ڕایكرد، لەكاتێكدا جەنابەتدار بوو یان بێ دەستنوێژ بوو، دواتر توشی جیماع بوو لەگەڵ خێزانەكەی، جا (ئیمامی مالیك) باسی كرد و (حوكمی ئەو كەسەی بەو شێوەیە ڕون كردەوە و) گوتی: خۆی دەشۆرێت (ئەگەر لەشگران بێت) یان دەستنوێژ دەشۆرێت (ئەگەر تەنها بێ دەستنوێژ بێت)، دواتر دەگەڕێتەوە و تەوافی بەیت دەكات و لە نێوان صەفا و مەڕوە ڕادەكات (چونكە تەواف و ڕاكردنەكەی نێوان صەفا و مەڕوە بەتاڵ بۆتەوە)

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٤، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٥، عن مالك به.




وە عومرەیێکی تر دەکات (چونکە ئەوەی پێشووی هەڵوەشاوەتەوە)، وە هەمان شت لەسەر ئەو ئافرەتەش واجبە کە مێردەکەی جیماعی لەگەڵ کردووە ئەگەر ئافرەتەکەش بە هەمان شێوە موحریم بێت.

**٩٩٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَأَمَّا الْعُمْرَةُ مِنَ التَّنْعِيمِ، فَإِنَّهُ مَنْ شَاءَ أَنْ يَخْرُجَ مِنَ الْحَرَمِ ثُمَّ يُحْرِمَ، فَإِنَّ ذَلِكَ مُجْزِئٌ عَنْهُ إِنْ شَاءَ اللهُ، وَلَكِنِ الْفَضْلُ أَنْ يُهِلَّ مِنَ الْمِيقَاتِ الَّذِي وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَوْ مَا هُوَ أَبْعَدُ مِنَ التَّنْعِيمِ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی عومرە بەستن لە تەنعیمدا گوتویەتی: هەر کەسێك ویستی لە حەرەم دەربچێت دواتر ئیحرام ببەستێت، إن شاءالله بەردەکەوێت و بۆی دروستە، بەڵام چاکتر وایە لەو شوێن و میقاتە ئیحرام ببەستێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری کردووە، یان ئەو میقاتەی دورترە لە تەنعیم.

## ٢٢- هاوسەرگیری کەسی موحریم[2]

**٩٩٦-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ أَبَا رَافِعٍ مَوْلَاهُ، وَرَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَزَوَّجَاهُ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ[3].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو ڕافیعی خزمەتکاری خۆی و پیاوێکی لە ئەنصارەکان نارد و، مەیمونەی کچی حاریسیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ مارەکرد، لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە بوو بەر لەوەی دەربچێت (بۆ قەزاکردنەوەی عومرە).

**٩٩٧-** عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ ﵀، أَخِي بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ أَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ ﵀، وَأَبَانُ يَوْمَئِذٍ أَمِيرُ الْحَاجِّ، وَهُمَا مُحْرِمَانِ، إِنِّي قَدْ أَرَدْتُ أَنْ أُنْكِحَ طَلْحَةَ بْنَ عُمَرَ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٣، عن مالك به.

(٢) ـ نِكَاحُ الْمُحْرِمِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٦؛ وفي: ١٥٣٦؛ والحدثاني: ٣٣١؛ وفي: ٥٦٤؛ والشافعي: ٨٧٨؛ وفي: ١٢٥٣، كلهم عن مالك به.

بِنْتَ شَيْبَةَ بْنِ جُبَيْرٍ، وَأَرَدْتُ أَنْ تَحْضُرَ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ أَبَانُ، وَقَالَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يُنْكَحْ، وَلاَ يَخْطُبُ[1].

واتە: لە نوبەیهی کوڕی وەهبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عومەری کوڕی عوبەیدوڵلا (نوبەیە)ی نارد بۆ لای ئەبانی کوڕی عوسمان ﷺ، لەکاتێکدا ئەبان لەو ڕۆژگارەدا پێشەوای حاجیەکان بوو و هەردوکیان لە ژێر ئیحرامدا بوون، (گوتی): من دەمەوێ کچی شەیبەی کوڕی جوبەیر مارەبکەم بۆ (کوڕەکەم، کە) تەڵحەی کوڕی عومەرە، جا دەمەوێ تۆش ئامادەبی، جا ئەبان ڕازی نەبونی خۆی دەربڕی و گوتی: گوێم لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بووە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: کەسی موحریم نە مارەکردن بۆ خۆی ئەنجام دەدات و نە بۆشی مارەدەکرێ و نە خوازبێنیش دەکات.

٩٩٨- عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّ أَبَا غَطَفَانَ بْنَ طَرِيفٍ الْمُرِّيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَاهُ طَرِيفًا تَزَوَّجَ امْرَأَةً وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَرَدَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ نِكَاحَهُ[2].

واتە: لە داودی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش ئەبو غەتەفانی کوڕی تەریفی موڕڕی ﷺ پێی ڕاگەیاندووە بەوەی تەڕیفی باوکی ئافرەتێکی هێنا و لەخۆی مارەکرد لەکاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نیکاحەکەی ڕەت کردەوە.

٩٩٩- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَنْكِحِ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يَخْطُبُ عَلَى نَفْسِهِ، وَلاَ عَلَى غَيْرِهِ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٧؛ وفي: ١٥٣٧؛ والحدثاني: ٣٣١أ؛ وفي: ٥٦٥؛ والشيباني: ٤٣٦؛ والشافعي: ٨٧٧؛ وفي: ١٢٥١؛ وابن حنبل: ٤٠١، وفي: ٥٣٤؛ ومسلم: النكاح: ٤١؛ والنسائي: ٢٨٤٢، وفي: ٢٨٤٣، وفي: ٣٢٧٥، وفي: ٣٢٧٥؛ وأبو داود: ١٨٤١؛ وابن ماجه: ١٩٧٤؛ وابن حبان: ٤١٢٣، وفي: ٤١٣٩؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٤٣، وفي: ٦٩٣؛ والقابسي: ٢٦٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٨؛ وفي: ١٥٣٨؛ والحدثاني: ٣٣٢؛ وفي: ٥٦٥أ؛ والشيباني: ٤٣٨؛ والشافعي: ١٢٥٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٩؛ وفي: ١٥٤١؛ والحدثاني: ٣٣٢أ؛ وفي: ٥٦٥ب، عن مالك به.




واتە: لە نافعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: کەسی موحریم مارەبڕین بۆ خۆی ئەنجام نادات، وە بۆ خۆیشی خوازبێنی ناکات و بۆ جگە لە خۆیشی ئەنجامی نادات.

**١٠٠٠-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ سُئِلُوا عَنْ نِكَاحِ الْمُحْرِمِ؟ فَقَالُوا: لاَ يَنْكِحِ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُنْكِحُ[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییەب و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێکرا دەربارەی مارەبڕینی کەسی موحریم؟ گوتیان: کەسی موحریم نە مارەبڕین بۆ خۆی ئەنجام دەدات و نە بۆ کەسانی تریش مارەبڕین ئەنجام دەدات.

**١٠٠١-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ الْمُحْرِمِ: إِنَّهُ يُرَاجِعُ امْرَأَتَهُ إِنْ شَاءَ، إِذَا كَانَتْ فِي عِدَّةٍ مِنْهُ.

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوی موحریم گوتوویەتی: ئەگەر ویستی بۆی هەیە خێزانەکەی بگەڕێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی (ئەگەر یەك تەڵاق یان دوو تەڵاقی دابوو)، بە مەرجێك ئەگەر ئافرەتەکە هێشتا لەناو عیددەی پیاوەکەی مابوو.

## ٢٣- کەڵەشاخکردنی کەسی موحریم[٢]

**١٠٠٢-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَوْقَ رَأْسِهِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِلَحْيَيْ جَمَلٍ، مَكَانٌ بِطَرِيقِ مَكَّةَ[٣].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٠؛ وفي: ١٥٣٩؛ والحدثاني: ٣٣٢ب؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٩٢٨٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ حِجَامَةُ الْمُحْرِمِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٩؛ والحدثاني: ٥٧٩؛ والشيباني: ٥٢١، عن مالك به.




واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەریدا کەڵەشاخی کرد لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا لەو ڕۆژەدا لە «لەحیەی جەمەل» بوو، کە شوێنێکە لە سەر ڕێگەی مەککە.

**١٠٠٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَحْتَجِمُ الْمُحْرِمُ إِلاَّ أَنْ يَضْطَرَّ إِلَيْهِ، مِمَّا لاَ بُدَّ لَهُ مِنْهُ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: کەسی موحریم نابێ کەڵەشاخ بکات، تەنها لەو کاتە نەبێت کە ناچار بێت و پێویستی پێی بێت.

**١٠٠٤-** [**فتوى**] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَحْتَجِمُ الْمُحْرِمُ إِلاَّ مِنْ ضَرُورَةٍ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کەسی موحریم کەڵەشاخ ناکات تەنها بۆ زەڕورەت و پێویستی نەبێت.

## ٢٤- ئەوەی دروستە کەسی موحریم بیخوات لە نێچیردا[٣]

**١٠٠٥-** عَنْ نَافِعٍ، مَوْلَى أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ، تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَى حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَاسْتَوَى عَلَى فَرَسِهِ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ، فَأَبَوْا عَلَيْهِ، فَسَأَلَهُمْ رُمْحَهُ، فَأَبَوْا، فَأَخَذَهُ، ثُمَّ شَدَّ عَلَى الْحِمَارِ، فَقَتَلَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأَبَى بَعْضُهُمْ، فَلَمَّا أَدْرَكُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ، سَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللهُ[٤].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٠؛ والحدثاني: ٥٧٩أ؛ والشيباني: ٤١٦؛ والشيباني: ٥٢٢؛ والشافعي: ١٠٥٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩١، عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَجُوزُ لِلْمُحْرِمِ أَكْلُهُ مِنَ الصَّيْدِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٦؛ والحدثاني: ٥٧٠؛ والشيباني: ٤٤٣؛ والشافعي: ٩٠٣؛ وابن حنبل: ٢٢٦٢٠؛ والبخاري: ٢٩١٤، وفي: ٥٤٩٠؛ ومسلم: المناسك: ٥٧؛ والنسائي: ٢٨١٦؛ وأبو داود: ١٨٥٢؛ والترمذي: ٨٤٧؛ وابن حبان: ٣٩٧٥؛ والقابسي: ٤٢٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعی خزمەتکاری ئەبو قەتادەی ئەنصارییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئەبو قەتادەوە ﵁ گێڕاویەتەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە، تاوەکوو گەیشتن بە ڕێگایەکی مەککە لەگەڵ هەندێ هاوەڵی خۆی دوا کەوت کە ئەوان موحریم بوون و لەژێر ئیحڕامدا بوون، بەڵام خۆی موحریم نەبوو، جا کەرەکێوییەکی بینی و چووە سەر پشتی ئەسپەکەی و داوای لە هاوەڵەکانی کرد قامچییەکەی خۆی بدەنە دەست، ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، جا داوای ڕمەکەی خۆی لێ کردن، هەر پێیان نەدا (چونکە لەژێر ئیحڕامدا بوون و بۆیان دروست نییە بەژداری بکەن لە ڕاوکردن)، جا خۆی ڕمەکەی هەڵگرت و لە کەرەکێوییەکەی گیر کرد و کوشتی (ڕاوی کرد)، جا هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان خوارد و هەندێکی دیکەش نەیانخوارد (لە ترسی ئیحڕام)، جا کاتێ گەیشتن بە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لێکرد دەربارەی ئەوە (کە ئاخۆ دروستە هەندێك خواردوویانە)، ئەویش فەرمووی: ئەوە خواردنێکە خوای پەروەردگار پێی بەخشیون (مادەم خۆیان دەستیان لە ڕاوکردنەکەدا نەبووە کێشە نییە).

**١٠٠٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ الزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ ﵁ كَانَ يَتَزَوَّدُ صَفِيفَ الظِّبَاءِ فِي الإِحْرَامِ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالصَّفِيفُ الْقَدِيدُ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): زوبەیری کوڕی عەووام ﵁ صەفیفی ئاسکی دەکرد بە زاد و زەخیرەی ڕێگەی حەج لە ئیحڕامدا.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: صەفیف گۆشتی وشککراوەیە.

**١٠٠٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵀، أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ ﵀ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁، فِي الْحِمَارِ الْوَحْشِيِّ، مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي النَّضْرِ، إِلاَّ أَنَّ فِي حَدِيثِ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: هَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ؟[٢].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٨؛ والشيباني: ٤٤٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٧؛ والشافعي: ٩٠٤؛ وابن حنبل: ٢٢٦٢١؛ والبخاري: ٥٤٩١؛

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عەتائی کوڕی یەسار ﷺ لە ئەبو قەتادەوە ﷺ دەربارەی کەرەکێوی هەواڵی داوە بە هەمان فەرموودەی ئەبو نەزر (واتە فەرموودەی ژمارە ١٠٠٥)، تەنها ئەوەندە نەبێت لە فەرموودەی زەیدی کوڕی ئەسلەم (ئەوەندەشی تیایە): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئایا هیچ لە گۆشتەکەیتان لایە؟ (تا خۆیشی لێی بخوات).

**١٠٠٨**- عَنِ الْبَهْزِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ يُرِيدُ مَكَّةَ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالرَّوْحَاءِ، إِذَا حِمَارٌ وَحْشِيٌّ عَقِيرٌ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: دَعُوهُ، فَإِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ صَاحِبُهُ، فَجَاءَ الْبَهْزِيُّ، وَهُوَ صَاحِبُهُ، إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، شَأْنَكُمْ بِهَذَا الْحِمَارِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ، فَقَسَمَهُ بَيْنَ الرِّفَاقِ، ثُمَّ مَضَى، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالأُثَابَةِ بَيْنَ الرُّوَيْثَةِ وَالْعَرْجِ، إِذَا ظَبْيٌ حَاقِفٌ فِي ظِلٍّ فِيهِ سَهْمٌ، فَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ رَجُلاً أَنْ يَقِفَ عِنْدَهُ، لاَ يَرِيبُهُ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ، حَتَّى يُجَاوِزَهُ[1].

واتە: لە بەهزییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو مەبەستی بوو بچێتە مەککە، لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، لەناکاو (هاوەڵەکانی) کەرەکێوییەکی سەربڕاویان بینی، جا ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: وازی لێ بێنن، چونکە ڕەنگە خاوەنەکەی بگەڕێتەوە، جا بەهز ﷺ کە خاوەنەکەی بوو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵی خۆتان چ لەو کەرەکێوییە دەکەن وای لێ بکەن (با بۆ ئێوە بێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبو بەکر کرد و دابەشی کرد بەسەر هاوەڵەکاندا، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا گەیشتە ئەسابە لە نێوان ڕوەیسە و عەرج، لەوێ ئاسکێك لەژێر سێبەرێك سەری خستبووە ناو قاچەکانی و تیرێکی پێوە بوو (بریندار بوو)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پیاوێك کرد لەلای ئاسکەکە بوەستێ،

ومسلم: المناسك: ٥٨؛ والترمذي: ٨٤٨؛ والقابسي: ١٧٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٩؛ والحدثاني: ٥٧٢؛ والنسائي: ٢٨١٨؛ وابن حبان: ٥١١١؛ والقابسي: ٤٩٢، كلهم عن مالك به.




تاوەکوو هیچ کەسێك لە موحریمەکان دەستی لێ نەدەن و نەیڕەوێننەوە تاوەکوو لێی تێپەڕ دەبێ (چونکە کەسی موحریم نابێ ئاژەڵ بترسێنێ و بیڕەوێنێتەوە).

١٠٠٩- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ أَقْبَلَ مِنَ الْبَحْرَيْنِ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالرَّبَذَةِ، وَجَدَ رَكْبًا مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ مُحْرِمِينَ، فَسَأَلُوهُ عَنْ لَحْمِ صَيْدٍ وَجَدُوهُ عِنْدَ أَهْلِ الرَّبَذَةِ، فَأَمَرَهُمْ بِأَكْلِهِ، قَالَ: ثُمَّ إِنِّي شَكَكْتُ فِيمَا أَمَرْتُهُمْ بِهِ، فَلَمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: مَاذَا أَمَرْتَهُمْ بِهِ؟ فَقَالَ: أَمَرْتُهُمْ بِأَكْلِهِ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: لَوْ أَمَرْتَهُمْ بِغَيْرِ ذَلِكَ لَفَعَلْتُ بِكَ، يَتَوَاعَدُهُ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە لە بەحڕەینەوە دەهاتەوە، تاوەکوو گەیشتە ڕەبزە (کە شوێنێکی نزیکی مەدینەیە) کاروانێکی خەڵکی عێراقی بینی موحریم بوون (لەژێر ئیحرامدا بوون)، جا کاروانەکە پرسیاریان لە ئەبو هوڕەیڕە ﷺ کرد دەربارەی گۆشتی نێچیرێك کە دەستیان کەوتبوو لەلای خەڵکی ڕەبزە، جا ئەویش فەرمانی پێ کردن بە خواردنی، ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: دواتر گومانم بۆ دروست بوو لەوەی فەرمانم پێکردن، جا کاتێ گەیشتمەوە مەدینە ئەوەم بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باس کرد، عومەریش ﷺ گوتی: فەرمانی چیت پێکردوون؟ ئەویش گوتی: فەرمانم پێ کردن بە خواردنی، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: ئەگەر فەرمانت پێ کردبان بە جگە لەوە ئاوا و ئاوام لێ دەکردی، هەڕەشەی لێکرد (واتە فەتواکەت تەواوە، ئەگەر فەتوای هەڵەت بۆ بدابان تەمێم دەکردی).

١٠١٠- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يُحَدِّثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ مَرَّ بِهِ قَوْمٌ مُحْرِمُونَ بِالرَّبَذَةِ، فَاسْتَفْتَوْهُ فِي لَحْمِ صَيْدٍ، وَجَدُوا نَاسًا أَحِلَّةً يَأْكُلُونَهُ، فَأَفْتَاهُمْ بِأَكْلِهِ، قَالَ: ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: بِمَ أَفْتَيْتَهُمْ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: أَفْتَيْتُهُمْ بِأَكْلِهِ، قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لَوْ أَفْتَيْتَهُمْ بِغَيْرِ ذَلِكَ لأَوْجَعْتُكَ[2].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٠؛ والحدثاني: ٥٧٣، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤١؛ والحدثاني: ٥٧٤؛ والشيباني: ٤٤٢، عن مالك به.

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بووە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە کە خەڵکانێکی موحریم لە ڕەبزە بەلایدا تێ پەڕیون و پرسیاریان لێکردووە دەربارەی گۆشتی نێچیر کە بینیویانە خەڵکانێك دەیخۆن کە لەژێر ئیحرامدا نین (بەوەی ئاخۆ بۆ ئەوانیش دروستە لەگەڵیان بخۆن)، ئەویش فەتوای بۆ دان بە خواردنی، ئیبنو عومەر ﷺ گوتوویەتی: دواتر هاتمە لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مەدینە و پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەوە (کە ئاخۆ فەتواکەم ڕاستە)، ئەویش گوتی: بە چی فەتوات بۆ دان؟ منیش گوتم: فەتوام بۆ دان بە خواردنی، دەڵێ: جا عومەر ﷺ گوتی: ئەگەر جگە لەو فەتوایە فەتوایەکی دیکەت دابا ئەوە ئازارم دەدای.

**١٠١١-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ كَعْبَ الأَحْبَارِ ﷺ أَقْبَلَ مِنَ الشَّامِ فِي رَكْبٍ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، وَجَدُوا لَحْمَ صَيْدٍ، فَأَفْتَاهُمْ كَعْبٌ بِأَكْلِهِ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: مَنْ أَفْتَاكُمْ بِهَذَا؟ قَالُوا: كَعْبٌ ﷺ، قَالَ: فَإِنِّي قَدْ أَمَّرْتُهُ عَلَيْكُمْ حَتَّى تَرْجِعُوا، ثُمَّ لَمَّا كَانُوا بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ، مَرَّتْ بِهِمْ رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، فَأَفْتَاهُمْ كَعْبٌ ﷺ أَنْ يَأْخُذُوهُ، فَيَأْكُلُوهُ، فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ ذَكَرُوا لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ أَنْ أَفْتَيْتَهُمْ بِهَذَا؟ قَالَ: هُوَ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ، قَالَ: وَمَا يُدْرِيكَ؟ قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنْ هِيَ إِلاَّ نَثْرَةُ حُوتٍ يَنْثُرُهُ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّتَيْنِ[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کەعبی ئەحبار ﷺ لەگەڵ کاروانێك لە شامەوە هات تا گەیشتن بە یەکێك لە ڕێگاکان، جا گۆشتی نێچیریان دەست کەوت (کە خەڵکی دیکە ڕاویان کردبوو)، کەعبیش ﷺ فەتوای بۆ دان بە خواردنی، دەڵێ: جا کاتێ هاتن بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مەدینە، ئەوەیان بۆ باس کرد، ئەویش گوتی: کێ فەتوای بەوە بۆ دان؟ گوتیان: کەعب، عومەریش ﷺ گوتی: ئەوە من کردم بە گەورەتان تا دەگەڕێنەوە (لە سەفەری حەج)، جا کاتێ لە یەکێك لە ڕێگەکانی مەککە بوون، شەپۆل و کۆمەڵێك لە کللۆ بەلایاندا تێ پەڕین، جا کەعب فەتوای بۆ دان بەوەی بیانگرن و بیانخۆن، ئینجا کاتێ

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٢؛ والحدثاني: ٥٧٥؛ والشيباني: ٤٤٤، كلهم عن مالك به.




هاتنەوە بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ئەوەیان بۆ باس كرد، ئەویش گوتی: چی وای لێ كردی كە فەتوایان بەوە بۆ بدەی؟ گوتی: ئەوە نێچیری دەریایە (نێچیری دەریاش دروستە بۆ كەسی موحریم)، عومەریش ﷺ گوتی: چۆن دەزانی (نێچیری دەریایە)؟ گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوە دەرهاویشتەیەكی نەهەنگە لە ساڵێ دوو جار دەریدەهاوێژێ.

١٠١٢- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالِكٌ ﷺ عَمَّا يُوجَدُ مِنْ لُحُومِ الصَّيْدِ عَلَى الطَّرِيقِ: هَلْ يَبْتَاعُهُ الْمُحْرِمُ؟ فَقَالَ: أَمَّا مَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ يُعْتَرَضُ بِهِ الْحَاجُّ، وَمِنْ أَجْلِهِمْ صِيدَ، فَإِنِّي أَكْرَهُهُ، وَأَنْهَى عَنْهُ، فَأَمَّا أَنْ يَكُونَ عِنْدَ رَجُلٍ لَمْ يُرِدْ بِهِ الْمُحْرِمِينَ، فَوَجَدَهُ مُحْرِمٌ، فَابْتَاعَهُ فَلاَ بَأْسَ بِهِ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی گۆشتی ئەو نێچیرەی كە لەسەر ڕێگەی حەج تووشی دەبێ (كە خەڵك دەیفرۆشێ): ئایا كەسی موحریم بۆی هەیە بیكڕێ؟ ئەویش گوتی: ئەوەی بۆ كەسی حاجی بەمەبەست دەگیرێ و لە پێناوی ئەو ڕاو دەكرێ، ئەوە من بەباشی نازانم بیكڕێت و قەدەغەی لێ دەكەم، وە هەرچی ئەو نێچیرەیە كە لەلای كەسێكە و بە مەبەستی كەسی موحریم ڕاو نەكراوە، كەسی موحریم دەستی دەكەوێ و دەیكڕێ، ئەوە هیچ كێشەی تیا نییە.

١٠١٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنْ أَحْرَمَ وَعِنْدَهُ صَيْدٌ قَدْ صَادَهُ، أَوِ ابْتَاعَهُ: فَلَيْسَ عَلَيْهِ أَنْ يُرْسِلَهُ، وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَجْعَلَهُ عِنْدَ أَهْلِهِ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی چۆتە ژێر ئیحرام لە كاتێكدا نێچیرێكی لەلایە و پێشی ئیحرام ڕاوی كردووە یان كڕیویەتی، گوتوویەتی: لەسەری پێویست نییە بەڕەڵای بكاتەوە و هیچ كێشەیەكیش نییە لەوەی لە ماڵەوە دایبنێ.

١٠١٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ، فِي صَيْدِ الْحِيتَانِ فِي الْبَحْرِ وَالأَنْهَارِ وَالْبِرَكِ وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ: إِنَّهُ حَلاَلٌ لِلْمُحْرِمِ أَنْ يَصْطَادَهُ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٥، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٤، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ڕاوی ماسی لە دەریا و ڕووبار و حەوز و هاوشێوەی ئەوانە گوتوویەتی: بۆ کەسی موحریم حەڵاڵە ڕاوی بکات.

## ٢٥- ئەو نێچیرەی بۆ کەسی موحریم دروست نییە بیخوات[1]

**١٠١٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللهِ ﷺ حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مَا فِي وَجْهِي، قَالَ: إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە صەعبی کوڕی جەسامەی لەیسییەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی کەرەکێوییەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیاری بردووە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە «ئەبواء» یان لە «وەددان» بووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە بەسەریدا، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەواری پێناخۆشی لە ڕوخسارمدا بینی فەرمووی: ئێمە لەبەر هیچ شتێك ڕەتمان نەکردۆتەوە بەسەرتدا تەنها لەبەر ئەوە نەبێت ئێمە لەژێر ئیحرامداین (بۆمان دروست نییە بیخۆین، چونکە دیارە هەستی کردووە لە پێناوی ئەو ڕاوی کردووە).

**١٠١٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ بِالْعَرْجِ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فِي يَوْمٍ صَائِفٍ، قَدْ غَطَّى وَجْهَهُ بِقَطِيفَةِ أُرْجُوَانٍ، ثُمَّ أُتِيَ بِلَحْمِ صَيْدٍ، فَقَالَ لأَصْحَابِهِ: كُلُوا، فَقَالُوا: أَوَلاَ تَأْكُلُ أَنْتَ؟ فَقَالَ: إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنَّمَا صِيدَ مِنْ أَجْلِي[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: لە عەرج (کە گوندێکە سێ قۆناغ لە مەدینەوە دوورە) عوسمانی کوڕی عەففانم بینی

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ لِلْمُحْرِمِ أَكْلُهُ مِنَ الصَّيْدِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٦؛ والشيباني: ٤٤١؛ والشافعي: ٩٠٢؛ وابن حنبل: ١٦٤٧٠، وفي: ١٦٧١١، وفي: ١٦٧٣٣؛ والبخاري: ١٨٢٥، وفي: ٢٥٧٣؛ ومسلم: المناسك: ٥٠؛ والنسائي: ٢٨١٩؛ وابن حبان: ٣٩٦٩؛ والقابسي: ٥٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٧؛ والحدثاني: ٥٧٧؛ والشيباني: ٤١٧؛ والشافعي: ١١١١، كلهم عن مالك به.




ﷺ، لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، لە ڕۆژێکی زۆر گەرم، جا بە جلێکی سوف ڕوخساری داپۆشیبوو، دواتر گۆشتی نێچیری بۆ هێنرا و بە هاوەڵەکانی گوت: بخۆن، ئەوانیش گوتیان: تۆ نایخۆیت؟ ئەویش گوتی: من وەکوو ئێوە نیم، ئەو نێچیرە لەپێناوی من ڕاوکراوە (کەواتە بۆ من دروست نییە، بەڵام بۆ ئێوە دروستە).

**١٠١٧-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، **أَنَّهَا قَالَتْ لَهُ:** يَا ابْنَ أُخْتِي، إِنَّمَا هِيَ عَشْرُ لَيَالٍ، فَإِنْ تَخَلَّجَ فِي نَفْسِكَ شَيْءٌ فَدَعْهُ، تَعْنِي: أَكْلَ لَحْمِ الصَّيْدِ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، ئەویش لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی عائیشە ﷺ پێی گوتووە: ئەی کوڕی خوشکم (خوشکەزام)، ماوەی ئیحرام تەنها دە ڕۆژە، جا ئەگەر گومانێکت کەوتە ناو دڵ ئەوە وازی لێ بێنە، واتە: واز لە خواردنی نێچیر بێنە (کە گومانت هەیە تیایدا، ئەوەندە ماوەیە خۆت بگرە).

**١٠١٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ، فِي الرَّجُلِ الْمُحْرِمِ يُصَادُ مِنْ أَجْلِهِ صَيْدٌ، فَيُصْنَعُ لَهُ ذَلِكَ الصَّيْدُ، فَيَأْكُلُ مِنْهُ، وَهُوَ يَعْلَمُ، أَنَّهُ مِنْ أَجْلِهِ صِيدَ: فَإِنَّ عَلَيْهِ جَزَاءَ ذَلِكَ الصَّيْدِ كُلِّهِ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسی موحریم کە لە پێناوی ئەو ڕاو دەکرێ و نێچیرەکەی بۆ ئامادە دەکرێ (بۆ خواردن) و لێی دەخوات، لە کاتێکدا دەزانێ ئەو نێچیرە لە پێناوی ئەودا ڕاو کراوە، گوتوویەتی: جەزا و قەرەبووکردنەوەی گشت نێچیرەکەی لەسەرە (واتە: دەبێ ئاژەڵێکی هاوشێوە بکات بە صەدەقە و کەفارەتی ئەو کارەی، هەرچەندە بەتەنیاش نەیخواردبێ).

**١٠١٩- [فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ: عَنِ الرَّجُلِ يُضْطَرُّ إِلَى أَكْلِ الْمَيْتَةِ وَهُوَ مُحْرِمٌ، أَيَصِيدُ الصَّيْدَ فَيَأْكُلُهُ؟ أَمْ يَأْكُلُ الْمَيْتَةَ؟ فَقَالَ: بَلْ يَأْكُلُ الْمَيْتَةَ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ لَمْ يُرَخِّصْ لِلْمُحْرِمِ فِي أَكْلِ الصَّيْدِ، وَلاَ فِي أَخْذِهِ، عَلَى حَالٍ مِنَ الأَحْوَالِ، وَقَدْ أَرْخَصَ فِي الْمَيْتَةِ عَلَى حَالِ الضَّرُورَةِ[3].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٨؛ والحدثاني: ٥٧٧أفي المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٤٩، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥٠؛ والحدثاني: ٥٧٨ في المناسك؛ والجامع لابن زياد: ٩٠ في أكل المضطر




(فەتوا) ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك (بگاتە حاڵەتێك) ناچار بێت بۆ خواردنی مردارەوەبوو لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدایە، ئایا بۆی هەیە نێچیر ڕاو بکات و بیخوات؟ یان دەبێ مردارەوەبوو بخوات؟ ئەویش گوتی: بەڵکوو مردارەوەبوو دەخوات، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار مۆڵەتی نەداوە بۆ کەسی موحریم بە خواردن و گرتنی نێچیر بە هیچ شێوەیەك، لە کاتێکدا مۆڵەتی داوە بە خواردنی مردارەوەبوو لە کاتی ناچاریدا.

١٠٢٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَمَّا مَا قَتَلَ الْمُحْرِمُ، أَوْ ذَبَحَ مِنَ الصَّيْدِ، فَلاَ يَحِلُّ أَكْلُهُ لِحَلاَلٍ وَلاَ لِمُحْرِمٍ، لأَنَّهُ لَيْسَ بِذَكِيٍّ، كَانَ خَطَأً أَوْ عَمْدًا، فَأَكْلُهُ لاَ يَحِلُّ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ سَمِعْتُ ذَلِكَ مِنْ غَيْرِ وَاحِدٍ(١).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەو شتەیە کە کەسی موحریم دەیکوژێت یان سەری دەبڕێت لە نێچیر، ئەوە خواردنی دروست نییە نە بۆ کەسی حەڵاڵ نە بۆ کەسی موحریم، چونکە بەسەربڕاوی شەرعی حیساب نییە (بەڵکوو وەکوو مردارەوەبوو وایە) جا بەهەڵە بووبێ یان بە ئەنقەست (جیاوازی نییە)، هەر خواردنی حەڵاڵ نییە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەم لە زیاتر لە زانایێك بیستووە (چەندین زانا ئاوا فەتوایان داوە).

١٠٢١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَقْتُلُ الصَّيْدَ ثُمَّ يَأْكُلُهُ: إِنَّمَا عَلَيْهِ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ، مِثْلُ مَنْ قَتَلَهُ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی نێچیر دەکوژێت و دواتر دەیخوات، گوتوویەتی: تەنها یەك کەفارەتی لەسەرە، وەك ئەو کەسەی دەیکوژێت و نایخوات (واتە کوشتن و خواردنی بە یەك سەرپێچی حیسابە).

---

الميتة، كلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥١؛ وفي: ١١٥٢؛ وفي: ١٢٥٣؛ وفي: ١٢٧٣؛ والجامع لابن زياد: ٩٣ في أكل المضطر الميتة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥١؛ وفي: ١١٥٢؛ وفي: ١٢٥٣؛ وفي: ١٢٧٣؛ والجامع لابن زياد: ٩٣ في أكل المضطر الميتة، كلهم عن مالك به.




## ٢٦- بابەتی ڕاوکردن لە حەرەمی مەککەدا[١]

**١٠٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: كُلُّ شَيْءٍ صِيدَ فِي الْحَرَمِ، أَوْ أُرْسِلَ عَلَيْهِ كَلْبٌ فِي الْحَرَمِ، فَقُتِلَ ذَلِكَ الصَّيْدُ فِي الْحِلِّ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ أَكْلُهُ، وَعَلَى مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ جَزَاءُ الصَّيْدِ، فَأَمَّا الَّذِي يُرْسِلُ كَلْبَهُ عَلَى الصَّيْدِ فِي الْحِلِّ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يَصِيدَهُ فِي الْحَرَمِ، فَإِنَّهُ لاَ يُؤْكَلُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ جَزَاءٌ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَرْسَلَهُ عَلَيْهِ، وَهُوَ قَرِيبٌ مِنَ الْحَرَمِ، فَإِنْ أَرْسَلَهُ قَرِيبًا مِنَ الْحَرَمِ، فَعَلَيْهِ جَزَاؤُهُ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت شتێك كە ڕاو بكرێت لە حەرەم یان لە حەرەمەوە سەگی بۆ بنێردرێت و نێچیرەكە لە دەرەوەی حەرەم بكوژرێ و ڕاوبكرێ، ئەوە خواردنی حەڵاڵ نییە، وە ئەو كەسەی ئەوە ئەنجام دەدات كەفارەتی نێچیری لەسەرە، وە هەرچی ئەو كەسەشە كە سەگەكەی لە دەرەوەی حەرەمەوە دەنێرێ بۆ نێچیرێك، سەگەكەش دوای نێچیرەكە دەكەوێت تاوەكوو لەناو حەرەم دەیگرێ و ڕاوی دەكات، ئەوەش ناخورێت، بەڵام كەسەكە لەوەدا سزا و كەفارەتی نێچیری لەسەر نییە، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە سەگەكەی بنێرێت بۆ نێچیرەكە لە كاتێكدا نزیك بێت لە حەرەمەوە، جا ئەگەر ناردی و نزیكیش بوو لە حەرەم، ئەوە سزا و كەفارەتی نێچیری لەسەرە.

## ٢٧- حوكم و بڕیاری شەرعی دەربارەی نێچیر[٣]

**١٠٢٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالَّذِي يَصِيدُ الصَّيْدَ وَهُوَ حَلاَلٌ، ثُمَّ يَقْتُلُهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، بِمَنْزِلَةِ الَّذِي يَبْتَاعُهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، ثُمَّ يَقْتُلُهُ، وَقَدْ نَهَى اللهُ عَنْ قَتْلِهِ، فَعَلَيْهِ جَزَاؤُهُ[٤].

---

(١) ـ أَمْرُ الصَّيْدِ فِي الْحَرَمِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥٣؛ والحدثاني: ٥٧٨أ، عن مالك به.

(٣) ـ الْحُكْمُ فِي الصَّيْدِ.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥٦، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا، أَنَّ مَنْ أَصَابَ الصَّيْدَ وَهُوَ مُحْرِمٌ حُكِمَ عَلَيْهِ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی نێچیر ڕاو دەکات لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا نییە، دواتر سەری دەبڕێت لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدایە، وەك ئەو کەسە وایە کە دەیکڕێت و دواتر سەری دەبڕێت لە کاتێکدا لە ژێر ئیحرامدایە، جا خوای پەروەردگار ﷻ نەهی کردووە لە کوشتن و سەربڕینی، وە جەزا و کەفارەتیشی لەسەرە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە وایە: هەر کەسێك نێچیری بکەوێتە دەست لە کاتێکدا لە ژێر ئیحرامدا بێ، ئەوە بڕیاری بەسەردا دەدرێ بە جەزا و کەفارەتی نێچیرکوشتن.

**١٠٢٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الَّذِي يَقْتُلُ الصَّيْدَ فَيُحْكَمُ عَلَيْهِ فِيهِ، أَنْ يُقَوَّمَ الصَّيْدُ الَّذِي أَصَابَ، فَيُنْظَرَ كَمْ ثَمَنُهُ مِنَ الطَّعَامِ، فَيُطْعِمُ كُلَّ مِسْكِينٍ مُدًّا، أَوْ يَصُومَ مَكَانَ كُلِّ مُدٍّ يَوْمًا، وَيُنْظَرَ كَمْ عِدَّةُ الْمَسَاكِينِ، فَإِنْ كَانُوا عَشَرَةً، صَامَ عَشَرَةَ أَيَّامٍ، وَإِنْ كَانُوا عِشْرِينَ مِسْكِينًا، صَامَ عِشْرِينَ يَوْمًا عَدَدَهُمْ مَا كَانُوا، وَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ سِتِّينَ مِسْكِينًا[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جوانترین و چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو کەسەی نێچیر دەکوژێ بڕیاری بەسەر دادەدرێ بەوەی: ئەو نێچیرەی کوشتوویەتی بنرخێنرێت و سەیر بکرێت نرخەکەی چەندە لە خۆراك و هەر مودێك لە خۆراکەکە بدرێت بە هەژارێك، یان لە شوێنی هەر مودێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت، وە سەیر بکرێت ژمارەی هەژارەکان (بەپێی مودەکان) چەندە، جا ئەگەر دە بوو، ئەوە دە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت، وە ئەگەر بیست بوو،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥٨؛ وفي: ١٢٦٩، عن مالك به.




ئەوە بیست ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت، جا ژمارەیان هەر چەند بێت (هەر دەبێ ئەوەندە بەڕۆژوو بێت)، هەر چەندە ژمارەیان لە شێست هەزاریش زیاتر بێت.

**١٠٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: سَمِعْتُ أَنَّهُ يُحْكَمُ عَلَى مَنْ قَتَلَ الصَّيْدَ فِي الْحَرَمِ وَهُوَ حَلاَلٌ، بِمِثْلِ مَا يُحْكَمُ بِهِ عَلَى الْمُحْرِمِ الَّذِي يَقْتُلُ الصَّيْدَ فِي الْحَرَمِ وَهُوَ مُحْرِمٌ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لێ بووە ئەو كەسەی نێچیر دەكوژێ لە حەرەمی مەككە لە كاتێكدا لە ژێر ئیحرامدا نییە، هەمان حوكمی ئەو كەسە موحریمەی بەسەردا دەدرێ كە نێچیر دەكوژێت لە حەرەم لە كاتێكدا لە ژێر ئیحرامدایە.

## ٢٨- ئەو زیندەوەرانەی كەسی موحریم بۆی هەیە بیانكوژێ[2]

**١٠٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، لَيْسَ عَلَى الْمُحْرِمِ فِي قَتْلِهِنَّ جُنَاحٌ: الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج لە زیندەوەران هەن كەسی موحریم لە كوشتنیاندا هیچ تاوانی لەسەر نییە: قەلەڕەش و كۆلارە (باشوكە) و دووپشك و مشك و سەگی هار.

**١٠٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، مَنْ قَتَلَهُنَّ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ: الْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ[4].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٥٨؛ وفي: ١٢٦٩، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ مِنَ الدَّوَابِّ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٣؛ والحدثاني: ٦٢٩ في المناسك؛ والشيباني: ٤٢٧ في الحج؛ والشافعي: ١٠٥٩؛ وابن حنبل: ٦٢٢٩؛ والبخاري: ١٨٢٦؛ ومسلم: المناسك: ٧٦؛ والنسائي: ٢٨٢٨؛ والقابسي: ٢٢٤؛ وفي: ٢٨٦، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٤؛ والشيباني: ٤٢٨؛ وابن حنبل: ٦٢٢٨؛ والبخاري: ٣٣١٥؛ والقابسي: ٢٨٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج لە زیندەوەران هەن هەر كەسێك بیانكوژێ لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدا بێت، ئەوە هیچ تاوانی لەسەر نییە: دوو پشك و مشك و قەلەڕەش و كۆلارە (باشوكە) و سەگی هار.

**١٠٢٨-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ فَوَاسِقُ، يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ: الْفَأْرَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ(١).

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت لە سوود بەدەرن و زیانبەخشن، لە حەڕەمیش دەكوژرێن: مشك و دووپشك و قەلەڕەش و كۆلارە (باشوكە) و سەگی هار.

**١٠٢٩-** عن ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ أَمَرَ بِقَتْلِ الْحَيَّاتِ فِي الْحَرَمِ(٢).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﵁ فەرمانی كردووە بە كوشتنی مار لە حەڕەمدا.

**١٠٣٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي الْكَلْبِ الْعَقُورِ الَّذِي أُمِرَ بِقَتْلِهِ فِي الْحَرَمِ، إِنَّ كُلَّ مَا عَقَرَ النَّاسَ وَعَدَا عَلَيْهِمْ، وَأَخَافَهُمْ، مِثْلُ: الأَسَدِ، وَالنَّمِرِ، وَالْفَهْدِ، وَالذِّئْبِ، فَهُوَ الْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَأَمَّا مَا كَانَ مِنَ السِّبَاعِ، لاَ يَعْدُو، مِثْلُ: الضَّبُعِ، وَالثَّعْلَبِ وَالْهِرِّ، وَمَا أَشْبَهَهُنَّ مِنَ السِّبَاعِ، فَلاَ يَقْتُلُهُنَّ الْمُحْرِمُ، فَإِنْ قَتَلَهُ، فَدَاهُ(٣).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی سەگی هار كە فەرمان كراوە بە كوشتنی لە حەڕەمدا، گوتوویەتی: گشت ئاژەڵێك كە خەڵك بریندار بكات و هێرش بكاتە سەریان و بیانترسێنێ، وەك: شێر و پڵنگ و گورگ، ئەوە حوكمی سەگی هاری

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٥؛ والحدثاني: ٦٢٩ب في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٦؛ والحدثاني: ٦٢٨ في المناسك؛ والشيباني، ٤٢٩ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٧؛ والحدثاني، ٦٢٨أ في المناسك، عن مالك به.




هەیە، وە هەرچی ئەو ئاژەڵانەیە کە هێرش ناکات، وەك: کەمتیار و ڕێوی و پشیلە و هاوشێوەی ئەوانە لە ئاژەڵان، ئەوە کەسی موحریم نایانکوژێ، جا ئەگەر کوشتنی، ئەوە دەبێ فیدیە بدات[١].

**١٠٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَمَّا مَا ضَرَّ مِنَ الطَّيْرِ، فَإِنَّ الْمُحْرِمَ لاَ يَقْتُلُهُ، إِلاَّ مَا سَمَّى النَّبِيُّ ﷺ: الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَإِنْ قَتَلَ الْمُحْرِمُ شَيْئًا مِنَ الطَّيْرِ سِوَاهُمَا، فَدَاهُ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی دەربارەی ئەو باڵندانەیە کە زیانیان هەیە، ئەوە کەسی موحریم نابێ بیانکوژێ، تەنها ئەوانە نەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی هێناون (کە بریتین لە): قەلەڕەش و کۆلارە (باشوکە)، جا ئەگەر کەسی موحریم جگە لەو دووانەی کوشت، ئەوە دەبێ فیدیە بدات.

## ٢٩- ئەوەی بۆ کەسی موحریم دروستە ئەنجامی بدات[٣]

**١٠٣٢-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ اللهِ بْنِ الْهُدَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يُقَرِّدُ بَعِيرًا لَهُ فِي طِينٍ بِالسُّقْيَا وَهُوَ مُحْرِمٌ[٤].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَنَا أَكْرَهُهُ[٥].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی هودەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عومەری کوڕی خەتتابی بینیوە ﷺ لەناو قوڕێکدا قرنەی لە وشترەکەی دەکردەوە لە سوقیا (کە گوندێکە لە نێوان مەککە و مەدینە) لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو.

---

(١) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك ئەو شتانەی باس کراون کە دروستە لە کاتی ئیحرامیش بکوژرێن عیللەتەکەی لەلای ئەو زیان و هێرشبردنە، واتە ئەو شتەی هێرش ببات و زیانی هەبێت لە حەرەم کوشتنی دروستە و کەفارەتی لەسەر نییە، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی عیللەتەکە بریتییە لەوەی ئاخۆ گۆشتی دەخورێ یان نا، واتە ئەوەی گۆشتی نەخورێ کوشتنی دروستە و کەفارەتی تێدانییە، بەڵام ئەوەی گۆشتی بخورێ کوشتنی دروست نییە و لە کاتی کوشتنی کەفارەت واجب دەکات.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٨، عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَجُوزُ لِلْمُحْرِمِ أَنْ يَفْعَلَهُ.

(٤) ـ موقوف صحيح.

(٥) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٢؛ والحدثاني: ٥٨٢أ في المناسك، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: من بەناپەسەندی دەزانم (واتە پێم باش نییە لە ئیحرامدا دەستكاری قڕنەش بكرێ).

**١٠٣٣-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ، أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تُسْأَلُ عَنِ الْمُحْرِمِ، أَيَحُكُّ جَسَدَهُ؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَلْيَحْكُكْهُ وَلْيَشْدُدْ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: وَلَوْ رُبِطَتْ يَدَايَ، وَلَمْ أَجِدْ إِلاَّ رِجْلَيَّ لَحَكَكْتُ[١].

واتە: لە عەلقەمەی كوڕی ئەبو عەلقەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە دایكیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، پرسیاری لێ دەكرا دەربارەی كەسی موحریم، كە ئاخۆ بۆی دروستە خۆی بخورێنێت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، با خۆی بخورێنێت و بەتوندیش ئەنجامی بدات، عائیشە ﷺ گوتیشی: ئەگەر دەستەكانیشم ببەسترێنەوە و نەتوانم بەهیچ جۆرێك بە دەستەكانم خۆم بخورێنم تەنها بە قاچم نەبێت، ئەوە هەر خۆم دەخورێنم (واتە بزانن خۆخوراندن هەر زۆر ئاسایی و دروستە و هیچ ئیحراجییێكی تیا نییە).

**١٠٣٤-** عَنْ أَيُّوبَ بْنِ مُوسَى ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ نَظَرَ فِي الْمِرْآةِ لِشَكْوٍ كَانَ بِعَيْنَيْهِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ[٢].

واتە: لە ئەییوبی كوڕی موساوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ سەیری ئاوێنەی كرد بە هۆی ئێش و ژانێك لە چاوەكانی (واتە بە ئاوێنە سەیری چاوەكانی خۆی دەكرد)، لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدا بوو.

**١٠٣٥-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَنْزِعَ الْمُحْرِمُ حَلَمَةً أَوْ قُرَادًا عَنْ بَعِيرِهِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٤؛ والحدثاني: ٥٨١ في المناسك؛ والشيباني: ٤٣٥ في الحج، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٥؛ والحدثاني: ٥٨٢ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٣ في المناسك؛ والحدثاني: ٥٨٢ ب في المناسك؛ والشيباني، ٤٣٢ في الحج، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷄ پێی چاك نەبووە کەسی موحریم قێچ و قرنە لە وشترەکەی بکاتەوە.

**١٠٣٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ ﷀ، أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷀ عَنْ ظُفْرٍ لَهُ انْكَسَرَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷀ: اقْطَعْهُ(١).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مەڕیەمەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷀ کردووە دەربارەی نینۆکێکی خۆی کە شکا لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا سەعید ﷀ گوتی: بیقرتێنە (واتە بۆ پێویستی ڕێگەی دا نینۆکی بقرتێنێ، هیچ کەفارەتی لەسەر نییە).

**١٠٣٧-** **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷀ، عَنِ الرَّجُلِ يَشْتَكِي أُذُنَهُ، أَيَقْطُرُ فِي أُذُنِهِ مِنَ الْبَانِ الَّذِي لَمْ يُطَيَّبْ، وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَقَالَ: لاَ أَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا، وَلَوْ جَعَلَهُ فِي فِيهِ لَمْ أَرَ بِذَلِكَ بَأْسًا(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷀ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە لەبەر گوێچکەی بەئازارە، ئایا دەرمانی درەختی بان کە بۆنخۆش نەکرابێ بکاتە گوێچکەی، لە کاتێکدا کە لەژێر ئیحرامدایە؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشە لەوەدا نابینم، هەرچەندە بیکاتە دەمیشی هەر پێم وا نییە هیچ کێشەی هەبێت.

**١٠٣٨-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷀ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَبُطَّ الْمُحْرِمُ خُرَاجَهُ، وَيَفْقَأَ دُمَّلَهُ، وَيَقْطَعَ عِرْقَهُ، إِذَا احْتَاجَ إِلَى ذَلِكَ(٣).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: هیچ کێشەی تیا نییە کەسی موحریم جەڕاحەتی برینەکەی دەربکات و پۆرگەکەی بتەقێنێت و دەمارەکەی بپچڕێنێت، ئەگەر پێویستی بەوە بوو.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٦؛ والحدثاني: ٥٨١أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٧، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٨ في المناسك، عن مالك به.




## ٣٠- حەجکردن دەربارەی ئەو کەسەی حەجی لەجیاتی دەکرێ(١)

١٠٣٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ ﷺ رَدِيفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: فەزڵی کوڕی عەبباس ﷺ لە دواوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وڵاخ ببوو، جا ئافرەتێك لە هۆزی خەزعەم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێ کرد، جا فەزڵیش ﷺ هەر سەیری ئافرەتەکەی دەکرد و ئافرەتەکەش سەیری فەزڵی دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی فەزڵی وەردەچەرخاند بۆ لایەکەی دیکە، ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ واجبی خوای پەروەردگار کە حەجە لەسەر باوکم واجب بووە، ئەویش پیر و بێتاقەتە لەسەر وڵاخ خۆی ڕاناگرێ، ئایا حەجی لە جیاتی بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، جا ئەو بابەتە لە حەجیماڵئاواییدا بوو.

## ٣١- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی
## بە هۆی دوژمنەوە ڕێگری لێ دەکرێ لە حەجکردن(٣)

١٠٤٠- [فتوى] عَنْ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: مَنْ حُبِسَ بِعَدُوٍّ، فَحَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَإِنَّهُ يَحِلُّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، وَيَنْحَرُ هَدْيَهُ، وَيَحْلِقُ رَأْسَهُ حَيْثُ حُبِسَ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ(٤).

---

(١) ـ الْحَجُّ عَمَّنْ يُحَجُّ عَنْهُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٨٢؛ والحدثاني: ٥٨٠ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨١ في الحج؛ والشافعي: ٤٨٩؛ وابن حنبل: ٣٢٣٨، وفي: ٣٣٧٥؛ والبخاري: ١٥١٣، وفي: ١٨٥٥؛ ومسلم: المناسك: ٤٠٧؛ والنسائي: ٢٦٤١، وفي: ٥٣٩١؛ وأبو داود: ١٨٠٩؛ وابن حبان: ٣٩٨٩، وفي: ٣٩٩٦؛ والقابسي: ٥٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ أُحْصِرَ بِعَدُوٍّ.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٥، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷬ گێردراوەتەوە دەربارەی كەسێك كە بەهۆی دوژمنەوە ڕێگری لە حەج لێ دەكرێت و دەبێتە بەربەست لەوەی سەردانی ماڵی خوا بكات، گوتوویەتی: لەو شوێنەی ڕێگری لێ كراوە حەڵاڵ دەبێتەوە لە گشت شتێك و ئاژەڵەكەی خۆی سەر دەبڕێت و سەری دەتاشێت، قەزاكردنەوەشی لەسەر نییە.

١٠٤١- عَنْ مَالِكٍ ﷬؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حَلَّ هُوَ وَأَصْحَابُهُ بِالْحُدَيْبِيَةِ، فَنَحَرُوا الْهَدْيَ، وَحَلَقُوا رُؤُوسَهُمْ، وَحَلُّوا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ قَبْلَ أَنْ يَطُوفُوا بِالْبَيْتِ، وَقَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَيْهِ الْهَدْيُ، ثُمَّ لَمْ يُعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ، وَلاَ مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ، أَنْ يَقْضُوا شَيْئًا، وَلاَ يَعُودُوا لِشَيْءٍ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷬ گێردراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەكانی لە حودەیبییە ئیحرامیان شكاند و ئاژەڵەكانیان سەر بڕی و سەری خۆیان تاشی و لە گشت شتێك حەڵاڵ بوونەوە بێئەوەی تەوافی بەیت بكەن و بێئەوەی ئاژەڵەكانیان بگاتە بەیت، جا نەزانراوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە هیچ یەكێك لە هاوەڵان و ئەوانەی لەگەڵی بوون كردبێت بەوەی هیچ شتێك قەزا بكەنەوە، وە بۆ هیچ شتێكیش نەگەڕانەوە.

١٠٤٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ حِينَ خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ مُعْتَمِرًا، فِي الْفِتْنَةِ: إِنْ صُدِدْتُ عَنِ الْبَيْتِ، صَنَعْنَا كَمَا صَنَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، ثُمَّ إِنَّ عَبْدَ اللهِ ﷺ نَظَرَ فِي أَمْرِهِ، فَقَالَ: مَا أَمْرُهُمَا إِلاَّ وَاحِدٌ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: مَا أَمْرُهُمَا إِلاَّ وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ نَفَذَ حَتَّى جَاءَ الْبَيْتَ، فَطَافَ طَوَافًا وَاحِدًا، وَرَأَى ذَلِكَ مُجْزِيًا عَنْهُ، وَأَهْدَى[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی كاتێ دەرچوو بۆ مەككە بە عومرەكار لە كاتی فیتنە (كە دڵنیا نەبوو لە ڕێگاكە)، گوتی: ئەگەر

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٢، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٣ في المناسك؛ والحدثاني: ٥٦٩ في المناسك؛ والشيباني، ٣٩٤ في الحج؛ والشافعي: ٥٧٩؛ وابن حنبل: ٥٢٩٨، وفي: ٦٢٢٧؛ والبخاري: ١٨٠٦، وفي: ١٨١٣، وفي: ٤١٨٣؛ ومسلم: المناسك: ١٨٠، كلهم عن مالك به.

ڕێگەم پێ گیرا (ئەو کات) ئەوە ئەنجام دەدەم کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامیان دا، جا نییەتی بە عومرە بەست لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حودەیبییە نییەتی بە عومرە بەست، دواتر عەبدوڵڵا ﷺ بیری لە کارەکەی کردەوە و گوتی: کردارەکانی حەج و عومرە خۆ وەکوو یەکن، دواتر ئاوڕی دایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی و گوتی: کردارەکانیان وەکوو یەکن، کەواتە دەتانکەم بە شاهێد بەوەی من حەجیشم لەگەڵ عومرە لەسەر خۆم واجب کرد، دواتر جێبەجێی کرد تا گەیشت بە بەیت، جا یەك تەوافی (حەوت شەوتی) کرد و پێی وا بوو ئەوەندە (هەم بۆ حەج و هەم بۆ عومرەکەی) بەریدەکەوێ، وە قوربانیشی کرد.

**١٠٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ أُحْصِرَ بِعَدُوٍّ، كَمَا أُحْصِرَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ، فَأَمَّا مَنْ أُحْصِرَ بِغَيْرِ عَدُوٍّ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ دُونَ الْبَيْتِ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە بابەتەکە بەم شێوەیەیە ـ کە پێشتر باس کرا ـ دەربارەی ئەو کەسەی بەهۆی دوژمن ڕێگری لێ دەکرێ لە حەج، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ڕێگرییان لێ کرا، جا هەرچی دەربارەی ئەو کەسەیە کە ڕێگری لێ دەکرێ بە هەر شتێکی جگە لە دوژمن، ئەوە لەژێر ئیحرام نایەتە دەرەوە بەبێ تەوافی بەیت.

## ٣٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی ڕێگەی حەجکردنی لێ دەگیرێ بە هۆکارێکی جگە لە دوژمن[2]

**١٠٤٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: الْمُحْصَرُ بِمَرَضٍ لاَ يَحِلُّ، حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ، وَيَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَإِنِ اضْطُرَّ إِلَى لُبْسِ شَيْءٍ مِنَ الثِّيَابِ الَّتِي لاَ بُدَّ لَهُ مِنْهَا، أَوِ الدَّوَاءِ، صَنَعَ ذَلِكَ وَافْتَدَى[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٤، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ أُحْصَرِ بِغَيْرِ عَدُوٍّ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٢؛ والحدثاني، ٥٦٦ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٨ في الحج؛ والشافعي: ٥٨١، كلهم عن مالك به.





واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو کەسەی بەهۆی نەخۆشییەوە ڕێگری لێ کراوە لە تەواو ئەنجامدانی فەڕیزەی حەج، حەڵاڵ نابێتەوە تاوەکوو تەواف بەدەوری بەیتدا نەکات و لەنێوان صەفا و مەڕوە ڕانەکات، جا ئەگەر ناچار بوو بۆ لەبەرکردنی جلێکی دووراو کە دەبوو هەر لەبەری بکردایە یان ناچار بوو بۆ بەکارهێنانی دەرمان، ئەوە ئەنجامی دەدات و فیدیە دەدات.

**١٠٤٥-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: الْمُحْرِمُ لاَ يُحِلُّهُ إِلاَّ الْبَيْتُ(١).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: هیچ شتێك کەسی مەحریم لەژێر ئیحرام دەرناکات تەنها بەیت نەبێت (واتە مەحاڵە هەر دەبێ تەوافی بەیت بکات، تا لەژێر ئیحرام بێتە دەرەوە).

**١٠٤٦-** عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ كَانَ قَدِيمًا، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ إِلَى مَكَّةَ حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، كُسِرَتْ فَخِذِي، فَأَرْسَلْتُ إِلَى مَكَّةَ، وَبِهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَالنَّاسُ، فَلَمْ يُرَخِّصْ لِي أَحَدٌ أَنْ أَحِلَّ، فَأَقَمْتُ عَلَى ذَلِكَ الْمَاءِ سَبْعَةَ أَشْهُرٍ، حَتَّى أَحْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ(٢).

واتە: لە ئەیوبی کوڕی ئەبو تەمیمەی سەختیانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکی بەتەمەنی خەڵکی بەصرەی گێڕاوەتەوە گوتوویەتی: دەرچووم بۆ مەککە (بۆ حەجکردن) تاوەکوو گەیشتم بە یەکێك لە ڕێگەکان، ڕانم شکا و کەسێکم نارد بۆ مەککە (تا پرسیارم بۆ بکات کە ئاخۆ چارەم چییە) لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و زانایانی لێ بوو ﷺ، کەسیان مۆڵەتیان نەدام لەژێر ئیحرام بچمە دەرەوە، جا حەوت مانگ لەسەر ئاوەکە مامەوە تاوەکوو (چاکبوومەوە و چوومە بەیت و) بە عومرە لەژێر ئیحرام هاتمە دەرەوە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٣، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٤؛ والحدثاني، ٥٦٧ في المناسك، عن مالك به.




**١٠٤٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ حُبِسَ دُونَ الْبَيْتِ بِمَرَضٍ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: هەر كەسێك بەهۆی نەخۆشییەوە پێش ئەنجامدانی تەوافی بەیت ڕێگری لێكرا لە تەواوكردنی فەڕیزەی حەج، ئەوە حەڵاڵ نابێتەوە و لەژێر ئیحرام نایەتە دەرەوە تاوەكوو (دوای چاكبوونەوە) تەوافی بەیت دەكات و لە نێوان صەفا و مەڕوەش ڕادەكات.

**١٠٤٨**- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ حُزَابَةَ الْمَخْزُومِيَّ صُرِعَ بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَسَأَلَ: مَنْ يَلِي الْمَاءَ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ؟ فَوَجَدَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَمَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ، فَذَكَرَ لَهُمِ الَّذِي عَرَضَ لَهُ، فَكُلُّهُمْ أَمَرَهُ أَنْ يَتَدَاوَى بِمَا لاَ بُدَّ لَهُ مِنْهُ، وَيَفْتَدِيَ، فَإِذَا صَحَّ اعْتَمَرَ، فَحَلَّ مِنْ إِحْرَامِهِ، ثُمَّ عَلَيْهِ حَجُّ قَابِلٍ، وَيُهْدِي مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا، فِيمَنْ أُحْصِرَ بِغَيْرِ عَدُوٍّ.

واتە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعیدی كوڕی حوزابەی مەخزومی پەڕكەمی گرت لە یەكێك لە ڕێگەكانی مەككە، لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا داوای لەو كەسانە كرد كە لەگەڵی لەسەر هەمان ئاو بوون (بەوەی زانایەكی پێ نیشان بدەن)، جا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر و عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر و مەڕوانی كوڕی حەكەمی دەست كەوت (خوا لێیان ڕازی بێ) و ئەوەی بۆ باس كردن كە تووشی بووە، جا گشتیان فەرمانیان پێ كرد چارەسەر وەربگرێ بەوەی پێویستییەتی، وە فیدیەش بدات، وە كاتێ چاكبۆیەوە عومرە بكات و لەژێر ئیحرام بێتە دەرەوە، دواتر لەساڵی داهاتووشدا حەجی لەسەر واجبە، وە دەبێ ئاژەڵی هەدیش سەر ببڕێت بەوەی بۆی دەگونجێ.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٥؛ والحدثاني: ٥٦٧أ في المناسك؛ والشافعي: ٥٨٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٦؛ والحدثاني: ٥٦٨ في المناسك؛ والشافعي: ٥٨٢، كلهم عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا و کارکردن لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە، دەربارەی ئەو کەسەی ڕێگری لێ دەکرێ بە هەر شتێکی جگە لە دوژمن.

**١٠٤٩-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ، وَهَبَّارَ بْنَ الأَسْوَدِ ﷺ، حِينَ فَاتَهُمَا الْحَجُّ، وَأَتَيَا يَوْمَ النَّحْرِ، أَنْ يَحِلاً بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ يَرْجِعَا حَلاَلاً، ثُمَّ يَحُجَّانِ عَامًا قَابِلاً، وَيُهْدِيَانِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ(١).

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ فەرمانی بە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و هەباری کوڕی ئەسوەد ﷺ کرد، کاتێ هەردووکیان حەجیان لەدەستچوو بوو و لە ڕۆژی قوربان هاتن (فەرمانی پێ کردن) بەوەی: حەڵاڵ ببنەوە بەهۆی عومرە (واتە عومرە ئەنجام بدەن و لەژێر ئیحرام بێنە دەرەوە)، دواتر بەحەڵاڵی بگەڕێنەوە، دواتریش لە ساڵی داهاتوو حەج بکەنەوە، وە ئاژەڵی هەدیش سەر ببڕن، جا هەر کەسێك نەیبوو، ئەوە سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو دەبێت و حەوت ڕۆژیش کاتێ دەگەڕێتەوە ناو خانەوادەکەی.

**١٠٥٠-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ مَنْ حُبِسَ عَنِ الْحَجِّ بَعْدَ مَا يُحْرِمُ، إِمَّا بِمَرَضٍ، أَوْ بِغَيْرِهِ، أَوْ بِخَطَإٍ مِنَ الْعَدَدِ، أَوْ خَفِيَ عَلَيْهِ الْهِلاَلُ، فَهُوَ مُحْصَرٌ، عَلَيْهِ مَا عَلَى الْمُحْصَرِ(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك ڕێگری لێکرا لە ئەنجامدانی فەریزەی حەج دوای ئەوەی ئیحرامی بەستبوو، چ بە نەخۆشی یان بە جگە لە نەخۆشی یان بە هەڵەکردن لە ژمارەدا یان مانگی لێ ون بوو و نەیزانی کات بەسەرچووە، ئەوە موحصەر و ڕێگری لێکراوە و ئەوەی لەسەر واجبە کە لەسەر کەسی موحصەر واجبە ئەنجامی بدات.

**١٠٥١-** **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَمَّنْ أَهَلَّ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ بِالْحَجِّ، ثُمَّ أَصَابَهُ كَسْرٌ، أَوْ بَطْنٌ مُنْخَرِقٌ، أَوِ امْرَأَةٌ تُطْلَقُ، قَالَ: مَنْ أَصَابَهُ هَذَا مِنْهُمْ فَهُوَ مُحْصَرٌ، يَكُونُ عَلَيْهِ مِثْلُ مَا عَلَى أَهْلِ الآفَاقِ، إِذَا هُمْ أُحْصِرُوا(٣).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٨، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦٩ في المناسك، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ کرا دەربارەی ئەو کەسەی ئیحرام بە حەج دەبەستێت لە خەڵکی مەککە، دواتر شکانێکی جەستەی تووش دەبێت یان تووشی سکچوون دەبێت یان ئافرەتێکە و تووشی ئازاری منداڵبوون دەبێت، گوتوویەتی: هەر کەسێك لەوان ئەوەی تووش بوو ئەوە موحصەر و ڕێگەلێگیراوە، هەمان ئەوەی لەسەر واجبە کە لەسەر کەسی دوور هەیە کە خەڵکی مەککە نییە کاتێ بەربەست دێتە بەردەمیان.

١٠٥٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ قَدِمَ مُعْتَمِرًا فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ، حَتَّى إِذَا قَضَى عُمْرَتَهُ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مِنْ مَكَّةَ، ثُمَّ كُسِرَ، أَوْ أَصَابَهُ أَمْرٌ لاَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَحْضُرَ مَعَ النَّاسِ الْمَوْقِفَ، قَالَ مَالِكٌ: أَرَى أَنْ يُقِيمَ، حَتَّى إِذَا بَرَأَ خَرَجَ إِلَى الْحِلِّ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى مَكَّةَ، فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَيَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ يَحِلُّ، ثُمَّ عَلَيْهِ حَجٌّ قَابِلٍ وَالْهَدْيُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە لە مانگەکانی حەجدا بە (نییەتی) عومرەکاری هاتبێت، تا عومرەکەی خۆی تەواو دەکات (دواتر نییەتی دەگۆڕێت و دەیەوێت حەجیش بکات، جا) ئیحرام بە حەج دەبەستێت، دواتر تووشی شکانی ئەندامێکی جەستەی دەبێت یان تووشی شتێك دەبێت ناتوانێت لەگەڵ خەڵکی لە عەرەفە ئامادە بێت، ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسە گوتوویەتی: بۆچوونم وایە دەبێ بمێنێتەوە تاوەکوو چاك دەبێتەوە و دەچێتە دەرەوەی حەرەم (تاوەکوو ئیحرامی عومرە ببەستێت و دەست بە عومرە بکات) دواتر دەگەڕێتەوە بۆ مەککە و تەوافی بەیت دەکات و لە نێوان صەفا و مەروە ڕادەکات، دواتر لەژێر ئیحرام دێتە دەرەوە، دواتر لە ساڵی داهاتوودا حەج و هەدی لەسەرە.

١٠٥٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مِنْ مَكَّةَ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ مَرِضَ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَحْضُرَ مَعَ النَّاسِ الْمَوْقِفَ، قَالَ: إِذَا فَاتَهُ الْحَجُّ، فَإِنَّهُ إِنِ اسْتَطَاعَ خَرَجَ إِلَى الْحِلِّ، فَدَخَلَ بِعُمْرَةٍ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، لأَنَّ الطَّوَافَ الأَوَّلَ لَمْ يَكُنْ نَوَاهُ لِلْعُمْرَةِ، فَلِذَلِكَ يَعْمَلُ بِهَذَا، وَعَلَيْهِ حَجٌّ قَابِلٍ وَالْهَدْيُ، قَالَ: فَإِنْ كَانَ مِنْ غَيْرِ أَهْلِ مَكَّةَ، فَأَصَابَهُ مَرَضٌ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْحَجِّ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧٠، عن مالك به.




وَالْمَرْوَةِ، حَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَطَافَ بِالْبَيْتِ طَوَافًا آخَرَ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، لأَنَّ طَوَافَهُ الأَوَّلَ، وَسَعْيَهُ، إِنَّمَا كَانَ نَوَاهُ لِلْحَجِّ، وَعَلَيْهِ حَجُّ قَابِلٍ وَالْهَدْيُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی ئیحرام بە حەج دەبەستێت لە مەككە، دواتر تەوافی بەیت دەكات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات، دواتر نەخۆش دەكەوێت و ناتوانێت لەگەڵ خەڵكی لە عەرەفە ئامادە بێت، گوتوویەتی: ئەگەر حەجی لەكیس چوو، ئەوە ئەگەر توانی بەنییەتی عومرە بچێتە دەرەوەی مەككە و بێتەوە ناویەوە و تەوافی بەیت بكات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام بدات (ئەوە دەبێ ئاوا بكات)، چونكە تەوافی یەكەمی بەنییەتی عومرە نەكردووە، بۆیە ئاوا دەكات، وە لە ساڵی داهاتوودا حەج و هەدی لەسەر واجبە، گوتوویەتی: ئەگەر خەڵكی مەككە نەبوو و تووشی نەخۆشی بوو و نەخۆشییەكە بووە بەربەست لە نێوان خۆی و حەجكردنی، ئەوە تەوافی بەیت دەكات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات و خۆی بە عومرە حەڵاڵ دەكاتەوە و تەوافێكی دیكە ئەنجام دەدات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوەش ئەنجام دەدات، چونكە تەوافی یەكەم و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوەی بەنییەتی حەج بووە (ئەویانی بۆ حیساب نییە)، جا لە ساڵی داهاتوودا حەج و هەدی (قوربانی) لەسەر واجبە.

## ٣٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی دروستكردنی كەعبە[2]

**١٠٥٤**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَلَمْ دیكةی أَنَّ قَوْمَكِ حِينَ بَنَوُا الْكَعْبَةَ اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَفَعَلْتُ، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، مَا أُرَى رَسُولَ اللهِ ﷺ تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحِجْرَ، إِلاَّ أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٧١، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي بِنَاءِ الْكَعْبَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧٨؛ والشيباني: ٤٧٩ في الحج؛ والشافعي: ٦١٤؛ وابن حنبل:

واتە: لە عائیشەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا نەتزانیوە هۆزەکەت کاتێ بینای کەعبەیان نۆژەن کردۆتەوە لە بنچینەی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ کورتیان هەڵێناوە (بچووکیان کردۆتەوە)؟ دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆچی نایگێڕیتەوە بۆ بنچینەی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ (وەك خۆی فراوانی ناکەیتەوە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر قەومەکەت لە سەردەمی کوفر نزیك نەبووان ئەوە ئەنجامم دەدا، عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد ﷺ گوتوویەتی: جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: جا کە عائیشە ﷺ ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێ بووە، پێم وا نییە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وازی هێناوە لە دەستلێدانی دوو ڕوکن و زاویەکانی لای حیجر (لەبەر هیچ شتێك بووبێت) حەتمەن تەنها لەبەر ئەوە بووە بەیت تەواو نەکراوە لەسەر بنچینەی ئیبراهیم ﷺ (بەڵام دیارە دوو ڕوکنەکانی یەمانی لەسەر بنچینەی سەرەکی خۆیانن بۆیە دەستی لەوان دەدا).

**١٠٥٥**- أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ قَالَتْ: مَا أُبَالِي أَصَلَّيْتُ فِي الْحِجْرِ أَمْ فِي الْبَيْتِ[١].

واتە: عائیشەی دایکی باوەڕداران ﷺ گوتوویەتی: گوێ پێ نادەم ئاخۆ نوێژ لە حیجر بکەم یان لەناو بەیت (چونکە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە کە ئاخۆ حیجر بە بەیت حیسابە؟ ئەویش فەرموویەتی: بەڵێ، بۆیە پێی وایە وەکوو یەکن).

**١٠٥٦**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ بَعْضَ عُلَمَائِنَا يَقُولُ: مَا حُجِرَ الْحِجْرُ، فَطَافَ النَّاسُ مِنْ وَرَائِهِ، إِلاَّ إِرَادَةَ أَنْ يَسْتَوْعِبَ النَّاسُ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ كُلِّهِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە ئیبنو شیهاب ﷺ بووە دەیگوت: گوێم لە زانایانمان بووە دەیانگوت: (هیچ هۆکارێك نییە لەپشت)

---

٢٥٤٧٩، وفي: ٢٦١٤٣؛ والبخاري: ١٥٨٣، وفي: ٣٣٦٨، وفي: ٤٤٨٤؛ ومسلم: المناسك: ٣٩٩؛ والنسائي: ٢٩٠٠؛ وابن حبان: ٣٨١٥؛ وأبي يعلى الموصلي: ٤٣٦٣؛ والقابسي: ٦٠، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧٩؛ وأبو يعلى الموصلي: ٤٣٦٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٠، عن مالك به.

ئەوەی کە ڕێگری لە حیجر کراوە (لەوەی خەڵك تەوافی لەناو بکەن) بەڵکوو خەڵك تەواف لەدواوەی دەکەن، تەنها مەبەست ئەوە بووە گشت خەڵکی جێگەیان ببێتەوە لە تەوافی بەیتدا.

## ٣٤- نیمچەڕاکردن لە تەوافدا[1]

**١٠٥٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيْهِ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ[2].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەوافدا لە بەردەڕەشەکەوە بەڕاکردنێکی هێواشی هەنگاوکورت ڕایکرد تا دەگەیشتەوە بەردەڕەشەکە، سێ سوڕانەوە (واتە سێ سوڕانەوە بەڕاکردنی هێواش و چوار سوڕانەوەش بەڕۆیشتنی ئاسایی).

**١٠٥٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ الأَمْرُ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: زانایان بەردەوام لەسەر ئەو بۆچوونە بوون لە ناوچەکەمان (واتە لەسەر ئەوە بوون کە تەواف دەبێ بەڕۆیشتنێکی تۆزێك خێرا ئەنجام بدرێت).

**١٠٥٩-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَرْمُلُ مِنَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ، إِلَى الْحَجَرِ الأَسْوَدِ، ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ[3].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ سێ جار لە بەردەڕەشەکەوە بەڕاکردنێکی هێواشی هەنگاوکورت ڕایکرد تا

---

(١) ـ الرَّمَلُ فِي الطَّوَافِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨١؛ والحدثاني: ٥٤١أ في المناسك؛ وابن حنبل: ١٥٢٠٨؛ ومسلم: المناسك: ٢٣٥؛ والنسائي: ٢٩٤٤؛ وابن حبان: ٣٨١٣؛ والدارمي: ١٨٤٠؛ وأبو يعلى الموصلي: ١٨١٠؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٤٨٩٦؛ والقابسي: ١٤٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٣، عن مالك به.

دەگەیشتەوە بەردەڕەشەکە، سێ جار، وە چوار جاریش بەڕۆیشتنی ئاسایی ڕۆیشت (کە بە هەردووکی دەکاتە حەوت جار).

**١٠٦٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ يَسْعَى الأَشْوَاطَ الثَّلاَثَةَ يَقُولُ:

اللهُمَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَا ... وَأَنْتَ تُحْيِي بَعْدَ مَا أَمَتَّا.

يَخْفِضُ صَوْتَهُ بِذَلِكَ(١).

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): باوکم کاتێ تەوافی بەیتی دەکرد لە سێ خوولدا بەخێرایی دەڕۆیشت و دەیگوت: «اللهُمَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَا ... وَأَنْتَ تُحْيِي بَعْدَ مَا أَمَتَّا» واتە: پەروەردگارا هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ، وە تۆ زیندوو دەکەیتەوە دوای ئەوەی دەمرێنی.

بەدەنگی نزم دەیگوت.

**١٠٦١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ مِنَ التَّنْعِيمِ، قَالَ: ثُمَّ رَأَيْتُهُ يَسْعَى حَوْلَ الْبَيْتِ الأَشْوَاطَ الثَّلاَثَةَ(٢).

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری ﷺ لە تەنعیم بینیوە ئیحرامی بە عومرە بەستووە، دەڵێ: دواتر بینیم لەدەورەی بەیت لە سێ خوولانەوەدا بەخێرایی دەڕۆیشت.

**١٠٦٢-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا أَحْرَمَ مِنْ مَكَّةَ، لَمْ يَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَتَّى يَرْجِعَ مِنْ مِنًى، وَكَانَ لاَ يَرْمُلُ إِذَا طَافَ حَوْلَ الْبَيْتِ، إِذَا أَحْرَمَ مِنْ مَكَّةَ(٣).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٤؛ والحدثاني: ٥٤٢ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٥؛ والحدثاني: ٥٤٢أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٥٦ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٤؛ والحدثاني: ٥٥٣أ في المناسك؛ والشيباني، ٥٢٠ في الحج، كلهم عن مالك به.




واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ ئیحرامی لە مەککە دەبەست، تەوافی بەیت و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەی ئەنجام نەدەدا تاوەکوو لە مینا دەگەڕایەوە، جا کاتێ تەوافی بەیتی دەکرد ڕاینەدەکرد ئەگەر ئیحرامی لە مەککە بەستبا.

## ٣٥- دەستلێدانی ڕوکنی بەردەڕەشەکە لە تەوافدا[1]

**١٠٦٣-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ، وَرَكَعَ الرَّكْعَتَيْنِ، وَأَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، اسْتَلَمَ الرُّكْنَ الأَسْوَدَ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ تەوافی بەیتی تەواو دەکرد و دوو ڕکات نوێژی دەکرد و دەیەویست دەربچێت بۆ صەفا و مەڕوە، (ئەو کات) دەستی دەدا لە ڕوکنی بەردەڕەشەکە بەر لەوەی دەربچێت.

**١٠٦٤-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: كَيْفَ صَنَعْتَ يَا أَبَا مُحَمَّدٍ فِي اسْتِلَامِ الرُّكْنِ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: اسْتَلَمْتُ وَتَرَكْتُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَصَبْتَ[3].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی فەرموو: ئەی ئەبو موحەممەد لە دەستلێدانی ڕوکنی بەردەڕەشەکە چیت کرد؟ عەبدوڕڕەحمانیش گوتی: دەستم لێ دا و جێمهێشت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: پێکاوتە.

---

(١) ـ الِاسْتِلَامُ فِي الطَّوَافِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٦؛ والحدثاني: ٥٤١ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٧؛ والحدثاني: ٥٤١ ب في المناسك، عن مالك به.

**١٠٦٥-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ يَسْتَلِمُ الأَرْكَانَ كُلَّهَا، لاَ يَدَعُ الْيَمَانِيَ إِلاَّ أَنْ يُغْلَبَ عَلَيْهِ[(١)].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: باوکم کاتێ تەوافی بەیتی دەکرد دەستی دەدا لە گشت ڕوکنەکان (گشت زاوییەکانی بەیت)، وازی نەدەهێنا لە دەستلێدان لە ڕوکنە یەمانییەکان تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەسەڵاتی بەسەردا نەشکابا (لەبەر قەڕەباڵغی و پاڵەپەستۆ).

## ٣٦- ماچکردنی ڕوکنی بەردەڕەشەکە لە کاتی دەستلێداندا[(٢)]

**١٠٦٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ لِلرُّكْنِ الأَسْوَدِ: إِنَّمَا أَنْتَ حَجَرٌ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَبَّلَكَ، مَا قَبَّلْتُكَ، ثُمَّ قَبَّلَهُ[(٣)].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە کاتێکدا تەوافی بەدەوری بەیتدا دەکرد بە ڕوکنی بەردەڕەشەکەی گوت: تۆ تەنها بەردێکی، ئەگەر من نەمبینیایە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچت دەکات، ئەوە ماچم نەدەکردی، دواتر ماچی کرد.

**١٠٦٧-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: سَمِعْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَسْتَحِبُّ إِذَا رَفَعَ الَّذِي يَطُوفُ بِالْبَيْتِ يَدَهُ عَنِ الرُّكْنِ الْيَمَانِي، أَنْ يَضَعَهَا عَلَى فِيهِ[(٤)].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە هەندێك لە زانایان بووە بەچاك و سوننەتیان زانیوە کاتێ ئەو کەسەی تەواف بەدەوری بەیتدا دەکات ئەگەر دەستی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٨؛ والحدثاني: ٥٥١ ب في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ تَقْبِيلُ الرُّكْنِ الأَسْوَدِ فِي الاسْتِلَامِ.

(٣) ـ موقوف صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٨٩؛ والحدثاني: ٥٥١ في المناسك، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٠؛ والحدثاني: ٥٥١أ في المناسك، عن مالك به.




بۆ ڕوكنی یەمانی بەرز كردەوە، (سوننەت و چاك وایە دوای دەستبەرزكردنەوە) دەستی بخاتە سەر دەمی (وەك ئاماژەیەك بۆ ماچكردن).

## ٣٧- دوو ڕكاتەكانی تەواف[١]

١٠٦٨- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يَجْمَعُ بَيْنَ السُّبْعَيْنِ لاَ يُصَلِّي بَيْنَهُمَا، وَلَكِنَّهُ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ كُلِّ سُبْعٍ رَكْعَتَيْنِ، فَرُبَّمَا صَلَّى عِنْدَ الْمَقَامِ أَوْ عِنْدَ غَيْرِهِ[٢].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی (عادەتی وا بوو) دوو تەوافە حەوت شەوت و خولەكانی بەیەكەوە كۆ نەدەكردەوە بەوەی نوێژیان لە نێوان نەكات، بەڵكوو لەدوای هەر حەوت تەوافێك دوو ڕكات نوێژی دەكرد، هەندێ جار لەلای مەقامی ئیبڕاهیم نوێژەكەی دەكرد یان لە شوێنێكی دیكە.

١٠٦٩- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الطَّوَافِ، إِنْ كَانَ أَخَفَّ عَلَى الرَّجُلِ أَنْ يَتَطَوَّعَ بِهِ، فَيَقْرُنَ بَيْنَ الأَسْبُوعَيْنِ أَوْ أَكْثَرَ، ثُمَّ يَرْكَعُ مَا عَلَيْهِ مِنْ رُكُوعِ تِلْكَ السُّبُوعِ؟ قَالَ: لاَ يَنْبَغِي ذَلِكَ، وَإِنَّمَا السُّنَّةُ أَنْ يُتْبِعَ كُلَّ سُبْعٍ رَكْعَتَيْنِ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی تەواف، ئەگەر هاتوو لەسەر كەسەكە وا سوك بوو لە تەوافی سوننەتدا دوو تەواف یان زیاتری حەوتدانەیی بەیەكەوە بلكێنێ، دواتر چەند نوێژی كەوتۆتە سەر بەهۆی تەوافەكان گشتی ئەنجام بدات؟ گوتی: ئاوا نابێت، بەڵكوو سوننەت وایە دوای هەموو حەوت تەوافێك دوو ڕكات نوێژی بەدوادا بكرێت.

---

(١) ـ رَكْعَتَا الطَّوَافِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩١؛ والحدثاني: ٥٥٤ في المناسك؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٤٨٠٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٢، عن مالك به.




**١٠٧٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَدْخُلُ فِي الطَّوَافِ فَيَسْهُو حَتَّى يَطُوفَ ثَمَانِيَةَ أَوْ تِسْعَةَ أَطْوَافٍ، قَالَ: يَقْطَعُ، إِذَا عَلِمَ أَنَّهُ قَدْ زَادَ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَلاَ يَعْتَدُّ بِالَّذِي كَانَ زَادَ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَبْنِيَ عَلَى التِّسْعَةِ، حَتَّى يُصَلِّيَ سُبْعَيْنِ جَمِيعًا، لأَنَّ السُّنَّةَ فِي الطَّوَافِ، أَنْ يُتْبِعَ كُلَّ سُبْعٍ رَكْعَتَيْنِ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی دەچێتە ناو تەواف و هەڵە دەکات (لە حەوت تەواف ناوەستێت) تا هەشت یان نۆ تەواف دەکات، گوتوویەتی: واز دێنێ کاتێ زانی زیادی ئەنجام داوە، دواتر دوو ڕکات نوێژ دەکات و حیساب بۆ ئەو زیادە ناکات کە ئەنجامی داوە و بۆی نییە لەسەر نۆیەکە ئیدی بنیات بنێت تا هەردوو حەوتەکان بەیەکەوە ئەنجام بدات (ئاوا نابێ)، چونکە سوننەت وایە لە تەواف، دوو ڕکات نوێژ لەدوای هەر حەوت تەوافێك بکرێن.

**١٠٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ شَكَّ فِي طَوَافِهِ بَعْدَ مَا يَرْكَعُ رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ، فَلْيَعُدْ، وَلْيُتَمِّمْ طَوَافَهُ عَلَى الْيَقِينِ، ثُمَّ لِيُعِدِ الرَّكْعَتَيْنِ، لأَنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِطَوَافٍ، إِلاَّ بَعْدَ إِكْمَالِ السُّبْعِ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك گومانی پەیدا بوو لە ژمارەی تەوافەکانی (پێی وا بوو کەمتر لە حەوتی کردووە)، دوای ئەوەی دوو ڕکات نوێژی تەوافی کرد، (گوتوویەتی): دەبێ بگەڕێتەوە و لەسەر یەقین و دڵنیایی تەوافەکەی تەواو بکات، دواتر دوو ڕکاتەکە دووبارە بکاتەوە، چونکە نوێژی تەواف بوونی نییە تەنها دوای تەواوکردنی حەوت تەوافی یەقینی نەبێت.

**١٠٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ أَصَابَهُ شَيْءٌ بِنَقْضِ وُضُوئِهِ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، أَوْ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، أَوْ بَيْنَ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ مَنْ أَصَابَهُ ذَلِكَ، وَقَدْ طَافَ بَعْضَ الطَّوَافِ، أَوْ كُلَّهُ، وَلَمْ يَرْكَعْ رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ، فَإِنَّهُ يَتَوَضَّأُ، وَيَسْتَأْنِفُ الطَّوَافَ وَالرَّكْعَتَيْنِ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٤، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٥؛ وفي: ١٢٩٦، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك شتێكی تووش بوو لەوانەی دەستنوێژ دەشكێنن، لە كاتێكدا تەوافی بەیت دەكات، یان خەریكە لە نێوان صەفا و مەڕوە ڕادەكات (و دەستنوێژی دەشكێت)؟ (فەتواكە بەم شێوەیەیە): ئەگەر كەسێك ئەوەی بەسەر هات لە كاتێكدا هەندێ لە تەوافەكانی یان گشت تەوافەكانی كردبوو و دوو ڕكاتەكانی تەوافی نەكردبوو، ئەوە دەبێ دەستنوێژ بگرێت و تەواف و دوو ڕكاتەكان لە سەرەتاوە ئەنجام بداتەوە.

**١٠٧٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَمَّا السَّعْيُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَإِنَّهُ لاَ يَقْطَعُ ذَلِكَ عَلَيْهِ، مَا أَصَابَهُ مِنِ انْتِقَاضِ وُضُوئِهِ، وَلاَ يَدْخُلُ السَّعْيَ، إِلاَّ وَهُوَ طَاهِرٌ بِوُضُوءٍ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوەیە، ئەوە ئەو شتانە نایپچڕێنێ كە دەستنوێژ بەتاڵ دەكەنەوە، وە ناشبێ (بەئەنقەست بەبێدەستنوێژی) دەست بە ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە بكات حەتمەن دەبێ دەستنوێژی هەبێت.

## ٣٨- نوێژكردن دوای بەیانی و عەسر لە تەوافدا[2]

**١٠٧٤-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ الْقَارِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ طَافَ بِالْبَيْتِ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى عُمَرُ طَوَافَهُ، نَظَرَ فَلَمْ يَرَ الشَّمْسَ، فَرَكِبَ حَتَّى أَنَاخَ بِذِي طُوًى، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ[3].

واتە: لە حومەیدی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەبدی قاریء ﷺ هەواڵی پێ داوە (گوتوویەتی): لەگەڵ عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ تەوافی بەیتی كرد دوای نوێژی

---

(١) ـ ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٥؛ وفي: ١٢٩٦، عن مالك به.

(٢) ـ الصَّلاَةُ بَعْدَ الصُّبْحِ وَالْعَصِرْ فِي الطَّوَافِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٧؛ والحدثاني: ٥٥٥ في المناسك؛ والشيباني: ٤٤٠ في الحج، كلهم عن مالك به.

بەیانی، جا کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ تەوافەکەی تەواو کرد، سەیری کرد و خۆری نەبینی (هێشتا هەڵنەهاتبوو)، جا سواری وڵاغەکەی بوو تاوەکوو لە «زی طوا» وشترەکەی یەخ کرد و دوو ڕکات نوێژی کرد.

**١٠٧٥-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ يَطُوفُ بَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَدْخُلُ حُجْرَتَهُ، فَلاَ أَدْرِي مَا يَصْنَعُ[١].

واتە: لە ئەبو زوبەیری مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم ﷺ دەبینی دوای عەسر تەوافی دەکرد، دواتر دەچووە ژوورەکەیەوە، نازانم چی دەکرد (واتە: نازانم دوو ڕکاتەکانی تەوافی لە ژوورەکەی دەکرد یان نا).

**١٠٧٦-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ الْبَيْتَ يَخْلُو بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَبَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ، مَا يَطُوفُ بِهِ أَحَدٌ[٢].

واتە: لە ئەبو زوبەیری مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: بەیتم بینیوە دوای نوێژی بەیانی و دوای نوێژی عەسر چۆڵ بووە، کەس تەوافی بەدەوریدا نەدەکرد.

**١٠٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ بَعْضَ أُسْبُوعِهِ، ثُمَّ أُقِيمَتْ صَلاَةُ الصُّبْحِ، أَوْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَإِنَّهُ يُصَلِّي مَعَ الإِمَامِ، ثُمَّ يَبْنِي عَلَى مَا طَافَ، حَتَّى يُكْمِلَ سُبْعًا، ثُمَّ لاَ يُصَلِّي حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، أَوْ تَغْرُبَ، قَالَ: وَإِنْ أَخَّرَهُمَا حَتَّى يُصَلِّيَ الْمَغْرِبَ، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك هەندێك لە حەوت تەوافەکان ئەنجام بدات، دواتر کاتی نوێژی بەیانی یان عەسر بێت، ئەوە نوێژ لەگەڵ ئیمام دەکات، دواتر تەوافەکانی تەواو دەکات و لەسەر ئەوانەی پێشوو بنیات دەنێت تا حەوتەکان تەواو دەکات، دواتر (دوای نوێژی بەیانی) هیچ نوێژێك ناکات تاوەکوو خۆر هەڵدێ یان تا خۆر ئاوا دەبێ (دوای عەسر)، گوتوویەتی:

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٩٨؛ والحدثاني: ٥٥٥أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه الحدثاني: ٥٥٥ب في المناسك؛ والشيباني: ٤٣٩ في الحج، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٠، عن مالك به.

ئەگەر دوو ڕكاتەكانی تەوافی عەسر دوا بخات تا نوێژی مەغریبیش ئەنجام دەدات ئەوە هیچ كێشەی تیا نییە.

**١٠٧٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَطُوفَ الرَّجُلُ طَوَافًا وَاحِدًا، بَعْدَ الصُّبْحِ وَبَعْدَ الْعَصْرِ، لاَ يَزِيدُ عَلَى سُبْعٍ وَاحِدٍ، وَيُؤَخِّرَ الرَّكْعَتَيْنِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، كَمَا صَنَعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، وَيُؤَخِّرُهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَإِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، صَلاَّهُمَا إِنْ شَاءَ، وَإِنْ شَاءَ أَخَّرَهُمَا، حَتَّى يُصَلِّيَ الْمَغْرِبَ، لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچ كێشە نییە كەسێك تەوافێك بكات (واتە تەوافێكی حەوت شەوتی بكات) دوای نوێژی بەیانی و دوای عەسر، كە زیاتر لە تەوافێكی حەوت شەوتی ئەنجام نەدات و دوو ڕكاتەكانی تەواف دوا بخات تا خۆر هەڵدێت، وەك عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ئەنجامی داوە، وە (كێشەی تیا نییە) پاشی عەسر دوو ڕكاتەكانی تەواف دوا بخات تاوەكوو خۆر ئاوا دەبێت، جا كە خۆر ئاوا بوو ئەگەر ویستی ڕاستەوخۆ ئەنجامیان دەدات، ئەگەر ویستیشی دوایان دەخات تاوەكوو نوێژی مەغریب ئەنجام دەدات، ئەوە هیچ كێشەی تیا نییە (بەو شێوەیە دروستە).

## ٣٩- ماڵئاوایی لە بەیت[٢]

**١٠٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ يَصْدُرَنَّ أَحَدٌ مِنَ الْحَاجِّ، حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ، فَإِنَّ آخِرَ النُّسُكِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: با كەس لە حاجییەكان نەڕۆن تاوەكوو تەوافی بەیت دەكەن، چونكە كۆتا دروشم و قۆناغ و پەرستش تەوافكردنی بەیتە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠١، عن مالك به.

(٢) ـ وَدَاعُ الْبَيْتِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٢؛ والشيباني: ٥١٧ في الحج؛ والشافعي: ٦٢٢؛ والشافعي: ١١٠٩، كلهم عن مالك به.




١٠٨٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي قَوْلِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁: فَإِنَّ آخِرَ النُّسُكِ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ، إِنَّ ذَلِكَ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، لِقَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الحج، وَقَالَ: ﴿ ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ ﴾ الحج، فَمَحِلُّ الشَّعَائِرِ كُلِّهَا، وَانْقِضَاؤُهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی وتەی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ کە گوتوویەتی: کۆتا فەڕیزە لە حەجدا بریتییە لە تەوافی بەیت، (ئیمامی مالیك) گوتوویەتی: ئێمە پێمان وایە والله أعلم (کاتێ ئاوای گوتووە و ئەو بۆچوونەی هەبووە) لەبەر وتەی خوای پەروەردگارە ﷻ کە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الحج، واتە: [هەر کەسێك دروشمەکانی (ئایینی) خوا بەگەورە ڕاگرێت بەڕاستی ئەوە لە تەقوای دڵەکانیانە]، وە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ ﴾ الحج، واتە: [دواتر شوێنی (سەربڕینی قوربانییەکان) لایماڵی دێرینە (کە کەعبەیە)]، کەواتە شوێنی گشت شەعیرە و دروشمەکان و کۆتایی پێهێنانیان هەر لای بەیتە.

١٠٨١- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ رَدَّ رَجُلاً مِنْ مَرِّ الظَّهْرَانِ، لَمْ يَكُنْ وَدَّعَ الْبَيْتَ، حَتَّى وَدَّعَ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ پیاوێکی لە ناوچەی «مَرّ الظَّهْرَان» گەڕاندەوە کە تەوافی وەداع و ماڵئاوایی نەکردبوو، تا تەوافە ماڵئاواییەکەی کرد.

١٠٨٢- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَفَاضَ فَقَدْ قَضَى اللهُ حَجَّهُ، فَإِنَّهُ، إِنْ لَمْ يَكُنْ حَبَسَهُ شَيْءٌ، فَهُوَ حَقِيقٌ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ، وَإِنْ حَبَسَهُ شَيْءٌ، أَوْ عَرَضَ لَهُ، فَقَدْ قَضَى اللهُ حَجَّهُ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٣، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٤، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٥، عن مالك به.




واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: هەر كەسێك تەوافی ئیفازە بكات ئەوە خوا ﷻ حەجەكەی بۆ تەواو كردووە، جا ئەگەر هیچ شتێك پەكی نەخست ئەوە شایستەیە كۆتا شتی تەوافی بەیت بێت (واتە تەوافی وەداع و ماڵئاوایی)، وە ئەگەر شتێك بووە ڕێگری یان شتێكی بۆ پێش هات، ئەوە (پێویست ناكات و) خوا حەجەكەی تەواو كردووە.

**١٠٨٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً جَهِلَ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ، حَتَّى صَدَرَ، لَمْ أَرَ عَلَيْهِ شَيْئًا، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ قَرِيبًا، فَيَرْجِعَ، فَيَطُوفَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ يَنْصَرِفَ، إِذَا كَانَ قَدْ أَفَاضَ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك نەزانێت كۆتا شتی بریتییە لە تەوافی بەیت (تەوافی ماڵئاوایی)، تاوەكوو دەڕوات، ئەوە بۆچوونم وایە هیچی لەسەر نییە تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە نزیك بێت، ئەو كات با بگەڕێتەوە و تەوافی بەیت بكات، دواتر بڕوات، (بە مەرجێك) ئەگەر تەوافی ئیفازەی كردبوو.

## ٤٠- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی تەواف[٢]

**١٠٨٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنِّي أَشْتَكِي، فَقَالَ: طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ، قَالَتْ: فَطُفْتُ رَاكِبَةً بَعِيرِي، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَئِذٍ يُصَلِّي إِلَى جَانِبِ الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ[٣].**

واتە: لە ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: شەكوای حاڵی خۆم لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ كرد بەوەی نەخۆشم و ئازارم هەیە،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٦، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الطَّوَافِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٢؛ والحدثاني: ٥٥٢ في المناسك؛ والشيباني: ٤٧٦ في الحج؛ وابن حنبل: ٢٦٥٢٨، وفي: ٢٦٧٥٧؛ والبخاري: ٤٦٤، وفي: ١٦١٩، وفي: ١٦٣٣، وفي: ٤٨٥٣؛ ومسلم: المناسك: ٢٥٨؛ والنسائي: ٢٩٢٥، وفي: ٢٩٢٧؛ وأبو داود: ١٨٨٢؛ وابن ماجه: ٢٩٩٤؛ وابن حبان: ٣٨٣٠، وفي: ٣٨٣٣؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٦١؛ وأبو يعلى الموصلي: ٦٩٧٦؛ والقابسي: ٩١، كلهم عن مالك به.




ئەویش فەرمووی: لەدواوەی خەڵك بەسواری وڵاخ تەواف بكە، ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێت: جا بەسواری وشترەكەم تەوافم كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو كاتەدا لە تەنیشت بەیت نوێژی دەكرد، لە كاتێكدا (لەناو نوێژەكەی) سورەتی (والطُّورِ * وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ی دەخوێند[١].

**١٠٨٥-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ ﵀، أَنَّ أَبَا مَاعِزٍ الأَسْلَمِيَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سُفْيَانَ ﵀ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ تَسْتَفْتِيهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَقْبَلْتُ، أُرِيدُ أَنْ أَطُوفَ بِالْبَيْتِ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِبَابِ الْمَسْجِدِ، هَرَقْتُ الدِّمَاءَ، فَرَجَعْتُ حَتَّى ذَهَبَ ذَلِكَ عَنِّي، ثُمَّ أَقْبَلْتُ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، هَرَقْتُ الدِّمَاءَ، فَرَجَعْتُ حَتَّى ذَهَبَ ذَلِكَ عَنِّي، ثُمَّ أَقْبَلْتُ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، هَرَقْتُ الدِّمَاءَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: إِنَّمَا ذَلِكِ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ اسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، ثُمَّ طُوفِي[٢].

واتە: لە ئەبو زوبەیری مەكییەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو ماعیزی ئەسلەمی كە عەبدوڵڵای كوڕی سوفیانە ﵀ هەواڵی پێ داوە بەوەی لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ دانیشتبوو و ئافرەتێك هات بۆ لای و پرسیاری لێ كرد و گوتی: من هاتم ویستم تەوافی بەیت بكەم گەیشتمە بەر دەرگای مزگەوت و خوێنم هات (واتە خوێنم بینی نەمزانی حەیزە یان نا)، جا گەڕامەوە تا خوێنەكەم نەما، دواتر هاتمەوە تاگەیشتمەوە بەر دەرگای مزگەوت خوێنم هاتەوە، جا گەڕامەوە تا خوێنەكەم نەما، دواتر هاتمەوە تاگەیشتمەوە بەر دەرگای مزگەوت خوێنم هاتەوە، جا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ گوتی: ئەوە تەنها لێدانێكە لەلایەن شەیتانەوە، خۆت بشۆرە دواتر شوێنی خوێنەكە بە پەڕۆیێك ببەستە، دواتر تەواف بكە.

---

(١) ـ تێبینی: تەوافكردنی عائیشە ﵂ لەسەر پشتی وشتر بۆ ناچاری و عوزر بووە، ئەگینا بەبێ عوزر لەلای ئیمامی مالیك دروست نییە و لەلای ئیمامی شافیعیش مەكروهە.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٥؛ والحدثاني: ٥٤٩ في المناسك؛ والشيباني: ٤٧١ في الحج، كلهم عن مالك به.




١٠٨٦- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ كَانَ إِذَا دَخَلَ مَكَّةَ مُرَاهِقًا خَرَجَ إِلَى عَرَفَةَ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَعْدَ أَنْ يَرْجِعَ(١).

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ وَاسِعٌ إِنْ شَاءَ اللهُ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﵁ هەموو جار کاتێ بەکاتێکی تەنگ دەچوو بۆ مەککە (واتە کاتی تاخیر دەچوو بۆ حەج)، ڕاستەوخۆ دەردەچوو بۆ عەرەفە بەر لەوەی تەوافی قدوم و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام بدات، دواتر دوای ئەوەی دەگەڕایەوە تەوافی ئیفازەی دەکرد و (ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەی ئەنجام دەدا، تەوافی قدومیشی لەسەر نەدەما، چونکە تەنها لەسەر ئەو کەسەیە کە کاتەکەی تەنگ نییە و عوزری نییە).

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: إن شاء الله بابەتەکە فراوانە و مەجالی تیا هەیە و دروستە.

١٠٨٧- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﵀: هَلْ يَقِفُ الرَّجُلُ فِي الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ الْوَاجِبِ عَلَيْهِ، يَتَحَدَّثُ مَعَ الرَّجُلِ؟ فَقَالَ: لاَ أُحِبُّ ذَلِكَ لَهُ(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێ کرا: ئایا کەسێك لە تەوافی واجبدا بۆی دروستە قسە لەگەڵ کەسێکی دیکە بکات؟ گوتی: ئەوەم پێ باش نییە بۆی.

١٠٨٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ يَطُوفُ أَحَدٌ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، إِلاَّ وَهُوَ طَاهِرٌ(٣).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: کەس تەواف بەدەوری بەیتدا ناکات و لە نێوان صەفا و مەڕوە ڕاناکات حەتمەن دەبێ دەستنوێژی هەبێت.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٦؛ والحدثاني: ٥٤٩أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٩؛ والحدثاني: ٥٥٠أ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٨.




## ٤١- دەستپێکردن لە صەفاوە، لە ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەدا[١]

**١٠٨٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﭫ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ حِينَ خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ وَهُوَ يُرِيدُ الصَّفَا، وَهُوَ يَقُولُ: نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﭫ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێ لە مزگەوت دەرچوو لە کاتێکدا دەچوو بۆ صەفا، دەیفەرموو: بەوە دەست پێ دەکەین کە خوای پەروەردگار ﷻ دەستی پێ کردووە، جا بە صەفا دەستی پێ کرد (کە مەبەستی ئەو ئایەتە بوو: [إن الصفا والمروة من شعائر الله] کە سەرەتا باسی صەفا کراوە).

**١٠٩٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﭫ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا وَقَفَ عَلَى الصَّفَا، يُكَبِّرُ ثَلاَثًا، وَيَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، يَصْنَعُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، وَيَدْعُو، وَيَصْنَعُ عَلَى الْمَرْوَةِ مِثْلَ ذَلِكَ[٣].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﭫ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لەسەر صەفا دەوەستا سێ جار «الله أکبر»ی دەکرد و دەیفەرموو: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ» واتە: ((هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله، تاکە و هیچ هاوبەشی نییە، خاوەنداری و ستایش هەر هی ئەوە، وە هەر ئەو بەسەر گشت شتێکدا بەتوانایە))، سێ جار ئەوەی ئەنجام دەدا، نزاشی دەکرد، وە لەسەر مەڕوەش هەمان شتی ئەنجام دەدا.

---

(١) ـ الْبَدْءُ بِالصَّفَا فِي السَّعْيِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١١؛ والحدثاني: ٥٤٣ في المناسك؛ وابن حنبل: ١٥٢٠٩؛ والنسائي: ٢٩٦٩؛ والقابسي: ١٤٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٢؛ والحدثاني: ٥٤٣أ في المناسك؛ وابن حنبل: ١٥٢١٠؛ والنسائي: ٢٩٧٢؛ وابن حبان: ٣٨٤٢؛ والقابسي: ١٤٤، كلهم عن مالك به.




**١٠٩١**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ وَهُوَ عَلَى الصَّفَا يَدْعُو يَقُولُ: اللهُمَّ إِنَّكَ قُلْتَ: ﴿ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر، وَإِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ كَمَا هَدَيْتَنِي لِلإِسْلاَمِ أَنْ لاَ تَنْزِعَهُ مِنِّي، حَتَّى تَتَوَفَّانِي وَأَنَا مُسْلِمٌ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بووە لە کاتێکدا لەسەر صەفا بوو نزای دەکرد و دەیگوت: پەروەردگارە خۆت فەرمووتە: ﴿ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر، واتە: [داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە]، وە تۆ بەڵێنەکانت دوا ناخەیت و جێبەجێ دەبن، جا من داوات لێ دەکەم چۆن ڕێنموویت کردم بۆ ئیسلام ئاواش داوات لێ دەکەم ئیسلامم لێ دانەماڵی و لە ئیسلام دوور نەکەومەوە تاوەکوو دەمگەڕێنیتەوە لای خۆت لە کاتێکدا هەر مسوڵمان بم.

## ٤٢- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە[٢]

**١٠٩٢**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ: أَرَأَيْتِ قَوْلَ اللهِ ﷻ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، فَمَا عَلَى الرَّجُلِ شَيْءٌ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: كَلاَّ، لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ، لَكَانَتْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا، إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي الأَنْصَارِ، كَانُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ، وَكَانَتْ مَنَاةُ حَذْوَ قُدَيْدٍ، وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ أَنْ يَطُوفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٣؛ والحدثاني: ٥٤٣ ب في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ السَّعْيِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٦؛ والحدثاني: ٥٤٥ في المناسك؛ والبخاري: ١٧٩٠، وفي: ٤٤٩٥؛ وأبو داود: ١٩٠١؛ وابن حبان: ٣٨٣٩؛ والقابسي: ٤٦٧، كلهم عن مالك به.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: لە کاتێکدا من بچووك بووم بە عائیشەی دایکی باوەڕدارانم گوت: ئەو وتەی خوای پەروەردگار ﷻ چۆن تێ دەگەی: ﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، (من وا تێ دەگەم) مرۆڤ هیچی لەسەر نییە ئەگەر لە نێوانیاندا ڕانەکات (و ئەنجامیان نەدات، ئایا تێگەیشتنەکەم تەواوە)، عائیشە ﷺ گوتی: نەخێر، ئەگەر ئاوا بێت کە تۆ دەیڵێیت ئەوە دەبوو (ئایەتەکە ئاوا بووایە): ﴿ ۞ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن لَّا يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، ئەو ئایەتە دەربارەی ئەنصارەکان دابەزی، ئەوان حەجیان بۆ مەنات دەکرد (کە بت و پەیکەرێك بوو) جا مەنات دەکەوتە بەرانبەر قودەید (کە گوندێك بوو دەکەوتە نێوان مەککە و مەدینە)، جا ئەوان تا تووشی تاوان نەبن بەرانبەر مەنات خۆیان دەپاراست لەوەی ڕابکەن لە نێوان صەفا و مەڕوە (ئەوە ببووە دروشمێکی سەرەکی)، جا کاتێ ئیسلام هات پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەوە، خوای پەروەردگاریش ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾ ﴾ البقرة، واتە: [بەڕاستی صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی دینی خوان، جا هەر کەسێك حەجی ماڵی خوای کرد یان عومرەی کرد، هیچ خراپە و تاوانی ناگات کە هاتوچۆ و سەعی لە نێوان صەفا و مەڕوە بکات].

١٠٩٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، كَانَتْ عِنْدَ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، فَخَرَجَتْ تَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، مَاشِيَةً، وَكَانَتِ امْرَأَةً ثَقِيلَةً، فَجَاءَتْ حِينَ انْصَرَفَ النَّاسُ مِنَ الْعِشَاءِ، فَلَمْ تَقْضِ طَوَافَهَا، حَتَّى نُودِيَ بِالأُولَى مِنَ الصُّبْحِ، فَقَضَتْ طَوَافَهَا فِيمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ.

وَكَانَ عُرْوَةُ ﷺ، إِذَا رَآهُمْ يَطُوفُونَ عَلَى الدَّوَابِّ، يَنْهَاهُمْ أَشَدَّ النَّهْيِ، فَيَعْتَلُّونَ لَهُ بِالْمَرَضِ، حَيَاءً مِنْهُ، فَيَقُولُ لَنَا، فِيمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ: لَقَدْ خَابَ هَؤُلَاءِ وَخَسِرُوا[1].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٧؛ والحدثاني: ٥٤٦ في المناسك؛ وفي: ٥٤٦أ في المناسك، كلهم عن مالك به.




واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەودەی کچی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ خێزانی عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ بوو، جا دەرچوو بەپێ تەوافی نێوان صەفا و مەڕوەی دەکرد لە حەج ـ یان لە عومرە ـ، لە کاتێکدا ئافرەتێکی قورس و بەسەنگ و بەکێش بوو، جا لەو کاتەوەی خەڵك لە نوێژی عیشا گەڕانەوە ئەو دەرچوو بۆ ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوە و تەواف، جا ڕۆیشتنەکەی پێ تەواو نەکرا تاوەکوو بانگی یەکەمی نوێژی بەیانی درا، ئینجا تەواف و ڕۆیشتنەکەی نێوان صەفا و مەڕوەی تەواو کرد.

جا عوڕوە ﷺ کاتێ دەیبینی خەڵکانێك لەسەر وڵاخ ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدەن زۆر بەتوندی نەهی لێ دەکردن و قەدەغەی دەکردن (کەچی سەودە لەگەڵ ئەو نارەحەتییەش بەسواری وڵاخ صەفا و مەڕوەی نەکرد)، بۆیە لە شەرمی عوڕوە بەهانەیان بە نەخۆشی دەهێنایەوە (دەیانگوت: نەخۆشین)، عوڕوەش لەناو ئێمە دەیگوت: ئەوانە زەرەرمەند و خەسارەتمەندن (مەبەستی ئەوە بوو ئەگەر بەدرۆ نەخۆشی بکەنە هۆکار بۆ ئەوەی بەسواری وڵاخ صەفا و مەڕوە بکەن ئەوە خەسارەتمەندن).

**١٠٩٤- [فتوى]** قَالَ مالِكٌ ﷺ: مَنْ نَسِيَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فِي عُمْرَةٍ، فَلَمْ يَذْكُرْ حَتَّى يَسْتَبْعِدَ مِنْ مَكَّةَ: أَنَّهُ يَرْجِعُ فَيَسْعَى، وَإِنْ كَانَ قَدْ أَصَابَ النِّسَاءَ، فَلْيَرْجِعْ، فَلْيَسْعَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَتَّى يُتِمَّ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ تِلْكَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ عَلَيْهِ عُمْرَةٌ أُخْرَى وَالْهَدْيُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك لە عومرەدا ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەی لەیاد کرد تاوەکوو لە مەککە دوور کەوتەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات، وە ئەگەر جیماعی لەگەڵ خێزانی کرد (ئەوە فەریزەکەی بەتاڵ دەبێتەوە) و دەبێ بگەڕێتەوە و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام بدات، تاوەکوو هەموو ئەوەی لەم عومرەیە ماوە تەواوی دەکات، دواتریش عومرەیەکی دیکەی لەسەر واجبە لەگەڵ هەدی.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٩؛ والحدثاني: ٥٤٧أ في المناسك، عن مالك به.

١٠٩٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالِكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَلْقَاهُ الرَّجُلُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَيَقِفُ مَعَهُ يُحَدِّثُهُ؟ فَقَالَ: لاَ أُحِبُّ لَهُ ذَلِكَ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی كەسێك كە كەسێكی دیكە پێی دەگات لە نێوان صەفا و مەڕوە و لەگەڵی ڕادەوەستێت و قسەی لەگەڵ دەكات (ئایا حوكمی چۆنە)؟ گوتی: ئەوەم پێ باش نییە بۆی.

١٠٩٦- **[فتوى]** قَالَ مالِكٍ ﷺ: وَمَنْ نَسِيَ مِنْ طَوَافِهِ شَيْئًا، أَوْ شَكَّ فِيهِ، فَلَمْ يَذْكُرْ إِلاَّ وَهُوَ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَإِنَّهُ يَقْطَعُ سَعْيَهُ، ثُمَّ يُتِمُّ طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عَلَى مَا يَسْتَيْقِنُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ، ثُمَّ يَبْتَدِئُ سَعْيَهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك بەشێك لە تەوافەكەی لەیاد چوو یان گومانی دەربارەی دروست بوو و نەهاتەوە یادی لە كاتێكدا خەریكی ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوە بوو، ئەوە ڕۆیشتنەكەی نێوان صەفا و مەڕوە دەپچڕێنێت (دەبێ وازبێنێت)، دواتر تەوافەكەی لەسەر یەقین و دڵنیایی تەواو دەكات و دوو ڕكات نوێژی تەواف دەكات، دواتر دەست بە ڕۆیشتنی نێوان صەفا و مەڕوە دەكاتەوە.

١٠٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا نَزَلَ مِنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، مَشَى حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي، سَعَى حَتَّى يَخْرُجَ مِنْهُ[3].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ لە صەفا و مەڕوە دەهاتە خوارەوە، بەئاسایی دەڕۆیشت تاوەكوو قاچەكانی دەكەتنە ناو بەتنولوادی، لەوێوە بەخێرایی دەڕۆیشت تا لێی دەردەچوو.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢١، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٤؛ والحدثاني: ٥٤٤ في المناسك؛ وابن حنبل: ١٥٢١١؛ والنسائي: ٢٩٨١؛ والقابسي: ١٤٦، كلهم عن مالك به.

١٠٩٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ جَهِلَ فَبَدَأَ بِالسَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ؟ قَالَ: لِيَرْجِعْ، فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ لِيَسْعَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَإِنْ جَهِلَ ذَلِكَ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ مَكَّةَ وَيَسْتَبْعِدَ، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ إِلَى مَكَّةَ، فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَيَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَإِنْ كَانَ أَصَابَ النِّسَاءَ رَجَعَ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَتَّى يُتِمَّ مَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنْ تِلْكَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ عَلَيْهِ عُمْرَةٌ أُخْرَى وَالْهَدْيُ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك كە نەزانێت و دەست بە ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە دەكات بەر لەوەی تەوافی بەیت بكات، گوتوویەتی: دەبێ بگەڕێتەوە و تەوافی بەیت بكات، دواتر ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام بدات، جا ئەگەر هەر نەیزانی و زانیاری پێ نەگەیشت تاوەكوو لە مەككە چووە دەرەوە و دوور كەوتەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەككە و تەوافی بەیت دەكات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات، وە ئەگەر (ڕۆیشت و دواتر) جیماعی لەگەڵ خێزانی كرد (ئەوە فەڕیزەكەی بەتاڵ دەبێتەوە) و دەبێ بگەڕێتەوە و تەوافی بەیت بكات و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام بدات، تاوەكوو هەموو ئەوەی ماوە لەم عومڕەیە تەواوی دەكات، دواتریش عومڕەیەكی دیكەی لەسەر واجبە لەگەڵ هەدی.

## ٤٣- ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە[2]

١٠٩٩- عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ ﷺ، أَنَّ نَاسًا تَمَارَوْا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ بِعَرَفَةَ، فَشَرِبَ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢٢؛ وفي: ١٣٢٣؛ والحدثاني: ٥٤٨ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩١؛ وفي: ١٣٦٥ في المناسك؛ والحدثاني: ٤٧٦ في الصيام؛ وفي: ٥٦٢ في المناسك؛ والشيباني: ٣٦٩ في الصيام؛ وابن حنبل: ٢٦٩٢٥؛ والبخاري: ١٦٦١، وفي: ١٩٨٨، وفي: ١٩٨٨؛ ومسلم: الصيام: ١١٠؛ وأبو داود: ٢٤٤١؛ وابن حبان: ٣٦٠٦؛ والقابسي: ٤٢٥، كلهم عن مالك به.




واتە: لە ئوممو فەزڵی کچی حاریسەوە ﵄ گێردراوەتەوە بەوەی (جارێکیان) خەڵکانێك لەلای ئەو دەمەقاڵێیان لەگەڵ یەکدی کرد لە ڕۆژی عەرەفەدا دەربارەی بەڕۆژوبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێکیان گوتیان: بەڕۆژووە، هەندێکی دیکەش گوتیان: بەڕۆژوو نییە، منیش جامە شیرێکم بۆ ڕەوانە کرد لە کاتێکدا لە عەرەفە لەسەر وشترەکەی وەستابوو، جا خواردیەوە (دەرکەوت بەڕۆژوو نییە).

**١١٠٠-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﵀، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ كَانَتْ تَصُومُ يَوْمَ عَرَفَةَ، قَالَ الْقَاسِمُ: وَلَقَدْ رَأَيْتُهَا عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، يَدْفَعُ الإِمَامُ، ثُمَّ تَقِفُ حَتَّى يَبْيَضَّ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ مِنَ الأَرْضِ، ثُمَّ تَدْعُو بِشَرَابٍ، فَتُفْطِرُ[١].

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو دەبوو، قاسم دەڵێت: لە ئێوارەی عەرەفە عائیشەم بینیوە ئیمام ڕۆیشتووە، دواتر ئەو هەر ماوەتەوە و وەستاوە تاوەکوو لە نێوان خۆی و خەڵکی زەوی سپی بووە (واتە تا شوێنەکە چۆڵ بووە و نێوانێکی زۆر کەوتۆتە بەینی عائیشە و خەڵکی)، دواتر داوای خواردنەوەی کردووە و ڕۆژووەکەی شکاندووە.

## ٤٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژەکانی مینا[٢]

**١١٠١-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ أَيَّامِ مِنًى[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژووبوونی ڕۆژەکانی مینای قەدەغە کردووە (کە بریتییە لە سێ ڕۆژەکانی تەشریق).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٣؛ وفي: ١٣٦٦؛ والحدثاني: ٤٧٦ب في الصيام؛ وفي: ٥٦٢أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ أَيَّامِ مِنًى.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٥؛ وفي: ١٣٦٧؛ والحدثاني: ٤٧٧ في الصيام؛ وفي: ٥٦٣ في المناسك؛ والشيباني: ٣٧٠ في الصيام، كلهم عن مالك به.




**١١٠٢-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ عَبْدَ اللهِ بْنَ حُذَافَةَ أَيَّامَ مِنًى يَطُوفُ، يَقُولُ: إِنَّمَا هِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللهِ[١].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژەکانی مینا (کە دەکاتە ڕۆژەکانی تەشریق) عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی نارد بەناو خەڵکیدا دەسوڕایەوە دەیگوت: ئەو ڕۆژانە تەنها ڕۆژی خواردن و خواردنەوە و زیکر و یادی پەروەردگارن (واتە ڕۆژانی بەڕۆژووبوون نین).

**١١٠٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ الأَضْحَى[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە بەڕۆژووبوونی دوو ڕۆژ: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان.

**١١٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَبِيهِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ فَوَجَدَهُ يَأْكُلُ، قَالَ: فَدَعَانِي، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ: هَذِهِ الأَيَّامُ الَّتِي نَهَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِهِنَّ، وَأَمَرَنَا بِفِطْرِهِنَّ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: هِيَ أَيَّامُ التَّشْرِيقِ.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی هەواڵی داوە چۆتە لای عەمری کوڕی عاصی باوکی و ﷺ بینیویەتی خواردن دەخوات، دەڵێ: جا بانگی کردم (تا منیش خواردنەکە بخۆم)، منیش پێم گوت: من بەڕۆژووم، ئەویش گوتی: ئەو ڕۆژانە بریتین لەو ڕۆژانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووین لە بەڕۆژووبوونیان و فەرمانی پێ کردووین بە خواردن تیایاندا.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٦؛ وفي: ١٣٦٨؛ والحدثاني: ٥٦٣أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٢؛ وفي: ١٣٨٧؛ والحدثاني: ٤٧٦أ في الصيام؛ وفي: ٥٦٣ب في المناسك؛ وابن حنبل: ١٠٦٤٢؛ ومسلم: الصيام: ١٣٩؛ وابن حبان: ٣٥٩٨؛ والقابسي: ٩٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه ابن حنبل: ١٧٨٠٣؛ وأبو داود: ٢٤١٨، عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕۆژەكان بریتیبوون لە ئەیامولتەشریق (سێ ڕۆژەكانی تەشریق).

## ٤٥- ئەوەی دروستە لە هەدی (قوربانی حەج)[1]

**١١٠٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَهْدَى جَمَلاً كَانَ لأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێكی لە حەجدا ـ یان لە عومرەدا ـ كرد بە هەدی و سەری بڕی، كە پێشتر هی ئەبو جەهلی كوڕی هیشام بوو.

**١١٠٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: ارْكَبْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ، فَقَالَ: ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ فِي الثَّانِيَةِ أَوِ فِي الثَّالِثَةِ[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی بینی وشترێكی بەپێشەخۆ دابوو و لێی دەخوڕی، ئەویش فەرمووی: سواری بە، كابراش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە وشتری هەدی و سەربڕینە بۆ بەیت (چۆن دەبێ سواری بم)، ئەویش لە جاری دووەم یان سێیەم فەرمووی: سواری بە هەی لەناو بچی (واتە شایستەی بە كردەوەی خۆت لەناو بچی، ئەوەتا خاوەنی شەرع پێت دەڵێت: دروستە، هێشتا هەر دەڵێی: ئاخر چۆن دەبێ!).

---

(١) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ الْهَدْيِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٩؛ والحدثاني: ٥٢٢ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٣؛ والحدثاني: ٥٢٢أ في المناسك؛ والشيباني: ٤١٢ في الحج؛ وابن حنبل: ١٠٣٢٠؛ والبخاري: ١٦٨٩، وفي: ٢٧٥٥، وفي: ٦١٦٠؛ ومسلم: المناسك: ٣٧١؛ والنسائي: ٢٧٩٩؛ وأبو داود: ١٧٦٠؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٢٧؛ والقابسي: ٣٥٠، كلهم عن مالك به.

١١٠٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يُهْدِي فِي الْحَجِّ بَدَنَتَيْنِ بَدَنَتَيْنِ، وَفِي الْعُمْرَةِ بَدَنَةً بَدَنَةً، قَالَ: وَرَأَيْتُهُ فِي الْعُمْرَةِ يَنْحَرُ بَدَنَةً وَهِيَ قَائِمَةٌ فِي دَارِ خَالِدِ بْنِ أَسِيدٍ، وَكَانَ فِيهَا مَنْزِلُهُ، قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ طَعَنَ فِي لَبَّةِ بَدَنَتِهِ، حَتَّى خَرَجَتِ الْحَرْبَةُ مِنْ تَحْتِ كَتِفِهَا[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﷺ بینیوە لە حەجدا دوو دوو وشتری دەکردن بە هەدی و سەری دەبڕین، لە عومرەشدا یەك یەکی دەکرد بە هەدی، دەڵێ: جا بینیومە لە عومرەدا لە کاتێکدا وشترەکە وەستاوبوو سەری بڕیوە لە ماڵی خالیدی کوڕی ئوسەید کە عەبدوڵڵا ماڵەکەی لەوێ بوو، دەڵێ: بینیم لە شادەماری وشترەکەیدا تاوەکوو حەڕبەکەی لەژێر پیلی وشترەکە دەرچوو.

١١٠٨- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ أَهْدَى جَمَلاً فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ وشترێکی کرد بە هەدی لە حەج یان لە عومرە.

١١٠٩- عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الْقَارِئِ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ الْمَخْزُومِيَّ ﷺ أَهْدَى بَدَنَتَيْنِ، إِحْدَاهُمَا بُخْتِيَّةٌ[٣].

واتە: لە ئەبو جەعفەری قاریئەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەی مەخزومی ﷺ دوو وشتری کردن بە هەدی، یەکێکیان وشترێکی گەورەی دووکۆپاڵی بوو.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٠؛ والحدثاني: ٥٢٣ في المناسك؛ والشيباني: ٤٠٦ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٩٩؛ وفي: ١٢٠١؛ والحدثاني: ٥٢٢ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٢، عن مالك به.




**١١١٠-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا نُتِجَتِ النَّاقَةُ، فَلْيُحْمَلْ وَلَدُهَا حَتَّى يُنْحَرَ مَعَهَا، فَإِنْ لَمْ يُوجَدْ لَهُ مَحْمَلٌ، حُمِلَ عَلَى أُمِّهِ حَتَّى يُنْحَرَ مَعَهَا[١].

واته: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: ئەگەر وشتری هەدی زا، ئەوە با بەچکەکەی سواری وشترێك بکرێت تاوەکوو لەگەڵ دایکی سەر ببڕدرێت، جا ئەگەر وشترێك یان شتێك نەبوو سواری بکەن، ئەوە با لەسەر پشتی دایکی سوار بکرێت تاوەکوو لەگەڵی سەر ببڕدرێت.

**١١١١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ قَالَ: إِذَا اضْطُرِرْتَ إِلَى بَدَنَتِكَ، فَارْكَبْهَا رُكُوبًا غَيْرَ فَادِحٍ، وَإِذَا اضْطُرِرْتَ إِلَى لَبَنِهَا، فَاشْرَبْ، بَعْدَ مَا يَرْوَى فَصِيلُهَا، فَإِذَا نَحَرْتَهَا، فَانْحَرْ فَصِيلَهَا مَعَهَا[٢].

واته: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی باوکی گوتوویەتی: کاتێ ناچار بووی و پێویستت بە وشترە هەدییەکەت بوو (بۆ سواربوون)، ئەوە سواری بە بەسواربوونێکی هیلاککەر و ئەستەم نا (واتە وشترەکە ماندوو مەکە بە هەڵگرتنی شتی قورس و زۆر سواربوون)، وە کاتێ پێویستیت بە شیرەکەی بوو، ئەوە بیخۆرەوە دوای ئەوەی بێچووەکەی تێر شیر دەبێ (ئەگەر بێچووی هەبوو)، جا کاتێ سەرت بڕی ئەوە بێچووەکەشی لەگەڵ سەر ببڕە.

## ٤٦- مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەڵی هەدی کاتێ لێ دەخوڕدرێت[٣]

**١١١٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَهْدَى هَدْيًا مِنَ الْمَدِينَةِ، قَلَّدَهُ، وَأَشْعَرَهُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، يُقَلِّدُهُ قَبْلَ أَنْ يُشْعِرَهُ، وَذَلِكَ فِي مَكَانٍ وَاحِدٍ، وَهُوَ مُوَجَّهٌ لِلْقِبْلَةِ، يُقَلِّدُهُ بِنَعْلَيْنِ، وَيُشْعِرُهُ مِنَ الشِّقِّ الأَيْسَرِ، ثُمَّ يُسَاقُ مَعَهُ حَتَّى يُوقَفَ بِهِ مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ، ثُمَّ يَدْفَعُ بِهِ مَعَهُمْ

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٤؛ والحدثاني: ٥٢٨أ في المناسك؛ والشيباني: ٤١٣ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٥؛ والحدثاني: ٥٢٨ ب في المناسك؛ والشيباني: ٤١١ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ الْعَمَلُ فِي الْهَدْيِ حِيَن يُسَاقُ.




إِذَا دَفَعُوا، فَإِذَا قَدِمَ مِنًى غَدَاةَ النَّحْرِ، نَحَرَهُ قَبْلَ أَنْ يَحْلِقَ أَوْ يُقَصِّرَ، وَكَانَ هُوَ يَنْحَرُ هَدْيَهُ بِيَدِهِ، يَصُفُّهُنَّ قِيَامًا، وَيُوَجِّهُهُنَّ إِلَى الْقِبْلَةِ، ثُمَّ يَأْكُلُ وَيُطْعِمُ[١].

واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کاتێ هەدی ئەنجام دەدا و ئاژەڵی هەدی لە مەدینەوە دەبرد، لە زولحولەیفە (کە شوێنی ئیحرامبەستنی ئەهلی مەدینەیە، لەوێ) ملپێچی دەکرد و نیشانەداری دەکرد، جا بەر لەوەی نیشانەداری بکات ملپێچی دەکرد، لە یەك شوێنیش ئەنجامی دەدا، لە کاتێکدا ڕووی دەکردە قیبلە بە دوو نەعل ملپێچی دەکرد (جووتە نەعلەیەکی دەکردە مل)، وە نیشانەداری دەکرد بە شەقکردنی لای چەپی کۆپاڵی پشتی، دواتر لێی دەخوڕی و لەگەڵ خۆی دەیبرد تاوەکوو لەگەڵ خەڵکی لە عەرەفە ڕایدەگرت، دواتر کاتێ خەڵکەکە دەڕۆیشتن ئەویش لەگەڵ خۆی ئاژەڵەکەی دەبرد، جا کاتێ لە بەیانییەکەی ڕۆژی قوربان دەچوو بۆ مینا، سەری دەبڕی پێش ئەوەی سەری بتاشێ یان کورتی بکاتەوە، جا هەدییەکەی خۆی بە دەستی خۆی سەر دەبڕی، بەپێوە ڕیزی دەکردن و ڕووی دەکردنە قیبلە (ئینجا سەری دەبڕین)، دواتر دەیخوارد و دەرخواردی خەڵکیشی دەدا و دەیبەخشی[٢].

**١١١٣**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا طَعَنَ فِي سَنَامِ هَدْيِهِ وَهُوَ يُشْعِرُهُ، قَالَ: بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ[٣].

واته: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ چەقۆی لە کۆپاڵی هەدییەکەی دەدا کاتێ نیشانەی دەکرد (تاوەکوو بزانرێت ئاژەڵی هەدیە و خەڵك بۆ خۆیان لە گۆشتەکەی ببەن) دەیگوت: بسم الله والله أكبر.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٦؛ والحدثاني: ٥٢٤ في المناسك؛ والشيباني: ٣٩٩ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: لەلای ئیمامی مالیك سوننەتە لای چەپەی ببڕێت و نیشانەدار بکرێت، بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی سوننەتە لای ڕاستە بێت.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٧؛ والحدثاني: ٥٢٤أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٠٠ في الحج، كلهم عن مالك به.

**١١١٤-** عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يَقُولُ: الْهَدْيُ مَا قُلِّدَ وَأُشْعِرَ وَوُقِفَ بِهِ بِعَرَفَةَ[١].

واتە: لە نافیعەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەیگوت: هەدی ئەوەیە کە پەتی لە مل بکرێت و (دوای کوشتنەوە پشتی بە بڕین) نیشانە بکرێت و لە عەرەفە ڕابگیرێت.

**١١١٥-** عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ يُجَلِّلُ بُدْنَهُ الْقُبَاطِيَّ، وَالأَنْمَاطَ، وَالْحُلَلَ، ثُمَّ يَبْعَثُ بِهَا إِلَى الْكَعْبَةِ، فَيَكْسُوهَا إِيَّاهَا[٢].

واتە: لە نافیعەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وشترەکەی بە قوماشی قوبتی (کە لە میصر دروست دەکرا) وە بە کورتانی سوف و تاخمی دوو پارچەیی نەرمەکورتانی بۆ دەکردن، دواتر (دوای سەربڕینی وشترەکان) قوماشی کورتانەکانی بۆ کەعبە دەنارد و بەبەر کەعبەدا دەکرا (دەکرا بە پۆشاك بۆ کەعبە).

**١١١٦-** عَنْ مَالِكٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ دِينَارٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، مَا كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يَصْنَعُ بِجِلَالِ بُدْنِهِ حِينَ كُسِيَتِ الْكَعْبَةُ هَذِهِ الْكِسْوَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ يَتَصَدَّقُ بِهَا[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی دینار رَحِمَهُ اللَّهُ کردووە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا چی لە نەرمە کورتانەکانی وشترەکانی دەکرد کاتێ کەعبە ئەو بەرگەی بەبەردا دەکرا؟ ئەویش گوتی: دەیکردن بە خێر و صەدەقە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٨؛ والحدثاني: ٥٢٥أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٠٨ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٠؛ والحدثاني: ٥٢٥ب في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١١؛ والحدثاني: ٥٢٦ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٧ في الحج، كلهم عن مالك به.

**١١١٧- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي الضَّحَايَا وَالْبُدْنِ: الثَّنِيُّ فَمَا فَوْقَهُ[١].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەربارەی قوربانییەکان و وشترەکانی هەدی دەیگوت: لە ثهنی بەسەرەوە دروستە.

تێبینی: ثهنی لە وشتردا بریتییە لەوەی پێنج ساڵی تەواو کردووە و چۆتە ناو ساڵی شەشەمەوە، وە ثهنی لە مانگادا بریتییە لەوەی دوو ساڵی تەواو کردووە چۆتە ناو ساڵی سێیەم، وە لە بزن و مەڕیش بریتییە لەوەی ساڵێکی تەواو کردووە و چۆتە ناو ساڵی دووەم.

**١١١٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ لاَ يَشُقُّ جِلاَلَ بُدْنِهِ وَلاَ يُجَلِّلُهَا، حَتَّى يَغْدُوَ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ[٢].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ پێستی ئاژەڵی هەدییەکەی شەق نەدەکرد و نەرمەکورتانی بۆ نەدەپۆشی تاوەکوو لە میناوە دەچوو بۆ عەرەفە (ئینجا ئەوانەی ئەنجام دەدا).

**١١١٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ لِبَنِيهِ: يَا بَنِيَّ لاَ يُهْدِيَنَّ أَحَدُكُمْ للهِ مِنَ الْبُدْنِ شَيْئًا يَسْتَحْيِي أَنْ يُهْدِيَهُ لِكَرِيمِهِ، فَإِنَّ اللهَ أَكْرَمُ الْكُرَمَاءِ، وَأَحَقُّ مَنِ اخْتِيرَ لَهُ[٣].**

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە بە منداڵەکانی خۆی دەگوت: ئەی ڕۆڵەکانم با هیچ کەسێك لە ئێوە نەچێت ئاژەڵێك بۆ خوا بکات بە هەدی کە شەرم بکات بیکات بە دیاری بۆ عەزیز

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٢؛ والشيباني: ٦٢٩ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٢ في الضحايا، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٣؛ والحدثاني: ٥٢٦أ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٦ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٤؛ والحدثاني: ٥٢٦ب في المناسك، عن مالك به.

و خۆشەویستێکی، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە هەموو بەڕێزەکان بەڕێزتر و گەورەترە، وە شایستەترینی ئەو کەسانەیە کە شتیان بۆ هەڵدەبژێردرێت (کەواتە دەبێ چاکترین شت لە پێناوی ئەو دابنرێ).

## ٤٧- کردار دەربارەی هەدی کاتێ خەریکە بمرێت یان کاتێ ون دەبێت[1]

**١١٢٠**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ، عَنْ أَبِيهِ ، أَنَّ صَاحِبَ هَدْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنَ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كُلُّ بَدَنَةٍ عَطِبَتْ مِنَ الْهَدْيِ فَانْحَرْهَا، ثُمَّ أَلْقِ قِلَادَتَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ خَلِّ بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ يَأْكُلُونَهَا[2].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە  گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە  گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئەو کەسەی بۆ جێبەجێکردنی هەدی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاسپێردرابوو (کە ناوی ناجیە بوو) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بکەم لەو ئاژەڵە هەدییەی خەریکە دەمرێت؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەر ئاژەڵێکی هەدی کە خەریك بوو لەناو بچێت و بمرێت سەری ببڕە، دواتر پەت و ملپێچەکەی بخەرە سەر خوێنەکە (تا خەڵك بزانن ئاژەڵی هەدییە و بۆ خۆیان سوودی لێ ببینن)، دواتر لێی گەڕێ خەڵك بیخۆن.

**١١٢١**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ سَاقَ بَدَنَةً تَطَوُّعًا، فَعَطِبَتْ فَنَحَرَهَا ثُمَّ خَلَّى بَيْنَهَا وَبَيْنَ النَّاسِ يَأْكُلُونَهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهَا، أَوْ أَمَرَ مَنْ يَأْكُلُ مِنْهَا، غَرِمَهَا[3].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە  گێردراوەتەوە گوتوویەتی: هەر کەسێك وشترێك بە خێر ببات بۆ بەیت و وشترەکە خەریك بوو بمرێت (بە هەر

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي الْهَدْيِ إِذَا عَطِبَ أَوْ ضَلَّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٥؛ والحدثاني: ٥٢٧ في المناسك؛ والشيباني، ٤٠٥ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٦؛ والحدثاني: ٥٢٧أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٠٤ في الحج، كلهم عن مالك به.




هۆكارێك بێت) جا سەری بڕی و بۆ خەڵكی جێی هێشت تا بیخۆن، ئەوە هیچی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر خۆی لێی خوارد یان فەرمانی بە كەسێك كرد لێی بخوات، ئەوە غەرامە دەكرێت (دەبێت دووبارە ئاژەڵێكی دیكە بكاتەوە بە هەدی).

**١١٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، مِثْلَ ذَلِكَ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسیشەوە ﭬ هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

**١١٢٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَهْدَى بَدَنَةً، جَزَاءً أَوْ نَذْرًا، أَوْ هَدْيَ تَمَتُّعٍ، فَأُصِيبَتْ فِي الطَّرِيقِ، فَعَلَيْهِ الْبَدَلُ[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر كەسێك وشترێك بكاتە هەدی بۆ كەفارەت بێت یان بۆ نەزر بێت، یان هەدی تەمەتوع بێت، جا وشترەكە تووشی شتێك بوو لە ڕێگادا (فەوتا)، ئەوە ئاژەڵێكی دیكەی لەسەر واجبە.

**١١٢٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭬ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَهْدَى بَدَنَةً، ثُمَّ ضَلَّتْ أَوْ مَاتَتْ، فَإِنَّهَا إِنْ كَانَتْ نَذْرًا، أَبْدَلَهَا، وَإِنْ كَانَتْ تَطَوُّعًا، فَإِنْ شَاءَ أَبْدَلَهَا، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَهَا[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر كەسێك ئاژەڵێكی كردە هەدی، دواتر ون بوو یان مرد، ئەوە ئەگەر نەزر بوو دەبێ یەكێكی دیكە دابنێت، وە ئەگەر خێر بوو، (ئەوە سەرپشكە) ئەگەر حەز بكات یەكێكی دیكە دادەنێت ئەگەر حەزیش بكات وازی لێ دێنێت.

**١١٢٥- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: لاَ يَأْكُلُ صَاحِبُ الْهَدْيِ مِنَ الْجَزَاءِ وَالنُّسُكِ شَيْئًا[٤].

---

(١) ـ موقوف ضعيف.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٩؛ والحدثاني: ٥٢٨ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢١٨؛ والحدثاني: ٥٢٧ج في المناسك؛ والشيباني: ٤١٤ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٨؛ وفي: ١٣٧٦ في المناسك، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷫ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە زانایان بووە دەیانگوت: خاوەنی هەدی لە کەفارەت و لە حەجدا هیچ لە ئاژەڵەکە ناخوات.

## ٤٨- هەدی کەسی موحریم کاتێ تووشی خێزانی دەبێ (واتە کاتێ جیماعی لەگەڵ دەکات)[١]

**١١٢٦-** عَنْ مَالِكٍ ﷫: أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﭫ سُئِلُوا: عَنْ رَجُلٍ أَصَابَ أَهْلَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ بِالْحَجِّ؟ فَقَالُوا: يَنْفُذَانِ لِوَجْهِهِمَا، حَتَّى يَقْضِيَا حَجَّهُمَا، ثُمَّ عَلَيْهِمَا حَجُّ قَابِلٍ وَالْهَدْيُ، قَالَ: وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﭬ: وَإِذَا أَهَلاَّ بِالْحَجِّ مِنْ عَامٍ قَابِلٍ، تَفَرَّقَا حَتَّى يَقْضِيَا حَجَّهُمَا[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷫ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئەبو هوڕەیرە ﭫ پرسیاریان لێکرا دەربارەی پیاوێك تووشی جیماع بووە لەگەڵ خێزانەکەی لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامی حەجدا بووە؟ گوتیان: بەشێوەی خۆیان بەردەوام دەبن تاوەکوو حەجەکەیان کۆتایی پێ دەهێنن، دواتر لە ساڵی داهاتوو حەج و هەدییان لەسەر واجبە، دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﭬ ئەوەشی گوت: کاتێ ئیحرام دەبەستن بە حەج لە ساڵی داهاتوو، لێك جیا دەبنەوە تاوەکوو حەجەکەیان کۆتایی پێ دەهێنن (تاوەکوو دووبارە تووشی بەتاڵبوونەوەی حەج نەبنەوە).

**١١٢٧-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷫، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷫ يَقُولُ: مَا تَرَوْنَ فِي رَجُلٍ وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَلَمْ يَقُلْ لَهُ الْقَوْمُ شَيْئًا، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷫: إِنَّ رَجُلاً وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَبَعَثَ إِلَى الْمَدِينَةِ يَسْأَلُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ: يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا إِلَى عَامٍ قَابِلٍ، فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷫: لِيَنْفُذَا لِوَجْهِهِمَا، فَلْيُتِمَّا حَجَّهُمَا الَّذِي أَفْسَدَا، فَإِذَا فَرَغَا رَجَعَا، فَإِنْ أَدْرَكَهُمَا حَجٌّ قَابِلٌ، فَعَلَيْهِمَا الْحَجُّ وَالْهَدْيُ، وَيُهِلاَّنِ مِنْ حَيْثُ أَهَلاَّ بِحَجِّهِمَا الَّذِي أَفْسَدَا، وَيَتَفَرَّقَانِ حَتَّى يَقْضِيَا حَجَّهُمَا[٣].

---

(١) ـ هَدْيُ الْمُحْرِمِ إِذَا أَصَابَ أَهْلَهُ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٠؛ والحدثاني: ٥٢٩ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣١ في المناسك، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُهْدِيَانِ جَمِيعًا بَدَنَةً بَدَنَةً.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: بۆچوونتان چییە دەربارەی پیاوێك کە تووشی جیماع دەبێت لەگەڵ خێزانەکەی لە کاتێکدا پیاوەکە لە ئیحرامدایە؟ جا خەڵکەکە هیچ قسەیەکیان بۆ نەکرد، سەعید ﷺ خۆی گوتی: پیاوێك تووشی جیماع بوو لەگەڵ خێزانەکەی لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا (کەسێکی) نارد بۆ مەدینە تا پرسیار بکات دەربارەی ئەوە، جا هەندێ لە زانایان گوتیان: بۆ ساڵی داهاتوو لێك جیا دەکرێنەوە، سەعیدی کوڕی موسەیەبیش ﷺ گوتی: وەك خۆیان ئەنجامی دەدەن و حەجەکەیان تەواو دەکەن کە فەساد و بەتاڵیان کردۆتەوە، جا کاتێ تەواو بوون دەگەڕێنەوە (بۆ ماڵەوە)، وە کاتێ لە ساڵی داهاتوو کاتی حەج هات، ئەوە حەج و هەدییان لەسەر واجبە و لەو شوێنەش ئیحرام دەبەستن کە لەو حەجە بەستبوویان کە بەتاڵیان کردەوە، وە لێك جیا دەبنەوە تاوەکوو حەجەکەیان کۆتایی پێ دەهێنن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەردووکیان ئاژەڵ دەکەن بە هەدی، هەر یەکەیان ئاژەڵێك.

١١٢٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي رَجُلٍ وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ فِي الْحَجِّ، مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَنْ يَدْفَعَ مِنْ عَرَفَةَ وَيَرْمِيَ الْجَمْرَةَ: إِنَّهُ يَجِبُ عَلَيْهِ الْهَدْيُ وَحَجُّ قَابِلٍ، قَالَ: فَإِنْ كَانَتْ إِصَابَتُهُ أَهْلَهُ بَعْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ، فَإِنَّمَا عَلَيْهِ أَنْ يَعْتَمِرَ وَيُهْدِيَ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ حَجُّ قَابِلٍ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە تووشی جیماع بووە لەگەڵ خێزانەکەی لە حەجدا لە ماوەی دەرچوون لە عەرەفە و ڕەجمکردندا (کە دەکاتە شەوی مانەوە لە موزدەلیفە)، گوتوویەتی: لە ساڵی داهاتودا هەدی و حەجی لەسەر واجبە، گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر جیماعکردنەکەی دوای ڕەجمکردن بوو، ئەوە لەسەری واجبە عومرە بکات و هەدی پێشکەش بکات، حەجی لەسەر واجب نییە لە ساڵی داهاتوودا.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٢؛ والحدثاني: ٥٣٠أ في المناسك، عن مالك به.

١١٢٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالَّذِي يُفْسِدُ الْحَجَّ أَوِ الْعُمْرَةَ، حَتَّى يَجِبَ عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ الْهَدْيُ فِي الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، الْتِقَاءُ الْخِتَانَيْنِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَاءٌ دَافِقٌ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو شتەی حەج و عومرە بەتاڵ دەکاتەوە بەشێوەیەك لە حەجەکەدا یان لە عومرەکەدا هەدیشی لەسەر واجب دەبێت، بریتییە لە بەیەکگەیشتنی دوو دامێنەکان، هەرچەندە مەنیش دەرنەچێت.

١١٣٠- **[فتوى]** قَالَ: وَيُوجِبُ ذَلِكَ أَيْضًا الْمَاءُ الدَّافِقُ، إِذَا كَانَ مِنْ مُبَاشَرَةٍ، فَأَمَّا رَجُلٌ ذَكَرَ شَيْئًا، حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ مَاءٌ دَافِقٌ، فَلاَ أَرَى عَلَيْهِ شَيْئًا[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هاتنەوەی ئاو (مەنی) هەدی واجب دەکات، ئەگەر بەهۆی (جیماع و دەستگەمەی) ڕاستەوخۆ بێت، بەڵام کەسێك خەیاڵێك بکات تا دەگاتە ئەو ئاستەی ئاوی بێتەوە، ئەوە هیچی لەسەر نییە (واتە هەدی لەسەر واجب نییە).

١١٣١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً قَبَّلَ امْرَأَتَهُ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ ذَلِكَ مَاءٌ دَافِقٌ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ فِي الْقُبْلَةِ إِلاَّ الْهَدْيُ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاوێك خێزانەکەی ماچ بکات و ئاوهاتنەوە ڕوو نەدات، هیچ شتێکی لەسەر نییە لە ماچەکەدا جگە لە هەدی.

١١٣٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى الْمَرْأَةِ الَّتِي يُصِيبُهَا زَوْجُهَا وَهِيَ مُحْرِمَةٌ مِرَارًا، فِي الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، وَهِيَ لَهُ فِي ذَلِكَ مُطَاوِعَةٌ، إِلاَّ الْهَدْيُ وَحَجُّ قَابِلٍ، إِنْ أَصَابَهَا فِي الْحَجِّ، وَإِنْ كَانَ أَصَابَهَا فِي الْعُمْرَةِ، فَإِنَّمَا عَلَيْهَا قَضَاءُ الْعُمْرَةِ الَّتِي أَفْسَدَتْ وَالْهَدْيُ[٤].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ئافرەتەی پیاوەکەی چەندین جار جیماعی لەگەڵ کردووە لە کاتێکدا ئافرەتەکە لەژێر ئیحرامدایە و خۆی ڕازییە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٤؛ وفي: ١٢٣٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٤؛ وفي: ١٢٣٧، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٥، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٦، عن مالك به.



بەو کارە، گوتوویەتی: لە ساڵی داهاتوودا تەنها یەك هەدی و حەجی لەسەر واجبە، ئەوە ئەگەر لە حەجدا جیماعی لەگەڵ کردبوو، وە ئەگەر لە عومرەدا جیماعی لەگەڵ کردبوو، ئەوە تەنها قەزاکردنەوەی ئەو عومرەی لەسەرە کە بەتاڵی کردۆتەوە لەگەڵ پێشکەشکردنی هەدی.

## ٤٩- هەدی ئەو کەسەی حەجی لەکیس دەچێت[1]

**١١٣٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي سُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ خَرَجَ حَاجًّا، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالنَّازِيَةِ مِنْ طَرِيقِ مَكَّةَ، أَضَلَّ رَوَاحِلَهُ، وَإِنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ يَوْمَ النَّحْرِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: اصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْمُعْتَمِرُ، ثُمَّ قَدْ حَلَلْتَ، فَإِذَا أَدْرَكَكَ الْحَجُّ قَابِلاً، فَاحْجُجْ، وَأَهْدِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ هەواڵی پێ دام بەوەی (جارێکیان) ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ بە حاجی دەرچوو (واتە بەنییەتی حەج دەرچوو)، تا گەیشتە نازیە (کە شوێنێکە لەسەر ڕێگەی مەککە، (لەوێ) کۆمەڵەکەی خۆی ون کرد، جا لە ڕۆژی قوربان چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ (دوای ئەوەی حەجی لێ فەوتا بوو) و ئەوەی بۆ باس کرد، عومەریش ﷺ پێی گوت: ئەوە ئەنجام بدە کە کەسی عومرەکار ئەنجامی دەدات، دواتر حەڵاڵ دەبیتەوە (بەم شێوەیە لەژێر ئیحرام دێیتە دەرەوە)، جا کاتێ لە ساڵی داهاتودا کاتی حەج هات، حەج بکە و ئاژەڵێك کە بۆت بگونجێت بیکە بە هەدی.

**١١٣٤-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ هَبَّارَ بْنَ الأَسْوَدِ ﷺ، جَاءَ يَوْمَ النَّحْرِ، وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَنْحَرُ هَدْيَهُ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَخْطَأْنَا الْعِدَّةَ، كُنَّا نَرَى أَنَّ هَذَا الْيَوْمَ يَوْمُ عَرَفَةَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: اذْهَبْ إِلَى مَكَّةَ، فَطُفْ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ، وَانْحَرُوا هَدْيًا، إِنْ كَانَ مَعَكُمْ،

---

(١) ـ هَدْيُ مَنْ فَاتَهُ الْحَجُّ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٩؛ والحدثاني: ٥٣١ في المناسك؛ والشافعي: ٥٨٤، كلهم عن مالك به.

ثُمَّ احْلِقُوا أَوْ قَصِّرُوا وَارْجِعُوا، فَإِذَا كَانَ عَامٌ قَابِلٌ، فَحُجُّوا وَأَهْدُوا، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعَ[١].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): هەبباری کوڕی ئەسوەد ﷜ لە ڕۆژی قوربان هات لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتتاب ﷜ ئاژەڵی هەدی خۆی سەر دەبڕی، هەببار ﷜ گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران کاتەکەمان لێ تێکچوو پێمان وا بوو ئەوڕۆ ڕۆژی عەرەفەیە (نەمانزانی ڕۆژی قوربانە و عەرەفە فەوتاوە)، ئیمامی عومەریش ﷜ گوتی: خۆت و ئەوانەشی کە لەگەڵتن بڕۆن بۆ مەککە و تەواف بکەن، وە هەدیش سەر ببڕن ئەگەر پێتانە، دواتر سەرتان بتاشن یان کورتی بکەنەوە و بگەڕێنەوە، جا کە (مەوسیمی حەجی) ساڵی داهاتوو هات، گشتتان حەج بکەن و هەدی سەر ببڕن، ئەگەر کەسێکیش نەیبوو (هەدی بکڕێت) با سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت و حەوت ڕۆژیش کاتێ گەڕایەوە ماڵەوە.

**١١٣٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷀ: وَمَنْ قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، ثُمَّ فَاتَهُ الْحَجُّ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ قَابِلاً، وَيَقْرُنُ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، وَيُهْدِي هَدْيَيْنِ: هَدْيًا لِقِرَانِهِ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ، وَهَدْيًا لِمَا فَاتَهُ مِنَ الْحَجِّ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: هەر کەسێك حەج و عومرە بەیەکەوە گرێ بدات، دواتر حەجی بفەوتێت، ئەوە لە ساڵی داهاتوو حەجی لەسەر واجبە، وە حەج و عومرە بەیەکەوە گرێ دەدات و دوو هەدی ئەنجام دەدات: هەدییەك بۆ بەیەکەوەبەستنی حەج و عومرەکەی، هەدییەکیش بۆ فەوتانی حەجەکەی.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٠؛ والشيباني: ٤٣١ في الحج؛ والشافعي: ٥٨٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣١ في المناسك، عن مالك به.




## ٥٠- ئەو کەسەی تووشی جیماع دەبێت لەگەڵ خێزانەکەی بەر لەوەی تەوافی ئیفازە بکات[1]

**١١٣٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ وَقَعَ بِأَهْلِهِ وَهُوَ بِمِنًى قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ؟ فَأَمَرَهُ أَنْ يَنْحَرَ بَدَنَةً[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی پیاوێك کە تووشی جیماع ببوو لەگەڵ خێزانەکەی لە مینا بەر لەوەی تەوافی ئیفازە ئەنجام بدات؟ ئەویش فەرمانی پێ کرد وشترێك سەر ببڕێت.

**١١٣٧-** عَنْ عِكْرِمَةَ، مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: لاَ أَظُنُّهُ إِلاَّ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: الَّذِي يُصِيبُ أَهْلَهُ قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ، يَعْتَمِرُ وَيُهْدِي[3].

واتە: لە عیکریمەی خزمەتکاری ئیبنو عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم وایە هەر ئیبنو عەبباسە ﵄ گوتوویەتی: ئەو کەسەی تووشی سەرجێیی دەبێت لەگەڵ خێزانەکەی بەر لەوەی تەوافی ئیفازە بکات، عومرە و هەدی ئەنجام دەدات (بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕییە).

**١١٣٨-** عَنْ مالِكٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ فِي ذَلِكَ مِثْلَ قَوْلِ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ[4].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان بووە دەربارەی ئەو بابەتە هەمان قسەی عیکریمەی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاوەتەوە.

---

(١) ـ مَنْ أَصَابَ أَهْلَهُ قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٨؛ والحدثاني: ٥٣٢ في المناسك؛ والشيباني: ٥١٣ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٩؛ والحدثاني: ٥٣٢أ في المناسك، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٣٩؛ والحدثاني: ٥٣٢أ في المناسك، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویسترین شتە كە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

**١١٣٩- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ نَسِيَ الإِفَاضَةَ حَتَّى خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَرَجَعَ إِلَى بِلَادِهِ؟ فَقَالَ: أَرَى إِنْ لَمْ يَكُنْ أَصَابَ النِّسَاءَ، فَلْيَرْجِعْ، فَلْيُفِضْ، وَإِنْ كَانَ أَصَابَ النِّسَاءَ، فَلْيَرْجِعْ، فَلْيُفِضْ، ثُمَّ لْيَعْتَمِرْ وَلْيُهْدِ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ هَدْيَهُ مِنْ مَكَّةَ وَيَنْحَرَهُ بِهَا، وَلَكِنْ إِنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَهُ مَعَهُ مِنْ حَيْثُ اعْتَمَرَ، فَلْيَشْتَرِهِ بِمَكَّةَ، ثُمَّ لْيُخْرِجْهُ إِلَى الْحِلِّ، فَلْيَسُقْهُ مِنْهُ إِلَى مَكَّةَ، ثُمَّ يَنْحَرُهُ بِهَا[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كە تەوافی ئیفازەی لەیاد چووە تاوەكوو لە مەككە چۆتە دەرەوە و گەڕاوەتەوە شارەكەی؟ گوتی: بۆچوونم وایە ئەگەر هێشتا جیماعی لەگەڵ خێزانی نەكردووە با بگەڕێتەوە و تەوافی ئیفازە بكات، وە ئەگەر جیماعی لەگەڵ ئافرەت كردبێت، با بگەڕێتەوە و تەوافی ئیفازە بكات، دواتر عومرە بكات و هەدی ئەنجام بدات، وە بۆی نییە هەدی لە مەككە بكڕێت و لەوێ سەری ببڕێت، بەڵام ئەگەر هەدی لەگەڵ خۆی نەهێنابوو لەو شوێنەی نییەتی عومرەی لێ هێنا، ئەوە با لە مەككە بیكڕێت و دواتر بۆ دەرەوەی سنووری حەڕەم ببیات و لەوێوە بیهێنێت بۆ مەككە، دواتر لە مەككە سەری ببڕێت.

## ٥١- كەمترینی هەدی[2]

**١١٤٠-** أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: ﴿فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ۝١٩٦﴾ البقرة، شَاةٌ[3].

واتە: عەلی كوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەیگوت: ﴿فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ۝١٩٦﴾ البقرة، [چیتان بۆ گونجا لە ئاژەڵ بیكەن بە قوربانی]، بریتییە لە بزنێك (یان مەڕێك).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٣؛ والحدثاني: ٥٣٣ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٠؛ والشيباني: ٤٥٨ في الحج، عن مالك به.

**١١٤١**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ كَانَ يَقُولُ: ﴿فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ ۝١٩٦﴾ البقرة، شَاةٌ[1].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﵄ دەیگوت: ﴿فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ ۝١٩٦﴾ البقرة، [چیتان بۆ گونجا لە ئاژەڵ بیکەن بە قوربانی]، بریتییە لە بزنێك (یان مەڕێك).

**١١٤٢**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ، لأَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّـٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا ۝٩٥﴾ المائدة، فَمِمَّا يُحْكَمُ بِهِ فِي الْهَدْيِ شَاةٌ، وَقَدْ سَمَّاهَا اللهُ هَدْيًا، وَذَلِكَ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، وَكَيْفَ يَشُكُّ أَحَدٌ فِي ذَلِكَ؟ وَكُلُّ شَيْءٍ لاَ يَبْلُغُ أَنْ يُحْكَمَ فِيهِ بِبَعِيرٍ أَوْ بَقَرَةٍ، فَالْحُكْمُ فِيهِ شَاةٌ، وَمَا لاَ يَبْلُغُ أَنْ يُحْكَمَ فِيهِ بِشَاةٍ، فَهُوَ كَفَّارَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ إِطْعَامِ مَسَاكِينَ[2].

(فەتوا) واتە: واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویسترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّـٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا ۝٩٥﴾ المائدة، واتە: [ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نێچیر مەکوژن لە کاتێکدا ئێوە لەژێر ئیحرامدان، وە ئەوەتان کە بەدەستی ئەنقەست بیکوژێت ئەوە سەربڕینی هاووێنەی ئەو شتەی کوشتوویەتی لە ئاژەڵ و ماڵات لەسەری واجبە (جا بڕیاری ئەوەی کە ئاخۆ نێچیرەکە لە ئاستی چ ئاژەڵێکدایە) دوو پیاوی مسوڵمانی چاك لە خۆتان ئەو بڕیارە دەدەن، کە بەشێوەی قوربانی بگاتە کەعبە (لەوێ بیکاتە قوربانی) یان بەئەندازەی نرخی قوربانییەکە خۆراك بدات بە چەند هەژارێك یان بەئەندازەی ئەو خۆراکدانە ڕۆژوو بگرێت]، جا یەکێك لەوانەی بڕیاری پێ دەدرێت لە هەدیدا بریتییە لە بزن و مەڕ، (چونکە)

(١) ـ موقوف صحيح. ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٥؛ وفي: ١٢٢١؛ وفي: ٢٢٢٤؛ والحدثاني: ٢٧١ب في النذور والكفارات؛ وفي: ٥٣٣أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٠٥؛ وفي: ١٢٢١؛ وفي: ٢٢٢٤؛ والحدثاني: ٢٧١ب في النذور والكفارات؛ وفي: ٥٣٣أ في المناسك، عن مالك به.

خوای پەروەردگار ﷻ ناوی ناوە هەدی، جا ئەوە هیچ ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە، چۆن کەسێك گومان لەوەدا دەکات؟! جا هەر شتێك (کە بکوژرێت) نەگاتە ئەوەی بڕیاری پێ بدرێت بە وشتر یان مانگا، ئەوە تیایدا بڕیار بە بزنێك یان مەڕێك دەدرێت، وە ئەوەی نەگات بەوەی بڕیاری تیادا بە بزنێك بدرێت، ئەوە کەفارەتەکەی ڕۆژووە یان خواردنبەخشینە بە هەژاران.

**١١٤٣**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﭭ كَانَ يَقُولُ: ﴿ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ﴾ البقرة، بَدَنَةٌ أَوْ بَقَرَةٌ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ دەیگوت: ﴿ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ﴾ البقرة [چیتان بۆ گونجا لە ئاژەڵ بیکەن بە قوربانی]، بریتییە لە وشترێك یان مانگایێك.

**١١٤٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﭬ، أَنَّ مَوْلَاةً لِعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يُقَالُ لَهَا: رُقَيَّةُ، أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا خَرَجَتْ مَعَ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِلَى مَكَّةَ، قَالَتْ: فَدَخَلَتْ عَمْرَةُ مَكَّةَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، وَأَنَا مَعَهَا، فَطَافَتْ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ دَخَلَتْ صُفَّةَ الْمَسْجِدِ، فَقَالَتْ: أَمَعَكِ مِقَصَّانِ؟ فَقُلْتُ: لاَ، فَقَالَتْ: فَالْتَمِسِيهِ لِي، فَالْتَمَسْتُهُ حَتَّى جِئْتُ بِهِ، فَأَخَذَتْ مِنْ قُرُونِ رَأْسِهَا، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، ذَبَحَتْ شَاةً[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﭬ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): خزمەتکارێکی عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان کە پێی دەگوترا: ڕوقەییە، هەواڵی بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر داوە بەوەی لەگەڵ عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان دەرچووە بۆ مەککە، دەڵێت: عەمرە لە ڕۆژی تەڕویە چووە ناو مەککە و منیشی لەگەڵ بوو، جا تەوافی بەیتی کرد و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەی ئەنجام دا،

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٢؛ والحدثاني: ٥٣٤ في المناسك؛ والشيباني: ٤٥٩ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٣؛ والحدثاني: ٥٣٤أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٥٧ في الحج، كلهم عن مالك به.

دواتر چووە دواوەی مزگەوت و گوتی: ئایا مقەست لایە؟ منیش گوتم: نەخێر، ئەویش گوتی: بۆمی پەیدا بکە، منیش بۆم پەیدا کرد و بۆم برد، جا هەندێك مووی لە کەزییەکانی قژی کردەوە، جا کاتێ ڕۆژی قوربانی هات، بزنێکی سەربڕی.

## ٥٢- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی هەدی[1]

**١١٤٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ صَدَقَةَ بْنِ يَسَارٍ الْمَكِّيِّ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَقَدْ ضَفَرَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي قَدِمْتُ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: لَوْ كُنْتُ مَعَكَ، أَوْ سَأَلْتَنِي، لأَمَرْتُكَ أَنْ تَقْرِنَ، فَقَالَ الْيَمَانِي: قَدْ كَانَ ذَلِكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، خُذْ مَا تَطَايَرَ مِنْ رَأْسِكَ، وَأَهْدِ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ: وَمَا هَدْيُهُ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ فَقَالَ: هَدْيُهُ، فَقَالَتْ لَهُ: مَا هَدْيُهُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: لَوْ لَمْ أَجِدْ إِلاَّ أَنْ أَذْبَحَ شَاةً، لَكَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَصُومَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە صەدەقەی کوڕی یەساری مەکییەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی خەڵکی یەمەن هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، لە کاتێکدا قژی هۆنی بۆیەوە گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان من تەنها بەنییەتی عومرە هاتووم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ پێی گوت: ئەگەر من لەگەڵت بامە یان پێشتر پرسیارت لێ بکردبامە، ئەوە فەرمانم پێ دەکردی حەج و عومرە بەیەکەوە گرێ بدەی، پیاوە یەمەنییەکەش گوتی: تازە کارەکە بووە (ئەی چۆن قژم کورت بکەمەوە)، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتی: ئەو مووانەی لە قژت بەرز بوونەتەوە (کە لە هۆنینەوەکە دەرچوون و هاتوونەتە دەرەوە) بیانبڕە و هەدیش ئەنجام بدە، جا ئافرەتێکی خەڵکی عێراق گوتی: جا هەدییەکەی چییە ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان؟ ئەویش گوتی: هەدی خۆی، ئافرەتەکەش پێی گوت: ئاخر هەدییەکەی خۆی چییە؟ جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتی: ئەگەر هیچ پارەم نەبێت جگە لە پارەی سەربڕینی بزنێك،

---

(١) ـ جَامِعُ الْهَدْيِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٥؛ والحدثاني: ٥٣٦ في المناسك، عن مالك به.

ئەوە ئەوەم لەلام خۆشەویستترە لەوەی بەڕۆژوو بیم (واتە ئەگەر بای بزنێکی هەیە با ئاژەڵ بکاتە هەدی، نەك بەڕۆژوو بێت، ئەوەیان چاکترە).

**١١٤٦-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: الْمَرْأَةُ الْمُحْرِمَةُ إِذَا حَلَّتْ لَمْ تَمْتَشِطْ، حَتَّى تَأْخُذَ مِنْ قُرُونِ رَأْسِهَا، وَإِنْ كَانَ لَهَا هَدْيٌ لَمْ تَأْخُذْ مِنْ شَعْرِهَا شَيْئًا، حَتَّى تَنْحَرَ هَدْيَهَا[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئافرەتی موحریم کاتێ حەڵاڵ دەبێتەوە قژی شانە ناکات تا ئەو کاتەی هەندێك موو لە کەزیيەکانی دەکاتەوە، وە ئەگەر هەدی هەبوو ئەوە هیچ لە مووەکانی نابڕێت تاوەکوو هەدییەکەی سەر دەبڕێت.

**١١٤٧- [فتوى]** عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ: لاَ يَشْتَرِكُ الرَّجُلُ وَامْرَأَتُهُ فِي بَدَنَةٍ وَاحِدَةٍ، لِيُهْدِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بَدَنَةً بَدَنَةً[٢].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە هەندێك لە زانایان بووە دەیانگوت: پیاو و خێزانەکەی بەژدار و هاوبەش نابن لە یەك ئاژەڵی هەدی، بەڵکوو دەبێ هەر یەکەیان ئاژەڵێك سەر ببڕێت.

**١١٤٨- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: عَمَّنْ بُعِثَ مَعَهُ بِهَدْيٍ يَنْحَرُهُ فِي حَجٍّ، وَهُوَ مُهِلٌّ بِعُمْرَةٍ، هَلْ يَنْحَرُهُ إِذَا حَلَّ؟ أَمْ يُؤَخِّرُهُ حَتَّى يَنْحَرَهُ فِي الْحَجِّ، وَيُحِلُّ هُوَ مِنْ عُمْرَتِهِ؟ فَقَالَ: بَلْ يُؤَخِّرُهُ حَتَّى يَنْحَرَهُ فِي الْحَجِّ، وَيُحِلُّ هُوَ مِنْ عُمْرَتِهِ[٣].

(فەتوا) واتە: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ کرا دەربارەی ئەو کەسەی بە ئاژەڵی هەدییەوە ڕەوانە کراوە تا لە حەج سەری ببڕێت، لە کاتێکدا خۆی ئیحرامی بە عومرە بەستووە، ئایا سەری دەبڕێت کاتێ لەژێر ئیحرام دەچێتە دەرەوە؟ یان دوای دەخات تاوەکوو سەری ببڕێت لە حەج و خۆیشی لەژێر ئیحرامی عومرەکەی بێتە

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٦؛ والحدثاني: ٥٣٧ في المناسك؛ والشيباني: ٥١٨ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٠؛ والحدثاني: ٥٨٧ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٧، عن مالك به.

دەرەوە؟ گوتی: بەڵكوو دوای دەخات تاوەكوو سەری ببڕێت لە حەجدا و خۆیشی لەژێر ئیحرامی عومرەكەی دێتە دەرەوە.

**١١٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالَّذِي يُحْكَمُ عَلَيْهِ بِالْهَدْيِ فِي قَتْلِ الصَّيْدِ، أَوْ يَجِبُ عَلَيْهِ هَدْيٌ فِي غَيْرِ ذَلِكَ، فَإِنَّ هَدْيَهُ لاَ يَكُونُ إِلاَّ بِمَكَّةَ، كَمَا قَالَ اللهُ ﷻ:﴿ هَدْيًا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة، وَأَمَّا مَا عُدِلَ بِهِ الْهَدْيُ مِنَ الصِّيَامِ أَوِ الصَّدَقَةِ، فَإِنَّ ذَلِكَ يَكُونُ بِغَيْرِ مَكَّةَ، حَيْثُ أَحَبَّ صَاحِبُهُ أَنْ يَفْعَلَهُ، فَعَلَهُ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی بڕیاری پێ دەدرێت دەربارەی هەدی كوشتنی نێچیر، یان هەدییەك كە واجب بێت بەهۆی جگە لە نێچیر، ئەوە نابێ هەدییەكەی لە هیچ شوێنێك ئەنجام بدرێت جگە لە مەككە، وەك خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ هَدْيًا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ﴿٩٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: [بەشێوەیەك هەدییەكە بگات بە كەعبە (لەوێ ئاژەڵەكە سەر ببڕێت)]، وە هەرچی دەربارەی ئەو كەفارەتانەیە كە بەئەندازەی هەدی تەخمین دەكرێت لە ڕۆژوو و خواردن و صەدەقە، ئەوە لە جگە لە مەككەش دروستە ئەنجام بدرێت، لە هەر شوێنێك كە خاوەنەكەی حەز بكات ئەنجامی بدات ئەنجامی دەدات.

**١١٥٠-** عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵀، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵁، فَخَرَجَ مَعَهُ مِنَ الْمَدِينَةِ، فَمَرُّوا عَلَى حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ ﵄، وَهُوَ مَرِيضٌ بِالسُّقْيَا، فَأَقَامَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ جَعْفَرٍ ﵁، حَتَّى إِذَا خَافَ الْفَوَاتَ خَرَجَ، وَبَعَثَ إِلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، وَأَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ ﵂ وَهُمَا بِالْمَدِينَةِ، فَقَدِمَا عَلَيْهِ، ثُمَّ إِنَّ حُسَيْنًا أَشَارَ إِلَى رَأْسِهِ، فَأَمَرَ عَلِيٌّ بِرَأْسِهِ، فَحُلِّقَ، ثُمَّ نَسَكَ عَنْهُ بِالسُّقْيَا، فَنَحَرَ عَنْهُ بَعِيرًا.

قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﵀: وَكَانَ حُسَيْنٌ خَرَجَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ فِي سَفَرِهِ ذَلِكَ إِلَى مَكَّةَ[٢].

واتە: لە ئەبو ئەسمائی خزمەتكاری عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەرەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی هەواڵی داوە لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر ﵁ بووە و لە مەدینە لەگەڵی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٩، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٢٤؛ والحدثاني: ٥٣٥ في المناسك، عن مالك به.

دەرچووە، جا بەلای حوسەینی کوڕی عەلیدا ﷺ تێپەڕ بوون لە کاتێکدا نەخۆش بوو لە سوقیا (کە گوندێکە لە نێوان مەککە و مەدینە)، جا عەبدوڵڵا ﷺ لەلای مایەوە تا ئەو کاتەی (ماوەی حەج کەمێکی ما، جا) ترسا حەجی لەکیس بچێت ئینجا دەرچوو و ناردی بەدوای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئەسمائی کچی عومەیس (ی خێزانی ئیمامی عەلی) کە هەردووکیان لە مەدینە بوون، جا هەردووکیان هاتن بۆ لای حوسەین، دواتر حوسەین ئاماژەی بۆ سەری کرد (بەوەی ئازاری زۆرە) جا ئیمامی عەلی ﷺ فەرمانی کرد قژی بتاشرێت و قژی تاشرا، دواتر لە سوقیا فیدیەی بۆ درا، وشترێکی بۆ سەر بڕا.

یەحیای کوڕی سەعید ﷺ گوتوویەتی: حوسەین لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لەو سەفەرە دەرچووبوو بۆ مەککە (بەمەبەستی حەج، بەڵام نەخۆشی بووە ڕێگر).

## ٥٣- وەستان لە عەرەفە و مانەوە لە موزدەلیفە[1]

**١١٥١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: عَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَارْتَفِعُوا عَنْ بَطْنِ عُرَنَةَ، وَالْمُزْدَلِفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَارْتَفِعُوا عَنْ بَطْنِ مُحَسِّرٍ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گشت عەرەفە جێگەی وەستانە (بۆ بەجێگەیاندنی فەڕیزەی عەرەفە) وە سەر بکەون و دوور بکەونەوە لە دۆڵی عورەنە، وە موزدەلیفە هەمووی شوێنی مانەوەیە (بەناوی مانەوەی موزدەلیفە) وە سەر بکەون و دوور بکەونەوە لە دۆڵی موحەسسیر.

**١١٥٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اعْلَمُوا أَنَّ عَرَفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ، إِلاَّ بَطْنَ عُرَنَةَ، وَأَنَّ الْمُزْدَلِفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ، إِلاَّ بَطْنَ مُحَسِّرٍ[3].

---

(١) ـ الْوُقُوفُ بِعَرَفَةَ وَالْمُزْدَلِفَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣٨، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣٩، عن مالك به.




واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: بزانن عەرەفە گشتی جێگەی وەستانە (بۆ بەجێگەیاندنی فەرزەی عەرەفە) تەنها دۆڵی عورەنە نەبێت، وە موزدەلیفە هەمووی شوێنی مانەوەیە (بە ناوی موزدەلیفە) تەنها دۆڵی موحەسسیر نەبێت.

**١١٥٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ اللهُ ﷻ:﴿ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ ﴿١٩٧﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: فَالرَّفَثُ إِصَابَةُ النِّسَاءِ، وَاللهُ أَعْلَمُ، قَالَ اللهُ ﷻ:﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: وَالْفُسُوقُ: الذَّبْحُ لِلأَنْصَابِ، وَاللهُ أَعْلَمُ، قَالَ اللهُ ﷻ:﴿ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام، قَالَ: وَالْجِدَالُ فِي الْحَجِّ، أَنَّ قُرَيْشًا كَانَتْ تَقِفُ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِقُزَحَ، وَكَانَتِ الْعَرَبُ وَغَيْرُهُمْ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَكَانُوا يَتَجَادَلُونَ، يَقُولُ هَؤُلاَءِ: نَحْنُ أَصْوَبُ، وَيَقُولُ هَؤُلاَءِ: نَحْنُ أَصْوَبُ، فَقَالَ اللهُ تَعَالَى:﴿ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلْأَمْرِ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ ﴾ الحج، فَهَذَا الْجِدَالُ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، وَقَدْ سَمِعْتُ ذَلِكَ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ ﴿١٩٧﴾ ﴾ البقرة، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (الرفث) لەو ئایەتەدا جیماعكردنە لەگەڵ ئافرەت، والله أعلم، (چونكە) خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی:﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة، واتە: [لە شەوانی ڕۆژووی ڕەمەزان جیماعكردنتان بۆ حەڵاڵە لەگەڵ خێزانەكانتان]، (الفسوق)یش: بریتییە لە قوربانیكردن و ئاژەڵسەربڕین بۆ بت و صەنەم، والله أعلم، (چونكە) خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: :﴿ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام، (واتە: یان سەربڕاوێك كە ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنرابێ)، (والجدال فی الحج)یش بریتییە لەوەی كاتی خۆی قورەیشییەكان لە مەشعەرولحەرام كە كێوێكە لە موزدەلیفە لەوێ دەوەستان، عەرەب و خەڵكی دیكەش لە عەرەفە دەوەستان، جا موناقەشە و دەمەقاڵێیان لەگەڵ یەكدی دەكرد،

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤٠، عن مالك به.

قورەیشییەكان دەیانگوت: ئێمە ڕاستین، ئەوانی دیكەش دەیانگوت: ئێمە ڕاستین، جا خوای پەروەردگار ﷻ فەرمووی: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾﴾ الحج، جا ئەوە جیدالەكەیە بەپێی بۆچوونی ئێمە، والله أعلم، ئەوەشم لە زانایان بیستووە.

## ٥٤- وەستانی كەسی حاجی لە عەرەفە بەبێدەستنوێژی و وەستانی بەسواری[1]

١١٥٤- **[فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: هَلْ يَقِفُ الرَّجُلُ بِعَرَفَةَ، أَوْ بِالْمُزْدَلِفَةِ، أَوْ يَرْمِي الْجِمَارَ، أَوْ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَهُوَ غَيْرُ طَاهِرٍ؟ فَقَالَ: كُلُّ أَمْرٍ تَصْنَعُهُ الْحَائِضُ مِنْ أَمْرِ الْحَجِّ، فَالرَّجُلُ يَصْنَعُهُ وَهُوَ غَيْرُ طَاهِرٍ، ثُمَّ لاَ يَكُونُ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي ذَلِكَ، وَالْفَضْلُ أَنْ يَكُونَ الرَّجُلُ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ طَاهِرًا، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَتَعَمَّدَ ذَلِكَ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا: ئایا مرۆڤ لە عەرەفە دەوەستێ یان لە موزدەلیفە دەمێنێتەوە یان ڕەجمكردن ئەنجام دەدات، یان لە نێوان صەفا و مەڕوە ڕادەكات، لە كاتێكدا دەستنوێژی نییە؟ ئەویش گوتی: گشت ئەو شتانەی ئافرەتی حەیزدار ئەنجامیان دەدات لە حەجدا، پیاویش (بەهەمان شێوە) بە بێدەستنوێژی ئەنجامیان دەدات (و بۆی دروستە)، دواتریش هیچی لەسەر نییە لەو شتانە، بەڵام چاكتر وایە مرۆڤ لە هەموو ئەو شتانە دەستنوێژی هەبێ ناگونجێ و شایستە نییە بەئەنقەست بە بێدەستنوێژی (دەست پێ بكات و) ئەنجامیان بدات.

١١٥٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ لِلرَّاكِبِ، أَيَنْزِلُ أَمْ يَقِفُ رَاكِبًا؟ فَقَالَ: بَلْ يَقِفُ رَاكِبًا، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِهِ أَوْ بِدَابَّتِهِ عِلَّةٌ، فَاللهُ أَعْذَرُ بِالْعُذْرِ[3].

(فەتوا) واتە: هەروەها ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی وەستان لە عەرەفە بۆ كەسی بەسواری، كە ئاخۆ لە سوارییەكەی دێتە خوارەوە یان بەسواری

---

(١) ـ وُقُوفُ الرَّجُلِ وَهُوَ غَيْرُ طَاهِرٍ، وَوُقُوفُهُ عَلَى دَابَّتِهِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣١٨؛ وفي: ١٣٤١، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤٢، عن مالك به.




دەوەستێ (كامیان چاكترە)؟ گوتی: بەڵكوو بەسواری بوەستێت (چاكترە)، تەنها لەو كاتە نەبێت كە خۆی یان وڵاغەكەی كێشەیەكی هەبێت، (ئەوە عوزرە و) خوای پەروەردگار لە هەموو كەس زیاتر عوزرووەرگرترە.

## ٥٥- وەستان لە عەرەفە بۆ ئەو كەسەی حەجی لەدەستچووە[١]

**١١٥٦**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ لَمْ يَقِفْ بِعَرَفَةَ، مِنْ لَيْلَةِ الْمُزْدَلِفَةِ، قَبْلَ أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ، فَقَدْ فَاتَهُ الْحَجُّ، وَمَنْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ، مِنْ لَيْلَةِ الْمُزْدَلِفَةِ، مِنْ قَبْلِ أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ، فَقَدْ أَدْرَكَ الْحَجَّ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: هەر كەسێك لە شەوی موزدەلیفە لە عەرەفە نەوەستێ بەر لەوەی بەیان هەڵبێ، ئەوە حەجی لەكیس چووە، وە هەر كەسێك لە شەوی موزدەلیفە لە عەرەفە بوەستێت بەر لەوەی بەیان هەڵبێت، ئەوە بە حەج ڕاگەیشتووە.

**١١٥٧**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَهُ الْفَجْرُ مِنْ لَيْلَةِ الْمُزْدَلِفَةِ، وَلَمْ يَقِفْ بِعَرَفَةَ، فَقَدْ فَاتَهُ الْحَجُّ، وَمَنْ وَقَفَ بِعَرَفَةَ، مِنْ لَيْلَةِ الْمُزْدَلِفَةِ، قَبْلَ أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ، فَقَدْ أَدْرَكَ الْحَجَّ[٣].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: هەر كەسێك لە شەوی موزدەلیفە «بەیان»ی كردەوە و لە عەرەفە نەوەستا، ئەوە حەجی لەدەستچووە، وە هەر كەسێك لە شەوی موزدەلیفە لە عەرەفە بوەستێ بەر لەوەی بەیان هەڵبێ، ئەوە بە حەج ڕاگەیشتووە.

---

(١) ـ وُقُوفُ مَنْ فَاتَهُ الْحَجُّ بِعَرَفَةَ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤٣؛ والحدثاني: ٥٩٧ في المناسك؛ والشيباني: ٥١٠ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤٤، عن مالك به.

١١٥٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْعَبْدِ يُعْتَقُ فِي الْمَوْقِفِ بِعَرَفَةَ: فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يُجْزِئُ عَنْهُ مِنْ حَجَّةِ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَمْ يُحْرِمْ، فَيُحْرِمُ بَعْدَ أَنْ يُعْتَقَ، ثُمَّ يَقِفُ بِعَرَفَةَ مِنْ تِلْكَ اللَّيْلَةِ، قَبْلَ أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ فَعَلَ ذَلِكَ أَجْزَأَ عَنْهُ، وَإِنْ لَمْ يُحْرِمْ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ، كَانَ بِمَنْزِلَةِ مَنْ فَاتَهُ الْحَجُّ، إِذَا لَمْ يُدْرِكِ الْوُقُوفَ بِعَرَفَةَ، قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ مِنْ لَيْلَةِ الْمُزْدَلِفَةِ، وَيَكُونُ عَلَى الْعَبْدِ حَجَّةُ الإِسْلاَمِ يَقْضِيهَا[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی بەندەیەك كە لە كاتی وەستانی عەرەفەدا ئازاد بكرێت، گوتوویەتی: ئەو وەستانەی بۆ بە حەجی واجبی ئیسلام قبووڵ نییە (چونكە ئەوە حەجی واجب نەبووە كە ئێستا تیایەتی، چونكە حەج لەسەر بەندە واجب نییە، بەڵام كاتێ ئازاد دەبێت لەسەری واجب دەبێت، جا ناتوانێ لە هەمان ساڵدا حەج بكات)، تەنها لەو كاتەدا نەبێت (دەتوانێت لە هەمان ساڵدا حەجەكەی ئەنجام بدات) ئەگەر (پێشتر) ئیحرامی نەبەستبێت دواتر دوای ئەوەی ئازاد دەبێت ئیحرام ببەستێ، دواتر لە هەمان شەو لە عەرەفە بوەستێتەوە بەر لەوەی بەیان هەڵبێت، جا ئەگەر ئەوەی ئەنجام دا بەری دەكەوێت، بەڵام ئەگەر ئیحرامی نەبەست تا بەیان هەڵهات، ئەوە وەك ئەو كەسە وایە كە حەجی لێ دەفەوتێ كاتێ نەگاتە وەستانی عەرەفە بەر لە هەڵاتنی بەیان لە شەوی موزدەلیفە، جا حەجی واجبی ئیسلام لەسەر بەندەكە واجب دەبێت و دەبێ قەزای بكاتەوە.

## ٥٦- پێشخستنی ئافرەت و منداڵ[2]

١١٥٩- عَنْ سَالِمٍ، وَعُبَيْدِ اللهِ ﷺ ابْنَيْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ أَبَاهُمَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُقَدِّمُ أَهْلَهُ وَصِبْيَانَهُ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنًى، حَتَّى يُصَلُّوا الصُّبْحَ بِمِنًى وَيَرْمُوا قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ النَّاسُ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٤٦؛ والحدثاني: ٥٩٧أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ تَقْدِيمُ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٣؛ والحدثاني: ٥٩٨ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٥ في الحج، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سالم و عوبەیدوڵڵاوە ﷻ کە دوو کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرن گێڕدراوەتەوە (گوتوویانە): باوکیان عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷻ لە موزدەلیفەوە خێزان و منداڵەکانی پێش خۆی دەنارد بۆ مینا، تا نوێژی بەیانییان لە مینا دەکرد و ڕەجمیان ئەنجام دەدا بەر لەوەی خەڵك بێن (لە ترسی ئەوەی تووشی ئازار بن بەهۆی پەلەپەلکردن و قەرەباڵغی خەڵکی).

**١١٦٠-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ ﷺ، أَنَّ مَوْلَاةً لأَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷻ أَخْبَرَتْهُ قَالَتْ: جِئْنَا مَعَ أَسْمَاءَ ابْنَةِ أَبِي بَكْرٍ مِنًى بِغَلَسٍ، قَالَتْ: فَقُلْتُ لَهَا: لَقَدْ جِئْنَا مِنًى بِغَلَسٍ، فَقَالَتْ: قَدْ كُنَّا نَصْنَعُ ذَلِكَ مَعَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكِ[١].

واتە: لە عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی ئافرەتێکی خزمەتکاری ئەسمائی کچی ئەبو بەکر هەواڵی پێداوە و گوتوویەتی: لەگەڵ ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷻ بەتاریکی هاتین بۆ مینا، دەڵێ: بە ئەسمائم گوت: ئەوە بە تاریکی هاتووین بۆ مینا (چۆن دەبێ!)، ئەویش گوتی: ئێمە لەگەڵ کەسێکدا بووین و ئاوامان کردووە کە زۆر چاکتر بووە لە تۆ (واتە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی ئەوەی پێداوین پێش کاتی خۆی بچین بۆ مینا).

**١١٦١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَدِّمُ نِسَاءَهُ وَصِبْيَانَهُ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنًى[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﷺ لە موزدەلیفەوە خێزان و منداڵەکانی پێش خۆی دەنارد بۆ مینا.

**١١٦٢- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَمِعَ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَكْرَهُ رَمْيَ الْجَمْرَةِ، حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ، وَمَنْ رَمَى، فَقَدْ حَلَّ لَهُ النَّحْرُ[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٤؛ والحدثاني: ٥٩٨أ في المناسك؛ والنسائي: ٣٠٥٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٦؛ وفي: ١٤٢٢ في المناسك، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوێی لە هەندێك لە زانایان بووە پێیان باش نەبووە جەمەرەی عەقەبە ڕەجم بکرێت تاوەکوو بەیان هەڵدێت لە ڕۆژی قورباندا، وە هەر کەسێکیش ڕەجمەکە ئەنجام بدات ئەوە سەربڕینی بۆ دروستە.

**١١٦٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ الْمُنْذِرِ ﷺ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا كَانَتْ تَرَى أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ ﷺ بِالْمُزْدَلِفَةِ تَأْمُرُ الَّذِي يُصَلِّي لَهَا وَلأَصْحَابِهَا الصُّبْحَ، يُصَلِّي لَهُمُ الصُّبْحَ حِينَ يَطْلُعُ الْفَجْرُ، ثُمَّ تَرْكَبُ فَتَسِيرُ إِلَى مِنًى وَلاَ تَقِفُ[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): فاتیمەی کچی مونزیر ﷺ هەواڵی پێداوە بەوەی ئەسمائی کچی ئەبو بەکری ﷺ لە موزدەلیفە بینیوە فەرمانی بەو کەسە دەکرد کە نوێژ و ئیمامەتی بۆ ئەو و هاوڕێکانی دەکرد نوێژی بەیانییان بۆ بکات، ئەویش کاتێ بەیان هەڵدەهات نوێژی بەیانی بۆ دەکردن، دواتر ئەسماء سواری وڵاخ دەبوو و دەڕۆیشت بۆ مینا و نەدەوەستا.

## ٥٧- ڕۆیشتن لە کاتی چوون لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە[٢]

**١١٦٤-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ، وَأَنَا جَالِسٌ مَعَهُ، كَيْفَ كَانَ يَسِيرُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، حِينَ دَفَعَ؟ فَقَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَرْجَةً نَصَّ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ هِشَامٌ: وَالنَّصُّ فَوْقَ الْعَنَقِ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ پرسیاری لێکرا، لە کاتێکدا

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٥؛ والحدثاني: ٥٩٩ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ السَّيْرُ فِي الدَّفْعَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥١؛ والحدثاني: ٦٠٠ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨٦ في الحج؛ والبخاري: ١٦٦٦؛ والنسائي: ٣٠٥١؛ وأبو داود: ١٩٢٣؛ والقابسي: ٤٧٣، كلهم عن مالك به.

من دانیشتبووم، (لە پرسیارەکەدا گوترا): پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ڕۆیشتووە لە حەجی ماڵئاواییدا کاتێ (لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە) ڕۆیشتووە؟ ئەویش گوتی: بەمامناوەندی دەڕۆیشت، جا کاتێ بۆشایی و فراوانییەکی دەست بکەوتایە خێرا دەڕۆیشت.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هیشام گوتوویەتی: ڕۆیشتنی «النص» بریتییە لە ڕۆیشتنێکی خێراتر لە ڕۆیشتنی مامناوەندی «العنق».

**١١٦٥-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يُحَرِّكُ رَاحِلَتَهُ فِي بَطْنِ مُحَسِّرٍ قَدْرَ رَمْيَةٍ بِحَجَرٍ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ تەکان و جوڵەی بە وڵاخەکەی دەکرد لە دۆڵی موحەسسیر بەئەندازەی هاویشتنی بەردێك.

## ٥٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی شوێنی سەربڕینی قوربانی لە حەجدا[٢]

**١١٦٦-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ بِمِنًى: هَذَا الْمَنْحَرُ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، وَقَالَ فِي الْعُمْرَةِ: هَذَا الْمَنْحَرُ، يَعْنِي الْمَرْوَةَ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ وَطُرُقِهَا مَنْحَرٌ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا فەرموویەتی: ئەوە شوێنی سەربڕینی قوربانییە، وە هەموو خاکی مینا شوێنی سەربڕینە، وە لە عومرەش فەرموویەتی: ئەوە ـ واتە مەڕوە ـ شوێنی سەربڕینە، وە گشت ڕێگەوبانی مەککە شوێنی سەربڕینە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٢؛ والحدثاني: ٦٠٠أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨٧ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي النَّحْرِ فِي الْحَجِّ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧٠؛ والحدثاني: ٦٠٢أ في المناسك، عن مالك به.

**١١٦٧-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَمْرَةُ بِنْتُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ تَقُولُ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ لِخَمْسِ لَيَالٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقَعْدَةِ، وَلاَ نُرَى إِلاَّ أَنَّهُ الْحَجُّ، فَلَمَّا دَنَوْنَا مِنْ مَكَّةَ، أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، أَنْ يَحِلَّ، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَدُخِلَ عَلَيْنَا يَوْمَ النَّحْرِ بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: نَحَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَزْوَاجِهِ.

قَالَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ ﷺ: فَذَكَرْتُ هَذَا الْحَدِيثَ لِلْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ فَقَالَ: أَتَتْكَ وَاللَّهِ بِالْحَدِيثِ عَلَى وَجْهِهِ(١).

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێ داوم بەوەی گوێی لە عائیشەی دایکی باوەڕدان ﷺ بووە دەیگوت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین پێنج ڕۆژ مابوون لە مانگی زولقەعدە، جا پێمان وا نەبوو شتێکی دیکە دروست بێت جگە لە حەج (چونکە عادەت وا بوو لە مانگەکانی حەج تەنها حەج دەکرا)، جا کە لە مەککە نزیك بووینەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەو کەسانەی ئاژەڵی هەدییان پێ نییە کاتێ تەوافی بەیت دەکەن و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدەن، حەڵاڵ ببنەوە و لەژێر ئیحرام بێنە دەرەوە (ئەوە فەسخبوونەوەی حەج بوو بۆ عومرە)، عائیشە ﷺ دەڵێت: جا لە ڕۆژی قوربان بە گۆشتی مانگاوە هاتن بۆ لامان، منیش گوتم: ئەوە چییە؟ گوتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خێزانەکانی ئاژەڵی قوربانی سەر بڕیوە.

یەحیای کوڕی سەعید ﷺ گوتوویەتی: ئەو فەرموودەیەم بۆ قاسمی کوڕی موحەممەد باس کرد، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا فەرموودەکەت وەکوو خۆی پێ گەیشتووە (واتە ڕێك بابەتەکە ئاوا بوو، هەڵەی تیا نییە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧٢؛ والحدثاني: ٥٨٣ في المناسك؛ والبخاري: ١٧٠٩، وفي: ٢٩٥٢؛ وابن حبان: ٣٩٢٩؛ والقابسي: ٤٩٧، كلهم عن مالك به.




**١١٦٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄، عَنْ حَفْصَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا، وَلَمْ تَحْلِلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلاَ أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ(١).**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄، لە حەفصەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە بەوەی بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتووە: بۆچی حاڵی خەڵکی وایە لەژێر ئیحرام هاتوونەتە دەرەوە و تۆش لەژێر ئیحرامی عومرەکەت نەهاتوویتە دەرەوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: من قژم گلۆڵە کردووە و بەیەکەوەم نوساندووە و هەدییەکەم ملپێچ کردووە، (بۆیە) لەژێر ئیحرام نایەمە دەرەوە و حەڵاڵ نابمەوە تا هەدییەکەم سەر دەبڕم.

## ٥٩- کرداری سەربڕینی قوربانی(٢)

**١١٦٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَحَرَ بَعْضَ هَدْيِهِ بِيَدِهِ، وَنَحَرَ غَيْرُهُ بَعْضَهُ(٣).**

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لە ئاژەڵەکانی قوربانی خۆی بە دەستی خۆی سەربڕی، هەندێکی دیکەش کەسی دیکە سەری بڕین.

**١١٧٠- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ قَالَ: مَنْ نَذَرَ بَدَنَةً، فَإِنَّهُ يُقَلِّدُهَا نَعْلَيْنِ، وَيُشْعِرُهَا، ثُمَّ يَنْحَرُهَا عِنْدَ الْبَيْتِ أَوْ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ، لَيْسَ لَهَا مَحِلٌّ دُونَ ذَلِكَ، وَمَنْ نَذَرَ جَزُورًا مِنَ الإِبِلِ أَوِ الْبَقَرِ، فَلْيَنْحَرْهَا حَيْثُ شَاءَ(٤).**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٢؛ والحدثاني: ٦٠٥ في المناسك؛ والشافعي: ٩٥٨؛ وابن حنبل: ٢٦٤٧٥؛ والبخاري: ١٥٦٦، وفي: ١٧٢٥، وفي: ٥٩١٦؛ ومسلم: المناسك: ١٧٦؛ والنسائي: ٢٧٨١؛ وأبو داود: ١٨٠٦؛ وابن حبان: ٣٩٢٥؛ وأبي يعلى الموصلي: ٧٠٥٦؛ والقابسي: ٢٢٢؛ وفي: ٢٢٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي النَّحْرِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه القابسي: ١٤٥، عن مالك به.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٢؛ والشيباني: ٤٠٩ في الحج، عن مالك به.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك وشترێکی بۆ بەیت کردە نەزر، ئەوە (سوننەت وایە) جووت نەعلەیەکی بخاتە گەردەنی، وە نیشانەداری بکات (بەوەی دوای سەربڕینی کۆپاری پشتی شەق بکات)، جا با لەلای بەیت یان لە مینا لە ڕۆژی قوربان سەری ببڕێت، هیچ شوێنێکی دیکەی بۆ دروست نییە جگە لەوە، وە هەر کەسێك بێچووە وشترێك یان بێچووە مانگایەکی شایستە و قەڵەو بکات بە نەزر بۆ بەیت، ئەوە با لە هەر شوێنێك سەری ببڕێت کە دەیەوێت (چونکە لەوەدا تەنها مەبەست ئەوەیە هەژارەکان سوودی لێ ببینن، بەڵام ئەوەی دیکە زیاتر دیارییە بۆ بەیت و دەبێ لەوێ بێ).

**١١٧١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَنْحَرُ بُدْنَهُ قِيَامًا[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی باوکی ئەو وشترەکەی خۆی بەپێوە سەر بڕیوە.

**١١٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَجُوزُ لأَحَدٍ أَنْ يَحْلِقَ رَأْسَهُ، حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيَهُ، وَلاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَنْحَرَ قَبْلَ الْفَجْرِ، يَوْمَ النَّحْرِ، وَإِنَّمَا الْعَمَلُ كُلُّهُ يَوْمَ النَّحْرِ: الذَّبْحُ، وَلُبْسُ الثِّيَابِ، وَإِلْقَاءُ التَّفَثِ، وَالْحِلاَقُ، وَلاَ يَكُونُ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ، قَبْلَ يَوْمِ النَّحْرِ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ کەس دروست نییە سەری بتاشێ تاوەکوو ئاژەڵی هەدییەکەی سەر دەبڕێت، وە بۆ کەس نییە سەربڕین ئەنجام بدات بەر لە کاتی بەیان لە ڕۆژی قورباندا، بەڵکوو هەموو کردارەکان تەنها لە ڕۆژی قوربان ئەنجام دەدرێن (کە بریتین لەو شتانە): سەربڕین و پۆشینی جلوبەرگی دوراو و فڕێدان و داماڵینی نارێکی و چڵك و چەپەڵی جەستە و تاشین، هیچ شتێك لەمانە دروست نییە بەر لە ڕۆژی قوربان.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٤، عن مالك به.




## ٦٠- سەرتاشین[١]

**١١٧٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ، قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: اللهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ، قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَالْمُقَصِّرِينَ[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارا ڕەحم بکە بەو کەسانەی (بۆ حەج و عومرە) سەریان تاشیوە، گوتیان: ئەوانەشی کە کورتیان کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: پەروەردگارا ڕەحم بکە بەو کەسانەی تاشیویانە، گوتیان: ئەوانەشی کە کورتیان کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ (ئینجا) فەرمووی: ئەوانەشی کە کورتیان کردۆتەوە (کەواتە تاشین خێرترە، چونکە دوو جار دوعای بۆ کرد، بەڵام یەك جار دوعای بۆ کورتکردنەوە کرد).

**١١٧٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَدْخُلُ مَكَّةَ لَيْلاً وَهُوَ مُعْتَمِرٌ، فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَيُؤَخِّرُ الْحِلاَقَ حَتَّى يُصْبِحَ، قَالَ: وَلَكِنَّهُ لاَ يَعُودُ إِلَى الْبَيْتِ فَيَطُوفُ بِهِ، حَتَّى يَحْلِقَ رَأْسَهُ، قَالَ: وَرُبَّمَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَأَوْتَرَ فِيهِ، وَلاَ يَقْرَبُ الْبَيْتَ[٣].**

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە بە شەو دەچوو بۆ مەککە لە کاتێکدا عومرەکار بوو، جا تەوافی بەیتی دەکرد و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەی ئەنجام دەدا و سەرتاشینی دوادەخست تا بەیانی، گوتوویەتی: بەڵام نەدەگەڕایەوە بۆ بەیت بۆ ئەوەی تەواف

---

(١) ـ الْحِلاَقُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٠؛ والحدثاني: ٦٠٣ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٢ في الحج؛ وابن حنبل: ٥٥٠٧، وفي: ٦٢٣٤، وفي: ٦٢٣٤؛ والبخاري: ١٧٢٧؛ ومسلم: المناسك: ٣١٧؛ وأبو داود: ١٩٧٩؛ وابن حبان: ٣٨٨٠؛ والقابسي: ٢٢٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩١؛ والحدثاني: ٦٠٣أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٧٣ في الحج، كلهم عن مالك به.

بکات تا ئەو کاتەی سەری دەتاشی، گوتوویەتی: جاری واش هەبوو دەچووە مزگەوت و نوێژی ویتری تێدا دەکرد، نزیکی بەیت نەدەکەوتەوە.

١١٧٥- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: التَّفَثُ: حِلاَقُ الشَّعْرِ، وَلُبْسُ الثِّيَابِ، وَمَا يَتْبَعُ ذَلِكَ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: « التَّفَثُ» بریتییە لە: تاشینی موو و پۆشینی جلی دوراو و ئەو شتانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە (وەك نینۆککردن و لادانی چڵك و چەوری و ... هتد).

١١٧٦- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ نَسِيَ الْحِلاَقَ بِمِنًى فِي الْحَجِّ، هَلْ لَهُ رُخْصَةٌ فِي أَنْ يَحْلِقَ بِمَكَّةَ، قَالَ: ذَلِكَ وَاسِعٌ، وَالْحِلاَقُ بِمِنًى أَحَبُّ إِلَيَّ[2].

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە لە مینا سەرتاشینی لەیاد چووە لە حەجدا، ئایا بۆی هەیە لە مەککە سەری بتاشێ؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەوە بابەتێکی فراوانە (بۆی دروستە)، بەڵام سەرتاشینم لە مینا پێ چاکترە و خۆشەویسترە لەلام.

١١٧٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّ أَحَدًا لاَ يَحْلِقُ رَأْسَهُ، وَلاَ يَأْخُذُ مِنْ شَعَرِهِ، حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيًا، إِنْ كَانَ مَعَهُ، وَلاَ يَحِلُّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ عَلَيْهِ، حَتَّى يَحِلَّ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ﴿١٩٦﴾﴾ البقرة[3].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی ڕاجیایی تیا نییە لای ئێمە ئەوەیە: کەس سەری ناتاشێت و بەشێك لە مووەکانی کورت ناکاتەوە تاوەکوو ئاژەڵی هەدییەکەی سەر دەبڕێت ئەگەر پێی بوو، لە هیچ شتێك حەڵاڵ نابێتەوە کە لەسەری حەڕام بووە تاوەکوو لە ڕۆژی قوربان لە مینا حەڵاڵ دەبێتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە خوای پەروەردگار لە قوڕئانەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٤؛ والحدثاني: ٦٠٣ب في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٥، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٢، عن مالك به.

﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ (١٩٦)﴾، واتە: (سەرتان مەتاشن تاوەکوو هەدییەکان دەگەنە جێگەی خۆیان و جێبەجێ دەکرێن).

## ٦١- کورتکردنەوەی قژ[١]

**١١٧٨-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا أَفْطَرَ مِنْ رَمَضَانَ، وَهُوَ يُرِيدُ الْحَجَّ، لَمْ يَأْخُذْ مِنْ رَأْسِهِ وَلاَ مِنْ لِحْيَتِهِ شَيْئًا، حَتَّى يَحُجَّ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کاتێ ڕەمەزانی تەواو دەکرد و دەیەویست حەج ئەنجام بدات، هیچ لە مووی قژ و ڕیشی هەڵنەدەگرت و کورتی نەدەکردەوە تا حەجی ئەنجام دەدا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خەڵك ئەوەیان لەسەر واجب نییە (واتە چونکە مەشەقەتی زۆرە، بۆیە خەڵك تەکلیفی ئەوەیان لێ ناکرێ).

**١١٧٩-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا حَلَقَ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، أَخَذَ مِنْ لِحْيَتِهِ وَشَارِبِهِ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەموو جار کە لە حەج و عومرەدا سەری دەتاشی (جگە لە تاشینی سەری) مووی لە ڕیش و سمێڵیشی هەڵدەگرت.

**١١٨٠-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَفَضْتُ، وَأَفَضْتُ مَعِي بِأَهْلِي، ثُمَّ عَدَلْتُ إِلَى شِعْبٍ، فَذَهَبْتُ لأَدْنُوَ مِنْ أَهْلِي، فَقَالَتْ: إِنِّي لَمْ أُقَصِّرْ مِنْ شَعَرِي بَعْدُ، فَأَخَذْتُ مِنْ شَعَرِهَا بِأَسْنَانِي، ثُمَّ وَقَعْتُ بِهَا، قَالَ: فَضَحِكَ الْقَاسِمُ ﷺ، وَقَالَ: مُرْهَا، فَلْتَأْخُذْ مِنْ شَعَرِهَا بِالْجَلَمَيْنِ[٤].

---

(١) ـ التَّقْصِيرُ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٦، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٧؛ والحدثاني: ٦٠٤ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٣ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٨؛ والحدثاني: ٦٠٤أ في المناسك، عن مالك به.

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هاتە لای قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ و گوتی: من تەوافی ئیفازەم کرد و لەگەڵ خۆم تەوافی ئیفازەم بە خێزانیشم کرد، دواتر لامدا بۆ ناو دۆڵێك تاوەکوو لە خێزانم نزیك ببمەوە و جیماعی لەگەڵ بکەم، خێزانیشم گوتی: من هێشتا قژم کورت نەکردۆتەوە (چۆن جیماعم بۆ دروستە)، دەڵێ: منیش بە ددانم هەندێك لە قژیم بڕی دواتر لەگەڵی جووت بووم، ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: قاسم ﷺ پێکەنی و گوتی: فەرمان بە خێزانت بکە با هەندێك لە مووەکانی قژی بە مقەس ببڕێت.

**١١٨١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَسْتَحِبُّ فِي مِثْلِ هَذَا، أَنْ يُهْرِقَ دَمًا، وَذَلِكَ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئًا، فَلْيُهْرِقْ دَمًا[١].**

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە شتی ئاوا (واتە دەربارەی لەبیرچوونەوەی هەر شتێکی حەج) بەچاك و سوننەتی دەزانم خوێنێك بڕێژرێت (واتە ئاژەڵێك سەر ببڕێت)، لەبەر ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك فەڕیزەیەکی حەجی لەیاد چوو، ئەوە با خوێنێك بڕێژێ.

**١١٨٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّهُ لَقِيَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِهِ يُقَالُ لَهُ: الْمُجَبَّرُ، قَدْ أَفَاضَ وَلَمْ يَحْلِقْ وَلَمْ يُقَصِّرْ، جَهِلَ ذَلِكَ، فَأَمَرَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، أَنْ يَرْجِعَ فَيَحْلِقَ أَوْ يُقَصِّرَ، ثُمَّ يَرْجِعَ إِلَى الْبَيْتِ فَيُفِيضَ[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گەیشتووە بە پیاوێك لە خانەوادەی خۆی کە پێیان دەگوت: موجەبەڕ (کە برازای بووە)، تەوافی ئیفازەی کردبوو، بەڵام سەرتاشین و کورتکردنەوەی ئەنجام نەدابوو نەیزانیبوو (کە دەبێ ئەنجام بدرێن)، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ فەرمانی پێ کرد بگەڕێتەوە سەری بتاشێ یان کورتی بکاتەوە، دواتر بگەڕێتەوە بۆ بەیت و تەوافی ئیفازە ئەنجام بداتەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٨؛ والحدثاني: ٦٠٤أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٩٩؛ والحدثاني: ٦٠٤ ب في المناسك؛ والشيباني: ٥١٢ في الحج، كلهم عن مالك به.

**١١٨٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْرِمَ، دَعَا بِالْجَلَمَيْنِ فَقَصَّ شَارِبَهُ، وَأَخَذَ مِنْ لِحْيَتِهِ، قَبْلَ أَنْ يَرْكَبَ، وَقَبْلَ أَنْ يُهِلَّ مُحْرِمًا[١].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی سالمی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ کاتێ دەیویست ئیحڕام ببەستێت، داوای مقەسێکی دەکرد و سمێڵی کورت دەکردەوە و ڕیشی ڕێك دەخست، بەر لەوەی سواری وڵاخ ببێت و بکەوێتە ڕێ، بەر لەوەی ئیحڕام ببەستێت (واتە دوای ئەنجامدانی ئەو کارە ئینجا ئیحڕامی دەبەست).

## ٦٢- تەلبید و بەیەکەوەنوساندنی قژ (و سواقدانی بەهۆی بۆیە یان شتێکی چیڕ)[٢]

**١١٨٤- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ ضَفَرَ رَأْسَهُ، فَلْيَحْلِقْ، وَلاَ تَشَبَّهُوا بِالتَّلْبِيدِ[٣].**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك قژی بهۆنێتەوە با بیتاشێ (نابێ کورتی بکاتەوە)، هۆنینەوە مەچوێنن بە تەلبید (تەلبید بریتییە لە بەیەکەوەنوساندنی قژ، چونکە لە تەلبیددا کورتکردنەوە دروستە، بەڵام لە هۆنینەوەدا دروست نییە، حوکمەکەیان وەکوو یەکدی نییە).

**١١٨٥- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ عَقَصَ رَأْسَهُ أَوْ ضَفَرَ أَوْ لَبَّدَ، فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْحِلاَقُ[٤].**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك قژی لوول بدات یان بیهۆنێتەوە یان بە بۆیە و شتێك بەیەکەوەی بنوسێنێ، ئەوە تاشینی لەسەر واجب دەبێت (واتە نابێت کورتی بکاتەوە، دەبێت تەنها بیتاشێت).

---

(١) ـ مقطوع ضعيف.

(٢) ـ التَّلْبِيدُ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٣؛ والشيباني: ٤٦١ في الحج، عن مالك به.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٤، عن مالك به.

## ٦٣- نوێژکردن لەناو کەعبە و کورتکردنەوەی نوێژ و پەلەکردن لە وتاری عەرەفە[١]

١١٨٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ الْكَعْبَةَ هُوَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَبِلاَلُ بْنُ رَبَاحٍ، وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ ﵃ الْحَجَبِيُّ، فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ، وَمَكَثَ فِيهَا.

قَالَ عَبْدُ اللهِ ﵁: فَسَأَلْتُ بِلاَلاً ﵁ حِينَ خَرَجَ، مَا صَنَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَمِينِهِ، وَعَمُودَيْنِ عَنْ يَسَارِهِ، وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ، وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ، ثُمَّ صَلَّى[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و ئوسامەی کوڕی زەید و بیلالی کوڕی ڕەباح و عوسمانی کوڕی تەڵحەی حەجەبی ﵃ چوونە ناو کەعبە، ئینجا دەرگاکەی داخست و (ماوەیەك) تیایدا مایەوە.

عەبدوڵڵا ﵁ گوتوویەتی: جا کاتێ بیلال ﵁ هاتە دەرەوە پرسیارم لێ کرد (گوتم): پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد؟ گوتی: ئەستوندە و دینگەیەکی خستە لای ڕاستی، دوو دینگەشی خستە لای چەپی و سێ دینگەشی خستە پشتەوەی ـ لەو ڕۆژگارەدا بەیت شەش دینگەی هەبوو ـ دواتر (بەوشێوازە وەستانە لەو شوێنە) نوێژی کرد.

١١٨٧- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: كَتَبَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ إِلَى الحَجَّاجِ بْنِ يُوسُفَ: أَنْ لاَ يُخَالِفَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ فِي شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْحَجِّ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ، جَاءَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، وَأَنَا مَعَهُ، فَصَاحَ بِهِ عِنْدَ سُرَادِقِهِ: أَيْنَ هَذَا؟ فَخَرَجَ إِلَيْهِ الحَجَّاجُ، وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ مُعَصْفَرَةٌ، فَقَالَ: مَا لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ فَقَالَ: الرَّوَاحَ،

---

(١) ـ الصَّلاَةُ فِي الْبَيْتِ وَقَصْرُ الصَّلاَةِ وَتَعْجِيلُ الْخُطْبَةِ بِعَرَفَةَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢٨؛ والحدثاني: ٦١١ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨٠ في الحج؛ والشافعي: ٧٥؛ وفي: ١٧٠٤؛ وابن حنبل: ٥٩٢٧، وفي: ٦٢٣١، وفي: ٢٣٩٤٠؛ والبخاري: ٥٠٥؛ ومسلم: المناسك: ٣٨٨؛ والنسائي: ٧٤٩؛ وأبو داود: ٢٠٢٣؛ وابن حبان: ٣٢٠٤؛ والقابسي: ٢٢٦، كلهم عن مالك به.

إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، فَقَالَ: أَهَذِهِ السَّاعَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْظِرْنِي حَتَّى أُفِيضَ عَلَيَّ مَاءً، ثُمَّ أَخْرُجَ، فَنَزَلَ عَبْدُ اللهِ ﷺ، حَتَّى خَرَجَ الحَجَّاجُ، فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي، فَقُلْتُ لَهُ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ أَنْ تُصِيبَ السُّنَّةَ الْيَوْمَ، فَاقْصُرِ الْخُطْبَةَ، وَعَجِّلِ الصَّلَاةَ، قَالَ: فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ كَيْمَا يَسْمَعَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ ﷺ، قَالَ: صَدَقَ سَالِمٌ[1].

واتە: لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان بۆ حەجاجی کوڕی یوسفی نووسی: پێچەوانەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نەکەی لە هیچ شتێکی کاروباری حەجدا، دەڵێ: جا کە ڕۆژی عەڕەفە داهات، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هات بۆ لای حەجاج کاتێ خۆر لایدابوو (ببوو بە کاتی نیوەڕۆ) منیش لەگەڵی بووم، جا عەبدوڵڵا ﷺ لەلای خێمەکەی حەجاج بانگی کرد و گوتی: ئەوە لەکوێیە؟ حەجاجیش دەرچوو بۆ لای لە کاتێکدا خۆی بە خاولییەکی ڕەنگکراو پێچابوو و گوتی: چیتە ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان؟ ئەویش گوتی: ڕۆیشتن (واتە دەی با بڕۆین)، ئەگەر سوننەتت دەوێ، ئەویش گوتی: لەو کاتەدا؟ گوتی: بەڵێ، ئەویش گوتی: کەواتە چاوەڕێم بکە تاوەکوو ئاوێك بە خۆمدا دەکەم، دواتر دێمە دەرەوە، جا عەبدوڵڵا ﷺ لەسەر وڵاخەکەی دابەزی تا حەجاج هاتە دەرەوە، جا (حەجاج هات و) لە نێوان من و باوکم دەڕۆیشت، منیش پێم گوت: ئەگەر ئەوڕۆ دەتەوێت سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ بکەی، ئەوە وتار کورت بکەرەوە و نوێژ زوو ئەنجام بدە، حەجاجیش هەر سەیری عەبدوڵڵای کوڕی عومەری ﷺ دەکرد تاوەکوو ئەوە لەو ببیستێ، جا کاتێ عەبدوڵڵا ﷺ ئەو چاوەڕوانییەی ئەوی بینی گوتی: سالم ڕاست دەکات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٥؛ والبخاري: ١٦٦٠، وفي: ١٦٦٣؛ والنسائي: ٣٠٠٥، وفي: ٣٠٠٩، كلهم عن مالك به.

## ٦٤- نوێژ لە مینا لە ڕۆژی تەڕویە، وە نوێژی هەینی لە مینا و عەرەفە[١]

١١٨٨- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ، وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ، وَالصُّبْحَ بِمِنًى، ثُمَّ يَغْدُو إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ إِلَى عَرَفَةَ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا و بەیانی لە مینا دەکرد، دواتر کاتێ خۆر هەڵدەهات دەچوو بۆ عەرەفە.

١١٨٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا، أَنَّ الإِمَامَ لاَ يَجْهَرُ بِالْقُرْآنِ فِي الظُّهْرِ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَأَنَّهُ يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَأَنَّ الصَّلاَةَ يَوْمَ عَرَفَةَ إِنَّمَا هِيَ ظُهْرٌ، وَإِنْ وَافَقَتِ الْجُمُعَةَ، فَإِنَّمَا هِيَ ظُهْرٌ، وَلَكِنَّهَا قَصُرَتْ مِنْ أَجْلِ السَّفَرِ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە (ئەوەیە): ئیمام لە نیوەڕۆی ڕۆژی عەرەفە قوڕئان بەدەنگ ناخوێنێ، وە لە ڕۆژی عەرەفە وتار بۆ خەڵکی دەدات، وە نوێژی ڕۆژی عەرەفە نوێژی نیوەڕۆیە (نەك نوێژی هەینی) هەرچەندە بکەوێتە ڕۆژی هەینیش، (جا هەر چەندە بە دوو ڕکاتیش ئەنجام بدرێ) نوێژەکە هەر نیوەڕۆیە، بەڵام بەهۆی سەفەر کورت دەکرێتەوە.

١١٩٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي إِمَامِ الْحَاجِّ إِذَا وَافَقَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ يَوْمَ عَرَفَةَ أَوْ يَوْمَ النَّحْرِ أَوْ بَعْضَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، إِنَّهُ لاَ يُجَمِّعُ فِي شَيْءٍ مِنْ تِلْكَ الأَيَّامِ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئیمامی حاجییەکان گوتوویەتی: کاتێ ڕۆژی هەینی کەوتە ڕۆژی عەرەفە یان کەوتە ڕۆژی قوربان یان کەوتە ڕۆژێك لە

---

(١) ـ الصَّلاَةُ بِمِنًى يَوْمَ التَّرْوِيَةِ وَالْجُمُعَةِ بِمِنًى وَعَرَفَةَ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣٥؛ والحدثاني: ٦٠٦ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨٤ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣٧؛ والحدثاني: ٦٠٦أ في المناسك، عن مالك به.

ڕۆژەكانى تەشريق، ئەوە لە هيچێك لەو ڕۆژانە نوێژ و وتارى هەينى ئەنجام نادات (چونكە خەڵكەكە موسافيرن، موسافيريش سوننەت وايە هەينى ئەنجام نەدات).

## ٦٥- نوێژى موزدەليفە[1]

**١١٩١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ جَمِيعًا[2].

واتە: لە عەبدوڵڵاى كوڕى عومەرەوە رضي الله عنهما گێڕدراوەتەوە (گوتوويەتى): پێغەمبەرى خوا ﷺ نوێژى مەغريب و عيشاى لە موزدەليفە بەكۆكراوەيى (واتە بەجەمع و تەئخير) ئەنجام دا.

**١١٩٢-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: دَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالشِّعْبِ، نَزَلَ فَبَالَ فَتَوَضَّأَ، فَلَمْ يُسْبِغِ الْوُضُوءَ، فَقُلْتُ لَهُ: الصَّلَاةَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ: الصَّلَاةُ أَمَامَكَ، فَرَكِبَ، فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ، نَزَلَ، فَتَوَضَّأَ، فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الْعِشَاءُ فَصَلَّاهَا، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا[3].

واتە: لە ئوسامەى كوڕى زەيدەوە رضي الله عنهما گێڕدراوەتەوە گوتوويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ لە عەرەفە بەڕێ كەوت تا گەيشتە دۆڵەكە (كە لە نزيك موزدەليفەيە، لەوێ) دابەزى و سەرئاوى كرد و دەستنوێژى شۆرد (بەڵام وەك جاران) بەتێرى نەيشۆرد (بەڵكوو بەجوانى و خەفيفى شۆردى)، منيش پێم گوت: نوێژ ئەى پێغەمبەرى خوا

---

(١) ـ صَلَاةُ الْمُزْدَلِفَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٢؛ وفي: ١٣٤٧؛ والحدثاني: ١١٨أ في الصلاة؛ وفي: ٥٥٦ في المناسك؛ والشيباني: ٤٨٩ في الحج؛ والشافعي: ١١٣؛ وابن حنبل: ٥٢٨٧؛ ومسلم: المناسك: ٢٨٦؛ والنسائي: ٦٠٧؛ وأبو داود: ١٩٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٣؛ وفي: ١٣٤٨؛ والحدثاني: ٥٥٧ في المناسك؛ وابن حنبل: ٢١٨٦٣؛ والبخاري: ١٣٩، وفي: ١٦٧٢؛ ومسلم: المناسك: ٢٧٦؛ وأبو داود: ١٩٢٥؛ وابن حبان: ١٥٩٤، وفي: ٣٨٥٧؛ وشرح معاني الآثار: ٣٩٦٧؛ والقابسي: ١٩٠، كلهم عن مالك به.

ﷺ، ئەویش فەرمووی: نوێژەکە لەپێشتەوەیە (واتە لە موزدەلیفە نوێژەکە دەکەین)، جا کاتێ هاتە موزدەلیفە دابەزی و دەستنوێژی بەتێروتەسەلی شۆرد، دواتر قامەتی نوێژ کرا و نوێژی مەغریبی کرد، دواتر هەر کەسەو وشترەکەی لە شوێنی خۆی یەخ کرد، دواتر قامەتی عیشا کرا و نوێژی عیشاشی کرد، جا لە نێوانیاندا هیچ نوێژێکی (سوننەتی) نەکرد.

**١١٩٣-** أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ جَمِيعًا[١].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ هەواڵی داوە بەوەی لە حەجیماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای لە موزدەلیفە بەکۆکراوەیی (واتە بەجەمع و تەئخیر) ئەنجام داوە.

**١١٩٤-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ جَمِيعًا[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای لە موزدەلیفە بەکۆکراوەیی (واتە بەجەمع و تەئخیر) ئەنجام دا.

## ٦٦- نوێژی مینا[٣]

**١١٩٥-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي أَهْلِ مَكَّةَ: إِنَّهُمْ يُصَلُّونَ بِمِنًى إِذَا حَجُّوا رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى يَنْصَرِفُوا إِلَى مَكَّةَ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧١؛ وفي: ١٣٤٩ في المناسك؛ والحدثاني: ١١٨ في الصلاة؛ وفي: ٥٥٨ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٠ في الحج؛ وابن حنبل: ٢٣٦١٢؛ والبخاري: ٤٤١٤؛ والنسائي: ٦٠٥؛ وابن حبان: ٣٨٥٨؛ والقابسي: ٤٨٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٧٤؛ وفي: ١٣٥٠؛ والشيباني: ٤٨٨ في الحج، عن مالك به.

(٣) ـ صَلَاةُ مِنًى.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٦٢، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی خەڵکی مەككە گوتوویەتی: ئەوان كاتێ حەج دەكەن لە مینا دوو ڕكات دوو ڕكات نوێژ دەكەن (واتە نوێژە چوار ڕكاتییەكان دەكەن بە دوو)، تاوەكوو دەگەڕێنەوە بۆ مەككە (لە پێناوی پێڕاگەیشتنی مەناسیكەكان كورتی دەكەنەوە ئەگینا مەسافەكەی ناگاتە مەسافەی كورتكردنەوەی سەفەر).

**١١٩٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الصَّلاَةَ بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ صَلاَّهَا بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَأَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ صَلاَّهَا بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ، وَأَنَّ عُثْمَانَ ﷺ صَلاَّهَا بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ شَطْرَ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا بَعْدُ[١].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا بە دوو ڕكات نوێژی كرد (چونكە لە سەفەردا بوون)، ئەبو بەكریش ﷺ لە مینا بە دوو ڕكات ئەنجامی دا، عومەریش ﷺ لە مینا بە دوو ڕكات ئەنجامی دا، عوسمانیش ﷺ لە نیوەی یەكەمی كاربەدەستییەكەی لە مینا بە دوو ڕكات ئەنجامی دا، لەپاشان تەواوی كرد (بە چوار ڕكات ئەنجامی دەدا، كورتی نەدەكردەوە).

**١١٩٧-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ، صَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ، أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ، ثُمَّ صَلَّى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ بِمِنًى، وَلَمْ يَبْلُغْنَا أَنَّهُ قَالَ لَهُمْ شَيْئًا[٢].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ كاتێ هات بۆ مەككە نوێژی بە دوو ڕكات بۆ خەڵكی كرد، كە تەواو بوو گوتی: ئەی خەڵكی مەككە، ئێوە نوێژەكانتان بەتەواوی بكەن (بە چوار ڕكات بیكەن و كورتی مەكەنەوە) ئێمە خەڵكێكی موسافیرین (بۆیە بۆ ئێمە دروستە)، دواتر ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لە مینا نوێژی بە دوو ڕكات كرد، وە هیچمان

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٥٨؛ والحدثاني: ٦٠٨ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٩١؛ والحدثاني: ١٢٣ في الصلاة؛ والشيباني: ١٩٥ في الصلاة، كلهم عن مالك به.

پێ نەگەیشتووە لەوێ (نەهی لێ کردبن لەوەی کورتی بکەنەوە و) هیچی پێ گوتبن (دیارە لەوێ سوننەت وایە لەبەر خاتری مەناسیکەکان کورت بکرێتەوە).

**١١٩٨-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ صَلَّى لِلنَّاسِ بِمَكَّةَ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ: أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ، ثُمَّ صَلَّى عُمَرُ رَكْعَتَيْنِ بِمِنًى، وَلَمْ يَبْلُغْنَا أَنَّهُ قَالَ لَهُمْ شَيْئًا[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مەککە بە دوو ڕکات نوێژی بۆ خەڵکی کرد، کە تەواو بوو گوتی: ئەی خەڵکی مەککە، ئێوە نوێژەکانتان بەتەواوی بکەن (کورتی مەکەنەوە) ئێمە خەڵکێکی موسافیرین (بۆیە بۆ ئێمە دروستە)، دواتر ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە مینا نوێژی بە دوو ڕکات کرد، وە هیچمان پێ نەگەیشتووە لەوێ هیچی پێ گوتبن (چونکە لەوێ بۆ ئەوانیش دروستە کورتی بکەنەوە، چونکە شوێنەکە دوورە و خەڵکی مەککەش دەبن بە موسافیر).

**١١٩٩-** [فتوى] وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنْ أَهْلِ مَكَّةَ كَيْفَ صَلاَتُهُمْ بِعَرَفَةَ؟ أَرَكْعَتَانِ أَمْ أَرْبَعٌ؟ وَكَيْفَ بِأَمِيرِ الْحَاجِّ إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ؟ أَيُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِعَرَفَةَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ أَمْ رَكْعَتَيْنِ؟ وَكَيْفَ صَلاَةُ أَهْلِ مَكَّةَ بِمِنًى فِي إِقَامَتِهِمْ؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُصَلِّي أَهْلُ مَكَّةَ بِعَرَفَةَ وَمِنًى، مَا أَقَامُوا بِهِمَا، رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، يَقْصُرُونَ الصَّلاَةَ حَتَّى يَرْجِعُوا إِلَى مَكَّةَ[٢].

قَالَ: وَأَمِيرُ الْحَاجِّ أَيْضًا، إِذَا كَانَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ قَصَرَ الصَّلاَةَ بِعَرَفَةَ، وَأَيَّامَ مِنًى، وَإِنْ كَانَ أَحَدٌ سَاكِنًا بِمِنًى مُقِيمًا بِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُتِمُّ الصَّلاَةَ بِمِنًى، وَإِنْ كَانَ أَحَدٌ سَاكِنًا بِعَرَفَةَ مُقِيمًا بِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُتِمُّ الصَّلاَةَ بِهَا أَيْضًا[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی خەڵکی مەککە کە ئاخۆ نوێژەکانیان چۆنە لە عەرەفە؟ دوو ڕکاتە یان چوار؟ وە گەورە و ڕێبەری

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٦٠؛ والحدثاني: ٦٠٨أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٦٣، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٦٤، عن مالك به.

حاجییەکان ئەگەر خەڵکی مەککە بوو چی دەکات؟ ئایا نوێژی نیوەڕۆ و عەسر لە عەرەفە بە چوار ڕکات دەکات یان بە دوو ڕکات؟ وە نوێژی خەڵکی مەککە لە کاتی مانەوەیان لە مینا چۆنە؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: خەڵکی مەککە لە عەرەفە و مینا ئەو ماوەیەی تیایاندا دەمێننەوە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژ دەکەن، نوێژەکان کورت دەکەنەوە تا دەگەڕێنەوە بۆ مەککە، گوتی: وە گەورە و ڕێبەر و کاربەدەستی حاجییەکان بەهەمان شێوە ئەگەر خەڵکی مەککە بوو نوێژ لە عەرەفە و ڕۆژەکانی مینا کورت دەکاتەوە، وە ئەگەر کەسێك لە مینا نیشتەجێ بوو و لەوێ دەمایەوە، نوێژ بەتەواوی دەکات لە مینا (کورتی ناکاتەوە)، وە ئەگەر کەسێك لە عەرەفە نیشتەجێ دەبوو و دەمایەوە، ئەویش بەهەمان شێوە نوێژ تەواو دەکات (کورتی ناکاتەوە).

## ٦٧- نوێژی کەسی موقیم لە مەککە و مینا[١]

**١٢٠٠- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قَدِمَ مَكَّةَ لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَهَلَّ بِالْحَجِّ، فَإِنَّهُ يُتِمُّ الصَّلاَةَ، حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ مَكَّةَ إِلى مِنًى، فَيَقْصُرَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ قَدْ أَجْمَعَ عَلَى مُقَامٍ، أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِ لَيَالٍ[٢].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر کەسێك لە مانگی زولحیجە بێتە مەککە و ئیحرام بە حەج ببەستێ، ئەوە نوێژەکان بەتەواوی دەکات (کورتیان ناکاتەوە)، تاوەکوو لە مەککەوە بۆ مینا دەچێت، ئەو کات کورتیان دەکاتەوە، (جا کە پێشتر نابێت کورتیان بکاتەوە) لەبەر ئەوەیە کەسەکە نییەتی تۆکمە کردووە لەسەر مانەوەی زیاتر لە چوار شەو (بەمەش دەبێتە موقیم و بە موسافیر حیساب نابێت).

---

(١) ـ صَلاَةُ الْمُقِيمِ بِمَكَّةَ وَمِنًى.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٣٢، عن مالك به.





## ٦٨- تەكبیرلێدانی ڕۆژەكانی تەشریق[١]

١٢٠١- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَرَجَ الْغَدَ مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ شَيْئًا، فَكَبَّرَ، فَكَبَّرَ النَّاسُ بِتَكْبِيرِهِ، ثُمَّ خَرَجَ الثَّانِيَةَ مِنْ يَوْمِهِ ذَلِكَ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَكَبَّرَ، فَكَبَّرَ النَّاسُ بِتَكْبِيرِهِ، ثُمَّ خَرَجَ الثَّالِثَةَ حِينَ زَاغَتِ الشَّمْسُ، فَكَبَّرَ، فَكَبَّرَ النَّاسُ بِتَكْبِيرِهِ، حَتَّى يَتَّصِلَ التَّكْبِيرُ، وَيَبْلُغَ الْبَيْتَ، فَيُعْلَمَ أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَدْ خَرَجَ يَرْمِي[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕاویەتەوە پێی ڕاگەیاندووە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لە بەیانییەكەی ڕۆژی قوربان دەرچوو كاتێ تۆزێك خۆر بەرز بۆیەوە، جا (الله أكبر) ی كرد و خەڵكیش (الله أكبر)یان كرد، دواتر جاری دووەم دەرچوو لە هەمان ڕۆژ كاتێ خۆر بەتەواوی بەرز بۆیەوە، جا (الله أكبر)ی كرد و خەڵكیش (الله أكبر) یان كرد، دواتر جاری سێیەم دەرچوو كاتێ خۆر لایدا، جا (الله أكبر)ی كرد و خەڵكیش لەگەڵ (الله أكبر)ی ئەو (الله أكبر)یان كرد، تاوەكوو (الله أكبر)ـەكان یەكیان گرت و دەنگەكە گەیشت بە كەعبە و دەزانرا عومەر ﷺ دەرچووە كرداری بەردباران ئەنجام دەدات.

١٢٠٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا، أَنَّ التَّكْبِيرَ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ دُبُرَ الصَّلَوَاتِ، وَأَوَّلُ ذَلِكَ تَكْبِيرُ الإِمَامِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، دُبُرَ صَلاَةِ الظُّهْرِ مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ، وَآخِرُ ذَلِكَ تَكْبِيرُ الإِمَامِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، دُبُرَ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، ثُمَّ يَقْطَعُ التَّكْبِيرَ[٣].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لای ئێمە ئاوایە: «الله أكبر»كردن لە ڕۆژەكانی تەشریق دوای نوێژەكان ئەنجام دەدرێت، سەرەتای ئەو كارەش «الله أكبر»كردنی ئیمام و خەڵكە لەدوای نوێژی نیوەڕۆ لە ڕۆژی قورباندا،

---

(١) ـ تَكْبِيرُ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٥؛ والحدثاني: ٦١٢ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٦، عن مالك به.

وە کۆتاییەکەشی «للە أکبر»کردنی ئیمام و خەڵکە دوای نوێژی بەیانی لە کۆتایی ڕۆژەکانی تەشریق، دواتر «اللە أکبر» دەوەستێنێت.

تێبینی: ڕۆژەکانی تەشریق لە عادەتی کوردەواری پێی دەگوترێت ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەمی جەژنی قوربان، ئەگەرچی جەژن تەنها یەك ڕۆژە، بەڵام ئاوا بۆتە عادەت.

**١٢٠٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالتَّكْبِيرُ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ عَلَى الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، مَنْ كَانَ فِي جَمَاعَةٍ أَوْ وَحْدَهُ، بِمِنًى أَوْ بِالآفَاقِ، كُلُّهَا وَاجِبٌ، وَإِنَّمَا يَأْتَمُّ النَّاسُ فِي ذَلِكَ بِإِمَامِ الْحَاجِّ، وَبِالنَّاسِ بِمِنًى، لأَنَّهُمْ إِذَا رَجَعُوا وَانْقَضَى الإِحْرَامُ ائْتَمُّوا بِهِمْ، حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَهُمْ فِي الْحِلِّ، فَأَمَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ حَاجًّا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتَمُّ بِهِمْ إِلاَّ فِي تَكْبِيرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَيَّامُ الْمَعْدُودَاتُ أَيَّامُ التَّشْرِيقِ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لە ڕۆژەکانی تەشریقدا «اللە أکبر»کردن بۆ پیاوان و ئافرەتانە، بۆ هەر کەسێکە کە لەناو کۆمەڵی خەڵکیدا بێت یان بەتەنها بێت، لە مینا یان لە هەر جێگەیەکی دیکە بێت، بۆ گشتیان سونەتێکی موئەککەد و گەورەیە، جا کە خەڵك لەوەدا (واتە لە تەکبیرکردن و ڕەجمکردن) شوێنی ئیمامی حەج و خەڵکی مینا دەکەون، لەبەر ئەوەیە کاتێ گەڕانەوە و ئیحرامەکەیان تەواو بوو شوێنی ئەوان دەکەون تاوەکوو وەك ئەوان بن لە دەرچوون لەژێر ئیحرامدا، بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە حاجی نییە، ئەوە شوێنیان ناکەوێت تەنها لە «اللە أکبر»کردن نەبێت لە ڕۆژەکانی تەشریقدا.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: (الأَيَّامُ الْمَعْدُودَاتُ) ـ کە لە قوڕئاندا باس کراوە ـ بریتییە لە ڕۆژەکانی تەشریق.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٧، عن مالك به.

## ٦٩- نوێژ لە موعەڕەس و موحەصەب[1]

**١٢٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ، الَّتِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَصَلَّى بِهَا.

قَالَ نَافِعٌ ﷺ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی لە بەتحاء یەخ کرد، ئەو بەتحائەی کە لە زولحولەیفەیە (نەك بەتحائەکەی نێوان مەککە و مەدینە)، جا نوێژی لەوێ کرد.

نافیع ﷺ گوتوویەتی: ئیبنو عومەریش ﷺ ئاوای دەکرد.

**١٢٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يُجَاوِزَ الْمُعَرَّسَ إِذَا قَفَلَ، حَتَّى يُصَلِّيَ فِيهِ، وَإِنْ مَرَّ بِهِ فِي غَيْرِ وَقْتِ صَلاَةٍ، فَلْيُقِمْ حَتَّى تَحِلَّ الصَّلاَةُ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا بَدَا لَهُ، لأَنَّهُ بَلَغَنِي، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَرَّسَ بِهِ، وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ أَنَاخَ بِهِ[3].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ کەس نییە (کە بیەوێ چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات) کاتێ (لە حەج) گەڕایەوە لە موعەڕەس تێپەڕێ و بترازێ، تاوەکوو نوێژی تێدا دەکات، وە ئەگەر پێیدا تێپەڕ بوو کاتی نوێژیش نەبوو، ئەوە با بمێنێتەوە تاوەکوو نوێژ دەبێت، دواتر نوێژ بکات چۆن بۆی دەگونجێت، چونکە پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ شەو لەوێ ماوەتەوە و عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ وڵاغەکەی لەوێ یەخ کردووە و ماوەتەوە.

**١٢٠٦-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُحَصَّبِ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَطُوفُ بِالْبَيْتِ[4].

---

(١) ـ صَلاَةُ الْمُعَرَّسِ وَالْمُحَصَّبِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٦؛ والحدثاني: ٦٢٠ في المناسك؛ وابن حنبل: ٤٨١٩، وفي: ٥٩٢٢، وفي: ٦٢٣٢؛ والبخاري: ١٥٣٢؛ ومسلم: المناسك: ٤٣٠؛ وأبو داود: ٢٠٤٤؛ والقابسي: ٢٢٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٧؛ وأبو داود: ٢٠٤٥، عن مالك به.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧٧؛ والحدثاني: ٦٢٠أ في المناسك؛ والشيباني: ٥١٩ في

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشای لە موحەصەب دەکرد، دواتر لە شەودا دەچوو بۆ مەککە و تەوافی بەیتی دەکرد.

## ٧٠- شەو مانەوە لە مەککە لە شەوەکانی مینا[١]

١٢٠٧- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: زَعَمُوا أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَبْعَثُ رِجَالاً يُدْخِلُونَ النَّاسَ مِنْ وَرَاءِ الْعَقَبَةِ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دەڵێن عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ چەندین پیاوی ڕەوانە دەکرد خەڵکیان لە دوای عەقەبەوە دەخستەوە ناو سنووری مینا (لە عەقەبە دەریاندەکردن، چونکە ئەوێ سنووری مینا نییە).

١٢٠٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ يَبِيتَنَّ أَحَدٌ مِنَ الْحَاجِّ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ وَرَاءِ الْعَقَبَةِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: با هیچ کەس لە حاجییەکان لە شەوانی مینا لەدواوەی عەقەبە نەمێنێتەوە (چونکە عەقەبە مینا نییە، بەڵکوو سنووری مینایە لەلای مەککەوە).

١٢٠٩- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ، فِي الْبَيْتُوتَةِ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى: لاَ يَبِيتَنَّ أَحَدٌ إِلاَّ بِمِنًى[٤].

---

الحج، كلهم عن مالك به.

(١) ـ الْبَيْتُوتَةُ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠٩؛ والحدثاني: ٦١٠ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه الشيباني: ٥٠٠ في الحج، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١١؛ والحدثاني: ٦١٠ ب في المناسك، عن مالك به.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەربارەی مانەوەی لە مەککە لە شەوەکانی مینا گوتوویەتی: با کەس نەمێنێتەوە لە هیچ شوێنێك جگە لە مینا.

## ٧١- بەردبارانکردنەکان[١]

**١٢١٠-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَقِفُ عِنْدَ الْجَمْرَتَيْنِ الأَولَيَيْنِ وُقُوفًا طَوِيلاً حَتَّى يَمَلَّ الْقَائِمُ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە نێوان دوو جەمەڕەکانی یەکەم ڕادەوەستا بەڕاوەستانێکی زۆر دوورودرێژ تا ئەو ڕادەیەی کەسی ڕاوەستاو بێتاقەت دەبوو.

**١٢١١-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقِفُ عِنْدَ الْجَمْرَتَيْنِ الأَولَيَيْنِ وُقُوفًا طَوِيلاً، يُكَبِّرُ اللهَ، وَيُسَبِّحُهُ، وَيَحْمَدُهُ، وَيَدْعُو اللهَ، وَلاَ يَقِفُ عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەلای دوو جەمەڕەکانی یەکەم ڕادەوەستا بەڕاوەستانێکی دوورودرێژ، الله أكبر و سبحان الله و الحمد لله و دوعای دەکرد، بەڵام لەلای جەمەڕەی عەقەبە نەدەوەستا.

**١٢١٢-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يُكَبِّرُ عِنْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ[٤].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەگەڵ هەر بەردێك کە ڕەجمی پێ دەکرد «الله أكبر»ی دەکرد.

---

(١) ـ رَمْيُ الْجِمارِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٢؛ والحدثاني: ٦١٣أ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٣؛ والحدثاني: ٦١٣ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٨ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٤؛ والحدثاني: ٦١٣ ب في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٧ في الحج، كلهم عن مالك به.

**١٢١٣- [فتوى]** عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ: الْحَصَى الَّتِي يُرْمَى بِهَا الْجِمَارُ مِثْلُ حَصَى الْخَذْفِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ قَلِيلاً، أَعْجَبُ إِلَيَّ[(١)].

(فەتوا) واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە هەندێك لە زانایان بووە دەیانگوت: ئەو بەردەی کە ڕەجمی پێ دەکرێ ئەندازەکەی وەك ئەو بەردەیە کە بە دوو پەنجەکان دەهاوێژرێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای من تۆزێك لەو ئەندازەیە گەورەتر چاکترە.

**١٢١٤-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ غَرَبَتْ لَهُ الشَّمْسُ مِنْ أَوْسَطِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ وَهُوَ بِمِنًى، فَلاَ يَنْفِرَنَّ حَتَّى يَرْمِيَ الْجِمَارَ مِنَ الْغَدِ[(٢)].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: هەر کەسێك لە دووەم ڕۆژی تەشریقدا خۆری لێ ئاوا بوو لە کاتێکدا هێشتا لە مینایە، ئەوە با نەڕوات و ئەوێ جێ نەهێڵێت تاوەکوو بۆ بەیانی بەردباران ئەنجام دەدات.

**١٢١٥-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّاسَ كَانُوا إِذَا رَمَوُا الْجِمَارَ، مَشَوْا ذَاهِبِينَ وَرَاجِعِينَ، وَأَوَّلُ مَنْ رَكِبَ، مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ [(٣)].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێشتر خەڵکی کاتێ بەردبارانیان ئەنجام دەدا بەپێ دەڕۆیشتن لە چوون و گەڕانەوەدا، جا یەکەم کەس کە سواری وڵاخ بوو موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو ﷺ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٥؛ والحدثاني: ٦١٤ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٦؛ والحدثاني: ٦١٤أ في المناسك؛ والشيباني: ٥١١ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٨؛ والحدثاني: ٦١٥أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٦ في الحج، كلهم عن مالك به.

١٢١٦- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْقَاسِمِ: مِنْ أَيْنَ كَانَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ يَرْمِي جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ؟ فَقَالَ: مِنْ حَيْثُ تَيَسَّرَ(١).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە پرسیاری لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسم کردووە (گوتوویەتی): قاسمی کوڕی موحەممەد لە کوێ بەردبارانی عەقەبەی ئەنجام دەدا؟ ئەویش گوتی: لەکوێ بۆی سەهل و ئاسان با.

١٢١٧- **[فتوى]** سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: هَلْ يُرْمَى عَنِ الصَّبِيِّ وَالْمَرِيضِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَيَتَحَرَّى الْمَرِيضُ حِينَ يُرْمَى عَنْهُ، فَيُكَبِّرُ وَهُوَ فِي مَنْزِلِهِ، وَيُهَرِيقُ دَمًا، فَإِنْ صَحَّ الْمَرِيضُ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، رَمَى الَّذِي رُمِيَ عَنْهُ، وَأَهْدَى(٢).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا: ئایا لەبری منداڵ و نەخۆش بەردباران ئەنجام دەدرێت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، جا نەخۆش لەو کاتە دەکۆڵێتەوە کە تیایدا لەبری ئەو ڕەجم ئەنجام دەدرێت، «الله أکبر» دەکات لە کاتێکدا لە ماڵەکەی خۆیدایە، وە خوێن دەڕێژێت (قوربانی دەکات)، جا ئەگەر نەخۆش لە ڕۆژەکانی تەشریق چاك بۆیەوە، ئەوە ئەو بەردبارانە ئەنجام دەداتەوە کە لەبری ئەو ئەنجام دراوە وە هەدیش ئەنجام دەدات.

١٢١٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى عَلَى الَّذِي يَرْمِي الْجِمَارَ، أَوْ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَهُوَ غَيْرُ مُتَوَضٍّ، إِعَادَةً، وَلَكِنْ لاَ يَتَعَمَّدُ ذَلِكَ(٣).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەسەی بەردباران ئەنجام دەدات یان لەنێوان صەفا و مەڕوە ڕادەکات لە کاتێکدا دەستنوێژی نییە، پێم وا نییە دووبارەکردنەوەی لەسەر بێت، بەڵام نابێ بەئەنقەست وا بکات (واتە ئەگەر نەیزانی ئەوە دووبارەکردنەوەی لەسەر نییە، بەڵام نابێ بەئەنقەست بەبێدەستنوێژی دەست پێ بکات).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٩؛ والحدثاني: ٦١٥ ب في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٤ في الحج؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٣٤١٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٠، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢١، عن مالك به.

**١٢١٩-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ تُرْمَى الْجِمَارُ فِي الأَيَّامِ الثَّلاَثَةِ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: بەردبارانکردنەکان نابێ لە سێ ڕۆژەکان (ی تەشریق) ئەنجام بدرێن تاوەکوو خۆر لادەدات (و دەبێتە دوای نیوەڕۆ).

## ٧٢- مۆڵەتی تایبەت (بۆ شوانەکان) دەربارەی ڕەجمکردن[٢]

**١٢٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَا الْبَدَّاحِ بْنَ عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ ﷺ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرْخَصَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ عَنْ مِنًى، يَرْمُونَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْمُونَ الْغَدَ، وَمِنْ بَعْدِ الْغَدِ لِيَوْمَيْنِ، ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّفْرِ[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بەداحی کوڕی عاصمی کوڕی عەدی ﷺ لە باوکیەوە هەواڵی داوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە شوانەکانی وشتر لە مانەوەی شەو لە مینا بەوەی ڕەجم بکەن لە ڕۆژی قورباندا (کە واجبە لەسەر کەسانی دیکە)، بەوەی ڕەجم بکەن لە ڕۆژی دواتر (واتە یەکەم ڕۆژی تەشریق)، یان لە ڕۆژی دوای ئەو (واتە ڕۆژی دووەمی تەشریق)، لە ڕۆژی دووەم (واتە ئەو ڕۆژانەی کە ڕەجمی تێدا دەکەن بریتییە لە ڕۆژی دووەم لە چوار ڕۆژەکان، کە دەکاتە ڕۆژی یەکەمی تەشریق)، دواتر ڕەجم بکەن لە ڕۆژی جێهێشتنی مەککە (کە دەکاتە ڕۆژی سێیەم لە چوار ڕۆژەکان، کە دەکاتە ڕۆژی دووەمی تەشریق).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤١٧؛ والحدثاني: ٦١٥ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٩ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الرُّخْصَةُ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٥؛ والحدثاني: ٦١٦ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٥ في الحج؛ وابن حنبل: ٢٣٨٢٦، وفي: ٢٣٨٢٧؛ والنسائي: ٣٠٦٩؛ وأبو داود: ١٩٧٥؛ والترمذي: ٩٥٥؛ وابن ماجه: ٣٠٧٣؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٧٧؛ والدارمي: ١٨٩٧؛ وأبي يعلى الموصلي: ٦٨٣٦؛ والقابسي: ٣١٤، كلهم عن مالك به.

**١٢٢١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَذْكُرُ، أَنَّهُ أُرْخِصَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ أَنْ يَرْمُوا بِاللَّيْلِ، يَقُولُ: فِي الزَّمَانِ الأَوَّلِ[1].

واته: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباحەوە ﷺ گوێبیست بووە باسی کردووە (گوتوویەتی): مۆڵەت دراوە بە شوانی وشترەکان بەوەی بە شەو بەردباران ئەنجام بدەن، دەیگوت: لە سەردەمی یەکەمدا ئاوا بوو (واتە لە سەردەمی صەحابە ئەو مۆڵەتە دراوە).

**١٢٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ الْحَدِيثِ الَّذِي أَرْخَصَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَمْيَ الْجِمَارِ، فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنَّهُمْ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّحْرِ، فَإِذَا مَضَى الْيَوْمُ الَّذِي يَلِي يَوْمَ النَّحْرِ، رَمَوْا مِنَ الْغَدِ، وَذَلِكَ يَوْمُ النَّفْرِ الأَوَّلِ، يَرْمُونَ لِلْيَوْمِ الَّذِي مَضَى، ثُمَّ يَرْمُونَ لِيَوْمِهِمْ ذَلِكَ، لأَنَّهُ لاَ يَقْضِي أَحَدٌ شَيْئًا حَتَّى يَجِبَ عَلَيْهِ، فَإِذَا وَجَبَ عَلَيْهِ وَمَضَى كَانَ الْقَضَاءُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِنْ بَدَا لَهُمُ النَّفْرُ فَقَدْ فَرَغُوا، وَإِنْ أَقَامُوا إِلَى الْغَدِ، رَمَوْا مَعَ النَّاسِ يَوْمَ النَّفْرِ الآخِرِ، وَنَفَرُوا[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لێكدانەوەی ئەو فەرموودەی تیایدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی ڕەجمكردنی داوە (بە شوانەكان)، ئەوەی ئێمە لێی تێ دەگەین والله أعلم ئاوایە: ئەوان لە ڕۆژی قوربان ڕەجمیان ئەنجام داوە (دواتر گەڕاونەتەوە بۆ شوانەتی)، جا كاتێ ڕۆژی دوای ڕۆژی قوربان تێ پەڕی، ئەوە بۆ بەیانییەكەی ڕەجم ئەنجام دەدەن، كە ئەوە ڕۆژی نەفری یەكەمە (كە دەكاتە ڕۆژی سێیەم)، ڕەجمیان ئەنجام داوە بۆ ئەو ڕۆژەی تێ پەڕیوە دواتر بۆ ئەو ڕۆژەی تیایدان، چونكە كەس نییە شتێك قەزا بكاتەوە و بیگێڕێتەوە تاوەكوو لەسەری واجب دەبێت، جا كە لەسەری واجب بوو و تێپەڕ بوو قەزاكردنەوە دوای ئەوە دەبێت، جا ئەگەر ڕۆژی نەفر هات ئەوان لەكاری خۆیان بوونەتەوە (پێویستییان پێ نییە)، وە ئەگەر تا بەیانیش مانەوە ئەوە لەگەڵ خەڵكی ڕەجم ئەنجام دەدەن لە ڕۆژی نەفری دواتر، ئینجا دەڕۆن.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٦؛ والحدثاني: ٦١٦أ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٧، عن مالك به.

**١٢٢٣-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ نَافِعٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ ابْنَةَ أَخٍ لِصَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ نُفِسَتْ بِالْمُزْدَلِفَةِ، فَتَخَلَّفَتْ هِيَ وَصَفِيَّةُ حَتَّى أَتَيَا مِنًى، بَعْدَ أَنْ غَرَبَتِ الشَّمْسُ مِنْ يَوْمِ النَّحْرِ، فَأَمَرَهُمَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ أَنْ تَرْمِيَا الْجَمْرَةَ حِينَ أَتَتَا، وَلَمْ يَرَ عَلَيْهِمَا شَيْئًا(١).

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): کچەبرایێکی صەفیەی کچی ئەبو عوبەید لە موزدەلیفە منداڵی بوو، جا خۆی و صەفیە دوا کەوتن دوای ئەوەی خۆر ئاوا ببوو لە ڕۆژی قوربان ئینجا هاتن بۆ مینا، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەو کاتەی هاتن فەرمانی پێ کردن بەردباران ئەنجام بدەن، وە پێی وا نەبوو هیچیان لەسەر بێت.

**١٢٢٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَمَّنْ نَسِيَ رَمْيَ جَمْرَةٍ مِنَ الْجِمَارِ فِي بَعْضِ أَيَّامِ مِنًى حَتَّى يُمْسِيَ؟ قَالَ: لِيَرْمِ أَيَّ سَاعَةٍ ذَكَرَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ، كَمَا يُصَلِّي الصَّلَاةَ إِذَا نَسِيَهَا، ثُمَّ ذَكَرَهَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا، فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ بَعْدَ مَا صَدَرَ وَهُوَ بِمَكَّةَ، أَوْ بَعْدَ مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَعَلَيْهِ الْهَدْيُ(٢).

(فەتوا) واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی لەیاد دەکات یەکێك لە جەمەرەکان بەردباران بکات لە یەکێك لە ڕۆژەکانی مینا؟ گوتوویەتی: با هەر کاتێك یادی هاتەوە بەردباران ئەنجام بدات لە شەو بێت یان لە ڕۆژ، وەك چۆن نوێژ ئەنجام دەدات کاتێ لەیادی دەکات و دواتر یادی دەکەوێتەوە شەو بێت یان ڕۆژ، جا ئەگەر هاتەوە یادی دوای ئەوەی لە مینا گەڕابۆیەوە و لە مەککە بوو یان دوای ئەوەی لە مەککە دەرچوبوو، ئەوە هەدی لەسەر واجبە.

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٨؛ والحدثاني: ٦١٧ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٢٤، عن مالك به.

## ٧٣- تەوافی ئیفازە[١]

١٢٢٥- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ بِعَرَفَةَ، وَعَلَّمَهُمْ أَمْرَ الْحَجِّ، وَقَالَ لَهُمْ فِيمَا قَالَ: إِذَا جِئْتُمْ مِنًى، فَمَنْ رَمَى الْجَمْرَةَ، فَقَدْ حَلَّ لَهُ مَا حَرُمَ عَلَى الْحَاجِّ، إِلاَّ النِّسَاءَ وَالطِّيبَ، لاَ يَمَسَّ أَحَدٌ نِسَاءً وَلاَ طِيبًا، حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە عەرەفە وتاری بۆ خەڵکی دا و کاروباری حەجی فێرکردن و لە یەکێك لە قسەکانی پێی گوتن: ئەگەر چوون بۆ مینا، هەر کەسێك ڕەجمکردنی ئەنجام دا، ئەوە ئەو شتانەی بۆ حەڵاڵ دەبێت کە بە هۆی حەج لەسەری حەڕام بووە، تەنها ئافرەت و بۆنی خۆش نەبێت، کەواتە کەس دەست لە ئافرەت و بۆنی خۆش نەدات، تاوەکوو تەوافی ئیفازە دەکات.

١٢٢٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: مَنْ رَمَى الْجَمْرَةَ، ثُمَّ حَلَقَ أَوْ قَصَّرَ، وَنَحَرَ هَدْيًا، إِنْ كَانَ مَعَهُ، فَقَدْ حَلَّ لَهُ مَا حَرُمَ عَلَيْهِ، إِلاَّ النِّسَاءَ وَالطِّيبَ، حَتَّى يَطُوفَ بِالْبَيْتِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەردبارانی ئەنجام دا، دواتر قژی تاشی یان کورتی کردەوە و ئەگەر هەدی پێ بوو و سەری بڕی، ئەوە ئەو شتانەی بۆ حەڵاڵە کە لەسەری حەڕام ببوو، تەنها ئافرەت و بۆنی خۆش نەبێت، تاوەکوو تەوافی بەیت دەکات (ئەو کات ئەوانیشی بۆ حەڵاڵ دەبنەوە).

---

(١) ـ الإِفَاضَةُ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٢؛ والحدثاني: ٦١٨ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩١ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٣؛ والحدثاني: ٦١٩ في المناسك؛ والشيباني: ٤٩٢ في الحج، كلهم عن مالك به.

## ٧٤- چوونە ناو مەككە بۆ ئافرەتی حەیزدار[١]

**١٢٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيُهْلِلْ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا، قَالَتْ: فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: انْقُضِي رَأْسَكِ وَامْتَشِطِي وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ وَدَعِي الْعُمْرَةَ، قَالَتْ: فَفَعَلْتُ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الْحَجَّ، أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، فَقَالَ: هَذَا مَكَانُ عُمْرَتِكِ، فَطَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا آخَرَ، بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى لِحَجِّهِمْ، وَأَمَّا الَّذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالْحَجِّ، أَوْ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا[٢].

واتە: لە عائیشەی دایكی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە ساڵی حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین و ئیحرامان بە عومرە بەست، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك هەدی پێیە، با ئیحرام بە حەج و عومرە ببەستێت، دواتر حەڵاڵ نابێتەوە و لەژێر ئیحرام نایەتە دەرەوە تا كۆتایی بە هەردووكیان دەهێنێ، عائیشە ﷺ دەڵێت: جا چووم بۆ مەككە لە كاتێكدا حەیزدار بووم، تەوافی بەیتم نەكرد و ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوەم ئەنجام نەدا، بۆیە سكاڵای حاڵی خۆمم برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: قژت بكەرەوە و قژت شانە بكە و ئیحرام بە حەج ببەستە و واز لە عومرە بێنە، دەڵێت: منیش وام كرد، جا كاتێ حەجمان تەواو كرد پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكر ﷺ (واتە لەگەڵ برام) ناردمی بۆ تەنعیم و عومرەم ئەنجام دا و فەرمووی: ئەوە شوێنی عومرەكەتە، جا ئەوانەی ئیحرامیان بە عومرە

---

(١) ـ دُخُولُ الْحَائِضِ مَكَّةَ.

(٢) ـ شاذ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٠٣؛ وفي: ١٣٢٤؛ والحدثاني: ٥١٣ في المناسك؛ وفي: ٥٥٣ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٦ في الحج؛ وابن حنبل: ٢٤١١٧، وفي، ٢٥٤٨٠، وفي: ٢٥٤٨٠؛ والبخاري: ١٥٥٦، وفي: ١٦٣٨، وفي: ٤٣٩٥؛ ومسلم: المناسك: ١١١؛ والنسائي: ٢٤٢، وفي: ٢٧٦٤، وفي: ٢٧٦٤؛ وأبو داود: ١٧٨١؛ وابن حبان: ٣٩١٢، وفي: ٣٩١٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٢١، وفي: ٤٥٧؛ والقابسي: ٣٨، كلهم عن مالك به.

بەستبوو تەوافیان بەدەوری بەیتدا کرد و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەیان ئەنجام دا، دواتر حەڵاڵ بوونەوە و لەژێر ئیحرام دەرچوون، دواتر تەوافێکی دیکەیان ئەنجام دا دوای ئەوەی لە مینا گەڕانەوە لە حەجەکەیان، بەڵام هەرچی ئەوانە بوون کە ئیحرامیان بە حەج بەستبوو یان حەج و عومرەیان بەیەکەوە گرێ دابوو، ئەوان تەنها یەك تەوافیان کرد (واتە یەك تەوافی حەوت شەوتی).

**١٢٢٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، بِمِثْلِ ذَلِكَ[١].

واتە: (لە ڕێگەیەکی دیکەوە) لە عائیشەوە ﵂ هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

**١٢٢٩-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: قَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: افْعَلِي مَا يَفْعَلُ الْحَاجُّ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَتَّى تَطْهُرِي[٢].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: چووم بۆ مەککە لە کاتێکدا حەیزدار بووم، جا تەوافی بەیت و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوەم پێ نەکرا، بۆیە شکاتی ئەو حاڵەی خۆم لای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەموو ئەو شتانە بکە کە کەسی حاجی ئەنجامیان دەدات، تەنها تەواف بەدەوری بەیت و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە مەکە تا پاك دەبیتەوە.

**١٢٣٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي الْمَرْأَةِ الَّتِي تُهِلُّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ تَدْخُلُ مَكَّةَ مُوَافِيَةً لِلْحَجِّ وَهِيَ حَائِضٌ، لاَ تَسْتَطِيعُ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ: إِنَّهَا إِذَا خَشِيَتِ الْفَوَاتَ، أَهَلَّتْ بِالْحَجِّ وَأَهْدَتْ، وَكَانَتْ مِثْلَ مَنْ قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَأَجْزَأَ عَنْهَا طَوَافٌ وَاحِدٌ[٣].

وَالْمَرْأَةُ الْحَائِضُ إِذَا كَانَتْ قَدْ طَافَتْ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّتْ قَبْلَ أَنْ تَحِيضَ، فَإِنَّهَا تَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَتَقِفُ بِعَرَفَةَ وَالْمُزْدَلِفَةِ، وَتَرْمِي الْجِمَارَ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ تُفِيضُ، حَتَّى تَطْهُرَ مِنْ حَيْضَتِهَا[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢٥؛ والحدثاني: ٥١٤ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٥ في الحج؛ والشافعي: ١٤٧١؛ والبخاري: ١٦٥٠؛ وابن حبان: ٣٨٣٥؛ والدارمي: ١٨٤٦؛ والقابسي: ٣٨٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٣٢؛ وفي: ١٣٢٦، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٢٧، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە ئیحرام بە عومرە دەبەستێت، دواتر دەچێتە ناو مەککە کە خەریکە بکەوێتە ناو کاتی حەج لە کاتێکدا حەیزدارە ناتوانێت تەواف بکات، گوتوویەتی: ئەگەر ترسا لەدەستی بچێ ئەوە ئیحرام بە حەج دەبەستێت و هەدی پێشکەش دەکات، وەك ئەو کەسە وایە کە حەج و عومرە بەیەکەوە گرێ دەدات و یەك تەواف بەریدەکەوێت (واتە یەك تەوافی حەوت شەوتی دەکات)، ئافرەتی حەیزداریش ئەگەر بەر لەوەی تووشی حەیز بێت تەوافی بەیتی کرد و نوێژی کرد، ئەوە ڕاکردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات و لە عەرەفە دەوەستێت و لە موزدەلیفە دەمێنێتەوە و ڕەجم ئەنجام دەدات، تەنها تەوافی ئیفازە ئەنجام نادات تاوەکوو لە حەیزەکەی پاك دەبێتەوە.

## ٧٥- تەوافی ئیفازە بۆ ئافرەتی حەیزدار[1]

**١٢٣١-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ ﵂ حَاضَتْ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟ فَقِيلَ: إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ، فَقَالَ: فَلاَ إِذًا[2].

واتە: لە عائیشەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: صەفیەی کچی حویەی ﵂ تووشی حەیز بوو، جا ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە ڕێگریمان لێ دەکات لەوەی لە سەفەرەکەمان بەردەوام بین؟ جا گوترا: ئەو تەوافی ئیفازەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کەواتە ڕێگریمان لێ ناکات لە بەردەوامبوونی سەفەرەکەمان (چونکە بە تەوافی ئیفازە لە ژێر ئیحرام چۆتە دەر و کارەکە تەواوە).

**١٢٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ ﵂ قَدْ حَاضَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا، أَلَمْ تَكُنْ طَافَتْ مَعَكُنَّ بِالْبَيْتِ؟ قُلْنَ: بَلَى، قَالَ: فَاخْرُجْنَ[3].

---

(١) ـ إِفَاضَةُ الْحَائِضِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٤؛ والحدثاني: ٥١٥ في المناسك؛ وفي: ٥١٦ في المناسك؛ والشافعي: ٦٢٦؛ والبخاري: ١٧٥٧؛ وابن حبان: ٣٩٠٢؛ والقابسي: ٣٨٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٥؛ والحدثاني: ٥١٥أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٨ في الحج؛ وابن

واتە: لە عائیشەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ صەفیەی کچی حویەی ﵂ تووشی حەیز بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ڕەنگە بمانهێڵێتەوە (تا پاك دەبێتەوە و تەواف دەكات، ئینجا ئەو كات دەبێ بڕۆین)، (جا بە ئافرەتەکانی فەرموو): ئایا صەفیە تەوافی ئیفازەی لەگەڵ ئێوە کرد؟ گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە دەرچن (لەژێر ئیحرام نەماوە و نامانهێڵێتەوە).

**١٢٣٣-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵀، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ كَانَتْ إِذَا حَجَّتْ، وَمَعَهَا نِسَاءٌ تَخَافُ أَنْ يَحِضْنَ، قَدَّمَتْهُنَّ يَوْمَ النَّحْرِ فَأَفَضْنَ، فَإِنْ حِضْنَ بَعْدَ ذَلِكَ لَمْ تَنْتَظِرْهُنَّ، تَنْفِرُ بِهِنَّ، وَهُنَّ حُيَّضٌ إِذَا كُنَّ قَدْ أَفَضْنَ[١].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ کاتێ حەجی دەکرد و ئافرەتی لەگەڵدابان دەترسا لەوەی تووشی حەیز بن، بۆیە لە ڕۆژی قوربان پێشی دەخستن و تەوافی ئیفازەیان دەکرد، جا ئەگەر تووشی حەیز ببان دوای ئەوە، ئەوە چاوەڕێی نەدەکردن و نەیدەهێشتنەوە و لەگەڵ خۆی دەیبردن و دەڕۆیشتن، لە کاتێکدا حەیزداریش بوون (بە مەرجێك) ئەگەر تەوافی ئیفازەیان کردبا.

**١٢٣٤-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ ﵂، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهَا قَدْ حَاضَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَعَلَّهَا حَابِسَتُنَا؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا قَدْ طَافَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَلاَ إِذًا[٢].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی صەفیەی کچی حویەی ﵂ کرد، جا پێی گوترا: تووشی

---

حنبل: ٢٥٤٨١؛ والبخاري: ٣٢٨؛ ومسلم: المناسك: ٣٨٥؛ والنسائي: ٣٩١؛ والقابسي: ٣١٥، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤١؛ والشيباني: ٤٦٧ في الحج؛ والشافعي: ٦٢٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٦؛ والحدثاني: ٥١٦ في المناسك؛ والشافعي: ٦٢٦؛ وأبو داود: ٢٠٠٣، كلهم عن مالك به.

حەیز بووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کەواتە لەوانەیە بمانهێڵێتەوە و ڕێگریمان لێ بکات (لە بەردەوامبوونی سەفەرەکەمان)، جا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو تەوافی ئیفازەی کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کەواتە نامانهێڵێتەوە و ڕێگریمان لێ ناکات لە بەردەوامبوونی سەفەرەکەمان (چونکە بە تەوافی ئیفازە لەژێر ئیحرام چۆتە دەر و کارەکە تەواوە).

**١٢٣٥-** قَالَ عُرْوَةُ ﷺ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ، وَنَحْنُ نَذْكُرُ ذَلِكَ: فَلِمَ يُقَدِّمُ النَّاسُ نِسَاءَهُمْ إِنْ كَانَ ذَلِكَ لاَ يَنْفَعُهُنَّ، وَلَوْ كَانَ الَّذِي يَقُولُونَ، لأَصْبَحَ بِمِنًى أَكْثَرُ مِنْ سِتَّةِ آلاَفِ امْرَأَةٍ حَائِضٍ، كُلُّهُنَّ قَدْ أَفَاضَتْ[١].

واتە: عوروە ﷺ گوتوویەتی: لە کاتێکدا ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد (کە ئاخۆ تەوافی وەداع واجبە یان تەنها تەوافی ئیفازە بەسە بۆیان)، عائیشە ﷺ گوتی: کەواتە بۆچی خەڵك خێزانەکانیان پێشخۆیان دەدەن ئەگەر تەوافی ئیفازە سوودی نەبێ بۆیان؟! ئەگەر بەو شێوەیە بێ کە دەیڵێن (واتە ئەگەر تەوافی وەداع واجب بێت وەك ئێوە دەڵێن) ئەوە زیاتر لە شەش هەزار ئافرەتی حەیزدار لە مینا دەمێنێتەوە (دەبێ چاوەڕوانی پاکبوونەوە بکەن) گشتیشیان تەوافی ئیفازەیان کردووە (شتی واش ڕووی نەداوە، کەواتە واجب نییە).

**١٢٣٦-** أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ أَخْبَرَهُ: أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ بِنْتَ مِلْحَانَ ﷺ اسْتَفْتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ، وَحَاضَتْ أَوْ وَلَدَتْ بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ يَوْمَ النَّحْرِ، فَأَذِنَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَخَرَجَتْ[٢].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە و هەواڵی داوە (گوتوویەتی): ئوممو سولەیمی کچی میلحان ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، لە کاتێکدا تووشی حەیز ببوو یان منداڵی ببوو دوای ئەوەی لە ڕۆژی قورباندا تەوافی ئیفازەی کردبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا و دەرچوو بۆ مەدینە (بێئەوەی تەوافی ماڵئاوایی بکات).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٧؛ والشافعي: ٦٢٧؛ والقابسي: ٤٦٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٨؛ والحدثاني: ٥١٦أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٩ في الحج، كلهم عن مالك به.

**١٢٣٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمَرْأَةُ تَحِيضُ بِمِنًى، تُقِيمُ حَتَّى تَطُوفَ بِالْبَيْتِ، لاَ بُدَّ لَهَا مِنْ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَتْ قَدْ أَفَاضَتْ، فَحَاضَتْ بَعْدَ الإِفَاضَةِ، فَلْتَنْصَرِفْ إِلَى بَلَدِهَا، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنَا فِي ذَلِكَ رُخْصَةٌ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ لِلْحَائِضِ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ئافرەتەی لە مینا تووشی حەیز دەبێت (بەر لەوەی تەوافی ئیفازە بكات)، دەبێ بمێنێتەوە تاوەكوو تەوافی بەیت دەكات، ئەوە واجبە لەسەری، وە ئەگەر تەوافی ئیفازەی كردبوو و دوای تەوافی ئیفازە تووشی حەیز بوو، ئەوە با بچێت بۆ شارەكەی خۆی، چونكە مۆڵەتی پێغەمبەری خوامان ﷺ پێگەیشتووە بۆ ئافرەتی حەیزدار دەربارەی ئەو بابەتە.

**١٢٣٨- [فتوى]** قَالَ: وَإِنْ حَاضَتِ الْمَرْأَةُ بِمِنًى، قَبْلَ أَنْ تُفِيضَ، فَإِنْ كَرِيَّهَا يُحْبَسُ عَلَيْهَا أَكْثَرَ مِمَّا يَحْبِسُ النِّسَاءَ الدَّمُ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەت تووشی حەیز بوو لە مینا بەر لەوەی تەوافی ئیفازە بكات (وڵاخێكیشی بەكرێ گرتبوو)، ئەوە ئاژەڵە بەكرێگیراوەكە لە چاوەڕوانی ئەو ڕادەگیرێت ماوەیەكی زیاتر لەو مانەوەی كە خوێن ئافرەت ڕادەگرێت.

٧٦- فیدیەی كوشتنی باڵندە و ئاژەڵ[٣]

**١٢٣٩-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَضَى فِي الضَّبُعِ بِكَبْشٍ، وَفِي الْغَزَالِ بِعَنْزٍ، وَفِي الأَرْنَبِ بِعَنَاقٍ، وَفِي الْيَرْبُوعِ بِجَفْرَةٍ[٤].

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ حوكم و بڕیاری داوە بە سەربڕینی بەران لە جێگەی كەمتیار (ئەگەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٣٩، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٠، عن مالك به.

(٣) ـ فِدْيَةُ مَا أُصِيبَ مِنَ الطَّيْرِ وَالْوَحْشِ.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٤؛ والحدثاني: ٥٨٨ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٣ في الحج؛ والشافعي: ١١١٠، كلهم عن مالك به.




کەمتیار لە حەڕەم ڕاو کرا و کوژرا)، وە لە شوێنی مامز بزن، وە لە شوێنی کەروێشك کاریلە، وە لە شوێنی یەڕبوع[١] بەرخ.

**١٢٤٠-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي أَجْرَيْتُ أَنَا وَصَاحِبٌ لِي فَرَسَيْنِ، نَسْتَبِقُ إِلَى ثُغْرَةِ ثَنِيَّةٍ، فَأَصَبْنَا ظَبْيًا وَنَحْنُ مُحْرِمَانِ، فَمَاذَا تَرَى؟ فَقَالَ عُمَرُ ﷺ لِرَجُلٍ إِلَى جَنْبِهِ: تَعَالَ حَتَّى أَحْكُمَ أَنَا وَأَنْتَ، قَالَ: فَحَكَمَا عَلَيْهِ بِعَنْزٍ، فَوَلَّى الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: هَذَا أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَحْكُمَ فِي ظَبْيٍ، حَتَّى دَعَا رَجُلاً يَحْكُمُ مَعَهُ، فَسَمِعَ عُمَرُ ﷺ قَوْلَ الرَّجُلِ، فَدَعَاهُ، فَسَأَلَهُ: هَلْ تَقْرَأُ سُورَةَ الْمَائِدَةِ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: فَهَلْ تَعْرِفُ هَذَا الرَّجُلَ الَّذِي حَكَمَ مَعِي؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ أَخْبَرْتَنِي أَنَّكَ تَقْرَأُ سُورَةَ الْمَائِدَةِ لأَوْجَعْتُكَ ضَرْبًا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ﴿٩٥﴾﴾المائدة، وَهَذَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و گوتی: من و هاوڕێیەکم دوو ئەسپمان لێ دەخوڕی، پێشبڕکێمان دەکرد بۆ لای بەرزاییەك لە ڕێڕەوی چیا، جا (بۆمان ڕێککەوت و) ئاسکێکمان ڕاو کرد لە کاتێکدا لەژێر ئیحرامدا بووین، جا بۆچوونت چییە؟ عومەریش ﷺ بە پیاوێکی تەنیشتی خۆی گوت: وەرە با من و تۆ بڕیار بدەین، جا بڕیاریان دا بە بزنێك، جا پیاوەکە ڕووی سوڕاند و ڕۆیشت لە کاتێکدا دەیگوت: ئەوە گەورەی باوەڕدارانە کەچی بەتەنها ناتوانێ بڕیار لەسەر یەك ئاسك بدات تاوەکوو بانگی پیاوێك دەکات تا لەگەڵی بڕیار بدات، جا عومەر ﷺ گوێی لە قسەی پیاوەکە بوو و بانگی کرد و پرسیاری لێ کرد (گوتی): ئایا سوڕەتی مائیدە دەخوێنی؟ ئەویش گوتی: نەخێر، جا عومەر ﷺ پێی گوت: ئایا ئەو پیاوە دەناسی کە لەگەڵم بڕیاری دا؟ ئەویش گوتی: نەخێر، جا عومەر ﷺ گوتی: ئەگەر پێت بگوتبام سوڕەتی مائیدە دەخوێنمەوە ئەوە بە لێدان ئازارم پێ دەگەیاندی (چونکە لە ئایەتەکە باسی ئەوە دەکات کە دەبێ دوو کەس بن ئەوانەی بڕیارەکە

---

(١) ـ تێبینی: یەڕبوع ئاژەڵێکە لە مشك دەچێت، بەڵام لووت و قاچەکانی دواوەی لە مشك درێژترە.

(٢) ـ موقوف صحیح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٥؛ والحدثاني: ٥٨٩ في المناسك، عن مالك به.

دەدەن)، دواتر گوتی: خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەی دەفەرموێت: ﴿ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ ﴿٩٥﴾ ﴾، (واتە: دوو پیاوی مسوڵمانی دادپەروەری چاك بڕیاری دیاریکردنی تۆڵە هاوشێوەکە بدەن بەشێوەیەك بگات بە کەعبە (لەوێ ئاژەڵەکە سەرببڕێ))، وە ئەو کەسەش عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بوو ﷺ (کە لەگەڵ من بڕیاری دا).

**١٢٤١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يَقُولُ: فِي الْبَقَرَةِ مِنَ الْوَحْشِ بَقَرَةٌ، وَفِي الشَّاةِ مِنَ الظِّبَاءِ شَاةٌ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): باوکم دەیگوت: لە تۆڵەی کوشتنی مانگای کێوی لە حەڕەم، مانگایەك واجبە، وە لە تۆڵەی ئاسك بزنێك یان مەڕێك واجبە.

**١٢٤٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: فِي حَمَامِ مَكَّةَ إِذَا قُتِلَ شَاةٌ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی مەسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: لە تۆڵەی کۆتری مەککەدا ـ ئەگەر ڕاو کرا و کوژرا ـ بزنێك واجبە.

**١٢٤٣-** [فتوى] وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، يُحْرِمُ بِالْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، وَفِي بَيْتِهِ فِرَاخٌ مِنْ حَمَامِ مَكَّةَ، فَيُغْلَقُ عَلَيْهَا فَتَمُوتُ، فَقَالَ: أَرَى بِأَنْ يَفْدِيَ ذَلِكَ عَنْ كُلِّ فَرْخٍ بِشَاةٍ[3].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کە خەڵکی مەککەیە و ئیحڕام بە حەج یان بە عومرە دەبەستێ لە کاتێکدا لە ماڵەکەی بێچووی کۆتری مەککە هەیە و دەرگایان لەسەر دادەخا و دەمرن، گوتوویەتی: بۆچوونم وایە لەبری هەر بێچوویێك بزنێك بکاتە فیدیە.

**١٢٤٤-** [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَمْ أَزَلْ أَسْمَعُ أَنَّ فِي النَّعَامَةِ إِذَا قَتَلَهَا الْمُحْرِمُ بَدَنَةٌ[4].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٦؛ والحدثاني: ٥٩٠ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٩، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٠؛ والحدثاني: ٥٩٠أ في المناسك، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٧، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەردەوام (لە زانایانەوە) گوێبیست بووم بەوەی ئەگەر کەسی موحریم نەعامەی کوشت وشترێکی گەورەی لەسەر واجبە.

**١٢٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَرَى أَنَّ فِي بَيْضَةِ النَّعَامَةِ عُشْرَ ثَمَنِ الْبَدَنَةِ، كَمَا يَكُونُ فِي جَنِينِ الْحُرَّةِ، غُرَّةٌ، عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقِيمَةُ الْغُرَّةِ خَمْسُونَ دِينَارًا، وَذَلِكَ عُشْرُ دِيَةِ أُمِّهِ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆچوونم وایە هێلکەی نەعامە (تۆڵەکەی بریتییە لە) دەیەکی نرخی وشتر، وەك چۆن کۆرپەلەی ناو سکی کەسی ئازاد (کاتێ بەهۆی کەسێك دەمرێت و لەبار دەچێت) تۆڵەی هەیە، تۆڵەکەشی کۆیلەیەکی پیاو یان ئافرەتە (کە دەبێ بە خاوەنەکەی ببەخشرێت)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا قیمەتی تۆڵەکە پەنجا دینارە، کە بریتییە لە دەیەکی دیەی دایکی (واتە دایکی کۆرپەلەکە، کەواتە بابەتی کەفارەتی هێلکەی نەعامەش وەك ئەو بابەتە وایە).

**١٢٤٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ شَيْءٍ مِنَ النُّسُورِ أَوِ الْعِقْبَانِ أَوِ الْبُزَاةِ أَوِ الرَّخَمِ، فَإِنَّهُ صَيْدٌ يُودَى كَمَا يُودَى الصَّيْدُ، إِذَا قَتَلَهُ الْمُحْرِمُ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها هەر یەك لە هەڵۆکان و قەلەڕەشەکان و بازەکان و بازی مصری نێچیرن، تۆڵەیان دەدرێ کاتێ کەسی مەحریم دەیانکوژێ، وەك چۆن هەر نێچیرێکی دیکە تۆڵەی دەدرێ.

**١٢٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ شَيْءٍ فُدِيَ، فَفِي صِغَارِهِ مِثْلُ مَا يَكُونُ فِي كِبَارِهِ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، مَثَلُ دِيَةِ الْحُرِّ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، فَهُمَا، بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ سَوَاءٌ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٤٨؛ والحدثاني: ٥٩١ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥١؛ والحدثاني: ٥٩١أ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٢؛ والحدثاني: ٥٩١ ب في المناسك، عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەموو شتێك كە فیدیەی تێدا واجب بێت، ئەوە لە بێچووەكانیشی هەمان ئەوە هەیە كە لە گەورەكانیدا هەیە (هەمان شت واجبە)، جا نموونەی ئەوە وەك نموونەی تۆڵەی كەسی ئازادی بچووك و گەورە وایە (كە تۆڵەكەیان یەك شتە)، هەردووكیان وەك یەكدی بە یەك ئاست حیسابن.

## ٧٧- فیدیەی ئەو كەسەی كلۆ ڕاو دەكات لەكاتێكدا لەژێر ئیحرامدایە[1]

**١٢٤٨**- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنِّي أَصَبْتُ جَرَادَاتٍ بِسَوْطِي وَأَنَا مُحْرِمٌ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: أَطْعِمْ قَبْضَةً مِنْ طَعَامٍ[2].

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: ئەی گەورەی باوەڕداران من چەندین كلۆم بە قامچییەكەم كوشتووە لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدا بووم، عومەریش ﷺ پێی گوت: مشتە خۆراكێك ببەخشە.

**١٢٤٩**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ جَرَادَةٍ قَتَلَهَا وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ عُمَرُ لِكَعْبٍ ﷺ: تَعَالَ حَتَّى نَحْكُمَ، فَقَالَ كَعْبٌ ﷺ: دِرْهَمٌ، فَقَالَ عُمَرُ لِكَعْبٍ ﷺ: إِنَّكَ لَتَجِدُ الدَّرَاهِمَ، لَتَمْرَةٌ خَيْرٌ مِنْ جَرَادَةٍ[3].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ و پرسیاری لێكرد دەربارەی كلۆ كە كوشتبوونی لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدا بوو، جا عومەر بە كەعبی ﷺ گوت: وەرە تا بڕیار بدەین، جا كەعب ﷺ گوتی: درهەمێك (واجبە)، عومەریش بە كەعبی

---

(١) ـ فِدْيَةُ مَنْ أَصَابَ شَيْئًا مِنَ الْجَرَادِ وَهُوَ مُحْرِمٌ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٤؛ والحدثاني: ٥٩٢ في المناسك؛ والشيباني: ٤٤٥ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٥؛ والحدثاني: ٥٩٢أ في المناسك، عن مالك به.

ﷺ گوت: تۆ درهەمت هەیە (خۆ هەموو کەس درهەمی نییە، با شتێکی ئاسانتر بێ)، خورما لە کلۆ چاکترە (واتە تۆڵەکە بە خورماش پێك دێت، خورماکەش لە سەرووی نرخی کلۆیە کەواتە ئەو گونجاوترە).

## ٧٨- فیدیەی ئەو کەسەی سەری بتاشێ بەر لەوەی قوربانی سەر ببڕێ[١]

**١٢٥٠-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مُحْرِمًا، فَآذَاهُ الْقَمْلُ فِي رَأْسِهِ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يَحْلِقَ رَأْسَهُ، وَقَالَ: صُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، مُدَّيْنِ مُدَّيْنِ لِكُلِّ إِنْسَانٍ، أَوِ انْسُكْ بِشَاةٍ، أَيَّ ذَلِكَ فَعَلْتَ أَجْزَأَ عَنْكَ[٢].

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە بەموحریمی و ئەسپێ سەری ئازارداوە (سەری ئەسپێی زۆری تیا بوو و ئازاری هەبوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکرد سەری بتاشێت و فەرمووی: (بۆ کەفارەتەکەشی) سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بە، یان شەش هەژار نان بدە بۆ هەر کەسێك دوو مود، یان بزنێك سەر ببڕە، هەر کامێك لەمانە ئەنجام بدەیت بەرت دەکەوێت و بۆت دروستە.

**١٢٥١-** عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لَهُ: لَعَلَّكَ آذَاكَ هَوَامُّكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: احْلِقْ رَأْسَكَ، وَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، أَوِ انْسُكْ بِشَاةٍ[٣].

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ڕەنگە زیندەوەرەکانت ئازارت بدەن (واتە ڕەنگە ئازارت هەبێت بەهۆی ئەسپێکانی سەرت)؟ دەڵێ منیش گوتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا

---

(١) ـ فِدْيَةُ مَنْ حَلَقَ قَبْلَ أَنْ يَنْحَرَ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٨؛ والحدثاني: ٥٩٣ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٤ في الحج؛ وابن حنبل: ١٨١٣١؛ والنسائي: ٢٨٥١؛ وأبو داود: ١٨٦١؛ والمنتقى لابن الجارود: ٤٤٩؛ والقابسي: ٣٩٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٩؛ والحدثاني: ٥٩٣أ في المناسك؛ والبخاري: ١٨١٤، كلهم عن مالك به.




ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرت بتاشە و (کەفارەتەکەشی ئەوەیە) سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، یان شەش هەژار نان بدە، یان بزنێك سەر ببڕە.

**١٢٥٢- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا أَنْفُخُ تَحْتَ قِدْرٍ لأَصْحَابِي، وَقَدِ امْتَلأَ رَأْسِي وَلِحْيَتِي قَمْلاً، فَأَخَذَ بِجَبْهَتِي، ثُمَّ قَالَ: احْلِقْ هَذَا الشَّعَرَ، وَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلِمَ أَنَّهُ لَيْسَ عِنْدِي مَا أَنْسُكُ بِهِ[1].**

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام لە کاتێکدا من فووم لەژێر مەنجەڵێکی هاوڕێکانم دەکرد (تا ئاگرەکەی خۆش بێت) لە کاتێکدا سەر و ڕیشم پڕی ئەسپێ بوو، جا پێشەسەری گرتم و فەرمووی: ئەو قژە بتاشە و (ئەو ئەسپێیانە لەکۆڵ خۆت بکەوە، لە کەفارەتەکەشی) سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، یانیش شەش هەژار نان بدە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی من ئەو پارەیەم نییە تا ئاژەڵی پێ سەر ببڕم (بۆیە لە کەفارەتەکە باسی ئاژەڵی نەکرد).

**١٢٥٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي فِدْيَةِ الأَذَى: إِنَّ الأَمْرَ فِيهِ أَنَّ أَحَدًا لاَ يَفْتَدِي حَتَّى يَفْعَلَ مَا يُوجِبُ عَلَيْهِ الْفِدْيَةَ، وَإِنَّ الْكَفَّارَةَ إِنَّمَا تَكُونُ بَعْدَ وُجُوبِهَا عَلَى صَاحِبِهَا، وَأَنَّهُ يَضَعُ فِدْيَتَهُ حَيْثُمَا شَاءَ، النُّسُكَ، أَوِ الصِّيَامَ، أَوِ الصَّدَقَةَ بِمَكَّةَ، أَوْ بِغَيْرِهَا مِنَ الْبِلاَدِ[2].**

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی فیدیەی ئازار (واتە ئەگەر بەهۆی ئازارەوە ناچار بێ بۆ چارەسەر قەدەغەکراوێکی ئیحرام ئەنجام بدات) گوتوویەتی: بابەتەکە دەربارەی ئەوە ئاوایە: کەسێك نابێ بچێت فیدیە بدات تا ئەو شتە ئەنجام دەدات کە فیدیە واجب دەکات، چونکە کەفارەتەکە تەنها دوای واجببونی ئەو کەفارەتە دەکەوێتە سەر خاوەنەکەی، وە خاوەنەکەی لەکوێ حەز بکات کەفارەتەکەی ئەنجام دەدات، جا ئاژەڵسەربڕین یان ڕۆژوو یان صەدەقە بێت، لە مەککە بێت یان لە شار و دێهاتی جگە لە مەککە.

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٠؛ والحدثاني: ٥٩٤ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦١، عن مالك به.



١٢٥٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَصْلُحُ لِلْمُحْرِمِ أَنْ يَنْتِفَ مِنْ شَعَرِهِ شَيْئًا، وَلاَ يَحْلِقَهُ، وَلاَ يُقَصِّرَهُ، حَتَّى يَحِلَّ، إِلاَّ أَنْ يُصِيبَهُ أَذًى فِي رَأْسِهِ، فَعَلَيْهِ فِدْيَةٌ، كَمَا أَمَرَهُ اللهُ تَعَالَى، وَلاَ يَصْلُحُ لَهُ أَنْ يُقَلِّمَ أَظْفَارَهُ، وَلاَ يَقْتُلَ قَمْلَةً، وَلاَ يَطْرَحَهَا مِنْ رَأْسِهِ إِلَى الأَرْضِ، وَلاَ مِنْ جِلْدِهِ، وَلاَ مِنْ ثَوْبِهِ، فَإِنْ طَرَحَهَا الْمُحْرِمُ مِنْ جِلْدِهِ أَوْ مِنْ ثَوْبِهِ، فَلْيُطْعِمْ حَفْنَةً مِنْ طَعَامٍ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ کەسی موحریم نابێ هیچ لە مووەکانی هەڵکێشێت و بیانتاشێت و کورتیان بکاتەوە تا حەڵاڵ دەبێتەوە و لەژێر ئیحرام دێتە دەرەوە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە تووشی ئازار دەبێت لە سەریدا (ئەو کات بۆی دروستە)، جا (وا نەبێ ئەو کاتەی لەبەر ناچاری بۆی دروستە ئەوە ئەنجام بدات هیچی لەسەر نەبێت، نەخێر بەڵکوو) فیدیەی لەسەر واجبە وەك خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووە، وە بۆی نییە نینۆکەکانی بقرتێنێت، وە ئەسپێش ناکوژێت و ئەسپێکان لە سەری و لە جەستەی و لەژێر جلەکانی ناخاتە سەر زەوی (دەسکاری ناکات)، جا ئەگەر کەسی موحریم ئەسپێی لەسەر جەستەی یان لەژێر جلەکانی خستە سەر زەوی، ئەوە با پڕ بە دوو دەستەکانی خواردن ببەخشێت.

١٢٥٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ نَتَفَ شَعَرًا مِنْ أَنْفِهِ، أَوْ مِنْ إِبْطِهِ، أَوِ اطَّلَى جَسَدَهُ بِنُورَةٍ، أَوْ يَحْلِقُ عَنْ شَجَّةٍ فِي رَأْسِهِ لِضَرُورَةٍ، أَوْ يَحْلِقُ قَفَاهُ لِمَوْضِعِ الْمَحَاجِمِ وَهُوَ مُحْرِمٌ، نَاسِيًا أَوْ جَاهِلاً: إِنَّ مَنْ فَعَلَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، فَعَلَيْهِ الْفِدْيَةُ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَحْلِقَ مَوْضِعَ الْمَحَاجِمِ[2].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك موو لەناو لووتی هەڵکەنێ یان لەژێر باڵی (لەبن هەنگری) یان جەستەی بە نورە سواق بدات و بسوێت (کە گیراوەیەك بوو وەك دەرمانحەمام بەکار دەهات بۆ لێکردنەوەی مووەکان) یان لەبەر شکانی سەری بۆ ناچاری سەری بتاشێت، یان بۆ شوێنی کەڵەشاخ (حیجامە) پشتەسەری بتاشێت، لە کاتێکدا کە موحریمە، جا بەلەیادچوونەوە بێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٢؛ والشيباني: ٤١٥ في الحج، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٣، عن مالك به.

یان بەنەزانی: ئەو کەسەی شتێك لەمانە ئەنجام بدات، ئەوە فیدیەی لەسەر واجبە لە گشت شتێك لەوانە، وە (دەربارەی تاشینی شوێنی حیجامەش) بۆی نییە شوێنی حیجامە بتاشێت (ئەگەر تاشی فیدیەی لەسەر واجب دەبێ).

**١٢٥٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: مَنْ جَهِلَ فَحَلَقَ رَأْسَهُ قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ الْجَمْرَةَ، افْتَدَى.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هەر کەسێك نەیزانی و سەری تاشی بەر لەوەی ڕەجم ئەنجام بدات، ئەوە دەبێ فیدیە بدات.

## ٧٩- ئەو کەسە چی دەکات کە یەکێك لە دروشم و ڕێکارەکان لەیاد دەکات[1]

**١٢٥٧-** عَنْ أَيُّوبَ بْنِ أَبِي تَمِيمَةَ السَّخْتِيَانِيِّ ﵀، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﵀، أَنَّ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئًا، أَوْ تَرَكَهُ، فَلْيُهْرِقْ دَمًا.

قَالَ أَيُّوبُ ﵀: لاَ أَدْرِي قَالَ: تَرَكَ أَوْ نَسِيَ[2].

واتە: لە ئەیوبی کوڕی ئەبو تەمیمەی سەختیانییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ گوتی: هەر کەسێك فەڕیزەیەك لە فەڕیزەکانی حەج لەیاد بکات ـ یان تەرك بکات ـ، ئەوە با خوێنێك بڕێژێت.

ئەیوب ﵀ گوتوویەتی: نازانم گوتی (ئەگەر) تەرکی کرد یان گوتی ئەگەر لەیادی کرد.

**١٢٥٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: مَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ هَدْيًا فَلاَ يَكُونُ إِلاَّ بِمَكَّةَ، وَمَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ نُسُكًا، فَهُوَ يَكُونُ حَيْثُ أَحَبَّ صَاحِبُ النُّسُكِ.

---

(١) ـ مَا يَفْعَلُ مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئًا.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٠١؛ والحدثاني: ٥٩٥ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠٢ في الحج، كلهم عن مالك به.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر خوێنڕشتنەكە هەدی بوو حەتمەن دەبێ لە مەككە ئەنجام بدرێت، وە ئەگەر نوسوك بوو (واتە كەفارەتی لەیادكردنی فەرزیەیەك بوو) ئەوە لە هەر شوێنێك كە خاوەنەكەی پێی خۆش بێت دروستە (واتە مەرج نییە لە مەككە ئەنجام بدرێت، چونكە بە هەدی ناو نەنراوە).

## ٨٠- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی فیدیە[١]

**١٢٥٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنْ أَرَادَ أَنْ يَلْبَسَ شَيْئًا مِنَ الثِّيَابِ الَّتِي لاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَلْبَسَهَا وَهُوَ مُحْرِمٌ، أَوْ يُقَصِّرَ شَعَرَهُ، أَوْ يَمَسَّ طِيبًا مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ، لِيَسَارَةِ مُؤْنَةِ الْفِدْيَةِ عَلَيْهِ، قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَفْعَلَ ذَلِكَ، وَإِنَّمَا أُرْخِصَ فِيهِ لِلضَّرُورَةِ، وَعَلَى مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ الْفِدْيَةُ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی دەیەوێت جلێك بپۆشێت كە بۆی نییە بیپۆشێت لە كاتێكدا لەژێر ئیحرامدایە، یان قژی كورت بكاتەوە یان بۆن لە خۆی بدات بەبێ پێویستی، (كە ئەنجامیان دەدات) لەبەر دەوڵەمەندی و توانای ئەنجامدانی فیدیە بێت، گوتوویەتی: بۆ كەس نییە ئەوە ئەنجام بدات، بەڵكوو تەنها بۆ پێویستی و ناچاری مۆڵەتدراوە، وە ئەو كەسەی (بە پێویستیش) ئەوە ئەنجام بدات فیدیەی لەسەرە.

**١٢٦٠- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الْفِدْيَةِ مِنَ الصِّيَامِ، أَوِ الصَّدَقَةِ، أَوِ النُّسُكِ، أَصَاحِبُهُ بِالْخِيَارِ فِي ذَلِكَ؟ وَمَا النُّسُكُ؟ وَكَمِ الطَّعَامُ؟ وَبِأَيِّ مُدٍّ هُوَ؟ وَكَمِ الصِّيَامُ؟ وَهَلْ يُؤَخِّرُ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ أَمْ يَفْعَلُهُ فِي فَوْرِهِ ذَلِكَ؟ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: كُلُّ شَيْءٍ فِي كِتَابِ اللهِ فِي الْكَفَّارَاتِ، كَذَا أَوْ كَذَا، فَصَاحِبُهُ مُخَيَّرٌ فِي ذَلِكَ، أَيَّ شَيْءٍ أَحَبَّ أَنْ يَفْعَلَ ذَلِكَ فَعَلَ، قَالَ: وَأَمَّا النُّسُكُ فَشَاةٌ، وَأَمَّا الصِّيَامُ فَثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، وَأَمَّا الطَّعَامُ فَيُطْعِمُ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدَّانِ بِالْمُدِّ الأَوَّلِ، مُدِّ النَّبِيِّ ﷺ[٣].

---

(١) ـ جَامِعُ الْفِدْيَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٦، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٧، عن مالك به.




(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی فیدیە پرسیاری لێ کرا: لە ڕۆژوو و صەدەقە و ئاژەڵسەربڕین، کە ئاخۆ خاوەنەکەی سەرپشکە لە هەڵبژاردنی یەکێك لەوانە؟ وە (ئەگەر ئاژەڵی هەڵبژارد) ئاژەڵەکە چییە؟ وە خواردنەکە چەندە؟ وە بە چ مودێکە؟ وە ڕۆژووەکە چەندە؟ وە بۆی هەیە شتێك لەوانە دوا بخات یان دەبێ ڕاستەوخۆ ئەنجامی بدات؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: گشت شتێك لە کەفارەتەکان کە لە پەرتووکی خوا باس کراوە ئەوە بێ یان ئەوەی دیکەیان بێ، خاوەنەکەی سەرپشکە تیایدا، هەر یەکێك لە کەفارەتەکان کە حەز بکات ئەنجامی دەدات، گوتی: هەرچی دەربارەی ئاژەڵسەربڕینە (کە ئاخۆ دەبێ چ ئاژەڵێك بێت) ئەوە بریتییە لە بزن یان مەڕ، وە هەرچی دەربارەی ڕۆژووە، ئەوە سێ ڕۆژە، وە هەرچی دەربارەی خواردنیشە، دەبێ شەش هەژار نان بدات، بۆ هەر هەژارێك دوو مودد بە مودی سەردەمی یەکەم، موددی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**١٢٦١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَسَمِعْتُ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُ: إِذَا رَمَى الْمُحْرِمُ شَيْئًا، فَأَصَابَ شَيْئًا مِنَ الصَّيْدِ لَمْ يُرِدْهُ، فَقَتَلَهُ: إِنَّ عَلَيْهِ أَنْ يَفْدِيَهُ، وَكَذَلِكَ الْحَلاَلُ يَرْمِي فِي الْحَرَمِ شَيْئًا، فَيُصِيبُ صَيْدًا لَمْ يُرِدْهُ، فَيَقْتُلُهُ: إِنَّ عَلَيْهِ أَنْ يَفْدِيَهُ، لأَنَّ الْعَمْدَ وَالْخَطَأَ فِي ذَلِكَ بِمَنْزِلَةٍ سَوَاءٍ[1].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە هەندێك لە زانایان بووە گوتوویانە: ئەگەر کەسی موحریم شتێکی هاویشت (ڕایوەشاند) و بەر نێچیرێك کەوت مەبەستیشی نەبوو و کوشتی، گوتوویەتی: لەسەری واجبە فیدیەی بدات، بەهەمان شێوە کەسێك کە لەژێر ئیحرامیشدا نەبێت و شتێك لە حەرەمی مەککە بهاوێژێت و نێچیرێك بپێکێت کە مەبەستی نەبێت و کوشتی: ئەوە لەسەری واجبە فیدیەی بدات، چونکە ئەنقەست و هەڵە لەو بابەتەدا وەکوو یەکە.

**١٢٦٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الْقَوْمِ يُصِيبُونَ الصَّيْدَ جَمِيعًا وَهُمْ مُحْرِمُونَ، أَوْ فِي الْحَرَمِ، قَالَ: أَرَى أَنَّ عَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ جَزَاءَهُ، إِنْ حُكِمَ عَلَيْهِمْ بِالْهَدْيِ، فَعَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ هَدْيٌ، وَإِنْ حُكِمَ عَلَيْهِمْ بِالصِّيَامِ، كَانَ عَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمُ الصِّيَامُ، وَمِثْلُ ذَلِكَ، الْقَوْمُ يَقْتُلُونَ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٦٨؛ والحدثاني: ٥٩٦ في المناسك، عن مالك به.




الرَّجُلَ خَطأً، فَتَكُونُ كَفَّارَةُ ذَلِكَ عِتْقَ رَقَبَةٍ عَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، أَوْ صِيَامَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ عَلَى كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ»(1).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی خەڵكانێك كە بە هەموویان نێچیرێك ڕاو دەكەن لە كاتێكدا لەژێر ئیحڕامدان، یان (لەژێر ئیحڕامدا نین، بەڵام ڕاوەكە) لە حەڕەم ئەنجام دەدرێت، گوتوویەتی: من پێم وایە تۆڵەی تەواوی نێچیرەكە لەسەر گشت یەكێكیان واجبە، جا ئەگەر بە هەدی بڕیاریان لەسەر درا، ئەوە هەدی لەسەر گشت یەكێكیان واجبە، وە ئەگەر بە ڕۆژوو بڕیاریان لەسەر درا، ئەوە ڕۆژوو لەسەر گشت یەكێكیان واجبە، بەهەمان شێوە كەسانێك پیاوێك بەهەڵە بكوژن، ئەوە كەفارەتەكەی كە ئازادكردنی كۆیلەیە لەسەر گشت كەسێكیانە (هەر یەكەیان دەبێ كۆیلەیەك ئازاد بكەن)، یان بەڕۆژووبونی دوو مانگی بەسەریەكەوە لەسەر گشت یەكێكیان واجبە.

١٢٦٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ رَمَى صَيْدًا أَوْ صَادَهُ بَعْدَ رَمْيِهِ الْجَمْرَةَ، وَحِلاَقِ رَأْسِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يُفِضْ: إِنَّ عَلَيْهِ جَزَاءَ ذَلِكَ الصَّيْدِ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ۚ ﴿٢﴾﴾ المائدة، وَمَنْ لَمْ يُفِضْ، فَقَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ مَسُّ الطِّيبِ وَالنِّسَاءِ(2).

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك شتێك بگرێتە نێچیرێك یان ڕاوی بكات دوای ڕەجمكردن و سەرتاشین، تەنها تەوافی ئیفازەی نەكردبێ، گوتوویەتی: تۆڵەی نێچیرەكەی لەسەرە، چونكە خوای پەروەردگار ﷻ گوتوویەتی: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا ۚ ﴿٢﴾﴾ المائدة، (واتە: كاتێ حەڵاڵ بوونەوە و لەژێر ئیحڕام دەرچوون ڕاو بكەن)، جا كەسێك تەوافی ئیفازەی نەكردبێت ئەوە قەدەغەی بۆنی خۆش و قەدەغەی ئافرەتی هەر لەسەر دەمێنێ (واتە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ئەگەر حەڵاڵ بوونەوە ئینجا ڕاو بكەن، جا كە هێشتا بۆنی خۆشی ئافرەتی لەسەر قەدەغەیە دیارە نەبۆتە ئەو حەڵاڵەی كە ڕاوی بۆ دروست بێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١١٦١؛ وفي: ١٢٧٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧٤، عن مالك به.

**١٢٦٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لَيْسَ عَلَى الْمُحْرِمِ فِيمَا قَطَعَ مِنَ الشَّجَرِ فِي الْحَرَمِ شَيْءٌ، وَلَمْ يَبْلُغْنَا أَنَّ أَحَدًا حَكَمَ عَلَيْهِ فِيهِ بِشَيْءٍ، وَبِئْسَ مَا صَنَعَ[١].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو موحریمەی لە حەرەم دار ببڕێت هیچی لەسەر نییە و پێمان نەگەیشتووە كەسێك بڕیاری تیادا بە كەفارەت و شتێك دابێت، وە (لەگەڵ ئەوەشدا) كارێكی خراپی كردووە.

**١٢٦٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي الَّذِي يَجْهَلُ، أَوْ يَنْسَى صِيَامَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، أَوْ يَمْرَضُ فِيهَا فَلاَ يَصُومُهَا حَتَّى يَقْدَمَ بَلَدَهُ، قَالَ: لِيُهْدِ إِنْ وَجَدَ هَدْيًا، وَإِلاَّ فَلْيَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فِي أَهْلِهِ، وَسَبْعَةً بَعْدَ ذَلِكَ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو كەسەی بەڕۆژووبونی سێ ڕۆژی حەج نەزانێ یان لەیادی بچێتەوە، یان تیایدا نەخۆش بكەوێت و بەڕۆژوو نەبێت تا دەگەڕێتەوە شارەكەی، گوتوویەتی: با هەدییەك (قوربانییەك) ئەنجام بدات ئەگەر پارەی هەدی هەبوو، ئەگەرنا با سێ ڕۆژ لەناو خانەوادەكەی خۆی بەڕۆژوو بێت دواتریش حەوت ڕۆژی دیكە.

## ٨١- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی حەج[٣]

**١٢٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄، أَنَّهُ قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِلنَّاسِ بِمِنًى، وَالنَّاسُ يَسْأَلُونَهُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: انْحَرْ وَلاَ حَرَجَ، ثُمَّ جَاءَهُ آخَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ، فَقَالَ ﷺ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ، قَالَ: فَمَا سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ شَيْءٍ، قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ، إِلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٧٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٩؛ وفي: ١١١٥؛ وفي: ١٢٧٦، عن مالك به.

(٣) ـ جَامِعُ الْحَجِّ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٠؛ والحدثاني: ٦٢٢ في المناسك؛ والشيباني: ٥٠١ في الحج؛ والشافعي: ١٠٦٠؛ وابن حنبل: ٦٨٠٠؛ والبخاري: ٨٣، وفي: ١٧٣٦؛ ومسلم: المناسك: ٣٢٧؛ وأبو داود: ٢٠١٤؛ وابن حبان: ٣٨٧٧؛ والدارمي: ١٩٠٨؛ والقابسي: ٦٦، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی لە مینا وەستا بوو، لە کاتێکدا خەڵك پرسیاریان لێدەکرد، جا پیاوێك هاتە لای و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمزانی سەرم تاشی بەر لەوەی قوربانی سەر ببڕم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قوربانی سەر ببڕە هیچ کێشەی نییە، دواتر کەسێکی دیکە هاتە لای و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمزانی قوربانیم سەر بڕیوە پێش ئەوەی ڕەجم بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕەجم بکە هیچ کێشەی نییە، (عەبدوڵڵا ﷺ) دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری دەربارەی هەر شتێك لێکرا کە پێش خرابوو یان دواخرابوو حەتمەن فەرمووی: بیکە و هیچ کێشەی نییە.

**١٢٦٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاَثَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ[(١)].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە جیهادێك یان حەج یان عومرە دەگەڕایەوە ، سێ جار «الله أكبر»ی دەکرد لەسەر گشت بەرزاییەك، دواتر دەیگوت: ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ))، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە الله، تاکە هیچ هاوبەشی نییە، خاوەنداری و ستاییش هەر هی ئەوە، وە هەر ئەو بەسەر گشت شتێکدا بەتوانایە، ئێمە گەڕاوە و تەوبەکار و پەرستشکار و کڕنوشبەر و ستاییشکارین بۆ پەروەردگارمان، خوا بەڵێنەکەی خۆی بەجێ گەیاند و بەندەکەی خۆی سەرخست و بەتەنها کۆمەڵەکانی هەرەس پێهێنا)).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٠؛ والحدثاني: ٦٢٣ في المناسك؛ والشيباني: ٥١٥ في الحج؛ وابن حنبل: ٥٢٩٥؛ والبخاري: ١٧٩٧، وفي: ٦٣٨٥؛ وأبو داود: ٢٧٧٠؛ وابن حبان: ٢٧٠٧؛ والقابسي: ٢٢٧، كلهم عن مالك به.

**١٢٦٨-** عَنْ كُرَيْبٍ ﷺ، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَرَّ بِامْرَأَةٍ وَهِيَ فِي مِحَفَّتِهَا، فَقِيلَ لَهَا: هَذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَخَذَتْ بِضَبْعَيْ صَبِيٍّ كَانَ مَعَهَا، فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ[(١)].

واتە: لە کوڕەیبی ﷺ خزمەتکاری ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئافرەتێکدا تێ پەڕ بوو، لە کاتێکدا ئافرەتەکە لەناو کەژاوەکەی بوو پێی گوترا: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، جا دەستی منداڵێکی گرت کە لەگەڵی بوو گوتی: ئەوە حەجی بۆ هەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، تۆش پاداشتت بۆ هەیە.

**١٢٦٩-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ كَرِيزٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا رُئِيَ الشَّيْطَانُ يَوْمًا، هُوَ فِيهِ أَصْغَرُ وَلاَ أَدْحَرُ وَلاَ أَحْقَرُ وَلاَ أَغْيَظُ، مِنْهُ فِي يَوْمِ عَرَفَةَ، وَمَا ذَاكَ إِلاَّ لِمَا رَأَى مِنْ تَنَزُّلِ الرَّحْمَةِ، وَتَجَاوُزِ اللهِ عَنِ الذُّنُوبِ الْعِظَامِ، إِلاَّ مَا أُرِيَ يَوْمَ بَدْرٍ، قِيلَ: وَمَا رَأَى يَوْمَ بَدْرٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: أَمَا إِنَّهُ قَدْ رَأَى جِبْرِيلَ يَزَعُ الْمَلاَئِكَةَ[(٢)].

واتە: لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵای کوڕی کەریزەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ ڕۆژێك شەیتان نەبینراوە تیایدا بچووکتر و دوورتر لە ڕەحمەت و ڕیسواتر و بەقینتر بێت لە ڕۆژی عەرەفە، ئەوەش لەبەر هیچ شتێك نییە تەنها لەبەر ئەوەیە دابەزینی فریشتەکان و لێخۆشبوونی خوا بۆ تاوانە گەورەکان دەبینێت، تەنها لە ڕۆژی بەدر بینیوەتی (واتە جارێکی دیکەش شەیتان ئەو حاڵەتەی بەسەر هاتووە لە شەڕی بەدر)، گوترا: لە ڕۆژی بەدر چی بینی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بینی جیبریل فریشتەکانی ڕیز دەکرد (بۆ جەنگ).

**١٢٧٠-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ كَرِيزٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَأَفْضَلُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ[(٣)].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٥٦؛ والشافعي: ٤٨٥؛ وفي: ٦١٧؛ والنسائي: ٢٦٤٩؛ وابن حبان: ٣٧٩٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦١؛ والحدثاني: ٦٢٤ في المناسك، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٦٢١؛ وفي: ١٤٦٢؛ والحدثاني: ٢٠٢أ في الصلاة؛ وفي: ٦٢٤أ في

واتە: لە تەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵای كوڕی كەریزەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاكترین نزا نزای ڕۆژی عەرەفەیە، وە چاكترینی ئەوەی من و پێغەمبەرانی پێشی خۆم گوتومانە بریتییە لە: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ).

**١٢٧١**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ، وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْتُلُوهُ[1].

قَالَ مَالِكٌ: وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَوْمَئِذٍ مُحْرِمًا، وَاللهُ أَعْلَمُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادكردنی مەككە چووە ناو مەككە لە كاتێكدا زرێپۆشی لەسەر بوو، جا كاتێ دایكەند پیاوێك هاتە لای و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیبنو خەتەل خۆی بە پەردەی كەعبەوە هەڵواسیوە (تا لێی خۆش بن و نەیكوژن)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بیكوژن (چونكە بەفێڵ مسوڵمان ببوو و لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و بەندەیەكی مسوڵمانی كوشت و دوو كۆیلەشی كڕیبوو تەنها جوێندانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەی گۆرانی بۆ دەگوت).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەژێر ئیحرامدا نەبوو (بۆیە فەرمانی كوشتنی دەركرد) خوداش زاناترە.

---

المناسك، عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٧؛ والحدثاني: ٦٢١ في المناسك؛ والشيباني: ٥٢٣ في الحج؛ وابن حنبل: ١٢٠٨٧، وفي: ١٢٠٨٨، وفي: ١٢٧٠٤، وفي: ١٢٨٧٥، وفي: ١٢٩٥٥، وفي: ١٣٣٦٩، وفي: ١٣٤٦١، وفي: ١٣٥٤٢؛ والبخاري: ١٨٤٦، وفي: ٣٠٤٤، وفي: ٤٢٨٦، وفي: ٥٨٠٨؛ ومسلم: المناسك: ٤٥٠؛ والنسائي: ٢٨٦٧، وفي: ٢٨٦٨؛ وأبو داود: ٢٦٨٥؛ والترمذي: ١٦٩٣؛ وابن ماجه: ٢٨٣٢؛ وابن حبان: ٣٧١٩، وفي: ٣٧٢١، وفي: ٣٨٠٦؛ والدارمي: ١٩٣٨، وفي: ٢٤٥٦؛ وأبي يعلى الموصلي: ٣٥٣٩، وفي: ٣٥٤١؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٦٩٠٣، كلهم عن مالك به.

**١٢٧٢-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِقُدَيْدٍ، جَاءَهُ خَبَرٌ مِنَ الْمَدِينَةِ، فَرَجَعَ، فَدَخَلَ مَكَّةَ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ(١).

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لە مەککەوە هات و ڕووی کردە مەدینە، تاوەکوو گەیشتە قودەید و هەواڵێکی لە مەدینەوە بۆ هات، جا گەڕایەوە و بەبێ ئیحرام چووە ناو مەککە.

**١٢٧٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، بِمِثْلِ ذَلِكَ(٢).

واتە: بەهەمان شێوە لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە.

**١٢٧٤-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عِمْرَانَ الأَنْصَارِيِّ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: عَدَلَ إِلَيَّ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَأَنَا نَازِلٌ تَحْتَ سَرْحَةٍ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَقَالَ: مَا أَنْزَلَكَ تَحْتَ هَذِهِ السَّرْحَةِ؟ فَقُلْتُ: أَرَدْتُ ظِلَّهَا، فَقَالَ: هَلْ غَيْرُ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: لاَ، مَا أَنْزَلَنِي إِلاَّ ذَلِكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا كُنْتَ بَيْنَ الأَخْشَبَيْنِ مِنْ مِنًى، وَنَفَخَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، فَإِنَّ هُنَاكَ وَادِيًا، يُقَالُ لَهُ: السُّرَرُ، بِهِ سَرْحَةٌ، سُرَّ تَحْتَهَا سَبْعُونَ نَبِيًّا(٣).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عیمڕانی ئەنصارییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ لایدا بۆ لای من، لە کاتێکدا من لەژێر درەختێکی گەورە لامدابوو لەسەر ڕێگەی مەککە، جا گوتی: چ شتێك بووە پاڵنەر کە لەژێر ئەم درەختە بگیرسێیەوە؟ منیش گوتم: بۆ سێبەرەکەیمە، ئەویش گوتی: شتێکی دیکەی جگە لەوە هەیە؟ منیش گوتم: نەخێر، هیچ شتێك داینەبەزاندووم جگە لەوە، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: کاتێ کەوتیتە نێوان دوو چیاکان لە مینا، بەدەستیشی

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٤٨؛ والحدثاني: ٦٢١أ في المناسك؛ والشيباني: ٤٦٠ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥١؛ والحدثاني: ٦٢٧ في المناسك؛ وابن حنبل: ٦٢٣٣؛ والنسائي: ٢٩٩٥؛ وابن حبان: ٦٢٤٤؛ والقابسي: ١٠٢، كلهم عن مالك به.

ئاماژەی بۆ لای خۆرهەڵات کرد و فەرمووی: لەوێ دۆڵێك هەیە پێی دەگوترێ: سورەڕ، دارێکی گەورەی لێیە، لەژێر ئەو دارە حەفتا پێغەمبەر لە دایك بوون و ناوکیان بڕاوە (یانیش بە واتای ئەوە دێت حەفتا پێغەمبەر لەژێر ئەو درەختە مووژدەی خۆشیان پێدراوە).

**١٢٧٥-** عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ مَرَّ بِامْرَأَةٍ مَجْذُومَةٍ وَهِيَ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقَالَ لَهَا: يَا أَمَةَ اللهِ، لاَ تُؤْذِي النَّاسَ، لَوْ جَلَسْتِ فِي بَيْتِكِ، فَجَلَسَتْ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهَا: إِنَّ الَّذِي كَانَ نَهَاكِ قَدْ مَاتَ، فَاخْرُجِي، فَقَالَتْ: مَا كُنْتُ لأُطِيعَهُ حَيًّا وَأَعْصِيَهُ مَيِّتًا[١].

واتە: لە ئیبنو ئەبو مولەیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بەلای ئافرەتێکی گوڕی (گەڕ)دا ڕەت بوو لە کاتێکدا تەوافی بەدەوری بەیتدا دەکرد، ئیمامی عومەریش ﵁ پێی گوت: ئەی بەندەی خوا خەڵکی ئەزیەت مەدە (بە بۆنی جەستەت)، ئەگەر لەماڵی خۆت دابنیشی چاکترە، جا ئافرەتەکە لە ماڵەوە دانیشت، جا (دوای وەفاتکردنی ئیمامی عومەر ﵁) پیاوێك بەلای ئافرەتەکەدا ڕەت بوو و پێی گوت: ئەو کەسەی نەهی لێ کردی تەواف بکەی مرد، کەواتە ئێستا بڕۆ دەرەوە لە ماڵەکەت، ئافرەتەکەش گوتی: ناچم شتی وا بکەم بەزیندوویی گوێڕایەڵی بکەم و بەمردوویی سەرپێچی بکەم.

**١٢٧٦-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ كَانَ يَقُولُ: مَا بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ الْمُلْتَزَمُ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ هەموو جار دەیگوت: مولتەزەم (ئەو شوێنەی دوعای تیادا گیرایە) لە نێوان ڕوکن و دەرگای کەعبەیە.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٢؛ والحدثاني: ٦٢٥ في المناسك؛ والشيباني: ٤٧٧ في الحج، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه الحدثاني: ٦٢٥أ في المناسك، عن مالك به.

١٢٧٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَذْكُرُ، أَنَّ رَجُلاً مَرَّ عَلَى أَبِي ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ، وَأَنَّ أَبَا ذَرٍّ ﷺ سَأَلَهُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ فَقَالَ: أَرَدْتُ الْحَجَّ، فَقَالَ: هَلْ نَزَعَكَ غَيْرُهُ؟ فَقَالَ: لاَ، قَالَ: فَأْتَنِفِ الْعَمَلَ، قَالَ الرَّجُلُ: فَخَرَجْتُ حَتَّى قَدِمْتُ مَكَّةَ، فَمَكَثْتُ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ إِذَا أَنَا بِالنَّاسِ مُنْقَصِفِينَ عَلَى رَجُلٍ، فَضَاغَطْتُ عَلَيْهِ النَّاسَ، فَإِذَا الشَّيْخُ الَّذِي وَجَدْتُهُ بِالرَّبَذَةِ، يَعْنِي أَبَا ذَرٍّ، قَالَ: فَلَمَّا رَآنِي عَرَفَنِي، فَقَالَ: هُوَ الَّذِي حَدَّثْتُكَ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببانی ﷺ گێڕاوەتەوە کە گوێی لەو بووە باسی دەکرد دەیگوت: پیاوێك بەلای ئەبو زەڕ ﷺ تێپەڕ بوو و ئەبو زەڕیش ﷺ پرسیاری لێکرد: کوێت مەبەستە؟ ئەویش گوتی: دەمەوێ بچم بۆ حەج، ئەبو زەڕیش ﷺ گوتی: ئایا هیچ شتێکی دیکە دەریپەڕاندووی؟ ئەویش گوتی: نەخێر، ئەبو زەڕ ﷺ گوتی: ڕوو بکەرە کارەکەت بۆ هەڵوەڕاندنی تاوانەکان، پیاوەکە دەڵێ: جا دەرچووم تا چووم بۆ مەککە و ئەوەندەی خوا ﷻ مۆڵەتی لەسەر بوو مامەوە، دواتر لەناکاو گەیشتم بە خەڵکانێك پێشبڕکێ و پاڵەپەستۆیان دەکرد بۆ لای پیاوێك، منیش پاڵمنا بە خەڵکەکەوە (وەك ئەوانم کرد تا پێی بگەم بزانم چ باسە)، جا بینیم ئەو شێخە بوو کە لە ڕەبزە بینیم، واتە ئەبو زەڕ بوو، دەڵێ: جا کە منی بینی ناسیمیەوە و گوتی: ئەوەیە کە پێم گوتی.

١٢٧٨- عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنِ الاِسْتِثْنَاءِ فِي الْحَجِّ، فَقَالَ: أَوَيَصْنَعُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟ وَأَنْكَرَ ذَلِكَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی مەرجدانان لە حەج (بەوەی کەسەکە بڵێ: خوایە ئیحرامم بەست بە حەج، بەڵام لە هەر شوێنێك بەربەستم هاتە پێش لەژێر ئیحرام بێمە دەرەوە)، ئەویش گوتی: بۆ مەگەر کەس هەیە وا بکات؟! ئینکاری ئەوەی کرد[3].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٤؛ والحدثاني: ٦٢٦ في المناسك، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی شافیعی مەرجدانانی پێ دروستە، لەبەر مەرمودەیەك كە بوخاری و موسلیم

١٢٧٩- [فتوى] سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ: هَلْ يَحْتَشُّ الرَّجُلُ لِدَابَّتِهِ مِنَ الْحَرَمِ؟ فَقَالَ: لاَ.

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا: ئایا پیاو گژوگیا بۆ وڵاخەکەی دەدوورێتەوە لە حەرەم (بۆی دروستە)؟ ئەویش گوتی: نەخێر.

## ٨٢- حەجی ئافرەت بەبێ مەحرەم[١]

١٢٨٠- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الصَّرُورَةِ مِنَ النِّسَاءِ الَّتِي لَمْ تَحُجَّ قَطُّ: إِنَّهَا، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا ذُو مَحْرَمٍ يَخْرُجُ مَعَهَا، أَوْ كَانَ لَهَا، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَخْرُجَ مَعَهَا: أَنَّهَا لاَ تَتْرُكُ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَيْهَا فِي الْحَجِّ، وَلْتَخْرُجْ فِي جَمَاعَةٍ مِنَ النِّسَاءِ[٢].

(فەتوا) واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی هەرگیز حەجی نەکردووە، گوتوویەتی: ئەو ئافرەتە ئەگەر مەحرەمێکی نەبوو لەگەڵی دەربچێ، یان مەحرەمی هەبوو و نەیدەتوانی لەگەڵی دەربچێ، ئەوە نابێ فەریزەی خوا واز لێ بێنێ کە حەجە، دەبێت لەگەڵ کۆمەڵێکی ئافرەتان دەربچێ بۆ حەج.

## ٨٣- ڕۆژووی حەجی تەمەتوع[٣]

١٢٨١- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: الصِّيَامُ لِمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، لِمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا، مَا بَيْنَ أَنْ يُهِلَّ بِالْحَجِّ، إِلَى يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِنْ لَمْ يَصُمْ، صَامَ أَيَّامَ مِنًى[٤].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ڕۆژوو بۆ ئەو کەسەیە کە لە دوای عومرە (لە هەمان ساڵدا) ئیحرام بە حەج دەبەستێت،

---

گێڕاویانەتەوە.

(١) ـ حَجُّ الْمَرْأَةِ بِغَيْرِ ذِي مَحْرَمٍ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٥٨، عن مالك به.

(٣) ـ صِيَامُ التَّمَتُّعِ.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٤٧؛ وفي: ١١١٣؛ والحدثاني: ١٤٧٧أ في الصيام؛ وفي: ٥٥٩ في المناسك؛ والشيباني: ٤٥٢ في الحج، كلهم عن مالك به.

پارەی هەدیشی نەبێت لە بەینی ئەو کاتەی ئیحرام بە حەج دەبەستێت تا ڕۆژی عەرەفە، جا ئەگەر (بۆ کەفارەتەکە پێشی مینا) بەڕۆژوو نەبوو، ئەوە لە ڕۆژەکانی مینا بەڕۆژوو دەبێت.

**١٢٨٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي ذَلِكَ مِثْلَ قَوْلِ عَائِشَةَ، ﵂ [١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ هەمان وتەی عائیشەی ﵂ لێ گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ـ موقوف صحيح.



# پەرتووکی جیهـاد و تێکۆشان لە پێناو خودا ﷻ(١)



(١) ـ كِتَابُ الْجِهَادِ.

## ١- هاندان لەسەر جیهاد[1]

١٢٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الدَّائِمِ، الَّذِي لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ، حَتَّى يَرْجِعَ[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی موجاهید و تێکۆشەر لە پێناوی خوا (پاداشتی) وەك ڕۆژووەوانی شەونوێژکاری بەردەوام وایە، کە هیچ بێتاقەت نەبێت لە نوێژو ڕۆژوو، تا لە جیهادەکەی دەگەڕێتەوە.

١٢٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: تَكَفَّلَ اللهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ، لاَ يُخْرِجُهُ مِنْ بَيْتِهِ إِلاَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ، وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ، أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ[3].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ کەفالەتی ئەو کەسەی کردووە کە جیهاد دەکات و تێدەکۆشێت لە پێناوی خوا ﷻ کە هیچ شتێك نەیبردبێتە دەرەوە لە ماڵەوەی تەنها تێکۆشان لە پێناوی خوا و بەڕاستدانانی وتە و فەرمانەکانی خوا نەبێت، (کەفالەتی ئەو کەسەی کردووە) بەوەی بیخاتە بەهەشتەوە (ئەگەر شەهید کرا)، یانیش بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی کە لێوەی دەرچووە لەگەڵ ئەو پاداشت و دەستکەوتەی بەدەستی هێناوە.

١٢٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْخَيْلُ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ، فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأَطَالَ لَهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ،

---

(١) ـ التَّرْغِيبُ فِي الْجِهَادِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٥؛ والشيباني: ٣٠٠ في الصلاة؛ وابن حنبل: ١٠٠٠١؛ وابن حبان: ٤٦٢١؛ والقابسي: ٣٤٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٦؛ والبخاري: ٣١٢٣، وفي: ٧٤٥٧، وفي: ٧٤٦٣؛ والنسائي: ٣١٢٢؛ وابن حبان: ٤٦١٠؛ والقابسي: ٣٤٦، كلهم عن مالك به.

فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ، كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٌ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا ذَلِكَ، فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ، فَشَرِبَتْ مِنْهُ، وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَ بِهِ، كَانَ ذَلِكَ لَهُ حَسَنَاتٍ، فَهِيَ لَهُ أَجْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَتَعَفُّفًا، وَلَمْ يَنْسَ حَقَّ اللهِ فِي رِقَابِهَا وَلاَ فِي ظُهُورِهَا، فَهِيَ لِذَلِكَ سِتْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَنِوَاءً لأَهْلِ الإِسْلاَمِ، فَهِيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ، وَسُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْحُمُرِ؟ فَقَالَ: لَمْ يُنْزَلْ عَلَيَّ فِيهَا شَيْءٌ إِلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ:﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾الزلزلة[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ بۆ کەسی وا هەیە پاداشتە، بۆ کەسی واش هەیە داپۆشەرە (کار و کەسابەتی پێدەکات و بژێوی پێ دابین دەکات و هەژارییەکەی دەشارێتەوە و دایدەپۆشێ)، بۆ کەسی واش هەیە تاوانە، جا هەرچی ئەو کەسەیە کە ئەسپەکەی بۆی پاداشتە بریتییە لە کەسێك ڕایگرتووە و ئامادەی کردووە لە پێناوی خوا (واتە ڕایگرتووە بۆ کاتی جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوا)، جا پەتەکەی بۆ درێژ دەکات لە لەوەڕگا و مێرگ، جا بە پەتەکەیەوە لە لەوەڕگا و مێرگەکە هەر شتێك بکات (وەك خواردن و خواردنەوە و هەنگاونان)، بۆی دەبن بە پاداشت و چاکە، وە ئەگەر ئەم پەتەی بپچڕێنێ و ڕابکات بۆ یەك دوو بەرزایی، ئەوە شوێنەوار و پیسایییەکەشی چاکەن بۆی، وە ئەگەر بە ڕووبارێکدا تێبپەڕێت و لێی بخواتەوە، لە کاتێکدا خاوەنەکەی مەبەستیشی نەبوو ئاوی پێ بدات، ئەوەشی هەر بۆ دەبێت بە چاکە، جا ئەوە ئەو ئەسپە بوو کە بۆ خاوەنەکەی پاداشتە، وە کەسێکیش هەیە بەستوویەتەوە بۆ بێنیازبوون و خۆپاکگرتن (لە داواکردنی بژێوی لە خەڵکی و بژێویی خۆی بە ئەسپەکە دابین دەکات)، نە حەقی خوای پەروەردگاری لەیاد کردووە بەرانبەر ئاژەڵەکە (بەوەی نەرمونیان و چاك بێت لەگەڵی و مافەکانی پێ بدات)، نە حەقی پشتی ئاژەڵەکەشی لەیاد کردووە (بەوەی ڕێگە بدات لەگەڵ نێرەکەی یان مێیەکەی جووت بێت و لە پێناوی خوا بیدات بە خەڵك لەو کاتانەی

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠١؛ والبخاري: ٢٣٧١، وفي: ٢٨٦٠، وفي: ٣٦٤٦، وفي: ٤٩٦٢، وفي: ٤٩٦٣، وفي: ٧٣٥٦؛ والنسائي: ٣٥٦٣؛ وابن حبان: ٤٦٧٢؛ والقابسي: ١٧٨، كلهم عن مالك به.

کاریان پێیەتی و شتی قورستر لە توانای خۆی لێ بار نەکات)، جا ئەو ئەسپە بۆ ئەو کەسە داپۆشەرە (نایەڵێ پێویستی بە خەڵك بێت)، کەسی واش هەیە ئەسپی ڕاگرتووە بۆ خۆبەگەورەگرتن و ڕیابازی و ململانێکردن لەگەڵ ئەهلی ئیسلام و مسوڵمانان، جا ئەو ئەسپە تاوانە بۆ ئەو کەسە (بەردەوام تاوانی بۆ دەنووسرێت)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی گوێدرێژ (کە ئاخۆ هەمان حوکمی ئەسپی هەیە)؟ ئەویش فەرمووی: هیچ شتێکم بەسەر دانەبەزیوە جگە لەو ئایەتە کۆکەرەوە و پڕمانا و تاکە (کە دەفەرمووێت): ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾الزلزلة، واتە: جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجامدابێ دەیبینێتەوە * ئەوەش کە بە قەد سەنگی گەردیلەیەك خراپەی ئەنجامدابێ دەیبینێتەوە)، (کەواتە هەر شتێك بەمەبەستی چاك ئەنجامبدرێ بەرهەمەکەی پاداشتە، هەر شتێکیش بۆ مەبەستی خراپ بەکار بێت بەرهەمەکەی تاوانە، جا ئەسپ یان گوێدرێژ یان هەر شتێکی دیکە بێ)، والله أعلم.

١٢٨٦- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ مَنْزِلاً؟ رَجُلٌ آخِذٌ بِعِنَانِ فَرَسِهِ، يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ مَنْزِلاً بَعْدَهُ؟ رَجُلٌ مُعْتَزِلٌ فِي غُنَيْمَةٍ، يُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَعْبُدُ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا[1].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان پێنەدەم بە چاکترینی خەڵکی لە ڕووی پلەوپایەوە؟ (ئەو کەسە چاکترینە) پیاوێکە هەوساری ئەسپەکەی گرتووە جیهاد دەکات و تێدەکۆشێ لە پێناوی خوا، ئایا هەواڵتان پێنەدەم بە چاکترینی خەڵکی لە ڕووی پلەوپایەوە دوای ئەو کەسە؟ پیاوێکە دوورکەوتۆتەوە و بەتەنها لەناو هەندێك مەڕوماڵاتە، نوێژ دەکات و زەکات دەدات و خوای پەروەردگار دەپەرستێ و شیرك و هاوەڵی بۆ بڕیار نادات.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٧، عن مالك به.

١٢٨٧- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَادَةُ بْنُ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵀، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْيُسْرِ وَالْعُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُولَ أَوْ نَقُومَ بِالْحَقِّ حَيْثُمَا كُنَّا، لاَ نَخَافُ فِي اللهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامیت ﵀ هەواڵی پێدام، ئەویش لە باوك و باپیرەیەوە دەیگێڕایەوە بەوەی گوتوویەتی: پەیمانمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەری لە خۆشی و ناخۆشی و چاپوکی و تەمەڵیدا (واتە لە گشت حاڵێکدا)، وە لەسەر ئەوەی بەربەرەکانێ لەسەر دەسەڵات نەکەین لەگەڵ کەسانێك کە شایستەی دەسەڵاتن، وە لەسەر ئەوەی حەق بڵێین و بەحەق هەڵبستین لە هەر کوێ بین، لە پێناوی خوا ﷻ لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسین.

١٢٨٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵀، قَالَ: كَتَبَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ ﵁ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، يَذْكُرُ لَهُ جُمُوعًا مِنَ الرُّومِ وَمَا يَتَخَوَّفُ مِنْهُمْ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ مَهْمَا يَنْزِلْ بِعَبْدٍ مُؤْمِنٍ مِنْ مُنْزَلِ شِدَّةٍ، يَجْعَلِ اللهُ بَعْدَهُ فَرَجًا، وَإِنَّهُ لَنْ يَغْلِبَ عُسْرٌ يُسْرَيْنِ، وَأَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾آل عمران[2].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﵁ بۆ عومەری کوڕی خەتتابی ﵁ نووسی و باسی ژمارەی زۆری ڕۆمەکانی کرد، وە باسی ئەوەشی کرد کە ترسیان لێی هەبوو، عومەری کوڕی خەتتابیش ﵁ بۆی نووسی: دوای ناوی خوا و ستاییشی پەروەردگار، بەدڵنیایی هەر کاتێك ناخۆشی و توندییەك بۆ بەندەی بڕوادار دابەزێت و تووشی ببێت، خوای پەروەردگار خۆشی دەنێرێ و دەرگە و دەرچە دەکاتەوە، وە هەرگیز یەك عوسر و

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٦؛ والبخاري: ٧١٩٩؛ والنسائي: ٤١٥١؛ وابن حبان: ٤٥٤٧؛ والقابسي: ٥٠٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٤، عن مالك به.

ناخۆشی بەسەر دوو خۆشی و یوسردا زاڵ نابن (مەبەستی سورەتی «الشرح»ـە کە وشەی «العسر»ی دووم کەوتۆتە نێوان دوو «الیسر» و بەڵێنی خۆشی و ئاسانی دراوە دوای ناخۆشی «فإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا - إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا»)، وە خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾آل عمران، (واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆڕاگر بن و خۆڕاگری و ئارامگری بەسەر خۆتاندا بێنن، نەبەزن لە خۆگری و مانەوەتان لە سەنگەردا، هەوڵ بدەن هەمیشە لە سەنگەری خەبات و کۆششدا بن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بۆ ئەوەی سەرفرازی هەمیشەیی بەدەستبێنن).

## ٢- نەهیکردن لەوەی بە قورئانەوە سەفەر بکرێت بۆ خاکی دوژمن[1]

**١٢٨٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ.**

**قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِنَّمَا ذَلِكَ مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ[2].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی بە قورئانەوە سەفەر بکرێت بۆ خاکی دوژمن.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەبەر ترسی ئەوەیە (نەوەك قورئانەکە) بکەوێتە دەستی دوژمن و بێڕێزی بەرانبەر بکەن.

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنْ أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَىٰ أَرْضِ الْعَدُوِّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦١؛ وابن حنبل: ٤٥٢٥، وفي: ٥٢٩٣؛ والبخاري: ٢٩٩٠؛ ومسلم: الإمارة: ٩٢؛ وأبو داود: ٢٦١٠؛ وابن ماجه: ٢٩٠٩؛ وابن حبان: ٤٧١٥؛ والمنتقى لابن الجارود: ١٠٦٣؛ والقابسي: ٢١٢، كلهم عن مالك به.

## ٣- نەهیکردن لە کوشتنی ئافرەت و منداڵ لە جەنگدا[١]

**١٢٩٠-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، عَنِ ابْنٍ لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ الَّذِينَ قَتَلُوا ابْنَ أَبِي الْحُقَيْقِ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ، قَالَ: فَكَانَ رَجُلٌ مِنْهُمْ يَقُولُ: بَرَّحَتْ بِنَا امْرَأَةُ ابْنِ أَبِي الْحُقَيْقِ بِالصِّيَاحِ، فَأَرْفَعُ السَّيْفَ عَلَيْهَا، ثُمَّ أَذْكُرُ نَهْيَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَكُفُّ، وَلَوْلاَ ذَلِكَ اسْتَرَحْنَا مِنْهَا[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە کوڕێکی کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، (ئیمامی مالیك ﷺ) دەڵێ: پێم وا بوو (ئیبنو شیهاب ﷺ) گوتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعب ﷺ، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لەو کەسانە کرد کە ڕەوانەی کردن بۆ ئەوەی «ئیبنو ئەبو حوقەیق» بکوژن لەوەی نەکەن ژن و منداڵ بکوژن، دەڵێ: جا پیاوێك لەوان (لەو پێنج کەسەی ڕەوانە کرابوون بیکوژن) دەڵێ: ژنەکەی ئیبنو ئەبو حوقەیق بەقیژە لێمان پەیدا بوو، جا شمشێرەکەم لێ بەرز کردەوە (تا لێی بدەم)، دواتر نەهییەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ بیرکەوتەوە و دەستم گرتەوە (نەمکوشت)، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە ئەوە لەدەستی ئەرخەیان دەبووین (دیارە زۆر دەنگەدەنگی پەیدا کردووە، ئەوانیش نەیانتوانیوە هیچی لەگەڵ بکەن لەبەر نەهییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ).

**١٢٩١-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ امْرَأَةً مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ، وَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ[٣].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێك لە جەنگ و غەزایەکاندا ئافرەتێکی کوژراوی بینی، جا سەرکۆنەی ئەو بابەتەی کرد و نەهی کرد لە کوشتنی ئافرەت و منداڵ.

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ فِي الْغَزْوِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٩؛ وشرح معاني الآثار: ٥١٦١، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٠؛ والشيباني: ٨٦٨ في العتاق؛ وابن حنبل: ٤٧٤٦، وفي: ٥٤٥٩؛ وابن ماجه: ٢٨٦٨؛ وابن حبان: ١٣٥، وفي: ٤٧٨٥، كلهم عن مالك به.

**١٢٩٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ بَعَثَ جُيُوشًا إِلَى الشَّامِ، فَخَرَجَ يَمْشِي مَعَ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَ أَمِيرَ رُبْعٍ مِنْ تِلْكَ الأَرْبَاعِ، فَزَعَمُوا أَنَّ يَزِيدَ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ ﷺ: إِمَّا أَنْ تَرْكَبَ، وَإِمَّا أَنْ أَنْزِلَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: مَا أَنْتَ بِنَازِلٍ، وَمَا أَنَا بِرَاكِبٍ، إِنِّي أَحْتَسِبُ خُطَايَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: إِنَّكَ سَتَجِدُ قَوْمًا زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لِلَّهِ، فَذَرْهُمْ وَمَا زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لَهُ، وَسَتَجِدُ قَوْمًا فَحَصُوا عَنْ أَوْسَاطِ رُؤُوسِهِمْ مِنَ الشَّعَرِ، فَاضْرِبْ مَا فَحَصُوا عَنْهُ بِالسَّيْفِ، وَإِنِّي مُوصِيكَ بِعَشْرٍ: لاَ تَقْتُلَنَّ امْرَأَةً، وَلاَ صَبِيًّا، وَلاَ كَبِيرًا هَرِمًا، وَلاَ تَقْطَعَنَّ شَجَرًا مُثْمِرًا، وَلاَ تُخَرِّبَنَّ عَامِرًا، وَلاَ تَعْقِرَنَّ شَاةً، وَلاَ بَعِيرًا، إِلاَّ لِمَأْكَلَةٍ، وَلاَ تَحْرِقَنَّ نَحْلاً، وَلاَ تُفَرِّقَنَّهُ، وَلاَ تَغْلُلْ، وَلاَ تَجْبُنْ(١).

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بەكری صدیق ﷺ چەند سوپایەكی نارد بۆ شام (كە ژمارەیان چوار سوپا بوو)، جا لەگەڵ یەزیدی كوڕی ئەبو سوفیان دەرچوو و بەپێ دەڕۆیشت (واتە یەزید لەسەر ئەسپ بوو و ئیمامی ئەبو بەكریش بەپێ دەڕۆیشت)، لە كاتێكدا یەزید ئەمیر و گەورەی سوپایەك لەو چوار سوپایە بوو، جا دەڵێن: یەزید بە ئەبو بەكری گوت: یان تۆش سوار بە، یان من دێمە خوارەوە، ئەبو بەكریش ﷺ گوتی: نە تۆ دادەبەزی نە منیش سوار دەبم، من ئومێدم وایە ئەم هەنگاوانەم لە پێناوی خوا بە پاداشت ئەژمار بكرێت، دواتر پێی گوت: تۆ دەگەیت بە خەڵكانێك پێیان وایە خۆیان تەرخان كردووە بۆ خوا (وەك ڕاهیب و كەسە دوورەپەرێزەكان كە شەڕ ناكەن)، جا خۆیان و ئەو قسەی كە دەڵێن: خۆمان تەرخان كردووە بۆ خوا، پشت گوێ بخە (وازیان لێ بێنە مەیانكوژە)، دەگەی بە خەڵكانێك قژی ناوەڕاستی سەریان دەتاشن، (كە بریتین لە سەركردەكانی گاورەكان) جا بە شمشێر لەو سەرەیان بدە كە تاشیویانە (واتە بیانكوژە)، وە من ئامۆژگاریت دەكەم بە دە شت: ئافرەت مەكوژە و منداڵ مەكوژە، پیری بێتوانا مەكوژە، درەختی بەبەر مەبڕە، شوێن و خانوو و شتێكی ئاوەدان و بەكەڵك خاپوور مەكە، هیچ مەڕوماڵات و وشترێك سەر مەبڕە تەنها بۆ خواردن نەبێ، هەنگ مەسوتێنە و پەرشوبڵاویان مەكە (بەمەبەستی ئەوەی

---

(١) ـ موقوف ضعیف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٨، عن مالك به.

هەنگەکان بچنە خاکی مسوڵمانانەوە)، دزی و خیانەت لە دەستکەوتی جەنگی مەکە، ترسنۆك مەبە.

١٢٩٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَتَبَ إِلَى عَامِلٍ مِنْ عُمَّالِهِ أَنَّهُ بَلَغَنَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً يَقُولُ لَهُمْ: اغْزُوا بِاسْمِ اللهِ، فِي سَبِيلِ اللهِ، تُقَاتِلُونَ مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، لاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تُمَثِّلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَقُلْ ذَلِكَ لِجُيُوشِكَ وَسَرَايَاكَ إِنْ شَاءَ اللهُ، وَالسَّلاَمُ عَلَيْكَ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بۆ یەکێك لە کاربەدەستانی خۆی نووسی: پێمان گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار کاتێ کۆمەڵە جەنگاوەرێکی بۆ جەنگ دەنارد پێی دەفەرموون: بە ناوی خوا و لە پێناوی خوا بجەنگن، ئێوە لەگەڵ ئەو کەسانە دەجەنگن کە کوفریان بە خوا کردووە، وە لە دەستکەوت مەبەن (بەر لە دابەشکردن)، غەدر لە پەیمان مەکەن، دوژمن هەتك مەکەن (ئەندامەکانی جەستەیان مەبڕن دوای مردن)، منداڵ مەکوژن، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ دوای ئەوە بۆی نووسیبوو): ئەوە بە سوپا و کەتیبەکانت بڵێ، والسلام علیك.

## ٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەجێگەیاندنی بەڵێنی ئەمان[2]

١٢٩٤- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَتَبَ إِلَى عَامِلِ جَيْشٍ، كَانَ بَعَثَهُ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ رِجَالاً مِنْكُمْ يَطْلُبُونَ الْعِلْجَ، حَتَّى إِذَا أَسْنَدَ فِي الْجَبَلِ وَامْتَنَعَ، قَالَ رَجُلٌ: مَطْرَسْ (يَقُولُ: لاَ تَخَفْ) فَإِذَا أَدْرَكَهُ قَتَلَهُ، وَإِنِّي، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ أَعْلَمُ مَكَانَ وَاحِدٍ فَعَلَ ذَلِكَ، إِلاَّ ضَرَبْتُ عُنُقَهُ.

قَالَ يَحْيَى ﷺ: سَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: لَيْسَ هَذَا الْحَدِيثُ بِالْمُجْتَمَعِ عَلَيْهِ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ الْعَمَلُ[3].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف والمرفوع صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٧، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْوَفَاءِ بِالأَمَانِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢١، عن مالك به.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بۆ کاربەدەستی سوپایەکی ـ کە ڕەوانەی کردبوو ـ نووسی: (زانیومە) چەند پیاوێك لە ئێوە بەدوای پیاوێکی مەزنی فارس کەوتوون، تاوەکوو خۆی داوەتە پاڵ چیایێك و خۆی نەداوەتە دەست، پیاوێك (لە ئێوە) گوتوویەتی: مەترسە (واتە مەترسە لە ئەماندای ناتکوژین)، جا کاتێ گەیشتووە پێی کوشتوویەتی، جا سوێند بە خوا بزانم هەر کەسێك ئاوا بکات حەتمەن لە گەردەنی دەدەم.

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: ئەم فەرموودەیە (کۆتاییەکەی کە دەڵێ: سوێند بە خوا بزانم هەر کەسێك ئاوا بکات حەتمەن لە گەردەنی دەدەم) کۆدەنگی لەسەر نییە، وە کاری پێ ناکرێ.

١٢٩٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الإِشَارَةِ بِالأَمَانِ، أَهِيَ بِمَنْزِلَةِ الْكَلَامِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ يُتَقَدَّمَ فِي ذَلِكَ إِلَى الْجُيُوشِ: أَنْ لاَ تَقْتُلُوا أَحَدًا أَشَارُوا إِلَيْهِ بِالأَمَانِ، لأَنَّ الإِشَارَةَ عِنْدِي بِمَنْزِلَةِ الْكَلَامِ، وَلإِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَا خَتَرَ قَوْمٌ بِالْعَهْدِ، إِلاَّ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمُ الْعَدُوَّ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی وەرگرتنی ئەمان بەشێوەی ئاماژە، ئایا وەك قسە وایە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، من پێم باشە ئەو (ڕوونکردنەوەیە) بدرێت بە سوپاکان بەوەی: کەس نەکوژن کە ئاماژەی ئەمانی بۆ بکەن، چونکە ئاماژە لای من وەك قسە وایە، وە لەبەر ئەوەی پێم گەیشتووە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: هیچ قەومێك نییە غەدر لە پەیمان بکات حەتمەن خوای پەروەردگار دوژمنیان بەسەردا زاڵ دەکات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٢، عن مالك به.

## ٥- كردار دەربارەی ئەو كەسەی شتێكی (بۆ جیهاد) لە پێناوی خوا دەبەخشێت[١]

١٢٩٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ كَانَ إِذَا أَعْطَى شَيْئًا فِي سَبِيلِ اللهِ، يَقُولُ لِصَاحِبِهِ: إِذَا بَلَغْتَ وَادِيَ الْقُرَى فَشَأْنُكَ بِهِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە كاتێ شتێكی دەبەخشی بۆ جیهاد لە پێناوی خوا، بە كەسەكەی دەگوت: كاتێ گەیشتی بە «وادی قوڕا» ئەوە بووە موڵكی تۆ و كەیفی خۆتە چی لێ دەكەیت (بۆیە ئەو مەرجەی دادەنا، چونكە «وادی قوڕا» شوێنی سەرەتای پەڕینەوە بوو بۆ دوژمن و خەتی دەستپێكردنی جیهاد بوو، لەوێ دڵنیا دەبوو كەسەكە شتەكە بۆ جیهاد بەكار دەهێنێ).

١٢٩٧- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أُعْطِيَ الرَّجُلُ الشَّيْءَ فِي الْغَزْوِ، فَبَلَغَ بِهِ رَأْسَ مَغْزَاتِهِ، فَهُوَ لَهُ[٣].

واتە: سەعیدی كوڕی موسەیەب ﵀ دەیگوت: كاتێ پیاو شتێكی پێ بەخشرا بۆ جەنگ و جیهاد، جا گەیشت بە سەرەتای شوێنی جیهادكردن، ئەوە شتەكە بۆ ئەوە (لەوێ دەبێتە موڵكی ئەو).

١٢٩٨- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﵀ عَنْ رَجُلٍ أَوْجَبَ عَلَى نَفْسِهِ الْغَزْوَ فَتَجَهَّزَ، حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ مَنَعَهُ أَبَوَاهُ، أَوْ أَحَدُهُمَا، فَقَالَ: لاَ أَرَى أَنْ يُكَابِرْهُمَا، وَلَكِنْ يُؤَخِّرُ ذَلِكَ إِلَى عَامٍ آخَرَ، فَأَمَّا الْجِهَازُ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يَرْفَعَهُ، حَتَّى يَخْرُجَ بِهِ، فَإِنْ خَشِيَ أَنْ يَفْسُدَ، بَاعَهُ وَأَمْسَكَ ثَمَنَهُ، حَتَّى يَشْتَرِيَ بِهِ مَا يُصْلِحُهُ لِلْغَزْوِ، فَإِنْ كَانَ مُوسِرًا يَجِدُ مِثْلَ جَهَازِهِ إِذَا خَرَجَ، فَلْيَصْنَعْ بِجَهَازِهِ مَا شَاءَ[٤].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كە جیهادی لەسەر خۆی واجب دەكات و كەرەستەی تەواوی خۆی ئامادە دەكات، تا كاتێ

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِيمَنْ أَعْطَى شَيْئًا فِي سَبِيلِ اللهِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٥، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه الشيباني: ٨٦٤ في العتاق، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٦، عن مالك به.

دەیەوێت دەربچێت دایك و باوكی یان یەكێكیان ڕێگری لێ دەكەن، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: پێم وا نییە دروست بێت عینادییان لەگەڵ بكات، بەڵكوو جیهادەكەی دوا دەخات بۆ ساڵێكی دیكە، وە هەرچی كەرەستەی ئامادەكراوە بۆ ئەو بابەتە، ئەوە من بۆچوونم وایە هەڵیبگرێتەوە تاوەكوو (لە ساڵێكی دیكە) پێیەوە دەربچێت، جا ئەگەر ترسا شتەكان (لەوانەی زاد و زەخیرەن) تێكبچن، ئەوە دەیفرۆشێت و پارەكەی هەڵدەگرێت، تاوەكوو (بۆ ساڵی داهاتوو) ئەو شتانەی پێ بكڕێتەوە كە بۆ جیهادكردن پێویستن، جا ئەگەر دەوڵەمەند و هەبوون بوو (دەیزانی) كەلوپەلی وەكوو خۆی دەست دەكەوێتەوە كاتێ بیەوێت دەربچێت (پارەشی دەمێنێت)، ئەوە چی دەكات لە كەلوپەل و زاد و زەخیرەكەی با وای لێ بكات.

## ٦- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی نەفل و بەخشش لە جەنگ و جیهاددا[١]

**١٢٩٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ بَعَثَ سَرِيَّةً، فِيهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَ سُهْمَانُهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً، أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيراً، وَنُفِّلُوا بَعِيراً بَعِيراً[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ سوپا و سەریەیەكی نارد بۆ نەجد، كە عەبدوڵڵای كوڕی عومەریشیان ﷺ تیا بوو، جا وشتری زۆریان بە غەنیمەت دەست كەوت و پشكی هەر یەكەیان دوازدە ـ یان یازدە ـ وشتر بوو، وە دواتر هەریەكە و وشتری دیكەشیان بە نەفل و بەخشش پێ درا.

---

(١) ـ جَامِعُ النَّفْلِ فِي الْغَزْوِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٣؛ والشيباني: ٨٦٣ في العتاق؛ والشافعي: ١٥٠٩؛ وابن حنبل: ٥٢٨٨، وفي: ٥٩١٩، وفي: ٦٤٥٤؛ والبخاري: ٣١٣٤؛ ومسلم: الجهاد: ٣٥؛ وأبو داود: ٢٧٤٤؛ وابن حبان: ٤٨٣٣؛ والدارمي: ٢٤٨١؛ والقابسي: ٢١٣، كلهم عن مالك به.

١٣٠٠- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀، يَقُولُ: كَانَ النَّاسُ فِي الْغَزْوِ، إِذَا اقْتَسَمُوا غَنَائِمَهُمْ، يَعْدِلُونَ الْبَعِيرَ بِعَشْرِ شِيَاهٍ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀ بووە دەیگوت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگدا کاتێ دەستکەوتیان دابەش دەکرد، وشترێکیان بە دە مەڕ و بزن یەکسان دەکرد (واتە دە مەڕ یان دە بزنیان بەرانبەر یەك وشتر دادەنا).

١٣٠١- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ فِي الأَجِيرِ فِي الْغَزْوِ: إِنَّهُ إِنْ كَانَ شَهِدَ الْقِتَالَ، وَكَانَ مَعَ النَّاسِ عِنْدَ الْقِتَالِ، وَكَانَ حُرًّا، فَلَهُ سَهْمُهُ، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ، فَلاَ سَهْمَ لَهُ، قَالَ يَحْيَى ﵀: سَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: أَرَى أَنْ لاَ يُقْسَمَ إِلاَّ لِمَنْ شَهِدَ الْقِتَالَ مِنَ الأَحْرَارِ[٢].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەربارەی کرێکار و بەکرێگیراو کە ئامادە بێت لە جەنگدا گوتوویەتی: ئەگەر ئامادەی جەنگ بوو و لە کاتی جەنگ لەگەڵ خەڵکیدا بوو و کەسێکی ئازادیش بوو، ئەوە پشکی خۆی بۆ هەیە، وە ئەگەر وا نەبوو ئەوە هیچ پشکێکی بۆ نییە، یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: بۆچوونم وایە دەستکەوت دابەش نەکرێ تەنها بۆ ئەو کەسە ئازادانە نەبێ کە ئامادەی جەنگ بوون (کەواتە دەبێ ئازاد و ئامادە بن، دەبێ ئەو دوو مەرجەیان تێدابێ).

### ٧- ئەو شتانەی خومس و پێنجیەکی دەسکەوتیان تیا نییە[٣]

١٣٠٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِيمَنْ وُجِدَ مِنَ الْعَدُوِّ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ بِأَرْضِ الْمُسْلِمِينَ، فَزَعَمُوا أَنَّهُمْ تُجَّارٌ، وَأَنَّ الْبَحْرَ لَفِظَهُمْ، وَلاَ يَعْرِفُ الْمُسْلِمُونَ تَصْدِيقَ ذَلِكَ، إِلاَّ أَنَّ مَرَاكِبَهُمْ

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٦، عن مالك به.

(٣) ـ مَا لَا يَجِبُ فِيهِ الْخُمُسُ.

تَكَسَّرَتْ، أَوْ عَطِشُوا فَنَزَلُوا بِغَيْرِ إِذْنِ الْمُسْلِمِينَ: أَرَى أَنَّ ذَلِكَ لِلإِمَامِ، يَرَى فِيهِمْ رَأْيَهُ، وَلاَ أَرَى لِمَنْ أَخَذَهُمْ فِيهِمْ خُمُسًا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسانەی لە دوژمنانن و لە قەراغی دەریا لە ناو خاکی مسوڵمانان دەبینرێن کە دەڵێن بازرگانین و دەریا ئێمەی فڕێداوەتە دەرەوە بۆ ئێرە، مسوڵمانانیش ڕاستی بابەتەکە نەزانن، تەنها ئەوەندە نەبێت (ببینن) کەشتی و بەلەمەکانیان شکاوە، یان تینوویان بووە و بەبێ مۆڵەتی مسوڵمانان لە خاکی مسوڵمانان دابەزیون، گوتوویەتی: بۆچوونم وایە ئەو بابەتە کاری ئیمام و خەلیفەی مسوڵمانانە، ئەو بۆچوونی خۆی دەربارەیان دەردەکات، وە بۆچوونم وا نیە پێنجیەکی دەستکەوت هەبێت بۆ ئەو کەسانەی دەستگیریان دەکەن.

## ٨- ئەوەی خواردنی دروستە بۆ مسوڵمانان بەر لە پێدانی خومس (پێنجیەك)[2]

**١٣٠٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ يَأْكُلَ الْمُسْلِمُونَ إِذَا دَخَلُوا أَرْضَ الْعَدُوِّ مِنْ طَعَامِهِمْ، مَا وَجَدُوا مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ، قَبْلَ أَنْ تَقَعَ الْمَقَاسِمِ.**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچ کێشە نابینم لەوەی مسوڵمانان کاتێ دەچن بۆ خاکی دوژمن لە خواردنەکەیان بخۆن لەوەی دەستیان دەکەوێت بەگشتی، بەر لەوەی دابەشکردن ڕوو بدات.

**١٣٠٤- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَنَا أَرَى الإِبِلَ وَالْبَقَرَ وَالْغَنَمَ بِمَنْزِلَةِ الطَّعَامِ، يَأْكُلُ مِنْهُ الْمُسْلِمُونَ إِذَا دَخَلُوا أَرْضَ الْعَدُوِّ، كَمَا يَأْكُلُونَ مِنَ الطَّعَامِ، وَلَوْ أَنَّ ذَلِكَ لاَ يُؤْكَلُ حَتَّى يَحْضُرَ النَّاسُ الْمَقَاسِمَ، وَيُقْسَمَ بَيْنَهُمْ، أَضَرَّ ذَلِكَ بِالْجُيُوشِ، قَالَ مَالِكٌ: وَلاَ أَرَى بَأْسًا بِمَا أُكِلَ مِنْ ذَاكَ كُلِّهِ، عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ وَالْحَاجَةِ إِلَيْهِ، وَلاَ أَرَى أَنْ يَدَّخِرَ أَحَدٌ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا يَرْجِعُ بِهِ إِلَى أَهْلِهِ[3].**

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٩، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ لِلْمُسْلِمِيَن أَكْلُهُ قَبْلَ الْخُمُسِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٧، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: من پێم وایە وشتر و مانگا و مەڕ و بزن وەك خواردن وان، دروستە مسوڵمانان لێیان بخۆن کاتێ دەچنە ناو خاکی دوژمن، وەك چۆن بۆیان دروستە لە خواردن بخۆن، چونکە ئەگەر نەخورێت تا خەڵکی ئامادەی دابەشکردنەکە دەبن و ئینجا دابەش بکرێت، ئەوە زیان لە سوپاکە دەدات (برسی و شەکەت و بێهێز دەبن)، ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: پێم وا نییە هیچ کێشە هەبێت بەوەی لە گشت ئەو شتانە بخورێت بەشێوەیەکی چاك و بەپێی پێویست، وە بۆچوونم وا نییە دروست بێت کەسێك لەو شتانە بۆ خانەوادەکەی هەڵبگرێت و بیباتەوە.

**١٣٠٥- [فتوى] قَالَ: وَسُئِلَ مالكٌ ﷬ عَنِ الرَّجُلِ يُصِيبُ الطَّعَامَ فِي أَرْضِ الْعَدُوِّ، فَيَأْكُلُ مِنْهُ وَيَتَزَوَّدُ، فَيَفْضُلُ مِنْهُ شَيْءٌ، أَيَصْلُحُ لَهُ أَنْ يَحْبِسَهُ فَيَأْكُلَهُ فِي أَهْلِهِ، أَوْ يَبِيعَهُ قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ بِلَادَهُ فَيَنْتَفِعَ بِثَمَنِهِ؟ قَالَ مَالِكٌ: إِنْ بَاعَهُ وَهُوَ فِي الْغَزْوِ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يَجْعَلَ ثَمَنَهُ فِي غَنَائِمِ الْمُسْلِمِينَ، وَإِنْ بَلَغَ بِهِ بَلَدَهُ، فَلاَ أَرَى بَأْسًا، أَنْ يَأْكُلَهُ وَيَنْتَفِعَ بِهِ، إِذَا كَانَ يَسِيرًا تَافِهًا**[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷬ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷬ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە لە خاکی دوژمندا (دوای شکاندنی دوژمن) خۆراکی دەکەوێتە دەست، جا لێی دەخوات و لێی هەڵدەگرێت و هەندێکیشی لێ زیاد دەبێ، جا ئایا بۆی دروستە گلی بداتەوە و لەناو خانەوادەکەی بیخوات یان بیفرۆشێ بەر لەوەی بگەڕێتەوە ناوچەکەی و سوود وەربگرێت لە پارەکەی؟ ئیمامی مالیك ﷬ گوتی: ئەگەر فرۆشتی لە کاتێکدا لە غەزا و جیهاددایە، ئەوە من بۆچوونم وایە پارەکە بخاتە ناو دەستکەوتی مسوڵمانانەوە، وە ئەگەر گەیاندیەوە شارەکەی خۆی، ئەوە پێم وا نییە هیچ کێشەی تیا بێت لەوەی بیخوات و سوودی لێ وەربگرێ، (بەمەرجێك) ئەگەر شتەکە کەم و بێنرخ بوو.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٨، عن مالك به.

## ٩- ئەوەی لە دەسكەوتدا دەگەڕێندرێتەوە بەر لەوەی دابەشكردنی تێدا ڕوو بدات، لەو شتانەی دوژمن بردوویەتی[١]

١٣٠٦- أَنَّ عَبْدًا لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَبَقَ، وَأَنَّ فَرَسًا لَهُ عَارَ، فَأَصَابَهُمَا الْمُشْرِكُونَ، ثُمَّ غَنِمَهُمَا الْمُسْلِمُونَ، فَرُدَّا عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُصِيبَهُمَا الْمَقَاسِمُ[٢].

واتە: كۆیلەیەكی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ هەڵهات، هەروەها ئەسپێكیشی هەڵهات، جا موشریكەكان هەردووكیان گرتنەوە، دواتر مسوڵمانان هەردووكیان بەدەستكەوت كەوتنەوە دەست، جا گەڕێندرانەوە بۆ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄، بەر لەوەی دابەش بكرێن.

١٣٠٧- **[فتوى]** قَالَ: وسَمِعْتُ مَالكا ﵀ يَقُولُ فِيمَا يُصِيبُ الْعَدُوُّ مِنْ أَمْوَالِ الْمُسْلِمِينَ: إِنَّهُ إِنْ أُدْرِكَ قَبْلَ أَنْ تَقَعَ فِيهِ الْمَقَاسِمُ، فَهُوَ رَدٌّ عَلَى أَهْلِهِ، وَأَمَّا مَا وَقَعَتْ فِيهِ الْمَقَاسِمُ، فَلاَ يُرَدُّ عَلَى أَحَدٍ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەربارەی ئەوەی دوژمن دەیبات لە سەروەت و سامانی مسوڵمانان (دواتریش دەكەوێتەوە ژێر دەستی مسوڵمانان)، دەیگوت: ئەگەر دۆزرایەوە پێش ئەوەی دابەشكردنی تێدا ڕوو بدات، ئەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەكەی، وە هەرچی ئەوەیە كە دابەشكردن تێیدا ڕووی داوە، ئەوە بۆ كەس ناگەڕێنرێتەوە.

١٣٠٨- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﵀: وَسُئِلَ مَالِكٍ ﵀ عَنْ رَجُلٍ حَازَ الْمُشْرِكُونَ غُلاَمَهُ، ثُمَّ غَنِمَهُ الْمُسْلِمُونَ، قَالَ مَالِكٌ: صَاحِبُهُ أَوْلَى بِهِ بِغَيْرِ ثَمَنٍ، وَلاَ قِيمَةٍ، وَلاَ غُرْمٍ، مَا لَمْ تُصِبْهُ الْمَقَاسِمُ، فَإِنْ وَقَعَتْ فِيهِ الْمَقَاسِمُ، فَإِنِّي أَرَى أَنْ يَكُونَ الْغُلاَمُ لِسَيِّدِهِ بِالثَّمَنِ، إِنْ شَاءَ[٣].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﵀ پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كە موشریكەكان كۆیلەكەی ئەویان بردووە، دواتر مسوڵمانان

---

(١) ـ مَا يُرَدُّ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ الْقَسْمُ مِماَ أَصَابَ الْعَدُو.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٩، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥١، عن مالك به.

بەدەستکەوت دەکەوێتەوە ژێر دەستیان، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: خاوەنەکەی لەپێشترە بەوەی بەبێ پارە و قیمەت و غەرامە پێی بدرێتەوە، مادەم دابەشکردن تێیدا ڕووی نەدابێت، جا ئەگەر دابەشکردن تێیدا ڕووی دا، ئەوە من بۆچوونم وایە بەندەکە بۆ خاوەنەکەی بێت بە پارە، ئەگەر ویستیەوە[1].

**١٣٠٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي أُمِّ وَلَدِ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، حَازَهَا الْمُشْرِكُونَ، ثُمَّ غَنِمَهَا الْمُسْلِمُونَ، فَقُسِمَتْ فِي الْمَقَاسِمِ، ثُمَّ عَرَفَهَا سَيِّدُهَا بَعْدَ الْقَسْمِ: إِنَّهَا لاَ تُسْتَرَقُّ، وَأَرَى أَنْ يَفْتَدِيَهَا الإِمَامُ لِسَيِّدِهَا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ، فَعَلَى سَيِّدِهَا أَنْ يَفْتَدِيَهَا وَلاَ يَدَعُهَا، وَلاَ أَرَى لِلَّذِي صَارَتْ لَهُ أَنْ يَسْتَرِقَّهَا وَلاَ يَسْتَحِلَّ فَرْجَهَا، وَإِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْحُرَّةِ، لأَنَّ سَيِّدَهَا يُكَلَّفُ أَنْ يَفْتَدِيَهَا، إِذَا جَرَحَتْ، فَهَذَا بِمَنْزِلَةِ ذَلِكَ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُسَلِّمَ أُمَّ وَلَدِهِ تُسْتَرَقُّ وَيُسْتَحَلُّ فَرْجُهَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو جارییەیەی بۆتە دایك و منداڵی لە گەورەکەی بووە کە پیاوێکە لە مسوڵمانان و موشریکەکان جارییەکە دەبەن، دواتر مسوڵمانان بەدەستکەوت دەکەوێتەوە لایان و لەگەڵ دابەشکردن دەڕوا و دواتر گەورەکەی دەیناسێتەوە دوای دابەشکردن، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەو ئافرەتە ناکرێتە کۆیلە، وە بۆچوونم وایە ئیمام و گەورەی مسوڵمانان بۆ گەورەکەی بیکڕێتەوە، جا ئەگەر ئەوەی ئەنجام نەدا، ئەوە لەسەر گەورەکەیەتی فیدیەی کڕینەوەی بۆ بدات و وازی لێ نەهێنێ (چونکە نابێ ئەو ئافرەتە بکرێتە کۆیلە)، وە بۆچوونم وایە ئەو کەسەی ئافرەتەکەی بەرکەوتووە و بۆتە پشکی ئەو بۆی نییە بیکاتە کۆیلە و داوێنی بۆ خۆی حەڵاڵ بکات و بچێتە لای، چونکە ئەوە وەك ئافرەتی ئازاد وایە، (کە دەگوترێ دەبێ گەورەکەی بیکڕێتەوە و ئەو کارەی لەسەر واجبە) جا گەورەکەی داوای لێ دەکرێت فیدیە و غەرامەی لە جیاتی بدات لەبەر ئەوەیە ئەگەر ئافرەتەکە کەسێکی زامدار کرد، ئەوە دەبێ برێتی بۆ بدات، ئەو

---

(١) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی شافعی بۆچونی وایە ماڵی مسوڵمان ئەگەر بە جەنگ بکەوێتەوە دەست مسوڵمانان دوای داگیرکردنی لەلایەن کافرانەوە، ئەوە دەبێ بگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی جا پێشی دابەشکردن بێت یان دوای دابەش کردن، جیاوازی نیە.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٢، عن مالك به.

بابەتەش بەهەمان شێوەیە، بۆ گەورەکەی نییە دایکی منداڵەکەی تەسلیم بکات تاوەکوو بکرێتە کۆیلە و دامێنی حەڵاڵ بکرێ.

**١٣١٠- [فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَخْرُجُ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ فِي الْمُفَادَاةِ، أَوْ التِّجَارَةِ، فَيَشْتَرِيَ الْحُرَّ أَوِ الْعَبْدَ، أَوْ يُوهَبَانِ لَهُ، فَقَالَ: أَمَّا الْحُرُّ، فَإِنَّ مَا اشْتَرَاهُ بِهِ، دَيْنٌ عَلَيْهِ، وَلاَ يُسْتَرَقُّ، وَإِنْ كَانَ وُهِبَ لَهُ، فَهُوَ حُرٌّ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الرَّجُلُ أَعْطَى فِيهِ شَيْئًا مُكَافَأَةً، فَهُوَ دَيْنٌ عَلَى الْحُرِّ، بِمَنْزِلَةِ مَا اشْتُرِيَ بِهِ، وَأَمَّا الْعَبْدُ، فَإِنَّ سَيِّدَهُ الأَوَّلَ مُخَيَّرٌ فِيهِ، إِنْ شَاءَ أَنْ يَأْخُذَهُ، وَيَدْفَعَ إِلَى الَّذِي اشْتَرَاهُ ثَمَنَهُ، فَذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يُسْلِمَهُ أَسْلَمَهُ، وَإِنْ كَانَ وُهِبَ لَهُ، فَسَيِّدُهُ الأَوَّلُ أَحَقُّ بِهِ، وَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الرَّجُلُ أَعْطَى فِيهِ شَيْئًا مُكَافَأَةً، فَيَكُونُ مَا أَعْطَى فِيهِ غُرْمًا عَلَى سَيِّدِهِ، إِنْ أَحَبَّ أَنْ يَفْتَدِيَهُ[1].

**(فەتوا)**: واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە دەردەچێت بۆ خاکی دوژمن بۆ کڕینەوەی ئەسیرێك یان بۆ بازرگانی، جا کەسی ئازاد و کۆیلەی پێ فرۆشرا یان بۆی کرا بەدیاری، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: هەرچی ئازادەکەیە، ئەوە ئەو پارەی پێی کڕدراوە قەرزە لەسەری و ناکرێتە کۆیلە، وە ئەگەر هاتوو بۆی کرابوو بەدیاری، ئەوە ئازادە و هیچی لەسەر نییە، تەنها ئەگەر کەسەکە خۆی شتێکی بەخشیە ئەو کەسەی پێی بەخشرابوو وەك پاداشتدانەوە، ئەوە دەبێتە قەرز لەسەر کەسی ئازاد وەك ئەوە وایە کە پێی کڕابێ (واتە دیاری وەك کڕین وایە دەبێ قەرەبووی کەسەکە بکرێتەوە)، وە هەرچی عەبدە (ئەگەر کڕیبووی یان بەدیاری پێیان دابوو)، ئەوە گەورەکەی یەکەمی سەرپشکە تیایدا ئەگەر ویستی وەریبگرێتەوە و نرخەکەی بداتەوە بەو کەسەی کڕیویەتی (کە گەورەی دووەمیەتی)، ئەوە ئاوای بۆ دروستە، وە ئەگەر (گەورەکەی یەکەمی) ویستی بیداتێ و نەیکڕێتەوە ئەوە دەیداتێ، وە ئەگەر بەدیاری پێی بەخشرابوو، ئەوە گەورەکەی یەکەمی شایستەترە پێی و هیچی لەسەر نییە، تەنها ئەگەر خۆی شتێکی پێ بەخشی وەك پاداشتدانەوە، جا ئەوەی دەیەوێ بیبەخشێ دەکەوێتە سەر گەورەکەی یەکەمی ئەگەر حەزی کرد بەخشەکە لە پێناویدا بدات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٠، عن مالك به.




## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشینی چەك و کەلوپەلی کافری کوژرا و (بەو کەسەی کوشتوویەتی)[١]

١٣١١- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ حُنَيْنٍ، فَلَمَّا الْتَقَيْنَا، كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ عَلاَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ: فَاسْتَدَرْتُ لَهُ، حَتَّى أَتَيْتُهُ مِنْ وَرَائِهِ، فَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ عَلَى حَبْلِ عَاتِقِهِ، فَأَقْبَلَ عَلَيَّ، فَضَمَّنِي ضَمَّةً، وَجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ الْمَوْتِ، ثُمَّ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ، فَأَرْسَلَنِي، قَالَ: فَلَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقُلْتُ: مَا بَالُ النَّاسِ؟ فَقَالَ: أَمْرُ اللهِ، ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ رَجَعُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً، لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ، فَلَهُ سَلَبُهُ، قَالَ: فَقُمْتُ، ثُمَّ قُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً، لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ، فَلَهُ سَلَبُهُ، قَالَ: فَقُمْتُ، ثُمَّ قُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ الثَّالِثَةَ، فَقُمْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا لَكَ يَا أَبَا قَتَادَةَ؟ قَالَ: فَاقْتَصَصْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: صَدَقَ، يَا رَسُولَ اللهِ، وَسَلَبُ ذَلِكَ الْقَتِيلِ عِنْدِي، فَأَرْضِهِ مِنْهُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: لاَ هَاءَ اللهِ، إِذًا لاَ يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسْدِ اللهِ، يُقَاتِلُ عَنِ اللهِ وَرَسُولِهِ، فَيُعْطِيكَ سَلَبَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: صَدَقَ، فَأَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَأَعْطَانِيهِ، فَبِعْتُ الدِّرْعَ، فَاشْتَرَيْتُ بِهِ مَخْرَفًا فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَإِنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الإِسْلاَمِ[٢].

واتە: لە قەتادەی کوڕی ڕیبعییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی حونەین دەرچووین، جا کە (لەگەڵ موشریکەکان) بەیەك گەیشتین، مسوڵمانان کەڕەتێك کەوتن، دەڵێ: جا پیاوێکم لە موشریکەکان بینی بەسەر پیاوێك لە مسوڵمانان سەرکەوتبوو (و خستبوویە ژێر خۆیەوە و دەیەویست بیکوژێ)، دەڵێ: جا بۆی سوڕامەوە تا هاتمە پشتی و بە شمشێر لەسەر پەتی ملیم دا، جا ڕووی تێکردم و جارێك گوشیمی بۆنی مردنم لە گوشینەکەی کرد (ئەوەندە بەهێز بوو)، دواتر مردنەکەی (واتە پێکانەکەم تەئسیرەکەی) پێی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي السَّلَبِ فِي النَّفَلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٠؛ والشافعي: ١٠٩٦؛ والبخاري: ٢١٠٠، وفي: ٣١٤٢، وفي: ٤٣٢١؛ ومسلم: الجهاد: ٢٤١؛ وأبو داود: ٢٧١٧؛ والترمذي: ١٥٦٢؛ وابن حبان: ٤٨٠٥، وفي: ٤٨٣٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ١٠٧٥؛ والقابسي: ٥٠٨، كلهم عن مالك به.

گەیشت و بەریدام، دەڵێ: جا بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گەیشتم و گوتم: خەڵك لە چ حاڵێکدان؟ ئەویش گوتی: بڕیاری خوایە (واتە مسوڵمان لە کۆتایی و عاقیبەتدا هەر سەر دەکەون هەرچەندە ئێستاش هەڵاتبن و کەوتبن)، دواتر خەڵك گەڕانەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك کافرێك بکوژێ، بەڵگەشی هەبێت لەسەر کوشتنەکەی، ئەوە کەلوپەلەکانی (کافرەکە) بۆ ئەوە، دەڵێ: منیش هەڵسام، دواتر گوتم: کێ شایەتیم بۆ دەدات (لەسەر کوشتنی ئەم پیاوە کافرە)؟ دواتر دانیشتم، دواتر فەرمووی: هەر کەسێك کافرێك بکوژێ، بەڵگەشی هەبێت لەسەر کوشتنەکەی، ئەوە کەلوپەلەکانی (کافرەکە) بۆ ئەوە، دەڵێ: منیش هەڵسام گوتم: کێ شایەتیم بۆ دەدات (کە من ئەو کافرەم کوشتووە)؟ دواتر دانیشتم، دواتر بۆ جاری سێیەم ئاوای فەرموو، منیش هەڵسام، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چیتە ئەی ئەبو قەتادە؟ دەڵێ: منیش چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، جا پیاوێك لە خەڵکەکە گوتی: ڕاست دەکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەلوپەلەکانی کوژراوەکەش لەلای منە، جا ڕازی بکە دەربارەی کەلوپەلەکە (با بۆ من بێت)، جا ئەبو بەکر ﷺ گوتی: نەخێر سوێند بە خوا نابێت، پێغەمبەری خوا ﷺ شتی وا ناکات و ناچێت لە شێرێك لە شێرەکانی خوا و پێغەمبەر لابدات و کەلوپەلەکانی کوژراوەکە بدات بە تۆ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (ئەبو بەکر ﷺ) ڕاست دەکات، کەلوپەلەکانی بدەرێ، ئەویش دایەوە پێم، جا زرێیەکەم فرۆشت و ڕەزێکم پێ کڕی لەناو هۆزی بەنو سەلەمە (کە هۆزی خۆی بوون)، جا ئەوە یەکەم ماڵ و سەروەت بوو کە لە ئیسلامەتی بەدەستم هێنا و دامەزراند.

**١٣١٢- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَسْأَلُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ الأَنْفَالِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: الْفَرَسُ مِنَ النَّفَلِ، وَالسَّلَبُ مِنَ النَّفَلِ، قَالَ: ثُمَّ عَادَ الرَّجُلُ لِمَسْأَلَتِهِ: فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ، ذَلِكَ أَيْضًا، ثُمَّ قَالَ الرَّجُلُ: الأَنْفَالُ الَّتِي قَالَ اللهُ فِي كِتَابِهِ، مَا هِيَ؟ قَالَ الْقَاسِمُ: فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ حَتَّى كَادَ أَنْ يُحْرِجَهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتَدْرُونَ مَا مَثَلُ هَذَا؟ مَثَلُ هَذَا، مَثَلُ صَبِيغٍ، الَّذِي ضَرَبَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ (١).**

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤١؛ وشرح معاني الآثار: ٥٢٠٤، عن مالك به.

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە پیاوێك بوو دەربارەی ئەنفال (بەخششی جەنگ) پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ کرد، ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: ئەسپ بەشێکە لە نەفل و کەلوپەلی کافری شەڕکەریش بەشێکە لە نەفل، دەڵێ: پیاوەکە دووبارە گەڕایەوە سەر پرسیارەکەی، ئیبنو عەبباسیش ﷺ دیسان هەمان شتی گوت، دواتر پیاوەکە گوتی: ئەو ئەنفالەی خوا باسی کردووە لە پەرتووکەکەی کامەیە و چییە؟ قاسم دەڵێ: بەردەوام پرسیاری لێدەکرد تا خەریك بوو بێزاری بکات، جا ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: دەزانن نموونەی ئەوە وەکوو کێیە؟ نموونەی ئەوە وەك صەبیغە، ئەو کەسەی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لێی دا و دارکاری و تەمێی کرد (کە پرسیاری ناڕەوا و پڕوپوچی دەکرد و گومانی بێبنەمای دروست دەکرد).

**١٣١٣- [فتوى]** قَالَ: وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَمَّنْ قَتَلَ قَتِيلاً مِنَ الْعَدُوِّ، أَيَكُونُ لَهُ سَلَبُهُ بِغَيْرِ إِذْنِ الإِمَامِ؟ قَالَ: لاَ يَكُونُ ذَلِكَ لأَحَدٍ بِغَيْرِ إِذْنِ الإِمَامِ، وَلاَ يَكُونُ ذَلِكَ مِنَ الإِمَامِ إِلاَّ عَلَى وَجْهِ الاِجْتِهَادِ، وَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ، إِلاَّ يَوْمَ حُنَيْنٍ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی کافرێکی شەڕکەری دوژمن بکوژێ، ئایا بەبێ مۆڵەتی ئیمام و خەلیفەی مسوڵمانان کەلوپەلەکانی کوژراوەکەی بۆ هەیە؟ گوتی: کەس بەبێ مۆڵەتی ئیمامی مسوڵمانان ئەوەی بۆ نییە، بۆ ئیمامیش دروست نییە مۆڵەتی ئەوە بدات تەنها بە ڕێگەی ئیجتیهادەوە نەبێت، وە پێم نەگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویێتی: هەر کەسێك کافرێکی شەڕکەری دوژمنی کوشت ئەوە کەلوپەلەکانی بۆ خۆیەتی، تەنها لە شەڕی حونەین نەبێت (واتە ئەو بڕیارە بۆ هەموو کاتێك نییە).

تێبینی: بەڵام وەڵامدراوەتەوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەڕی بەدر و ئوحود و موئتەش ئەو بڕیارەی جێبەجێ کردووە و نموونە هەیە، وەك لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٢، عن مالك به.




## ١١- دەربارەی ئەوەی نەفل و بەخشش لە پێنجیەك بدرێت[١]

**١٣١٤**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُعْطَوْنَ النَّفَلَ مِنَ الْخُمُسِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خەڵك نەفل و بەخششیان لە پێنجیەکەکە پێ دەدرا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گویم لێ بووە لەوبارەیەوە.

**١٣١٥**- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنِ النَّفَلِ، هَلْ يَكُونُ فِي أَوَّلِ مَغْنَمٍ؟ قَالَ: ذَلِكَ عَلَى وَجْهِ الاجْتِهَادِ مِنَ الإِمَامِ، لَيْسَ عِنْدَنَا فِي ذَلِكَ أَمْرٌ مَعْرُوفٌ مَوْقُوفٌ، إِلاَّ اجْتِهَادُ السُّلْطَانِ، وَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَفَّلَ فِي مَغَازِيهِ كُلِّهَا، وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّهُ نَفَّلَ فِي بَعْضِهَا يَوْمَ حُنَيْنٍ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ عَلَى وَجْهِ الاجْتِهَادِ مِنَ الإِمَامِ، فِي أَوَّلِ مَغْنَمٍ، وَفِيمَا بَعْدَهُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی نەفل (بەخششی جەنگ)، کە ئاخۆ لە یەکەم دەستکەوت دەدرێت؟ گوتوویەتی: ئەوە دەگەڕێتەوە سەر ئیجتیهادی ئیمام، لەلای ئێمە هیچ شتێکی زانراو و دەقی شەرعی نییە تەنها ئیجتیهادی کاربەدەست نەبێ (واتە تەنها ئیجتیهادی سوڵتانمان لەبەردەستە)، وە پێم نەگەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ لە گشت جەنگەکانی نەفل و بەخششی دابێت، وە پێمگەیشتووە لە یەکێك لە جەنگەکان بەخششی داوە کە بریتییە لە جەنگی حونەین، جا ئەو بابەتە تەنها دەگەڕێتەوە سەر ئیجتیهادی ئیمام، (جیاوازی نییە) دەربارەی یەکەم دەستکەوت بێت یان دەستکەوتەکانی دواتر.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي إِعْطَاءِ النَّفَلِ مِنَ الْخُمُسِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٣، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٤، عن مالك به.

## ١٢- پشكی ئەسپ لە غەزا[١]

**١٣١٦-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لِلْفَرَسِ سَهْمَانِ، وَلِلرَّجُلِ سَهْمٌ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَمْ أَزَلْ أَسْمَعُ ذَلِكَ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێمگەیشتووە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ﷺ دەیگوت: دوو بەش و پشك بۆ ئەسپ، پشكێكیش بۆ پیاو (واتە بۆ جەنگاوەرەكە كە خاوەنی ئەسپەكەیە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەردەوام گوێم لەوە بووە.

**١٣١٧- [فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنْ رَجُلٍ يَحْضُرُ بِأَفْرَاسٍ كَثِيرَةٍ، فَهَلْ يُقْسَمُ لَهَا كُلِّهَا؟ فَقَالَ: لَمْ أَسْمَعْ بِذَلِكَ، وَلاَ أَرَى أَنْ يُقْسَمَ إِلاَّ لِفَرَسٍ وَاحِدٍ، الَّذِي يُقَاتِلُ عَلَيْهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كە بەژداری بە زۆر ئەسپ دەكات لە جەنگ و جیهاددا، ئایا پشك و بەش بۆ گشتیان دادەنرێ؟ گوتی: شتی وام نەبیستووە، پێشم وا نییە پشكی بۆ دابنرێ تەنها بۆ یەك ئەسپ نەبێ، ئەوەیان كە خۆی لەسەر پشتی دەجەنگێ.

**١٣١٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى الْبَرَاذِينَ، وَالْهُجُنَ إِلاَّ مِنَ الْخَيْلِ، لأَنَّ اللهَ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ﴿٨﴾ ﴾النحل، وَقَالَ ﷻ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾الأنفال، فَأَنَا أَرَى الْبَرَاذِينَ وَالْهُجُنَ مِنَ الْخَيْلِ إِذَا أَجَازَهَا الْوَالِي، وَقَدْ قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ، وَسُئِلَ عَنِ الْبَرَاذِينَ هَلْ فِيهَا صَدَقَةٌ؟ فَقَالَ: وَهَلْ فِي الْخَيْلِ مِنْ صَدَقَةٍ؟[٣].

---

(١) ـ الْقَسْمُ لِلْخَيْلِ فِي الْغَزْو.

(٢) ـ مقطوع ضعيف والمرفوع صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٥، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٤٦، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وا نییە بارجین و هوجون (کە بریتین لە تێکەڵەی ئەسپی عەرەبی و عەجەمی) جۆری جیاواز بن، پێم وایە هەر لە ئەسپ حیسابن، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗ ۝٨ ﴾ النحل، (واتە: ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ بۆ سواربوون و جوانین)، وە فەرموویەتی ﷻ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ ۝٦٠ ﴾الأنفال، (واتە: بۆیان ئامادە بکەن ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز و ئەسپی دابەستراو تا دوژمنی خوا و دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن)، جا من پێم وایە بارجین و متربەی ئەسپ هەر لە ئەسپ حیسابە ئەگەر کاربەدەست ڕێگەی پێ دا بێتە جەنگ (دەبێ پشکی ئەسپی بۆ دابنرێ)، وە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کاتێ پرسیاری لێکرا دەربارەی بارجین کە ئاخۆ زەکاتی تیایە؟ گوتی: بۆ مەگەر ئەسپ زەکاتی تیایە؟! (واتە بارجینی بە ئەسپ داناوە و ئەژمار کردووە).

## ١٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی دزیکردن لە غەنیمەت و دەسکەوتی جیهاد[1]

**١٣١٩-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ صَدَرَ مِنْ حُنَيْنٍ، وَهُوَ يُرِيدُ الْجِعْرَانَةَ، سَأَلَهُ النَّاسُ، حَتَّى دَنَتْ بِهِ نَاقَتُهُ مِنْ شَجَرَةٍ، فَتَشَبَّكَتْ بِرِدَائِهِ حَتَّى نَزَعَتْهُ عَنْ ظَهْرِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: رُدُّوا عَلَيَّ رِدَائِي، أَتَخَافُونَ أَنْ لاَ أَقْسِمَ بَيْنَكُمْ مَا أَفَاءَ اللهُ عَلَيْكُمْ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَفَاءَ اللهُ عَلَيْكُمْ مِثْلَ سَمُرِ تِهَامَةَ نَعَمًا، لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثُمَّ لاَ تَجِدُونِي بَخِيلاً، وَلاَ جَبَانًا، وَلاَ كَذَّابًا. فَلَمَّا نَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَامَ فِي النَّاسِ، فَقَالَ: أَدُّوا الْخَائِطَ وَالْمِخْيَطَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ، وَنَارٌ، وَشَنَارٌ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، قَالَ: ثُمَّ تَنَاوَلَ مِنَ الأَرْضِ وَبَرَةً مِنْ بَعِيرٍ، أَوْ شَيْئًا، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا لِي مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَيْكُمْ، وَلاَ مِثْلُ هَذِهِ، إِلاَّ الْخُمُسُ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ[2].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْغُلُولِ.

(٢) ـ حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٣، عن مالك به.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە حونەین دەرچوو لە کاتێکدا مەبەستی ڕۆیشتن بوو بۆ جیعڕانە، خەڵك داوایان لێ کرد (گوتیان دەسکەوتمان بدێ، ئەوەندە وشترەکەیان تەنگاو کرد) تا وشترەکەی نزیکی کردەوە لە دارەکە (کە دارێکی دڕکاوی بوو، تا وای لێهات ئەوەندە نزیکیان کردەوە لە دارەکە) دارەکە لە عەباکەی ئاڵا و عەباکەی لەسەر پشتی داماڵی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: عەباکەم بۆ بگەڕێننەوە، ئایا دەترسن ئەوەی خوا بەدەسکەوت بۆ ئێوەی داناوە دابەشی نەکەم لە نێوانتاندا؟ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر خوای پەروەردگار بە وێنەی دارەکانی سەمورەی تیهامە (کە داری گەڵا زۆروردن) ئاژەڵتان بەدەستکەوت پێ بدات، ئەوە لە نێوانتاندا دابەشی دەکەم و بەڕەزیلی و ترسنۆکی و درۆزنی نامبینن (حاشای پێغەمبەری خوا ﷺ)، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ (لە وشترەکەی) دابەزی، لەناو خەڵکی هەڵسایەوە و فەرمووی: داو و دەرزیش بدەنەوە و بگەڕێننەوە، چونکە دزی کردن لە دەستکەوت عەیب و ئاگر و قەباحەتە بۆ خاوەنەکەی لە ڕۆژی دواییدا، دەڵێ: دواتر پارچە خورییەکی بچووکی وشتری لە زەوییەکە هەڵگرتەوە و فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ بۆ من نییە لەوەی خوا بەدەستکەوت بۆ ئێوە دەینێرێت، تەنانەت بەئەندازەی ئەو خورییەش، جگە لە پێنجیەك، پێنجیەکەکەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ ئێوە (واتە ئەویشیان بەپێی بۆچوون و ئیجتیهادی خۆم بەسەر ئێوەدا دابەشی دەکەم بەڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ئێوە).

**١٣٢٠- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﷺ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ قَالَ: تُوُفِّيَ رَجُلٌ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَإِنَّهُمْ ذَكَرُوهُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَزَعَمَ زَيْدٌ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، فَتَغَيَّرَتْ وُجُوهُ النَّاسِ لِذَلِكَ، فَزَعَمَ زَيْدٌ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ صَاحِبَكُمْ قَدْ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللهِ، قَالَ: فَفَتَحْنَا مَتَاعَهُ، فَوَجَدْنَا خَرَزَاتٍ مِنْ خَرَزَاتِ يَهُودَ، مَا تُسَاوِينَ دِرْهَمَيْنِ[1].**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەببانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ گوتوویەتی: پیاوێك لە ڕۆژی

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٤؛ والقابسي: ٥٠٤، عن مالك به.

خەیبەر مرد، خەڵکیش ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، جا زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، جا ڕوخساری خەڵکی گۆڕا (پێیان ناخۆش بوو)، ئینجا زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوەڵەکەتان دزی و خیانەتی لە دەسکەوتی جیهادی لە پێناوی خوا کردووە، دەڵێ: جا کەلوپەلەکانی پیاوەکەمان کردەوە، هەندێك لە مورووی جولەکەکانمان لەناودا بینیەوە، کە دوو درهەمیان دەکرد (نرخەکەیان دوو درهەم بوو).

**١٣٢١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ الْكِنَانِيِّ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَتَى النَّاسَ فِي قَبَائِلِهِمْ يَدْعُو لَهُمْ، وَأَنَّهُ تَرَكَ قَبِيلَةً مِنَ الْقَبَائِلِ، قَالَ: وَإِنَّ الْقَبِيلَةَ وَجَدُوا فِي بَرْدَعَةِ رَجُلٍ مِنْهُمْ عِقْدَ جَزْعٍ غُلُولاً، فَأَتَاهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَكَبَّرَ عَلَيْهِمْ، كَمَا يُكَبِّرُ عَلَى الْمَيِّتِ[1].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی موغیرەی کوڕی ئەبو بوڕدەی کینانییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ لای خەڵکی لەناو هۆزەکانیان نزای بۆ دەکردن، جا وازی لە هۆزێك لە هۆزەکان هێنا (نەچوو بۆ لایان)، دەڵێ: جا هۆزەکە لەژێر کورتانی وڵاغی پیاوێك لە خۆیان ملوانکەیەکی مورووی دزراویان دۆزیەوە (کابرا لە دەستکەوتی جیهاد دزیبووی)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لایان و وەك تەکبیری مردوو تەکبیر و «الله أکبر»ی لەسەر لێ دان (واتە تا تێ بگەن ئێوە وەك مردووتان لێ هاتووە جێبەجێکاری شەریعەتی خوا نین).

**١٣٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلاَ وَرِقًا، إِلاَّ الأَمْوَالَ: الثِّيَابَ وَالْمَتَاعَ، قَالَ: فَأَهْدَى رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ غُلاَمًا أَسْوَدَ، يُقَالُ لَهُ: مِدْعَمٌ، فَوَجَّهَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى وَادِي الْقُرَى، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِوَادِي الْقُرَى، بَيْنَمَا مِدْعَمٌ يَحُطُّ رَحْلَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، إِذْ جَاءَهُ سَهْمٌ عَائِرٌ، فَأَصَابَهُ، فَقَتَلَهُ، فَقَالَ النَّاسُ: هَنِيئًا لَهُ الْجَنَّةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَلاَّ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَ يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ، لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ، لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَارًا، قَالَ: فَلَمَّا سَمِعَ النَّاسُ ذَلِكَ، جَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: شِرَاكٌ أَوْ شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ[2].**

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٥، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٦؛ والبخاري: ٤٢٣٤، وفي: ٦٧٠٧؛ ومسلم: الإيمان: ١٨٣؛ والنسائي:

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە ساڵی خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، جا هیچ زێڕ و زیومان بەدەستكەوت بەدەست نەهێنا، جگە لە ماڵ (واتە): پۆشاك و كەلوپەل، (ئەبو هورەیرە ﷺ) دەڵێ: جا ریفاعەی كوڕی زەید ﷺ بەندە و خزمەتكارێكی ڕەشپێستی كردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، كە پێی دەگوترا: میدعەم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی كردە وادی قوڕا (كە شوێنێكە لە نزیك مەدینە)، لە كاتێكدا میدعەم بارگەی پێغەمبەری خوای ﷺ دەخست، لەناكاو تیرێكی بۆ هات كە نەدەزانرا كێ هاویشتی بەریكەوت و كوشتی، جا خەڵكی گوتیان: خۆشبەختی بۆ خۆی و پیرۆزی بێت بەهەشتی بۆ هەیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نەخێر، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو چارۆگەی لە ڕۆژی خەیبەر لە دەسكەوتدا بردی كە هێشتا دابەش نەكرابوو، بڵێسەی ئاگری لەسەر دەكاتەوە، جا كاتێ خەڵك گوێبیستی ئەمە بوون، پیاوێك (زۆر ترسا، جا) بەخۆ بە قەیتانێك ـ یان دوو قەیتان ـ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (كە دزیبووی، گەڕاندیەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قەیتانێك ـ یان دوو قەیتان ـ لە ئاگر.

**١٣٢٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: مَا ظَهَرَ الْغُلُولُ فِي قَوْمٍ قَطُّ إِلاَّ أُلْقِيَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبُ، وَلاَ فَشَا الزِّنَا فِي قَوْمٍ قَطُّ إِلاَّ كَثُرَ فِيهِمُ الْمَوْتُ، وَلاَ نَقَصَ قَوْمٌ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِلاَّ قُطِعَ عَنْهُمُ الرِّزْقُ، وَلاَ حَكَمَ قَوْمٌ بِغَيْرِ الْحَقِّ إِلاَّ فَشَا فِيهِمُ الدَّمُ، وَلاَ خَتَرَ قَوْمٌ بِالْعَهْدِ إِلاَّ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمُ الْعَدُوَّ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خیانەت و دزیكردن لە جیهاد لە ناو هەر قەومێك ڕوو بدات حەتمەن ترسیان دەخرێتە ناو دڵ، وە زینا لەناو هەر قەومێك ڕوو بدات حەتمەن مردنیان لەناو زۆر دەبێت، وە كەمپێوان و كەمكێشان و تەرازووبازی لەناو هەر قەومێك ڕوو بدات حەتمەن ڕۆزییان لەسەر دەبڕدرێت، وە هەر قەومێك حوكم بە جگە لە حەق بكەن حەتمەن

٣٨٢٧؛ وأبو داود: ٢٧١١؛ وابن حبان: ٤٨٥١؛ والقابسي: ١٤١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٧؛ والشيباني: ٨٦٢، عن مالك به.




خوێنڕشتنیان لەناو بڵاو دەبێتەوە، وە هەر قەومێك غەدر لە پەیمان بکەن حەتمەن خوای پەروەردگار ﷻ دوژمنیان بەسەر باڵادەست دەکات.

## ١٤- شەهیدەکانی پێناوی خوا ﷻ[1]

**١٣٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَأُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا، فَأُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا، فَأُقْتَلُ، فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ ثَلاَثًا: أَشْهَدُ بِاللَّهِ[2].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە حەز دەکەم لە پێناوی خوا بجەنگم و بکوژرێم، دواتر زیندوو بکرێمەوە و بکوژرێم، دواتر زیندوو بکرێمەوە و بکوژرێم، جا ئەبو هورەیرە ﷺ سێ جار دەیگوت: بە خوا شاهێدی دەدەم (پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرموو).

**١٣٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ: يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، كِلاَهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللهِ، فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُقَاتِلُ، فَيُسْتَشْهَدُ[3].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار کاری دوو کەسی زۆر پێ جوانە و زۆر لێیان ڕازییە: یەکێکیان ئەوەیدیکەی کوشتووە، هەردووکیشیان چوونەتە بەهەشت، ئەوەیان لە پێناوی خوا جەنگاوە و کوژراوە، دواتر خوای پەروەردگار تەوبەی لە بکوژەکەی قوبوڵ کردووە و هاتۆتە ناو ئیسلام و مسوڵمان بووە و جەنگاوە و شەهید بووە.

---

(١) ـ الشُّهَدَاءُ فِي سَبِيلِ اللهِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٨؛ والشيباني: ٣٠١ في الصلاة؛ والبخاري: ٧٢٢٧؛ والقابسي: ٣٤٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٩؛ والبخاري: ٢٨٢٦؛ والنسائي: ٣١٦٦؛ وابن حبان: ٢١٥، وفي: ٤٦٦٧؛ والقابسي: ٣٤٨، كلهم عن مالك به.

١٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ، إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَمًا، اللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ مِسْكٍ[١].

واته: له ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێك نییە لە پێناوی خوا ﷻ بریندار بێ، خواش دەزانێ کێ (نییەتی پاك بووە و) بۆ خوا بریندار بووە، (جا ئەوەی لە پێناوی خوا بریندار بووە) حەتمەن لە ڕۆژی دوایی دێت لە کاتێکدا برینەکەی خوێنی زۆر فڕێ دەدات، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەشی بۆنی میسکە.

١٣٢٧- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللهُمَّ لاَ تَجْعَلْ قَتْلِي بِيَدِ رَجُلٍ صَلَّى لَكَ سَجْدَةً وَاحِدَةً، يُحَاجُّنِي بِهَا عِنْدَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٢].

واته: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەموو جار دەیگوت: پەروەردگارا کوشتنەکەم نەدەیتە دەستی کەسێك یەك کڕنوشیشی بۆ تۆ بردبێت (نەوەك) بەهۆیەوە بەربەرەکانێم لەگەڵ بکات لەلای تۆ لە ڕۆژی دوایی (جا نزاکەی قبووڵ بوو بکوژەکەی ئەبو لوئلوئەی مەجوسی بوو).

١٣٢٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللهِ صَابِرًا مُحْتَسِبًا، مُقْبِلاً غَيْرَ مُدْبِرٍ، أَيُكَفِّرُ اللهُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، فَلَمَّا أَدْبَرَ الرَّجُلُ، نَادَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَوْ أَمَرَ بِهِ، فَنُودِيَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَيْفَ قُلْتَ؟ فَأَعَادَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: نَعَمْ، إِلاَّ الدَّيْنَ، كَذَلِكَ قَالَ لِي جِبْرِيلُ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٠؛ والبخاري: ٢٨٠٣؛ وابن حبان: ٤٦٥٢؛ والقابسي: ٣٤٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٥، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٢٣؛ والنسائي: ٣١٥٦؛ وابن حبان: ٤٦٥٤؛ والقابسي: ٥٠٧، عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە پێناوی خوا ﷻ بکوژرێم بەئارامگری و چاوبڕینە پاداشت و ڕووکردنە دوژمن و پشتتێنەکردنی، ئایا خوا لە تاوانەکانم خۆش دەبێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، جا کە پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد ـ یان فەرمانی بە کەسێك کرد بانگی بکات و بانگ کرا ـ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوەکەی فەرموو: چیت گوت؟ ئەویش قسەکەی بۆ دووبارە کردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: بەڵێ، جگە لە قەرز، جیبریل ﷺ ئاوای پێ گوتم (واتە بە شەهیدبوونیش قەرز لەسەر کەسەکە لاناچێت).

**١٣٢٩**- عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِشُهَدَاءِ أُحُدٍ: هَؤُلَاءِ أَشْهَدُ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ: أَلَسْنَا يَا رَسُولَ اللهِ بِإِخْوَانِهِمْ؟ أَسْلَمْنَا كَمَا أَسْلَمُوا، وَجَاهَدْنَا كَمَا جَاهَدُوا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بَلَى، وَلَكِنْ لاَ أَدْرِي مَا تُحْدِثُونَ بَعْدِي؟ فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ ﷺ، ثُمَّ بَكَى، ثُمَّ قَالَ: أَئِنَّا لَكَائِنُونَ بَعْدَكَ[1].

واتە: لە ئەبو نەزری خزمەتکاری عومەری کوڕی عوبەیدوڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ڕایگەیاندووە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەهیدەکانی ئوحود فەرمووی: شاهێدی بۆ ئەوانە دەدەم، ئەبو بەکری صددیقیش ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئێمەش برای ئەوان نین؟ مسوڵمان بووین وەك چۆن ئەوان مسوڵمان بوون، وە جیهاد و تێکۆشانمان کردووە وەك ئەوان جیهادیان کردووە (بۆ شاهێدی بۆ ئێمەش نادەی)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ (ڕاستە)، بەڵام (شاهێدی نادەم، چونکە هێشتا ژیانتان لەپێشە) نازانم لەدوای من چی دەکەن؟ جا ئەبو بەکر ﷺ گریا، دواتر جارێکی دیکە گریا و گوتی: ئایا ئێمە لەدوای تۆ دەمێنین (واتە پێی ناخۆش بوو نەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینێ و خۆیشی هەر لەژیاندا بێت).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣١، عن مالك به.

**١٣٣٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسًا، وَقَبْرٌ يُحْفَرُ بِالْمَدِينَةِ، فَاطَّلَعَ رَجُلٌ فِي الْقَبْرِ، فَقَالَ: بِئْسَ مَضْجَعُ الْمُؤْمِنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِئْسَ مَا قُلْتَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أُرِدْ هَذَا يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّمَا أَرَدْتُ الْقَتْلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ مِثْلَ لِلْقَتْلِ فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا عَلَى الأَرْضِ بُقْعَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَكُونَ قَبْرِي بِهَا، مِنْهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ[(١)].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو لە کاتێکدا لە مەدینە گۆڕێك لێ دەدرا، جا پیاوێك سەیری گۆڕەکەی کرد و گوتی: (ئەو گۆڕە) شوێنێکی خراپی مرۆڤی بڕوادارە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خراپت گوت، پیاوەکەش گوتی: من مەبەستم ئەوە نەبوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵکوو مەبەستم کوشتن بوو لە پێناوی خوا (واتە مەبەستم ئەوە بوو بڕوادار وا چاکە لە پێناوی خوا بکوژرێت نەك خۆی بمرێت و لە مەدینە بخرێتە ناو گۆڕ)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هیچ شتێك وەکوو کوشتن و شەهیدبوون نییە لە پێناوی خوا، (بەڵام لەگەڵ ئەوەش) هیچ پارچەیەك لە زەوی نییە خۆشەویستتر بێت لەلام لەوەی گۆڕەکەمی لێ بێت جگە لە مەدینە، سێ جار ئەوەی فەرمووی (واتە مردنیش لە مەدینە تایبەتمەندی خۆی هەیە).

## ١٥- ئەو شتانەی شەهیدیان تیایە[(٢)]

**١٣٣١-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَوَفَاةً بِبَلَدِ رَسُولِكَ[(٣)].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەموو جار دەیگوت: پەروەردگارا داوات لێ دەکەم شەهیدی لە پێناوی تۆ و مردن لە شاری پێغەمبەرەکەتم ﷺ پێ ببەخشی (پەروەردگاریش هەردووکی پێ بەخشی).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٢، عن مالك به.

(٢) ـ مَا تَكُونُ فِيهِ الشَّهَادَةُ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٤، عن مالك به.

**١٣٣٢-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: كَرَمُ الْمُؤْمِنِ تَقْوَاهُ، وَدِينُهُ حَسَبُهُ، وَمُرُوءَتُهُ خُلُقُهُ، وَالْجُرْأَةُ وَالْجُبْنُ غَرَائِزُ يَضَعُهَا اللهُ حَيْثُ شَاءَ، فَالْجَبَانُ يَفِرُّ عَنْ أَبِيهِ وَأُمِّهِ، وَالْجَرِيءُ يُقَاتِلُ عَمَّا لاَ يَؤُوبُ بِهِ إِلَى رَحْلِهِ، وَالْقَتْلُ حَتْفٌ مِنَ الْحُتُوفِ، وَالشَّهِيدُ مَنِ احْتَسَبَ نَفْسَهُ عَلَى اللهِ(١).

واتە: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ڕێزی بڕوادار تەقواكەیەتی و دینەكەی حەسەب و ڕەچەڵەكەكەیەتی و پیاوەتییەكەی ڕەوشتەكەیەتی، جا غیرەت و ئازایەتی و ترسنۆكی غەریزەن خوای پەروەردگار ﷻ (لەناو بونەوەرەكانیدا) هەر كوێ بیەوێ لێی دادەنێ، جا كەسی ترسنۆك لە باوك و دایكیشی ڕادەكات (واتە بەرگری لەوانیش ناكات)، كەسی ئازا و بەغیرەتیش شەر لەسەر كەسێكیش دەكات كە نەگەڕێتەوە بۆ شوێن و بارگەكەی (واتە بەرگری لە كەسێكیش دەكات یەك جار هاتبێتە ماڵەكەی و یەك جار بینیبێتی و بزانێ جارێكی دیكە نەگەڕێتەوە ماڵەكەی)، جا كوشتنیش یەكێكە لە جۆرەكانی مردن (مردنیش هەر بەرۆكی مرۆڤ دەگرێت، جا ترسنۆكی بۆ چییە)، كەسی شەهیدیش كەسێكە نەفسی خۆی كردۆتە پاداشت بۆ خوا ﷻ (واتە بۆ پاداشت خۆی فیدای ڕێبازی خوا كردووە).

## ١٦- دەربارەی شۆردنی شەهید(٢)

**١٣٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ غُسِّلَ وَكُفِّنَ وَصُلِّيَ عَلَيْهِ، وَكَانَ شَهِيدًا يَرْحَمُهُ اللهُ(٣).

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ شۆردرا و كفن كرا، لە كاتێكدا شەهید بوو ﷺ (واتە با شەهیدیش بێت هەر دەشۆردرێت و كفن دەكرێت، چونكە لە گۆڕەپانی جەنگ گیانی لەدەست نەداوە).

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٤، عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي غَسْلِ الشُّهَدَاءِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٧؛ والشافعي: ١٦٣٠، عن مالك به.

**١٣٣٤-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: الشُّهَدَاءُ فِي سَبِيلِ اللهِ، لاَ يُغَسَّلُونَ، وَلاَ يُصَلَّى عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَإِنَّهُمْ يُدْفَنُونَ فِي الثِّيَابِ الَّتِي قُتِلُوا فِيهَا[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتِلْكَ السُّنَّةُ فِيمَنْ قُتِلَ فِي الْمُعْتَرَكِ، فَلَمْ يُدْرَكْ حَتَّى مَاتَ.

قَالَ: وَأَمَّا مَنْ حُمِلَ مِنْهُمْ، فَعَاشَ مَا شَاءَ اللهُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ يُغَسَّلُ وَيُصَلَّى عَلَيْهِ، كَمَا عُمِلَ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە زانایانەوە پێی گەیشتووە دەیانگوت: شەهیدەکانی لە پێناوی خوا هیچ کەسێکیان نە دەشۆردرێن و نە نوێژیان لەسەر دەکرێت، وە بەهەمان ئەو پۆشاکەیانەوە دەنێژرێن کە تیایدا کوژراون.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو ڕێباز و شێوازە دەربارەی کەسێکە کە لە گۆڕەپانی جەنگ دەکوژرێت و ناگەن پێی و (واتە ناگوازرێتەوە) تا دەمرێت.

گوتوویەتی: جا هەرچی ئەو کەسەیە کە هەڵدەگیرێتەوە (لە گۆڕەپانی جەنگ دوای برینداربوونێکی سەخت) و ئەوەندەی خوای پەروەردگار ﷻ مۆڵەتی لەسەر بێت دەژییێت (واتە دواتر بەهۆی سەختی برینەکەیەوە دەمرێت)، ئەوە دەشۆردرێت و نوێژی لەسەر دەکرێت، وەك چۆن ئەوە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا کرا ﷺ.

## ١٧- ئەو شتەی نەهی لێ کراوە لەپێناوی خوا دابنرێت[٢]

**١٣٣٥-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ كَانَ يَحْمِلُ فِي الْعَامِ الْوَاحِدِ عَلَى أَرْبَعِينَ أَلْفِ بَعِيرٍ، يَحْمِلُ الرَّجُلَ إِلَى الشَّامِ عَلَى بَعِيرٍ، وَيَحْمِلُ الرَّجُلَيْنِ إِلَى الْعِرَاقِ عَلَى بَعِيرٍ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَقَالَ: احْمِلْنِي وَسُحَيْمًا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: نَشَدْتُكَ اللهَ أَسُحَيْمٌ زِقٌّ؟ قَالَ لَهُ: نَعَمْ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٩، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الشَّيْءِ يُجْعَلُ فِي سَبِيلِ اللهِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٣، عن مالك به.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە ساڵێکدا (جەنگاوەرانی لەسەر) چل هەزار وشتر بار دەکرد، جا بۆ شام یەك پیاوی لەسەر یەك وشتر بار دەکرد (چونکە دوژمن لەوێ زۆر بوو و پێویستیان بە وشتری زیاتر بوو بۆ شەڕ)، وە بۆ عێراق دوو پیاوی لەسەر یەك وشتر بار دەکرد (چونکە دوژمن لەوێ کەم بوو و پێویستی کەمتر هەبوو بە وشتر)، جا پیاوێکی خەڵکی عێراق هاتە لای و گوتی: من و سوحەیم بەیەکەوە بار بکە لەسەر وشترێك، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئایا سوحەیم مەتارەی ئاو خواردنەوە نییە؟ ئەویش پێی گوت: بەڵێ (واتە کابرا دەیویست ئیمامی عومەر ﷺ لە خشتە ببات و وا حاڵی بکات هاوڕێیەکی هەیە بە ناوی سوحەیم تا بەیەکەوە وشترێکیان پێ بدات کەچی مەبەستی مەتارەی ئاوەکەی بوو، تاوەکوو خۆی بەتەنها سواری وشترەکە بێت، بەڵام ئیمامی عومەر ﷺ بەزیرەکی خۆی بە فێڵەکەی زانی و پیلانەکەی پووچەڵ کردەوە).

## ١٨- هاندان بۆ جیهاد و تێکۆشان[1]

**١٣٣٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا ذَهَبَ إِلَى قُبَاءٍ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمًا، فَأَطْعَمَتْهُ، وَجَلَسَتْ تَفْلِي فِي رَأْسِهِ، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمًا، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ، مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ، أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ، يَشُكُّ إِسْحَاقُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا يُضْحِكُكَ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ، أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ، كَمَا قَالَ فِي الأُولَى، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ، قَالَ: فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَنِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ[2].

---

(١) ـ التَّرْغِيبُ فِي الْجِهَادِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٩؛ وابن حنبل: ١٣٥٤٤؛ والبخاري: ٢٧٨٨، وفي: ٦٢٨٢، وفي:

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچووبایە بۆ قوباء دەچووە لای ئوممو حەڕامی کچی میلحان ﷺ و ئەویش خواردنی دەدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان چوو بۆ لای و ئەویش خواردنی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا و دانیشت سەری پێغەمبەری خوای ﷺ دەکۆڵیەوە و پاکی دەکردەوە (چونکە مەحرەمی ئەو بوو)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (لەو حاڵەتەدا) خەوت، دواتر بەخەبەر هات و پێ دەکەنی، دەڵێ: منیش گوتم: چ شتێك وای لێ کردی پێبکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: خەڵکانێکم پێ نیشان درا لە ئوممەتی من جەنگاوەر بوون سواری پشتی دەریا ببوون بە کورسی پادشایەتی ـ یان هەر وەك چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن بەو شێوەیە ـ، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزام بۆ لە خوا بکە بمکات بە یەکێك لەوان، جا نزای بۆ کرد، دواتر سەری دانایەوە و خەوتەوە، دواتر بەخەبەر هات و پێ دەکەنی: دەڵێ: منیش گوتم: چ شتێك وای لێ کردی پێ بکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: خەڵکانێکم پێ نیشان درا لە ئوممەتی من جەنگاوەر بوون سواری پشتی دەریا ببوون بە کورسی پادشایەتی ـ یان هەر وەك چۆن پادشاکان لەسەر کورسی پادشایەتی دادەنیشن بەو شێوەیە ـ، وەك جاری یەکەمی فەرموو، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە من لەوان بم، فەرمووی: تۆ لە یەکەمەکانی ئەوانی، ئەنەس ﷺ دەڵێ: جا لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ئوم حەڕام ﷺ سواری کەشتی بوو (بۆ جەنگ و جیهاد، لەگەڵ عوبادەی هاوسەری)، جا کاتێ لە دەریا هاتە دەرەوە لە وڵاغەکەی کەوتە خوارەوە و گیانی لەدەست دا (نزاکەی پێغەمبەری سەروەر ﷺ گیرا بوو).

**١٣٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لأَحْبَبْتُ أَنْ لاَ أَتَخَلَّفَ عَنْ سَرِيَّةٍ تَخْرُجُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَلَكِنِّي لاَ أَجِدُ مَا أَحْمِلُهُمْ عَلَيْهِ، وَلاَ يَجِدُونَ مَا

---

٧٠٠١؛ ومسلم: الإمارة: ١٦٠؛ والنسائي: ٣١٧١؛ وأبو داود: ٢٤٩١؛ والترمذي: ١٦٤٥؛ وابن حبان: ٦٦٦٧؛ والقابسي: ١١٧، كلهم عن مالك به.




يَتَحَمَّلُونَ عَلَيْهِ، فَيَخْرُجُونَ وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا بَعْدِي، فَوَدِدْتُ أَنِّي أُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا فَأُقْتَلُ[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم گرانیم دروست دەکرد، ئەوە حەزم دەکرد لە هیچ سوپایێك دوا نەکەوم کە دەردەچن بۆ جەنگ لە پێناوی خوا، بەڵام من کەرەستەی جەنگ و وڵاغم دەست ناکەوێت تا (گشت مسوڵمانان) ئامادە بکەم و بەسەر وڵاغەوە هەڵیانبگرم، خۆشیان کەرەستەی جەنگ و وڵاخیان نییە سواری ببن و دەربچن، وە لەسەریشیان قورسە (من بۆ جیهاد بچم و ئەوانیش) لەدوای من بەجێ بمێنن، (ئەگەر لەبەر ئەو بابەتە نەبووایە) حەزم دەکرد بجەنگم لە پێناوی خوا و بکوژرابام، دواتر زیندوو بکرابامەوە و بکوژرابام، دواتر زیندوو بکرابامەوە و بکوژرابام.

**١٣٣٨- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ، لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ يَأْتِينِي بِخَبَرِ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ الأَنْصَارِيِّ؟ فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ، فَذَهَبَ الرَّجُلُ يَطُوفُ بَيْنَ الْقَتْلَى، فَقَالَ لَهُ سَعْدُ بْنُ الرَّبِيعِ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ لآتِيَهُ بِخَبَرِكَ، قَالَ: فَاذْهَبْ إِلَيْهِ فَاقْرَأْهُ مِنِّي السَّلاَمَ، وَأَخْبِرْهُ أَنِّي قَدْ طُعِنْتُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ طَعْنَةً، وَأَنِّي قَدْ أُنْفِذَتْ مَقَاتِلِي، وَأَخْبِرْ قَوْمَكَ أَنَّهُ لاَ عُذْرَ لَهُمْ عِنْدَ اللهِ، إِنْ قُتِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَوَاحِدٌ مِنْهُمْ حَيٌّ[٢].**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: لە ڕۆژی ئوحود پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاریم بۆ دەهێنێ، پیاوێك گوتی: من، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پیاوەکە ڕۆیشت بەنێوانی کوژراوەکاندا دەگەڕا، جا سەعدی کوڕی ڕەبیع (بەبرینداری بانگی کرد و) پێی گوت: چیت دەوێت؟ پیاوەکەش پێی گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوومی تاوەکوو هەواڵی تۆی بۆ ببەم، ئەویش گوتی: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامی منی پێ بگەیەنە و هەواڵی پێ بدە کە من لە دوازدە شوێن پێکراوم و لێم دراوە و شوێنە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١١؛ وابن حبان: ٤٧٣٦؛ والقابسي: ٥٠٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٢، عن مالك به.

کوشندەکانم پێکراون، وە هەواڵ بدە قەومەکەت بەوەی هیچ عوزر و بەهانەیان نییە لەلای خوای پەروەردگار ﷻ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژرێت لە کاتێکدا کەسێك لە ئێوە زیندوو بێت (واتە تا یەك کەس لە ئێوە زیندوو بێت نابێ بهێڵن پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ئازار و دەستدرێژی بێت).

**١٣٣٩- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَغَّبَ فِي الْجِهَادِ، وَذَكَرَ الْجَنَّةَ، وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يَأْكُلُ تَمَرَاتٍ فِي يَدِهِ، فَقَالَ: إِنِّي لَحَرِيصٌ عَلَى الدُّنْيَا، إِنْ جَلَسْتُ حَتَّى أَفْرُغَ مِنْهُنَّ، فَرَمَى مَا فِي يَدِهِ، فَحَمَلَ بِسَيْفِهِ، فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ[١].**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (مسوڵمانانی) بۆ جیهاد هان دا و باسی بەهەشتی کرد، پیاوێکی ئەنصاریش چەند دانە خورمایەکی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، جا گوتی: ئەگەر دابنیشم تاوەکوو لە خواردنی خورماکان دەبمەوە بەدڵنیایی واتە من سوورم لەسەر دونیا، جا ئەوەی لە دەستی بوو فڕێی دا و شمشێرەکەی هەڵگرت و جەنگا تا کوژرا.

**١٣٤٠- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: الْغَزْوُ غَزْوَانِ: فَغَزْوٌ تُنْفَقُ فِيهِ الْكَرِيمَةُ، وَيُيَاسَرُ فِيهِ الشَّرِيكُ، وَيُطَاعُ فِيهِ ذُو الأَمْرِ، وَيُجْتَنَبُ فِيهِ الْفَسَادُ، فَذَلِكَ الْغَزْوُ خَيْرٌ كُلُّهُ، وَغَزْوٌ لاَ تُنْفَقُ فِيهِ الْكَرِيمَةُ، وَلاَ يُيَاسَرُ فِيهِ الشَّرِيكُ، وَلاَ يُطَاعُ فِيهِ ذُو الأَمْرِ، وَلاَ يُجْتَنَبُ فِيهِ الْفَسَادُ، فَذَلِكَ الْغَزْوُ لاَ يَرْجِعُ صَاحِبُهُ كَفَافًا[٢].**

واتە: لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دوو جۆرە غەزا هەیە: غەزایەك شتی چاك و بەنرخی تێدا سرف دەکرێت و هاوبەش و هاوڕێکانی ئەو غەزایە کۆك و ئاسانکار دەبن لەگەڵ یەکدی و تیایدا گوێڕایەڵی کاربەدەست دەکرێت و خۆپارێزی دەکرێت لە تێکدان و فەساد و خراپە، ئەوە غەزایێکە گشتی خێر و چاکە و پاداشتە، وە غەزاییێکیش هەیە شتی چاك و بەنرخی تێدا سرف ناکرێت و هاوبەش و هاوڕێکانی ئەو غەزایە کۆك و ئاسانکار نابن لەگەڵ یەکدی

---

(١) ـ ضعيف بهذا السياق. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٨، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٢، عن مالك به.

و تیایدا گوێڕایەڵی كاربەدەست ناكرێت و خۆپارێزی ناكرێت لە تێكدان و فەساد و خراپە، ئەوە غەزایێكە خاوەنەكەی بە ماوەی خۆشی ناگەڕێتەوە (واتە دەبێ مەمنون بێ بەبێ پاداشتیش لێی دەربچێ و تاوانبار نەبێ، سەرەڕای ماندووبوون و مەسرەف و ئازار).

## ١٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەسپ و پێشبڕكێكردن لە نێوانیاندا و دەربارەی نەفەقە و مەسرەفكردنی جیهاد[١]

**١٣٤١-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ (كە بۆ جیهاد و كاری چاك بەكاربهێنرێ) خێر و چاكە بە ناوچاوانیەوەتی تاوەكوو ڕۆژی دوایی.

**١٣٤٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ مِمَّنْ سَابَقَ بِهَا[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەیفاء تاوەكوو ثهنییە (كە ناوی دوو شوێنن) پێشبڕكێی كرد لە نێوان ئەسپی دابەستی (دابەستوو)ی ڕامهاتووی بەهێز، لە ثهنییەوە تاوەكوو مزگەوتی بەنو زوڕەیق (كە ئەندازەكەی نزیكترە لەوەی پێشوو) پێشبڕكێی لە نێوان ئەسپی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْخَيْلِ وَالْمُسَابَقَةِ بَيْنَهَا، وَالنَّفَقَةِ فِي الْغَزْوِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٨٩٩؛ والشيباني: ٩٩٤؛ والبخاري: ٢٨٤٩؛ ومسلم: الإمارة: ٩٦؛ والقابسي: ٢١٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٢؛ والشافعي: ١٦١١؛ والبخاري: ٤٢٠؛ ومسلم: الإمارة: ٩٥؛ والنسائي: ٣٥٨٤؛ وأبو داود: ٢٥٧٥؛ وابن حبان: ٤٦٨٦، وفي: ٤٦٩٢؛ والقابسي: ٢١٦، كلهم عن مالك به.

دانەبەستوو کرد (چونکە هێزیان کەمترە، تا ئەزیەت نەخۆن)، ئیبنو عومەریش ﷺ لەوانە بوو کە پێشبڕکێی پێ کرد.

**١٣٤٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: لَيْسَ بِرِهَانِ الْخَيْلِ بَأْسٌ، إِذَا دَخَلَ فِيهَا مُحَلِّلٌ، فَإِنْ سَبَقَ أَخَذَ السَّبَقَ، وَإِنْ سُبِقَ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ شَيْءٌ[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: دانانی پاداشت بۆ پێشبڕکێی ئەسپ هیچ کێشەی تیا نییە ئەگەر کەسێك بێتە ناویەوە (واتە بێتە ناو پێشبڕکێکە و لە دانانی پاداشتیش بەشدار نەبێ)، جا ئەگەر ئەو کەسە پێش کەوت پاداشتەکە بۆ خۆی دەبات، وە ئەگەر پێشی کەوتنەوە هیچی لەسەر نییە (پاداشت نادات، ئەگەرنا حەڕام دەبێ).

**١٣٤٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رُئِيَ وَهُوَ يَمْسَحُ وَجْهَ فَرَسِهِ بِرِدَائِهِ، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: إِنِّي عُوتِبْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْخَيْلِ[2].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ بینرا کەوێ و جوببەکەی بە ڕوخساری ئەسپەکەیدا دەهێنا، جا پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەوە، ئەویش فەرمووی: من ئەمشەو سەرزەنشت کرام دەربارەی ئەسپ (بەوەی نابێ سوکایەتی پێ بکرێ، بۆیە ڕێزی لێ دەنێم).

**١٣٤٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ خَرَجَ إِلَى خَيْبَرَ، أَتَاهَا لَيْلاً، وَكَانَ إِذَا أَتَى قَوْمًا بِلَيْلٍ لَمْ يُغِرْ حَتَّى يُصْبِحَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، خَرَجَتْ يَهُودُ بِمَسَاحِيهِمْ وَمَكَاتِلِهِمْ، فَلَمَّا رَأَوْهُ قَالُوا: مُحَمَّدٌ، وَاللَّهِ مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ[3].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٣؛ والشيباني: ٨٦٠، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٠٠، عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٦٣؛ والبخاري: ٢٩٤٤، وفي: ٤١٩٧؛ والترمذي: ١٥٥٠؛ وابن حبان: ٤٧٤٦؛ والقابسي: ١٤٩، كلهم عن مالك به.



واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ خەیبەر (تا خەیبەر ئازاد بکات لەدەست جوولەکەکان)، جا (عادەتی وا بوو) کە بەشەو بۆ قەومێك بچووبا بەسەریدا نەدەدان تا بەیانی دەکردەوە، جا کە بەیانی کردەوە، جوولەکەکان بە بێڵ و زەنبیلەکانیانەوە دەرچوون (بۆ سەر کێڵگەکانیان)، جا کاتێ پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی گوتیان: ئەوە موحەممەدە، بە خوا موحەممەدە لەگەڵ سوپاکەی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: الله أكبر، خەیبەر تێکچوو، ئێمە کاتێ لە حەوشەی قەومێك بگیرسێینەوە ئەوە خراپترین بەیانی ئەو کەسانەیە کە ئاگادار کراونەتەوە و ترسێنراون (بەوەی واز لە باتڵ بێنن و ڕێگر نەبن لە گەیشتنی ئەو حەقیقەتە بە بەندەکانی خوا، جا بەسەری دادان).

**١٣٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ نُودِيَ فِي الْجَنَّةِ: يَا عَبْدَ اللهِ، هَذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ، دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا عَلَى مَنْ يُدْعَى مِنْ هَذِهِ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ[(١)].**

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك (لە هەر شتێکدا) دوانەیەك ببەخشێت لە پێناوی خوا، ئەوە لە بەهەشتەوە بانگ دەکرێت: ئەی بەندەی خوا ئەوە (دەرگای) چاکەیە (لێرەوە وەرە ژوورەوە)، جا ئەگەر کەسێك لە ئەهلی نوێژ بێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێت، وە کەسێك ئەهلی جیهاد و تێکۆشان بێت، لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێت، وە کەسێك لە ئەهلی بەخشین بێت، لە دەرگای بەخشینەوە بانگ دەکرێت، وە کەسێك لە ئەهلی ڕۆژوو بێت، لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێت، جا ئەبو بەکری صدیق ﷺ گوتی: پێویست نییە بۆ کەسێك لە گشت دەرگاکانەوە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩١٠؛ والبخاري: ١٨٩٧؛ والنسائي: ٣١٨٣؛ والترمذي: ٣٦٧٤؛ وابن حبان: ٣٠٨؛ والقابسي: ٣١، كلهم عن مالك به.

بانگ بکرێت (چونکە لە یەك دەرگاش بانگ بکرێت هەر دەچێتە بەهەشت، بەڵام لە گشتیان بانگ بکرێت شەرەفێکی گەورەیە)، جا ئایا هیچ کەسێك هەیە لە گشت ئەو دەرگایانە بانگ بکرێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئومێدم وایە تۆ لەوان بیت.

## ٢٠- بەدەستهێنانەوەی زەوییەکانیان بۆ ئەو کەسانەی مسوڵمان دەبن لە ئەهلی زیممە[1]

**١٣٤٧- [فتوى] سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ، عَنْ إِمَامٍ قَبِلَ الْجِزْيَةَ مِنْ قَوْمٍ فَكَانُوا يُعْطُونَهَا، أَرَأَيْتَ مَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ، أَتَكُونُ لَهُ أَرْضُهُ، أَوْ تَكُونُ لِلْمُسْلِمِينَ، وَيَكُونُ لَهُمْ مَالُهُ؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: ذَلِكَ يَخْتَلِفُ، أَمَّا أَهْلُ الصُّلْحِ، فَإِنَّ مَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ، فَهُوَ أَحَقُّ بِأَرْضِهِ وَمَالِهِ، وَأَمَّا أَهْلُ الْعَنْوَةِ الَّذِينَ أُخِذُوا عَنْوَةً، فَمَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ، فَإِنَّ أَرْضَهُ وَمَالَهُ لِلْمُسْلِمِينَ، لأَنَّ أَهْلَ الْعَنْوَةِ قَدْ غُلِبُوا عَلَى بِلاَدِهِمْ، وَصَارَتْ فَيْئًا لِلْمُسْلِمِينَ، وَأَمَّا أَهْلُ الصُّلْحِ، فَإِنَّهُمْ قَوْمٌ قَدْ مَنَعُوا أَمْوَالَهُمْ وَأَنْفُسَهُمْ، حَتَّى صَالَحُوا عَلَيْهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِمْ إِلاَّ مَا صَالَحُوا عَلَيْهِ[2].**

(فەتوا): واتە: پرسیار کرا لە پێشەوا مالیك ﷺ دەربارەی ئیمامێك سەرانە لە قەومێك قبووڵ بکات و ئەوانیش سەرانەکە بدەن، پێیان بڵێ: ئەوانەی مسوڵمان دەبن لەو قەومە ئایا زەوییەکانیان بۆ خۆیانە، یان زەوی و ماڵەکەشیان بۆ مسوڵمانانە؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەوە جیاوازە و (بەپێی حاڵەت) دەگۆڕێ: هەرچی ئەهلی صولحن، ئەوانەی کە مسوڵمان دەبن لەوان، ئەوە خۆیان شایستەترن بە زەوی و ماڵەکانیان، وە هەرچی ئەهلی زۆرەملێنە کە مسوڵمانان بەزۆری و جەنگ بەسەریاندا زاڵ بوون لە وڵاتی خۆیاندا، ئەوە زەوییەکانیان دەبن بە دەستکەوت بۆ مسوڵمانان، جا هەرچی ئەوانەن کە ئەهلی صولحن، ئەوە خەڵکانێکن ماڵ و نەفسی خۆیان پاراستووە تا ئەو کاتەی (پابەندن بەوەی) صولحیان لەسەر کردووە، جا ئەوانە هیچیان لەسەر نییە، تەنها ئەوە نەبێ کە صولحیان لەسەر کردووە (کە

---

(١) ـ إِحْرَازُ مَنْ أَسْلَمَ مِنْ أَهْلِ الذِّمَّةِ أَرْضَهُ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٨، عن مالك به.

بريتييە لەوەی ماڵ و زەوییەکانیان بۆ خۆیان بێ و خۆیان تەسلیمی هێز و سوپای ئیسلام بکەن).

## ٢١- شاردنەوەی چەند کەسێك لە ناو یەك گۆڕ بۆ پێویستییە، وە جێبەجێکردنی (ئەو بابەتە) دوای وەفاتکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن ئەبو بەکرەوە لەبەر بەڵێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو[١]

**١٣٤٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ الْجَمُوحِ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ الأَنْصَارِيَّيْنِ، ثُمَّ السَّلَمِيَّيْنِ، كَانَا قَدْ حَفَرَ السَّيْلُ قَبْرَهُمَا، وَكَانَ قَبْرُهُمَا مِمَّا يَلِي السَّيْلَ، وَكَانَا فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ، وَهُمَا مِمَّنِ اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَحُفِرَ عَنْهُمَا لِيُغَيَّرَا مِنْ مَكَانِهِمَا، فَوُجِدَا لَمْ يَتَغَيَّرَا، كَأَنَّهُمَا مَاتَا بِالأَمْسِ، وَكَانَ أَحَدُهُمَا قَدْ جُرِحَ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جُرْحِهِ، فَدُفِنَ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَأُمِيطَتْ يَدُهُ عَنْ جُرْحِهِ، ثُمَّ أُرْسِلَتْ فَرَجَعَتْ كَمَا كَانَتْ، وَكَانَ بَيْنَ أُحُدٍ، وَبَيْنَ يَوْمَ حُفِرَ عَنْهُمَا، سِتٌّ وَأَرْبَعُونَ سَنَةً[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە ڕایگەیاندووە (گوتوویەتی): عەمری کوڕی جەموح و عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ کە هەردووکیان ئەنصاری و سەلەمی بوون، لافاو گۆڕەکانی ئەو دووانەی هەڵکۆڵی کە گۆڕەکانیان لە شوێنی لافاو نزیك بوو و بەیەکەوە لەناو یەك گۆڕدا نێژرابوون، وە هەردووکیان لەو کەسانە بوون کە لە ڕۆژی ئوحود شەهید بوون، جا دوو گۆڕی دیکەیان بۆ هەڵکەنرا تاوەکوو شوێنەکانیان بگۆڕدرێت، جا (دەرهێنران) بینران هیچ نەگۆڕابوون وەکوو بڵێی دوێنێ مردبوون، یەکێکیان برینی پێوەبوو و دەستی لەسەر برینەکەی دانابوو، جا هەر بەو شێوەیە نێژرا و دەستی لادرا لەسەر برینەکەی و دەستیان واڵا کرد، جا دەستی گەڕایەوە شوێنی خۆی (بۆ سەر برینەکە)، جا ماوەی نێوانی ساڵی ئوحود و ئەو ڕۆژەی گۆڕیان بۆ هەڵکەندرایەوە چل و شەش ساڵ بوو (واتە دوای چل و شەش ساڵ هێشتا وەك زیندوو جوان و نوێ بوون).

---

(١) ـ الدَّفْنُ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ مِنْ ضَرُورَةٍ، وَإِنْفَاذُ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عِدَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٣٨، عن مالك به.

**١٣٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ أَنْ يُدْفَنَ الرَّجُلاَنِ وَالثَّلاَثَةُ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ، مِنْ ضَرُورَةٍ، وَيُجْعَلَ الأَكْبَرُ مِمَّا يَلِي الْقِبْلَةَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچ كێشە نییە بۆ پێویستی دوو كەس و سێ كەس لە یەك گۆڕدا بنێژرێن و گەورەترینەكەیان لەلای قیبلە دابنرێ (واتە با ئەویان لەپێشتر بێت).

**١٣٥٠-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ مَالٌ مِنَ الْبَحْرَيْنِ، فَقَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأْيٌ أَوْ عِدَةٌ، فَلْيَأْتِنِي، فَجَاءَهُ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ ﷺ، فَحَفَنَ لَهُ ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ[1].

واتە: لە ڕەبیعەی كوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سەروەت و سامانێك لە بەحرێنەوە بۆ ئیمامی ئەبو بەكری صددیق ﷺ هات، جا گوتی: هەر كەسێك لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بەڵێنێكی هەیە، با بێت بۆ لام، جا جابری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ هات بۆ لای (گوتی من بەڵێنێكم پێ دراوە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ)، جا پڕ بە دوو دەستەكانی سێ مشتی (لە سەروەتەكە) پێ بەخشی (هەر مشتێكیان پێنج سەت دیناری زێڕ بوو).

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٩٥٤، عن مالك به.

## ١- ئەوەی واجبە دەربارەی نەزری بەپێڕۆیشتن[١]

**١٣٥١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄؛ أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ ﵁ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ وَلَمْ تَقْضِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اقْضِهِ عَنْهَا[٢].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعدی کوڕی عوبادە ﵁ پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: دایکم مرد لە کاتێکدا نەزرێکی لەسەر بوو و بەجێی نەگەیاند؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە جیاتی ئەو جێبەجێی بکە.

**١٣٥٢- عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﵀، عَنْ عَمَّتِهِ ﵂، أَنَّهَا حَدَّثَتْهُ عَنْ جَدَّتِهِ، أَنَّهَا كَانَتْ جَعَلَتْ عَلَى نَفْسِهَا مَشْيًا إِلَى مَسْجِدِ قُبَاءٍ، فَمَاتَتْ وَلَمْ تَقْضِهِ، فَأَفْتَى عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ ﵄ ابْنَتَهَا أَنْ تَمْشِيَ عَنْهَا[٣].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پوریەوە ﵂ گێڕاویەتەوە باسی داپیری خۆی کردووە بەوەی لەسەر خۆی نەزر کردبوو بەپێ بچێت بۆ مزگەوتی قوباء، جا وەفاتی کرد و بەجێی نەگەیاند، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ فەتوای بۆ کچەکەی دا بەوەی لە جیاتی ئەو بڕوات.

**١٣٥٣- قَالَ يَحْيَى ﵀: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: لاَ يَمْشِي أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ.**

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: کەس لە جیاتی کەس ڕۆیشتن ناکات (واتە کەس لە جیاتی کەس نەزری بەپێڕۆیشتن بۆ شوێنێکی بە پاداشت ئەنجام نادات).

---

(١) ـ مَا يَجِبُ مِنَ النُّذُورِ فِي الْمَشْيِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩١؛ والحدثاني: ٢٥٩ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٥٠ في الفرائض؛ والبخاري: ٢٧٦١؛ وأبو داود: ٣٣٠٧؛ وابن حبان: ٤٣٩٣؛ والقابسي: ٥١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٢؛ والحدثاني: ٢٥٩أفي النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٤٤ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

**١٣٥٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي حَبِيبَةَ ﵀، قَالَ: قُلْتُ لِرَجُلٍ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ: مَا عَلَى الرَّجُلِ أَنْ يَقُولَ عَلَيَّ مَشْيٌ إِلَى بَيْتِ اللهِ، وَلَمْ يَقُلْ عَلَيَّ نَذْرُ مَشْيٍ، فَقَالَ لِي رَجُلٌ: هَلْ لَكَ أَنْ أُعْطِيَكَ هَذَا الْجِرْوَ، لِجِرْوِ قِثَّاءٍ فِي يَدِهِ، وَتَقُولُ: عَلَيَّ مَشْيٌ إِلَى بَيْتِ اللهِ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقُلْتُهُ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ، ثُمَّ مَكَثْتُ حَتَّى عَقَلْتُ، فَقِيلَ لِي: إِنَّ عَلَيْكَ مَشْيًا، فَجِئْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ لِي: عَلَيْكَ مَشْيٌ، فَمَشَيْتُ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو حەبیبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لە کاتێکدا تەمەنم بچووك بوو بە پیاوێکم گوت: مرۆڤ چی لەسەرە لەوەی بڵێت: بەپێڕۆیشتنم لەسەر بێت بۆ ماڵی خوا، نەڵێت: نەزری بەپێڕۆیشتنم لەسەر واجب بێت، جا پیاوەکە گوتی: ئایا دەتەوێ ئەم فەرخۆکەت بدەمێ، مەبەستی تەرۆزیەکی بچووك بوو کە لە دەستیدا بوو ـ لە کاتێکدا دەڵێیت: لەسەرم بێت بەپێ بچم بۆ ماڵی خوا؟! منیش گوتم: بەڵێ (کابراش گاڵتەی پێهات وەڵامی نەدایەوە)، جا کە ئەوەم گوت لە کاتێکدا بوو بچووك بووم، دواتر ماوەیەکی چاك بەسەرچوو تا عەقڵ و تێگەیشتنم بۆ دروست بوو، جا پێم گوترا: بەپێڕۆیشتنت لەسەر واجب بووە (بەهۆی قسەکەی کاتی خۆی)، جا چووم بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەیەب و پرسیارم لێکرد دەربارەی ئەوە؟ ئەویش پێی گوتم: بەپێڕۆیشتنت لەسەر واجبە، جا بەپێڕۆیشتم.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتە لای ئێمەش هەر ئاوایە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٣؛ والحدثاني: ٢٥٩ب في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٤٥ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی نەزر دەکات بەپێ بڕوات بۆ ماڵی خوا (کەعبە) و پەکی دەکەوێ[1]

**١٣٥٥-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ أُذَيْنَةَ اللَّيْثِيِّ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ جَدَّةٍ لِي عَلَيْهَا مَشْيٌ إِلَى بَيْتِ اللهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَجَزَتْ، فَأَرْسَلَتْ مَوْلًى لَهَا يَسْأَلُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄، فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَسَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄: مُرْهَا فَلْتَرْكَبْ، ثُمَّ لْتَمْشِ مِنْ حَيْثُ عَجَزَتْ[2].

واتە: لە عورووەی کوڕی ئوزەینەی لەیسییەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ داپیرم چووم بۆ ماڵی خوا (کەعبە) کە ڕۆیشتنی بەپێی لەسەر واجب ببوو (بەهۆی نەزرەوە)، تا وای لێهات لە بەشێك لە ڕێگاکە پەکی کەوت (نەیتوانی چیتر بڕوات)، جا خزمەتکارێکی خۆی نارد تا پرسیار بکات لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ (کە ئاخۆ حوکم و چارەی چییە؟)، منیش لەگەڵی دەرچووم، جا پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ کرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﵄ پێی گوت: فەرمانی پێ بکە با سواری وڵاخ ببێت (تا ئەو شوێنەی لێی پەکی کەوتووە، واتە با بۆ جاری دووەم هەوڵبداتەوە بەڵام با تا ئەو شوێنەی بەپێ بڕیویەتی دووبارە بەپێ نەیبڕێتەوە بەڵکوو بەسواری بیبڕێت) دواتر با بەپێ بڕوات لەو شوێنەی لێی پەکی کەوتبوو.

**١٣٥٦-** قَالَ يَحْيَى ﵀: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﵀ يَقُولُ: وَنَرَى عَلَيْهَا مَعَ ذَلِكَ الْهَدْيَ.

واتە: یەحیا ﵀ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﵀ بوو دەیگوت: (لەو مەسەلەی پێشوو) پێمان وایە لەگەڵ ئەوەدا (کە لەگەڵ ئەوەی دەبێ بۆ جاری دووەم نەزرەکەی بەپێ تەواو بکات) لەسەری واجبە ئاژەڵێکیش سەرببڕێ لە مەککە (لەبەر پچڕاندنی ڕۆیشتنەکە بەپێ لە سەفەرەکە و گۆڕینی سەفەرێك بۆ دوو سەفەر).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ نَذَرَ مَشْيًا إِلَىَ بَيْتِ اللهِ فَعَجَزَ.

(٢) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٤؛ والحدثاني: ٢٦٠ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٤٦ في الفرائض؛ والشافعي: ١١٤٥؛ والترمذي: الفرائض: ١٦، كلهم عن مالك به.

١٣٥٧- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ مِثْلَ قَوْلِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ هەمان قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان دەکرد.

١٣٥٨- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ عَلَيَّ مَشْيٌ، فَأَصَابَتْنِي خَاصِرَةٌ، فَرَكِبْتُ حَتَّى أَتَيْتُ مَكَّةَ، فَسَأَلْتُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ ﷺ وَغَيْرَهُ فَقَالُوا: عَلَيْكَ هَدْيٌ، فَلَمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، سَأَلْتُ، فَأَمَرُونِي أَنْ أَمْشِيَ مَرَّةً أُخْرَى مِنْ حَيْثُ عَجَزْتُ، فَمَشَيْتُ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: (بەهۆی نەزرێکەوە) بەپێڕۆیشتنم لەسەر واجب بوو، جا (لە ڕێگا) ئێرکم ژانی گرت، بۆیە سواری وڵاخ بووم تاوەکوو گەیشتم بە مەککە، جا پرسیارم لە عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح ﷺ و زانایانی دیکەی ئەوێ کرد، ئەوانیش گوتیان: سەربڕینی ئاژەڵێکت لەسەرە، جا کاتێ هاتمەوە مەدینە پرسیارم کرد، فەرمانیان پێکردم بەوەی جارێکی دیکە لەو شوێنەی پێشتر پەکم تێداکەوت بەپێ بڕۆمەوە، جا (ئەوەی مابوو بەپێ) ڕۆیشتم.

١٣٥٩- قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: فَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ يَقُولُ عَلَيَّ مَشْيٌ إِلَى بَيْتِ اللهِ، أَنَّهُ إِذَا عَجَزَ رَكِبَ، ثُمَّ عَادَ فَمَشَيَ مِنْ حَيْثُ عَجَزَ، فَإِنْ كَانَ لاَ يَسْتَطِيعُ الْمَشْيَ، فَلْيَمْشِ مَا قَدَرَ عَلَيْهِ، ثُمَّ لْيَرْكَبْ، وَعَلَيْهِ هَدْيُ بَدَنَةٍ أَوْ بَقَرَةٍ أَوْ شَاةٍ، إِنْ لَمْ يَجِدْ إِلاَّ هِيَ[٣].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: دەربارەی ئەو کەسەی دەڵێت: بەپێڕۆیشتنم لەسەر واجب بێت بۆ ماڵی خوا، فەتوا لای ئێمە ئەوەیە ئەگەر (لە ڕێگا) پەکی کەوت و نەیتوانی چیدی بەپێ بڕوات ئەوە

---

(١) ـ مقطوع ضعيف.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٦؛ والحدثاني: ٢٦٠ب في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٤٨ في الفرائض، كلهم عن به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٧، عن مالك به.

سواری وڵاخ دەبێت، دواتر (بۆ جاری دووەم) دەگەڕێتەوە و بەپێ دەڕوات لەو شوێنەی لێی پەکی کەوتبوو، جا ئەگەر (بەهەمان شێوە جارێکی دیکە) نەیتوانی بەپێ بڕوات، ئەوە با ئەوەندە بڕوات کە دەتوانێت، دواتر با سواری وڵاخ بێت، وە سەربڕینی وشترێك یان مانگایێك یان بزنێك یان مەڕێکی لەسەر واجبە، هیچی دیکە بەر ناکەوێت و واجبەکە نایێنێتە جێ جگە لەم ئاژەڵانە.

١٣٦٠- **[فتوى]** وَسُئِلَ مالكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَقُولُ لِلرَّجُلِ: أَنَا أَحْمِلُكَ إِلَى بَيْتِ اللهِ، فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِنْ نَوَى أَنْ يَحْمِلَهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، يُرِيدُ بِذَلِكَ الْمَشَقَّةَ، وَتَعَبَ نَفْسِهِ، فَلَيْسَ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَلْيَمْشِ عَلَى رِجْلَيْهِ، وَلْيُهْدِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ نَوَى شَيْئًا، فَلْيَحْجُجْ وَلْيَرْكَبْ، وَلْيَحْجُجْ بِذَلِكَ الرَّجُلِ مَعَهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ قَالَ: أَنَا أَحْمِلُكَ إِلَى بَيْتِ اللهِ، فَإِنْ أَبَى أَنْ يَحُجَّ مَعَهُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ، وَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ[1].

(فەتوا): واتە: وە پرسیار کرا لە ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە بە کەسێك دەڵێت: من هەڵتدەگرم بۆ ماڵی خوا (کەعبە)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەگەر نییەتی وا بێت لەسەر ملی خۆی هەڵیبگرێت، مەبەستی بەوە خۆخستنە زەحمەت و ماندووکردنی خۆی بێت، ئەوە (بەجێگەیاندنی ئەو شێوازە زەحمەتەی) لەسەر نییە و با لەسەر قاچەکانی بڕوات و ئاژەڵێکیش سەر ببڕێت (بەڵام بە واجببوون لەسەری واجب نییە و سوننەتە)، وە ئەگەر مەبەستی هیچ شتێك نەبوو (لە خۆماندووکردن و خۆخستنە زەحمەت، تەنها مەبەستی ئەوە بوو لەگەڵ خۆی ببات بۆ حەج)، ئەوە با بچێت بۆ حەج و سواری وڵاخ ببێت و حەجیش بە کەسەکە بکات لەگەڵ خۆی، لەبەرئەوەی گوتوویەتی: من هەڵتدەگرم (واتە زەحمەتت قەبوڵ دەکەم) بۆ چوون بۆ ماڵی خوا، جا ئەگەر ئەو ڕازی نەبوو لەگەڵی بێت بۆ حەج، ئەوە هیچ شتێکی لەسەر نییە و ئەوەی جێبەجێ کردووە کە لەسەری واجب بووە (بەوەی داوای لێ کردووە تا بیبات).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٨، عن مالك به.




**١٣٦١- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: سُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَحْلِفُ بِنُذُورٍ مُسَمَّاةٍ، مَشْيًا إِلَى بَيْتِ اللهِ، أَنْ لاَ يُكَلِّمَ أَخَاهُ أَوْ أَبَاهُ بِكَذَا وَكَذَا، نَذْرًا لِشَيْءٍ لاَ يَقْوَى عَلَيْهِ، وَلَوْ تَكَلَّفَ ذَلِكَ كُلَّ عَامٍ، لَعُرِفَ أَنَّهُ لاَ يَبْلُغُ عُمْرُهُ مَا جَعَلَ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ ذَلِكَ، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ يُجْزِيهِ مِنْ ذَلِكَ نَذْرٌ وَاحِدٌ أَوْ نُذُورٌ مُسَمَّاةٌ؟ فَقَالَ مَالِكٌ: مَا أَعْلَمُهُ يُجْزِئُهُ مِنْ ذَلِكَ إِلاَّ الْوَفَاءُ بِمَا جَعَلَ عَلَى نَفْسِهِ، فَلْيَمْشِ مَا قَدَرَ عَلَيْهِ مِنَ الزَّمَانِ، وَلْيَتَقَرَّبْ إِلَى اللهِ تَعَالَى بِمَا اسْتَطَاعَ مِنَ الْخَيْرِ[1].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك کە بە چەندین نەزری ناوهێنراو و بەپێڕۆیشتن بۆ ماڵی خوا سوێند بخوات ئەگەر ئەو قسە و ئەو قسە لەگەڵ برای یان باوکی بکات، (واتە) نەزری بۆ شتێك کرد کە توانای بەسەردا نەبوو، جا (دەزانرا) ئەگەر زۆر لە خۆی بکات لە هەموو ساڵێکدا (بۆ جێبەجێکردنی ئەو نەزرانەی کردوویەتی)، ئەوە تەمەنی ناگات بەوەی کە لەسەر خۆی پێویست کردووە، جا پێی گوترا: ئایا لەوەدا تەنها یەك نەزر جێبەجێ بکات واجبەکە دێتە جێ و بەریدەکەوێت یان دەبێ گشت نەزرە ناوهێنراوەکان ئەنجام بدات؟ ئیمامی مالیکیش ﷺ گوتی: نەمزانیوە هیچ شتێك بەریبکەوێت و واجبەکەی بێنێتە جێ تەنها ئەوە نەبێ دەبێ ئەو شتە جێبەجێ بکات کە لەسەر خۆی واجب کردووە، جا با ئەوەندە کاتەی دەتوانێت بەپێ بڕوات، وە خۆی لە خوا نزیك بکاتەوە بەوەی لە توانایدا هەیە لە چاکە.

### ٣- کرداری بەپێڕۆیشتن بۆ کەعبە[2]

**١٣٦٢- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي الرَّجُلِ يَحْلِفُ بِالْمَشْيِ إِلَى بَيْتِ اللهِ، أَوِ الْمَرْأَةِ، فَيَحْنَثُ أَوْ تَحْنَثُ، أَنَّهُ إِنْ مَشَى الْحَالِفُ مِنْهُمَا فِي عُمْرَةٍ، فَإِنَّهُ يَمْشِي حَتَّى يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَإِذَا سَعَى فَقَدْ فَرَغَ، وَأَنَّهُ إِنْ جَعَلَ عَلَى نَفْسِهِ مَشْيًا فِي الْحَجِّ، فَإِنَّهُ يَمْشِي حَتَّى يَأْتِيَ مَكَّةَ، ثُمَّ يَمْشِي حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ الْمَنَاسِكِ كُلِّهَا، وَلاَ يَزَالُ مَاشِيًا حَتَّى يُفِيضَ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٩، عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي الْمَشْيِ إِلَىَ الْكَعْبَةِ.




قَالَ مَالِكٌ ﷀ: وَلاَ يَكُونُ مَشْيٌ إِلاَّ فِي حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ[١].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): چاكترینی ئەوەی لە زانایانەوە گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو پیاوە یان ئەو ئافرەتەی سوێند دەخوات بەوەی بەپێ بڕوات بۆ ماڵی خوا، جا پیاوەكە یان ئافرەتەكە سوێندەكەی شكاند، (گوتوویانە): ئەگەر سوێندخۆرەكە سوێندی خواردبوو بۆ ڕۆیشتن بەپێ بۆ عومرە، ئەوە بەپێ دەڕوات تاوەكوو ڕاكردنی نێوان صەفا و مەڕوە ئەنجام دەدات، جا ئەگەر ڕاكردنی صەفا و مەڕوەی ئەنجام دا ئەوە لێ بۆتەوە و كۆتایی پێ هێناوە، وە ئەگەر لەسەر خۆی واجب كردبوو بەپێ بڕوات بۆ حەجكردن، ئەوە بەپێ دەڕوات تا دەچێتە مەككە، دواتر بەپێ دەڕوات تاوەكوو لە گشت مەناسیك و دروشمەكان دەبێتەوە، جا هەر بەپێ دەڕوا تاوەكوو تەوافی ئیفازەش دەكات.

ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: هیچ (نەزرێكی) بەپێڕۆیشتن جێبەجێ ناكرێت جگە لە حەج و عومرە.

## ٤- ئەوەی لە نەزرەكاندا دروست نییە لە سەرپێچی خوادا[٢]

**١٣٦٣-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ قَيْسٍ، وَثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ ﷺ، أَنَّهُمَا أَخْبَرَاهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَأَحَدُهُمَا يَزِيدُ فِي الْحَدِيثِ عَلَى صَاحِبِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً قَائِمًا فِي الشَّمْسِ فَقَالَ: مَا بَالُ هَذَا؟ فَقَالُوا: نَذَرَ أَنْ لاَ يَتَكَلَّمَ، وَلاَ يَسْتَظِلَّ مِنَ الشَّمْسِ، وَلاَ يَجْلِسَ، وَيَصُومَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مُرُوهُ فَلْيَتَكَلَّمْ، وَلْيَسْتَظِلَّ، وَلْيَجْلِسْ، وَلْيُتِمَّ صِيَامَهُ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷀ: وَلَمْ أَسْمَعْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَهُ بِكَفَّارَةٍ، وَقَدْ أَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُتِمَّ مَا كَانَ لِلَّهِ طَاعَةً، وَيَتْرُكَ مَا كَانَ لِلَّهِ مَعْصِيَةً[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٠؛ والحدثاني: ٢٦١ في النذور والكفارات، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ النُّذُورِ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٤؛ والحدثاني: ٢٦٨ في النذور والكفارات، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه الحدثاني: ٢٦٨أ في النذور والكفارات، عن مالك به.

واتە: لە حومەیدی کوڕی قەیس و سەوری کوڕی زەیدی دیلیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵیان داوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە یەکێکیان لە فەرموودەکەدا زیاتری لەوەی دیکە گێڕاوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی (لە کات و ڕۆژێکی زۆر گەرم) لەبەر خۆر وەستابوو، ئەویش فەرمووی: ئەوە چییەتی؟ هاوەڵانیش گوتیان: نەزری کردووە قسە نەکات و نەچێتە بەر سێبەر و خۆی لە خۆر نەپارێزێ و دانەنیشێ و بەڕۆژووش بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێ بکەن با قسە بکات و بچێتە بەر سێبەر و دابنیشێت و ڕۆژووەکەشی تەواو بکات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نەمبیستووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردبێت بە کەفارەت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووە ئەو شتە تەواو بکات کە پەرستشە بۆ خوا (کە ڕۆژووەکەیە)، وە واز لەوە بهێنێت کە سەرپێچییە لە خوا (چونکە ئەزیەتدانێك کە داواکراو نەبێت لە شەرعدا ڕێی پێ نەدراوە).

**١٣٦٤- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ يَقُولُ: أَتَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ ابْنِي، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: لاَ تَنْحَرِي ابْنَكِ، وَكَفِّرِي عَنْ يَمِينِكِ، فَقَالَ شَيْخٌ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: وَكَيْفَ يَكُونُ فِي هَذَا كَفَّارَةٌ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة، ثُمَّ جَعَلَ فِيهِ مِنَ الْكَفَّارَةِ مَا قَدْ رَأَيْتَ**(١).

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئافرەتێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ و گوتی: من نەزرم کردووە کوڕەکەم سەر ببڕم، ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: (شتی وا چۆن دەبێ) کوڕەکەت سەر مەبڕە و کەفارەتی نەزرەکەت بدە، جا پیاوێك لەلای ئیبنو عەبباس ﷺ بوو گوتی: چۆن شتێکی وا کەفارەتی تیایە (ئەوە تاوانبارییە خۆ عیبادەت نییە)؟ ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: خوای پەروەردگار گوتوویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة، (واتە: ئەوانەی زیهار لە خێزانەکانیان دەکەن) -لە کاتێکدا زیهار شتێکی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٥؛ والشيباني: ٧٥٢ في الفرائض، عن مالك به.

خراپە کەچی- دواتر ئەو کەفارەتەی تیادا داناوە کە بینیوتە و دەیزانی (کەواتە بەپێی بۆچوونی ئیبنو عبباس نەزری تاوانیش کەفارەتی هەیە).

**١٣٦٥-** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: مَعْنَى قَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: مَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللهَ فَلاَ يَعْصِهِ، أَنْ يَنْذِرَ الرَّجُلُ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الشَّامِ، أَوْ إِلَى مِصْرَ، أَوْ إِلَى الرَّبَذَةِ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، مِمَّا لَيْسَ لِلَّهِ بِطَاعَةٍ، إِنْ كَلَّمَ فُلاَنًا، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، إِنْ هُوَ كَلَّمَهُ أَوْ حَنِثَ بِمَا حَلَفَ عَلَيْهِ، لأَنَّهُ لَيْسَ لِلَّهِ فِي هَذِهِ الأَشْيَاءِ طَاعَةٌ، وَإِنَّمَا يُوَفَّى لِلَّهِ بِمَا لَهُ فِيهِ طَاعَةٌ[1].

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: مانای وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ (کە دەفەرموێ): هەر کەسێك نەزری کرد لەوەی سەرپێچی خوا بکات (واتە نەزرەکە لەگەڵ شەریعەت نەدەگونجا) ئەوە با سەرپێچی نەکات، ماناکەی ئەوەیە کەسێك نەزر بکات بەپێ بچێتە شام یان میصر یان ڕەبەزە یان شوێنێك و شتێکی وەکوو ئەمانە، لەو شتانەی پەرستشی بۆ خوا تێدا نییە، (وەك ئەوەی بڵێ:) ئەگەر من قسە لەگەڵ فڵان کەس بکەم (لەسەرم نەزر بێ دەبێ بچم بۆ شام)، یان شتێکی لەمجۆرە، ئەوە هیچ شتێکی لەسەر نییە لە هیچێك لەم شتانە ئەگەر قسەی لەگەڵ کرد یان قسەکەی شکاند بەوەی سوێندی لەسەر خواردبوو، لەبەر ئەوەی هیچ پەرستشێك بۆ خوا لەم شتانەدا بوونی نییە، تەنها ئەوە بۆ خوا بەجێ دەگەیەنێ کە بۆ خوا پەرستشی تیایە.

## ٥- سەرزارەکی لە سوێنددا[2]

**١٣٦٦-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: لَغْوُ الْيَمِينِ قَوْلُ الإِنْسَانِ لاَ وَاللَّهِ، وبَلَى وَاللَّهِ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٨، عن مالك به.

(٢) ـ اللَّغْوُ فِي الْيَمِينِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٩؛ والشيباني: ٧٥٦ في الفرائض؛ والشافعي: ١١١٢، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عائیشەی دایکی بڕوادارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: سوێندی سەرزارەکی بریتییە لەو قسەی مرۆڤ کاتێ دەڵێ: ناوالله (وا نییە بە خوا، نەوالله...)، وایە والله (ئەرێ والله، بەرێ والله، ... هتد).

**١٣٦٧-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي هَذَا، أَنَّ اللَّغْوَ حَلِفُ الإِنْسَانِ عَلَى الشَّيْءِ، يَسْتَيْقِنُ أَنَّهُ كَذَلِكَ، ثُمَّ يُوجَدُ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، فَهُوَ اللَّغْوُ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێم لێ بووە دەربارەی ئەمە ئەوەیە: سوێندی سەرزارەکی بریتییە لە سوێندخواردنی مرۆڤ لەسەر شتێك کە دڵنیایە و یەقینی وایە شتەکە بەمجۆرەیە، دواتر دەبینێ بە جۆرێکی دیکەیە، ئەوە سەرزارەکییە.

**١٣٦٨-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَعَقْدُ الْيَمِينِ، أَنْ يَحْلِفَ الرَّجُلُ أَنْ لاَ يَبِيعَ ثَوْبَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، ثُمَّ يَبِيعَهُ بِذَلِكَ، أَوْ يَحْلِفَ لَيَضْرِبَنَّ غُلاَمَهُ، ثُمَّ لاَ يَضْرِبُهُ، وَنَحْوَ هَذَا، فَهَذَا الَّذِي يُكَفِّرُ صَاحِبُهُ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَيْسَ فِي اللَّغْوِ كَفَّارَةٌ[2].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: سوێندی دامەزراو ئەوەیە: (بۆ نموونە) مرۆڤ سوێند بخوات بەوەی پۆشاکەکەی بە دە دینار نەفرۆشێت، دواتر بەوەندە بیفرۆشێت، یان سوێند بخوات بەوەی دەبێت لە خزمەتکارەکەی بدات، دواتر لێی نادات، وە هاوشێوەی ئەوە، جا ئەوە ئەو سوێندەیە کە خاوەنەکەی کەفارەتی بۆ دەدات، سوێندی سەرزارەکیش کەفارەتی تیا نییە.

**١٣٦٩-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَأَمَّا الَّذِي يَحْلِفُ عَلَى الشَّيْءِ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ آثِمٌ، وَيَحْلِفُ عَلَى الْكَذِبِ، وَهُوَ يَعْلَمُ، لِيُرْضِيَ بِهِ أَحَدًا، أَوْ لِيَعْتَذِرَ بِهِ إِلَى مُعْتَذَرٍ إِلَيْهِ، أَوْ لِيَقْطَعَ بِهِ مَالاً، فَهَذَا أَعْظَمُ مِنْ أَنْ تَكُونَ فِيهِ كَفَّارَةٌ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٠، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢١، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٢؛ والحدثاني: ٢٧٠أ في النذور والكفارات، عن مالك به.

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەو کەسەیە کە سوێند دەخوات لەسەر شتێك لە کاتێکدا دەزانێ (بەو سوێندخواردنە) تاوانبارە، وە سوێند دەخوات بەدرۆ لە کاتێکدا دەزانێت درۆیە، تاوەکوو کەسێکی پێ ڕازی بکات، یان بۆ ئەوەی پاساو بێنێتەوە بۆ ئەو کەسەی پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە، یان بۆ ئەوەی ماڵ و سەروەتێك بۆ خۆی دابڕێ، ئەوە زۆر لەوە گەورەترە کەفارەتی تیا بێت (واتە ئەو سوێندانە بە کەفارەت تاوانەکەیان پاك نابێتەوە).

## ٦- ئەوەی کەفارەتی تێدانییە لە سوێنددا[١]

**١٣٧٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ قَالَ: وَاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، ثُمَّ لَمْ يَفْعَلِ الَّذِي حَلَفَ عَلَيْهِ، لَمْ يَحْنَثْ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەیگوت: هەر کەسێك گوتی: سوێند بە خوا (ئاوا دەکەم)، دواتر (هەر لەناو سوێندەکەی) گوتی: إن شاء الله، دواتر ئەو شتەی جێبەجێ نەکرد کە سوێندی لەسەر خواردووە، ئەوە سوێندی ناکەوێت (چونکە سوێندەکەی بەستۆتەوە بە مەشیئەتی خواوە گوتوویەتی: إن شاء الله).

**١٣٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللهُ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الثُّنْيَا أَنَّهَا لِصَاحِبِهَا، مَا لَمْ يَقْطَعْ كَلاَمَهُ، وَمَا كَانَ مِنْ ذَلِكَ نَسَقًا، يَتْبَعُ بَعْضُهُ بَعْضًا، قَبْلَ أَنْ يَسْكُتَ، فَإِذَا سَكَتَ وَقَطَعَ كَلاَمَهُ، فَلاَ ثُنْيَا لَهُ[٣]

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێبیستی بووم دەربارەی هەڵاوێردان و جیاکردنەوە لە قسەدا بە «إن شاء الله» کە بۆ خاوەنەکەی هەیە ئەنجامی بدات بریتییە لەوەی لەناو قسەکانی بڵێت: «إن شاء الله» مادەم قسەکەی نەپچڕێنێت، بەوەی قسەکانی لەسەر یەك ڕێ بێت و بەشەکانی بەدوای

---

(١) ـ مَا لَا تَجِبُ فِيهِ الْكَفَّارَةُ مِنَ الْأَيْمَانِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١١؛ والشيباني: ٧٤٩ في الفرائض، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٢، عن مالك به.




یەکەوە بێت پێش ئەوەی بێدەنگ ببێت (وەك ئەوەی بڵێت: والله دەبێ لەم ماڵە دەرت بکەم قەت نەهێڵم پێیەکانت بێتەوە ماڵەوە و نابێ قسەی کەسیش قبووڵ بکەم بە وەرگرتنەوەت إن شاء الله)، (بەڵام) ئەگەر بێدەنگ بوو و قسەکەی پچڕاند، ئەوە بە گوتنی: «إن شاء الله» هەڵاوێردان و جیاکردنەوەی بۆ نییە (وەك ئەوەی بڵێت: والله دەبێ لەم ماڵە دەرت بکەم قەت نەهێڵم پێیەکانت بێتەوە ماڵەوە و نابێ قسەی کەسیش قبووڵ بکەم بە وەرگرتنەوەت ـ ئا دەی فڵان وەرە ئەم خواردنە لێرە هەڵگرە با ئەو منداڵە نەیرێژێ ـ دواتر إن شاء الله بۆ تەواوکردنی سوێندەکەی بڵێت، بەو شێوەیە قبووڵ نییە).

**١٣٧٢- [فتوى] قَالَ يَحْيَى ﷺ: وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ: كَفَرَ بِاللَّهِ، أَوْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ، ثُمَّ يَحْنَثُ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ كَفَّارَةٌ، وَلَيْسَ بِكَافِرٍ، وَلاَ مُشْرِكٍ، حَتَّى يَكُونَ قَلْبُهُ مُضْمِرًا عَلَى الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ، وَلْيَسْتَغْفِرِ اللهَ، وَلاَ يَعُدْ إِلَى شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَبِئْسَ مَا صَنَعَ**[١].

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی دەڵێت: کافر بم بە خوا یان موشریك بم بە خوا (ئەگەر ئاوا بکەم یان ئەگەر ئاوا نەکەم)، دواتریش قسەکەی نایێنێتە جێ، گوتوویەتی: کەفارەتی لەسەر نییە (چونکە ئەوە سوێند نییە)، وە کافر و موشریکیش نابێ تاوەکوو لە دڵیدا بەڕاستی نییەتی شیرك و کوفر بوونی نەبێت، وە با داوای لێخۆشبوون لە خوای پەروەردگار بکات، وە نەگەڕێتەوە سەر شتی ئاوا، وە خراپترین شتی ئەنجام داوە.

## ٧- ئەوەی واجبە کەفارەتی تیا بدرێت لە سوێند[٢]

**١٣٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ، فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَفْعَلِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ**[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٣، عن مالك به.

(٢) ـ مَا تَجِبُ فِيهِ الْكَفَّارَةُ مِنَ الْأَيْمَانِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠١؛ والشيباني: ٧٥٣ في الفرائض؛ وابن حنبل: ٨٧١٩؛ ومسلم: الأيمان: ١٢؛ والترمذي: ١٥٣٠؛ وابن حبان: ٤٣٤٩؛ والقابسي: ٤٤٠، كلهم عن مالك به.



واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك سوێندێك بخوات، جا زانی غەیری بەجێهێنانی سوێندەكە چاكترە لە بەجێهێنانی سوێندەكە، ئەوە با كەفارەت بۆ سوێندەكەی بدات و ئەو كارە ئەنجام بدات كە چاكترە.

**١٣٧٤- [فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَالَ عَلَيَّ نَذْرٌ، وَلَمْ يُسَمِّ شَيْئًا: إِنَّ عَلَيْهِ كَفَّارَةَ يَمِينٍ.

(فەتوا): واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: هەر كەسێك گوتی نەزرێكم لەسەر بێت، ناوی هیچ شتێكیشی نەهێنا، ئەوە كەفارەتی سوێندی لەسەرە.

**١٣٧٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا التَّوْكِيدُ، فَهُوَ حَلِفُ الإِنْسَانِ فِي الشَّيْءِ الْوَاحِدِ، يُرَدِّدُ فِيهِ الأَيْمَانَ يَمِينًا بَعْدَ يَمِينٍ، كَقَوْلِهِ: وَاللَّهِ لاَ أَنْقُصُهُ مِنْ كَذَا وَكَذَا، يَحْلِفُ بِذَلِكَ مِرَارًا، ثَلاَثًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ.

قَالَ: فَكَفَّارَةُ ذَلِكَ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ، مِثْلُ كَفَّارَةِ الْيَمِينِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی سوێندی دووپاتكراوەیە ئەوە بریتییە: لە سوێندخواردنی مرۆڤ دەربارەی یەك شت، كە تیایدا سوێند دوای سوێند دووپاتی دەكاتەوە، وەك (بۆ شتێك) بڵێت: سوێند بە خوا لەوەندە و لەوەندە كەمتری ناكەمەوە، سوێند بۆ ئەوە بخوات چەندین جار، سێ جار یان زیاتر (ئایا بە هەر دووپاتكردنەوەیەك كەفارەتێكی دەكەوێتە سەر؟)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كەفارەتەكەی یەك كەفارەتە، وەك كەفارەتی یەك تاكە سوێند.

**١٣٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ حَلَفَ رَجُلٌ فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ آكُلُ هَذَا الطَّعَامَ، وَلاَ أَلْبَسُ هَذَا الثَّوْبَ، وَلاَ أَدْخُلُ هَذَا الْبَيْتَ، فَكَانَ هَذَا فِي يَمِينٍ وَاحِدَةٍ، فَإِنَّمَا عَلَيْهِ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ كَقَوْلِ الرَّجُلِ لاِمْرَأَتِهِ: أَنْتِ الطَّلاَقُ، إِنْ كَسَوْتُكِ هَذَا الثَّوْبَ، وَأَذِنْتُ لَكِ إِلَى الْمَسْجِدِ،

---

(١) ـ أخرجه الحدثاني: ٢٦٢أ في النذور والكفارات، عن مالك به.

يَكُونُ ذَلِكَ نَسَقًا مُتَتَابِعًا، فِي كَلَامٍ وَاحِدٍ، فَإِنْ حَنِثَ فِي شَيْءٍ وَاحِدٍ مِنْ ذَلِك، فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الطَّلَاقُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ فِيمَا فَعَلَ، بَعْدَ ذَلِكَ، حِنْثٌ، إِنَّمَا الْحِنْثُ فِي ذَلِكَ حِنْثٌ وَاحِدٌ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك سوێندی خوارد و گوتی: سوێند بە خوا ئەو خواردنە ناخۆم و ئەم جلە ناپۆشم و ناچمە ناو ئەم ژوورەوە، جا ئەمانە لەناو یەك سوێندا ڕووی دا، ئەوە تەنها یەك كەفارەتی لەسەرە، جا ئەوە وەكوو قسەی پیاوە كە بە خێزانەكەی دەڵێت: تۆ تەڵاقت كەوتبێت ئەگەر ئەم جلەت بدەمێ و مۆڵەتت بدەم بۆ مزگەوت، ئەگەر بەدوای یەكدا بوون لەناو یەك قسەدا، جا ئەگەر قسەی خۆی شكاند لە شتێك لەمانە، ئەوە تەڵاقی دەكەوێت و هیچ سوێندشكانێكی لەسەر نییە لەوەی دواتر ئەنجامی دەدات لە بەشەكانی دیكەی سوێندەكەی، چونكە سوێندشكانەكە یەك شكانە (گشتیان بەیەكەوە دەشكێن).

**١٣٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الْأَمْرُ عِنْدَنَا فِي نَذْرِ الْمَرْأَةِ، إِنَّهُ جَائِزٌ عَلَيْهَا بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا، يَجِبُ عَلَيْهَا ذَلِكَ، وَيَثْبُتُ إِذَا كَانَ ذَلِكَ فِي جَسَدِهَا، وَكَانَ ذَلِكَ لاَ يَضُرُّ بِزَوْجِهَا، وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ يَضُرُّ بِزَوْجِهَا، فَلَهُ مَنْعُهَا مِنْهُ، وَكَانَ ذَلِكَ عَلَيْهَا حَتَّى تَقْضِيَهُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لای ئێمە دەربارەی نەزری ئافرەت (بەم شێوەیەیە): بەبێ پرسی مێردەكەی بۆی دروستە، نەزرەكەی لەسەر واجب دەبێت و جێگیر دەبێت (بە مەرجێك) ئەگەر ئەوە پەیوەندی بە جەستەی ئافرەتەكەوە هەبوو و زیانیشی نەدەدا لە هاوسەرەكەی (وەك نوێژ)، وە ئەگەر زەرەری لە هاوسەرەكە دەدا (وەك بەڕۆژووبوون، كە ڕێگرە لە جیماع، یان پارەبەخشین لە كاتێكدا خۆی پارەی نەبێ و پێویستی بەوەبێ مێردەكەی بۆی بدات)، ئەوە بۆ هاوسەرەكەی هەیە ڕێگری لێ بكات، جا (ئافرەتەكە) نەزرەكەی هەر لەسەر دەمێنێ تا ئەو كاتەی جێبەجێی دەكات (دوای نەمانی ڕێگرییەكە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٢، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٣؛ والحدثاني: ٢٦٣أ في النذور والكفارات، عن مالك به.

## ٨- کرداری کەفارەتدانی سوێند[1]

**١٣٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ فَوَكَّدَهَا، ثُمَّ حَنِثَ، فَعَلَيْهِ عِتْقُ رَقَبَةٍ، أَوْ كِسْوَةُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، وَمَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ، فَلَمْ يُؤَكِّدْهَا، ثُمَّ حَنِثَ، فَعَلَيْهِ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ مِنْ حِنْطَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: هەر کەسێك سوێندی خوارد و چەند جارێك دووپاتی کردەوە، دواتر سوێندەکەی شکاند، ئەوە ئازادکردنی کۆیلەیەك یان پۆشتەکردنی دە هەژاری لەسەر واجبە، وە هەر کەسێك (یەك جار) سوێندی خوارد و دووپاتی نەکردەوە، دواتر سوێندەکەی شکاند، ئەوە خواردن بەخشینی لەسەر واجبە بە دە هەژار، بۆ هەر هەژارێك یەك مود لە گەنم، جا هەر کەسێك نەیبوو، ئەو کات سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت (کەفارەتەکە بەو شێوەیەیە لەسەر بۆچوونی ئیبنو عومەر).

**١٣٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ كَانَ يُكَفِّرُ عَنْ يَمِينِهِ، بِإِطْعَامِ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ مِنْ حِنْطَةٍ، وَكَانَ يَعْتِقُ الْمِرَارَ إِذَا وَكَّدَ الْيَمِينَ[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە بەوەی ئیبنو عومەر کەفارەتی سوێندی خۆی دەدا بە بەخشینی خواردن بە دە هەژار، بۆ هەر هەژارێك مودێك لە گەنم، وە چەندین جار کۆیلەی ئازاد کردووە کاتێ سوێندی دووپاتکراوەی خواردووە (ئەوە بۆچوونی ئیبنو عومەرە).

**١٣٨٠-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ وَهُمْ إِذَا أَعْطَوْا فِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ، أَعْطَوْا مُدًّا مِنْ حِنْطَةٍ بِالْمُدِّ الأَصْغَرِ، وَرَأَوْا ذَلِكَ مُجْزِئًا عَنْهُمْ[4].

---

(١) ـ الْعَمَلُ فِي كَفَّارَةِ الأَيْمَانِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٤؛ والحدثاني: ٢٦٤ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٣٩ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٦؛ والحدثاني: ٢٦٤أ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٣٧ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٥؛ والشيباني: ٧٣٨ في الفرائض، عن مالك به.

واته: له سولەیمانی كوڕی یەسارەوه ﷺ گێردراوەتەوه گوتوویەتی: بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتووم كاتێ كەفارەتیان بۆ سوێند دەدا یەك مودیان لە گەنم دەبەخشی، بە مودی بچووك، وه پێیان وا بوو ئەوه دروستە و بەردەكەوێت.

١٣٨١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الَّذِي يُكَفِّرُ عَنْ يَمِينِهِ بِالْكِسْوَةِ، أَنَّهُ إِنْ كَسَا الرِّجَالَ، كَسَاهُمْ ثَوْبًا ثَوْبًا، وَإِنْ كَسَا النِّسَاءَ كَسَاهُنَّ ثَوْبَيْنِ ثَوْبَيْنِ، دِرْعًا وَخِمَارًا، وَذَلِكَ أَدْنَى مَا يُجْزِي كُلاًّ فِي صَلاَتِهِ[1].

(فەتوا): واته: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاكترینی ئەوەی گوێم لێ بووه دەربارەی ئەو كەسەی كەفارەتی سوێندەكەی دەدات بە بەخشینی پۆشاك، ئەوەیە ئەگەر پیاوانی پۆشتە كرد ئەوه هەر یەكەو یەك پۆشاكیان پێ دەدات، وه ئەگەر ئافرەتانی پۆشتە كرد ئەوه هەر یەكەو دوو پارچە جلیان پێ دەبەخشێت، مەكسیێك و لەچكێك، (چونكە) ئەوه كەمترینی ئەوەیە كە هەر یەكەیان نوێژیان بەربكەوێت (واتە ئەندازەی داپۆشینی عەورەتی ناو نوێژ بریتییە لە كەمترینی ئەندازەی بەجێگەیاندنی بەخشینی پۆشاك بۆ كەفارەتی سوێند).

## ٩- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە سوێند[2]

١٣٨٢- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَهُوَ يَسِيرُ فِي رَكْبٍ، وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفًا، فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ[3].

واته: له عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوه ﷺ گێردراوەتەوه (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ لە كاتێكدا لەناو كۆمەڵێك دەڕۆیشت و سوێندی بە باوكی دەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٧، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعُ الْأَيْمَانِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٣؛ والحدثاني: ٢٧١ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٥٤ في الفرائض؛ والبخاري: ٦٦٤٦؛ وابن حبان: ٤٣٥٩، وفي: ٤٣٦٠؛ والدارمي: ٢٣٤١؛ والقابسي: ٢١٨، كلهم عن مالك به.

ڕێگریتان لێ دەکات لەوەی سوێند بە باب و باپیرانتان بخۆن، جا هەر کەسێك ویستی سوێند بخوات، ئەوە با سوێند بە خوا ﷻ بخوات یان بێدەنگ بێت.

**١٣٨٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ[1].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار (بۆ وەڵامدانەوەی شتێك بە نەخێر) دەیفەرموو: نەخێر سوێند بەو کەسەی حاڵی دڵەکان دەگۆڕێت.

**١٣٨٤- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أَبَا لُبَابَةَ بْنَ عَبْدِ الْمُنْذِرِ ﷺ حِينَ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَهْجُرُ دَارَ قَوْمِي الَّتِي أَصَبْتُ فِيهَا الذَّنْبَ، وَأُجَاوِرُكَ، وَأَنْخَلِعُ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللهِ، وَإِلَى رَسُولِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُجْزِيكَ مِنْ ذَلِكَ الثُّلُثُ[2].**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدول مونزیر ﷺ کاتێ خوای پەروەردگار تەوبەی لێ قبووڵ کرد (دوای سزادانی بە هۆکاری بەبێ عوزر نەچوونی بۆ جیهاد)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکەم کە لە ناوچەی قەومەکەمە وازی لێ دەهێنم کە تیایدا تووشی تاوانەکە بووم (چونکە لەبەر خۆشی ماڵەکەم و خێزانەکانم نەچووم بۆ جیهاد)، وە دەبمە دراوسێت و خۆم دادەدڕم لە سەروەتەکەم لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ (جا ئایا ڕێ دەدەیت)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێنەکەت دێتە جێ بە بەخشینی سێیەك لە ماڵەکەت (واتە پێویست ناکات گشتی ببەخشی بە سێیەك ئەو بەڵێنەت لەسەر لادەچێ کە نییەتت بۆ هێناوە).

**١٣٨٥- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا سُئِلَتْ عَنْ رَجُلٍ قَالَ: مَالِي فِي رِتَاجِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: يُكَفِّرُهُ مَا يُكَفِّرُ الْيَمِينَ[3].**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٢٥؛ والحدثاني: ٢٧١أ في النذور والكفارات، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٨؛ وفي: ٢٩٩٦؛ والحدثاني: ٢٦٦ في النذور والكفارات؛ وفي: ٣٠٨ في القضاء، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢٠٩؛ والحدثاني: ٢٦٦أ في النذور والكفارات؛ والشيباني: ٧٥٥ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە گوتبووی: سەروەتەکەم بۆ پێش دەرگەی کەعبە بێت (واتە لەوێ گشتی ببەخشرێت)، عائیشەش ﵂ گوتی: ئەو کەفارەتە دەدات کە بۆ سوێند دەیدات (واتە ئەگەر پەشیمان بۆتەوە با قسەکەی نەباتە سەر و لەبری ئەوە کەفارەتی سوێند بدات).

**١٣٨٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فِي الَّذِي يَقُولُ مَالِي فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ يَحْنَثُ، قَالَ: يَجْعَلُ ثُلُثَ مَالِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَذَلِكَ لِلَّذِي جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي أَمْرِ أَبِي لُبَابَةَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو کەسەی دەڵێت: ماڵ و سامانم ببێتە صەدەقە و بەخشین لە پێناوی خوا، دواتر قسەکەی دەشکێنێت (و گشت ماڵەکەی نابەخشێت)، گوتوویەتی: سێیەکی ماڵەکەی لە پێناوی خوا ﷻ دادەنێت، لەبەر ئەوەی ئاوا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی بڕیارەکەی ئەبو لوبابە (کە پێشتر باس کرا)[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٢١٠؛ والحدثاني: ٢٦٦ب في النذور والكفارات، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمد بۆی دروستە کارەکە جێبەجێ نەکات و کەفارەتی سوێند بدات.



# پەرتووكی قوربانی[1]



---

(1) - كِتَابُ الضَّحَايَا.

## ١- ئەو ئاژەڵەی نەهی لێ كراوە لە قوربانیدا[١]

**١٣٨٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ: مَاذَا يُتَّقَى مِنَ الضَّحَايَا؟ فَأَشَارَ بِيَدِهِ، وَقَالَ: أَرْبَعًا، وَكَانَ الْبَرَاءُ ﷺ يُشِيرُ بِيَدِهِ، وَيَقُولُ: يَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: الْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لاَ تُنْقِي[٢].

واتە: لە بەڕائی كوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێكراوە: چ ئاژەڵێك خۆی لێ بەدوور دەگیرێ لە قوربانیدا؟ ئەویش بە دەستی ئاماژەی كرد: چوار، جا بەڕائیش ﷺ بە دەستی ئاماژەی كرد (وەك لاساییكردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ) و گوتی: دەستم كورتترە لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ (چوار ئاژەڵەكان ئەمانە بوون): ئاژەڵی شەل كە شەلییەكەی بەڕوونی دیار بێت، وە ئاژەڵی كوێر كە كوێرییەكەی بەڕوونی دیار بێت، وە ئاژەڵی نەخۆش كە نەخۆشییەكەی بەڕوونی بێت، وە ئاژەڵی لاواز كە هیچ بەزی نەبێت.

**١٣٨٨-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَتَّقِي مِنَ الضَّحَايَا وَالْبُدْنِ الَّتِي لَمْ تُسِنَّ، وَالَّتِي نَقَصَ مِنْ خَلْقِهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەموو جار (بۆ قوربانی و هەدی) خۆی دەپاراست لەو بزن و مەڕەی ددانی پێشەوەیان نەكەوتبا دووساڵیان تەواو نەكردبا، وە خۆی لەوەش دەپاراست كە كەموكوڕی هەبووایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترین و خۆشەویسترین شتە لەلام كە گوێم لێ بووە (دەربارەی ئەو بابەتە).

---

(١) ـ مَا يُنْهَى عَنْهُ مِنَ الضَّحَايَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٢٥؛ والشيباني: ٦٣٣ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والدارمي: ١٩٤٩؛ والجامع لابن زياد: ١ في الضحايا، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٢٠٩؛ وفي: ٢١٢٦؛ والحدثاني: ٥٢٥ في المناسك؛ والشيباني: ٦٣٠ في الضحايا وما يجزئ منها، كلهم عن مالك به.

## ٢- ئەوەی سوننەتە لە قوربانیدا[١]

١٣٨٩- عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ضَحَّى مَرَّةً بِالْمَدِينَةِ، قَالَ نَافِعٌ رَحِمَهُ اللهُ: فَأَمَرَنِي أَنْ أَشْتَرِيَ لَهُ كَبْشًا فَحِيلاً أَقْرَنَ، ثُمَّ أَذْبَحَهُ يَوْمَ الأَضْحَى فِي مُصَلَّى النَّاسِ، قَالَ نَافِعٌ رَحِمَهُ اللهُ: فَفَعَلْتُ، ثُمَّ حُمِلَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فَحَلَقَ رَأْسَهُ حِينَ ذُبِحَ الْكَبْشُ، وَكَانَ مَرِيضًا لَمْ يَشْهَدِ الْعِيدَ مَعَ النَّاسِ، قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَقُولُ: لَيْسَ حِلاَقُ الرَّأْسِ بِوَاجِبٍ عَلَى مَنْ ضَحَّى، وَقَدْ فَعَلَهُ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا [٢].

واتە: لە نافیعەوە رەحمەتی خوای لێ بێت گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێت جارێکیان لە مەدینە قوربانی کرد، نافیع رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: جا فەرمانی پێ کردم بەرانێکی پێگەیشتووی قۆچداری بۆ بکڕم، دواتر لە ڕۆژی قورباندا لە شوێنی نوێژی جەژن سەری ببڕم، نافیع رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: منیش ئەنجامم دا، دواتر بەرانەکە (بەسەربڕاوی) هەڵگیرا بردرا بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێت، جا سەری خۆی تاشی کاتێ بەرانەکە سەر بڕا، لە کاتێکدا نەخۆش بوو لەگەڵ خەڵکی ئامادەی نوێژی جەژن نەبیوو، نافیع رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێت دەیگوت: سەرتاشین واجب نییە لەسەر ئەو کەسەی قوربانی دەکات، لە کاتێکدا ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێت خۆی ئەنجامی دەدا (چونکە پێی سوننەت بوو).

## ٣- نەهیکردن لە کوشتنەوەی قوربانی بەر لە تەواوبوونی ئیمام لە نوێژی جەژن[٣]

١٣٩٠- عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ رَحِمَهُ اللهُ، أَنَّ أَبَا بُرْدَةَ بْنَ نِيَارٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ذَبَحَ ضَحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يَذْبَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَوْمَ الأَضْحَى، فَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَعُودَ بِضَحِيَّةٍ أُخْرَى، فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: لاَ أَجِدُ إِلاَّ جَذَعًا يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: وَإِنْ لَمْ تَجِدْ إِلاَّ جَذَعًا، فَاذْبَحْ[٤].

---

(١) ـ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الضَّحَايَا.

(٢) ـ موقوف صحيح.

(٣) ـ النَّهْيُ عَنْ ذَبْحِ الضَّحِيَّةِ قَبْلَ انْصِرَافِ الإِمَامِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٣؛ وابن حبان: ٥٩٠٥؛ والدارمي: ١٩٦٣؛ والقابسي: ٥٠١، كلهم عن مالك به.

واتە: لە بوشەیری کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بوڕدەی کوڕی نیار ﷺ قوربانییەکەی خۆی سەر بڕی پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانییەکەی خۆی سەر ببڕێت لە ڕۆژی قورباندا، جا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد قوربانییەکی دیکە بکات، ئەبو بوڕدەش ﷺ گوتی: نیمە، تەنها کاریلەیەکی شەشمانگە نەبێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بەڵام زۆر قەڵەو و جوانە)، فەرمووی: ئەگەر هیچت نەبێت جگە لە کاریلە شەشمانگییەکە ئەوە سەری ببڕە.

**١٣٩١-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ ﷺ، أَنَّ عُوَيْمِرَ بْنَ أَشْقَرَ ﷺ ذَبَحَ ضَحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ يَوْمَ الأَضْحَى، وَأَنَّهُ ذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَعُودَ بِضَحِيَّةٍ أُخْرَى[١].

واتە: لە عەبادی کوڕی تەمیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عوەیمیری کوڕی ئەشقەر ﷺ قوربانییەکەی خۆی سەر بڕی پێش خۆرهەڵات و پێش نوێژی جەژن لە ڕۆژی جەژنی قورباندا، جا ئەوەی باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمانی پێ کرد قوربانییەکی دیکە بکات.

## ٤- هەڵگرتن و داکردنی گۆشتی قوربانی[٢]

**١٣٩٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، ثُمَّ قَالَ بَعْدُ: كُلُوا وَتَصَدَّقُوا، وَتَزَوَّدُوا وَادَّخِرُوا[٣].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ (ساڵێکیان) نەهی کرد لە خواردنی گۆشتی قوربانی لە دوای سێ ڕۆژ (واتە نەهی کرد لەوەی پشکی سێ ڕۆژ زیاتر هەڵبگیرێت، چونکە گۆشتەکە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٤؛ والشيباني: ٦٣٧ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ١٢ في الضحايا، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ادِّخَارُ لُحُومِ الأَضَاحِيِّ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٥؛ والشيباني: ٦٣٥ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٧٩٣؛ وابن حنبل: ١٥٢٠٧؛ ومسلم: الأضاحي: ٢٩؛ والنسائي: ٤٤٣٦؛ وابن حبان: ٥٩٢٥؛ والجامع لابن زياد: ١٤ في الضحايا؛ والقابسي: ١٠٥، كلهم عن مالك به.

کەم بوو و مسوڵمانانیش زۆر بوون، بۆ ئەوەی بەشیان بکات)، دواتر (بۆ ساڵی داهاتوو) فەرمووی: بخۆن و لێی ببەخشن و بیکەن بە زەخیرە و هەڵیبگرن (چونکە ئەمجارەیان زۆر بوو).

**١٣٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ وَاقِدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، فَقَالَتْ: صَدَقَ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: دَفَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حَضْرَةَ الأَضْحَى، فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ادَّخِرُوا لِثَلاَثٍ، وَتَصَدَّقُوا بِمَا بَقِيَ، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ، قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: لَقَدْ كَانَ النَّاسُ يَنْتَفِعُونَ بِضَحَايَاهُمْ، وَيَجْمُلُونَ مِنْهَا الْوَدَكَ، وَيَتَّخِذُونَ مِنْهَا الأَسْقِيَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَمَا ذَلِكَ، أَوْ كَمَا قَالَ: قَالُوا: نَهَيْتَ عَنْ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِي دَفَّتْ عَلَيْكُمْ، فَكُلُوا، وَتَصَدَّقُوا، وَادَّخِرُوا.

يَعْنِي بِالدَّافَّةِ: قَوْمًا مَسَاكِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی واقیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە خواردنی گۆشتی قوربانی لە سێ ڕۆژ زیاتر، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: جا ئەوەم بۆ عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان ﷺ باس کرد، ئەویش گوتی: ڕاست دەکات، گوێم لە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو دەیگوت: خەڵکانێکی زۆر لە خەڵکی ڕەشماڵنشینی هەژار ئامادەی کاتی قوربانی بوون لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەشی سێ ڕۆژی لێ هەڵبگرن و ئەوەی مایەوە ببەخشن، عەمرە ﷺ دەڵێت: جا کاتێ بۆ ساڵی دواتر کاتی قوربان هات، بە پێغەمبەری خوایان ﷺ گوت: خەڵکی سوودی چاك لە قوربانییەکانیان وەردەگرن و بەزەکەی کۆ دەکەنەوە، وە دێمکە و کوندەشی لێ دروست دەکەن! (ئەوە چۆن دەبێت)!، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: جا ئەوە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٦؛ والشيباني: ٦٣٤ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ٧٩٤؛ ومسلم: الأضاحي: ٢٨؛ والنسائي: ٤٤٣٦؛ وابن حبان: ٥٩٢٧؛ والجامع لابن زياد: ١٥ في الضحايا؛ والقابسي: ٣٠٩، كلهم عن مالك به.

چییە (چ کێشەی تیایە) یان شتێکی لەو جۆرەی فەرموو، گوتیان: ئاخر (پارساڵ) تۆ نەهیت کرد لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی لە سێ ڕۆژ زیاتر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کاتێ نەهیم لێ کردن تەنها لە پێناوی ئەو کۆمەڵە خەڵکە بوو کە هاتن بۆ لاتان، کەواتە (ئێستا کێشە نییە و خەڵك زۆر نییە) بخۆن و لێی ببەخشن و هەڵیبگرن.

مەبەست بە «الدَّافَّةِ» لە فەرموودەکەدا بریتییە لە: خەڵکانێکی هەژار کە هاتن بۆ مەدینە (و لە پێناوی ئەوان پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کرد لەوەی گۆشتی قوربانی لە سێ ڕۆژ زیاتر هەڵبگیرێ).

**١٣٩٤**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَقَدَّمَ إِلَيْهِ أَهْلُهُ لَحْمًا، فَقَالَ: انْظُرُوا أَنْ يَكُونَ هَذَا مِنْ لُحُومِ الأَضْحَى؟ فَقَالُوا: هُوَ مِنْهَا، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: أَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْهَا؟ فَقَالُوا: إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَعْدَكَ أَمْرٌ، فَخَرَجَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ، فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ، فَأُخْبِرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الأَضْحَى بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَكُلُوا، وَتَصَدَّقُوا، وَادَّخِرُوا، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ الانْتِبَاذِ، فَانْتَبِذُوا، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوهَا، وَلاَ تَقُولُوا هُجْرًا، يَعْنِي: لاَ تَقُولُوا سُوءًا[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە: لە سەفەرێکدا گەڕایەوە، خانەوادەکەشی گۆشتێکیان لەبەردەمی دانا، ئەویش گوتی: ئاگادار بن و هەڵوێستە بکەن ئەوە گۆشتی قوربانی نەبێت؟ ئەوانیش گوتیان: ئەوە گۆشتی قوربانییە، ئەبو سەعیدیش ﷺ گوتی: مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ نەکردووە (دوای سێ ڕۆژ نابێ گۆشتی زیادەتان هەبێت، کەچی ئەوە دوای سێ ڕۆژە)؟ ئەوانیش گوتیان: دوای تۆ فەرمانی دیکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی (ئەو بابەتە) دەرچووە، جا ئەبو سەعید ﷺ دەرچوو و پرسیاری دەربارەی ئەو بابەتە کرد، جا هەواڵی پێ درا بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەهیم لێ کردن لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی دوای سێ ڕۆژ (لەبەر ئامادەبوونی خەڵکی هەژاری شوێنی دیکە)، (بەڵام ئێستا) بخۆن و

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٧؛ والشافعي: ١٦٦١؛ والجامع لابن زياد: ١٦ في الضحايا، كلهم عن مالك به.

لێی ببەخشن و هەڵیبگرن، وە نەهیم لێ كردن لە گرتنەوەی خۆشاو لەناو چەند جۆرە دەفر و كوپێك (لە ترسی گۆڕان و بوون بە خواردنەوەی سەرخۆشكەر)، (بەڵام ئێستا) خۆشاو بگرنەوە لە گشت شتێك (بەڵام ئەوەندەیە ئاگادار بن) گشت سەرخۆشكەرێك حەڕامە، وە پێشتر نەهیم لێكردن لە سەردانیكردنی گۆڕستان، (بەڵام لە ئێستا بەولاوە) سەردانی بكەن، بەڵام (لەسەر گۆڕ) قسەی خراپ مەكەن.

## ٥- هاوبەشی لە قوربانیدا[1]

**١٣٩٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﭭ، أَنَّهُ قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ[2].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە ﭭ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ساڵی حودەیبیە هەر وشترێكمان بۆ حەوت كەس كرد بە قوربانی، مانگاشمان بۆ حەوت كەس كرد بە قوربانی.

**١٣٩٦-** أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﮅ قَالَ: كُنَّا نُضَحِّي بِالشَّاةِ الْوَاحِدَةِ يَذْبَحُهَا الرَّجُلُ عَنْهُ، وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، ثُمَّ تَبَاهَى النَّاسُ بَعْدُ، فَصَارَتْ مُبَاهَاةً[3].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﮅ گوتوویەتی: ئێمە مەڕێك یان بزنێكمان دەكردە قوربانی، پیاو بۆ خۆی و خانەوادەكەی سەری دەبڕی، دواتر خەڵكی خۆیان بەسەر یەكدی هەڵكێشا (هەر كەسەو ئاژەڵێكی بۆ خۆی سەر دەبڕی بۆ خۆهەڵكێشان) و قوربانی بوو بە فیزلێدان[4].

---

(١) ـ الشَّرِكَةُ فِي الضَّحَايَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧٣؛ وفي: ٢١٢٩؛ والحدثاني: ٥٨٤ في المناسك؛ والشيباني: ٦٣٩ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٠٦١؛ وفي: ١٦٩٢؛ وابن حنبل: ١٤١٥٩؛ ومسلم: المناسك: ٣٥٠؛ وأبو داود: ٢٨٠٩؛ والترمذي: ٩٠٤، وفي: ١٥٠٢؛ وابن ماجه: ٣١٧٠؛ وابن حبان: ٤٠٠٦؛ والجامع لابن زياد: ٩ في الضحايا؛ والقابسي: ١٠٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧٧؛ وفي: ٢١٣٢؛ والحدثاني: ٥٨٦ في المناسك؛ والشيباني: ٦٣٨ في الضحايا وما يجزئ منها، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: سوننەتێكی چاك و گەورەیە هەر كەسەو بتوانێت بەتەنها ئاژەڵێك بەجیا سەر ببڕێت، بە

**١٣٩٧-** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَأَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الْبَدَنَةِ، وَالْبَقَرَةِ، وَالشَّاةِ الْوَاحِدَةِ، أَنَّ الرَّجُلَ يَنْحَرُ عَنْهُ، وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ الْبَدَنَةَ، وَيَذْبَحُ الْبَقَرَةَ، وَالشَّاةَ الْوَاحِدَةَ هُوَ يَمْلِكُهَا، وَيَذْبَحُهَا عَنْهُمْ، وَيَشْرَكُهُمْ فِيهَا، فَأَمَّا أَنْ يَشْتَرِيَ النَّفَرُ الْبَدَنَةَ أَوِ الْبَقَرَةَ أَوِ الشَّاةَ، يَشْتَرِكُونَ فِيهَا فِي النُّسُكِ وَالضَّحَايَا، فَيُخْرِجُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ حِصَّتَهُ مِنْ ثَمَنِهَا، وَتَكُونُ لَهُ حِصَّتُهُ مِنْ لَحْمِهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يُكْرَهُ، وَإِنَّمَا سَمِعْنَا الْحَدِيثَ: أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَكُ فِي النُّسُكِ، وَإِنَّمَا يَكُونُ عَنْ أَهْلِ الْبَيْتِ الْوَاحِدِ[1].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێم لێ بووە دەربارەی یەك وشتر و مانگا و مەڕ و بزن ئەوەیە پیاو وشترێك بۆ خۆی و خانەوادەکەی سەر ببڕێت، هەروەها یەك مانگا یان مەڕ یان بزن بۆ گشتیان سەر ببڕێت و لە پاداشت بەژدارییان پێ بکات (بە مەرجێك) بەتەنها بیکڕێت، جا هەرچی ئەوەیە چەند کەسێك بەیەکەوە وشترێك یان مانگایێك یان مەڕێك یان بزنێك بکرن، تیایدا بەژدار بن لە هەدی و قوربانیدا و هەر کەسێك لەوان بەشی خۆی دەربێنێت لە پارەکەیدا، وە پشکەکەی خۆی بۆ هەبێت لە گۆشتەکەیدا، ئەوە دروست نییە، وە فەرموودەمان بیستووە بەوەی: لە قوربانیدا شەریکایەتی کڕین ناکرێت، بەڵکوو تەنها بۆ یەك خانەوادە دەبێت (بۆیان ئاساییە بەژداری بکەن لە پاداشت).

**١٣٩٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: مَا نَحَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ إِلاَّ بَدَنَةً وَاحِدَةً، أَوْ بَقَرَةً وَاحِدَةً.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ أَدْرِي أَيَّتَهُمَا قَالَ أبْنُ شِهَابٍ ﵀ [2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی و بۆ خانەوادەکەی لە وشترێك ـ یانیش گوتی: لە مانگایێك ـ زیاتری سەر نەبڕیوە.

---

مەرجێك نییەتی بۆ خوا بێت نەك فیزلێدان و خۆهەڵکێشان.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧٩؛ وفي: ٢١٣١؛ والحدثاني: ٥٨٧أ في المناسك؛ والجامع لابن زياد: ١٠ في الضحايا؛ والجامع لابن زياد: ٢٩ في الضحايا، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٧١؛ والحدثاني: ٥٨٦أ في المناسك، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نازانم ئیبنو شیهاب ﷺ كامیانی گوت (وشتر یان مانگا).

## ٦- قوربانیكردن بۆ ئەو منداڵەی لەناو سكی ئافرەتدایە، وە باسی ڕۆژەكانی قوربانی[1]

**١٣٩٩- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: الأَضْحَى يَوْمَانِ بَعْدَ يَوْمِ الأَضْحَى[٢].**

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ گوتوویەتی: قوربانی دوو ڕۆژە دوای ڕۆژی جەژنی قوربان (واتە كۆی گشتی دەكاتە سێ ڕۆژ)[٣].

**١٤٠٠- عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ مِثْلُ ذَلِكَ[٤].**

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەمان شتی لە ئیمامی عەلی كوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ پێ گەیشتووە.

**١٤٠١- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ لَمْ يَكُنْ يُضَحِّي عَمَّا فِي بَطْنِ الْمَرْأَةِ[٥].**

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ قوربانی نەدەكرد بۆ ئەو منداڵەی لەناو سكی ئافرەتدایە.

**١٤٠٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الضَّحِيَّةُ سُنَّةٌ، وَلَيْسَتْ بِوَاجِبَةٍ، وَلاَ أُحِبُّ لأَحَدٍ مِمَّنْ قَوِيَ عَلَى ثَمَنِهَا أَنْ يَتْرُكَهَا.**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: قوربانیكردن سوننەتە و واجب نییە، پێشم خۆش نییە و چاك نییە بۆ هەر كەسێك توانای دارایی قوربانیكردنی هەبێت و نەیكات.

---

(١) ـ الضَّحِيَّةُ عَماَّ فِي بَطْنِ الْمَرْأَةِ وَذِكْرُ أَيَّامِ الأَضْحَى.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٨؛ وفي: ٢١٣٨؛ والجامع لابن زياد: ١٧ في الضحايا، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی ڕۆژی قوربان و سێ ڕۆژەكانی تەشریق گشتی دروستن قوربانیان تێدا بكرێت، بە بەڵگەی فەرموودەیەك كە ئیبن حیبان ڕیوایەتی كردووە.

(٤) ـ موقوف ضعيف.

(٥) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٣٩؛ والشيباني: ٦٣٢ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.



# پەرتووكی

# سەربڕین و كوشتنەوەكان[1]



---

(١) ـ كِتَابُ الذَّبَائِحِ.




## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی «بسم الله»کردن لەسەر ئاژەڵ و باڵندەی سەربڕاو(١)

١٤٠٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ يَأْتُونَنَا بِلُحْمَانٍ وَلاَ نَدْرِي هَلْ سَمَّوُا اللهَ عَلَيْهَا أَمْ لاَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: سَمُّوا اللهَ عَلَيْهَا، ثُمَّ كُلُوهَا(٢).

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا و پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکانێك لە ڕەشماڵنشینان زۆر گۆشتمان بۆ دەهێنن و نازانین کە ئاخۆ ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بێنن، دواتر بیخۆن.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە لە سەرەتای ئیسلامەتیدا بوو(٣).

١٤٠٤- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ الْمَخْزُومِيَّ ﵀ أَمَرَ غُلاَمًا لَهُ أَنْ يَذْبَحَ ذَبِيحَةً، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَذْبَحَهَا، قَالَ لَهُ: سَمِّ اللهَ، فَقَالَ لَهُ الْغُلاَمُ: قَدْ سَمَّيْتُ،

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي التَّسْمِيَةِ عَلَى الذَّبِيحَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤١؛ والشيباني، ٦٥٧ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٥١ في ذكاة الجنين، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: ئیبن عەبدول بەڕ ﵀ دەڵێت: ئەو قەولەی ئیمامی مالیك ﵀ لاوازە کە دەڵێت: ئەوە لە سەرەتای ئیسلامەتیدا بووە، چونکە ئەوە دەگەیەنێت ئەم فەرموودە پێش ئایەتی: [وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ] گوترابێت، کەچی ئەم ئایەتە بەکۆدەنگی زانایان لە مەککە دابەزیوە و ئەم فەرموودەیەش لە مەدینە گوتراوە، وە فەرموودەکەش مەبەستی ئەوە نییە ئەگەر «بسم الله» لەسەر ئاژەڵ و باڵندە نەکرێت دواتر «بسم الله» لەسەر گۆشتەکە بکرێت دروست بێت و بەربکەوێت، نەخێر، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە: گومان بۆ خۆتان دروست مەکەن، مادەم ئەوانەی گۆشتتان بۆ دێنن مسوڵمانن دەبێ گومانی چاك بە مسوڵمان ببردرێت و وا حیساب بکەن «بسم الله»ی لەسەر کراوە، ئێوەش بۆ بەرەکەت بۆ خۆتان «بسم الله»ی لەسەر بکەن.

فَقَالَ لَهُ: سَمِّ اللهَ وَيْحَكَ، قَالَ لَهُ: قَدْ سَمَّيْتُ اللهَ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَيَّاشٍ ﷺ: وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُهَا أَبَدًا[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشی کوڕی ڕەبیعەی مەخزومی ﷺ فەرمانی بە خزمەتکارێکی خۆی کرد ئاژەڵێکی بۆ سەر ببڕێت، جا کاتێ ویستی سەری ببڕێت، عەبدوڵڵا ﷺ پێی گوت: ناوی خوا بێنە، خزمەتکارەکەش پێی گوت: هێناومە، ئەویش پێی گوت: ناوی خوا بێنە هاوار بۆ تۆ، ئەویش پێی گوت: ناوی خوام هێناوە و (سەری بڕی)، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەیاش ﷺ پێی گوت: سوێند بە خوا هەرگیز نایخۆم (واتە لەبەر عینادییەکەی گومانی برد «بسم الله»ی نەکردبێ و متمانەی پێ نەبوو).

## ٢- ئەوەی لە حاڵەتی ناچاریدا دروستە لە کوشتنەوەدا[٢]

**١٤٠٥**- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ مِنْ بَنِي حَارِثَةَ كَانَ يَرْعَى لِقْحَةً لَهُ بِأُحُدٍ، فَأَصَابَهَا الْمَوْتُ، فَذَكَّاهَا بِشِظَاظٍ، فَسُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: لَيْسَ بِهَا بَأْسٌ، فَكُلُوهَا[٣].

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێکی ئەنصاری لە بەنو حاریسە وشترێکی شیرداری هەبوو لەلای کێوی ئوحود دەیلەوەڕاند، جا (بە هەر هۆکارێك بێت) هاتە سەر مردن و خەریك بوو مردار بێتەوە، خاوەنەکەشی بە پارچەدارێکی سەرتیژ سەری بڕی، جا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی ئەوە (کە ئاخۆ سەربڕین بە داری تیژ دروستە)؟ ئەویش فەرمووی: هیچ کێشەی تیا نییە، بیخۆن.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٣؛ والجامع لابن زياد: ١٥٧ في الذبائح، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ الذَّكَاةِ فِي حَالِ الضَّرُورَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٦؛ والشيباني: ٦٤٠ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

١٤٠٦- عَنْ مُعَاذِ بْنِ سَعْدٍ، أَوْ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ ﷺ، أَنَّ جَارِيَةً لِكَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ كَانَتْ تَرْعَى غَنَمًا لَهَا بِسَلْعٍ، فَأُصِيبَتْ شَاةٌ مِنْهَا، فَأَدْرَكَتْهَا، فَذَكَّتْهَا بِحَجَرٍ، فَسُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهَا، فَكُلُوهَا[١].

واتە: لە موعازی کوڕی سەعدەوە یان لە سەعدی کوڕی موعازەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێکی خزمەتکاری کەعبی کوڕی مالیك ﷺ هەبوو، شوانەتی بزن و مەڕەکانی خۆی دەکرد لە چیای سەلع (لە مەدینە)، جا بزنێك تووشی شکست بوو (خەریك بوو مردار بێتەوە)، ئەویش گەیشتە سەری و بە بەردێك سەری بڕی، جا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی ئەوە؟ ئەویش فەرمووی: هیچ کێشەی تیا نیە، بیخۆن.

١٤٠٧- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ ذَبَائِحِ نَصَارَى الْعَرَبِ؟ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهَا، وَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ﴿٥١﴾﴾ المائدة[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی کوژراوەی دەستی عەرەبەگاورەکان (کە ئاخۆ دروستە بخورێن)؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەی تیا نییە، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ﴿٥١﴾﴾ المائدة، (واتە: ئەو کەسەش پشت بەوان ببەستێت هەر لەوانە)، (مەبەستی ئەوە بوو: ئەگەرچی کوژراوەکانیان دروستە بخورێن، بەڵام دروست نییە پشتیان پێ ببەسترێت و بکرێن بە سەربڕ و کاروباری خۆتانیان بدەنە دەست، پارێزتان هەبێ لەو بابەتە).

١٤٠٨- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَا فَرَى الأَوْدَاجَ فَكُلُوهُ[٣].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٧؛ والشيباني: ٦٤١ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والبخاري: ٥٥٠٥؛ والجامع لابن زياد: ٤٥ في الذكاة؛ والقابسي: ٢٦٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٠؛ والشيباني: ٦٥٤ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٦٩ في ذبح أهل الكتاب، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٨؛ والجامع لابن زياد: ٤٧ في الذكاة، عن مالك به.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەیگوت: هەر شتێك شادەمارەکانی خوێن ببڕێت لە ملدا ئەوە بیخۆن.

**١٤٠٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا ذُبِحَ بِهِ إِذَا بَضَعَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ إِذَا اضْطُرِرْتَ إِلَيْهِ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەیگوت: هەر شتێك سەربڕینی پێ ئەنجام درا ئەگەر گەروو و دەمارەکانی بڕی، ئەوە هیچ کێشەی نییە ئەگەر بەناچاری پێویستت پێی بوو (ئەگەر ناچاریش نەبووی ئەوە وا سوننەتە بە ئاسنێکی تیژ سەری ببڕیت: وەك چەقۆ، خەنجەر، شمشێر، ... هتد).

## ٣- ئەوەی لە کوژراوەدا مەکرووهە دەربارەی کوشتنەوە[2]

**١٤١٠-** عَنْ أَبِي مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ شَاةٍ ذُبِحَتْ، فَتَحَرَّكَ بَعْضُهَا، فَأَمَرَهُ أَنْ يَأْكُلَهَا، ثُمَّ سَأَلَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ الْمَيْتَةَ لَتَتَحَرَّكُ، وَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ[3].

واتە: لە ئەبو مورەی خزمەتکاری عەقیلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئەبو هورەیرە ﷺ کردووە دەربارەی بزنێك کە سەر بڕاوە و قاچی جوڵاوە (کە ئاخۆ دەخورێ)؟ ئەویش فەرمانی پێ کردووە بیخوات، دواتر پرسیاری لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ کردووە، ئەویش گوتوویەتی: ئاژەڵی مردارەوەبووش (تۆزێك) دەجوڵێ (بەهۆی تەواو نەمردنی دەمارەکانی)، وە نەهی کرد لە خواردنی.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٩؛ والشيباني: ٦٤٢ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٤٨ في الذكاة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنَ الذَّبِيحَةِ فِي الذَّكَاةِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٦؛ والشيباني: ٦٥٦ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٥٣ في ذكاة الجنين، كلهم عن مالك به.

**١٤١١- [فتوى]** وَسُئِلَ مالِكٌ ﷺ عَنْ شَاةٍ تَرَدَّتْ فَكُسِرَتْ، فَأَدْرَكَهَا صَاحِبُهَا فَذَبَحَهَا، فَسَالَ الدَّمُ مِنْهَا وَلَمْ تَتَحَرَّكْ، فَقَالَ مالِكٍ ﷺ: إِنْ كَانَ ذَبَحَهَا وَنَفَسُهَا يَجْرِي وَهِيَ تَطْرِفُ، فَلْيَأْكُلْهَا[١].

(فەتوا): واتە: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ كرا دەربارەی ئاژەڵێك كە لە بەرزایی دەكەوێتە خوارەوە و شوێنێكی دەشكێ، جا خاوەنەكەی دەگاتە سەری و سەری دەبڕێ و (ملی) خوێنی لەبەر دەڕوات بەڵام ناجوڵێت؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەگەر سەری بڕی و خوێنی لەبەر دەڕۆیشت لە كاتێكدا چاوەكانی دەجوڵا، ئەوە با بیخوات (چونكە چاوجوڵانەكە نیشانەی مانی گیانە تیایدا).

## ٤- كوشتنەوەی ئەو بێچووەی لەناو سكی ئاژەڵی كوژراوەدایە[٢]

**١٤١٢-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا نُحِرَتِ النَّاقَةُ، فَذَكَاةُ مَا فِي بَطْنِهَا ذَكَاتُهَا، إِذَا كَانَ قَدْ تَمَّ خَلْقُهُ، وَنَبَتَ شَعَرُهُ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ بَطْنِ أُمِّهِ ذُبِحَ، حَتَّى يَخْرُجَ الدَّمُ مِنْ جَوْفِهِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر وشتر سەر بڕا، ئەوە كوشتنەوەی بێچووەكەی ناو سكی بریتییە لە كوشتنەوەی دایكی، ئەگەر بەتەواوی وێنەی دروست ببوو و مووی لێ ڕوابوو، جا ئەگەر (دوای سەربڕینی دایكی) لە سكی دایكی (بەمردوویی) هاتە دەرەوە، ئەوە دەكوژرێتەوە تاوەكوو خوێنی ناوەوەی بێتە دەرەوە (ئەگەرچی بۆ مەسەلەی دروستی هەر دروستە بخورێ بەبێ كوشتنەوە، چونكە دایكی كوژراوەتەوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٧؛ والجامع لابن زياد: ٥٦ في ذكاة الجنين، عن مالك به.

(٢) ـ ذَكَاةُ مَا فِي بَطْنِ الذَّبِيحَةِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٤؛ والشيباني: ٦٥١ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٤٩ في ذكاة الجنين، كلهم عن مالك به.

**١٤١٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: ذَكَاةُ مَا فِي بَطْنِ الذَّبِيحَةِ فِي ذَكَاةِ أُمِّهِ، إِذَا كَانَ قَدْ تَمَّ خَلْقُهُ وَنَبَتَ شَعَرُهُ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: کوشتنەوەی بێچووی ناو سکی ئاژەڵی کوژراوە لەگەڵ کوشتنەوەی دایکیەتی، ئەگەر بەتەواوی وێنەی دروست ببوو و مووی لێ ڕوابوو.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٤٥؛ والشيباني: ٦٥٢ في الضحايا وما يجزئ منها، عن مالك به.

## ١- وازهێنان لە خواردنی ئەو نێچیرانەی شتی پان یان بەرد دەیانکوژێ (کە شتەکە تیژ نەبێ)[١]

١٤١٤- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: رَمَيْتُ طَائِرَيْنِ بِحَجَرٍ، وَأَنَا بِالْجُرْفِ، فَأَصَبْتُهُمَا، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَمَاتَ، فَطَرَحَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄، وَأَمَّا الآخَرُ، فَذَهَبَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄ يُذَكِّيهِ بِقَدُومٍ، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُذَكِّيَهُ، فَطَرَحَهُ عَبْدُ اللهِ ﵁ أَيْضًا[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: بەردێکم لە دوو باڵندە گرت لە کاتێکدا لە جوڕف بووم (کە شوێنێکە لە مەدینە)، جا هەردووکیانم پێکا، یەکێکیان مرد و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ فڕێی دا، هەرچی ئەوەی دیکەیان بوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ چوو بە تەور سەری ببڕێت، جا ئەویش مرد پێش ئەوەی سەری ببڕێت، جا عەبدوڵڵا ﵁ ئەویشی فڕێدا، (چونکە بە بەرد پێکرابوون، بەردیش تیژ نییە).

١٤١٥- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ كَانَ يَكْرَهُ مَا قَتَلَ الْمِعْرَاضُ وَالْبُنْدُقَةُ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد ﵀ نەهی دەکرد لە خواردنی ئەو گیاندار و پەلەوەرەی شتی پان و خڕ دەیکوژێت (وەك دار و ئاسن بە باری پانییەوە و بەرد و کەلا و ... هتد).

١٤١٦- أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ تُقْتَلَ الإِنْسِيَّةُ، بِمَا يُقْتَلُ بِهِ الصَّيْدُ مِنَ الرَّمْيِ وَأَشْبَاهِهِ[٤].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀ نەهی کردووە لەوەی ئاژەڵی ماڵی بە هەمان ئەو شتانە بکوژرێت کە نێچیری (کێوی) پێ دەکوژرێت، لە تیرتێگرتن و هاووێنەکانی (کاتێك وەکوو ئاژەڵی کێوی لە دەستتان ڕادەکات).

---

(١) ـ تَرْكُ أَكْلِ مَا قَتَلَ الْمِعْرَاضُ وَالْحَجَرُ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٨؛ والشيباني: ٦٥٥ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ١٣٦ في الصيد، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٩، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٠، عن مالك به.

١٤١٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ أَرَى بَأْسًا بِمَا أَصَابَ الْمِعْرَاضُ إِذَا خَسَقَ، وَبَلَغَ الْمَقَاتِلَ أَنْ يُؤْكَلَ[١]، قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيْءٖ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ ﴿٩٤﴾ ﴾المائدة، قَالَ: فَكُلُّ شَيْءٍ يَنَالُهُ الإِنْسَانُ بِيَدِهِ أَوْ بِرُمْحِهِ أَوْ بِشَيْءٍ مِنْ سِلاَحِهِ، فَأَنْفَذَهُ وَبَلَغَ مَقَاتِلَهُ، فَهُوَ صَيْدٌ كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: من هیچ كێشە نابینم لەوەی ئەو ئاژەڵە بخورێت كە تیر و ڕمی پان دەیپێكن ئەگەر تێیدا بچەقێت و بچێتە ژوورەوە و بگاتە شوێنی كوشندە، خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيْءٖ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ ﴿٩٤﴾ ﴾ المائدة، (واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە خوای پەروەردگار تاقیتان دەكاتەوە بە شتانێكی كەم لە نێچیر كە دەست و چەكەكانتان پێیان دەگات)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كەواتە گشت شتێك مرۆڤ بە دەستی بێنێت بە گرتن بە دەستی یان بە ڕمەكەی یان بە شتێك لە چەكەكەی و بچێتە ژوورەوە و بگاتە شوێنی كوشندە، ئەوە نێچیرە (واتە حەڵاڵە) وەك خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی.

١٤١٨- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: إِذَا أَصَابَ الرَّجُلُ الصَّيْدَ، فَأَعَانَهُ عَلَيْهِ غَيْرُهُ مِنْ مَاءٍ أَوْ كَلْبٍ غَيْرِ مُعَلَّمٍ، لَمْ يُؤْكَلْ ذَلِكَ الصَّيْدُ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ سَهْمُ الرَّامِي قَدْ قَتَلَهُ، أَوْ بَلَغَ مَقَاتِلَ الصَّيْدِ حَتَّى لاَ يَشُكَّ أَحَدٌ فِي أَنَّهُ هُوَ قَتَلَهُ، وَأَنَّهُ لاَ يَكُونُ لِلصَّيْدِ حَيَاةٌ بَعْدَهُ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە زانایان بووە دەیانگوت: ئەگەر مرۆڤ نێچیری پێكا، جا شتێكی دیكە (بۆ كوشتنەكە) بووە یارمەتیدەری وەك ئاو (بەوەی گاندارەكە دوای پێكانی بكەوێتە ناو ئاو)، یان سەگی فێرنەكراو (دوای پێكانی بچێت بەتەواوی بیكوژێت)، ئەوە ئەو نێچیرە ناخورێت، تەنها لەو كاتە نەبێت كە تیری كەسەكە كوشتبێتی (پێش كەوتنە ناو ئاوەكە و پێش گرتنی سەگەكە)، یان تیرەكە گەیشتبێتە شوێنی كوشندە كە كەس گومانی نەبێت تیرەكە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٦؛ والجامع لابن زياد: ١٣٣ في الصيد، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٣؛ والجامع لابن زياد: ١٣٥ في الصيد، عن مالك به.




کوشتوویەتی و (بەوجۆرە لێدانە) نێچیر گیانی لەبەردا نامێنێت دوای پێکانی ئەو شوێنە (ئەوە لەو حاڵەتانەدا دەخورێت، ئەگەرچی ئاو و سەگی فێرنەکراویش بێنە ناو بابەتەکە).

١٤١٩- قَالَ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: لاَ بَأْسَ بِأَكْلِ الصَّيْدِ وَإِنْ غَابَ عَنْكَ مَصْرَعُهُ، إِذَا وَجَدْتَ بِهِ أَثَرًا مِنْ كَلْبِكَ، أَوْ كَانَ بِهِ سَهْمُكَ، مَا لَمْ يَبِتْ، فَإِذَا بَاتَ، فَإِنَّهُ يُكْرَهُ أَكْلُهُ(١).

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: کێشەی تیا نییە خواردنی نێچیرێك هەر چەندە مردنەکەیت لێ ون بووبێ (واتە ئەگەر دوای پێکانی بە چاوی خۆت نەبینی کە دەمرێت)، (بە مەرجێك) ئەگەر شوێنەواری سەگەکەتت پێوە بینی، یان تیرەکەتی پێوە بوو (لەو حاڵەتانەدا حەڵاڵە)، مادەم شەو نەمابێتەوە، (بەڵام ئەگەر شەو مایەوە) ئەو کات خواردنی ناپەسەندە (چونکە ڕەنگە گۆڕانێکی خراپی بەسەر هاتبێت، وەك ئەوەی مارێك ژەهری تێ کردبێت یان هەر شتێکی دیکە کە دەکرێ ڕوویدات لەو ماوە زۆرەدا).

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕاوی شتە فێرکراوەکان (سەگ و تاژی و هەڵۆ و ...)(٢)

١٤٢٠- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي الْكَلْبِ الْمُعَلَّمِ: كُلْ مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ إِنْ قَتَلَ، وَإِنْ لَمْ يَقْتُلْ(٣).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی سەگی فێرکراو دەیگوت: ئەوەی بۆت دەگرێت بیخۆ، بیکوژێت یان نەیکوژێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٥؛ والجامع لابن زياد: ١٣١ في الصيد، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ الْمُعَلَّمَاتِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٠؛ والشيباني: ٦٥٨ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ١٢٤ في الصيد، كلهم عن مالك به.

**١٤٢١-** قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭭ: وَإِنْ أَكَلَ، وَإِنْ لَمْ يَأْكُلْ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﭭ گوتوویەتی: (خواردنی نێچیری سەگی فێرکراو دروستە) جا لێی بخوات یان لێی نەخوات[٢].

**١٤٢٢-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﮃ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْكَلْبِ الْمُعَلَّمِ إِذَا قَتَلَ الصَّيْدَ؟ فَقَالَ سَعْدٌ ﮃ: كُلْ وَإِنْ لَمْ تَبْقَ إِلاَّ بَضْعَةٌ وَاحِدَةٌ[٣].

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ﮃ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی سەگی فێرکراو کاتێ نێچیرەکە دەکوژێت؟ سەعدیش ﮃ گوتی: بیخۆ ئەگەر هیچیشی نەهێشتبۆیەوە تەنها یەك پارچە نەبێ.

**١٤٢٣- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﭬ: أَنَّهُ سَمِعَ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ فِي الْبَازِي، وَالْعُقَابِ، وَالصَّقْرِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ: أَنَّهُ إِذَا كَانَ مُعَلَّمًا يَفْقَهُ كَمَا تَفْقَهُ الْكِلاَبُ الْمُعَلَّمَةُ، فَلاَ بَأْسَ بِأَكْلِ مَا قَتَلَتْ مِمَّا صَادَتْ، إِذَا ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَى إِرْسَالِهَا[٤].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە گوێی لە هەندێك زانایان بووە دەربارەی هەڵۆ و باشوکە و هاوشێوەکانیان (کە باڵندەن و ڕاویان پێ ئەنجام دەدرێت) دەیانگوت: ئەگەر (باڵندەکە) فێرکراو بوو و تێ دەگەیشت وەك چۆن سەگ تێ دەگات، ئەوە خواردنی ئەو نێچیرەی ئەوان ڕاوی دەکەن و دەیکوژن هیچ کێشەی تیا نییە، (بە مەرجێك) ئەگەر ناوی خوا بهێنرێت لە کاتی ناردن و بەڕەڵاکردنیان بۆ ڕاو.

**١٤٢٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﭬ: وَأَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الَّذِي يَتَخَلَّصُ الصَّيْدَ مِنْ مَخَالِبِ الْبَازِي، أَوْ مِن فِي الْكَلْبِ، ثُمَّ يَتَرَبَّصُ بِهِ فَيَمُوتُ، أَنَّهُ لاَ يَحِلُّ أَكْلُهُ.

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لە قەولی جەدیدی ئیمامی شافیعی ناخورێت، لەبەر فەرموودەی عەدی کە لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ئەگەر لێی خوارد مەیخۆ.

(٣) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٢؛ والجامع لابن زياد: ١٢٥ في الصيد، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٤؛ والجامع لابن زياد: ١٣٢ في الصيد، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ كُلُّ مَا قُدِرَ عَلَى ذَبْحِهِ وَهُوَ فِي مَخَالِبِ الْبَازِي، أَوْ فِي فِي الْكَلْبِ، فَيَتْرُكُهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى ذَبْحِهِ، حَتَّى يَقْتُلَهُ الْبَازِي، أَوِ الْكَلْبُ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ أَكْلُهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: چاکترینی ئەوەی گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو کەسەی نێچیر لە چنگی هەڵۆ یان لە دەمی سەگ دەردێنێت، دواتر چاوەڕێی دەکات و دەمرێت (واتە هەندێك دەمێنێتەوە بەئەندازەیەك بتوانێت لەو کاتەدا بیکوژێتەوە، کەچی نایکوژێتەوە و دەمرێت)، ئەوە خواردنی حەڵاڵ نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە هەر شتێك بتوانرێت بکوژرێتەوە لە کاتێکدا لەناو چڕنوکی هەڵۆدا بێت یان لە دەمی سەگدا بێت، جا خاوەنەکەی وازی لێ بێنێت لە کاتێکدا دەتوانێت بیکوژێتەوە (کەچی نەیکوژێتەوە) تا هەڵۆیەکە یان سەگەکە دەیکوژێت، ئەوە خواردنی حەڵاڵ نییە.

**١٤٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ أَيْضًا الَّذِي يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَنَالُهُ وَهُوَ حَيٌّ، فَيُفَرِّطُ فِي ذَبْحِهِ حَتَّى يَمُوتَ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ أَكْلُهُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە ئەو کەسەی نێچیر دەپێکێ و دەیگرێت و دەکەوێتە ناو دەستی (و هێشتا زیندووە)، جا کەمتەرخەمی بکات لە زوو سەربڕینی تا دەمرێت، ئەوەش خواردنی حەڵاڵ نییە[٣].

**١٤٢٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا أَرْسَلَ كَلْبَ الْمَجُوسِيِّ الضَّارِيَ، فَصَادَ أَوْ قَتَلَ، إِنَّهُ إِذَا كَانَ مُعَلَّمًا فَأَكْلُ ذَلِكَ الصَّيْدِ حَلاَلٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ لَمْ يُذَكِّهِ الْمُسْلِمُ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ مَثَلُ الْمُسْلِمِ يَذْبَحُ بِشَفْرَةِ الْمَجُوسِيِّ، أَوْ يَرْمِي بِقَوْسِهِ، أَوْ بِنَبْلِهِ، فَيَقْتُلُ بِهَا، فَصَيْدُهُ ذَلِكَ وَذَبِيحَتُهُ حَلاَلٌ، لاَ بَأْسَ بِأَكْلِهِ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٧؛ والجامع لابن زياد: ١٢٦ في الصيد، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه الجامع لابن زياد: ١٢٨ في الصيد، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: واتە حەڵاڵی نێچیر و خواردنی کاتێك سەگی ڕاو یان باز ڕاوی دەکات و دەمرێت یان بە تیر لێی دەدرێت و دەمرێت و پێ ڕاناگات سەری ببڕێت ئەوە بۆ حاڵەتی ناچارییە دەنا لە حاڵەتی ئاساییدا دروست نییە کەمتەرخەمی بکرێت لە سەربڕینی نێچیری سەگ و باز و تیر.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٥٩، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا أَرْسَلَ الْمَجُوسِيُّ كَلْبَ الْمُسْلِمِ الضَّارِيَ عَلَى صَيْدٍ، فَأَخَذَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يُؤْكَلُ ذَلِكَ الصَّيْدُ إِلاَّ أَنْ يُذَكَّى، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ مَثَلُ قَوْسِ الْمُسْلِمِ، وَنَبْلِهِ، يَأْخُذُهَا الْمَجُوسِيُّ فَيَرْمِي بِهَا الصَّيْدَ فَيَقْتُلُهُ، وَبِمَنْزِلَةِ شَفْرَةِ الْمُسْلِمِ، يَذْبَحُ بِهَا الْمَجُوسِيُّ، فَلاَ يَحِلُّ أَكْلُ شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی كۆدەنگی لە سەرە لەلای ئێمە ئەوەیە: ئەگەر مسوڵمان سەگێكی ڕاوكەری (بۆ گرتنی نێچیر) ڕەوانە كرد كە هی كەسێكی مەجوسی بوو، جا گرتی یان كوشتی، ئەوە (فەتوایەكە ئاوایە): ئەگەر فێركراو و ڕاهێنراو بوو، ئەوە خواردنی ئەو نێچیرە حەڵاڵە، كێشەی تیا نییە (پەیوەندی بە مەجوسییەتی خاوەنەكەیەوە نییە)، ئەگەرچی مسوڵمانەكە سەریشی نەبڕێ، چونكە ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە مسوڵمان بە چەقۆی كەسی مەجوسی ئاژەڵ سەر ببڕێت یان بە كەوانی ئەو یان بە تیری ئەو بیپێكێت و بیكوژێت، ئەو ڕاوكردن و كوشتنەوەیە حەڵاڵە و كێشە لە خواردنیدا نییە (ئەوەش بە هەمان شێوەیە سەگەكە تەنها ئالەتێكە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر كەسی مەجوسی سەگی ڕاهێنراوی كەسی مسوڵمانی نارد بۆ نێچیر و گرتی، ئەوە ئەو نێچیرە ناخورێ (واتە كەسی مسوڵمان بۆی دروست نییە بیخوات) تەنها لەو كاتە نەبێ ئەگەر مسوڵمانەكە خۆی سەری ببڕێت، چونكە نموونەی ئەو بابەتە وەك نموونەی كەوان و تیری مسوڵمان وایە كە مەجوسی وەریدەگرێت و دەیهاوێژێتە نێچیر و دەیكوژێت، هەروەها وەك چەقۆی مسوڵمان وایە كە مەجوسی ئاژەڵ و نێچیری پێ سەر ببڕێت، جا خواردنی هیچێك لەمانە حەڵاڵ نییە (چونكە كەسەكە و نییەتی كەسەكە گرنگە و حەڵاڵ و حەرامی پێ دەگۆڕێت، نەك كەرەستەی كەسەكە).

---

(١) ـ أخرجه الجامع لابن زياد: ١٣٨ في الصيد، عن مالك به.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی نێچیری دەریا[١]

١٤٢٧- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، سَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ عَمَّا لَفَظَ الْبَحْرُ، فَنَهَاهُ عَنْ أَكْلِهِ.

قَالَ نَافِعٌ ﷺ، ثُمَّ انْقَلَبَ عَبْدُ اللهِ ﷺ فَدَعَا بِالْمُصْحَفِ، فَقَرَأَ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ ﴿٩٦﴾ المائدة، قَالَ نَافِعٌ: فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِأَكْلِهِ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو هورەیرە ﷺ پرسیاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی ئەو ئاژەڵە مردووانەی دەریا دەیانخاتە دەرەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ نەهی لە خواردنی کرد.

نافیع ﷺ دەڵێت: دواتر عەبدوڵڵا ﷺ گەڕایەوە و داوای قورئانی کرد و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ ﴿٩٦﴾ المائدة، (واتە: نێچیر و خواردەمەنییەکانی دەریا حەڵاڵ کراوە بۆتان) نافع ﷺ دەڵێ: جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ منی بەدوای عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو هورەیرەدا ﷺ ڕەوانە کرد (تا پێی بڵێم): خواردنی هیچ کێشەی تیا نییە (عەبدوڵڵا هەڵە بووە).

١٤٢٨- عَنْ سَعْدٍ الْجَارِيِّ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ عَنِ الْحِيتَانِ يَقْتُلُ بَعْضُهَا بَعْضًا، أَوْ تَمُوتُ صَرَدًا؟ فَقَالَ لَيْسَ بِهَا بَأْسٌ، قَالَ سَعْدٌ: ثُمَّ سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي صَيْدِ الْبَحْرِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦١؛ والحدثاني: ٤١١ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٤٩ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ١١٦ في صيد البحر، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٠؛ والحدثاني: ٤١١أ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٥٠ في الضحايا وما يجزئ منها؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٩٧٦٥؛ والجامع لابن زياد: ١١٣ في صيد البحر، كلهم عن مالك به.



واتە: لە سەعدی جاری خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ کرد دەربارەی ماسی کاتێ هەندێکیان هەندێکی دیکە دەکوژن یان لە سارديیان دەمرن و دەیانبەستێت (ئایا دروستە بخورێت)؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەی تیا نییە (حەڵاڵە)، سەعد دەڵێ: دواتر پرسیارم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ کرد، ئەویش هەمان شتی گوت.

**١٤٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُمَا كَانَا لاَ يَرَيَانِ بِمَا لَفَظَ الْبَحْرُ بَأْسًا[1].

واتە: ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پێیان وا نەبووە خواردنی ئەو ئاژەڵانەی دەریا فڕێیان دەداتە دەرەوە هیچ کێشەیەکی هەبێت.

**١٤٣٠-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الْجَارِ قَدِمُوا، فَسَأَلُوا مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ عَمَّا لَفَظَ الْبَحْرُ؟ فَقَالَ: لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ، وَقَالَ: اذْهَبُوا إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، فَاسْأَلُوهُمَا عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ ائْتُونِي، فَأَخْبِرُونِي مَاذَا يَقُولاَنِ؟ فَأَتَوْهُمَا، فَسَأَلُوهُمَا، فَقَالاَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، فَأَتَوْا مَرْوَانَ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ مَرْوَانُ: قَدْ قُلْتُ لَكُمْ[2].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): هەندێك لە خەڵکی جار (کە ناوچەیەکی نزیك مەدینەیە) هاتن و پرسیاریان لە مەڕوانی کوڕی حەکەم کرد دەربارەی ئەو ماسی و ئاژەڵانەی دەریا فڕێیان دەداتە دەرەوە دوای مردنیان؟ ئەویش گوتی: هیچ کێشەی تیا نییە (حەڵاڵە و دەخورێن)، هەروەها گوتیشی بڕۆن بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت و ئەبو هورەیرە ﷺ و پرسیاریان لێ بکەن دەربارەی ئەو بابەتە و دواتر وەرنەوە بۆ لام و هەواڵم پێ بدەن بەوەی گوتوویانە، جا ئەوانیش چوون بۆ لای هەردووکیان و پرسیاریان لێ کردن: جا هەردووکیان گوتیان: هیچ کێشەی تیا نییە، ئینجا هاتنەوە بۆ لای مەڕوان و هەواڵەکەیان پێ دا، مەڕوانیش گوتی: پێم گوتن ئاوایە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه الحدثاني: ٤١٢ في الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ١١٥ في صيد البحر، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٢؛ والحدثاني: ٤١٢أفي الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ١١٧ في صيد البحر، كلهم عن مالك به.

**١٤٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لاَ بَأْسَ بِأَكْلِ الْحِيتَانِ يَصِيدُهَا الْمَجُوسِيُّ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ فِي الْبَحْرِ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: خواردنی ماسی کە مەجوسی ڕاوی بکات هیچ کێشەی تیا نییە و حەڵاڵە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەریا فەرموویەتی: ئاوەکەی پاك و پاککەرەوەیە و مردارەوەبووەکەشی دەخورێ (کەواتە کە بەمردوویی بخورێ گرنگ نییە کێ بەزیندوویی دەیگرێت).

**١٤٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَإِذَا أُكِلَ ذَلِكَ مَيْتًا، فَلاَ يَضُرُّهُ مَنْ صَادَهُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: کەواتە مادەم (ماسی) بەمردوویی بخورێت، ئەوە ئەو کەسەی ڕاوی دەکات زیان بە حەڵاڵ و حەڕامی ناگەیەنێت.

## ٤- حەڕامییەتی خواردنی گشت ئاژەڵێکی کەڵبەدار[٢]

**١٤٣٣-** عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَكْلُ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ حَرَامٌ[٣].

واتە: لە ئەبو سەعلەبەی خوشەنییەوە ﵁ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردنی گشت ئاژەڵێکی کەڵبەدار (ی بەهێز کە هێرشی پێ بکات بۆ سەر گیانداری دیکە) حەڕامە[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٦٣؛ وفي: ٢١٦٤؛ والحدثاني: ٤١٢ب في الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ١١٨ في صيد البحر، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تَحْرِيمُ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ.

(٣) ـ شاذ بهذا اللفظ. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٥؛ وفي: ٢١٧٦؛ والحدثاني: ٤١٣ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٤٣ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١٧٤٨؛ والبخاري: ٥٥٣٠؛ وأبو داود: ٣٨٠٢؛ والترمذي: ١٤٧٧؛ وابن حبان: ٥٢٧٩؛ والدارمي: ١٩٨٠؛ والقابسي: ٧٦، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی ئەو جۆرە ئاژەڵە کەڵبەدارانە خواردنیان حەڕامە، کە کەڵبەکەیان بەهێز بێت و هێرشی پێ بکەنە سەر گیانداری دیکە، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە کەمتیار خواردنی حەڕام نییە و کەڵبەشی هەیە، بەڵام چونکە کەڵبەکانی هی ئەوە نین بەردەوام هێرشی پێ بکاتە سەر گیاندار و مرۆڤ، بۆیە حیسابی بۆ ناکرێت.

١٤٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَكْلُ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ حَرَامٌ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردنی گشت ئاژەڵێکی کەڵبەدار (ی بەهێز کە هێرشی پێ بکات بۆ سەر گیانداری دیکە) حەرامە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە فەتوا لەسەر ئەوەیە.

## ٥- ئەوەی خواردنی حەرامە لە ئاژەڵان[٢]

١٤٣٥- [فتوى] عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعَ فِي الْخَيْلِ، وَالْبِغَالِ، وَالْحَمِيرِ، أَنَّهَا لاَ تُؤْكَلُ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ: ﴿وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ﴿٨﴾﴾النحل، وَقَالَ تبارك وتعالى فِي الأَنْعَامِ: ﴿لِتَرْكَبُواْ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾﴾غافر، وَقَالَ ﷻ: ﴿لِّيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴿٣٤﴾﴾الحج، ﴿فَكُلُواْ مِنْهَا وَأَطْعِمُواْ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ﴿٣٦﴾﴾الحج[٣].

قَالَ: وَسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: إِنَّ الْبَائِسَ هُوَ الْفَقِيرُ، وَأَنَّ الْمُعْتَرَّ هُوَ الزَّائِرُ[٤].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَذَكَرَ اللهُ الْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِلرُّكُوبِ وَالزِّينَةِ، وَذَكَرَ الأَنْعَامَ لِلرُّكُوبِ وَالأَكْلِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْقَانِعُ، هُوَ الْفَقِيرُ أَيْضًا.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٥؛ والحدثاني: ٤١٣أ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٤٤ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والشافعي: ١١٧٦؛ وفي: ١٧٥٠؛ وابن حنبل: ٧٢٢٣؛ ومسلم: الصيد: ١٥؛ والنسائي: ٤٣٢٤؛ وابن ماجه: ٣٢٧٣؛ وابن حبان: ٥٢٧٨؛ والجامع لابن زياد: ٩٥ في أكل السباع والطير؛ والقابسي: ١١٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنْ أَكْلِ الدَّوَابِّ.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٢؛ وفي: ٢١٧٤؛ والحدثاني: ٤١٤ في الصيد والذبائح؛ وفي: ٤١٤أ في الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ١٠٤ في أكل الدواب، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٣٨٦؛ وفي: ٢١٧٣، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): چاكترینی ئەوەی گوێم لێ بووە دەربارەی ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ ئەوەیە: ناخورێن، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ ﴿٨﴾ ﴾النحل، (واتە: هەروەها جۆرەها جۆری هەسپ و هێستر و گوێدرێژی بۆ بەدیهێناون تا بۆ سواری و گواستنەوە بەكاری بهێنن، سەرەڕای جوانیش)، (باسی خواردنیانی نەكردووە)، وە خوای تبارك وتعالی دەربارەی چوار ئاژەڵەكە (واتە: وشتر و مانگا و مەڕ و بزن) فەرموویەتی: ﴿لِتَرۡكَبُواْ مِنۡهَا وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ غافر، (واتە: تا هەندێكی بۆ سواری بەكاربهێنن وە هەندێكیش بۆ خواردن)، وە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ ﴿٣٤﴾ ﴾الحج، (واتە: بۆ ئەوەی ناوی خوا بەرن لە كاتی سەربڕینی ئەو ڕۆزییەی خوا پێی بەخشیون لە ماڵاتەكاندا)، وە فەرموویەتی: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ ﴿٣٦﴾ ﴾الحج، (واتە: لێیان بخۆن و بەشی هەژاران و داواكارانیشی لێ بدەن).

یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: « الْبَائِس» ـ كە لە ئایەتەكەدا هاتووە ـ بریتییە لە هەژار، وە « الْمُعْتَرّ»یش بریتییە لە سەردانیكەر (واتە ئەو كەسەی دێتە ماڵەكەت بە نیازی نانخواردن و پێبەخشین).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار باسی ئەسپ هێسترو گوێدرێژی كردووە بۆ سواربوون و جوانی، وە باسی ئەنعامی كردووە (كە بریتین لە جۆرەكانی وشتر و مانگا و مەڕ و بزن) بۆ سواربوون و خواردن.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: «الْقَانِع»یش لە ئایەتەكەدا هەر بریتییە لە جۆرێكی دیكەی هەژار.

## ٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی پێستەی مردارەوەبوو[١]

**١٤٣٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِشَاةٍ مَيِّتَةٍ، كَانَ أَعْطَاهَا مَوْلًى لِمَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَفَلاَ انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا؟ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهَا مَيْتَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا حُرِّمَ أَكْلُهَا[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای بزنێکی مردارەوەبوودا تێپەڕی، کە (بەزیندوویی) خزمەتکارێك دابووی بە مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بۆچی سوودتان لە پێستەکەی وەرنەگرتووە؟ هاوەڵانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە مردارەوەبووە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: تەنها خواردنی حەڕام کراوە.

**١٤٣٧**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهَرَ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پێستە دەباغ کرا (واتە خۆشە کرا بە شتی تفت و تاری وەك مازوو و شتی دیکە)، ئەوە پاك بۆتەوە (دەتوانرێ بەکار بهێنرێت).

**١٤٣٨**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ أَنْ يُسْتَمْتَعَ بِجُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ[٤].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي جُلُودِ الْمَيْتَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٩؛ والحدثاني: ٤١٥ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٩٨٧ في العتاق؛ والشافعي: ١٧؛ وابن حنبل: ٣٠١٨؛ والنسائي: ٤٢٣٥؛ والقابسي: ٥٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٠؛ والحدثاني: ٤١٥أ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٩٨٥ في العتاق؛ والشافعي: ٢٠؛ وابن حبان: ١٢٨٧؛ والجامع لابن زياد: ٧٩ في الاستمتاع بجلود الميتة؛ والقابسي: ١٨٢، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨١؛ والحدثاني: ٤١٦ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٩٨٦ في العتاق؛ والشافعي: ٢١؛ وابن حنبل: ٢٤٤٩١، وفي: ٢٤٧٧٤، وفي: ٢٥١٩٨، وفي: ٢٥٢٣٧؛ والنسائي: ٤٢٥٢؛ وأبو داود: ٤١٢٤؛ وابن ماجه: ٣٦٥٦؛ وابن حبان: ١٢٨٦؛ والدارمي: ١٩٨٧؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٤٧٦٧؛

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە سوود وەربگیرێ لە پێستەی ئاژەڵی مردارەوەبوو ئەگەر دەباغ و خۆشە کرا.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی ناچار دەبێت یان ناچار دەکرێت بە خواردنی مردارەوەبوو[1]

**١٤٣٩- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﵀، أَنَّ أَحْسَنَ مَا سُمِعَ فِي الرَّجُلِ يُضْطَرُّ إِلَى الْمَيْتَةِ، أَنَّهُ يَأْكُلُ مِنْهَا، حَتَّى يَشْبَعَ وَيَتَزَوَّدُ مِنْهَا، فَإِنْ وَجَدَ عَنْهَا غِنًى طَرَحَهَا[2].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): چاکترینی ئەوەی گوتراوە دەربارەی ئەو کەسەی ناچار دەکرێت (یان ناچار دەبێت) بۆ خواردنی مردارەوەبوو، ئەوەیە: (دروست و حەڵاڵە) لێی بخوات، تاوەکوو تێر دەبێت و لێشی هەڵبگرێت (مادەم شتی دیکەی دەست نەکەوێت)، جا ئەگەر پێویستی پێ نەما و شتی دیکەی دەست کەوت فڕێی دەدات[3].

**١٤٤٠- [فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﵀ عَنِ الرَّجُلِ يُضْطَرُّ إِلَى الْمَيْتَةِ، أَيَأْكُلُ مِنْهَا، وَهُوَ يَجِدُ ثَمَرَ الْقَوْمِ، أَوْ زَرْعًا أَوْ غَنَمًا بِمَكَانِهِ ذَلِكَ؟ قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِنْ ظَنَّ أَنَّ أَهْلَ ذَلِكَ الثَّمَرِ أَوِ الزَّرْعِ أَوِ الْغَنَمِ يُصَدِّقُونَهُ بِضَرُورَتِهِ، حَتَّى لاَ يُعَدُّ سَارِقًا فَتُقْطَعَ يَدُهُ، رَأَيْتُ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ أَيِّ ذَلِكَ وَجَدَ مَا يَرُدُّ جُوعَهُ، وَلاَ يَحْمِلُ مِنْهُ شَيْئًا، وَذَلِكَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَأْكُلَ الْمَيْتَةَ، وَإِنْ هُوَ خَشِيَ أَنْ لاَ يُصَدِّقُوهُ، وَأَنْ يَعُدُّوهُ سَارِقًا بِمَا أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ، فَإِنَّ أَكْلَ الْمَيْتَةِ خَيْرٌ لَهُ عِنْدِي، وَلَهُ فِي أَكْلِ الْمَيْتَةِ عَلَى هَذَا الْوَجْهِ سَعَةٌ، مَعَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ يَعْدُوَ عَادٍ مِمَّنْ لَمْ يُضْطَرَّ إِلَى الْمَيْتَةِ يُرِيدُ اسْتِجَازَةَ أَخْذِ أَمْوَالِ النَّاسِ وَزُرُوعِهِمْ وَثِمَارِهِمْ بِذَلِكَ.

---

والجامع لابن زياد: ٧٨ في الاستمتاع بجلود الميتة؛ والقابسي: ٥١٧، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُضْطَرُّ إِلىَ أَكْلِ الْمَيْتَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٧؛ والحدثاني: ٤١٧ في الصيد والذبائح، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی دروستن نییە خۆی تێر بخوات، بەڵکوو دەبێ تەنها ئەوەندە بخوات کە ژیانی پارێزراو بێت.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[١].

(فەتوا): واتە: پرسیار لە ئیمامی مالیك ﷺ کرا دەربارەی ئەو کەسەی ناچار دەکرێ یان ناچار دەبێ بۆ خواردنی مردارەوەبوو، ئاخۆ دروستە لێی بخوات لە کاتێکدا میوە یان دانەوێڵە یان مەڕومالاتی خەڵکی دەست دەکەوێت لە ناوچەکەی خۆی (واتە ئایا لە حاڵەتی ناچاریدا بەبێ مۆڵەت شتی خەڵکی بخوات یان مردارەوەبوو بخوات)؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتی: ئەگەر گومانی زیاتر بوو لەوەی خاوەنی میوەکە یان دانەوێڵەکە یان ئاژەڵەکان باوەڕی پێ دەکەن کاتێ دەڵێت لەبەر ناچاری خواردوومە، بۆ ئەوەی بە دز ئەژمار نەکرێت و دەستی نەبڕدرێت، ئەوە پێم وایە (دروستە و) لە هەر کامێك لەوانە دەخوات ئەگەر دەستی کەوت کە برسییەتییەکەی لابەرێت، بەڵام هیچ شتێکی لێ هەڵناگرێت و نایبات، ئەوەم لەلا چاکترە لەوەی مردارەوەبوو بخوات، وە ئەگەر ترسا باوەڕی پێ نەکەن بەوەی ناچار بووە، وە ترسا بە دز دایبنێن لەوەی بردوویەتی، ئەوە (لەو حاڵەتەدا) لەلای من خواردنی مردارەوەبوو چاکترە، وە بۆ ئەو ڕێپێدان هەیە دەربارەی خواردنی مردارەوەبوو بەم شێوەیەی (لە ئایەتدا باس کراوە)، لەگەڵ ئەوەی دەترسم (لە بابەتی ڕێپێدانی خواردنی شتی خەڵکی بۆ ناچاری) دەستدرێژکەرێك لەوانەی ناچار نین دەستدرێژی بکات و مەبەستی ئەوە بێت بە هۆی ئەوەوە بردنی ماڵی خەڵکی بۆ خۆی ڕێ پێ بدات (بە بەهانەی ناچاری، کەچی واش نەبێت، بۆیە دڵم بە خواردنی مردارەوەبووەکە پەیوەستترە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٧٨؛ والحدثاني: ٤١٧أ في الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ٩١ في أكل المضطر الميتة، كلهم عن مالك به.



# پەرتووکی

# هۆزەبانە

# (گوێزەبانە، حەوتم)[1]



---

١) ـ كِتَابُ الْعَقِيقَةِ.




## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی هۆزەبانە (حەوتم)[١]

**١٤٤١-** عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي ضَمْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْعَقِيقَةِ؟ فَقَالَ: لاَ أُحِبُّ الْعُقُوقَ، وَكَأَنَّهُ إِنَّمَا كَرِهَ الاِسْمَ، وَقَالَ: مَنْ وُلِدَ لَهُ وَلَدٌ فَأَحَبَّ أَنْ يَنْسُكَ عَنْ وَلَدِهِ، فَلْيَفْعَلْ[٢].

واتە: لە پیاوێکی بەنو زەمرەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی هۆزەبانە؟ ئەویش فەرمووی: «عقوق»ـم پێ خۆش نییە (کە بە مانای ئەزیەتدان دێت، کە لێرە بە مانای سەربڕینی ئاژەڵە بەبۆنەی لەدایکبوونی منداڵ)، وەك بڵێی تەنها وشەکەی پێ چاك نەبوو (واتە حەزی نەکرد ئەو وشە کە بۆ خراپ بەکار دێت بۆ ئەو شتە چاکەش بەکار بێت)، وە فەرمووی: هەر کەسێك منداڵێکی بۆ هاتە دونیا و حەزی کرد (وەك سوپاسگوزاری و ستاییش بۆ خوا) ئاژەڵێکی لە پێناو سەر ببڕێت، ئەوە با بیکات.

**١٤٤٢-** عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: وَزَنَتْ فَاطِمَةُ ﷺ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَعَرَ حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ، وَزَيْنَبَ، وَأُمِّ كُلْثُومٍ، فَتَصَدَّقَتْ بِزِنَةِ ذَلِكَ فِضَّةً[٣].

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: فاتیمەی ﷺ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ مووەکانی قژی حەسەن و حوسەین و زەینەب و ئوم کەلسومی کێشا (وەزنی کرد) و بەئەندازەی وەزنی مووەکان زیوی بەخشی.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْعَقِيقَةِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٣؛ والحدثاني: ٤١٨هـ في الصيد والذبائح؛ وفي: ٤١٨ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٥٩ في الضحايا وما يجزئ منها؛ وابن حنبل: ٢٣١٨٣؛ والجامع لابن زياد: ٣٤ في العقيقة؛ والقابسي: ١٨٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٥؛ والحدثاني: ٤١٩ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٦١ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٣٩ في العقيقة، كلهم عن مالك به.

**١٤٤٣-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: وَزَنَتْ فَاطِمَةُ ﵂ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَعَرَ حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ، فَتَصَدَّقَتْ بِزِنَتِهِ فِضَّةً[١].

واته: لە موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ قژی حەسەن و حوسەینی کێشا و بەئەندازەکەی زیوی بەخشی.

## ٢- کردار دەربارەی عەقیقە[٢]

**١٤٤٤-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ لَمْ يَكُنْ يَسْأَلُهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ عَقِيقَةً، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهَا، وَكَانَ يَعُقُّ عَنْ وَلَدِهِ بِشَاةٍ شَاةٍ، عَنِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ[٣].

واته: لە نافیعەوە ﵀ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ هیچ کەسێك نەبوو لە خانەوادەکەی داوای هۆزەبانەی لێ بکات حەتمەن بۆی جێبەجێ دەکرد، وە بۆ هەر یەکێك لە منداڵەکانی بە بزنێك هۆزەبانەی دەکرد، بۆ کوڕەکان و کچەکان.

**١٤٤٥-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ التَّيْمِيِّ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: تُسْتَحَبُّ الْعَقِيقَةُ ولَوْ بِعُصْفُورٍ[٤].

واتـــە: لە موحەممـــەدی کوڕی ئیبراهیمـــی کوڕی حاریسی تەیمییەوە ﵀ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە باوکم ﵀ بوو دەیگوت: هۆزەبانە سوننەتە ئەگەر بە چۆلەکەیەکیش بێت[٥].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٦؛ والشيباني: ٦٦٢ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٣٨ في العقيقة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ الْعَمَلُ فِي الْعَقِيقَةِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه الحدثاني: ٤١٨ في الصيد والذبائح؛ والشيباني: ٦٦٠ في الضحايا وما يجزئ منها؛ والجامع لابن زياد: ٣٥ في العقيقة، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٨؛ والجامع لابن زياد: ٣٧ في العقيقة، عن مالك به.

(٥) ـ تێبینی: بۆ گرینگی ئاوای فەرمووە ئەگەرنا شتی وا بۆ هۆزەبانە ناشێت، بەڵکوو دەبێت ئاژەڵ بێت و

**١٤٤٦- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّهُ عُقَّ عَنْ حَسَنٍ وَحُسَيْنٍ ابْنَيْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ [(١)].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە هۆزەبانە بۆ حەسەن و حوسەین دوو کوڕەکانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ کراوە.

**١٤٤٧- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، أَنَّ أَبَاهُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﵀ كَانَ يَعُقُّ عَنْ بَنِيهِ الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ بِشَاةٍ شَاةٍ[(٢)].**

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عورووەی کوڕی زوبەیری ﵀ باوکی هۆزەبانەی بۆ منداڵە کوڕەکان و کچەکانی دەکرد هەر یەکەو بە بزنێك.

**١٤٤٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْعَقِيقَةِ، أَنَّ مَنْ عَقَّ، فَإِنَّمَا يَعُقُّ عَنْ وَلَدِهِ بِشَاةٍ شَاةٍ، الذُّكُورِ وَالإِنَاثِ، وَلَيْسَتِ الْعَقِيقَةُ بِوَاجِبَةٍ، وَلَكِنَّهَا يُسْتَحَبُّ الْعَمَلُ بِهَا، وَهِيَ مِنَ الأَمْرِ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ النَّاسُ عِنْدَنَا، فَمَنْ عَقَّ عَنْ وَلَدِهِ، فَإِنَّمَا هِيَ بِمَنْزِلَةِ النُّسُكِ وَالضَّحَايَا، لاَ يَجُوزُ فِيهَا عَوْرَاءُ، وَلاَ عَجْفَاءُ، وَلاَ مَكْسُورَةٌ، وَلاَ مَرِيضَةٌ، وَلاَ يُبَاعُ مِنْ لَحْمِهَا شَيْءٌ، وَلاَ جِلْدُهَا، وَتُكْسَرُ عِظَامُهَا، وَيَأْكُلُ أَهْلُهَا مِنْ لَحْمِهَا، وَيَتَصَدَّقُونَ مِنْهَا، وَلاَ يَمَسُّ الصَّبِيُّ بِشَيْءٍ مِنْ دَمِهَا[(٣)].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: فەتوا لای ئێمە دەربارەی هۆزەبانە ئەوەیە: هەر کەسێك ویستی هۆزەبانە بۆ منداڵەکەی بکات، ئەوە بۆ هەر یەکەیان بزنێك یان مەڕێك دەکات بە هۆزەبانە، بۆ کوڕەکان و کچەکان (جیاوازی نییە)، جا هۆزەبانە واجب نییە، بەڵام سوننەتە ئەنجام بدرێت، لەو بابەتانەیە کە خەڵکی لەلای ئێمە (واتە لە مەدینە) بەردەوام ئەنجامیان داوە، جا هەر کەسێك هۆزەبانەی بۆ منداڵەکەی کرد، ئەوە (مواسەفاتی ئاژەڵەکە) وەك ئاژەڵی هەدی و قوربانی وایە، هەمان سیفاتی ئاژەڵی قوربانی تێدابێ.

---

(١) ـ صحيح لغيره.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٨٩؛ والحدثاني: ٤١٨ج في الصيد والذبائح؛ والجامع لابن زياد: ٣٦ في العقيقة، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢١٩٠؛ والجامع لابن زياد: ٤٠ في العقيقة، كلهم عن مالك به.

دروست نییە نە کوێر و نە لاواز و نە شکاو و نە نەخۆشی تیا بێت، وە نابێ نە هیچ لە گۆشتەکەی و نە پێستەکەشی بفرۆشرێت، وە (سوننەتە) ئێسکەکانی ئاژەڵەکە بشکێندرێت (بەپێچەوانەی سەردەمی نەفامی کە ئێسکەکانیان نەدەشکاند تا منداڵەکە لە بەڵا و شکست دوور بێت)، وە خانەوادەکەی لە گۆشتەکەی دەخۆن و لێی دەبەخشن، وە هیچ لە خوێنەکەی لە منداڵەکە نادرێت (واتە خوێنەکە بە منداڵەکەوە ناسووێت).

## ١- میراتی منداڵی پشتی[1]

**١٤٤٩- [فتوى]** عَنْ مَالِكٍ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا فِي فَرَائِضِ الْمَوَارِيثِ: أَنَّ مِيرَاثَ الْوَلَدِ مِنْ وَالِدِهِمْ، أَوْ وَالِدَتِهِمْ، أَنَّهُ إِذَا تُوُفِّيَ الأَبُ أَوِ الأُمُّ، وَتَرَكَا وَلَدًا رِجَالاً وَنِسَاءً، فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، فَإِنْ شَرِكَهُمْ أَحَدٌ بِفَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، وَكَانَ فِيهِمْ ذَكَرٌ بُدِئَ بِفَرِيضَةِ مَنْ شَرِكَهُمْ، وَكَانَ مَا بَقِيَ بَعْدَ ذَلِكَ بَيْنَهُمْ، عَلَى قَدْرِ مَوَارِيثِهِمْ، وَمَنْزِلَةُ وَلَدِ الأَبْنَاءِ الذُّكُورِ، إِذَا لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ كَمَنْزِلَةِ الْوَلَدِ، سَوَاءٌ ذُكُورُهُمْ كَذُكُورِهِمْ، وَإِنَاثُهُمْ كَإِنَاثِهِمْ، يَرِثُونَ كَمَا يَرِثُونَ، وَيَحْجُبُونَ كَمَا يَحْجُبُونَ، فَإِنِ اجْتَمَعَ الْوَلَدُ لِلصُّلْبِ، وَوَلَدُ الابْنِ، وَكَانَ فِي الْوَلَدِ لِلصُّلْبِ ذَكَرٌ، فَإِنَّهُ لاَ مِيرَاثَ مَعَهُ لأَحَدٍ مِنْ وَلَدِ الابْنِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي الْوَلَدِ لِلصُّلْبِ ذَكَرٌ، وَكَانَتَا اثْنَتَيْنِ، فَأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ مِنَ الْبَنَاتِ لِلصُّلْبِ، فَإِنَّهُ لاَ مِيرَاثَ لِبَنَاتِ الابْنِ مَعَهُنَّ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعَ بَنَاتِ الابْنِ ذَكَرٌ، هُوَ مِنَ الْمُتَوَفَّى بِمَنْزِلَتِهِنَّ، أَوْ هُوَ أَطْرَفُ مِنْهُنَّ، فَإِنَّهُ يَرُدُّ عَلَى مَنْ هُوَ بِمَنْزِلَتِهِ وَمَنْ هُوَ فَوْقَهُ مِنْ بَنَاتِ الأَبْنَاءِ، فَضْلاً إِنْ فَضَلَ، فَيَقْتَسِمُونَهُ بَيْنَهُمْ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ، وَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْوَلَدُ لِلصُّلْبِ إِلاَّ ابْنَةً وَاحِدَةً، فَلَهَا النِّصْفُ، وَلابْنَةِ ابْنِهِ وَاحِدَةً كَانَتْ أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ مِنْ بَنَاتِ الأَبْنَاءِ، مِمَّنْ هُوَ مِنَ الْمُتَوَفَّى بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ، السُّدُسُ، فَإِنْ كَانَ مَعَ بَنَاتِ الابْنِ ذَكَرٌ، هُوَ مِنَ الْمُتَوَفَّى بِمَنْزِلَتِهِنَّ، فَلاَ فَرِيضَةَ وَلاَ سُدُسَ لَهُنَّ، وَلَكِنْ إِنْ فَضَلَ بَعْدَ فَرَائِضِ أَهْلِ الْفَرَائِضِ فَضْلٌ، كَانَ ذَلِكَ الْفَضْلُ لِذَلِكَ الذَّكَرِ، وَلِمَنْ هُوَ بِمَنْزِلَتِهِ، وَمَنْ هُوَ فَوْقَهُ مِنْ بَنَاتِ الأَبْنَاءِ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَلَيْسَ لِمَنْ هُوَ أَطْرَفُ مِنْهُمْ شَيْ، وَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ﴿١١﴾ ﴾النساء[2].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە وە لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان دەربارەی میرات (ئەوەیە): میراتگرتنی منداڵ لە باوکیان یان دایکیان ئەوەیە کاتێ باوك یان دایك مرد و منداڵی کوڕ یان کچیان جێ هێشت، ئەوە بۆ هەر کوڕێك دوو

---

(١) ـ مِيرَاثُ وَلَدِ الصُّلْبِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٦، عن مالك به.

هێندەی کچێکە، جا ئەگەر کەسێکی خاوەنمیراتی دیاریکراو (وەك باوك یان ژن یان مێرد) لەگەڵیان بەژدار بوو و نێری تیا بوو، ئەوە بە دابەشکردنی میراتی ئەو کەسە دەست پێ دەکرێت کە بە پشکی دیاریکراو لەگەڵیان بەژدارە، جا ئەوەی مایەوە لە نێوان کوڕ و کچەکان دابەش دەکرێت بەپێی میراتەکەیان، وە پلەی منداڵی منداڵە کوڕەکان وەك پلەی کوڕەکە وان ئەگەر منداڵی ڕاستەوخۆ نەبێت، نێرەکان وەك نێرەکە وان و مێیەکانیش وەك مێیەکە وان، جا (ئەم کوڕی کوڕ و کچی کوڕە) میرات دەگرن چۆن کوڕەکان میرات دەگرن، وە حوجب و ڕێگری لە میرات دروست دەکەن وەك چۆن کوڕەکە دروستی دەکات، جا ئەگەر منداڵی پشتێ (کوڕ و کچی ڕاستەوخۆ) و منداڵی کوڕ (کوڕی کوڕ و کچی کوڕ) کۆ بوونەوە و لەناو منداڵەکانی پشتێ نێرێك هەبوو، ئەوە هیچ میراتێك بۆ منداڵی کوڕەکە نییە لە حاڵەتی هەبوونی کوڕی ڕاستەوخۆ، وە ئەگەر لەناو منداڵەکانی پشتێ هیچ نێرێك بوونی نەبوو (تەنها کچ هەبوون)، کچەکانیش دوو و زیاتر بوون لە کچەکانی پشتێ، ئەوە هیچ میراتێك بۆ کچی کوڕ نییە لەگەڵ هەبوونی کچی پشتێی ڕاستەوخۆ، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە لەگەڵ کچی کوڕ نێر بوونی هەبێت، جا یان ئەوەتا لە ئاستی کچی پشتێ بێت یانیش دوورتر بێت لە کچەکان بۆ مردووەکە، ئەوە ئەگەر میراتەکە زیاد بوو دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کچانەی کوڕەکان کە لە ئاستی ئەون یان لەو بەرزترن و لەنێوانیان دابەش دەکرێت بۆ هەر نێرێك هێندەی دوو مێ، وە ئەگەر هیچ شتێك زیادی نەکرد، ئەوە هیچیان بۆ نییە، وە ئەگەر هیچ کوڕێکی پشتێ نەبوو تەنها تاکە کچێك نەبێت، ئەوە نیوەی بۆ هەیە، وە بۆ کچی کوڕ کە یەك دانە بێت یان زیاتر بێت، لە کچانی کوڕ لەوانەی لە یەك ئاستن لە ڕووی مردووەکە ئەوە شەش یەکیان بۆ هەیە، جا ئەگەر لەگەڵ کچی کوڕ نێرێك هەبوو، لە ئاستی کچەکان بوو لە ڕووی مردووەکە، ئەوە (کچەکانی کوڕەکە) نە پشکی میرات و نە شەشیەکیان بۆ نییە، بەڵام ئەگەر شتێك زیادی کرد لە خاوەنپشکەکان، ئەوە زیادەکە بۆ ئەو نێرە و بۆ ئەو کەسەشە کە لە ئاستی ئەودایە و ئەوەیشی کە لە سەرووی ئەوە لە کچەکانی کوڕەکان، ئەوە بۆ هەر نێرێك بەشی دوو مێ هەیە، وە بۆ کەسێك کە لەوان دوورتر بێت هیچ شتێك نییە،

وە ئەگەر هیچ شتێك زیاد نەبوو ئەوە هیچیان بۆ نییە، ئەوەش گشتی لەبەر ئەوەیە خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُ ﴿١١﴾ ﴾النساء، (واتە: خوا ڕێنموویيتان دەكات و فەرمانتان پێ دەدات دەربارەی وەچەكانتان لەبواری میراتگرتندا (ئەویش ئەوەیە) كە بەشی نێرینەیەكیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە، خۆ ئەگەر منداڵەكان تەنها ئافرەت بوون (دووان) و لە دووان زیاتر بوون ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی میراتییەكە لە نێوان ئەوان بەش دەكرێت، خۆ ئەگەر مردووەكە تەنها كچێكی هەبوو ئەوە نیوەی داراییەكەی دەدرێتێ).

### ٢- میراتی پیاو لە خێزانەكەی و میراتی ئافرەت لە مێردەكەی[١]

١٤٥٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِيرَاثُ الرَّجُلِ مِنِ امْرَأَتِهِ، إِذَا لَمْ تَتْرُكْ وَلَدًا وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ النِّصْفُ، فَإِنْ تَرَكَتْ وَلَدًا، أَوْ وَلَدَ ابْنٍ، ذَكَرًا كَانَ أَوْ أُنْثَى، فَلِزَوْجِهَا الرُّبُعُ، مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ.

وَمِيرَاثُ الْمَرْأَةِ مِنْ زَوْجِهَا، إِذَا لَمْ يَتْرُكْ وَلَدًا وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ، الرُّبُعُ، فَإِنْ تَرَكَ وَلَدًا، أَوْ وَلَدَ ابْنٍ، ذَكَرًا كَانَ أَوْ أُنْثَى، فَلاِمْرَأَتِهِ الثُّمُنُ، مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ تبارك وتعالى يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖ ﴿١٢﴾ ﴾النساء[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: میراتی پیاو لە خێزانەكەی ئەگەر خێزانەكەی منداڵی خۆی و منداڵی كوڕی خۆی لەدوای خۆی جێ نەهێشتبوو، نیوەیە، وە ئەگەر منداڵی خۆی یان منداڵی كوڕی خۆی جێ هێشتبوو كوڕ بن یان

---

(١) ـ مِيرَاثُ الرَّجُلِ مِنِ امْرَأَتِهِ وَالْمَرْأَةِ مِنْ زَوْجِهَا.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٧، عن مالك به.

کچ، ئەوە مێردەکەی چواریەکی بۆ هەیە، دوای وەسییەت کە ئەنجامی بدات یان قەرزدانەوە.

وە میراتی ئافرەت لە مێردەکەی ئەگەر مێردەکەی هیچ منداڵێکی خۆی و منداڵی کوڕی خۆی دوای خۆی جێ نەهێڵێت، چواریەکە، جا ئەگەر منداڵی خۆی یان منداڵی کوڕی خۆی دوای خۆی جێ هێشت، کوڕ بن یان کچ، ئەوە هەشتیەك بۆ خێزانەکەیەتی، دوای وەسییەت کە ئەنجامی بدات یان دانەوەی قەرز، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ﴿١٢﴾﴾النساء.

## ٣- میراتگرتنی باوك و دایك لە منداڵەكانیان[1]

**١٤٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّ مِيرَاثَ الأَبِ مِنِ ابْنِهِ أَوِ ابْنَتِهِ، أَنَّهُ إِنْ تَرَكَ الْمُتَوَفَّى وَلَدًا، أَوْ وَلَدَ ابْنٍ ذَكَرًا، فَإِنَّهُ يُفْرَضُ لِلأَبِ السُّدُسُ فَرِيضَةً، فَإِنْ لَمْ يَتْرُكِ الْمُتَوَفَّى وَلَدًا، وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ ذَكَرًا، فَإِنَّهُ يُبَدَّأُ بِمَنْ شَرَّكَ الأَبَ مِنْ أَهْلِ الْفَرَائِضِ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ مِنَ الْمَالِ السُّدُسُ، فَمَا فَوْقَهُ كَانَ لِلأَبِ، وَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ عَنْهُمُ السُّدُسُ فَمَا فَوْقَهُ، فُرِضَ لِلأَبِ السُّدُسُ، فَرِيضَةً.

وَمِيرَاثُ الأُمِّ مِنْ وَلَدِهَا، إِذَا تُوُفِّيَ ابْنُهَا أَوِ ابْنَتُهَا، فَتَرَكَ الْمُتَوَفَّى وَلَدًا أَوْ وَلَدَ ابْنٍ، ذَكَرًا كَانَ أَوْ أُنْثَى، أَوْ تَرَكَ مِنَ الإِخْوَةِ اثْنَيْنِ فَصَاعِدًا، ذُكُورًا كَانُوا أَوْ إِنَاثًا، مِنْ أَبٍ وَأُمٍّ، أَوْ مِنْ أَبٍ أَوْ مِنْ أُمٍّ، فَالسُّدُسُ لَهَا.

فَإِنْ لَمْ يَتْرُكِ الْمُتَوَفَّى، وَلَدًا وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ، وَلاَ اثْنَيْنِ مِنَ الإِخْوَةِ فَصَاعِدًا، فَإِنَّ لِلأُمِّ الثُّلُثَ كَامِلاً إِلاَّ فِي فَرِيضَتَيْنِ فَقَطْ.

---

(١) ـ مِيرَاثُ الأَبِ وَالأُمِّ مِنْ وَلَدِهِمَا.

وَإِحْدَى الْفَرِيضَتَيْنِ: أَنْ يُتَوَفَّى رَجُلٌ وَيَتْرُكَ امْرَأَتَهُ وَأَبَوَيْهِ، فَلامْرَأَتِهِ الرُّبُعُ، وَلأُمِّهِ الثُّلُثُ مِمَّا بَقِيَ، وَهُوَ الرُّبُعُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ.

وَالأُخْرَى: أَنْ تُتَوَفَّى امْرَأَةٌ، وَتَتْرُكَ زَوْجَهَا وَأَبَوَيْهَا، فَيَكُونُ لِزَوْجِهَا النِّصْفُ، وَلأُمِّهَا الثُّلُثُ مِمَّا بَقِيَ، وَهُوَ السُّدُسُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ.

وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ﴿١١﴾ ﴾النساء، فَمَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ الإِخْوَةَ اثْنَانِ فَصَاعِدًا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە و ڕاجیایی تیا نییە و لەسەریشی گەیشتووم بە زانایان لە شارەكەمان (ئەوەیە): میراتی باوك لە كوڕ و كچەكەی، ئەگەر (منداڵە) مردووەكە منداڵی خۆی یان منداڵی كوڕی خۆی لەدوای خۆی جێ هێشتبوو منداڵەكەش كوڕ بێت، (ئەو باوكە) پشكی شەشیەكی بۆ دادەنرێت، وە ئەگەر (منداڵە) مردووەكە منداڵی خۆی یان منداڵی كوڕی خۆی لەدوای خۆی جێ نەهێشتبوو كە كوڕ بێت، ئەوە سەرەتا دەست دەكرێت بە پێدانی پشكی ئەو كەسانەی لەگەڵ باوك بەشدارن لە میرات و پشكەكانی خۆیان پێ دەدرێت، جا ئەگەر شەشیەك و زیاتر دەمایەوە لە ماڵەكە ئەوە (بە ناوی عەصەبە) بۆ باوكە، (بەڵام) ئەگەر شەشیەك و زیاتر نەدەمایەوە بۆ باوك، ئەوە (بە ناوی خاوەنپشكی دیاریكراو) شەشیەك بۆ باوك دادەنرێت (واتە نابێ لەوە كەمتر بێت).

وە میراتی دایك لە منداڵەكەی ئەگەر كوڕەكەی یان كچەكەی مرد و مردووەكە منداڵی خۆی یان منداڵی كوڕەكەی لەدوای خۆی جێ هێشتبوو، جا كوڕ بن یان كچ، یانیش دوو برا و خوشك یان زیاتر جێ بهێڵێت، جا لە دایك و باوك بن یان تەنها لە باوك یان تەنها لە دایك، ئەوە شەشیەك بۆ دایكە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٨، عن مالك به.

وە ئەگەر مردووەکە منداڵی خۆی یان منداڵی کوڕەکەی یان دوو برا و زیاتری لەدوای خۆی جێ نەهێشتبوو، ئەوە دایك سێیەکی تەواوی بۆ هەیە تەنها لە دوو بابەت نەبێت.

یەکێك لە بابەتەکان ئەوەیە: پیاوێك بمرێت و خێزانەکەی و دایك و باوکی دوای خۆی جێ بهێڵێت، ئەوە چواریەك بۆ خێزانەکەیەتی، وە سێیەکیش لەوەی دەمێنێتەوە بۆ دایکە، کە دەکاتە چواریەکی کۆی گشتی سەرمایەکە.

ئەوەی دیکەیان ئەوەیە: ئافرەتێك بمرێت و مێرد و دایك و باوك لەدوای خۆی جێ بهێڵێت، جا نیوە بۆ مێردەکەیەتی، سێیەکیش لەوەی دەمێنێتەوە بۆ دایکە، کە دەکاتە شەشیەکی کۆی گشتی سەرمایەکە.

(جا ئەوەی باس کرا) لەبەر ئەوەیە خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ﴿١١﴾﴾النساء، جا دەربارەی تێگەیشتن لە وشەی (الإخوة) لە ئایەتەکە هەر وا هاتووە مەبەست پێی: دوو و زیاتر بن.

### ٤- میراتی برای لە دایك[١]

**١٤٥٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الإِخْوَةَ لِلأُمِّ لاَ يَرِثُونَ مَعَ الْوَلَدِ شَيْئًا، وَلاَ مَعَ وَلَدِ الأَبْنَاءِ، ذُكْرَانًا كَانُوا أَوْ إِنَاثًا شَيْئًا، وَلاَ يَرِثُونَ مَعَ الأَبِ وَلاَ مَعَ الْجَدِّ، أَبِي الأَبِ شَيْئًا، وَأَنَّهُمْ يَرِثُونَ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ، يُفْرَضُ لِلْوَاحِدِ مِنْهُمُ السُّدُسُ، ذَكَرًا كَانَ أَوْ أُنْثَى، فَإِنْ كَانَا اثْنَيْنِ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ، فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ، يَقْتَسِمُونَهُ بَيْنَهُمْ بِالسَّوَاءِ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَى، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن

---

(١) ـ مِيَرَاثُ الإِخْوَةِ لِلأُمِّ.

كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾ ﴾النساء، فَكَانَ الذَّكَرُ وَالأُنْثَى فِي هَذَا بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: براكانی لە دایك هیچ میراتێك ناگرن لەگەڵ هەبوونی منداڵ و منداڵی منداڵ، جا چ نێر بن یان مێ، وە هیچ میراتێك ناگرن لەگەڵ هەبوونی باوك و باپیر، باوكی باوك، (بەڵكوو) میرات دەگرن كە ئەوان نەبن، بۆ هەر یەكێكیان شەشیەك دادەنرێت، چ نێر بن یان مێ، جا ئەگەر دوو بن بۆ هەر یەكێكیان شەشیەك هەیە، وە ئەگەر لەوە زیاتر بوون ئەوە لە سێیەك بەژدار دەبن، لە نێوانیان بەیەكسانی دابەش دەكرێت، نێر هەمان پشكی مێی بۆ هەیە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووكەكەیدا فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾ ﴾النساء، نێر و مێ لێرەدا لە یەك ئاستن.

### ٥- میراتی خوشك و برای لە دایك و باوك[2]

**١٤٥٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الإِخْوَةَ لِلأَبِ وَالأُمِّ لاَ يَرِثُونَ مَعَ الْوَلَدِ الذَّكَرِ شَيْئًا، وَلاَ مَعَ وَلَدِ الابْنِ الذَّكَرِ شَيْئًا، وَلاَ مَعَ الأَبِ دِنْيَا شَيْئًا، وَهُمْ يَرِثُونَ مَعَ الْبَنَاتِ، وَبَنَاتِ الأَبْنَاءِ، مَا لَمْ يَتْرُكِ الْمُتَوَفَّى جَدًّا أَبَا أَبٍ، مَا فَضَلَ مِنَ الْمَالِ يَكُونُونَ فِيهِ عَصَبَةً، يُبْدَأُ بِمَنْ كَانَ لَهُ أَصْلُ فَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ بَعْدَ ذَلِكَ فَضْلٌ، كَانَ لِلإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، يَقْتَسِمُونَهُ بَيْنَهُمْ عَلَى كِتَابِ اللهِ، ذُكْرَانًا كَانُوا أَوْ إِنَاثًا، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ.

قَالَ: وَإِنْ لَمْ يَتْرُكِ الْمُتَوَفَّى أَبًا وَلاَ جَدًّا أَبَا أَبٍ، وَلاَ وَلَدًا، وَلاَ وَلَدَ ابْنٍ، ذَكَرًا كَانَ أَوْ أُنْثَى، فَإِنَّهُ يُفْرَضُ لِلأُخْتِ الْوَاحِدَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ النِّصْفُ، فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ مِنَ الأَخَوَاتِ لِلأَبِ وَالأُمِّ فُرِضَ لَهُنَّ الثُّلُثَانِ، فَإِنْ كَانَ مَعَهُنَّ أَخٌ ذَكَرٌ ، فَلاَ فَرِيضَةَ لأَحَدٍ مِنَ الأَخَوَاتِ، وَاحِدَةً كَانَتْ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٢٩، عن مالك به.

(٢) ـ مِيرَاثُ الإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ.

أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، وَيُبْدَأُ بِمَنْ شَرِكَهُمْ بِفَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَمَا فَضَلَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْ شَيْءٍ كَانَ بَيْنَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ إِلاَّ فِي فَرِيضَةٍ وَاحِدَةٍ فَقَطْ، لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِيهَا شَيْءٌ فَاشْتَرَكُوا فِيهَا مَعَ بَنِي الأُمِّ فِي ثُلُثِهِمْ، وَتِلْكَ الْفَرِيضَةُ: امْرَأَةٌ تُوُفِّيَتْ وَتَرَكَتْ زَوْجَهَا وَأُمَّهَا وَإِخْوَتَهَا لأُمِّهَا، وَإِخْوَتَهَا لأُمِّهَا وَأَبِيهَا، فَكَانَ لِزَوْجِهَا النِّصْفُ، وَلأُمِّهَا السُّدُسُ، وَلإِخْوَتِهَا لأُمِّهَا الثُّلُثُ، فَلَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ بَعْدَ ذَلِكَ، فَيَشْتَرِكُ بَنُو الأَبِ وَالأُمِّ فِي هَذِهِ الْفَرِيضَةِ مَعَ بَنِي الأُمِّ فِي ثُلُثِهِمْ، فَيَكُونُ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَى، مِنْ أَجْلِ أَنَّهُمْ كُلَّهُمْ إِخْوَةُ الْمُتَوَفَّى لأُمِّهِ، وَإِنَّمَا وَرِثُوا بِالأُمِّ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ تبارك وتعالى قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾﴾النساء، فَلِذَلِكَ شُرِّكُوا فِي هَذِهِ الْفَرِيضَةِ، لأَنَّهُمْ كُلَّهُمْ إِخْوَةُ الْمُتَوَفَّى لأُمِّهِ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە (ئەوەیە): برای لە دایك و باوك هیچ میراتێك ناگرن بەهۆی هەبوونی منداڵی نێر (ی مردووەکە)، هەروەها هیچ میراتێك ناگرن بەهۆی هەبوونی کچ و کوڕی کوڕ (ی مردووەکە)، هەروەها هیچ میراتێك ناگرن لەگەڵ هەبوونی باوکی نزیکتر (کە بریتییە لە باوکی ڕاستەوخۆ بۆ مردووەکە، نەك باپیر، هەرچەندە ئەویش بە باوك حیسابە)، (بەڵام) میرات دەگرن لەگەڵ هەبوونی کچ و کچی کوڕ مادەم مردووەکە باپیر (باوکی باوك)ی لەدوای خۆی جێ نەهێشتبێ، ئەوە (لەو حاڵەتەدا) دەبن بە عەصەبە و ئەوەی لە ماڵەکە دەمێنێتەوە وەریدەگرن، سەرەتا بەوانە دەست پێ دەکرێت کە پشکی دیاریکراویان هەیە، میراتی خۆیان پێ دەدرێت، جا ئەگەر شتێك زیادی کرد، ئەوە بۆ برای لە دایك و باوکە، بەپێی پەرتووکی خوای پەروەردگار ﷻ لە نێوانی خۆیان دابەشی دەکەن، جا چ نێر بن چ مێ، پشکی نێرێك بەقەد پشکی دوو مێ، جا ئەگەر هیچ زیادی نەکرد، ئەوە هیچیان بۆ نییە.

گوتوویەتی: وە ئەگەر مردووەکە باوك و باپیر (باوکی باوك)ی لەدوای خۆی جێ نەهێشتبوو، وە منداڵی خۆیشی و منداڵی کوڕی خۆیشی جێ نەهێشتبوو، نە نێر نە مێ، ئەوە بۆ یەك خوشکی لە دایك و باوك نیوە هەیە، جا ئەگەر دوو خوشکی لە دایك و باوك و زیاتر بوون، ئەوە دوو لەسەر سێیان بۆ دادەنرێت، جا

ئەگەر برایێکیان لەگەڵ بوو، ئەوە هیچ پشکێك بۆ خوشکەکان نییە، (چون یەکە) یەك یان زیاتر بن، وە سەرەتا بەوانە دەست پێ دەکرێت کە بە پشکی دیاریکراو لەگەڵیان بەشدارن، پشکەکانیان پێ دەدرێت، جا هەر شتێك دوای ئەوە زیاد بوو بۆ خوشك و براکانی لە دایك و باوکە، بۆ هەر نێرێك دوو پشکی مێیێك هەیە، تەنها لە یەك بابەت نەبێت (کە بریتییە لە بابەتی: موشەڕەکە یان حەجەرییە، یان یەمییە یان حیمارییە)، تیایدا (بەسەربەخۆ) هیچیان بۆ نییە (بەڵکوو) بەژدار دەبن لەگەڵ منداڵی دایك لە سێیەکەکەیان، جا نموونەی بابەتەکە ئاوایە: ئافرەتێك دەمرێت و مێرد و دایك و خوشك و برای لە دایکی و خوشك و برای لە دایك و باوکی، دوای خۆی جێ دەهێڵێت، ئەوە بۆ مێردەکەی نیوە هەیە، بۆ دایکیشی شەشیەك هەیە، بۆ خوشك و براکانی لە دایك سێیەك هەیە، جا ئەگەر هیچ شتێك دوای ئەوە زیاد نەبوو، ئەوە لەو بابەتە منداڵەکانی لە باوك و دایك لەگەڵ منداڵەکانی لە دایك بەژدار دەبن، بۆ هەر نێرێك پشکی دوو مێ هەیە، لەبەر ئەوەی گشتیان برا و خوشکی مردوون لە دایکەوە (واتە چ خوشك و برای لە دایك، چ خوشك و برای لە دایك و باوك هەر لە دایك دەگەنەوە یەکدی، بۆیە) تەنها بەلای دایکەوە میرات دەگرن، ئەوەش لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾﴾النساء، جا بۆیە لەو بابەتەدا بەژدارییان پێ دەکرێ، چونکە گشتیان خوشك و برای مردوون لە دایکەوە.

## ٦- میراتی خوشك و برای لە باوك[(١)]

**١٤٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ مِيرَاثَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ، إِذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ أَحَدٌ مِنْ بَنِي الأَبِ وَالأُمِّ، كَمَنْزِلَةِ الإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، سَوَاءٌ، ذَكَرُهُمْ كَذَكَرِهِمْ، وَأُنْثَاهُمْ كَأُنْثَاهُمْ، إِلاَّ أَنَّهُمْ لاَ يُشَرَّكُونَ مَعَ بَنِي الأُمِّ فِي الْفَرِيضَةِ الَّتِي شَرَّكَهُمْ فِيهَا بَنُو الأَبِ وَالأُمِّ، لأَنَّهُمْ خَرَجُوا مِنْ وِلاَدَةِ الأُمِّ الَّتِي جَمَعَتْ أُولَئِكَ.

---

(١) ـ مِيَرَاثُ الإِخْوَةِ لِلأَبِ.

فَإِنِ اجْتَمَعَ الإِخْوَةُ لِلأَبِ وَالأَمِّ، وَالإِخْوَةُ لِلأَبِ، فَكَانَ فِي بَنِي الأَبِ وَالأَمِّ ذَكَرٌ، فلاَ مِيرَاثَ لأَحَدٍ مِنْ بَنِي الأَبِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ بَنُو الأَبِ وَالأَمِّ إِلاَّ امْرَأَةً وَاحِدَةً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ مِنَ الإِنَاثِ، لاَ ذَكَرَ مَعَهُنَّ، فَإِنَّهُ يُفْرَضُ لِلأُخْتِ الْوَاحِدَةِ لِلأَبِ وَالأَمِّ النِّصْفُ، وَيُفْرَضُ لِلأَخَوَاتِ لِلأَبِ السُّدُسُ، تَتِمَّةَ الثُّلُثَيْنِ، فَإِنْ كَانَ مَعَ الأَخَوَاتِ لِلأَبِ ذَكَرٌ، فَلاَ فَرِيضَةَ لَهُنَّ، وَيُبْدَأُ بِأَهْلِ الْفَرَائِضِ الْمُسَمَّاةِ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ بَعْدَ ذَلِكَ فَضْلٌ، كَانَ بَيْنَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ، فَإِنْ كَانَ الأَخَوَاتُ لِلأَبِ وَالأَمِّ امْرَأَتَيْنِ، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ مِنَ الإِنَاثِ، فُرِضَ لَهُنَّ الثُّلُثَانِ، وَلاَ مِيرَاثَ مَعَهُنَّ لِلأَخَوَاتِ لِلأَبِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَعَهُنَّ أَخٌ لأَبٍ، فَإِنْ كَانَ مَعَهُنَّ أَخٌ لأَبٍ، بُدِئَ بِمَنْ شَرَّكَهُمْ بِفَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، فَأُعْطُوا فَرَائِضَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ بَعْدَ ذَلِكَ فَضْلٌ، كَانَ بَيْنَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ، للذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ، وَلِبَنِي الأَمِّ، مَعَ بَنِي الأَبِ وَالأَمِّ، وَمَعَ بَنِي الأَبِ، لِلْوَاحِدِ السُّدُسُ، وَلِلاثْنَيْنِ فَصَاعِدًا الثُّلُثُ: لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَى، هُمْ فِيهِ، بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ سَوَاءٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە (ئەوەیە): میراتی خوشك و برای لە باوك ئەگەر هیچ برا یان خوشکی لەدایك و باوکی لەگەڵدا نەبن، ئەوە وەك برا و خوشکی لە دایك و باوك وان، نێرەکانیان وەك نێرەکانیانە، مێیەکانیشیان وەك مێیەکانیانە، تەنها ئەوەندە نەبێت بەژدارییان پێ ناکرێت لەگەڵ منداڵی لە دایك لەو بابەتەی بەژداری دەکەن تیایدا لەگەڵ منداڵی لە دایك و باوك، چونکە چوونەتە دەرەوە لە لەدایکبوونی ئەو دایکەی ئەوان کۆ دەکاتەوە (واتە لە یەك دایك لەدایك نەبوونە، دایکیان جیایە).

جا ئەگەر خوشك و برای لە دایك و باوك لەگەڵ خوشك و برای لە باوك کۆ بوونەوە و لەناو منداڵەکانی لە باوك و دایك نێرینە هەبوو، ئەوە هیچ میراتێك بۆ منداڵانی باوك نییە، جا ئەگەر منداڵەکانی لە دایك و باوك کەسیان بوونی نەبوو جگە لە ئافرەتێك، یان زیاتر لە ئافرەتێك، کە هیچ پیاوێکیان لەگەڵ نەبێ، ئەوە بۆ خوشکە لە باوك و دایکەکە نیوەی میرات هەیە، وە شەشیەکیش بۆ خوشکەکانی لە باوکە، کە تەواوکەری دوو لەسەر سێیە، وە ئەگەر لەگەڵ خوشکەکانی لە باوك نێرێك هەبوو، ئەوە هیچ میراتێك بۆ خوشکەکان نییە، (وە لە دابەشکردنیشدا) دەست دەکرێت بە پێدانی میرات بەو کەسانەی میراتی دیاریکراویان هەیە، میراتەکەی خۆیان پێ

دەدرێت، جا ئەگەر شتێك دوای ئەوە زیادی کرد، ئەوە لە نێوان خوشك و براکانی لە باوك دابەش دەکرێت، بۆ هەر نێرێك پشکی دوو مێ، جا ئەگەر هیچ شتێك زیادی نەکرد ئەوە هیچیان بۆ نییە، وە ئەگەر خوشکەکانی لە باوك و دایك دوو ئافرەت بوون، یان لەوە زیاتر بوون، ئەوە دوو لەسەر سێیان بۆ دادەنرێت، وە هیچ میراتێك بۆ خوشکی لە باوك نییە لەگەڵ هەبوونی خوشکی لە دایك و باوك، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە براییکی لە باوکیان لەگەڵ بێت، جا ئەگەر برای لە باوکیان لەگەڵ بوو، (لە دابەشکردندا) سەرەتا دەست دەکرێت بەو کەسەی بە پشکە میراتی دیاریکراو لەگەڵیان بەژدارە، میراتی خۆیان پێ دەدرێت، جا ئەگەر دوای ئەوە شتێك زیاد بوو، ئەوە لە نێوان خوشك و براکانی لە باوك دابەش دەکرێت، بۆ هەر نێرێك پشکی دوو مێ، جا ئەگەر هیچ شتێك زیاد نەبوو، ئەوە هیچیان بۆ نییە، وە بۆ منداڵی لە دایك لەگەڵ هەبوونی منداڵەکانی لە باوك و دایك وە لەگەڵ هەبوونی منداڵەکانی لە باوك، شەش یەك هەیە (ئەگەر) یەك دانە بوو، وە بۆ دوو کەسیان سێیەك هەیە: بۆ هەر نێرێك بە ئەندازەی پشکی مێیەك، لەو بابەتەدا بە یەك ئاست حیسابن.

## ٧- میراتی باپیر[١]

**١٤٥٥- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ كَتَبَ إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ يَسْأَلُهُ عَنِ الْجَدِّ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: إِنَّكَ كَتَبْتَ إِلَيَّ تَسْأَلُنِي عَنِ الْجَدِّ، وَاللهُ أَعْلَمُ، وَذَلِكَ مَا لَمْ يَكُنْ يَقْضِي فِيهِ إِلاَّ الأُمَرَاءُ، يَعْنِي الْخُلَفَاءَ، وَقَدْ حَضَرْتُ الْخَلِيفَتَيْنِ قَبْلَكَ يُعْطِيَانِهِ النِّصْفَ مَعَ الأَخِ الْوَاحِدِ، وَالثُّلُثَ مَعَ الاِثْنَيْنِ، فَإِنْ كَثُرَ الإِخْوَةُ لَمْ يُنَقِّصُوهُ مِنَ الثُّلُثِ[٢].**

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بۆ زەیدی کوڕی سابیتی ﷺ نووسی و پرسیاری لێ کرد دەربارەی (میراتی) باپیر، زەیدی کوڕی سابیتیش ﷺ بۆی نووسی: تۆ بۆت نووسیوم و پرسیارم لێ دەکەی دەربارەی باپیر، والله أعلم، ئەوەش بابەتێکە کەس بڕیاری

---

(١) ـ مِيَراثُ الْجَدِّ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٢؛ والحدثاني: ٢١١ في ما جاء في الزكاة، عن مالك به.

تێدا نادات تەنها کاربەدەستان نەبن، واتە خەلیفە و جێنشینان، جا ئامادەی دوو خەلیفەکانی پێش تۆ بووم (کە عومەر و عوسمانن ـ ﭭ ـ) نیوەی میراتیان داوە بە باپیر کاتێ لەگەڵ یەك برا بووە، وە سێیەکیان پێ داوە کاتێ لەگەڵ دوو برا بووە، وە ئەگەر براکان زۆر بووبن لە سێیەك کەمتریان نەکردۆتەوە (بۆ باپیر).

**١٤٥٦-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﭬ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﭬ فَرَضَ لِلْجَدِّ الَّذِي يَفْرِضُ النَّاسُ لَهُ الْيَوْمَ[١].

واتە: لە قەبیصەی کوڕی زوئەیبەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﭬ پشکی بۆ باپیر دانا بەو شێوەیەی خەڵکی بۆی دادەنێن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا.

**١٤٥٧-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﭬ، أَنَّهُ قَالَ: فَرَضَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﭬ لِلْجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ الثُّلُثَ[٢].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففان و زەیدی کوڕی سابیت ﭬ سێیەکیان بۆ باپیر داناوە کاتێ لەگەڵ چەند برایەك بێت.

**١٤٥٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﭬ: وَالأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّ الْجَدَّ أَبَا الأَبِ، لاَ يَرِثُ مَعَ الأَبِ دِنْيَا شَيْئًا، وَهُوَ يُفْرَضُ لَهُ مَعَ الْوَلَدِ الذَّكَرِ، وَمَعَ ابْنِ الابْنِ الذَّكَرِ، السُّدُسُ فَرِيضَةً، وَهُوَ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ، مَا لَمْ يَتْرُكِ الْمُتَوَفَّى أَخًا أَوْ أُخْتًا لأَبِيهِ، يُبَدَّأُ بِأَحَدٍ إِنْ شَرَّكَهُ بِفَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَإِنْ فَضَلَ مِنَ الْمَالِ السُّدُسُ فَمَا فَوْقَهُ كَانَ لَهُ، وَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ مِنَ الْمَالِ السُّدُسُ فَمَا فَوْقَهُ، فُرِضَ لِلْجَدِّ السُّدُسُ فَرِيضَةً[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٣؛ والحدثاني: ٢١١أفي ما جاء في الزكاة؛ والشيباني: ٧٢٢ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٤؛ وفي: ٣٠٤٠؛ والحدثاني: ٢١١ب في ما جاء في الزكاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٥، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە و لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (بریتییە لەوەی): باپیر، باوکی باوك، هیچ میراتێك ناگرێت لەگەڵ باوك کە نزیکترە، بەڵکوو لەگەڵ منداڵی کوڕ وە لەگەڵ کوڕی کوڕ پشکی شەشیەکی هەیە، جا جگە لەو نموونانە مادەم مردووەکە برا یان خوشکی لە باوکی جێ نەهێشتبێت بە کەسێك دەست پێ دەکرێت کە لەگەڵی بەژدار بێت لە میرات و پشکی دیاریکراوی هەبێت، جا ئەوان بەشەمیراتی خۆیان پێ دەدرێت و ئەگەر لە شەشیەکی ماڵەکە زیاتر دەمایەوە ئەوە گشتی بۆ باپیرە، وە ئەگەر شەشیەك یان زیاتر نەدەمایەوە، ئەوە هەر شەشیەك بۆ باپیر دادەنرێت (نابێ لەوە کەمتر بێت).

**١٤٥٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْجَدُّ، وَالإِخْوَةُ لِلأَبِ وَالأَمِّ، إِذَا شَرَّكَهُمْ أَحَدٌ بِفَرِيضَةٍ مُسَمَّاةٍ، يُبَدَّأُ بِمَنْ شَرَّكَهُمْ مِنْ أَهْلِ الْفَرَائِضِ، فَيُعْطَوْنَ فَرَائِضَهُمْ، فَمَا بَقِيَ بَعْدَ ذَلِكَ لِلْجَدِّ وَالإِخْوَةِ مِنْ شَيْءٍ، فَإِنَّهُ يُنْظَرُ، أَيُّ ذَلِكَ أَفْضَلُ لِحَظِّ الْجَدِّ، أُعْطِيَهُ الثُّلُثُ مِمَّا بَقِيَ لَهُ وَلِلإِخْوَةِ، أَوْ يَكُونُ بِمَنْزِلَةِ رَجُلٍ مِنَ الإِخْوَةِ، فِيمَا يَحْصُلُ لَهُ وَلَهُمْ، يُقَاسِمُهُمْ بِمِثْلِ حِصَّةِ أَحَدِهِمْ، أَوِ السُّدُسُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ كُلِّهِ، أَيُّ ذَلِكَ كَانَ أَفْضَلَ لِحَظِّ الْجَدِّ، أُعْطِيَهُ الْجَدُّ، وَكَانَ مَا بَقِيَ بَعْدَ ذَلِكَ لِلإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأَمِّ، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، إِلاَّ فِي فَرِيضَةٍ وَاحِدَةٍ، تَكُونُ قِسْمَتُهُمْ فِيهَا عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، وَتِلْكَ الْفَرِيضَةُ: امْرَأَةٌ تُوُفِّيَتْ، وَتَرَكَتْ زَوْجَهَا، وَأُمَّهَا، وَأُخْتَهَا لأُمِّهَا وَأَبِيهَا، وَجَدَّهَا، فَلِلزَّوْجِ النِّصْفُ، وَلِلأَمِّ الثُّلُثُ، وَلِلْجَدِّ السُّدُسُ، وَلِلأُخْتِ لِلأَمِّ وَالأَبِ النِّصْفُ، ثُمَّ يُجْمَعُ سُدُسُ الْجَدِّ، وَنِصْفُ الأُخْتِ، فَيُقْسَمُ أَثْلاَثًا، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، فَيَكُونُ لِلْجَدِّ ثُلُثَاهُ، وَلِلأُخْتِ ثُلُثُهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: باپیر و برا و خوشکی لە دایك و باوك، کاتێ کەسێك بە پشکی دیاریکراو لەگەڵیان بەژدار دەبێت لە میرات، (لە دابەشکردندا) سەرەتا بەو کەسە دەست پێ دەکرێت کە لەگەڵیان بەژدارە لە خاوەنپشکە دیاریکراوەکان و پشك و میراتی خۆیان پێ دەدرێت، جا (ئەگەر) دوای ئەوە شتێك مایەوە، ئەوە بۆ باپیر و خوشك و برایە، جا سەیر دەکرێت: چۆن چاکترە بۆ باپیر، (ئاخۆ) سێیەکی بۆ دەمێنێتەوە لەوەی بۆ خۆی و بۆ خوشك و

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٦، عن مالك به.

براكانی مردووەكە دەمێنێتەوە، یان (وا قازانجترە) وەك پیاوێك بێت لە براكانی مردووەكە لەوەی بۆ ئەو و براكان وەدەست دێت، بە ئەندازەی پشكی یەكێكیان بەشدار بێت لەگەڵیان، یان شەشیەكی بۆ دابنرێت لە كۆی گشتی ماڵەكە، كامیان چاكتر بێت بۆ باپیر ئەویان دەدرێت بە باپیر، جا ئەوەی دەمێنێتەوە دوای ئەوە بۆ خوشك و براكانی مردووەكەیە لەدایك و باوك، بۆ هەر نێرێك دوو پشكی مێینێك، تەنها لە یەك بابەتدا نەبێت، پشكەكەیان تیایدا بەو پێیە نییە، بابەتەكەش ئەوەیە: ئافرەتێك دەمرێت و مێرد و دایكی و خوشكی لە دایك و باوكی و باپیری دوای خۆی جێ دەهێڵێت، جا نیوە بۆ مێردە و سێیەك بۆ دایكە و شەشیەك بۆ باپیرە و نیوەش بۆ خوشكی لە دایك و باوكە، دواتر شەشیەكی باپیر و نیوەی خوشك كۆ دەكرێتەوە و دەكرێتە سێ بەش، بۆ نێر دوو بەشی مێیەك، كەواتە دوو لەسەر سێ دەبێتە پشكی باپیر و سێیەكیش دەبێتە پشكی خوشك.

١٤٦٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِيرَاثُ الإِخْوَةِ لِلأَبِ مَعَ الْجَدِّ، إِذَا لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ إِخْوَةٌ لأَبٍ وَأُمٍّ، كَمِيرَاثِ الإِخْوَةِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، سَوَاءٌ ذَكَرُهُمْ كَذَكَرِهِمْ، وَأُنْثَاهُمْ كَأُنْثَاهُمْ، فَإِذَا اجْتَمَعَ الإِخْوَةُ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَالإِخْوَةُ لِلأَبِ، فَإِنَّ الإِخْوَةَ لِلأَبِ وَالأُمِّ، يُعَادُّونَ الْجَدَّ بِإِخْوَتِهِمْ لأَبِيهِمْ، فَيَمْنَعُونَهُ بِهِمْ كَثْرَةَ الْمِيرَاثِ بِعَدَدِهِمْ، وَلاَ يُعَادُّونَهُ بِالإِخْوَةِ لِلأُمِّ، لأَنَّهُ لَوْ لَمْ يَكُنْ مَعَ الْجَدِّ غَيْرُهُمْ، لَمْ يَرِثُوا مَعَهُ شَيْئًا، وَكَانَ الْمَالُ كُلُّهُ لِلْجَدِّ فَمَا حَصَلَ لِلإِخْوَةِ مِنْ بَعْدِ حَظِّ الْجَدِّ، فَإِنَّهُ يَكُونُ لِلإِخْوَةِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ، دُونَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ، وَلاَ يَكُونُ لِلإِخْوَةِ لِلأَبِ مَعَهُمْ شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الإِخْوَةُ لِلأَبِ وَالأُمِّ امْرَأَةً وَاحِدَةً، فَإِنْ كَانَتِ امْرَأَةً وَاحِدَةً، فَإِنَّهَا تُعَادُّ الْجَدَّ بِإِخْوَتِهَا لأَبِيهَا، مَا كَانُوا فَمَا حَصَلَ لَهُمْ وَلَهَا مِنْ شَيْءٍ كَانَ لَهَا دُونَهُمْ، مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ أَنْ تَسْتَكْمِلَ فَرِيضَتَهَا، وَفَرِيضَتُهَا النِّصْفُ مِنْ رَأْسِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَإِنْ كَانَ فِيمَا يُحَازُ لَهَا وَلإِخْوَتِهَا لأَبِيهَا فَضْلٌ عَنْ نِصْفِ رَأْسِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَهُوَ لإِخْوَتِهَا لأَبِيهَا، لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَفْضُلْ شَيْءٌ، فَلاَ شَيْءَ لَهُمْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: میراتی خوشك و برای لە باوك لەگەڵ باپیر، ئەگەر خوشك و برای لە دایك و باوكی لەگەڵ نەبێت، وەك میراتی خوشك و برای لە دایك و باوك وایە، نێرینەیان وەك نیرینەكان وایە مێینەكانیشیان

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٧، عن مالك به.

وەك مێیینەكان وایە، جا ئەگەر خوشك و برای لە دایك و باوك لەگەڵ خوشك و برای لە باوك بەیەكەوە كۆ بوونەوە، ئەوە خوشك و برای لە دایك و باوك باپیر دەگەڕێننەوە بۆ براكانیان لە باوك و لەگەڵ ئەوان حیسابی دەكەن و بە هۆی ژمارەیان باپیر قەدەغە دەكەن لە وەرگرتنی میراتی زۆر، (بەڵام) ناتوانن باپیر بگەڕێننەوە بۆ خوشك و برای لە دایك و لەگەڵ ئەوان حیسابی بكەن، چونكە ئەگەر جگە لە خوشك و برای لە دایك لەگەڵ باپیردا نەبێت، ئەوە لەگەڵ باپیردا میرات ناگرن و ماڵەكە گشتی بۆ باپیرە، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ خوشك و براكان دوای پشكی باپیر تەنها بۆ خوشك و برای لە دایك و باوكە، نەك خوشك و برای لە باوك، هیچ پشك و میراتێك بۆ خوشك و برای لە باوك نییە لەگەڵ هەبوونی خوشك و برای لە دایك و باوك، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە خوشك و برای لە دایك و باوك تەنها ئافرەتێك بێت، جا ئەگەر تەنها ئافرەتێك بوو، ئەوە باپیر دەگەڕێنێتەوە بۆ سەر خوشك و براكانی لە باوك هەر چەند بن، جا ئەوەی وەدەست دێت بۆ ئەوان و ئافرەتەكە، ئەوە بۆ ئافرەتەكەیە نەك بۆ ئەوان تا میراتەكەی خۆی تەواو دەكات، میراتەكەشی بریتییە لە نیوەی گشتی سەرمایەكە، جا لەوەی وەدەست هاتووە بۆ ئافرەتەكە و بۆ خوشك و براكانی لە باوك شتێك زیادی كرد، ئەوە بۆ خوشك و براكانیەتی لە باوك، بۆ هەر نێرێك بە ئەندازەی پشكی دوو مێ، وە ئەگەر هیچ شتێك زیادی نەكرد (لەدوای بەشی ئافرەتەكە)، ئەوە هیچیان بۆ نییە.

## ٨- میراتی داپیر (نەنك)[١]

١٤٦١- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ لَهَا أَبُو بَكْرٍ ﷺ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ، وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ شَيْئًا، فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ، فَسَأَلَ النَّاسَ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ ﷺ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْطَاهَا السُّدُسَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيُّ ﷺ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ، ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الأُخْرَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا؟ فَقَالَ لَهَا: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ، وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ

---

(١) ـ مِيرَاثُ الْجَدَّةِ.





الَّذِي قُضِيَ بِهِ إِلاَّ لِغَيْرِكِ، وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ شَيْئًا، وَلَكِنَّهُ ذَلِكَ السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا[1].

واتە: لە قەبیصەی كوڕی زوئەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: داپیرەیەك (دایكی دایك) هات بۆ لای ئیمامی ئەبو بەكر ﷺ داوای میراتی كرد، ئەبو بەكریش ﷺ گوتی: لە پەرتووكی خوادا هیچت بۆ نییە (باس نەكراوی) وە نەمزانیوە لە سوننەتی پێغەمبەری خواش ﷺ هیچت بۆ هەبێت، جا بگەڕێوە تا پرسیار لە خەڵك دەكەم (واتە تا ڕاوێژ بە هاوەڵان دەكەم)، جا پرسیاری لە خەڵك كرد، موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ گوتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم شەشیەكی دا بە داپیرەیەك، ئەبو بەكر ﷺ گوتی: ئایا كەسێكی دیكەت لەگەڵە جگە لە خۆت (كە ئەوە بزانێت)؟ جا موحەممەدی كوڕی مەسلەمە ﷺ هەڵسایەوە هەمان شتی گوت كە موغیرە گوتی، جا ئەبو بەكر ﷺ جێبەجێی كرد، جا داپیرەیەكی دیكە (كە دایكی باوك بوو) هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ و داوای میراتی لێ كرد، عومەریش ﷺ گوتی: لە پەرتووكی خوادا هیچت بۆ نییە (باس نەكراوی)، وە ئەو بڕیارەی دراویشە بۆ جگە لە تۆ بووە (واتە بۆ دایكی دایك بووە نەك دایكی باوك)، وە من هیچ زیاد ناكەم لە بابەتی میرات، بەڵام هەر ئەو شەشیەكە هەیە (كە ئەبو بەكر دایناوە) ئەگەر هەردووكتان كۆ بوونەوە (واتە دایكی دایك و دایكی باوك هەبوون)، ئەوە لە نێوانتاندا دابەش دەكرێت بەیەكسانی، وە هەر كامێكیشتان بەتەنها بوو ئەوە (گشت ماڵەكە) بۆ خۆیەتی.

**١٤٦٢- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، أَنَّهُ قَالَ: أَتَتِ الْجَدَّتَانِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، فَأَرَادَ أَنْ يَجْعَلَ السُّدُسَ لِلَّتِي مِنْ قِبَلِ الأُمِّ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: أَمَا إِنَّكَ تَتْرُكُ الَّتِي لَوْ مَاتَتْ وَهُوَ حَيٌّ كَانَ إِيَّاهَا يَرِثُ، فَجَعَلَ أَبُو بَكْرٍ السُّدُسَ بَيْنَهُمَا[2].**

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٨؛ والحدثاني: ٢١١أ في ما جاء في الزكاة؛ وفي: ٢١٢ في ما جاء في الزكاة؛ والشيباني: ٧٢٣ في الفرائض؛ وابن حنبل: ١٨٠٠٩؛ وأبو داود: ٢٨٩٤؛ والترمذي: ٢١٠١؛ وابن ماجه: ٢٧٥٦؛ وابن حبان: ٦٠٣١؛ وأبي يعلى الموصلي: ١١٩، وفي: ٥٠٠٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٣٩؛ والحدثاني: ٢١٣ في ما جاء في الزكاة، عن مالك به.




واتە: لە قاسمی كوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دوو داپیرەكان (واتە دایكی دایك و دایكی باوك) هاتن بۆ لای ئەبو بەكری صدیق، جا ویستی شەشیەك دابنێت بۆ ئەو داپیرەی لەلای دایكەوەیە (واتە دایكی دایك، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ شەشیەكی بە دایكی دایك دا، جا ئەبو بەكر ـ ﷺ ـ ویستی هیچ نەدات بە داپیرەی لای باوك، واتە دایكی باوك، چونكە هیچی دەربارە نەزانیبوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ)، جا پیاوێك لە ئەنصارییەكان پێی گوت: تۆ ئەو داپیرەیە پەراوێز دەخەی كە ئەگەر بمرێت و نەوەكەی (كە كوڕی كوڕیەتی) زیندوو بێت میراتی لێ دەگرێت (واتە ئەوە نزیكتریشە لە داپیرەكەی دیكە، چونكە داپیرەكەی دیكە بمرێت و نەوەی زیندوو بێت میراتی لێ ناگرێت)، جا ئەبو بەكر شەشیەكی كردە میرات لە نێوانیاندا.

**١٤٦٣-** عَنْ عَبْدِ رَبِّهِ بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ كَانَ لاَ يَفْرِضُ إِلاَّ لِلْجَدَّتَيْنِ[1].

واتە: لە عەبدی ڕەبیهی كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حاریسی كوڕی هیشام ﷺ بەشەمیراتی (بۆ هیچ داپیرەیەك) دانەدەنا جگە لە دوو داپیرەكان (واتە داپیرە ڕاستەخۆكان، دایكی دایك و دایكی باوك).

**١٤٦٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّ الْجَدَّةَ أُمَّ الأُمِّ لاَ تَرِثُ مَعَ الأُمِّ دِنْيَا شَيْئًا، وَهِيَ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ يُفْرَضُ لَهَا السُّدُسُ فَرِيضَةً، وَأَنَّ الْجَدَّةَ أُمَّ الأَبِ لاَ تَرِثُ مَعَ الأُمِّ، وَلاَ مَعَ الأَبِ شَيْئًا، وَهِيَ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ يُفْرَضُ لَهَا السُّدُسُ فَرِيضَةً، فَإِذَا اجْتَمَعَتِ الْجَدَّتَانِ أُمُّ الأَبِ، وَأُمُّ الأُمِّ، وَلَيْسَ لِلْمُتَوَفَّى دُونَهُمَا أَبٌ وَلاَ أُمٌّ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنِّي سَمِعْتُ أَنَّ أُمَّ الأُمِّ، إِنْ كَانَتْ أَقْعَدَهُمَا، كَانَ لَهَا السُّدُسُ، دُونَ أُمِّ الأَبِ، وَإِنْ كَانَتْ أُمُّ الأَبِ أَقْعَدَهُمَا، أَوْ كَانَتَا فِي الْقُعْدَدِ مِنَ الْمُتَوَفَّى، بِمَنْزِلَةٍ سَوَاءٍ، فَإِنَّ السُّدُسَ بَيْنَهُمَا نِصْفَانِ.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤١، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە و ڕاجیایی تیا نییە و لەسەریشی گەیشتووم بە زانایان لە شارەكەمان (ئەوەیە): داپیر، دایكی دایك هیچ میراتێك ناگرێت لەگەڵ هەبوونی دایك كە لەو نزیكترە، بەڵام جگە لەو حاڵەتە (لە حاڵەتەكانی دیكە) پشكی شەشیەكی بۆ دادەنرێت، وە داپیرە، دایكی باوك لەگەڵ هەبوونی دایك یان باوك هیچ میراتێك ناگرێت، بەڵام جگە لەو حاڵەتە (لە حاڵەتەكانی دیكە) پشكی شەشیەكی بۆ دادەنرێت، جا ئەگەر دوو داپیرەكان دایكی باوك و دایكی دایك بەیەكەوە كۆ بوونەوە و مردووەكەش باوك و دایكی نەبوو، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: من گوێبیست بووم بەوەی دایكی دایك ئەگەر نزیكتر بوو لە مردووەكە، ئەوە شەشیەك بۆ ئەوە نەك بۆ دایكی لای باوك (كە دەكاتە دایكی دایكی باوك)، وە ئەگەر دایكی باوك نزیكتر بوو لە مردووەكە (ئەوە شەشیەكەكە بۆ ئەوە نەك بۆ دایكی دایكی دایك)، یان ئەگەر هەردووكیان لە یەك ئاست بوون، ئەوە شەشیەكەكە لە نێوانیان بەنیوەیی دابەش دەكرێت.

**١٤٦٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ مِيرَاثَ لأَحَدٍ مِنَ الْجَدَّاتِ، إِلاَّ الْجَدَّتَيْنِ، لأَنَّهُ بَلَغَنِي، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَرَّثَ الْجَدَّةَ، ثُمَّ سَأَلَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، حَتَّى أَتَاهُ الثَّبَتُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ وَرَّثَ الْجَدَّةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا، ثُمَّ أَتَتِ الْجَدَّةُ الأُخْرَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: مَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ شَيْئًا، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ، فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: میرات بۆ هیچ داپیرەیەك نییە جگە لە دوو داپیرە، چونكە پێم گەیشتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ میراتی بە داپیرە داوە، دواتر ئەبو بەكر ﷺ پرسیاری دەربارەی ئەوە كرد تا دڵنیایی پێگەیشت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بەوەی میراتی بە داپیرە داوە، ئینجا بۆی جێبەجێ كرد، دواتر داپیرەیەكی دیكە هات بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ، عومەری كوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: من هیچ بابەتێك لە میرات زیاد ناكەم، ئەگەر هەردووكتان كۆ بوونەوە (واتە دایكی دایك و دایكی باوك بەیەكەوە بوونیان هەبوو) ئەوە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٣، عن مالك به.




لە نێوانتاندا (شەشیەکەکە) دابەش دەکەم (پشکی تایبەتی دانانێم)، وە هەر کامێکیشتان بەتەنها بوو ئەوە شەشیەکەکە بۆ ئەوە.

**١٤٦٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: ثُمَّ لَمْ نَعْلَمْ أَحَدًا وَرَّثَ غَيْرَ جَدَّتَيْنِ، مُنْذُ كَانَ الإِسْلاَمُ إِلَى الْيَوْمِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نەمانزانیوە کەس میراتی دابێت بە جگە لە دوو داپیرەکان (واتە جگە لە داپیرە نزیکەکان کە بریتین لە دایکی دایك و دایکی باوك) لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ[2].

## ٩- میراتی کەلالە[3]

**١٤٦٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ الْكَلاَلَةِ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَكْفِيكَ مِنْ ذَلِكَ الآيَةُ الَّتِي أُنْزِلَتْ فِي الصَّيْفِ، فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ[4].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی کەلالە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەربارەی ئەو بابەتە ئەو ئایەتەت بەسە کە لە هاوین دابەزی لە کۆتایی سوڕەتی: النساء.

**١٤٦٨-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّ الْكَلاَلَةَ عَلَى وَجْهَيْنِ: فَأَمَّا الآيَةُ الَّتِي أُنْزِلَتْ فِي أَوَّلِ سُورَةِ النِّسَاءِ، الَّتِي قَالَ اللهُ ﷻ فِيهَا: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾﴾النساء، فَهَذِهِ الْكَلاَلَةُ الَّتِي لاَ يَرِثُ فِيهَا الإِخْوَةُ لِلأَمِّ، حَتَّى لاَ يَكُونَ وَلَدٌ وَلاَ وَالِدٌ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٣، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لای هەندێك لە زانایان هاتووە کە ئیمامی زەید و عەلی و ئیبن عەباس و ئیبن مەسعود (خوا لێیان ڕازی بێت) میراتیان داوە بە دایکی باپیری لە باوك.

(٣) ـ مِيرَاثُ الْكَلاَلَةِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٥، عن مالك به.

وَأَمَّا الآيَةُ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ، الَّتِي قَالَ اللهُ تعالى فِيهَا: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾ النساء، قَالَ مَالِكٌ: فَهَذِهِ الْكَلاَلَةُ الَّتِي تَكُونُ فِيهَا الإِخْوَةُ عَصَبَةً، إِذَا لَمْ يَكُنْ وَلَدٌ، فَيَرِثُونَ مَعَ الْجَدِّ فِي الْكَلاَلَةِ[1].

فَالْجَدُّ يَرِثُ مَعَ الإِخْوَةِ، لأَنَّهُ أَوْلَى بِالْمِيرَاثِ مِنْهُمْ، وَذَلِكَ أَنَّهُ يَرِثُ مَعَ ذُكُورِ وَلَدِ الْمُتَوَفَّى السُّدُسَ، وَالإِخْوَةُ لاَ يَرِثُونَ مَعَ ذُكُورِ وَلَدِ الْمُتَوَفَّى شَيْئًا، وَكَيْفَ لاَ يَكُونُ كَأَحَدِهِمْ، وَهُوَ يَأْخُذُ السُّدُسَ مَعَ وَلَدِ الْمُتَوَفَّى؟ فَكَيْفَ لاَ يَأْخُذُ الثُّلُثَ مَعَ الإِخْوَةِ، وَبَنُو الأُمِّ يَأْخُذُونَ مَعَهُمُ الثُّلُثَ؟ فَالْجَدُّ هُوَ الَّذِي حَجَبَ الإِخْوَةَ لِلأُمِّ، وَمَنَعَهُمْ مَكَانُهُ الْمِيرَاثَ، فَهُوَ أَوْلَى بِالَّذِي كَانَ لَهُمْ، لأَنَّهُمْ سَقَطُوا مِنْ أَجْلِهِ، وَلَوْ أَنَّ الْجَدَّ لَمْ يَأْخُذْ ذَلِكَ الثُّلُثَ، أَخَذَهُ بَنُو الأُمِّ، فَإِنَّمَا أَخَذَ مَا لَمْ يَكُنْ يَرْجِعُ إِلَى الإِخْوَةِ لِلأَبِ، وَكَانَ الإِخْوَةُ لِلأُمِّ هُمْ أَوْلَى بِذَلِكَ الثُّلُثِ مِنَ الإِخْوَةِ لِلأَبِ، وَكَانَ الْجَدُّ هُوَ أَوْلَى بِذَلِكَ مِنَ الإِخْوَةِ لِلأُمِّ[2].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ڕاجیایی تیا نییە و لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (ئەوەیە): کەلالە دوو جۆرە: هەرچی ئەوەیانە کە ئایەت دەربارەی دابەزێندراوە لە سەرەتای سورەتی «النساء» کە خوای پەروەردگار دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ﴿١٢﴾﴾النساء، ئەو کەلالە ئەوەیانە کە خوشك و برای لە دایك میرات ناگرن، تاوەکوو کوڕ و باوك نەبن.

بەڵام هەرچی ئەو ئایەتەیە کە لە کۆتایی سورەتی «النسا»ـە کە خوای پەروەردگار ﷻ دەربارەی فەرموویەتی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٦؛ وفي: ٣٠٤٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٨، عن مالك به.

﴿فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾النساء، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو کەلالەیان ئەوەیانە کە خوشك و برا تیایدا عەصەبەیە، ئەگەر منداڵ بوونی نەبێت، (ئەوکات) لەگەڵ باپیر میرات دەبەن لە کەلالەدا.

کەواتە باپیر لەگەڵ خوشك و برا میرات دەگرێت، چونکە ئەو لەوان لە پێشترە لە میراتگرتن، لەبەر ئەوەی باپیر شەشیەکی میرات دەگرێت لەگەڵ هەبوونی کوڕی مردووەکە، (لە کاتێکدا) خوشك و برا هیچ میراتێك ناگرن لەگەڵ هەبوونی کوڕی مردووەکە، کەواتە چۆن وەکوو یەکێك لە خوشك و براکان نابێت لە کاتێکدا شەشیەك دەگرێت لەگەڵ هەبوونی کوڕی مردووەکەش (کە بەهێزتر و لەپێشترە)؟ جا چۆن لەگەڵ خوشك و برا سێیەك نابات لە کاتێکدا منداڵی لە دایك سێیەکیان لەگەڵ دەبات؟ باپیر ئەو کەسەیە کە خوشك و برای لە دایك حوجب دەکات و لە میرات و بێبەشیان دەکات، کەواتە ئەو لەپێشترە بەو میراتەی بۆ ئەوان هەیە، چونکە ئەوان بۆ ئەو لاچوون و بێبەش بوون لە میرات، جا ئەگەر باپیر ئەو سێیەکە وەرنەگرێت ئەوە منداڵەکانی دایك وەریدەگرن، لەبەر ئەوە وەریدەگرن چونکە ناگەڕێتەوە بۆ خوشك و برای لە دایك، خوشك و برای لە دایکیش لەپێشترن لە خوشك و برای لە باوك بەو سێیەکە، باپیریش لەپێشترە بەوە لە خوشك و برای لە دایك (کەواتە دەبێ بۆ ئەو بێت).

### ١٠- ئەوەی دەربارەی پور هاتووە[١]

**١٤٦٩-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَنْظَلَةَ الزُّرَقِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَنْ مَوْلًى لِقُرَيْشٍ كَانَ قَدِيمًا، يُقَالُ لَهُ: ابْنُ مِرْسَى، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَلَمَّا صَلَّى الظُّهْرَ، قَالَ: يَا يَرْفَأُ هَلُمَّ ذَلِكَ الْكِتَابَ، لِكِتَابٍ كَتَبَهُ فِي شَأْنِ الْعَمَّةِ، فَنَسْأَلَ عَنْهَا وَنَسْتَخْبِرْ فِيهَا، فَأَتَاهُ بِهِ يَرْفَأُ، فَدَعَا بِتَوْرٍ أَوْ قَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ، فَمَحَا ذَلِكَ الْكِتَابَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: لَوْ رَضِيَكِ اللهُ أَقَرَّكِ، لَوْ رَضِيَكِ اللهُ أَقَرَّكِ[٢].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْعَمَّةِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٤٩؛ والحدثاني: ٢١٤ في ما جاء في الزكاة؛ والشيباني:

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەنزەلەی زوڕقییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی لە خزمەتکارێکی قوڕەیشەوە هەواڵی داوە کە پێی دەگوترا: ئیبنو میرسا، بەوەی گوتوویەتی: لەلای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بووم، کاتێ نوێژی نیوەڕۆی کرد گوتی: ئەی یەرفەء ئەو نووسراوە بێنە، مەبەستی نووسراوێك بوو دەربارەی پلك (پور)، تا پرسیاری دەربارە بکەین و هەواڵی دەربارە بدەین، یەرفەئیش بۆی هێنا، جا داوای تەشتێك یان قاپێکی کرد و نووسراوەکەی تیا سڕیەوە، دواتر گوتی: ئەگەر خوای پەروەردگار ﷻ ڕازی بووایە (لەگەڵ میراتگرەکانی دیکە لە قوڕئاندا) جێگیری دەکردی، ئەگەر خوای پەروەردگار ﷻ ڕازی بووایە جێگیری دەکردی.

**١٤٧٠**- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ كَثِيراً يَقُولُ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: عَجَبًا لِلْعَمَّةِ تُورَثُ وَلاَ تَرِثُ[1].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی زۆر گوێبیستی باوکی بووە دەیگوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەیگوت: عەجایب لە پلك (پور) میراتی لێ دەگیرێ و میرات ناگرێ.

## ١١- میراتی خزمی پشتێ (عەصەبە)[2]

**١٤٧١**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، فِي وِلاَيَةِ الْعَصَبَةِ: أَنَّ الأَخَ لِلأَبِ وَالأُمِّ، أَوْلَى بِالْمِيرَاثِ مِنَ الأَخِ لِلأَبِ، وَالأَخُ لِلأَبِ، أَوْلَى بِالْمِيرَاثِ مِنْ بَنِي الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَبَنُو الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، أَوْلَى مِنْ بَنِي الأَخِ لِلأَبِ، وَبَنُو الأَخِ لِلأَبِ، أَوْلَى مِنْ بَنِي ابْنِ الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَبَنُو ابْنِ الأَخِ لِلأَبِ، أَوْلَى مِنَ الْعَمِّ أَخِي الأَبِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَالْعَمُّ أَخُو الأَبِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، أَوْلَى مِنَ الْعَمِّ أَخِي الأَبِ لِلأَبِ، وَالْعَمُّ

٧٢٥ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٠؛ والحدثاني: ٢١٥ في ما جاء في الزكاة؛ والشيباني: ٧٢٤ في الفرائض؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣١١١٥، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مِيرَاثُ وِلاَيَةِ الْعَصَبَةِ.




أَخُو الأَبِ لِلأَبِ، أَوْلَى مِنْ بَنِي الْعَمِّ أَخِي الأَبِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَابْنُ الْعَمِّ لِلأَبِ، أَوْلَى مِنْ عَمِّ الأَبِ أَخِي أَبِي الأَبِ لِلأَبِ وَالأُمِّ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە، هیچ ڕاجیایی تیا نییە و لەسەریشی گەیشتووم بە زانایان لە ناوچەكەمان دەربارەی ویلایەتی عەصەبەیە ـ خزمانی پشتێ ـ (كە بەم شێوەیەیە): برای لە دایك و باوك لەپێشترە بە میرات لە برای لە باوك، وە برای لە باوك لەپێشترە بە میرات لە كوڕەكانی برا لە دایك و باوك، وە كوڕەكانی برا لە دایك و باوك لەپێشترن لە كوڕەكانی برا لە باوك، وە كوڕەكانی برا لە باوك لەپێشترن لە كوڕەكانی كوڕی برا لە دایك و باوك، وە كوڕەكانی كوڕی برا لە باوك لەپێشترە لە مام، برای باوك لە دایك و باوك، وە مام، برای باوك لە دایك و باوك لەپێشترە لە مام، برای باوك لە باوك، وە مام، برای باوك لە باوك، لەپێشترە لە كوڕەكانی مام، برای باوك لە باوك و دایك، وە كوڕی مام لە باوك، لەپێشترە لە مامی باوك، برای باوكی باوك لە باوك و دایك.

**١٤٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ شَيْءٍ سُئِلْتَ عَنْهُ مِنْ مِيرَاثِ الْعَصَبَةِ، فَإِنَّهُ عَلَى نَحْوِ هَذَا: انْسُبِ الْمُتَوَفَّى وَمَنْ يُنَازِعُ فِي وِلاَيَتِهِ مِنْ عَصَبَتِهِ، فَإِنْ وَجَدْتَ أَحَدًا مِنْهُمْ يَلْقَى الْمُتَوَفَّى إِلَى أَبٍ لاَ يَلْقَاهُ أَحَدٌ مِنْهُمْ إِلَى أَبٍ دُونَهُ، فَاجْعَلْ مِيرَاثَهُ لِلَّذِي يَلْقَاهُ إِلَى الأَبِ الأَدْنَى، دُونَ مَنْ يَلْقَاهُ إِلَى فَوْقِ ذَلِكَ، فَإِنْ وَجَدْتَهُمْ كُلَّهُمْ يَلْقَوْنَهُ إِلَى أَبٍ وَاحِدٍ يَجْمَعُهُمْ جَمِيعًا، فَانْظُرْ أَقْعَدَهُمْ فِي النَّسَبِ، فَإِنْ كَانَ ابْنَ أَبٍ فَقَطْ، فَاجْعَلِ الْمِيرَاثَ لَهُ دُونَ الأَطْرَفِ، وَإِنْ كَانَ ابْنَ أَبٍ وَأُمٍّ، فَإِنْ وَجَدْتَهُمْ مُسْتَوِينَ، يَنْتَسِبُونَ مِنْ عَدَدِ الآبَاءِ إِلَى عَدَدٍ وَاحِدٍ، حَتَّى يَلْقَوْا نَسَبَ الْمُتَوَفَّى جَمِيعًا، وَكَانُوا كُلُّهُمْ جَمِيعًا بَنِي أَبٍ، أَوْ بَنِي أَبٍ وَأُمٍّ، فَاجْعَلِ الْمِيرَاثَ بَيْنَهُمْ سَوَاءً، وَإِنْ كَانَ وَالِدُ بَعْضِهِمْ أَخَا وَالِدِ الْمُتَوَفَّى لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَكَانَ مَنْ سِوَاهُ مِنْهُمْ، إِنَّمَا هُوَ أَخُو أَبِي الْمُتَوَفَّى لأَبِيهِ فَقَطْ، فَإِنَّ الْمِيرَاثَ لِبَنِي أَخِي الْمُتَوَفَّى لأَبِيهِ وَأُمِّهِ، دُونَ بَنِي الأَخِ لِلأَبِ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ تعالى قَالَ فِي كِتَابِهِ:﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾ ﴾الأنفال[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٨، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت شتێك كە پرسیارت لێ بكرێت دەربارەی عەصەبە (خزمانی پشتێ)، وەڵامەكەی بەو شێوەیەیە: مردووەكە و ئەوانەی ڕكابەری دەكەن لە نزیكایەتی لە خزمانی پشتێی دیارییان بكە، جا ئەگەر كەسێكت لەوان بینی لە باوك دەگەیشتەوە مردووەكە و كەس لەوان لە باوك نەدەگەیشتەوە پێی جگە لەو، ئەوە میراتەكە بۆ ئەو كەسە دابنێ كە بە باوكی نزیك دەگاتەوە مردووەكە نەك ئەوەی بە سەرەوەتر پێی بگات، جا ئەگەر بینیت گشتیان دەگەنەوە مردووەكە لە یەك باوك و ئەو كۆیان دەكاتەوە، ئەوە دیقەت بدە لەوانەی لە نەسەب نزیكترن، جا ئەگەر كوڕی باوك بەتەنها بوو، ئەوە میراتەكە بۆ ئەو دابنێ نەك بۆ دوورەكان، وە ئەگەر هاتوو كوڕی لە باوك و دایك هەبوون، ئەگەر بینیت لە یەك ئاستن نەسەبیان شۆڕ دەبێتەوە لە چەند باوكێكەوە بۆ یەك باوك تا دەگەنەوە بە نەسەبی كەسی مردوو، وە گشتیان كوڕ بن لە باوك یان كوڕ بن لە باوك و دایك، ئەوە میراتەكەیان بەیەكسانی لە نێوان دابەش بكە، وە ئەگەر باوكی هەندێكیان برای باوكی كەسە مردووەكە بوو لە باوك و دایك، وە ئەوانەی دیكە تەنها برای باوكی مردووەكە بوون لە باوك، ئەوە میراتەكە بۆ برای مردووەكەیە لە دایك و باوك، نەك كوڕەكانی برا لە باوك، چونكە خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٧٥﴾ ﴾الأنفال، (واتە: هەروەها ئەوانەی خزمی یەكدین هەندێكیان (بۆ میراتگرتن) لەپێشترن بەهەندێكی دیكە لە كتێبی خوادا، بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە).

١٤٧٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْجَدُّ أَبُو الأَبِ أَوْلَى، مِنْ بَنِي الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَأَوْلَى مِنَ الْعَمِّ أَخِي الأَبِ لِلأَبِ وَالأُمِّ بِالْمِيرَاثِ، وَابْنُ الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، أَوْلَى مِنَ الْجَدِّ بِوَلاَءِ الْمَوَالِي[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: باپیر، باوكی باوك لە كوڕەكانی برا لە دایك و باوك، وە لە مام، برای باوك لە باوك و دایك، لەپێشترە لە میرات، وە كوڕە برای لە دایك و باوك لەپێشترە لە باپیر بۆ ویلایەتی بەندەی ئازادكراو (واتە لەپێشترە بۆ میراتگرتن لە كۆیلەی ئازادكراو).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٩، عن مالك به.




## ١٢- ئەو کەسەی میراتی بۆ نییە[1]

**١٤٧٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّ ابْنَ الأَخِ لِلأُمِّ، وَالْجَدَّ أَبَا الأُمِّ، وَالْعَمَّ أَخَا الأَبِ لِلأُمِّ، وَالْخَالَ، وَالْجَدَّةَ أُمَّ أَبِي الأُمِّ، وَابْنَةَ الأَخِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، وَالْعَمَّةَ، وَالْخَالَةَ، لاَ يَرِثُونَ بِأَرْحَامِهِمْ شَيْئًا.

قَالَ: وَإِنَّهُ لاَ تَرِثُ امْرَأَةٌ، هِيَ أَبْعَدُ نَسَبًا مِنَ الْمُتَوَفَّى، مِمَّنْ سُمِّيَ فِي هَذَا الْكِتَابِ، بِرَحِمِهَا شَيْئًا، وَإِنَّهُ لاَ يَرِثُ أَحَدٌ مِنَ النِّسَاءِ شَيْئًا، إِلاَّ حَيْثُ سُمِّينَ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهُ ﷻ ذَكَرَ فِي كِتَابِهِ: مِيرَاثَ الأُمِّ مِنْ وَلَدِهَا، وَمِيرَاثَ الْبَنَاتِ مِنْ أَبِيهِنَّ، وَمِيرَاثَ الزَّوْجَةِ مِنْ زَوْجِهَا، وَمِيرَاثَ الأَخَوَاتِ لِلأَبِ والأم، وَمِيرَاثَ الأَخَوَاتِ لِلأَب، وَمِيرَاثَ الأَخَوَاتِ لِلأُمِّ، وَوَرِثَتِ الْجَدَّةُ بِالَّذِي جَاءَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهَا، وَالْمَرْأَةُ تَرِثُ مَنْ أَعْتَقَتْ هِيَ نَفْسُهَا، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۝٥﴾ الأحزاب[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە و ڕاجیایی تیا نییە و لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (بریتییە لەوەی): کوڕی برا لە دایك و باپیر باوکی دایك و مام برای باوك لە دایك و خاڵ و داپیر دایکی باوکی دایك و کچە برای لە باوك و دایك و پوری لای باوك و پوری لای دایك (واتە خوشکی دایك و خوشکی باوك)، (ئەمانە هیچیان) بە هۆی خزمایەتیی ژنخوازی میرات ناگرن.

گوتوویەتی: هیچ ئافرەتێك بە خزمایەتیی ژنخوازی میرات ناگرێت کە نەسەبی دوورتر بێت لە مردووەکە لەو کەسانەی لەو پەرتووکە باس کراون، وە هیچ ئافرەتێك میرات ناگرێت تەنها ئەوانە نەبن کە باس کراون، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەی تەنها باسی ئەوانەی کردووە: میراتگرتنی دایك لە منداڵەکەی و میراتگرتنی کچان لە باوکیان و میراتگرتنی خێزان لە مێردەکەی و میراتگرتنی خوشکی لە باوك و دایك میراتگرتنی خوشکی لە باوك و میراتگرتنی خوشکی لە

---

(١) ـ مَنْ لَا مِيرَاثَ لَهُ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٠، عن مالك به.




دایك، وە داپیریش میرات دەگرێت لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە (میراتی پێداوە)، وە ئافرەت میرات لەو کەسە دەگرێت کە خۆی ئازادی دەکات، چونکە خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۝٥﴾الأحزاب، (واتە: (بەندەکان) براتانن لە ئایینیدا، وە مەولاتانن (ویلایەتییان بۆ ئێوەیە)).

## ١٣- میراتی خاوەنئایینەکان[1]

**١٤٧٥-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ[2].

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت.

**١٤٧٦-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ: إِنَّمَا وَرِثَ أَبَا طَالِبٍ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ، وَلَمْ يَرِثْهُ عَلِيٌّ، قَالَ: فَلِذَلِكَ تَرَكْنَا نَصِيبَنَا مِنَ الشِّعْبِ[3].

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە هەواڵی بە ڕاوی دوای خۆی داوە بەوەی: تەنها عەقیل و تاڵیب میراتیان لە ئەبو تاڵیب گرت (چونکە ئەوان ئەو کات وەك ئەبو تاڵیب کافر بوون لە کاتی مردنی ئەبو تاڵیب، بەڵام دواتر عەقیلیش لەساڵی ئازادکردنی مەککە مسوڵمان بوو، بەڵام تاڵیب بەکافری مرد)، بەڵام ئیمامی عەلی میراتی لێ نەگرت (هەرچەندە ئەویش کوڕی بوو، چونکە ئەو مسوڵمان بوو)، دەڵێ: لەبەر ئەو هۆکارە (واتە لەبەر جیاوازی ئایین) وازمان لە پشکەکەی خۆمان هێنا لە سەروەت و سامانی دۆڵەکە.

---

(١) ـ مِيرَاثُ أَهْلِ الْمِلَلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦١؛ والشيباني: ٧٢٨ في الفرائض؛ وابن حنبل: ٢١٨٦٢؛ وشرح معاني الآثار: ٥٢٩٦؛ والقابسي: ٦٥، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٢؛ والحدثاني: ٢١٥ ب في ما جاء في الزكاة؛ والشيباني: ٧٢٩ في الفرائض؛ والشافعي: ١٧٦٥، كلهم عن مالك به.




١٤٧٧- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ الأَشْعَثِ أَخْبَرَهُ: أَنَّ عَمَّةً لَهُ يَهُودِيَّةً أَوْ نَصْرَانِيَّةً تُوُفِّيَتْ، وَأَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ الأَشْعَثِ ذَكَرَ ذَلِكَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، وَقَالَ لَهُ: مَنْ يَرِثُهَا؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: يَرِثُهَا أَهْلُ دِينِهَا، ثُمَّ أَتَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ ﷺ: أَتَرَانِي نَسِيتُ مَا قَالَ لَكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: يَرِثُهَا أَهْلُ دِينِهَا[١].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، (گوتوویەتی): موحەممەدی کوڕی ئەشعەس هەواڵی پێ داوە بەوەی: پورێکی خۆی کە جوولەکە بوو ـ یان گاور بوو ـ وەفاتی کرد، جا موحەممەدی کوڕی ئەشعەس ئەوەی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باس کرد و پێی گوت: کێ میراتی لێ دەگرێ؟ عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ پێی گوت: خزمی ئایینی خۆی میراتی لێ دەگرن، دواتر هات بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان و ﷺ پرسیاری دەربارەی ئەوە لێ کرد، عوسمانیش ﷺ پێی گوت: ئایا پێت وایە بیرم چووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ چی پێ گوتی: خزمی ئایینی خۆی میراتی لێ دەگرن.

١٤٧٨- عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ ﷺ أَنَّ نَصْرَانِيًّا أَعْتَقَهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ هَلَكَ، قَالَ إِسْمَاعِيلُ ﷺ: فَأَمَرَنِي عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ: أَنْ أَجْعَلَ مَالَهُ فِي بَيْتِ الْمَالِ[٢].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو حەکیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): گاورێك هەبوو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ ئازادی کردبوو، جا مرد، ئیسماعیل ﷺ دەڵێ: جا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ فەرمانی پێ کردم بەوەی ماڵ و سەروەتەکەی بخەمە ناو خەزێنەی مسوڵمانانەوە (چونکە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نەدەبووە میراتگری لەبەر جیاوازیی ئایین).

١٤٧٩- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ الثِّقَةِ عِنْدَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: أَبَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ أَنْ يُوَرِّثَ أَحَدًا مِنَ الأَعَاجِمِ، إِلاَّ أَحَدًا وُلِدَ فِي الْعَرَبِ[٣].

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٤؛ والحدثاني: ٢١٦أ في ما جاء في الزكاة، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٦٢؛ وفي: ٣٠٦٥؛ والحدثاني: ٢١٦ب في ما جاء في الزكاة؛ وفي: ٤٣٩ في المكاتب والمدبر، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٦؛ والحدثاني: ٢١٦ج في ما جاء في الزكاة؛ والشيباني:

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە کەسێکی گێڕاوەتەوە کە جێی متمانەیە لەلای ئەو، ئەویش گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ڕەتی کردەوە هیچ کەسێك بکات بە میراتگر لە عەجەمەکان (واتە کەسی بەبێ بەڵگە نەدەکرد بە میراتگر)، تەنها کەسێك نەبێت لەناو ئیسلام لەدایك بووبێت (و ڕەچەڵەکی دیار بێت).

١٤٨٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ جَاءَتِ امْرَأَةٌ حَامِلٌ مِنْ أَرْضِ الْعَدُوِّ، فَوَضَعَتْ فِي أَرْضِ الْعَرَبِ، فَهُوَ وَلَدُهَا يَرِثُهَا إِنْ مَاتَتْ، وَتَرِثُهُ إِنْ مَاتَ، مِيرَاثُهَا فِي كِتَابِ اللهِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتێکی دووگیان لە ناوچەی دوژمنەوە هات و حەملەکەی لە زەوی ئیسلام دانا، (منداڵەکە) منداڵی ئەوە و میرات لە دایکی دەگرێت ئەگەر (دایکی) مرد، وە دایکەکەش میراتی لێ دەگرێت ئەگەر ئەو مرد، میراتی دایکەکە لە پەرتووکی خوادایە ﷻ.

١٤٨١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، وَالسُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا: أَنَّهُ لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ بِقَرَابَةٍ، وَلاَ وَلاَءٍ، وَلاَ رَحِمٍ، وَلاَ يَحْجُبُ أَحَدًا عَنْ مِيرَاثِهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ كُلُّ مَنْ لاَ يَرِثُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ دُونَهُ وَارِثٌ، فَإِنَّهُ لاَ يَحْجُبُ أَحَدًا عَنْ مِيرَاثِهِ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە و ڕێبازێکە ڕاجیایی تیا نییە و لەسەری گەیشتووم بە زانایان لە مەدینە (بریتییە لەوەی): مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت بەهۆی خزمایەتی و وەلائی ئازادکردن و تێکەڵی بە ژنوژنخوازی، وە کەسیش ڕێگری و حوجب لە میراتی کافرەکە دروست ناکات.

---

٧٣٣ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٧، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٦٨؛ وابن حنبل: ٢١٨٦٢؛ والقابسي: ٦٥، كلهم عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها بەهەمان شێوەیە ئەو کەسەی میرات ناگرێت، کاتێ هیچ میراتگرێك بونیان نییە، ئەوە کەس حوجب و قەدەغە ناکات لە میراتەکەی (چونکە کە میرات نەبات چۆن حوجب دەکات).

## ١٤- میراتی ئەو کەسەی بە کوشتن حاڵەکەی نەزانرێت ـ کە ئاخۆ کوژراوە یان ماوە ـ، یان بە شتی دیکە (وەك ونبوون)[١]

**١٤٨٢- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ عُلَمَائِهِمْ: أَنَّهُ لَمْ يَتَوَارَثْ مَنْ قُتِلَ يَوْمَ الْجَمَلِ، وَيَوْمَ صِفِّينَ، وَيَوْمَ الْحَرَّةِ، ثُمَّ كَانَ يَوْمَ قُدَيْدٍ، فَلَمْ يُوَرَّثْ أَحَدٌ مِنْهُمْ مِنْ صَاحِبِهِ شَيْئًا، إِلاَّ مَنْ عُلِمَ أَنَّهُ قُتِلَ قَبْلَ صَاحِبِهِ[٢].**

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە چەندین لە زانایان گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئەو کەسانەی لە ڕۆژی جەمەل و صیفین و حەڕە و قودەید کوژران، هیچ کەسێك لەوان میراتی لەوەی دیکە نەگرت (چونکە نەدەزانرا کامیان پێش کامیان کوژراوە)، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە بەر لەوەی دیکە کوژرابوو (و بەڕوونی ئەوە دەزانرا).

**١٤٨٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ، وَلاَ شَكَّ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا، وَكَذَلِكَ الْعَمَلُ فِي كُلِّ مُتَوَارِثَيْنِ هَلَكَا بِغَرَقٍ أَوْ قَتْلٍ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ مِنَ الْمَوْتِ، إِذَا لَمْ يُعْلَمْ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلَ صَاحِبِهِ، فَإِذَا لَمْ يُعْلَمْ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلَ صَاحِبِهِ، لَمْ يَرِثْ أَحَدٌ مِنْهُمَا مِنْ صَاحِبِهِ شَيْئًا، وَكَانَ مِيرَاثُهُمَا لِمَنْ بَقِيَ مِنْ وَرَثَتِهِمَا، يَرِثُ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَرَثَتُهُ مِنَ الأَحْيَاءِ[٣].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتە (واتە میراتنەگرتن لە بەینی دوو کەس کە نەزانرێت کامیان پێشتر مردوون) ڕاجیایی تیا نییە و هیچ زانایێکی شارەکەمان گومانی تیا نییە، جا کارەکە بە هەمان شێوەیە دەربارەی دوو

---

(١) ـ مِيَرَاثُ مَنْ جُهِلَ أَمْرُهُ بِالْقَتْلِ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥١؛ والحدثاني: ٢١٥أ في ما جاء في الزكاة، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٢، عن مالك به.

میراتگر کە بەیەکەوە بمرن بە خنکان یان کوشتن یان هەر جۆرێکی دیکە لە مردن، ئەگەر نەزانرا کامیان بەر لەوەی دیکەیان مردووە، جا ئەگەر نەزانرا کامیان پێشی ئەوەیدی مردووە، ئەوە هیچ کامێکیان میرات لەوەیدی ناگرێت، وە میراتەکەیان بۆ ئەو کەسانەیە کە ماونەتەوە لە میراتگرەکانیان، میراتگرە زیندووەکانی هەر یەکێکیان میراتیان لێ دەگرن.

**١٤٨٤- [فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي أَنْ يَرِثَ أَحَدٌ أَحَدًا بِالشَّكِّ، وَلاَ يَرِثُ أَحَدٌ أَحَدًا إِلاَّ بِالْيَقِينِ مِنَ الْعِلْمِ، وَالشُّهَدَاءِ، وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ يَهْلَكُ هُوَ وَمَوْلاَهُ الَّذِي أَعْتَقَهُ أَبُوهُ، فَيَقُولُ بَنُو الرَّجُلِ الْعَرَبِيِّ: قَدْ وَرِثَهُ أَبُونَا، فَلَيْسَ ذَلِكَ لَهُمْ أَنْ يَرِثُوهُ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلاَ شَهَادَةٍ، إِنَّهُ مَاتَ قَبْلَهُ، وَإِنَّمَا يَرِثُهُ أَوْلَى النَّاسِ بِهِ مِنَ الأَحْيَاءِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ کەس لەسەر بنەمای گومان میرات لە کەس بگرێت، وە نابێ کەس میرات لەکەس بگرێت تەنها بەیەقین نەبێت، لەسەر بنەمای هەبوونی زانیاری و شاهێد، چونکە پیاو هەیە خۆی و گەورەکەی دەمرێت کە ئازادی کردووە، جا کوڕەکانی پیاوە ئازادەکە دەڵێن: باوکم میراتی لێ دەگرێت، (نەخێر) بۆیان نییە میراتی لێ بگرن بەبێ زانست و شاهێدی کە (بیسەلمێنێ) بەر لەو مردووە، (بەڵکوو) تەنها نزیکترین کەسەکان لە میراتگرە زیندووەکان میراتی لێ دەگرن.

**١٤٨٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِنْ ذَلِكَ أَيْضًا الأَخَوَانِ لِلأَبِ وَالأُمِّ، يَمُوتَانِ وَلأَحَدِهِمَا وَلَدٌ، وَالآخَرُ لاَ وَلَدَ لَهُ، وَلَهُمَا أَخٌ لأَبِيهِمَا، فَلاَ يُعْلَمُ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ: فَمِيرَاثُ الَّذِي لاَ وَلَدَ لَهُ، لأَخِيهِ لأَبِيهِ، وَلَيْسَ لِبَنِي أَخِيهِ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ، شَيْءٌ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوەیە حاڵی دوو برای لە باوك و دایك، کە بەیەکەوە دەمرن و یەکێکیان منداڵی هەیە و ئەوەی دیکەیان منداڵی نییە، وە هەردووکیان برای لە باوکیان هەیە و نازانرێت کامیان

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٤، عن مالك به.




پێشتر مردوون: ئەوە میراتی ئەو کەسەی منداڵی نییە بۆ برای لە باوکیەتی، هیچ بۆ کوڕەکانی برای لە دایك و باوکی نییە.

١٤٨٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِنْ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنْ تَهْلَكَ الْعَمَّةُ وَابْنُ أَخِيهَا، أَوِ ابْنَةُ الأَخِ وَعَمُّهَا، فَلاَ يُعْلَمُ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ، فَإِنْ لَمْ يُعْلَمْ أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ، لَمْ يَرِثِ الْعَمُّ مِنِ ابْنَةِ أَخِيهِ شَيْئًا، وَلاَ يَرِثُ ابْنُ الأَخِ مِنْ عَمَّتِهِ شَيْئًا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە لەو بابەتەیە: پورێك و کوڕی براکەی بمرن، یان کچی برا و مامی بمرن و نەزانرێت کامیان پێشتر مردوون، جا ئەگەر نەزانرا کامیان پێشتر مردووە، ئەوە مام هیچ میراتێك لە کچی براکەی ناگرێت، وە کوڕی براش هیچ میراتێك لە پوری ناگرێت.

### ١٥- میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە و منداڵی زینا[2]

١٤٨٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ وَوَلَدِ الزِّنَا، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ وَرِثَتْهُ أُمُّهُ حَقَّهَا فِي كِتَابِ اللهِ ﷻ، وَإِخْوَتُهُ لأُمِّهِ حُقُوقَهُمْ، وَيَرِثُ الْبَقِيَّةَ، مَوَالِي أُمِّهِ، إِنْ كَانَتْ مَوْلاَةً، وَإِنْ كَانَتْ عَرَبِيَّةً، وَرِثَتْ حَقَّهَا، وَوَرِثَ إِخْوَتُهُ لأُمِّهِ حُقُوقَهُمْ، وَكَانَ مَا بَقِيَ لِلْمُسْلِمِينَ[3].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەربارەی منداڵی ئافرەتی مولاعەنە و منداڵی زینا گوتوویەتی: ئەگەر مرد دایکی پشکەمیراتی خۆی لێ دەگرێت، مافەکەی لە قورئاندا هەیە (کە بریتییە لە شەشیەك یان سێیەك)، وە براکانی لە دایکی ماف و پشکی خۆیان وەردەگرن (کە بریتییە لە شەشیەك)، وە ئەوەی دەمێنێتەوە خزمانی ئازادکەرەکەی دایکی وەریدەگرن ئەگەر دایکەکەی بەندەی ئازادکراوی ئەوان بوو، وە ئەگەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٣٠٥٥، عن مالك به.

(٢) ـ مِيرَاثُ وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ وَوَلَدِ الزِّنَا.

(٣) ـ مقطوع صحيح.

خۆی لە بنچینە هەر ئازاد بوو ئەوە پشکەمیراتی خۆی دەگرێت، هەروەها برای لای دایکیشی میراتەکەیان دەگرن، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ مسوڵمانانە (واتە بۆ بەیتولمالە).

**١٤٨٨-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَلَغَنِي عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، مِثْلُ ذَلِكَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ أَدْرَكْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا.

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ هەمان شتم پێ گەیشتووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەسەر ئەو (بۆچوونە) گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (مەدینە).



# پەرتووكی

# ژن و ژنخوازی[1]



---

(١) ـ كِتَابُ النِّكَاحِ.




## ١- ئەوەی هاتووە دەربارەی خوازبێنی[١]

**١٤٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی برا مسوڵمانەکەیدا.

**١٤٩٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی برا مسوڵمانەکەیدا.

**١٤٩١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ قَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، لاَ يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، أَنْ يَخْطُبَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ، فَتَرْكَنَ إِلَيْهِ، وَيَتَّفِقَانِ عَلَى صَدَاقٍ وَاحِدٍ مَعْلُومٍ، وَقَدْ تَرَاضَيَا، فَهِيَ تَشْتَرِطُ عَلَيْهِ لِنَفْسِهَا، فَتِلْكَ الَّتِي نَهَى أَنْ يَخْطُبَهَا الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلَمْ يَعْنِ بِذَلِكَ، إِذَا خَطَبَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَلَمْ يُوَافِقْهَا أَمْرُهُ، وَلَمْ تَرْكَنْ إِلَيْهِ، أَنْ لاَ يَخْطُبَهَا أَحَدٌ، فَهَذَا بَابُ فَسَادٍ يَدْخُلُ عَلَى النَّاسِ[٤].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ـ والله أعلم ـ پێمان وایە لێکدانەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ((با هیچ کەسێك لە ئێوە خوازبێنی نەکات بەسەر خوازبێنی برا مسوڵمانەکەیدا)) بریتییە لەوەی: پیاوێك خوازبێنی ئافرەتێك بکات و ئافرەتەکەش دڵی بۆ لای پیاوەکە

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْخِطْبَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٦؛ والشيباني: ٥٢٨ في النكاح؛ والشافعي: ١٣٢٤؛ وابن حنبل: ٩٩٥٢؛ والنسائي: ٣٢٤٠؛ والقابسي: ٩٧؛ وفي: ٣٥١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٤؛ والحدثاني: ٣١٥ في النكاح؛ والشافعي: ٩٠٨؛ وفي: ١٣٢٣؛ وابن حبان: ٤٠٤٧؛ والقابسي: ٢٢٩، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٧، عن مالك به.





بچێت و ڕێك بکەون لەسەر مارەیێکی دیاریکراو و هەردووکیان ڕازی بووبن، کەواتە ئافرەتەکە مەرجی بۆ خۆی داناوە لەسەر پیاوەکە (خوازبێنییەکە بڕاوەتەوە و دڵیان وابەستەی یەکدی بووە)، جا ئەوە ئەو خوازبێنییەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە پیاو بچێتە خوازبێنی بەسەر خوازبێنی برا مسوڵمانەکەیدا، جا (کەواتە) مەبەست بەوە ئەوە نییە کاتێ پیاوێك دەچێتە خوازبێنی ئافرەتێك و ئافرەتەکەش بە کاروباری پیاوەکە ڕازی نییە و دڵی نەچووە بەلای، جا قەدەغە بێت کەسێك بچێتە خوازبێنی ئەو ئافرەتە (نەخێر ئەوە مەبەست نییە)، جا ئەوە (بۆیە قەدەغە کراوە چونکە) دەرگای فەساد و تێکدان بەسەر خەڵکیدا دەکاتەوە (شەڕ و ئاژاوە و ڕقلێبوونەوە دروست دەبێت).

**١٤٩٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة، أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلْمَرْأَةِ، وَهِيَ فِي عِدَّتِهَا مِنْ وَفَاةِ زَوْجِهَا: إِنَّكِ عَلَيَّ لَكَرِيمَةٌ، وَإِنِّي فِيكِ لَرَاغِبٌ، وَإِنَّ اللهَ لَسَائِقٌ إِلَيْكِ خَيْرًا وَرِزْقًا، وَنَحْوَ هَذَا مِنَ الْقَوْلِ[١].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە دەربارەی ئەو وتەی خوای پەروەردگار ﷻ: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٢٣٥﴾ ﴾ البقرة، دەیگوت: ئەوەیە پیاو بە ئافرەتە مێردمردووەکە ـ لە کاتێکدا هێشتا لە عیدەی مردنی پیاوەکەیدایە ـ (بڵێت): تۆ بۆ من جێی نرخ و گرنگی و من تۆم مەبەستە و چاوم لێتە و خوای پەروەردگار ﷻ چاکە و بژێوی و ڕۆزیت بۆ دەنێرێت (واتە پیاوەکە مەبەستی ئەوەیە سەرپەرشتیارت بۆ دروست دەبێتەوە، مەبەستی خۆیەتی)، قسەیەکی هاوشێوەی

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٨؛ والحدثاني: ٣١٥ب في النكاح؛ والشيباني: ١٠٠٥ في العتاق؛ والشافعي: ١٣٢١، كلهم عن مالك به.




ئەوە (واتە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ دروستە تێی بگەیەنێ من بەتەمای تۆم کاتێ عیدەت تەواو بوو دێمە خوازبێنیت و لەکیسم نەچی).

## ٢- پرسکردن بە کچ و بێوەژن دەربارەی شوکردنی خۆیان[١]

**١٤٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی بێوەژن شایستەتر و لەپێشترە لە وەلی و سەرپەرشتیار لە بەشوودانی خۆی، وە کچیش پرسی پێ دەکرێت و ئیزنی لێ وەردەگیرێت بۆ بەشوودان، جا مۆڵەتدان و ڕازیبوونی کچ بریتییە لە بێدەنگییەکەی (واتە کاتێ کچ بێدەنگ بوو و نیشانەی ناڕەزایی و زۆرەملێی پێوە دیار نەبوو، نیشانەی ئەوەیە ڕازییە، پێویست ناکات زۆری لێ بکرێت قسە بکات).

**١٤٩٤-** قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: لاَ تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ إِلاَّ بِإِذْنِ وَلِيِّهَا، أَوْ ذِي الرَّأْيِ مِنْ أَهْلِهَا أَوِ السُّلْطَانِ[٣].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: ئافرەت مارە ناکرێت تەنها بە مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی نەبێت، یان بڕیاربەدەستی خانەوادەکەی، یان فەرمانڕەوای مسوڵمانان.

**١٤٩٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ كَانَا يُنْكِحَانِ بَنَاتِهِمَا الأَبْكَارَ، وَلاَ يَسْتَأْمِرَانِهِنَّ[٤].

---

(١) ـ اسْتِئْذَانُ الْبِكْرِ وَالأَيِّمِ فِي أَنْفُسِهِمَا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٦٩؛ والشيباني: ٥٤٠ في النكاح؛ والشافعي: ٨٣٢؛ وفي: ١٠٧٨؛ وابن حنبل: ٢١٦٣، وفي: ٣٢٢٢؛ ومسلم: النكاح: ٦٦؛ والنسائي: ٣٢٦٠؛ وأبو داود: ٢٠٩٨؛ والترمذي: ١١٠٨؛ وابن ماجه: ١٨٧٥؛ وابن حبان: ٤٠٨٤، وفي: ٤٠٨٧؛ والدارمي: ٢١٨٨، وفي: ٢١٨٩؛ والقابسي: ٣٨١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٠؛ والشيباني: ٥٤٢ في النكاح، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٢؛ والحدثاني: ٣١٦أ في النكاح، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي نِكَاحِ الأَبْكَارِ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا (کە هەردووکیان زانای گەورە بوون) هەردووکیان کچەکانیان بەشوو داوە و فەرمانیان لێ وەرنەگرتوون.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتە لای ئێمە بەم شێوەیەیە دەربارەی بەشوودانی ئافرەتانی کچ (واتە وەلییەکانیان بۆیان هەیە خۆیان بیاندەن بەشوو بێ ئەوەی فەرمانیان لێ وەربگرن، بەڕەچاوکردنی چاکترین شت بۆیان).

١٤٩٦-**[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ لِلْبِكْرِ جَوَازٌ فِي مَالِهَا، حَتَّى تَدْخُلَ بَيْتَهَا، وَيُعْرَفَ مِنْ حَالِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کچ بۆی دروست نییە تەصەڕوف لە سەروەتەکەی بکات تا دەچێتە ماڵەکەی (واتە تا شوو دەکات) و هەست بە ژیرییەکەی دەکرێت (واتە تا دەزانرێت کامڵ بووە و ڕێگەی قازانج و زەرەر باش جیا دەکاتەوە).

١٤٩٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ فِي الْبِكْرِ يُزَوِّجُهَا أَبُوهَا بِغَيْرِ إِذْنِهَا: إِنَّ ذَلِكَ لاَزِمٌ لَهَا[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەربارەی کچ دەیانگوت: باوکی بەشووی دەدات بەبێ پرسی ئەو، ئەوە (واتە بڕیاری باوکەکە) بۆ کچەکە واجب دەبێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٣، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧١؛ والحدثاني: ٣١٦ في النكاح؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٥٩٧٠، كلهم عن مالك به.

## ٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی مارەیی و بەخشش[1]

١٤٩٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ، فَقَامَتْ قِيَامًا طَوِيلاً، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا إِيَّاهُ؟ فَقَالَ: مَا عِنْدِي إِلاَّ إِزَارِي هَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنْ أَعْطَيْتَهَا إِيَّاهُ جَلَسْتَ لاَ إِزَارَ لَكَ، فَالْتَمِسْ شَيْئًا، فَقَالَ: مَا أَجِدُ شَيْئًا، قَالَ: الْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، فَالْتَمَسَ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، لِسُوَرٍ سَمَّاهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أَنْكَحْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ[2].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من خۆم کردە دیاری بۆ تۆ، جا ماوەیەکی دوورودرێژ ڕاوەستا (پێغەمبەری خواش ﷺ هەر وەڵامی نەبوو، دیارە وەحی ڕێگەی نەداوە ڕازی ببێت)، جا پیاوێك هەڵسایەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خۆت پێویستیت پێی نییە لە منی مارە بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا شتێکت هەیە بۆی بکەیت بە مارەیی؟ پیاوەکەش گوتی: هیچم نییە جگە لەو پۆشاکەی لەبەرمە (مەگەر ئەوەی پێ بدەم)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر بیدەی بە ئەو خۆت بەبێ پۆشاك دەمێنیتەوە، (کەواتە نابێت) شتێکی دیکە دەست بخە، ئەویش گوتی: شتێکی دیکەم نییە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر گوستیلەیەکی ئاسنیش بێت دەستی بخە، جا چوو دەستی بخات هیچی دەست نەکەوت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا هیچ قورئانت لەبەرە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ: فڵان سوڕەت و فڵان سوڕەت ...، ناوی چەند سوڕەتێکی هێنا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو:

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الصَّدَاقِ وَالْحِبَاءِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٧؛ والحدثاني: ٣١٨ في النكاح؛ والشافعي: ٥٠٧؛ وفي: ١١٥٢؛ وفي: ١٢٢١؛ وابن حنبل: ٢٢٩٠١؛ والبخاري: ٢٣١٠، وفي: ٥١٣٥، وفي: ٧٤١٧؛ والنسائي: ٣٣٥٩؛ وأبو داود: ٢١١١؛ والترمذي: ١١١٤؛ وابن حبان: ٤٠٩٣؛ والقابسي: ٤١١، كلهم عن مالك به.




ئەوە لێم مارە کردی لەسەر ئەو قورئانەی لەبەرتە (بەوەی فێری بکەیت و لە تۆوە شتێکی پێ بگات).

**١٤٩٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، وَبِهَا جُنُونٌ أَوْ جُذَامٌ أَوْ بَرَصٌ، فَمَسَّهَا، فَلَهَا صَدَاقُهَا كَامِلاً، وَذَلِكَ لِزَوْجِهَا غُرْمٌ عَلَى وَلِيِّهَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ غُرْمًا عَلَى وَلِيِّهَا لِزَوْجِهَا، إِذَا كَانَ وَلِيُّهَا الَّذِي أَنْكَحَهَا، هُوَ أَبُوهَا أَوْ أَخُوهَا، أَوْ مَنْ يُرَى أَنَّهُ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا، فَأَمَّا إِذَا كَانَ وَلِيُّهَا الَّذِي أَنْكَحَهَا ابْنَ عَمٍّ، أَوْ مَوْلًى، أَوْ مِنَ الْعَشِيرَةِ، مِمَّنْ يُرَى أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ غُرْمٌ، وَتَرُدُّ تِلْكَ الْمَرْأَةُ مَا أَخَذَتْ مِنْ صَدَاقِهَا، وَيَتْرُكُ لَهَا قَدْرَ مَا تُسْتَحَلُّ بِهِ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك بکات و ئافرەتەکە شێتی یان گوڕی بوون یان بەڵەکی هەبێت و لەگەڵیشی جووت بووبێت، ئەوە ئافرەتەکە مارەیی تەواوی بۆ هەیە، مێردەکەشی قەرەبووی بۆ هەیە لەسەر سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە (چونکە زانیویانە ئەو عەیبەی هەیە و پێیان نەگوتووە و فێڵیان لێ کردووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تەنها لەو حاڵەتەدا قەرەبوو لەسەر وەلی و سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە هەیە، ئەگەر ئەو وەلی و سەرپەرشتیارەی بەشووی دابوو باوکی یان برای بوو (چونکە گومان لەوەدا نییە ئەوانە دەزانن ئەو عەیبەی هەبووە و شاردوویانەتەوە)، یان هەر کەسێك بەشووی دابێت کە بزانرێت زانیویەتی ئافرەتەکە ئەو عەیبەی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو سەرپەرشتیارەی بەشووی داوە کوڕەمام یان گەورەکەی یان کەسێکی هۆزەکەی بوو، لەوانەی وا دەبینرا ئەو عەیبە نەزانێ لە ئافرەتەکەدا، ئەوە (ئەو سەرپەرشتیارە) قەرەبووی لەسەر نییە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٨؛ والحدثاني: ٣١٩ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح.

ئەوە لێم مارە کردی لەسەر ئەو قورئانەی لەبەرتە (بەوەی فێری بکەیت و لە تۆوە شتێکی پێ بگات).

**١٤٩٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، وَبِهَا جُنُونٌ أَوْ جُذَامٌ أَوْ بَرَصٌ، فَمَسَّهَا، فَلَهَا صَدَاقُهَا كَامِلاً، وَذَلِكَ لِزَوْجِهَا غُرْمٌ عَلَى وَلِيِّهَا[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ غُرْمًا عَلَى وَلِيِّهَا لِزَوْجِهَا، إِذَا كَانَ وَلِيُّهَا الَّذِي أَنْكَحَهَا، هُوَ أَبُوهَا أَوْ أَخُوهَا، أَوْ مَنْ يُرَى أَنَّهُ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا، فَأَمَّا إِذَا كَانَ وَلِيُّهَا الَّذِي أَنْكَحَهَا ابْنَ عَمٍّ، أَوْ مَوْلًى، أَوْ مِنَ الْعَشِيرَةِ، مِمَّنْ يُرَى أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهَا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ غُرْمٌ، وَتَرُدُّ تِلْكَ الْمَرْأَةُ مَا أَخَذَتْ مِنْ صَدَاقِهَا، وَيَتْرُكُ لَهَا قَدْرَ مَا تُسْتَحَلُّ بِهِ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك بکات و ئافرەتەکە شێتی یان گوڕی بوون یان بەڵەکی هەبێت و لەگەڵیشی جووت بووبێت، ئەوە ئافرەتەکە مارەیی تەواوی بۆ هەیە، مێردەکەشی قەرەبووی بۆ هەیە لەسەر سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە (چونکە زانیویانە ئەو عەیبەی هەیە و پێیان نەگوتووە و فێڵیان لێ کردووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تەنها لەو حاڵەتەدا قەرەبوو لەسەر وەلی و سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە هەیە، ئەگەر ئەو وەلی و سەرپەرشتیارەی بەشووی دابوو باوکی یان برای بوو (چونکە گومان لەوەدا نییە ئەوانە دەزانن ئەو عەیبەی هەبووە و شاردوویانەتەوە)، یان هەر کەسێك بەشووی دابێت کە بزانرێت زانیویەتی ئافرەتەکە ئەو عەیبەی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو سەرپەرشتیارەی بەشووی داوە کوڕەمام یان گەورەکەی یان کەسێکی هۆزەکەی بوو، لەوانەی وا دەبینرا ئەو عەیبە نەزانێ لە ئافرەتەکەدا، ئەوە (ئەو سەرپەرشتیارە) قەرەبووی لەسەر نییە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٨؛ والحدثاني: ٣١٩ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح.



و دەبێ ئافرەتەکە لە مارەییەکەی خۆی قەرەبووەکەی بداتەوە و تەنها هەندێك بهێڵێتەوە تا جوتبوونەکەی بەبێ مارەیی نەمێنێتەوە.

**١٥٠٠-** عَنْ نَافِعٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّ ابْنَةَ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَأُمُّهَا بِنْتُ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، كَانَتْ تَحْتَ ابْنٍ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَمَاتَ، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَلَمْ يُسَمِّ لَهَا صَدَاقًا، فَابْتَغَتْ أُمُّهَا صَدَاقَهَا، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: لَيْسَ لَهَا صَدَاقٌ، وَلَوْ كَانَ لَهَا صَدَاقٌ لَمْ نُمْسِكْهُ وَلَمْ نَظْلِمْهَا، فَأَبَتْ أُمُّهَا أَنْ تَقْبَلَ ذَلِكَ، فَجَعَلُوا بَيْنَهُمْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَقَضَى أَنْ لاَ صَدَاقَ لَهَا وَلَهَا الْمِيرَاثُ[١].

واتە: لە نافیعەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): کچی عوبەیدوڵلای کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا کە دایکی ئەو کچی زەیدی کوڕی خەتتابە، لەژێر نیکاحی کوڕێکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا بوو، جا مێردی وەفاتی کرد لە کاتێکدا جیماعی لەگەڵ نەکردبوو و هیچ مارەییێکیشی بۆ دیاری نەکردبوو، دایکیشی داوای مارەیی بۆ دەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا گوتی: مارەیی بۆ نییە، ئەگەر مارەیی بۆ هەبووایە ئەوە لێمان نەدەگرتەوە و ستەممان لێ نەکردووە، جا دایکی ڕازی نەبوو ئەوە قبووڵ بکات، ئینجا زەیدی کوڕی سابیتیان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بە دادوەر خستە نێوانی خۆیان، ئەویش بڕیار و دادوەرییەکەی بەوە کرد کە مارەیی بۆ نییە، بەڵکوو میراتی بۆ هەیە[٢].

**١٥٠١-** عَنْ مَالِكٍ رَحِمَهُ اللَّهُ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَتَبَ فِي خِلاَفَتِهِ إِلَى بَعْضِ عُمَّالِهِ: أَنَّ كُلَّ مَا اشْتَرَطَ الْمُنْكِحُ، مَنْ كَانَ أَبًا أَوْ غَيْرَهُ مِنْ حِبَاءٍ، أَوْ كَرَامَةٍ، فَهُوَ لِلْمَرْأَةِ إِنِ ابْتَغَتْهُ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە رَحِمَهُ اللَّهُ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە سەردەمی خەلافەتەکەی بۆ کاربەدەستانی خۆی نووسی: هەر مەرجێك کە سەرپەرشتیاری ئافرەت دایبنێت بۆ خۆی لە دیاری و بەخشش، جا

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٩؛ والحدثاني: ٣١٩أ في النكاح؛ والشيباني: ٥٤٣ في النكاح؛ والشافعي: ١٢٢٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی مارەییشی بۆ واجب دەبێت، بە بەڵگەی فەرموودەیەك کە ئەبو داود و ترمزی ڕیوایەتیان کردووە.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٠، عن مالك به.

باوك بێت یان كەسی دیكە، ئەوە (مافی ئافرەتەكەیە) و بۆ ئافرەتەكەیە ئەگەر بیەوێت و داوای بكات (واتە هیچ پەیوەندی بە سەرپەرشتیارەكەوە نییە).

١٥٠٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمَرْأَةِ يُنْكِحُهَا أَبُوهَا، وَيَشْتَرِطُ فِي صَدَاقِهَا الْحِبَاءَ يُحْبَى بِهِ، إِنَّهُ مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ يَقَعُ بِهِ النِّكَاحُ، فَهُوَ لاِبْنَتِهِ إِنِ ابْتَغَتْهُ، وَإِنْ فَارَقَهَا زَوْجُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَلِزَوْجِهَا شَطْرُ الْحِبَاءِ الَّذِي وَقَعَ بِهِ النِّكَاحُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی كە باوكی بەشووی دەدات و باوكەكە لە مارەییەكەیدا دیاری بۆ خۆی بە مەرج دەگرێت تا پێ ببەخشرێت، گوتوویەتی: هەر مەرجێك هەبێت هاوسەرگیری پێ دابمەزرێت ئەوە بۆ كچەكەیەتی ئەگەر كچەكەی شتەكەی ویست، جا ئەگەر مێردەكەی لێی جیا بۆیەوە بەر لەوەی لەگەڵی جووت بێت، ئەوە مێردەكەی نیوەی ئەو بەخششەی بۆ هەیە كە زەواجەكەی پێ دامەزراوە (واتە گشتی جێبەجێ ناكات، بەڵكوو وەك مارەییەكە نیوەی جێبەجێ دەكات).

١٥٠٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُزَوِّجُ ابْنَهُ صَغِيراً لاَ مَالَ لَهُ: إِنَّ الصَّدَاقَ عَلَى أَبِيهِ، إِذَا كَانَ الْغُلاَمُ يَوْمَ تَزَوَّجَ لاَ مَالَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ لِلْغُلاَمِ مَالٌ فَالصَّدَاقُ فِي مَالِ الْغُلاَمِ، إِلاَّ أَنْ يُسَمِّيَ الأَبُ أَنَّ الصَّدَاقَ عَلَيْهِ، وَذَلِكَ النِّكَاحُ ثَابِتٌ عَلَى الابْنِ إِذَا كَانَ صَغِيراً وَكَانَ فِي وِلاَيَةِ أَبِيهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی ژن بۆ كوڕەكەی مارە دەبڕێت بەبچووكی كە ماڵ و سەروەتی نییە، گوتوویەتی: مارەییەكە لەسەر باوكیەتی ئەگەر هەرزەكارەكە لەو كاتەی هاوسەرگیری دەكات پارە و سەروەتی نەبێت، بەڵام ئەگەر هەرزەكارەكە پارە و سەروەتی هەبوو، ئەوە مارەییەكە لە سەروەتی هەرزەكارەكە دەدرێت، تەنها لەو كاتە نەبێت كە باوكەكە بڵێت مارەییەكە لەسەر منە، جا ئەو هاوسەرگیریە لەسەر كوڕەكە جێگیر دەبێت و دادەمەزرێت بە ویلایەت و سەرپەرشتی باوكی.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٢، عن مالك به.

١٥٠٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي طَلَاقِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، وَهِيَ بِكْرٌ، فَيَعْفُو أَبُوهَا عَنْ نِصْفِ الصَّدَاقِ، إِنَّ ذَلِكَ جَائِزٌ لِزَوْجِهَا مِنْ أَبِيهَا فِيمَا وَضَعَ عَنْهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ:﴿ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ ﴿٢٣٧﴾ ﴾ البقرة، فَهُنَّ النِّسَاءُ اللاَّتِي قَدْ دُخِلَ بِهِنَّ:﴿ أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴿٢٣٧﴾ ﴾ البقرة، فَهُوَ الأَبُ فِي ابْنَتِهِ الْبِكْرِ وَالسَّيِّدُ فِي أَمَتِهِ.

قَالَ مَالِكٌ: وَهَذَا الَّذِي سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ، وَالَّذِي عَلَيْهِ الأَمْرُ عِنْدَنَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی تەڵاقدانی پیاو بۆ ژنەکەی بەر لەوەی بچێتە لای، لە کاتێکدا ئافرەتەکە کچە و باوکی کچەکە لە نیوەی مارەییەکە خۆش دەبێت، گوتوویەتی: ئەوە بۆ مێردی ئافرەتەکە جێبەجێ دەکرێت کە لەلایەن باوکی کچەکەوە دەرچووە لەو مارەییەی لەسەری لاداوە و هەڵیگرتووە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ ﴿٢٣٧﴾ ﴾ البقرة، ئەمانە بریتین لەو ئافرەتانەی جیماعیان لەگەڵ کراوە:﴿ أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِ ﴿٢٣٧﴾ ﴾ البقرة، یش بریتییە لە باوك دەربارەی کچەکەی کە بێوەژن نییە، وە بریتییە لە سەيید و گەورە دەربارەی جارییەکەی (ئەوانیش دەتوانن لێبووردن و چاوپۆشی دەربکەن بۆ مارەیی ئافرەتەکان).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بریتییە لەوەی گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە، کار و فەتوا لای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

١٥٠٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْيَهُودِيَّةِ أَوِ النَّصْرَانِيَّةِ تَحْتَ الْيَهُودِيِّ أَوِ النَّصْرَانِيِّ، فَتُسْلِمُ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، إِنَّهُ لاَ صَدَاقَ لَهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئافرەتی جوولەکە و دیان کە لەژێر نیکاحی پیاوی جوولەکە و دیاندا بن و (دواتر) ئافرەتەکە مسوڵمان ببێت بەر لەوەی پیاوەکە جیماعی لەگەڵ بکات، گوتوویەتی: ئافرەتەکە مارەیی بۆ نییە (چونکە جیماع

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٤، عن مالك به.




ڕووی نەداوە و دەبێ لە پیاوەکەی جیا بێتەوە ئەگەر نەبێتە مسوڵمان، چونکە تازە ئەو مسوڵمانە و بۆ پیاوی کافر حەڵاڵ نییە).

**١٥٠٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ أَرَى أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ بِأَقَلَّ مِنْ رُبْعِ دِينَارٍ، وَذَلِكَ أَدْنَى مَا يَجِبُ بِهِ الْقَطْعُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆچوونم وایە ئافرەت مارە نەکرێت بە کەمتر لە چارەکە دینارێك (کە دەکاتە چارەکە مسقاڵێکی زێڕ)، چونکە ئەوە کەمترینی ئەو ئەندازەیەیە کە دەستبڕینی دزی پێ واجب دەبێت (کاتێ ئەو ئەندازەیە دەدزێت)[٢].

## ٤- پەردەدادان (چوونە پەنا بۆ ژن و مێرد)[٣]

**١٥٠٧-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَضَى فِي الْمَرْأَةِ إِذَا تَزَوَّجَهَا الرَّجُلُ: أَنَّهُ إِذَا أُرْخِيَتِ السُّتُورُ، فَقَدْ وَجَبَ الصَّدَاقُ[٤].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دادوەری کرد و بڕیاری دا دەربارەی ئەو ئافرەتەی پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، بەوەی ئەگەر (بەیەکەوە بوون و) پەردە دادرا ئەوە مارەیی واجب دەبێت (واتە ئەگەر مردن و نەزانرا جیاعیان کردووە یان نا، ئەوە حیسابی ئەوە دەکرێت جیاعیان کردووە و مارەیی تەواو واجب دەبێت ئەگەر زانرا ئافرەتەکە دواتر مردووە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٣، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئیمامی مالیك بۆیە ئەو دوو بابەتەی قیاس کردووە لەسەر یەکدی، چونکە بڕینی دەست پەیوەستە بە ئەندامی جەستە و جیماعیش کە مارەیی واجب دەکات پەیوەستە بە ئەندامی جەستە.

(٣) ـ إِرْخَاءُ السُّتُورِ.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٦؛ والحدثاني: ٣٢٠ في النكاح، عن مالك به.




**١٥٠٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بِامْرَأَتِهِ، فَأُرْخِيَتْ عَلَيْهِمَا السُّتُورُ، فَقَدْ وَجَبَ الصَّدَاقُ[١].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): زەیدی کوڕی سابیت ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو چووە لای ئافرەتەکەی و پەردەیان بۆ داندرا (واتە خۆیان لە چاوی خەڵکی ون کرد و بەتەنها بوون) مارەیی واجب دەبێت (چونکە نیشانەی ئەوەیە جیماعیان کردووە)[٢].

**١٥٠٩-** أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بِالْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا، صُدِّقَ الرَّجُلُ عَلَيْهَا، وَإِذَا دَخَلَتْ عَلَيْهِ فِي بَيْتِهِ، صُدِّقَتْ عَلَيْهِ[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەیگوت: ئەگەر پیاو چوو بۆ لای ئافرەتەکەی لەماڵی ئافرەتەکە (یان لە ماڵی باوکی ئافرەتەکە، جا ئافرەتەکە بانگەشەی ئەوەی دەکرد پیاوەکە جیماعی لەگەڵ کردووە و پیاوەکەش ڕەتی دەکردەوە) ئەوە پیاوەکە باوەڕی پێ دەکرێت و قسەی ئەو هەڵدەبژێردرێت بەسەر قسەی ژنەکە (چونکە عادەتەن پیاو ئامادە نییە و حەز ناکات لە جگە لە ماڵی خۆی ئەو کارە ئەنجام بدات)، وە ئەگەر ئافرەتەکە چوو بۆ ماڵی پیاوەکە (و ئافرەتەکە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پیاوەکە جیماعی لەگەڵ کردووە و پیاوەکەش ڕەتی دەکردەوە) ئەوە باوەڕ بە ئافرەتەکە دەکرێت و قسەی ئەو بەسەر قسەی پیاوەکە هەڵدەبژێردرێت (چونکە عادەتەن پیاو لە ماڵی خۆی سەلیقەی ئەو بابەتەی هەیە، بۆیە مارەیی تەواو بۆ ئافرەتەکە دادەمەزرێت).

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٧؛ والحدثاني: ٣٢٠ب في النكاح؛ والشيباني: ٥٣٢ في النكاح، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەم بابەتە سوودی لێ وەردەگیرێت ئەگەر دوای ئەو بەیەکەوەبوونە یەکێکیان مرد و کارەکە دیار نەبوو کە ئاخۆ جیماعیان کردووە یان نا، ئەو کات بەو بەڵگەیە بڕیار دەدرێت کە جیماع کراوە و مارەییەکە بۆ ئافرەتەکە واجب دەبێت و دەبێتە میرات بۆ خزمانی ئافرەتەکە ئەگەر ئافرەتەکە دواتر مردبوو.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٨٨؛ والحدثاني: ٣٢٠أ في النكاح، عن مالك به.

١٥١٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَرَى ذَلِكَ فِي الْمَسِيسِ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا فِي بَيْتِهَا، فَقَالَتْ: قَدْ مَسَّنِي، وَقَالَ: لَمْ أَمَسَّهَا، صُدِّقَ عَلَيْهَا، فَإِنْ دَخَلَتْ عَلَيْهِ فِي بَيْتِهِ، فَقَالَ: لَمْ أَمَسَّهَا، وَقَالَتْ: قَدْ مَسَّنِي، صُدِّقَتْ عَلَيْهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی پێشەوە كە سەعیدی كوڕی موسەیەب ﷺ باسی كرد دەربارەی بەڕاستدانان پێم وایە دەربارەی جیماعە، كاتێ پیاوەكە دەچێتە لای ئافرەتەكە لە ماڵی ئافرەتەكە (واتە لە ماڵی باوكی)، جا (دوای تەڵاقدان پاش ئەو بەیەكەوە مانەوەیە) ئافرەتەكە بڵێت: جیماعی لەگەڵ كردووم، پیاوەكەش بڵێت: جیماعم لەگەڵ نەكردووە، ئەوە باوەڕ بە پیاوەكە دەكرێت و قسەی ئەو بەسەر قسەی ژنەكە هەڵدەبژێردرێت، وە ئەگەر ئافرەتەكە چوبووە لای پیاوەكە لە ماڵی پیاوەكە، جا پیاوەكە بڵێت: جیماعم لەگەڵ نەكردووە، ئافرەتەكەش بڵێت: جیماعی لەگەڵ كردووم، ئەوە ئافرەتەكە باوەڕی پێ دەكرێت و قسەكەی بەسەر قسەی پیاوەكەی هەڵدەبژێردرێت (و مارەیی تەواوی بۆ دادەمەزرێت).

## ٥- ماوەی مانەوە لەلای خێزانی كچ و بێوەژن (بۆ ئەو كەسەی هاوسەرگیرییان لەگەڵ دەكات و خێزانی دیكەشی هەیە)[١]

١٥١١- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ الْمَخْزُومِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حِينَ تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ، وَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، قَالَ لَهَا: لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ عِنْدَكِ، وَسَبَّعْتُ عِنْدَهُنَّ، وَإِنْ شِئْتِ ثَلَّثْتُ عِنْدَكِ، وَدُرْتُ، فَقَالَتْ: ثَلِّثْ[٢].

واتە: لە عەبدولمەلیكی كوڕی ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حاریسی كوڕی هیشامی مەخزومییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ هاوسەرگیری لەگەڵ ئوممو

---

(١) ـ الْمَقَامُ عِنْدَ الْبِكْرِ وَالأَيِّمِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٤؛ والحدثاني: ٣١٧ في النكاح؛ والشيباني: ٥٢٤ في النكاح؛ والشافعي: ١٢٧٠؛ ومسلم: الرضاع: ٤٢، كلهم عن مالك به.




سەلەمە ﵂ کرد و لەلای ئەو بەیانی کردەوە پێی فەرموو: تۆ لەلای مێردەکەت (کە مەبەستی خۆی بوو) کەمبەها نیت (واتە وا تێ نەگەی کەمبەهایت لەو قسەی ئێستا پێت دەڵێم، بەڵکوو ئەوە دادگەرییە دەبێ لە نێوان خێزانەکانی دیکەشم پەیڕەوی بکەم)، (قسەکە ئەوەیە): ئەگەر حەز دەکەیت حەوت شەو لای تۆ دەمێنمەوە و حەوت شەویش لەلای هەر یەك لە خێزانەکانی دیکەم، وە ئەگەر حەزیش دەکەیت سێ شەو لەلات دەبم و لەلای ئەوانی دیکەش بە هەمان شێوە تا دەگەڕێمەوە و سەرەت دێتەوە، جا ئوممو سەلەمە ﵂ گوتی: سێ شەوەکە ئەنجام بدە (تا زوو سەرەی بسوڕێتەوە).

**١٥١٢**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لِلْبِكْرِ سَبْعٌ، وَلِلثَّيِّبِ ثَلاَثٌ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: حەوت شەو بۆ کچ (واتە ئەگەر کەسێك خێزانی دووەم یان سێیەم یان چوارەمی کچ بوو حەوت شەو لەلای دەمێنێتەوە تا ڕادێت و ترس و دڵەڕاوکێی نامێنێت و بەرگەی جێهێشتن دەگرێت کاتێ بۆ نۆرەی خێزانەکانی دیکە جێی دێڵێت)، سێ شەویش بۆ بێوەژنە (ئەویان ڕاهاتووە و ئەزمونی هەیە)[٢].

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە.

**١٥١٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَإِنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَةٌ غَيْرُ الَّتِي تَزَوَّجَ، فَإِنَّهُ يَقْسِمُ بَيْنَهُمَا، بَعْدَ أَنْ تَمْضِيَ أَيَّامُ الَّتِي تَزَوَّجَ بِالسَّوَاءِ، وَلاَ يَحْسِبُ عَلَى الَّتِي تَزَوَّجَ مَا أَقَامَ عِنْدَهَا[٣].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەگەر پیاو جگە لەو خێزانەی ئێستا هێناویەتی خێزانی دیکەی هەبوو، ئەوە دوای تێپەڕینی

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٥؛ والحدثاني: ٣١٧أ في النكاح؛ والشافعي: ١٢٧٢؛ وشرح معاني الآثار: ٤٣٢٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: دوای ئەو ماوەیە ئینجا بەیەکسانی نۆرە دادەنێت لە نێوان گشت خێزانەکانی بۆ شەومانەوە.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٧٦؛ والحدثاني: ٣١٧ب في النكاح، عن مالك به.

ڕۆژەکانی هاوسەرگیری (کە بریتییە لە سێ شەومانەوە لەلای بێوەژنی تازە و حەوت شەو مانەوە لەلای کچی تازە) دەبێ دواتر بەیەکسانی نۆرەی شەوانەیان بۆ دابنێت، وە ئافرەتە تازەکە ئەو ماوەیەی لەسەر حیساب ناکرێت کە پیاوەکە لەلای ماوەتەوە لە سەرەتای زەواجەکە (کە بریتییە لە سێ ڕۆژ یان حەوت ڕۆژەکە).

## ٦- ئەو مەرجەی دروست نییە لە زەواجدا[١]

**١٥١٤**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ تَشْتَرِطُ عَلَى زَوْجِهَا، أَنَّهُ لاَ يَخْرُجُ بِهَا مِنْ بَلَدِهَا؟ فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷺ: يَخْرُجُ بِهَا إِنْ شَاءَ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی (لە کاتی گرێبەستی زەواجەکە) مەرج لەسەر مێردەکەی دادەنێت کە نابێت لە شاری خۆی بیباتە دەرەوە (واتە نابێ لە دەرەوەی ناوچەی خۆی بژییێت)؟ سەعیدی کوڕی موسەیەبیش ﷺ گوتی: ئەگەر بیەوێ دەیباتە دەرەوە (واتە مەرجەکە لەغوە و حیسابی بۆ ناکرێت و زیان لە هاوسەرگیرییەکە نادات بە جێبەجێنەکردنی، پیاوەکە دەتوانێ جێبەجێی نەکات و هاوسەرگیرییەکەش کێشەی نییە).

**١٥١٥**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ إِذَا شَرَطَ الرَّجُلُ لِلْمَرْأَةِ، وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ عِنْدَ عُقْدَةِ النِّكَاحِ أَنْ لاَ أَنْكِحَ عَلَيْكِ، وَلاَ أَتَسَرَّرَ، إِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ بِشَيْءٍ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي ذَلِكَ يَمِينٌ بِطَلاَقٍ، أَوْ عَتَاقَةٍ، فَيَجِبُ ذَلِكَ عَلَيْهِ وَيَلْزَمُهُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کارەکە لای ئێمە ئاوایە: ئەگەر پیاو مەرجی بۆ ئافرەت دانا بەوەی ژنت بەسەر نەهێنم و ئافرەتی جارییە وەرنەگرم، ئەگەر ئەو مەرجە لە کاتی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە بوو، ئەوە هیچ نییە (واتە

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الشَّرْطِ فِي النِّكَاحِ.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٠، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩١، عن مالك به.

حیساب بۆ ئەو مەرجە ناکرێت و لەغوە، واجب نییە جێبەجێ بکرێت)، تەنها لەو کاتەدا نەبێت سوێندی تەڵاق یان ئازادکردنی ئافرەتەکەی لەگەڵ بێت، ئەو کات لەسەری واجبە جێبەجێی بکات (ئەگینا هاوسەرگیرییەکەی هەڵدەوەشێتەوە).

## ٧- هاوسەرگیری مارەبەجاش و هاووێنەکانی[١]

**١٥١٦-** عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الزَّبِيرِ ﷺ، أَنَّ رِفَاعَةَ بْنَ سِمْوَالٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَمِيمَةَ بِنْتَ وَهْبٍ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثَلاَثًا، فَنَكَحَتْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ ﷺ، فَاعْتَرَضَ عَنْهَا، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَمَسَّهَا، فَفَارَقَهَا، فَأَرَادَ رِفَاعَةُ أَنْ يَنْكِحَهَا، وَهُوَ زَوْجُهَا الأَوَّلُ الَّذِي كَانَ طَلَّقَهَا، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: فَنَهَاهُ عَنْ تَزْوِيجِهَا، وَقَالَ: لاَ تَحِلُّ لَكَ حَتَّى تَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ[٢].

لە زوبەیری کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ریفاعەی کوڕی سیموال خێزانەکەی خۆی کە تەمیمەی کچی وەهب بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ سێ بەسێ تەڵاق دا ، شووی بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر ﷺ کرد، جا عەبدوڕڕەحمان بەربەستی بۆ پەیدا بوو (واتە توانای جیماعکردنی نەبوو) و نەیتوانی جیماعی لەگەڵ بکات، بۆیە لێی جیا بۆیەوە، جا ریفاعە کە مێردی یەکەمی بوو و تەڵاقی دابوو ویستی دووبارە بیکاتەوە خێزانی خۆی، جا ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ قەدەغەی کرد لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە و فەرمووی: بۆت حەڵاڵ نابێتەوە تا پیاوێکی دیکە جیماعی لەگەڵ دەکات.

**١٥١٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا سُئِلَتْ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، فَتَزَوَّجَهَا رَجُلٌ آخَرُ، فَطَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، هَلْ يَصْلُحُ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: لاَ حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا[٣].

---

(١) ـ نِكَاحُ الْمُحَلِّلِ وَمَا أَشْبَهَهُ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٢؛ والحدثاني: ٣٢١ في النكاح؛ والشيباني: ٥٨٢ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٠٩؛ وابن حبان: ٤١٢١؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٨١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٣؛ والحدثاني: ٣٢١أ في النكاح، عن مالك به.

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی پیاوێك کە خێزانەکەی بەیەکجاری تەڵاق دابێت و پیاوێکی دیکە خواستبێتی و تەڵاقی دابێت بەر لەوەی لەگەڵی جووت ببێت، ئایا بۆ مێردی یەکەمی دروستە هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە؟ عائیشەش ﵂ گوتی: نەخێر، تا (پیاوێکی دیکە) شیرینایەتی ئافرەتەکە دەچێژێت (واتە تا جیماعی لەگەڵ دەکات).

**١٥١٨-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﵀ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، ثُمَّ تَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ رَجُلٌ آخَرُ، فَمَاتَ عَنْهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، هَلْ يَحِلُّ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ أَنْ يُرَاجِعَهَا؟ فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﵀: لاَ يَحِلُّ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ أَنْ يُرَاجِعَهَا[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە قاسمی کوڕی موحەممەد ﵀ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە ئافرەتەکەی بەتەواوی و یەکجارەکی تەڵاق داوە، دواتر پیاوێکی دیکە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات و پیاوەکە بمرێت بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، ئایا بۆ مێردی یەکەمی دروستە بیگەڕێنێتەوە و دووبارە بیکاتەوە خێزانی خۆی؟ قاسمی کوڕی موحەممەد ﵀ گوتی: بۆ مێردی یەکەمی دروست نییە بیگەڕێنێتەوە لای خۆی (تا جیماع لەگەڵ پیاوی دووەم ڕوو دەدات).

**١٥١٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الْمُحَلِّلِ: إِنَّهُ لاَ يُقِيمُ عَلَى نِكَاحِهِ ذَلِكَ، حَتَّى يَسْتَقْبِلَ نِكَاحًا جَدِيدًا، فَإِنْ أَصَابَهَا، فَلَهَا مَهْرُهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو کەسەی دەیەوێ ئافرەتێك حەڵاڵ بکاتەوە بۆ مێردەکەی (واتە ئەو کەسەی مارەبەجاش دەکات)، نابێ لەسەر هاوسەرگیرییەکەی بەردەوام بێت (چونکە کارەکەی باتڵە و هاوسەرگیرییەکە دانەمەزراوە، بۆیە نابێ بەردەوامی پێ بدات) تاوەکوو هاوسەرگیرییەکی نوێ دەکات (بەنییەتی زەواجی شەرعی نەك مارەبەجاش)، جا ئەگەر (لە مارەبەجاشدا) لەگەڵ ئافرەتەکە جووت بوو، ئەوە ئافرەتەکە مارەیی بۆ هەیە و دەبێ پێی بدات.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٤، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٥، عن مالك به.

## ٨- ئەوانەی لەگەڵ یەکدی کۆ ناکرێنەوە (بۆ هاوسەرگیری) لە ئافرەتان[١]

**١٥٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﵁، گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتێك و پورەکەی (خوشکی باوك) بەیەکەوە کۆ ناکرێنەوە، وە ئافرەتێك و خوشکی دایك بەیەکەوە کۆ ناکرێنەوە (واتە حەرامە پیاوێکی مسوڵمان ئافرەتێك و خوشکی باوکی ئافرەتەکە یان خوشکی دایکی ئافرەتەکە خێزانی بن لە یەك کاتدا).

**١٥٢١-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: يُنْهَى أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوْ عَلَى خَالَتِهَا، أَوْ أَنْ يَطَأَ الرَّجُلُ وَلِيدَةً، وَفِي بَطْنِهَا جَنِينٌ لِغَيْرِهِ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﵀ گێردراوەتەوە دەیگوت: حەڕام کراوە ئافرەت بەسەر خوشکی باوك یان بەسەر خوشکی دایك بهێنرێت (واتە نابێ ئافرەت بەسەر پوری خۆی بچێ)[٤]، یان پیاو جیماع لەگەڵ جارییەیەك بکات لە کاتێکدا کۆرپەلەی کەسێکی دیکەی لە سکدا بێت.

---

(١) ـ مَا لَا يُجْمَعُ بَيْنَهُ مِنَ النِّسَاءِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٦؛ والحدثاني: ٣٢٢ في النكاح؛ والشيباني: ٥٢٦ في النكاح؛ والشافعي: ١٣٢٠؛ وابن حنبل: ٩٩٥٣، وفي: ٩٩٩٦، وفي: ٩٩٩٦، وفي: ١٠٧٠١، وفي: ١٠٧٢٨، وفي: ١٠٨٥٦، وفي: ١٠٨٩٩؛ والبخاري: ٥١٠٩؛ ومسلم: النكاح: ٣٣؛ والنسائي: ٣٢٨٨؛ وابن حبان: ٤١١٣، وفي: ٤١١٥؛ والدارمي: ٢١٧٩؛ والقابسي: ٣٥٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٧؛ والحدثاني: ٣٢٢أ في النكاح؛ والشيباني: ٥٢٧ في النكاح، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ تێبینی: هەندێك هۆز و عەشیرەت بە خوشکی باوك و کوشکی دایك دەڵێن پلك (پور)، هەندێکیش جیاوازی دەکەن لە نێوانیان، بە خوشکی باوك دەڵێن «پلك یان پور»، بەڵام بە خوشکی دایك دەڵێن «خارەت».

## ٩- ئەوەی دروست نییە لە هاوسەرگیریکردنی پیاو لەگەڵ دایکی خێزانی (خەسووی)[١]

**١٥٢٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، ثُمَّ فَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا، هَلْ تَحِلُّ لَهُ أُمُّهَا؟ فَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: لاَ الأُمُّ مُبْهَمَةٌ، لَيْسَ فِيهَا شَرْطٌ، وَإِنَّمَا الشَّرْطُ فِي الرَّبَائِبِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: زەیدی کوڕی سابیت پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك کە ئافرەتێکی هێنابێت دواتر تەڵاقی دابێت بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ کردبێت، ئایا دایکی ئەو ئافرەتە بۆ پیاوەکە حەڵاڵە (ئەگەر ویستی هاوسەرگیری لەگەڵ بکات)؟ جا زەیدی کوڕی سابیت ﷺ گوتی: نەخێر، دایك ڕوون نەکراوەتەوە (تەفصیلی نەدراوەتێ)، ئەو مەرجی تیا نییە (واتە مەرجی جیماع دانەندراوە بۆ حەڕامبوون، کەواتە بەڕەهایی حەڕام دەبێت مادەم کچەکەی مارە کردبێت هەرچەندە جیماعیشی لەگەڵ نەکردبێت)، مەرجەکە (واتە بەمەرجدانانی جیماع بۆ حەڕامبوونی خواستنی کچ بریتییە لەوەی کەسێك دایکی کچەکە بخوازێت و جیماعیشی لەگەڵ بکات) تەنها بۆ ڕەبیبەیە (واتە بۆ ئەو کچەیە کە لەگەڵ دایکیەتی و لەماڵی ئەو پیاوە دەژیێت کە هاوسەرگیری لەگەڵ دایکەکەی کردووە).

**١٥٢٣-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ اسْتُفْتِيَ وَهُوَ بِالْكُوفَةِ عَنْ نِكَاحِ الأُمِّ بَعْدَ الابْنَةِ، إِذَا لَمْ تَكُنِ الابْنَةُ مُسَّتْ، فَأَرْخَصَ فِي ذَلِكَ، ثُمَّ إِنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ، فَأُخْبِرَ أَنَّهُ لَيْسَ كَمَا قَالَ، وَإِنَّمَا الشَّرْطُ فِي الرَّبَائِبِ، فَرَجَعَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ إِلَى الْكُوفَةِ، فَلَمْ يَصِلْ إِلَى مَنْزِلِهِ، حَتَّى أَتَى الرَّجُلَ الَّذِي أَفْتَاهُ بِذَلِكَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُفَارِقَ امْرَأَتَهُ[٣].

---

(١) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنْ نِكَاحِ الرَّجُلِ أُمَّ امْرَأَتِهِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٨، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٤٩٩، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە زیاتر لە کەسێکی گێڕاوەتەوە (گوتوویانە): عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ لە کاتێکدا لە کوفە بوو پرسیاری لێکرا دەربارەی هاوسەرگیریکردن لەگەڵ دایك دوای هاوسەرگیریکردن لەگەڵ کچەکەی (و جیابوونەوە لە کچەکەی)، کاتێ کچەکە دەستی لێ نەدرابێ (جیماعی لەگەڵ نەکرابێ)، جا ئیبنو مەسعود ﵁ مۆڵەتی دا (گوتی: دروستە)، دواتر ئیبنو مەسعود ﵁ هات بۆ مەدینە و پرسیاری ئەو بابەتەی کرد و هەواڵی پێ درا بەوەی بەو شێوەیە نییە کە فەتوای داوە، بەڵکوو مەرجی جیماع تەنها بۆ ڕەبیبەیە (واتە بۆ حەڕامبوونی ئەو کچەی کە ڕەبیبەیە مەرجە لەگەڵ مارەکردن جیماعیش ڕووی دابێ ئینجا حەڕام دەبێ، بەڵام بۆ حەڕامبوونی دایك ئەو مەرجە نییە، بەڵکوو هەر ئەوەندەی کچەکە مارە بکات دایکەکە حەڕام دەبێت)، جا ئیبنو مەسعود ﵁ هاتەوە کوفە و هێشتا نەگەیشتبووە ماڵەکەی تا ئەو پیاوە هات کە پرسیاری لێ کردبوو و فەتواکەی پێ دابوو، جا فەرمانی پێ کرد لە خێزانەکەی جیا بێتەوە.

١٥٢٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الرَّجُلِ تَكُونُ تَحْتَهُ الْمَرْأَةُ، ثُمَّ يَنْكِحُ أُمَّهَا فَيُصِيبُهَا، إِنَّهَا تَحْرُمُ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ، وَيُفَارِقُهُمَا جَمِيعًا، وَتَحْرُمَانِ عَلَيْهِ أَبَدًا، إِذَا كَانَ قَدْ أَصَابَ الأُمَّ، فَإِنْ لَمْ يُصِبِ الأُمَّ، لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ، وَفَارَقَ الأُمَّ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتێکی لەژێر نیکاحدایە و خێزانیەتی، دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ دایکی ئافرەتەکە (واتە خەسووی) دەکات و جیماعیشی لەگەڵ دەکات، گوتوویەتی: ئافرەتەکەی خۆیشی لەسەر حەڕام دەبێت و دەبێ لە هەردووکیان جیا بێتەوە و هەردووکیان بەهەمیشەیی لەسەری حەڕام دەبن، ئەگەر جیماعی لەگەڵ دایکەکە کردبێت، بەڵام ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکردبێت (تەنها مارەی کردبێت)، ئەوە ئافرەتەکەی خۆی لەسەر حەڕام نابێت و دەبێت لە دایکەکە جیا بێتەوە.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٠، عن مالك به.

١٥٢٥- [فتوى] وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ ثُمَّ يَنْكِحُ أُمَّهَا فَيُصِيبُهَا: إِنَّهُ لاَ تَحِلُّ لَهُ أُمُّهَا أَبَدًا، وَلاَ تَحِلُّ لأَبِيهِ، وَلاَ لاِبْنِهِ، وَلاَ تَحِلُّ لَهُ ابْنَتُهَا، وَتَحْرُمُ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك دەكات و دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ دایكی ئافرەتەكە دەكات و جیماعیشی لەگەڵ دەكات، گوتوویەتی: ئەوە هەرگیز دایكەكەی بۆ حەڵاڵ نابێ، وە بۆ باوكی پیاوەكە و كوڕی پیاوەكەش حەڵاڵ نابێت، وە كچی ئافرەتەكەشی بۆ حەڵاڵ نییە و ئافرەتەكەی خۆی لەسەر حەڕام دەبێت (دەبێ لەویشیان جیا بێتەوە).

١٥٢٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الزِّنَا، فَإِنَّهُ لاَ يُحَرِّمُ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، لأَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ: ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ ﴿٢٣﴾﴾ النساء، فَإِنَّمَا حَرَّمَ مَا كَانَ تَزْوِيجًا، وَلَمْ يَذْكُرْ تَحْرِيمَ الزِّنَا، فَكُلُّ تَزْوِيجٍ كَانَ عَلَى وَجْهِ الْحَلاَلِ يُصِيبُ صَاحِبُهُ امْرَأَتَهُ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ التَّزْوِيجِ الْحَلاَلِ.

فَهَذَا الَّذِي سَمِعْتُ، وَالَّذِي عَلَيْهِ أَمْرُ النَّاسِ عِنْدَنَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی بابەتی زینایە (واتە ئەگەر خێزانی هەبێت و زینا لەگەڵ دایكی خێزانی بكات، یان دایكەكە خێزانی پیاوەكە بێت و زینا لەگەڵ كچەكەی بكات)، ئەوە هیچ حەڕام ناكات (لەوەی لە پێشەوە باس كرا، چونكە بە نیكاحی شەرعی مەحرەمییەت دروست دەبێت نەك بە زینا، بە زینا هەر نامەحرەم حیسابن)، چونكە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ ﴿٢٣﴾﴾ النساء، واتە: [ـ یەكێك لەوانەی لەسەرتان حەڕام دەبن بریتییە لە ـ دایكی خێزانەكانتان]، جا تەنها ئەوە حەرامی مەحرەمییەت دروست دەكات كە زەواج بێت، باسی مەحرەمییەتی نەكردووە بەهۆی زینا، كەواتە هەر زەواجێك لەسەر بنەمای حەڵاڵ و شەریعەت بێت و كەسەكە جیماع لەگەڵ ئافرەتەكەی بكات، ئەوە زەواجی حەڵاڵە.

جا ئەوە بریتییە لەوەی گوێبیستی بووم و كار و فەتواش لای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠١، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٢؛ وفي: ١٥٠٥، عن مالك به.

## ١٠- هاوسەرگیریکردنی پیاو لەگەڵ دایکی ئەو ئافرەتەی کە زینای لەگەڵ کردووە[١]

**١٥٢٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الرَّجُلِ يَزْنِي بِالْمَرْأَةِ، فَيُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ فِيهَا: إِنَّهُ يَنْكِحُ ابْنَتَهَا، وَيَنْكِحُهَا ابْنُهُ إِنْ شَاءَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ أَصَابَهَا حَرَامًا، وَإِنَّمَا الَّذِي حَرَّمَ اللهُ مَا أُصِيبَ بِالْحَلَالِ، أَوْ عَلَى وَجْهِ الشُّبْهَةِ بِالنِّكَاحِ، قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٢٢﴾ ﴾ النساء[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو پیاوەی زینا لەگەڵ ئافرەتێك دەكات و حەد و سزای شەرعی لەسەر جێبەجێ دەكرێت، گوتوویەتی: بۆی حەڵاڵە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی ئافرەتەكە بكات (واتە بە زینایەكە ئافرەتەكە نەبۆتە مەحرەمی تا کچەكەی لەسەر حەرام بێت)، وە بۆ کوڕەكەشی دروستە بیهێنێ، لەبەر ئەوەی پیاوەكە كە جیماعی لەگەڵ ئافرەتەكە كردووە بەحەرامی بووە (بەحەرامیش نابێتە مەحرەم)، چونكە خوای پەروەردگار ﷻ ئەوەی كردۆتە مەحرەم كە بەحەڵاڵی جیماعی لەگەڵ كرابێت، یان بەشێوەی شوبهە و بەهەڵە جیماع ئەنجام درابێت، خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٢٢﴾ ﴾ النساء، واتە: [ئەوانە مەخوازن لەو ئافرەتانەی كە باوكتان كردوویەتی بە خێزانی خۆی و جیماعی لەگەڵ كردوون (بە ڕێگەی زەواج)].

**١٥٢٨- [فتوى]** قالَ مَالِكٌ ﵀: فَلَوْ أَنَّ رَجُلاً نَكَحَ امْرَأَةً فِي عِدَّتِهَا، نِكَاحًا حَلاَلاً، فَأَصَابَهَا، حَرُمَتْ عَلَى ابْنِهِ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، وَذَلِكَ أَنَّ أَبَاهُ نَكَحَهَا عَلَى وَجْهِ الْحَلاَلِ، لاَ يُقَامُ عَلَيْهِ فِيهِ الْحَدُّ، وَيُلْحَقُ بِهِ الْوَلَدُ الَّذِي يُولَدُ فِيهِ بِأَبِيهِ، وَكَمَا حَرُمَتْ عَلَى ابْنِهِ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا حِينَ تَزَوَّجَهَا أَبُوهُ فِي عِدَّتِهَا وَأَصَابَهَا، فَكَذَلِكَ يَحْرُمُ عَلَى الأَبِ ابْنَتُهَا إِذَا هُوَ أَصَابَ أُمَّهَا[٣].

---

(١) ـ نِكَاحُ الرَّجُلِ أُمَّ امْرَأَةٍ قَدْ أَصَابَهَا عَلىَ وَجْهِ مَا يَكْرَهُ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٣، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٣، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاوێك ئافرەتێكی هێنا لە كاتێكدا هێشتا لە عیدەدا بوو (كە حەرامە لەو حاڵەتە هاوسەرگیری لەگەڵ بكرێ)، جا جیماعیشی لەگەڵ كرد، ئەوە لەسەر كوڕی پیاوەكە حەرام دەبێت ئافرەتەكە بهێنێت (ئەگەر باوكی تەڵاقی دا یان مرد، چونكە هەرچەندە باوكی هاوسەرگیرییەكەی لە حاڵەتێكی حەرامدا ئەنجام داوە بەڵام هاوسەرگیرییەكە دامەزراوە و ئافرەتەكە بۆتە مەحرەم، كەواتە بۆ كوڕەكەی حەڵاڵ نییە دوای باوكی بیهێنێت)، چونكە باوكی بە هاوسەرگیری دامەزراو هێناویەتی (تەنها شێوازەكەی حەرامە)، حەد و سزای شەرعی بەسەردا جێبەجێ ناكرێت، وە نەسەبی منداڵەكەش دەلكێندرێت بە باوكیەوە كە لەو نیحاكە پەیدا دەبێ، جا چۆن لەسەر كوڕەكەی حەرام دەبێت ئافرەتەكە بهێنێت كە باوكی لە عیدەدا هێناویەتی و جیماعیشی لەگەڵ كردووە، بەهەمان شێوە كچی ئافرەتەكە لەسەر خودی باوكەكە حەرام دەبێت ئەگەر باوكەكە جیماعی لەگەڵ ئافرەتەكە كردبوو كە دایكی ئەو كچەیە.

## ١١- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی ئەو شتانەی دروست نین لە هاوسەرگیریدا[١]

**١٥٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ[٢].

وَالشِّغَارُ: أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ، عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە ژنبەژنە، جا ژنبەژنە ئەوەیە: پیاوێك كچی خۆی لە پیاوێكی دیكە مارە بكات لەسەر ئەوەی ئەو پیاوەی دیكە كچی خۆی لەو مارە بكات بەبێ مارەیی (واتە بێئەوەی هیچیان مارەییان بۆ بكرێت).

---

(١) ـ جَامِعُ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ النِّكَاحِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٦؛ والحدثاني: ٣٢٣ في النكاح؛ والشيباني: ٥٣٣ في النكاح؛ والشافعي: ١٢٤٨؛ وابن حنبل: ٤٥٢٦؛ والبخاري: ٥١١٢؛ ومسلم: النكاح: ٥٧؛ والنسائي: ٣٣٣٧؛ والترمذي: ١١٢٤؛ وابن ماجه: ١٨٨٩؛ وابن حبان: ٤١٥٢؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧١٨، وفي: ٧١٩؛ والدارمي: ٢١٨٠؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٧٩٥، وفي: ٥٨١٩؛ والقابسي: ٢٣٠، كلهم عن مالك به.

**١٥٣٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَمُجَمِّعٍ ابْنَيْ يَزِيدَ بْنِ جَارِيَةَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ ﷺ: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ، فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَرَدَّ نِكَاحَهُ[١].

واتە: لە عەبدوڕەحمان و موجەمیعەوە کە دوو کوڕی یەزیدی کوڕی جارییەی ئەنصارین ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەوانیش لە خەنسائی کچی خیزامی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە بەوەی باوکی بەشووی دا، لە کاتێکدا بێوەژن بوو، ژنەکەش پێی ناخۆش بوو و ڕازی نەبوو، جا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و (پێغەمبەری خواش ﷺ) بەشوودانەکەی ڕەت کردەوە.

**١٥٣١-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ أُتِيَ بِنِكَاحٍ لَمْ يَشْهَدْ عَلَيْهِ إِلاَّ رَجُلٌ وَامْرَأَةٌ، فَقَالَ: هَذَا نِكَاحُ السِّرِّ، وَلاَ أُجِيزُهُ، وَلَوْ كُنْتُ تَقَدَّمْتُ فِيهِ لَرَجَمْتُ[٢].

واتە: لە ئەبو زوبەیری مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): هاوسەرگیرییەکیان هێنایە خزمەتی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کە کەس نەببوو بە شاهێد تیایدا جگە لە پیاوێك و ئافرەتێك، جا گوتی: ئەمە هاوسەرگیری نهێنییە و بە ڕەوای نازانم و ڕێگەی پێ نادەم، وە ئەگەر من پێش کەوتبام (واتە کارەکە بەدەستی من با) ئەوە ئەو کەسەم ڕەجم دەکرد کە ئەنجامی داوە.

**١٥٣٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ طُلَيْحَةَ الأَسَدِيَّةَ، كَانَتْ تَحْتَ رُشَيْدٍ الثَّقَفِيِّ فَطَلَّقَهَا، فَنَكَحَتْ فِي عِدَّتِهَا، فَضَرَبَهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، وَضَرَبَ زَوْجَهَا بِالْمِخْفَقَةِ ضَرَبَاتٍ، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ فِي عِدَّتِهَا، فَإِنْ كَانَ زَوْجُهَا الَّذِي تَزَوَّجَهَا لَمْ يَدْخُلْ بِهَا، فُرِّقَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ اعْتَدَّتْ بَقِيَّةَ عِدَّتِهَا مِنْ زَوْجِهَا

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٧؛ والشيباني: ٥٢٩ في النكاح؛ والشافعي: ٨٣٣؛ وابن حنبل: ٢٦٨٢٩؛ والبخاري: ٥١٣٨، وفي: ٦٩٤٥؛ والنسائي: ٣٢٦٨؛ وأبو داود: ٢١٠١؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٠٩؛ والقابسي: ٣٩٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٨؛ والشيباني: ٥٣٤ في النكاح؛ والشافعي: ١٤٠٤، كلهم عن مالك به.

الأَوَّلِ، ثُمَّ كَانَ الآخَرُ خَاطِبًا مِنَ الْخُطَّابِ، وَإِنْ كَانَ دَخَلَ بِهَا، فُرِّقَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ اعْتَدَّتْ بَقِيَّةَ عِدَّتِهَا مِنَ الأَوَّلِ، ثُمَّ اعْتَدَّتْ مِنَ الآخَرِ، ثُمَّ لاَ يَجْتَمِعَانِ أَبَدًا[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷬: وَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﷬: وَلَهَا مَهْرُهَا بِمَا اسْتَحَلَّ مِنْهَا[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﵏ گێڕدراوەتەوە (گوتوویانە): تولەیحەی ئەسەدی لەژێر نیکاحی ڕوشەیدی سەقەفی بوو و تەڵاقی دا، جا هەر لە عیدەدا بوو شوی کردەوە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە گۆچان لەو و مێردەکەی دا و لێکی جیا کردنەوە، دواتر عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: هەر ئافرەتێك لە عیدەکەیدا شوو بکات، ئەگەر مێردەکەی جیماعی لەگەڵ نەکردبوو لێك جیا دەکرێنەوە، دواتر عیدەکەی لە مێردی یەکەم تەواو دەکات، دواتر پیاوەکەی دیکە دەبێتە یەکێك لە داخوازیکارەکان (ئەگەر ویستی)، وە ئەگەر (پیاوی دووەم کە لە عیدە هاوسەرگیری لەگەڵ کردبوو) جیماعیشی لەگەڵ کردبوو، ئەوە لێك جیا دەکرێنەوە، دواتر عیدەکەی لە مێردی یەکەم تەواو دەکات، دواتر عیدەی مێردی دووەمیش دادەنیشێت، دواتر هەرگیز بۆ یەکدی نابن.

ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷬ گوتوویەتی: ئافرەتەکە مارەیی بۆ هەیە (لەلایەن ئەو پیاوەی لە عیدە هاوسەرگیری لەگەڵ کردووە و لەگەڵی جووت بووە) بەهۆی ئەوەی جیماعی لەگەڵ کردووە.

**١٥٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمَرْأَةِ الْحُرَّةِ يُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، فَتَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، إِنَّهَا لاَ تَنْكِحُ، إِنِ ارْتَابَتْ مِنْ حَيْضَتِهَا، حَتَّى تَسْتَبْرِئَ نَفْسَهَا مِنْ تِلْكَ الرِّيبَةِ إِذَا خَافَتِ الْحَمْلَ[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٠٩؛ والحدثاني: ٣٢٤ في النكاح؛ والشيباني: ٥٤٥ في النكاح؛ والشافعي: ١٤٤٠؛ وشرح معاني الآثار: ٤٨٨٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٠؛ وفي: ١٧١٢؛ والحدثاني: ٣٢٤أ في النكاح، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: دەربارەی ئەو ئافرەتە ئازادەی مێردەکەی دەمرێت، بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە: دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ لە عیدە و چاوەڕوانیدا بێت، جا نابێ هاوسەرگیری بکات ئەگەر گومانی لە سووڕی مانگانەکەی هەبوو تا خۆی ڕزگار دەکات لەو گومانە ئەگەر ترسا لەوەی دووگیان بێت (چونکە ئەو کات عیدەکەی بریتییە لە دانانی حەملەکەی، بۆیە دەبێ ڕوون بێتەوە کە ئاخۆ حوکمی عیدەی حەملی بەسەر جێبەجێ دەبێت یان حوکمی چوار مانگ و دە ڕۆژەکە).

### ١٢- هاوسەرگیری ئافرەتی کۆیلە بەسەر ئافرەتی ئازاددا[١]

**١٥٣٤-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ سُئِلاَ عَنْ رَجُلٍ كَانَتْ تَحْتَهُ امْرَأَةٌ حُرَّةٌ، فَأَرَادَ أَنْ يَنْكِحَ عَلَيْهَا أَمَةً، فَكَرِهَا أَنْ يَجْمَعَ بَيْنَهُمَا[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئیبنو عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ پرسیاریان لێ کراوە دەربارەی پیاوێك کە ئافرەتێکی ئازادی لەژێر نیکاحدایە و دەیەوێ ئافرەتێکی کۆیلەی بەسەر بێنێ و بیکاتە هاوسەری دووەمی، جا هەردووکیان بە باشیان نەزانی ئەو دووانە بەیەکەوە کۆ بکاتەوە.

**١٥٣٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تُنْكَحُ الأَمَةُ عَلَى الْحُرَّةِ إِلاَّ أَنْ تَشَاءَ الْحُرَّةُ، فَإِنْ طَاعَتِ الْحُرَّةُ، فَلَهَا الثُّلُثَانِ مِنَ الْقَسْمِ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: نابێ ئافرەتی کۆیلە بەسەر ئافرەتی ئازاددا بهێندرێت مەگەر ئافرەتە ئازادەکە خۆی ڕێگە بدات، جا ئەگەر ئافرەتە ئازادەکە بەخۆشی خۆی ڕێگەی دا، ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی نۆبەتی بۆ هەیە (واتە دوو ڕۆژ بۆ ئەو ڕۆژێکیش بۆ ئافرەتە کۆیلەکە).

---

(١) ـ نِكَاحُ الأَمَةِ عَلَى الْحُرَّةِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١١، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٢؛ والحدثاني: ٣٢٥ في النكاح، عن مالك به.

**١٥٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي لِحُرٍّ أَنْ يَتَزَوَّجَ أَمَةً وَهُوَ يَجِدُ طَوْلاً لِحُرَّةٍ، وَلاَ يَتَزَوَّجَ أَمَةً إِذَا لَمْ يَجِدْ طَوْلاً لِحُرَّةٍ، إِلاَّ أَنْ يَخْشَى الْعَنَتَ، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ قَالَ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء، وَقَالَ: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْعَنَتُ هُوَ الزِّنَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كەسی ئازاد بۆی نییە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێكی كۆیلە بكات لە كاتێكدا پارە و مەسرەفی ئافرەتی ئازادی هەبێت، وە دیسان (بۆی نییە و) هاوسەرگیری ناكات لەگەڵ ئافرەتی كۆیلەدا ئەگەر پارە و مەسرەفی ئافرەتی ئازادیشی نەبوو، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە لە عەنەت بترسێت، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووكەكەیدا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء، وە فەرموویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: عەنەت زینایە.

## ١٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتێكی كۆیلە دەكڕێت كە پێشتر خێزانی بووە و تەڵاقی داوە[2]

**١٥٣٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يُطَلِّقُ الأَمَةَ ثَلاَثًا، ثُمَّ يَشْتَرِيهَا، إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ[3].

واتە: لە زەیدی كوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتە كۆیلەكەی خۆی سێ بەسێ تەڵاق دەدات و دواتر دەیكڕێتەوە، دەیگوت: بۆی حەڵاڵ نابێ تاوەكوو مێردێكی دیكە دەكاتەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٣، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَمْلِكُ الأَمَةَ، وَقَدْ كَانَتْ تَحْتَهُ فَفَارَقَهَا.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٤؛ والحدثاني: ٣٢٥أ في النكاح، عن مالك به.

**١٥٣٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ سُئِلاَ عَنْ رَجُلٍ زَوَّجَ عَبْدًا لَهُ جَارِيَةً لَهُ، فَطَلَّقَهَا الْعَبْدُ الْبَتَّةَ، ثُمَّ وَهَبَهَا سَيِّدُهَا لَهُ، هَلْ تَحِلُّ لَهُ بِمِلْكِ الْيَمِينِ؟ فَقَالاَ: لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ(١).

واته: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێ کراوە دەربارەی پیاوێك کە جارییەیەك دەخوازێت بۆ بەندەکەی و بەندەکەش (دواتر) سێ بە سێ تەڵاقی دەدات، دواتر گەورەی ئافرەتەکە بەناوی دیاری جارییەکە دەبەخشێت بە پیاوە کۆیلەکەی کە تەڵاقی داوە، ئایا بۆی حەڵاڵ دەبێ بە ناوی موڵکی یەمین و جارییایەتی؟ هەردووکیان گوتیان: بۆی حەڵاڵ نییە تاوەکوو مێردێکی دیکە دەکاتەوە.

**١٥٣٩-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنْ رَجُلٍ كَانَتْ تَحْتَهُ أَمَةٌ مَمْلُوكَةٌ فَاشْتَرَاهَا، وَقَدْ كَانَ طَلَّقَهَا وَاحِدَةً، فَقَالَ: تَحِلُّ لَهُ بِمِلْكِ يَمِينِهِ مَا لَمْ يَبُتَّ طَلاَقَهَا، فَإِنْ بَتَّ طَلاَقَهَا، فَلاَ تَحِلُّ لَهُ بِمِلْكِ يَمِينِهِ، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ(٢).

واته: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی پیاوێك کە ئافرەتێکی کۆیلەی لەژێر نیکاحدایە و کڕیویەتی، جا تەڵاقێکی داوە، گوتی: بە موڵکی یەمین بۆی حەڵاڵە مادەم بەیەکجارەکی تەڵاقی نەدابێت، جا ئەگەر بەیەکجارەکی تەڵاقی دابوو، ئەوە بە موڵکی یەمین بۆی حەڵاڵ نییە، تاوەکوو مێردێکی دیکە دەکات.

**١٥٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَنْكِحُ الأَمَةَ فَتَلِدُ مِنْهُ، ثُمَّ يَبْتَاعُهَا: إِنَّهَا لاَ تَكُونُ أُمَّ وَلَدٍ لَهُ بِذَلِكَ الْوَلَدِ الَّذِي وَلَدَتْ مِنْهُ، وَهِيَ لِغَيْرِهِ حَتَّى تَلِدَ مِنْهُ، وَهِيَ فِي مِلْكِهِ بَعْدَ ابْتِيَاعِهِ إِيَّاهَا(٣).

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٥، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٦؛ والشيباني: ٥٧٢ في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٦١٢٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٧؛ وفي: ١٥١٨، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوێك کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلە بکات و منداڵی لێ ببێت دواتر بیکڕێتەوە (حوکمەکەی چۆنە)؟ گوتوویەتی: ئافرەتەکە نابێتە ئوم وەلەد بەهۆی ئەو منداڵەی لە پیاوەکە بوویەتی، لە کاتێکدا ئافرەتەکە هێشتا موڵکی کەسێکی دیکەیە، (کەواتە نابێتە ئوم وەلەد) تاوەکوو ئافرەتەکە منداڵی لە پیاوەکە نەبێت لە کاتێکدا بۆتە موڵکی کەسەکە دوای ئەوەی کڕیویەتی (نەك بەر لەوەی کڕیبێتی)[١].

**١٥٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنِ اشْتَرَاهَا وَهِيَ حَامِلٌ مِنْهُ، ثُمَّ وَضَعَتْ عِنْدَهُ كَانَتْ أُمَّ وَلَدِهِ بِذَلِكَ الْحَمْلِ، فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر (کەسێك) ئافرەتێکی کۆیلەی کڕی لە کاتێکدا دووگیان بوو، دواتر ئافرەتەکە حەملەکەی لەلای ئەو دانا و منداڵەکەی بوو، ئەوە بەهۆی ئەو حەملەوە دەبێتە ئوم وەلەد (کەواتە خۆی و منداڵەکە بە ئازاد حیسابن)، پێیان وایە ئاوایە، والله أعلم.

## ١٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەی جیماعکردن لەگەڵ دوو خوشك یان دایك و کچ بە ناوی موڵکی یەمین[٣]

**١٥٤٢-** أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ وَابْنَتِهَا مِنْ مِلْكِ الْيَمِينِ، تُوطَأُ إِحْدَاهُمَا بَعْدَ الأُخْرَى، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: مَا أُحِبُّ أَنْ أَخْبُرَهُمَا جَمِيعًا، وَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ[٤].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئافرەتێك و کچەکەی لە موڵکی یەمیندا، کە یەکێکیان دوای ئەوەیدی جیماعی لەگەڵ بکرێت،

---

(١) ـ تێبینی: ئوم وەلەد بریتییە لەو ئافرەتەی کە کەسێك دوای کڕینی منداڵی لێی دەبێت و ئافرەتەکە و منداڵەکە بەهۆی ئەوەوە دەبن بە کەسی ئازاد.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٧؛ وفي: ١٥١٨، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ إِصَابَةِ الأَخْتَيْنِ بِمِلْكِ الْيَمِينِ وَالْمَرْأَةِ وَابْنَتِهَا.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥١٩؛ والحدثاني: ٣٢٥ب في النكاح؛ والشيباني: ٥٣٦ في النكاح؛ والشافعي: ١٣٩١، كلهم عن مالك به.

جا ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: پێم حەڕامە هیچیان جیاعیان لەگەڵ بكرێت و قەدەغەی لێ كرد.

**١٥٤٣-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ عَنِ الأَخْتَيْنِ مِنْ مِلْكِ الْيَمِينِ، هَلْ يُجْمَعُ بَيْنَهُمَا؟ فَقَالَ عُثْمَانُ ﷺ: أَحَلَّتْهُمَا آيَةٌ، وَحَرَّمَتْهُمَا آيَةٌ، فَأَمَّا أَنَا، فَلاَ أُحِبُّ أَنْ أَصْنَعَ ذَلِكَ.

قَالَ: فَخَرَجَ مِنْ عِنْدِهِ، فَلَقِيَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: لَوْ كَانَ لِي مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ، ثُمَّ وَجَدْتُ أَحَدًا فَعَلَ ذَلِكَ، لَجَعَلْتُهُ نَكَالاً.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: أُرَاهُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ[1].

واتە: لە قەبیصەی كوڕی زوئەیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك پرسیاری لە عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ كرد دەربارەی دوو خوشك لە موڵكی یەمیندا، كە ئاخۆ بەیەكەوە كۆ دەكرێنەوە؟ جا ئیمامی عوسمان ﷺ گوتی: ئایەتێك حەڵاڵیان دەكات و ئایەتێكیش حەڕامیان دەكات (واتە ئایەتێكمان هەیە ئەگەر سەیری بكەین بەگشتی دێتە بەرچاو كە هەر ئافرەتێك بێت لە موڵكی یەمیندا دروستە مرۆڤ لەلای بێت، بەو پێیە حەڵاڵە، وە ئایەتێكیشمان هەیە دەڵێ نابێ دوو خوشك بەیەكەوە كۆ بكرێنەوە، بەو پێیە حەڕامە)، جا من بە چاكی نازانم ئەوە بكەم.

جا (قەبیصە) دەڵێ: پیاوەكە لەلای ئیمامی عوسمان ﷺ دەرچوو و گەیشت بە هاوەڵێكی پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری ئەوەی لێ كرد؟ ئەویش گوتی: ئەگەر شتێكم بەدەست بووایە دواتر كەسێكم ببینیایە ئاوای كردووە (دوو خوشكی بەیەكەوە كۆ كردۆتەوە لە موڵكی یەمیندا) ئەوە دەمكرد بە پەند.

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە هاوەڵەكە عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب بوو ﷺ.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٠؛ والحدثاني: ٣٢٦ في النكاح؛ والشيباني: ٥٣٧ في النكاح؛ والشافعي: ١٣٩٠؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٦٢٥١، كلهم عن مالك به.

**١٥٤٤**- عَنْ مالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، مِثْلُ ذَلِكَ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە ﷺ هەمان شتی پێ گەیشتووە.

**١٥٤٥**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الأَمَةِ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ فَيُصِيبُهَا، ثُمَّ يُرِيدُ أَنْ يُصِيبَ أُخْتَهَا: إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى يُحَرِّمَ عَلَيْهِ فَرْجَ أُخْتِهَا بِنِكَاحٍ، أَوْ عَتَاقَةٍ، أَوْ كِتَابَةٍ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ يُزَوِّجُهَا عَبْدَهُ أَوْ غَيْرَ عَبْدِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی لەلای پیاوێکە و جیماعی لەگەڵ دەکات، دواتر دەیەوێ جیماع لەگەڵ خوشکەکەشی بکات، گوتوویەتی: بۆی حەڵاڵ نیە تاوەکوو عەوڕەتی خوشکەکەی دیکەی لەسەر حەڕام نەبێت بەوەی بیکات بە خێزانی کەسێکی دیکە یان ئازادی بکات یان موکاتەبەی لەگەڵ بکات و بیکاتە کۆیلەی نووسراوپێدراو یان شتێکی هاوشێوەی ئەو شتانە، (وەك ئەوەی) بیکات بە خێزانی عەبدەکەی خۆی یان کەسێکی جگە لە عەبدەکەی خۆی (ئەو ڕێگەچارانە هەن).

## ١٥- نەهیکردن لەوەی پیاو جیماع لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلە بکات کە پێشتر هی باوکی بووە[٣]

**١٥٤٦**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ وَهَبَ لِابْنِهِ جَارِيَةً، فَقَالَ: لاَ تَمَسَّهَا، فَإِنِّي قَدْ كَشَفْتُهَا[٤].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ جارییەیەکی بۆ کوڕەکەی کردە دیاری و گوتی: دەستی لێ نەدەی،

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٢، عن مالك به.

(٣) ـ النَّهْيُ أَنْ يُصِيبَ الرَّجُلُ أَمَةً كَانَتْ لأَبِيهِ.

(٤) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٣، عن مالك به.

چونکە من جەستەیم بینیوە (واتە خۆشەویستی و دەست لەملانێیەکم لەگەڵدا گۆڕیوەتەوە، بەڵام جیماعی لەگەڵ نەکردبوو).

**١٥٤٧-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْمُجَبَّرِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: وَهَبَ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللهِ ﷺ لِابْنِهِ جَارِيَةً، فَقَالَ: لاَ تَقْرَبْهَا، فَإِنِّي قَدْ أَرَدْتُهَا، فَلَمْ أَنْبَسِطْ إِلَيْهَا[١].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موجەبەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سالمی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ جارییەیەکی بە دیاری دا بە کوڕەکەی و گوتی: نزیکی نەکەویتەوە، چونکە من ویستم لەگەڵی جووت بم، بەڵام لەگەڵی نەکرامەوە (واتە لە کۆتایی جیماعم لەگەڵی نەکرد بەڵام لەزەتمان لە یەکدی کرد).

**١٥٤٨-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا نَهْشَلِ بْنَ الْأَسْوَدِ قَالَ لِلْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ: إِنِّي رَأَيْتُ جَارِيَةً لِي مُنْكَشِفًا عَنْهَا، وَهِيَ فِي الْقَمَرِ، فَجَلَسْتُ مِنْهَا مَجْلِسَ الرَّجُلِ مِنِ امْرَأَتِهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي حَائِضٌ، فَقُمْتُ، فَلَمْ أَقْرَبْهَا بَعْدُ، أَفَأَهَبُهَا لِابْنِي يَطَؤُهَا؟ فَنَهَاهُ الْقَاسِمُ عَنْ ذَلِكَ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو نەهشەلی کوڕی ئەسوەد بە قاسمی کوڕی موحەممەدی گوت: من جارییەیەکی خۆم بینی جلەکەی هەڵکردبوو، لەبەر ڕووناکی مانگەشەو بوو (یان وەك وێنەی مانگ جوان بوو)، جا پیاو لەکوێی ئافرەت دادەنیشیت منیش لەو شوێنە دانیشتم (تا جیماعی لەگەڵ بکەم)، جا ئافرەتەکە گوتی: من حەیزدارم، منیش هەڵسام و جیماعەکەم نەکرد، جا ئایا دەکرێت بیبەخشم بە کوڕەکەم تا سەرجێیی لەگەڵ بکات؟ جا قاسم ئەوەی لێ قەدەغە کرد.

**١٥٤٩-** عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ ﷺ: أَنَّهُ وَهَبَ لِصَاحِبٍ لَهُ جَارِيَةً، ثُمَّ سَأَلَهُ عَنْهَا فَقَالَ: قَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَهَبَهَا لِابْنِي، فَيَفْعَلُ بِهَا كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ لَمَرْوَانُ: كَانَ أَوْرَعَ مِنْكَ، وَهَبَ لِابْنِهِ جَارِيَةً، ثُمَّ قَالَ: لاَ تَقْرَبْهَا، فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ سَاقَهَا مُنْكَشِفَةً[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٤؛ والحدثاني: ٣٢٧ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٣؛ والحدثاني: ٣٢٦أ في النكاح، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٥؛ والحدثاني: ٣٢٧أ في النكاح؛ وفي: ٣٢٧ب في النكاح،

واتە: لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە جارییەیەکی بە هاوڕێیەکی بەخشی، دواتر پرسیاری جارییەکەی کرد، هاوڕێکەشی گوتی: دەمەوێ بیبەخشم بە کوڕەکەم تاوەکوو جیماعی لەگەڵ بکات، جا عەبدولمەلیك گوتی: مەڕوان لەتۆ پارێزکارتر بوو، جارییەیەکی بە کوڕەکەی بەخشی دواتر گوتی: نزیکی نەکەویتەوە، من قاچەکانیم بەڕووتی بینیوە.

## ١٦- قەدەغەکردن لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ئافرەتی کۆیلەی ئەهلی کیتاب[1]

**١٥٥٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَحِلُّ نِكَاحُ أَمَةٍ يَهُودِيَّةٍ وَلاَ نَصْرَانِيَّةٍ، لأَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ:﴿ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ﴿٥﴾ ﴾ المائدة، فَهُنَّ الْحَرَائِرُ مِنَ الْيَهُودِيَّاتِ وَالنَّصْرَانِيَّاتِ، وَقَالَ اللهُ ﷻ:﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء، فَهُنَّ الإِمَاءُ الْمُؤْمِنَاتُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هێنانی ئافرەتی کۆیلەی جوولەکە و دیان حەڵاڵ نییە، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ﴿٥﴾ ﴾ المائدة، (کە ڕێگەی داوە بە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ئافرەتی جوولەکە و گاور، ئەو ئافرەتانە) بریتین لە ئافرەتانی ئازادی جوولەکە و گاور (نەك ئافرەتی کۆیلەی جوولەکە و گاور)، وە خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٢٥﴾ ﴾ النساء، (جا کە لەو ئایەتە ڕێگە بە خواستنی کۆیلە دراوە ئەوە) بریتین لە ئافرەتانی کۆیلەی باوەڕدار (کەواتە ئەگەر ئافرەتی کۆیلەی خواست

---

عن مالك به.

(١) ـ النَّهْيُ عَنْ نِكَاحِ إِمَاءِ أَهْلِ الْكِتَابِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٦؛ والحدثاني: ٣٢٨ في النكاح، عن مالك به.

دەبێ کۆیلەکە باوەڕدار بێت، ئەگەر ئافرەتەکەش جوولەکە یان دیان بوو دەبێ ئازاد بێت، کەواتە نابێ کۆیلە بێت و کافر بێت).

**١٥٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنَّمَا أَحَلَّ اللهُ فِيمَا نُرَى نِكَاحَ الإِمَاءِ الْمُؤْمِنَاتِ، وَلَمْ يَحْلِلْ نِكَاحَ إِمَاءِ أَهْلِ الْكِتَابِ: الْيَهُودِيَّةِ وَالنَّصْرَانِيَّةِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ تەنها هاوسەرگیریکردنی لەگەڵ ئافرەتانی کۆیلەی باوەڕداری حەڵاڵ کردووە، هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی کۆیلەی ئەهلی کیتاب حەڵاڵ نەکردووە، کە بریتین لە جوولەکە و دیان.

**١٥٥٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمَةُ الْيَهُودِيَّةُ وَالنَّصْرَانِيَّةُ تَحِلُّ لِسَيِّدِهَا بِمِلْكِ الْيَمِينِ، وَلاَ يَحِلُّ وَطْءُ أَمَةٍ مَجُوسِيَّةٍ بِمِلْكِ الْيَمِينِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی کۆیلەی جوولەکە و دیان بە موڵکی یەمین بۆ گەورەکەی حەڵاڵ دەبێت، بەڵام جیماعکردن لەگەڵ ئافرەتی مەجووسی دروست نییە بە موڵکی یەمین.

## ١٧- ئەوەی دەربارەی ئیحصان هاتووە[3]

**١٥٥٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٢٤﴾﴾ النساء، هُنَّ أُولاَتُ الأَزْوَاجِ، وَيَرْجِعُ ذَلِكَ إِلَى أَنَّ اللهَ تَعَالَى حَرَّمَ الزِّنَا[4].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴿٢٤﴾﴾ النساء، بریتین لە ئافرەتانی خاوەن مێرد، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە خوای پەروەردگار زینای حەڕام کردووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٦؛ والحدثاني: ٣٢٨ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٦؛ والحدثاني: ٣٢٨ في النكاح، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي الإِحْصَانِ.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٢٩؛ والحدثاني: ٣٢٩ في النكاح؛ والشيباني: ١٠٠٢ في العتاق، كلهم عن مالك به.

**١٥٥٤**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، وَبَلَغَهُ عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُمَا كَانَا يَقُولاَنِ: إِذَا نَكَحَ الْحُرُّ الأَمَةَ فَمَسَّهَا، فَقَدْ أَحْصَنَتْهُ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئیبنو شیهاب و قاسمی کوڕی موحەممەدی ﷺ گێڕاوەتەوە بەوەی گوتوویانە: ئەگەر پیاوی ئازاد هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی کۆیلە کرد و جیماعی لەگەڵ کرد، ئەوە بۆتە موحصەن (کەواتە ئەگەر زینا بکات ڕەجم دەکرێت).

**١٥٥٥**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ مَنْ أَدْرَكْتُ كَانَ يَقُولُ ذَلِكَ: تُحْصِنُ الأَمَةُ الْحُرَّ إِذَا نَكَحَهَا فَمَسَّهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت ئەوانەی پێیان گەیشتووم دەیانگوت: ئافرەتی کۆیلە پیاوی ئازاد دەکات بە موحصەن ئەگەر پیاوەکە مارەی کردبێت و جیماعی لەگەڵ کردبێت (کەواتە ئەگەر ئەو پیاوە زینا بکات ڕەجم دەکرێت).

**١٥٥٦**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُحْصِنُ الْعَبْدُ الْحُرَّةَ إِذَا مَسَّهَا بِنِكَاحٍ، وَلاَ تُحْصِنُ الْحُرَّةُ الْعَبْدَ، إِلاَّ أَنْ يَعْتِقَ وَهُوَ زَوْجُهَا، فَيَمَسَّهَا بَعْدَ عِتْقِهِ، فَإِنْ فَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَعْتِقَ، فَلَيْسَ بِمُحْصَنٍ حَتَّى يَتَزَوَّجَ بَعْدَ عِتْقِهِ، وَيَمَسَّ امْرَأَتَهُ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاوی کۆیلە ئافرەتی ئازاد دەکات بە موحصەنە کاتێ جیماعی لەگەڵ بکات بە هاوسەرگیری، (بەڵام) ئافرەتی ئازاد پیاوی کۆیلە ناکات بە موحصەن، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە پیاوەکە ئازاد ببێت لە کاتێکدا هێشتا هاوسەری ئافرەتە ئازادەکەیە، جا ئەگەر لە ئافرەتەکە جیا بۆیەوە بەر لەوەی ئازاد ببێت، ئەوە موحصەن نییە تاوەکوو دوای ئازادبوونی هاوسەرگیری دەکات و جیماع لەگەڵ خێزانی دەکات.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣٠ في النكاح؛ والحدثاني: ٣٢٩أ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣١، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣٢، عن مالك به.

١٥٥٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمَةُ إِذَا كَانَتْ تَحْتَ الْحُرِّ ثُمَّ فَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَعْتِقَ، فَإِنَّهُ لاَ يُحْصِنُهَا نِكَاحُهُ إِيَّاهَا وَهِيَ أَمَةٌ حَتَّى تُنْكَحَ بَعْدَ عِتْقِهَا وَيُصِيبَهَا زَوْجُهَا، فَذَلِكَ إِحْصَانُهَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی کۆیلەش ئەگەر لەژێر نیکاحی پیاوێکی ئازاددا بوو دواتر پیاوەکە تەڵاقی دا بەر لەوەی ئازاد ببێت، ئەوە هاوسەرگیرییەکەی نایکات بە موحصەنە لە کاتێکدا ئافرەتەکە هەر کۆیلەیە، تاوەکوو ئافرەتەکە دوای ئازادکردنی شوو دەکاتەوە و مێردەکەی جیماعی لەگەڵ دەکات، ئا ئەوە ئیحصانەکەیەتی.

١٥٥٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمَةُ إِذَا كَانَتْ تَحْتَ الْحُرِّ فَتَعْتِقُ، وَهِيَ تَحْتَهُ قَبْلَ أَنْ يُفَارِقَهَا: إِنَّهُ يُحْصِنُهَا إِذَا أُعْتِقَتْ، وَهِيَ عِنْدَهُ إِذَا هُوَ أَصَابَهَا بَعْدَ أَنْ تَعْتِقَ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی کۆیلە ئەگەر لەژێر نیکاحی پیاوێکی ئازاددا بوو و لە کۆیلایەتی ڕزگاری بوو، لە کاتێکدا ئافرەتەکە هێشتا هەر لەژێر نیکاحی پیاوەکەدا بوو بەر لەوەی تەڵاقی بدات: ئەوە ئەو پیاوە دەیکات بە موحصەنە کاتێ ئازاد دەکرێت، (بە مەرجێك) هەر لەلای مابێتەوە و دوای ئازادکردنی جیماعی لەگەڵ کردبێ.

١٥٥٩- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْحُرَّةُ النَّصْرَانِيَّةُ وَالْيَهُودِيَّةُ، وَالأَمَةُ الْمُسْلِمَةُ يُحْصِنَّ الْحُرَّ الْمُسْلِمَ، إِذَا نَكَحَ إِحْدَاهُنَّ فَأَصَابَهَا(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی ئازادی جوولەکە و دیان و ئافرەتی مسوڵمان پیاوی ئازاد دەکەن بە موحصەن، ئەگەر پیاوەکە هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێکیان بکات و جیماعیشی لەگەڵ بکات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣٣، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣٣، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٣٥، عن مالك به.

## ١٨- هاوسەرگیری موتعە (سیغە)[١]

**١٥٦٠-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ[٢].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی خەیبەر موتعە و خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڕام کرد.

**١٥٦١-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيمٍ ﷺ دَخَلَتْ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَبِيعَةَ بْنَ أُمَيَّةَ اسْتَمْتَعَ بِامْرَأَةٍ مُوَلَّدَةٍ، فَحَمَلَتْ مِنْهُ، فَخَرَجَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ فَزِعًا يَجُرُّ رِدَاءَهُ، فَقَالَ: هَذِهِ الْمُتْعَةُ، وَلَوْ كُنْتُ تَقَدَّمْتُ فِيهَا، لَرَجَمْتُ[٣].

واتە: لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): خەولەی کچی حەکیم ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و گوتی: ڕەبیعەی کوڕی ئومەییە هاوسەرگیریی کاتی لەگەڵ ئافرەتێکی غەیرە عەرەب کردووە و ئافرەتەکە دووگیان بووە لە پیاوەکە، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەپەشۆکاوی دەرپەڕیە دەرەوە جوبە و کەواکەی لەدوای خۆی دەخشاند و دەیگوت: ئەوە موتعەیە (هاوسەرگیریی کاتییە)، وەی ئەگەر من پێشەنگ دەبووم لەو بابەتە ئەوە ڕەجمم دەکرد.

---

(١) ـ نِكَاحُ الْمُتْعَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٢؛ والحدثاني: ٣٣٣ في النكاح؛ والشيباني: ٥٨٤ في الطلاق؛ والشافعي: ١٧٥٣؛ والبخاري: ٤٢١٦، وفي: ٥٥٢٣؛ ومسلم: النكاح: ٢٩، وفي: الصيد: ٢٢؛ والنسائي: ٣٣٦٦، وفي: ٣٣٦٧، وفي: ٣٣٦٧، وفي: ٣٣٦٧؛ والترمذي: ١٧٩٤؛ وابن ماجه: ١٩٦٩؛ وابن حبان: ٤١٤٠، وفي: ٤١٤٣، وفي: ٤١٤٥؛ والدارمي: ١٩٩٠؛ والقابسي: ٦٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٣؛ والحدثاني: ٣٣٣أ في النكاح؛ والشيباني: ٥٨٥ في الطلاق؛ والشافعي: ١١٠٨، كلهم عن مالك به.

## ١٩- هاوسەرگیری کۆیلەکان[١]

**١٥٦٢-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: يَنْكِحُ الْعَبْدُ أَرْبَعَ نِسْوَةٍ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْعَبْدُ مُخَالِفٌ لِلْمُحَلِّلِ، إِنْ أَذِنَ لَهُ سَيِّدُهُ ثَبَتَ نِكَاحُهُ، وَإِنْ لَمْ يَأْذَنْ لَهُ سَيِّدُهُ، فُرِّقَ بَيْنَهُمَا، وَالْمُحَلِّلُ يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا عَلَى كُلِّ حَالٍ، إِذَا أُرِيدَ بِالنِّكَاحِ التَّحْلِيلُ[٣].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ﷺ بووە دەیگوت: پیاوی کۆیلە چوار خێزان دەهێنێت (واتە وەك کەسی ئازاد ئەو مافەی هەیە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کۆیلە جیاوازە لەگەڵ کەسی موحەلیل (ئەو کەسەی مارەبەجاش دەکات، کە بریتییە لەو کەسەی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی تەڵاقدراو دەکات بۆئەوەی تەڵاقی بدات و بۆ پیاوی یەکەم حەڵاڵی بکاتەوە)، (کۆیلە) ئەگەر گەورەکەی مۆڵەتی بدات هاوسەرگیرییەکەی دادەمەزرێت، وە ئەگەر گەورەکەی مۆڵەتی پێ نەدات لێك جیا دەکرێنەوە، بەڵام موحەلیل بەهەموو شێوەیەك لێك جیا دەکرێنەوە، ئەگەر مەبەست بە هاوسەرگیرییەکە حەڵاڵکردنەوە بێت.

**١٥٦٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَبْدِ إِذَا مَلَكَتْهُ امْرَأَتُهُ، أَوِ الزَّوْجُ يَمْلِكُ امْرَأَتَهُ، إِنَّ مِلْكَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ يَكُونُ فَسْخًا بِغَيْرِ طَلَاقٍ، فَإِنْ تَرَاجَعَا بِنِكَاحٍ بَعْدُ، لَمْ تَكُنْ تِلْكَ الْفُرْقَةُ طَلَاقًا[٤].

---

(١) ـ نِكَاحُ الْعَبِيدِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٤؛ والحدثاني: ٣٣٤ في النكاح، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٥، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کۆیلەیەك ئەگەر خێزانەکەی بوو بە خاوەنی پیاوەکەی (بە کڕین یان دیاری یان میرات)، یان مێردێك بوو بە خاوەنی خێزانەکەی (بە کڕین یان دیاری یان میرات)، ئەوە خاوەندارییەتی هەر یەکێکیان بۆ ئەوەی دیکە دەبێتە هەڵوەشانەوەی نیکاحەکە بەبێ تەڵاق، جا ئەگەر دواتر گەڕانەوە لای یەکدی بەنیکاح (نەك بەکڕین و فرۆشتن)، ئەو لێکجیابوونەوەی ڕووی دا نەبۆتە تەڵاق (واتە هەموو تەڵاقەکەی دەمێنێت).

**١٥٦٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْعَبْدُ إِذَا أَعْتَقَتْهُ امْرَأَتُهُ إِذَا مَلَكَتْهُ وَهِيَ فِي عِدَّةٍ مِنْهُ، لَمْ يَتَرَاجَعَا إِلاَّ بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاوی کۆیلە ئەگەر خێزانەکەی ئازادی کرد دوای ئەوەی ببوو بە موڵکی ئەو لە کاتێکدا لە عیدەی پیاوەکەدا بوو، ئەوە ناگەڕێنەوە لای یەکدی تەنها بە هاوسەرگیرییەکی نوێ نەبێ (واتە بە ڕیجعە حەڵاڵ نابێتەوە چونکە بارودۆخ گۆڕاوە هەرچەندە هێشتا لە عیدەشدا بێت).

## ٢٠- هاوسەرگیری کەسی موشریك کاتێ خێزانەکەی بەر لە خۆی مسوڵمان دەبێت[٢]

**١٥٦٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ نِسَاءً كُنَّ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يُسْلِمْنَ بِأَرْضِهِنَّ، وَهُنَّ غَيْرُ مُهَاجِرَاتٍ، وَأَزْوَاجُهُنَّ حِينَ أَسْلَمْنَ كُفَّارٌ، مِنْهُنَّ بِنْتُ الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، وَكَانَتْ تَحْتَ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ، فَأَسْلَمَتْ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَهَرَبَ زَوْجُهَا صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ مِنَ الإِسْلاَمِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ ابْنَ عَمِّهِ، وَهْبَ بْنَ عُمَيْرٍ، بِرِدَاءِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَمَانًا لِصَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ، وَدَعَاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَأَنْ يَقْدَمَ عَلَيْهِ، فَإِنْ رَضِيَ أَمْرًا قَبِلَهُ، وَإِلاَّ سَيَّرَهُ شَهْرَيْنِ، فَلَمَّا قَدِمَ صَفْوَانُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بِرِدَائِهِ، نَادَاهُ عَلَى رُؤُوسِ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ هَذَا وَهْبَ بْنَ عُمَيْرٍ جَاءَنِي بِرِدَائِكَ، وَزَعَمَ أَنَّكَ دَعَطوتني إِلَى الْقُدُومِ عَلَيْكَ، فَإِنْ رَضِيتُ أَمْرًا قَبِلْتُهُ، وَإِلاَّ سَيَّرْتَنِي شَهْرَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: انْزِلْ أَبَا وَهْبٍ، فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ، لاَ أَنْزِلُ حَتَّى

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٦، عن مالك به.

(٢) ـ نِكَاحُ الْمُشْرِكِ إِذَا أَسْلَمَتْ زَوْجَتُهُ قَبْلَهُ.

تُبَيِّنَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بَلْ لَكَ تَسِيرُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قِبَلَ هَوَازِنَ بِحُنَيْنٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ يَسْتَعِيرُهُ أَدَاةً وَسِلاَحًا عِنْدَهُ، فَقَالَ صَفْوَانُ: أَطَوْعًا أَمْ كَرْهًا؟ فَقَالَ: بَلْ طَوْعًا، فَأَعَارَهُ الأَدَاةَ وَالسِّلاَحَ الَّتِي عِنْدَهُ، ثُمَّ خَرَجَ صَفْوَانُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ كَافِرٌ، فَشَهِدَ حُنَيْنًا وَالطَّائِفَ، وَهُوَ كَافِرٌ، وَامْرَأَتُهُ مُسْلِمَةٌ، وَلَمْ يُفَرِّقْ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، حَتَّى أَسْلَمَ صَفْوَانُ، وَاسْتَقَرَّتْ عِنْدَهُ امْرَأَتُهُ بِذَلِكَ النِّكَاحِ[1].

واته: له ئیبنو شیهابەوه ﷬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): هەندێ ئافرەت له سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ له خاك و ناوچە و مەملەكەتی خۆیان بوون بە مسوڵمان، له كاتێكدا موهاجیر و كۆچكەر نەبوون، وە مێردەكانیان كافر بوون ئەو كاتەی ئەوان بوون بە مسوڵمان، یەكێك لەوان كچی وەلیدی كوڕی موغیرە بوو كە لەژێر نیكاحی صەفوانی كوڕی ئومەییەدا بوو، جا ئافرەتەكە لە ڕۆژی فەتحی مەككە مسوڵمان بوو، مێردەكەشی كە صەفوانی كوڕی ئومەییە بوو لە ئیسلام هەڵهات، جا پێغەمبەری خوا ﷺ كوڕەمامەكەی كە وەهبی كوڕی عومەیر بوو بە جوبەی پێغەمبەری خواوە ﷺ نارد بەدوایدا تا ببێتە (نیشانەیەكی) ئەمان بۆ صەفوانی كوڕی ئومەییە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ (بە نێردراوەكەی خۆی) بانگی كرد بۆ ئیسلام و هاتن بۆ لای، جا ئەگەر ڕازی بوو ئەوە (باشە) قبووڵی كردووە، ئەگەر ڕازیش نەبوو ئەوە دوو مانگ مۆڵەتی دەدرێت، جا كاتێ صەفوان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە جوبەكەوە لەناو هەموو خەڵكی هاواری كرد: ئەی موحەممەد ﷺ ئەوە وەهبی كوڕی عومەیرە بەخۆ بە جوبەكەتەوە هاتووە بۆ لام و دەڵێت تۆ بانگت كردووم بەوەی بێم بۆ لات، جا ئەگەر ڕازی بووم ئەوە قبووڵم كردووە، ئەگینا دوو مانگ مۆڵەتم دەدەیت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دابەزە ئەی ئەبو وەهب (ئەی صەفوان)، ئەویش گوتی: نەخێر بە خوا، دانابەزم تا بۆم ڕوون نەكەیتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵكوو مۆڵەتی چوار مانگ بۆ تۆ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ هۆزی هەوازن لە (دۆڵی) حونەین، جا (نێردراوی) نارد بۆ لای صەفوانی كوڕی ئومەییە تا بەخواستن داوای ئەو

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٧؛ وفي: ١٥٤٨؛ والحدثاني: ٣٣٦ في النكاح؛ والحدثاني: ٣٣٧ج في النكاح؛ والشافعي: ١٠٧٢، كلهم عن مالك به.

کەلوپەل و چەکانەی لێ بکات کە هەیبوو، جا صەفوان گوتی: بەخواستی خۆمە یان بەزۆرەملێیە؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ وەڵامی دایەوە) فەرمووی: بەڵکوو بەئارەزوو و خواستی خۆتە (دەتوانی نەیدەیت)، جا ئەو کەلوپەل و چەکانەی هەیبوو بەخواستن پێی دا، دواتر صەفوان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو (بۆ شەڕ دژی دوژمنانی ئیسلام) لە کاتێکدا هێشتا کافر بوو، ئامادەی شەڕی حونەین و تائیف بوو لە کاتێکدا کافر بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو و خێزانەکەی لێك جیا نەکردەوە تا صەفوانیش مسوڵمان بوو، جا خێزانەکەی لەلای مایەوە بە هەمان هاوسەرگیری پێشوو.

**١٥٦٦-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ بَيْنَ إِسْلاَمِ صَفْوَانَ، وَبَيْنَ إِسْلاَمِ امْرَأَتِهِ، نَحْوٌ مِنْ شَهْرٍ[(١)].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ماوەی مسوڵمانبوونی صەفوان و مسوڵمانبوونی خێزانەکەی نزیکەی مانگێك بوو (کەواتە ئەو ماوە زۆر نییە بۆیە لێك جیا نەکرانەوە).

**١٥٦٧-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: وَلَمْ يَبْلُغْنَا أَنَّ امْرَأَةً هَاجَرَتْ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَزَوْجُهَا كَافِرٌ مُقِيمٌ بِدَارِ الْكُفْرِ، إِلاَّ فَرَّقَتْ هِجْرَتُهَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ زَوْجِهَا، إِلاَّ أَنْ يَقْدَمَ زَوْجُهَا مُهَاجِرًا قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا[(٢)].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: پێمان نەگەیشتووە ئافرەتێك کۆچی کردبێت بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە کاتێکدا مێردەکەی کافر بووبێت و لە مەملەکەتی کافران مابێتەوە، حەتمەن کۆچەکەی بۆتە هۆی تەڵاق و لێکجیابوونەوەیان، تەنها لەو کاتە نەبێت مێردەکەشی کۆچی کردبێت بەر لەوەی ئافرەتەکە عیدەکەی تەواو ببێت (کەواتە تا کۆتاییهاتنی ماوەی عیدە لێك جیا ناکرێنەوە).

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٠؛ والحدثاني: ٣٣٧أ في النكاح، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٠؛ والحدثاني: ٣٣٧أ في النكاح، عن مالك به.

**١٥٦٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ أُمَّ حَكِيمٍ بِنْتَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، وَكَانَتْ تَحْتَ عِكْرِمَةَ بْنِ أَبِي جَهْلٍ، فَأَسْلَمَتْ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَهَرَبَ زَوْجُهَا عِكْرِمَةُ بْنُ أَبِي جَهْلٍ مِنَ الإِسْلَامِ، حَتَّى قَدِمَ الْيَمَنَ، فَارْتَحَلَتْ أُمُّ حَكِيمٍ، حَتَّى قَدِمَتْ عَلَيْهِ بِالْيَمَنِ، فَدَعَتْهُ إِلَى الإِسْلَامِ، فَأَسْلَمَ، وَقَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَثَبَ إِلَيْهِ فَرِحًا، وَمَا عَلَيْهِ رِدَاءٌ حَتَّى بَايَعَهُ، فَثَبَتَا عَلَى نِكَاحِهِمَا ذَلِكَ[1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئوم حەکیمی کچی حاریسی کوڕی هیشام کە لەژێر نیکاحی عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلدا بوو (خێزانی ئەو بوو)، لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە مسوڵمان بوو و مێردەکەشی کە عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل بوو لە ئیسلام و مسوڵمانان ڕایکرد، تا چوو بۆ یەمەن، جا ئوم حەکیمیش ڕۆیشت و چوو بۆ لای ئەو لە یەمەن و بانگی کرد بۆ ئیسلام، جا بوو بە مسوڵمان و لە هەمان ساڵی ئازادکردنی مەککە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ عیکریمەی بینی لە خۆشییان خۆی تێ کرد و کەوا و جوبەی لەسەر شان نەبوو (لە خۆشی و پەلەپەلییان جوبەکەی نەپۆشی) تا بەیعەتی لێ وەرگرت، جا عیکریمە و خێزانی لەسەر هەمان هاوسەرگیری کۆن مانەوە (واتە لێك جیا نەکرانەوە بەبەهانەی ئەوەی یەکێکیان پێشتر بۆتە مسوڵمان و ئەوەی دیکەیان بەکافری ماوەتەوە، چونکە ماوەکەی کەم بوو).

**١٥٦٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا أَسْلَمَ الرَّجُلُ قَبْلَ امْرَأَتِهِ، وَقَعَتِ الْفُرْقَةُ بَيْنَهُمَا، إِذَا عُرِضَ عَلَيْهَا الإِسْلَامُ، فَلَمْ تُسْلِمْ، لأَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ ۝١٠﴾ الممتحنة [2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو بەر لە ئافرەتەکەی بوو بە مسوڵمان، ئەوە جیابوونەوە لە نێوانیان ڕوو دەدات، ئەگەر ئافرەتەکە ئیسلامی بۆ پێشنیار کرا و مسوڵمان نەبوو، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٤٩؛ والحدثاني: ٣٣٧ في النكاح؛ والشيباني: ٦٠٢ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥١؛ والحدثاني: ٣٣٧ب في النكاح، عن مالك به.



دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ ۝١٠﴾ ، واتە: [ئافرەتە کافرەکان لای خۆتان ڕامەگرن].

## ٢١- ئەوەی دەربارەی چێشت و داوەتی هاوسەرگیری هاتووە[1]

**١٥٧٠**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﷺ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَمْ سُقْتَ إِلَيْهَا؟ فَقَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ[2].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا شوێنەواری گوڵاوی پێوە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەواڵی پێ دا بەوەی هاوسەرگیری کردووە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: چەندت کردووە بە مارەیی بۆی؟ ئەویش گوتی: بە کێشی ناوکی خورما زێڕ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی: چێشتی هاوسەرگیری بکە ئەگەر بە بزنێکیش بێت.

**١٥٧١**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُولِمُ بِالْوَلِيمَةِ، مَا فِيهَا خُبْزٌ وَلاَ لَحْمٌ[3].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی هاوسەرگیری ئەنجام داوە، نە نان و نە گۆشتی تیا نەبووە (بەڵکوو بە خورما و سوەیق کردوویەتی).

**١٥٧٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى وَلِيمَةٍ، فَلْيَأْتِهَا[4].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْوَلِيمَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٩؛ والحدثاني: ٣٣٥ في النكاح؛ والشيباني: ٥٢٥ في النكاح؛ والشافعي: ١٢٢٠؛ والبخاري: ٥١٥٣؛ والنسائي: ٣٣٥١؛ وابن حبان: ٤٠٦٠؛ والقابسي: ١٥٠، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩١، عن مالك به.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٨؛ والحدثاني: ٣٣٥ب في النكاح؛ والشيباني: ٨٨٦ في العتاق؛

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بانگهێشت کرا بۆ خواردنی چێشتی هاوسەرگیری، ئەوە با بچێت.

**١٥٧٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعَى لَهَا الأَغْنِيَاءُ، وَيُتْرَكُ الْمَسَاكِينُ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِ الدَّعْوَةَ، فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ[(١)].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە دەیگوت: خراپترین و بەدترین خواردن خواردن و چێشتی هاوسەرگیرییە کە دەوڵەمەندەکانی بۆ بانگ بکرێن و هەژارەکان وازیان لێ بهێنرێن، وە هەر کەسێك نەچێتە بانگهێشتەکە ئەوە سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ کردووە.

**١٥٧٤**- عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ، قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ، فَقَرَّبَ إِلَيْهِ خُبْزًا مِنْ شَعِيرٍ، وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ، قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوْلِ الْقَصْعَةِ، فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ[(٢)].

واتە: لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ بووە دەیگوت: بەرگدوورێك پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ داوەتێك بانگ کرد کە ئامادەی کردبوو، ئەنەس ﷺ دەڵێ: جا منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووم بۆ ئەو خواردنە، جا نانێکی جۆ و مەرەگەیەك (ترشێك) ی (مەرەگە بە واتای شلە دێت یان ترش؟!) بۆ نزیك خستەوە و هێنایە بەردەمی کە کولەکەی تیا بوو، ئەنەس ﷺ دەڵێت: جا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەدەورەی

---

وابن حنبل: ٤٧١٢؛ والبخاري: ٥١٧٣؛ ومسلم: النكاح: ٩٦؛ وأبو داود: ٣٧٣٦؛ وابن حبان: ٥٢٩٤؛ والقابسي: ٢٣١، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٢؛ والحدثاني: ٣٣٥أ في النكاح؛ والشيباني: ٨٨٧ في العتاق؛ والبخاري: ٥١٧٧؛ ومسلم: النكاح: ١٠٧؛ وأبو داود: ٣٧٤٢؛ والقابسي، ٨٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٠؛ والشيباني: ٨٨٨ في العتاق؛ والبخاري: ٢٠٩٢، وفي: ٥٣٧٩، وفي: ٥٤٣٦، وفي: ٥٤٣٩؛ ومسلم: الأشربة: ١٤٤؛ وأبو داود: ٣٧٨٢؛ وابن حبان: ٤٥٣٩، كلهم عن مالك به.

قاپەکە بەدوای کودیەکەدا دەگەڕا، جا (لەبەر خۆشەویستی و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ) بەردەوام حەزم چۆتە کودی دوای ئەو ڕۆژە.

## ٢٢- بابەتی جۆراوجۆری پەیوەست بە هاوسەرگیری(١)

**١٥٧٥**- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ أَوِ اشْتَرَى الْجَارِيَةَ، فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا، وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ، وَإِذَا اشْتَرَى الْبَعِيرَ، فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ(٢).

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ، گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە ئێوە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کرد یان جارییەیەکی کڕی، با ناوچەوانی بگرێت (دەست لەسەر ناوچەوانی دابنێت) و دوعای بەرەکەتداری بکات، وە کاتێ وشترێکی کڕی، با چڵەپۆپەی کۆپارەکەی (پشتی) بگرێت و پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان.

**١٥٧٦**-عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ الْمَكِّيِّ ، أَنَّ رَجُلاً خَطَبَ إِلَى رَجُلٍ أُخْتَهُ، فَذَكَرَ أَنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَحْدَثَتْ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ، فَضَرَبَهُ أَوْ كَادَ يَضْرِبُهُ، ثُمَّ قَالَ: مَا لَكَ وَلِلْخَبَرِ(٣).

واتە: لە ئەبو زوبەیری مەکییەوە گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك خوازبێنی خوشکی پیاوێکی کرد، پیاوەکەش بۆ خوازبێنیکەرەکەی باس کرد کە ئەوە زینای کردووە (واتە گوتی: خوشکم زینای کردووە)، جا ئەو هەواڵە گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ، جا عومەر لە پیاوەکەی دا (واتە لە برای ئافرەتەکەی دا) ـ یان خەریك بوو لێی بدات ـ دواتر گوتی: چ کارت بەو هەواڵدانەیە (واتە بۆ حەیای دەبەی لەجیاتی ئەوەی بۆی داپۆشی کە تووشی ئەو هەڵەیە بووە!).

---

(١) ـ جَامِعُ النِّكَاحِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٢؛ وفي: ٢٤٩٠؛ وفي: ٢٦٠١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢١ في البيوع؛ وفي: ٢٤٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٣٣٨ في النكاح، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٣، عن مالك به.

١٥٧٧- أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَعُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ فِي الرَّجُلِ يَكُونُ عِنْدَهُ أَرْبَعُ نِسْوَةٍ، فَيُطَلِّقُ إِحْدَاهُنَّ الْبَتَّةَ، أَنَّهُ يَتَزَوَّجُ إِنْ شَاءَ، وَلاَ يَنْتَظِرُ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا[١].

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی چوار خێزانی هەن و یەکێکیان بەیەکجاری تەڵاق دەدات، دەیانگوت: ئەگەر بیەوێت دەتوانێ هاوسەرگیرییەکی دیکە ئەنجام بدات، وە چاوەڕێی تەواوبوونی عیدەی ئافرەتە تەڵاقدراوەکە ناکات (واتە: بۆی دروستە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی دیکە بکات و بیانکاتەوە بە چوار دانە، وە چاوەڕوانیش نەکات تا ئافرەتە تەڵاقدراوەکە حەڵاڵ دەبێت بۆ خەڵکی دیکە، بەڵکوو ئەوەندە بەسە کە چوار دانەی لەلا نەمابن).

١٥٧٨- أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَعُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَفْتَيَا الْوَلِيدَ بْنَ عَبْدِ الْمَلِكِ عَامَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ بِذَلِكَ غَيْرَ أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، قَالَ: طَلَّقَهَا فِي مَجَالِسَ شَتَّى[٢].

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد و عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ بەو حوکمەی پێشتر باس کرا ـ فەتوایان بۆ وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك دا لەو ساڵەی هات بۆ مەدینە، تەنها ئەوەندە نەبێت قاسمی کوڕی موحەممەد گوتی: دەبێ تەڵاقی بدەیت لە چەندین دانیشتنی جیاواز (واتە تا بەڕوونی خەڵك بزانێ خێزانی چوارەمی تەڵاق داوە و بڕاوەتەوە، تا قسەی خراپی لەسەر نەکەن کاتێ خێزانێکی دیکە دەخوازێت).

١٥٧٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: ثَلاَثٌ لَيْسَ فِيهِنَّ لَعِبٌ: النِّكَاحُ، وَالطَّلاَقُ، وَالْعِتْقُ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: سێ شت هەن گاڵتەیان تیا نییە: هاوسەرگیری و تەڵاق و ئازادکردن.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٤؛ والحدثاني: ٣٣٩ في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٦٧٤٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٥؛ والحدثاني: ٣٣٩أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٦؛ والحدثاني: ٣٣٩ب في الطلاق، عن مالك به.




**١٥٨٠-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ بِنْتَ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ الأَنْصَارِيِّ، فَكَانَتْ عِنْدَهُ حَتَّى كَبِرَتْ، فَتَزَوَّجَ عَلَيْهَا فَتَاةً شَابَّةً، فَآثَرَ الشَّابَّةَ عَلَيْهَا، فَنَاشَدَتْهُ الطَّلَاقَ، فَطَلَّقَهَا وَاحِدَةً، ثُمَّ أَمْهَلَهَا، حَتَّى إِذَا كَادَتْ تَحِلُّ رَاجَعَهَا، ثُمَّ عَادَ، فَآثَرَ الشَّابَّةَ عَلَيْهَا، فَنَاشَدَتْهُ الطَّلَاقَ، فَطَلَّقَهَا وَاحِدَةً، ثُمَّ رَاجَعَهَا، ثُمَّ عَادَ، فَآثَرَ الشَّابَّةَ عَلَيْهَا، فَنَاشَدَتْهُ الطَّلَاقَ، فَقَالَ: مَا شِئْتِ إِنَّمَا بَقِيَتْ وَاحِدَةٌ، فَإِنْ شِئْتِ اسْتَقْرَرْتِ عَلَى مَا تَرَيْنَ مِنَ الأَثَرَةِ، وَإِنْ شِئْتِ فَارَقْتُكِ؟ قَالَتْ: بَلْ أَسْتَقِرُّ عَلَى الأَثَرَةِ، فَأَمْسَكَهَا عَلَى ذَلِكَ، وَلَمْ يَرَ رَافِعٌ عَلَيْهِ إِثْمًا حِينَ قَرَّتْ عِنْدَهُ عَلَى الأَثَرَةِ[1].

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ گێڕدراوەتەوە: هاوسەرگیری لەگەڵ کچی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری کرد، جا هەر لەلای بوو تا بەتەمەن بوو، دواتر ئافرەتێکی گەنجی بەسەر هێنا، جا ئافرەتە گەنجەکەی بەسەر ئەودا هەڵبژارد (خۆشەویستی زیاتری پێ دا)، خێزانە گەورەکەشی داوای تەڵاقی لێ کرد و ئەویش تەڵاقێکی دا، دواتر وازی لێ هێنا تا خەریك بوو عیدەکەی تەواو بێت، گەڕاندیەوە، جا دووبارە ئافرەتە گەنجەکەی بەسەر ئەودا هەڵدەبژارد، جا خێزانە گەورەکەشی داوای تەڵاقی لێ کرد و ئەویش تەڵاقێکی دا، دواتر گەڕاندیەوە، جا دیسان ئافرەتە گەنجەکەی بەسەر ئەودا هەڵدەبژارد، جا خێزانە گەورەکەی داوای تەڵاقی لێ کرد، جا ڕافیع گوتی: چۆنت دەوێ با ئاوا بێ، تەنها یەك تەڵاقت ماوە، ئەگەر دەتەوێت بمێنیتەوە لەسەر ئەو هەڵبژاردنەی کە من ئەنجامی دەدەم بۆ خێزانە گەنجەکەم کە خۆت دەیبینی (ئەوە باشە)، ئەگەریش حەز دەکەی تەڵاقت دەدەم (کامیانت دەوێ)؟ ئەویش گوتی: بەڵکوو دەمێنمەوە لەسەر ئەو هەڵبژاردنەی تۆ ئەنجامی دەدەیت بۆ خێزانە بچووکەکەت، جا لەسەر ئەو مەرجە لای خۆی هێشتیەوە، جا ڕافیع پێی وابوو هیچ تاوانی لەسەر نییە کاتێ خێزانە گەورەکەی لای ماوەتەوە لەسەر هەڵبژاردن و فەزڵدانی ئافرەتە گەنجەکە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٧؛ والشيباني: ٥٨٦ في الطلاق، عن مالك به.

## ١- ئەوەی دەربارەی تەڵاقی یەكجارەكی هاتووە[1]

**١٥٨١**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنِّي طَلَّقْتُ امْرَأَتِي مِئَةَ تَطْلِيقَةٍ، فَمَاذَا تَرَى عَلَيَّ؟ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: طَلُقَتْ مِنْكَ لِثَلاَثٍ، وَسَبْعٌ وَتِسْعُونَ اتَّخَذْتَ بِهَا آيَاتِ اللهِ هُزُوًا[2].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە پیاوێك بە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسی ﷺ گوتووە: من خێزانی خۆم بە سەت تەڵاق تەڵاق داوە، جا پێت وایە چیم لەسەرە؟ ئیبنو عەبباسیش ﷺ پێی گوت: ئافرەتەكە بە سێ تەڵاق لێت جیا بۆتەوە، بە نەوەت و حەفت تەڵاقیش یاری و گاڵتەت بە ئایەتەكانی خوا كردووە.

**١٥٨٢**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي طَلَّقْتُ امْرَأَتِي ثَمَانِيَ تَطْلِيقَاتٍ، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: فَمَاذَا قِيلَ لَكَ؟ قَالَ: قِيلَ لِي: إِنَّهَا قَدْ بَانَتْ مِنِّي، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: صَدَقُوا، مَنْ طَلَّقَ كَمَا أَمَرَهُ اللهُ، فَقَدْ بَيَّنَ اللهُ لَهُ، وَمَنْ لَبَسَ عَلَى نَفْسِهِ لَبْسًا، جَعَلْنَا لَبْسَهُ بِهِ، لاَ تَلْبِسُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَنَتَحَمَّلُهُ عَنْكُمْ، هُوَ كَمَا يَقُولُونَ[3].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی پیاوێك هاتووە بۆ لای عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ و گوتوویەتی: من خێزانی خۆم تەڵاق داوە بە هەشت تەڵاق، ئیبنو مەسعودیش ﷺ گوتی: چیان پێ گوتووی؟ كابراش گوتی: پێیان گوتووم: ئافرەتەكەت بەتەواوی لێت جیا بۆتەوە، ئیبنو مەسعودیش ﷺ گوتی: ڕاستیان گوتووە، هەر كەسێك تەڵاقدان ئەنجام بدات وەك ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ فەرمانی كردووە (بەوەی بۆی هەیە دوو جار، یەك یەك تەڵاق بخوات، جاری سێیەمیش یان بەڕێكی لەلای یەكدی بمێننەوە یان بەیەكجاری لێك جیا دەبنەوە، جا هەر كەسێك لەسەر ئەو شێوازە بڕوات) ئەوە خوای

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْبَتَّةِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧١، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٠، عن مالك به.

پەروەردگار ﷻ بۆی ڕوون کردۆتەوە، هەر کەسێکیش سەر لە خۆی بشێوێنێ، ئەوە سەرلێشێوانەکەی دەخەینەوە سەر خۆی، کەواتە نەکەن سەر لە خۆتان بشێوێنن و (بتانەوێ) بیخەنە سەر ئێمە (شتی واتان بۆ ناکەین)، (حوکمەکەت) بەو شێوەیەیە کە دەیڵێن (واتە بەیەکجاری تەڵاقت کەوتووە).

**١٥٨٣**- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ ﵀، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀ قَالَ لَهُ: الْبَتَّةُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهَا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقُلْتُ لَهُ: كَانَ أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ ﵀ يَجْعَلُهَا وَاحِدَةً، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﵀: لَوْ كَانَ الطَّلَاقُ أَلْفًا مَا أَبْقَتِ الْبَتَّةُ مِنْهُ شَيْئًا، مَنْ قَالَ: الْبَتَّةَ، فَقَدْ رَمَى الْغَايَةَ الْقُصْوَى[١].

واتە: لە ئەبو بەکری کوڕی حەزمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ پێی گوتووە: دەربارەی تەڵاقی بەتتە زانایان چی دەڵێن (بەوەی پیاوێك بە ئافرەتەکەی بڵێت: تۆ بەیەکجاری لێم حەڕام بی و تەڵاقی یەکجاریت بکەوێت)؟ ئەبو بەکریش ﵀ دەڵێ: منیش پێم گوت: ئەبانی کوڕی عوسمان دەیکرد بەیەکجاری (واتە بەیەك جار دەیخست و بەیەکجاری لێکی جیا دەکردنەوە)، جا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﵀ گوتی: ئەگەر تەڵاق (نەك سێ دانە، بەڵکوو) هەزار دانەشی هەبێت وشەی «بەتتە- واتە وشەی: بەیەکجاری» هیچی ناهێڵێتەوە، هەر کەسێك بەتتە ـ یەکجاری ـ بڵێت، ئەوە ئەوپەڕی تەڵاقی فڕێداوە (هیچی لەدەست نەماوەتەوە).

**١٥٨٤**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ كَانَ يَقْضِي فِي الَّذِي يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، أَنَّهَا ثَلَاثُ تَطْلِيقَاتٍ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): مەڕوانی کوڕی حەکەم دەربارەی ئەو کەسەی ئافرەتەکەی بە وشەی «بەتتە ـ یەکجاری ـ»

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٨؛ والحدثاني: ٣٤٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٩؛ والحدثاني: ٣٤٣أ في الطلاق، عن مالك به.




تەڵاق دەدات، ئەوە سێ تەڵاق حیسابە (کەواتە بەیەکجاری تەڵاقی دەکەوێت و گەڕانەوەی تێدا نییە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە کە بیستوومە لەو بارەیەوە.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی وشەی: بەتەنهامانەوە و بەریبوون و هاوشێوەکانی[١]

١٥٨٥- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّهُ كُتِبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ مِنَ الْعِرَاقِ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِامْرَأَتِهِ: حَبْلُكِ عَلَى غَارِبِكِ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى عَامِلِهِ: أَنْ مُرْهُ يُوَافِينِي بِمَكَّةَ فِي الْمَوْسِمِ، فَبَيْنَمَا عُمَرُ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، إِذْ لَقِيَهُ الرَّجُلُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: مَنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: أَنَا الَّذِي أَمَرْتَ أَنْ أُجْلَبَ عَلَيْكَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّ هَذِهِ الْبَنِيَّةِ، مَا أَرَدْتَ بِقَوْلِكَ: حَبْلُكِ عَلَى غَارِبِكِ؟ فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: لَوِ اسْتَحْلَفْتَنِي فِي غَيْرِ هَذَا الْمَكَانِ، مَا صَدَقْتُكَ؟ أَرَدْتُ بِذَلِكَ الْفِرَاقَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: هُوَ مَا أَرَدْتَ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی نووسراو لە عێراقەوە نووسراوە بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بەوەی پیاوێك بە خێزانەکەی گوتووە: پەتی خۆت لە ئەستۆی خۆت (واتە خۆت خاوەنی خۆتی و من بەشم پێتەوە نەماوە)، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بۆ فەرمانبەرەکەی خۆی نووسی: فەرمان بە پیاوەکە بکە لە مەوسیمی حەج بێت بۆ لام لە مەککە، جا عومەر ﷺ لە کاتێکدا تەوافی بەدەوری بەیتدا دەکرد، لەناکاو پیاوەکە پێی گەیشت و سەلامی لێ کرد، ئیمامی عومەریش ﷺ گوتی: تۆ کێی؟ ئەویش گوتی: من ئەو کەسەم کە فەرمانت کردبوو بهێنرێم بۆ لات، ئیمامی عومەریش ﷺ پێی گوت: بە ناوی پەروەردگاری ئەو بینایە (کە کەعبەیە) پرسیارت لێ دەکەم مەبەستت چی بوو بە قسەکەت (کە بە خێزانەکەت گوتبوو): پەتی خۆت لە ئەستۆی خۆت؟ پیاوەکەش

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْخَلِيَّةِ وَالْبَرِيَّةِ وَأَشْبَاهِ ذَلِكَ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٢، عن مالك به.

گوتی: ئەگەر سوێندت بدابام لە شوێنێکی جگە لێرە ڕاست نەدەبووم لەگەڵت؟! مەبەستم جیابوونەوە و تەڵاق بوو، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: ئەوەیە کە ویستووتە (واتە نییەتت چۆن بووبێت ـ لە وشەکانی کینایەت ـ ئەو حوکمە جێبەجێ دەبێت، کەواتە مادەم نییەتت تەڵاق بووبێت تەڵاقت کەوتووە).

**١٥٨٦**- أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لِامْرَأَتِهِ: أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ: إِنَّهَا ثَلَاثُ تَطْلِيقَاتٍ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ.

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی بە خێزانەکەی دەڵێت: تۆ لەسەرم حەڕام بیت، گوتوویەتی: ئەوە سێ تەڵاقە (واتە بەیەکجاری تەڵاقی دەکەوێت و گەڕانەوەی تیا نییە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە.

**١٥٨٧**- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي الْخَلِيَّةِ وَالْبَرِيَّةِ: إِنَّهَا ثَلَاثُ تَطْلِيقَاتٍ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەربارەی وشەی: بەتەنها بمێنیتەوە و بەری بیت (کاتێ پیاو بە خێزانی دەڵێت) دەیگوت: هەر یەك لەو دوو وشانە سێ تەڵاقن (بەیەکجاری لێك جیا دەبنەوە).

**١٥٨٨**- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً كَانَتْ تَحْتَهُ وَلِيدَةٌ لِقَوْمٍ، فَقَالَ لِأَهْلِهَا: شَأْنَكُمْ بِهَا، فَرَأَى النَّاسُ أَنَّهَا تَطْلِيقَةٌ وَاحِدَةٌ[3].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٣، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٤؛ والحدثاني: ٣٤٤ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٩ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٧؛ وفي: ١٦٩٨ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٧أ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٠٠ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

واتە: لە قاسمی كوڕی موحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەگەر پیاوێك ئافرەتێكی كۆیلەی خاوەن خانەوادەی لەژێر نیكاحدا بێت (خێزانی بێت) و بە خانەوادەكەی بڵێت: بۆخۆتان، ئەوە زانایان پێیان وایە ئەوە یەك تەڵاقە.

**١٥٨٩-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ يَقُولُ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ: بَرِئْتِ مِنِّي وَبَرِئْتُ مِنْكِ، إِنَّهَا ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ، بِمَنْزِلَةِ الْبَتَّةِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئیبنو شیهاب ﷺ بووە دەربارەی ئەو پیاوەی بە خێزانەكەی دەڵێت: تۆ لە من بەری بوویت و منیش لە تۆ بەری بووم، گوتوویەتی: ئەوە سێ تەڵاقە، وەك بەتتە وایە (واتە وەك ئەوە وایە بڵێت: بەیەكجاری لێم حەرام بیت).

**١٥٩٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ: أَنْتِ خَلِيَّةٌ، أَوْ بَرِيَّةٌ، أَوْ بَائِنَةٌ، إِنَّهَا ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ لِلْمَرْأَةِ الَّتِي قَدْ دَخَلَ بِهَا، وَيُدَيَّنُ فِي الَّتِي لَمْ يَدْخُلْ بِهَا أَوَاحِدَةً أَرَادَ أَمْ ثَلاَثًا، فَإِنْ قَالَ: وَاحِدَةً، أُحْلِفَ عَلَى ذَلِكَ، وَكَانَ خَاطِبًا مِنَ الْخُطَّابِ، لأَنَّهُ لاَ يُخْلِي الْمَرْأَةَ الَّتِي قَدْ دَخَلَ بِهَا زَوْجُهَا، وَلاَ يُبِينُهَا، وَلاَ يُبْرِيهَا، إِلاَّ ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ، وَالَّتِي لَمْ يَدْخُلْ بِهَا تُخْلِيهَا، وَتُبْرِيهَا، وَتُبِينُهَا الْوَاحِدَةُ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی بە خێزانەكەی دەڵێت: تۆ سەربەخۆ و بەتەنهایت یان بەریت یان بەیەكجاری پچڕاوی، گوتوویەتی: بۆ ئەو ئافرەتەی مێردەكەی جیماعی لەگەڵ كردووە سێ تەڵاقە، وە دەربارەی ئەو ئافرەتەی جیماعی لەگەڵ نەكراوە تەنها مارە كراوە دەدرێتە دەست دینداریی پیاوەكە (واتە دەدرێتە دەست نییەتەكەی) كە ئاخۆ مەبەستی یەك تەڵاق یان سێ تەڵاق بووە، جا ئەگەر گوتی: مەبەستم یەك بووە، سوێند دەدرێت لەسەر ئەوە، جا دەبێتە داخوازیكارێك لە داخوازیكەران (واتە تەڵاقی یەكجاری دەكەوێت)، چونكە تەنها

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٥؛ والحدثاني: ٣٤٤أ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٦، عن مالك به.

خواردنی سێ تەڵاق ئافرەتی جیاعلەگەڵکراو بەتەنها دەهێڵێتەوە و تەڵاقی یەکجاری دەکەوێنێت و بەری دەکات (لە مێردەکەی)، وە ئەو ئافرەتەی جیاعی لەگەڵ نەکراوە یەك تەڵاق دەیکات بەتەنها و بەری و تەڵاقکەوتووی یەکجاری.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو بابەتە.

## ٣- ئەو تەڵاقەی دەبێتە تەڵاقی یەکجارەکی لە بابەتی تەڵاقکردنە موڵکدا[١]

**١٥٩١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي جَعَلْتُ أَمْرَ امْرَأَتِي فِي يَدِهَا، فَطَلَّقَتْ نَفْسَهَا، فَمَاذَا تَرَى؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: أُرَاهُ كَمَا قَالَتْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لاَ تَفْعَلْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ: أَنَا أَفْعَلُ؟ أَنْتَ فَعَلْتَهُ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پیاوێك هاتووە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ و گوتوویەتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان من تەڵاقی خێزانەکەمم داوەتە دەست خۆی، جا ئەو ئێستا خۆی تەڵاق داوە، جا چی دەڵێی؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: چی گوتووە بۆچوونم هەر ئەوەیە، پیاوەکەش گوتی: (ئەی هاوار) نەکەی ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان! ئیبنو عومەریش ﷺ گوتی: من وا دەکەم؟! خۆت وات کردووە (خۆت داوتەتە دەست خێزانەکەت و تەڵاقت کەوتووە).

**١٥٩٢-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا مَلَّكَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ أَمْرَهَا، فَالْقَضَاءُ مَا قَضَتْ بِهِ، إِلاَّ أَنْ يُنْكِرَ عَلَيْهَا فَيَقُولُ: لَمْ أُرِدْ إِلاَّ وَاحِدَةً، فَيَحْلِفُ عَلَى ذَلِكَ، وَيَكُونُ أَمْلَكَ بِهَا، مَا كَانَتْ فِي عِدَّتِهَا[٣].

---

(١) ـ مَا يَبِيْن مِنَ التَّمْلِيكِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٨، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٥٩؛ والحدثاني: ٣٤٠ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٠ في

واته: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: ئەگەر پیاو خێزانەکەی خۆی کردە خاوەنی تەڵاقی خۆی، ئەوە بڕیارەکە بڕیتییە لەو بڕیارەی ژنەکە دەیدات (واتە ئەگەر خۆی تەڵاق دا تەڵاقی دەکەوێت)، تەنها لەو کاتە نەبێ کە پیاوەکە ئینکاری لە خێزانەکەی بکا و بڵێت: مەبەستم تەنها یەك تەڵاق بوو (واتە تەنها یەك تەڵاقم تەسلیم کردبووی) وە سوێند لەسەر ئەوە بخوات، جا پیاوەکە لە خەڵکی دیکە لەپێشترە مادەم ئافرەتەکە لە عیدەدا بێت (دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە).

## ٤- ئەوەی یەك تەڵاق دەخات لە تەڵاقکردنە موڵکدا[١]

**١٥٩٣-** عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَأَتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَتِيقٍ، وَعَيْنَاهُ تَدْمَعَانِ، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: مَلَّكْتُ امْرَأَتِي أَمْرَهَا، فَفَارَقَتْنِي، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: الْقَدَرُ، فَقَالَ زَيْدٌ: ارْتَجِعْهَا إِنْ شِئْتَ، فَإِنَّمَا هِيَ وَاحِدَةٌ، وَأَنْتَ أَمْلَكُ بِهَا[٢].

واته: لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی لەلای زەیدی کوڕی سابیت دانیشتووە و موحەممەدی کوڕی ئەبو عەتیق هاتووە بۆ لای لە کاتێکدا چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت، زەیدیش پێی گوت: چیتە؟ ئەویش گوتی: تەڵاقی خێزانەکەمم داوەتە دەستی خێزانەکەم و لێم جیا بۆتەوە، ئینجا زەید پێی گوت: چی وای لێ کردی ئەوە بکەی؟ گوتی: قەدەر، جا زەید گوتی: خێزانەکەت بگەڕێنەوە بۆ خۆت ئەگەر دەتەوێت، چونکە ئەوە تەنها یەك تەڵاقە و تۆ لەپێشتری بەو (چونکە مەبەستی نەبووە گشت تەڵاقەکانی بداتە دەست).

---

الطلاق، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مَا يَجِبُ فِيهِ تَطْلِيقَةٌ وَاحِدَةٌ مِنَ التَّمْلِيكِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦١؛ والحدثاني: ٣٤٠أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٦٧ في الطلاق؛ والشافعي: ١١٤١، كلهم عن مالك به.




**١٥٩٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ ثَقِيفٍ، مَلَّكَ امْرَأَتَهُ أَمْرَهَا، فَقَالَتْ: أَنْتَ الطَّلَاقُ، فَسَكَتَ، ثُمَّ قَالَتْ: أَنْتَ الطَّلَاقُ، فَقَالَ: بِفِيكِ الْحَجَرُ، ثُمَّ قَالَتْ: أَنْتَ الطَّلَاقُ، فَقَالَ: بِفِيكِ الْحَجَرُ، فَاخْتَصَمَا إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَاسْتَحْلَفَهُ مَا مَلَّكَهَا إِلاَّ وَاحِدَةً، وَرَدَّهَا إِلَيْهِ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَكَانَ الْقَاسِمُ يُعْجِبُهُ هَذَا الْقَضَاءُ، وَيَرَاهُ أَحْسَنَ مَا سَمِعَ فِي ذَلِكَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ، وَأَحَبُّهُ إِلَيَّ.

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك لە سەقیف تەڵاقی خێزانەکەی خستە دەستی خێزانەکەی، ئافرەتەکەش گوتی: تەڵاقت کەوتبێ، پیاوەکەش بێدەنگ بوو، دواتر ئافرەتەکە (تەڵاقی دووەمی خوارد) و گوتی: تەڵاقت کەوتبێ، پیاوەکەش گوتی: بەردت بە دەم (واتە دەمت بشکێ)، دواتر ئافرەتەکە (تەڵاقی سێیەمیشی خوارد) و گوتی: تەڵاقت کەوتبێ، پیاوەکەش گوتی: بەردت بە دەم، جا کێشەکەیان بردە لای مەڕوانی کوڕی حەکەم (کە ئاخۆ لێك جیا بوونەتەوە یان نا)، مەڕوانیش سوێندی دا لەسەر ئەوەی کە مەبەستی نەبووە گشت تەڵاقەکانی بداتە دەست و تەنها مەبەستی بووە یەك تەڵاقی بداتە دەست، جا ئافرەتەکەی گەڕاندەوە لای.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: عەبدورڕەحمان گوتوویەتی: قاسم ئەو بڕیاردانەی زۆر پێ چاك و پەسەند بوو، وە پێی وابوو چاکترینی ئەوەیە کە گوێی لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترین و خۆشەویسترینی ئەوەیە کە گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو بابەتە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٢؛ والحدثاني: ٣٤١ في الطلاق، عن مالك به.

## ٥- ئەوەی تەڵاق ناخات لە تەڵاقکردنە موڵکدا[1]

**١٥٩٥-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا خَطَبَتْ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، قُرَيْبَةَ بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، فَزَوَّجُوهُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ عَتَبُوا عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَقَالُوا: مَا زَوَّجْنَا إِلاَّ عَائِشَةَ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَجَعَلَ أَمْرَ قُرَيْبَةَ بِيَدِهَا، فَاخْتَارَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ طَلاَقًا[2].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ گێڕدراوەتەوە بەوەی داخوازی قوڕەیبەی کچی ئومەییەی بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر کرد (کە برایەتی)، ئەوانیش دایان پێی، دواتر لۆمەی عەبدوڕڕەحمانیان کرد و (ڕایان لێ نەبوو) و گوتیان: ئێمە داومانە بە عائیشە (واتە لەبەر خاتری تۆ ئەی عائیشە داومانە بە عەبدوڕڕەحمان)، جا عائیشە ناردی بەدوای عەبدوڕڕەحمان و ئەوەی بۆ باس کرد، عەبدوڕڕەحمانیش تەڵاقی قوڕەیبەی دایە دەستی قوڕەیبە، ئەویش مێردەکەی خۆی هەڵبژارد (بە تەڵاق ڕازی نەبوو)، جا ئەوە نەبوو بە تەڵاق (واتە تەنها بە تەسلیمکردنی تەڵاق، تەڵاق ناکەوێت).

**١٥٩٦-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ زَوَّجَتْ حَفْصَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، الْمُنْذِرَ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ غَائِبٌ بِالشَّامِ، فَلَمَّا قَدِمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، قَالَ: وَمِثْلِي يُصْنَعُ هَذَا بِهِ، وَمِثْلِي يُفْتَاتُ عَلَيْهِ؟ فَكَلَّمَتْ عَائِشَةُ ﵂ الْمُنْذِرَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﵁، فَقَالَ الْمُنْذِرُ: فَإِنَّ ذَلِكَ بِيَدِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ ﵁: مَا كُنْتُ لأَرُدَّ أَمْرًا قَضَيْتِهِ، فَقَرَّتْ حَفْصَةُ عِنْدَ الْمُنْذِرِ، وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ طَلاَقًا[3].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ حەفصەی کچی

---

(١) ـ مَا لَا يَبِيْنُ مِنَ التَّمْلِيكِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٣؛ والحدثاني: ٣٤٢ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٦٨ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٤؛ والحدثاني: ٣٤٢أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٦٩ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

عەبدوڕڕەحمانی دا بە مونزیری کوڕی زوبەیر، لە کاتێکدا عەبدوڕڕەحمان لەوێ نەبوو لە شام بوو، جا کاتێ عەبدوڕڕەحمان هاتەوە (توڕە بوو و) گوتی: کەسێکی وەکوو من ئاوای لەگەڵ دەکرێ، کەسێکی وەکوو من شتی بەسەردا دەسەپێندرێت؟! جا عائیشە ﷺ قسەی لەگەڵ مونزیری کوڕی زوبەیر ﷺ کرد، مونزیریش گوتی: ئەوە بەدەستی عەبدوڕڕەحمانە (ئەگەر عەبدوڕڕەحمان ڕەتی بکاتەوە هیچمان پێ ناکرێت)، عەبدوڕڕەحمانیش ﷺ گوتی: من کارێك ڕەت ناکەمەوە کە تۆ بڕیارت لەسەر دابێت (ئەی عائیشەی خوشکم)، جا حەفصە لەلای مونزیر مایەوە و (ئەو ناڕەزاییەی کە سەرەتا پەیدابوو) نەبوو بە تەڵاق.

**١٥٩٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ سُئِلاَ عَنِ الرَّجُلِ يُمَلِّكُ امْرَأَتَهُ أَمْرَهَا، فَتَرُدُّ بِذَلِكَ إِلَيْهِ، وَلاَ تَقْضِي فِيهِ شَيْئًا، فَقَالاَ: لَيْسَ ذَلِكَ بِطَلاَقٍ[1].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەبو هوڕەیرە ﷺ پرسیاریان لێکرا دەربارەی پیاوێك کە خێزانەکەی خۆی دەکات بە خاوەنی تەڵاقی خۆی، جا (دواتر) ئافرەتەکە تەڵاقەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ پیاوەکە و دەیداتەوە دەستی خۆی (ئاخۆ ئەوە دەبێتە تەڵاق؟)، هەردووکیان گوتیان: ئەوە تەڵاق نییە و تەڵاقی پێ ناکەوێت.

**١٥٩٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِذَا مَلَّكَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ أَمْرَهَا، فَلَمْ تُفَارِقْهُ، وَقَرَّتْ عِنْدَهُ، فَلَيْسَ ذَلِكَ بِطَلاَقٍ[2].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەگەر پیاو بابەتی تەڵاقی خێزانی دایە دەست خێزانی، خێزانەکەشی لێی جیا نەبۆیەوە و لەلای مایەوە، ئەوە نابێتە تەڵاق (واتە تەنها بە نەهێشتنی تەڵاق لەدەستی پیاوەکە تەڵاق ناکەوێت بەڵکوو دەبێ ژنەکە تەڵاقەکەی خۆی بخات ئینجا تەڵاق دەکەوێت).

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٥، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٦؛ والشيباني: ٥٧١ في الطلاق، عن مالك به.

١٥٩٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُمَلَّكَةِ إِذَا مَلَّكَهَا زَوْجُهَا أَمْرَهَا، ثُمَّ افْتَرَقَا، وَلَمْ تَقْبَلْ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَلَيْسَ بِيَدِهَا مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، وَهُوَ لَهَا، مَا دَامَا فِي مَجْلِسِهِمَا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی دەكرێتە خاوەنی تەڵاق كاتێ پیاوەكەی تەڵاقەكەی دەداتە دەستی ئەو (لە مەجلیسێكدا)، دواتر لێك جیا دەبنەوە لە كاتێكدا (لە هەمان مەجلیس) وەرگرتنی هیچێك لە تەڵاقەكانی قبووڵ نەكرد، ئەوە هیچ تەڵاقێك بە دەستی ئافرەتەكەوە نییە (چونكە ڕەتی كردۆتەوە لە هەمان مەجلیس وەریبگرێت)، جا كارەكە بە دەستی ئافرەتەكەیە تا ئافرەتەكە و مێردەكەی لە مەجلیسەكەدان (لەوێ دەتوانێت قبووڵی بكات و تەڵاقی خۆی بدات، یان ڕەتی بكاتەوە و تەڵاقەكان وەرنەگرێت، گشتی بە دەستی خۆیەتی تا لەو مەجلیسە مابن).

## ٦- ئیلاء (واتە سوێند خواردنی پیاو لە ژن بەوەی پیاوەكە سوێند بخوات جیماعی لەگەڵ نەكات)[2]

١٦٠٠- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا آلَى الرَّجُلُ مِنِ امْرَأَتِهِ، لَمْ يَقَعْ عَلَيْهِ طَلَاقٌ، وَإِنْ مَضَتِ الْأَرْبَعَةُ الْأَشْهُرِ حَتَّى يُوقَفَ، فَإِمَّا أَنْ يُطَلِّقَ، وَإِمَّا أَنْ يَفِيءَ[3].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الْأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر پیاو ئیلائی خێزانەكەی كرد (واتە سوێندی خوارد نەچێتە لای و جیماعی لەگەڵ نەكات)، ئەوە تەڵاقی ناكەوێت، جا ئەگەر چوار مانگەكە تێ پەڕی (لەبەردەمی دادوەر) ڕادەگیرێ و دەوەستێنرێت، جا یان دەبێ تەڵاقی بدات، یانیش دەبێ بچێتەوە لای و جیماعی لەگەڵ بكات و كەفارەتی ئیلائەكەی بدات.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٧؛ والحدثاني: ٣٤٢ب في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ الإِيلَاءُ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٨؛ والحدثاني: ٣٤٥ في الطلاق، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کارەکە لای ئێمە بەم شێوەیەیە.

١٦٠١- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: أَيُّمَا رَجُلٍ آلَى مِنِ امْرَأَتِهِ، فَإِنَّهُ إِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ، وُقِفَ حَتَّى يُطَلِّقَ أَوْ يَفِيءَ، وَلاَ يَقَعُ عَلَيْهِ طَلاَقٌ، إِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ حَتَّى يُوقَفَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە بەوەی دەیگوت: هەر پیاوێك ئیلاء لەگەڵ خێزانەکەی بکات، جا ئەگەر چوار مانگ تێ پەڕی (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێ تا تەڵاقی بدات یان پەیوەندی هاوسەرایەتی بەجێ بگەیەنێت (و کەفارەتی سوێندەکەی بدات)، جا هیچ تەڵاقێکی ناکەوێت (و بابەتی تەڵاق نایێتە ناو باس) تا چوار مانگ تێ پەڕ دەبێت و (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت.

١٦٠٢- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَأَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ فِي الرَّجُلِ يُولِي مِنِ امْرَأَتِهِ: إِنَّهَا إِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ، فَهِيَ تَطْلِيقَةٌ، وَلِزَوْجِهَا عَلَيْهَا الرَّجْعَةُ مَا كَانَتْ فِي الْعِدَّةِ[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعیدی کوڕی موسەیەب و ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی ئیلاء لەگەڵ خێزانەکەی دەکات گوتوویانە: ئەگەر چوار مانگ تێ پەڕی ئەوە ئیلائەکە دەبێت بە تەڵاقێك، وە مێردەکەی گەڕاندنەوەی خێزانەکەی بۆ هەیە مادەم ئافرەتەکە لەناو عیدەددا بێت.

١٦٠٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ كَانَ يَقْضِي فِي الرَّجُلِ إِذَا آلَى مِنِ امْرَأَتِهِ: أَنَّهَا إِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ، فَهِيَ تَطْلِيقَةٌ، وَلَهُ عَلَيْهَا الرَّجْعَةُ، مَا دَامَتْ فِي عِدَّتِهَا[3].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٧٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٤٥أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨٠ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٣٢؛ والبخاري: ٥٢٩١ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٠ في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٨٥٤٨ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨١ في الطلاق، عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَعَلَى ذَلِكَ كَانَ رَأْيُ ابْنِ شِهَابٍ ﵀.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێردراوەتەوە پێی گەیشتووە مەڕوانی کوڕی حەکەم بڕیاری دەردەکرد و دادوەری دەکرد دەربارەی پیاوێك کە ئیلائی لەگەڵ خێزانەکەی کردبێت (بەو شێوەیە بڕیاری دەدا): ئەگەر چوار مانگ تێ پەڕیبایە، ئەوە ئیلائەکە دەبێت بە یەك تەڵاقدان، وە مێردەکەی گەڕاندنەوەی خێزانەکەی بۆ هەیە مادەم ئافرەتەکە لەناو عیدەدا بێت.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بۆچوونی ئیبنو شیهابیش ﵀ هەر لەسەر ئەوە بوو.

**١٦٠٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الرَّجُلِ يُولِي مِنِ امْرَأَتِهِ، فَيُوقَفُ، فَيُطَلِّقُ عِنْدَ انْقِضَاءِ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ، ثُمَّ يُرَاجِعُ امْرَأَتَهُ: أَنَّهُ إِنْ لَمْ يُصِبْهَا حَتَّى تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا، فَلاَ سَبِيلَ لَهُ إِلَيْهَا، وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْهَا، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ عُذْرٌ مِنْ مَرَضٍ، أَوْ سِجْنٍ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْعُذْرِ، فَإِنَّ ارْتِجَاعَهُ إِيَّاهَا ثَابِتٌ عَلَيْهَا، فَإِنْ مَضَتْ عِدَّتُهَا، ثُمَّ تَزَوَّجَهَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ إِنْ لَمْ يُصِبْهَا حَتَّى تَنْقَضِيَ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ وُقِفَ أَيْضًا، فَإِنْ لَمْ يَفِئْ دَخَلَ عَلَيْهِ الطَّلاَقُ بِالإِيلاَءِ الأَوَّلِ، إِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ، لأَنَّهُ نَكَحَهَا ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَلاَ عِدَّةَ لَهُ عَلَيْهَا وَلاَ رَجْعَةَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو پیاوەی ئیلاء لەگەڵ خێزانەکەی دەکات و (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت، جا تەڵاقی دا بەتەواوبوونی چوار مانگەکە، دواتر خێزانەکەی گەڕاندەوە، گوتوویەتی: ئەگەر جیماعی لەگەڵ نەکات تاوەکوو عیدەکەی تەواو دەبێت، ئەوە هیچ دەسەڵاتی بەسەردا نییە و ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە، تەنها لەو کاتە نەبێت ئەگەر عوزرێکی هەبێت وەك نەخۆشی یان بەندکردن یان هەر عوزرێکی لەو جۆرە، (لەو حاڵەتانەدا) گەڕاندنەوەی خێزانەکەی بۆ هەیە، جا ئەگەر عیدەکەی تێ پەڕی و دوای ئەوە هاوسەرگیری لەگەڵ هەمان ئافرەت کردەوە (بە عەقدێکی نوێ)، جا جیماعی لەگەڵ نەکرد تاوەکوو چوار مانگەکە تێ پەڕ دەبێت، ئەوە دیسان (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت، جا ئەگەر ئیلائەکەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٣ في الطلاق، عن مالك به.

نەشکاند و جیماعی لەگەڵ نەکرد و نەچوو بۆ لای ئەوە تەڵاقی دەکەوێتە ناو بەهۆی ئیلائی یەکەمەوە (ئیلائی زەواجی یەکەم) ئەگەر چوار مانگ تێ پەڕی، جا ڕیجعە و گەڕاندنەوەشی بۆ نییە، چونکە هاوسەرگیری لەگەڵ کردووە دواتر تەڵاقی داوە بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، کەواتە نە عیدە و نە گەڕاندنەوەی بۆ نییە لەسەر ئافرەتەکە.

١٦٠٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُولِي مِنِ امْرَأَتِهِ، فَيُوقَفُ بَعْدَ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ، فَيُطَلِّقُ، ثُمَّ يَرْتَجِعُ وَلاَ يَمَسُّهَا، فَتَنْقَضِي أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا، إِنَّهُ لاَ يُوقَفُ، وَلاَ يَقَعُ عَلَيْهِ طَلاَقٌ، وَإِنَّهُ إِنْ أَصَابَهَا قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا، كَانَ أَحَقَّ بِهَا، وَإِنْ مَضَتْ عِدَّتُهَا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا، فَلاَ سَبِيلَ لَهُ إِلَيْهَا، وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی ئیلاء لەگەڵ خێزانەکەی دەکات و (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت دوای چوار مانگەکە و ئافرەتەکە تەڵاق دەدات، دواتر دەیگەڕێنێتەوە و جیماعی لەگەڵ ناکات و چوار مانگی دیکە تێ پەڕ دەبێت بەر لەوەی عیدەکەی تەواو بێت، گوتوویەتی: (لەبەردەم دادوەر) ڕاناگیرێت و تەڵاقی ناکەوێت، وە ئەگەر جیماعی لەگەڵ کرد بەر لەوەی عیدەکەی تەواو بێت، ئەوە خۆی لەپێشترە (لە پیاوی دیکە) بە ئافرەتەکە، وە ئەگەر عیدەکەی تەواو ببوو بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، ئەوە هیچ دەسەڵاتی بەسەردا نییە (مافی مێردایەتی بەسەرەوە نامێنێت)، جا ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم لەو بارەیەوە.

١٦٠٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُولِي مِنِ امْرَأَتِهِ، ثُمَّ يُطَلِّقُهَا، فَتَنْقَضِي الأَرْبَعَةُ الأَشْهُرِ قَبْلَ انْقِضَاءِ عِدَّةِ الطَّلاَقِ، قَالَ: هُمَا تَطْلِيقَتَانِ إِنْ هُوَ وُقِفَ، وَلَمْ يَفِئْ، وَإِنْ مَضَتْ عِدَّةُ الطَّلاَقِ قَبْلَ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ، فَلَيْسَ الإِيلاَءُ بِطَلاَقٍ، وَذَلِكَ أَنَّ الأَرْبَعَةَ الأَشْهُرِ الَّتِي كَانَ يُوقَفُ بَعْدَهَا، مَضَتْ وَلَيْسَتْ لَهُ يَوْمَئِذٍ بِامْرَأَةٍ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٤ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٥ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی ئیلاء لەگەڵ خێزانەکەی دەکات، دواتر تەڵاقی دەدات و چوار مانگەکە تەواو دەبێت بەر لەوەی عیدەی تەڵاق تەواو ببێت، گوتوویەتی: دوو تەڵاق حیسابن ئەگەر (لەبەردەم دادوەر) وەستێندرا و لە خێزانی نزیك نەکەوتەوە و جیماعی لەگەڵ نەکرد، وە ئەگەر عیدەی تەڵاق تێ پەڕی پێشی چوار مانگ، ئەوە ئیلائەکە تەڵاق نییە، جا ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەو چوار مانگەی کە لە دوای تێپەڕبوونی ڕادەگیرێ تێ پەڕیوە و لەو کاتەدا خێزانی نییە.

**١٦٠٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ حَلَفَ أَنْ لاَ يَطَأَ امْرَأَتَهُ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا، ثُمَّ مَكَثَ حَتَّى يَنْقَضِيَ أَكْثَرُ مِنَ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ، فَلاَ يَكُونُ ذَلِكَ إِيلاَءً، وَإِنَّمَا يُوقَفُ فِي الإِيلاَءِ مَنْ حَلَفَ عَلَى أَكْثَرَ مِنَ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ، فَأَمَّا مَنْ حَلَفَ أَنْ لاَ يَطَأَ امْرَأَتَهُ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ و أَوْ أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ، فَلاَ أَرَى عَلَيْهِ إِيلاَءً، لأَنَّهُ إِذَا جَاءَ الأَجَلُ الَّذِي يُوقَفُ عِنْدَهُ، خَرَجَ مِنْ يَمِينِهِ، وَلَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ وَقْفٌ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك سوێند بخوات بەوەی ڕۆژێك یان مانگێك جیماع لەگەڵ خێزانەکەی نەکات، دواتر هەر مایەوە (جیماعی نەکرد) تاوەکوو زیاتر لە چوار مانگ تێ پەڕی، ئەوە نابێتە ئیلاء ، بەڵکوو ئەو کەسە دەربارەی ئیلاء (لە بەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت کە سوێند بخوات لەسەر زیاتر لە چوار مانگ، بەڵام هەرچی ئەو کەسەیە کە سوێند دەخوات بەوەی چوار مانگان یان کەمتر لەو ماوەیە جیماع لەگەڵ خێزانی نەکات، پێم وا نییە ئیلائی لەسەر بێت، چونکە کاتێ ماوەکە دێت کە تیایدا (لەبەردەم دادوەر) ڕادەگیرێت ئەو لە سوێندەکەی دەردەچێت و تەواو دەبێت و وەستاندنی لەسەر نییە (کەواتە بابەتی ئیلاء نایگرێتەوە).

**١٦٠٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ حَلَفَ لاِمْرَأَتِهِ أَنْ لاَ يَطَأَهَا حَتَّى تَفْطِمَ وَلَدَهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَكُونُ إِيلاَءً، وَقَدْ بَلَغَنِي أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ سُئِلَ عَنْ ذَلِكَ، فَلَمْ يَرَهُ إِيلاَءً[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٦ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٧ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر پیاوێك سوێند لە خێزانەکەی بخوات بەوەی جیماع و سەرجێیی لەگەڵ نەکات تا منداڵەکەی لە شیر دەکاتەوە، ئەوە نابێتە ئیلاء ، وە پێم گەیشتووە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ ئەوەی پێ ئیلاء نەبووە.

## ٧- ئیلائی کۆیلەکان[١]

١٦٠٩- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنْ إِيلاَءِ الْعَبْدِ، فَقَالَ: هُوَ نَحْوُ إِيلاَءِ الْحُرِّ، وَهُوَ عَلَيْهِ وَاجِبٌ، وَإِيلاَءُ الْعَبْدِ شَهْرَانِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی ئیلائی پیاوی کۆیلە، گوتوویەتی: وەکوو ئیلائی کەسی ئازاد وایە، (ئەحکامی ئیلائی) لەسەر واجب دەبێ، ئیلائەکەشی بریتییە لە دوو مانگ (واتە وەك کەسی ئازاد چوار مانگ نییە)[٣].

٨- زیهاری کەسی ئازاد[٤]

١٦١٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَةً إِنْ هُوَ تَزَوَّجَهَا، فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ ﷺ: إِنَّ رَجُلاً جَعَلَ امْرَأَةً عَلَيْهِ كَظَهْرِ أُمِّهِ، إِنْ هُوَ تَزَوَّجَهَا، فَأَمَرَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ إِنْ هُوَ تَزَوَّجَهَا، أَنْ لاَ يَقْرَبَهَا حَتَّى يُكَفِّرَ كَفَّارَةَ الْمُتَظَاهِرِ[٥].

واتە: لە سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی سولەیمی زوڕەقییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لە قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ کردووە دەربارەی پیاوێك کە

---

(١) ـ إِيلاَءُ الْعَبِيدِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٤٩ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ تێبینی: بەڵام لەلای هەندێ لە زانایان وەك ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەبو حەنیفە بە هەمان شێوەی کەسی ئازاد بریتییە لە چوار مانگ.

(٤) ـ ظِهَارُ الْحُرِّ.

(٥) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٨ في الطلاق، عن مالك به.




ئافرەتێك تەڵاق دەدات (كە هێشتا نەیهێناوە) ئەگەر هێنای (حوكمی چییە؟)، قاسمی كوڕی موحەممەد ﷺ گوتی: (پرسیار لە ئیمامی عومەر كرا) پیاوێك ئافرەتێكی لەسەر خۆی وەك پشتی دایكی حیساب كردووە (واتە گوتوویەتی وەك پشتی دایكم لەسەرم حەڕام بێت نزیكی بكەومەوە) جا ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ كرد (حوكمی چۆنە)، جا ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ فەرمانی بە پیاوەكە كرد ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتەكە كرد لێی نزیك نەكەوێتەوە تا كەفارەتی كەسی زیهاركەر جێبەجێ دەكات (كەواتە لەلای ئیمامی قاسمی كوڕی موحەممەد ﷺ تەڵاق و زیهار بە تەعلیق دادەمەزرێن پێشی زەواج).

**١٦١١-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ عَنْ رَجُلٍ تَظَاهَرَ مِنِ امْرَأَةٍ قَبْلَ أَنْ يَنْكِحَهَا، فَقَالاَ: إِنْ نَكَحَهَا فَلاَ يَمَسَّهَا حَتَّى يُكَفِّرَ كَفَّارَةَ الْمُتَظَاهِرِ[1].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پیاوێك پرسیاری لە قاسمی كوڕی موحەممەد و سولەیمانی كوڕی یەسار ﷺ كردووە دەربارەی پیاوێك زیهار لەگەڵ ئافرەتێك دەكات بەر لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بكات، ئەوانیش هەردووك گوتیان: ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ كرد ئەوە نابێ جیماعی لەگەڵ بكات تا كەفارەتی كەسی زیهاركەر جێبەجێ دەكات.

**١٦١٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ فِي رَجُلٍ تَظَاهَرَ مِنْ أَرْبَعِ نِسْوَةٍ لَهُ بِكَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ، إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ[2].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە دەربارەی ئەو پیاوەی زیهار لەگەڵ چوار خێزانەكەی دەكات بە یەك وشە (واتە بە یەك ڕستە دەڵێت: ئێوە وەك پشتی دایكمن بۆ من)، (گوتوویەتی): لە یەك كەفارەت زیاتری لەسەر نییە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٨٩ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٠ في الطلاق، عن مالك به.

١٦١٣- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، مِثْلَ ذَلِكَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ اللهُ تَعَالَى فِي كَفَّارَةِ الْمُتَظَاهِرِ: ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة ﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ﴿٤﴾ ﴾ المجادلة[1].

واته: هەمان شت لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فەتوا لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ دەربارەی کەفارەتی کەسی زیهارکەر فەرموویەتی: ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ﴿٣﴾ ﴾ ، واته: [پێویستە بەندەیەك ئازاد بکات بەر لەوەی جیماع لەگەڵ یەکدی بکەن]، ﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ﴿٤﴾ ﴾ ، واته: [جا ئەگەر کەسێك بەندەی دەست نەکەوت ئەوە با دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت بەر لەوەی جیماع لەگەڵ یەکدی بکەن، جا ئەگەر کەسێك ئەوەی نەتوانی، ئەوە با نانی شەست هەژار بدات].

١٦١٤- **[فتوى]** قالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَتَظَاهَرُ مِنِ امْرَأَتِهِ فِي مَجَالِسَ مُتَفَرِّقَةٍ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ، فَإِنْ تَظَاهَرَ ثُمَّ كَفَّرَ، ثُمَّ تَظَاهَرَ بَعْدَ أَنْ يُكَفِّرَ، فَعَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ أَيْضًا[2].

(فەتوا): واته: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی لە چەندین مەجلیسی جیا زیهار لەگەڵ خێزانەکەی دەکات، گوتوویەتی: لە یەك کەفارەت زیاتر هیچی لەسەر نییە، جا ئەگەر زیهاری کرد دواتر کەفارەتی دا، دواتر زیهاری کرد دوای ئەوەی کەفارەتی داوە، ئەوە دیسان کەفارەتی لەسەرە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٠ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٢ في الطلاق، عن مالك به.




١٦١٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ تَظَاهَرَ مِنِ امْرَأَتِهِ، ثُمَّ مَسَّهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْهِ إِلاَّ كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ، وَيَكُفُّ عَنْهَا، حَتَّى يُكَفِّرَ، وَيَسْتَغْفِرِ اللهَ، وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها هەر كەسێك زیهار لەگەڵ خێزانەكەی بكات، دواتر جیماعی لەگەڵ بكات بەر لەوەی كەفارەتەكەی جێبەجێ بكات: ئەوە لە یەك كەفارەت زیاتر هیچی لەسەر نییە، (وە دەبێ) واز لە خێزانەكەی بێنێ (نابێ جیماعی لەگەڵ بكات) تا كەفارەت جێبەجێ دەكات، وە دەبێ داوای لێخۆشبوون لە خوا بكات (چونكە پێش كەفارەتدان جیماعی لەگەڵ كردووە)، جا ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێم لێ بووە (دەربارەی ئەو بابەتە).

١٦١٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالظِّهَارُ مِنْ ذَوَاتِ الْمَحَارِمِ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَالنَّسَبِ سَوَاءٌ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زیهاركردن (بەوێچواندنی خێزان) بە مەحرەمەكان لە شیر و لە نەسەب وەكوو یەكدین (گرنگ ئەوەیە خێزانی حەڵاڵی خۆی چواندووە بە خزمە حەرامكراوەكانی).

١٦١٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ ظِهَارٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زیهار لەسەر ئافرەتان نییە.

١٦١٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي قَوْلِ اللهِ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة قَالَ: سَمِعْتُ أَنَّ تَفْسِيرَ ذَلِكَ، أَنْ يَتَظَاهَرَ الرَّجُلُ مِنِ امْرَأَتِهِ، ثُمَّ يُجْمِعَ عَلَى إِمْسَاكِهَا وَإِصَابَتِهَا، فَإِنْ أَجْمَعَ عَلَى ذَلِكَ، فَقَدْ وَجَبَتْ عَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ، وَإِنْ طَلَّقَهَا، وَلَمْ يُجْمِعْ بَعْدَ تَظَاهُرِهِ مِنْهَا عَلَى إِمْسَاكِهَا وَإِصَابَتِهَا، فَلاَ كَفَّارَةَ عَلَيْهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ تَزَوَّجَهَا بَعْدَ ذَلِكَ لَمْ يَمَسَّهَا، حَتَّى يُكَفِّرَ كَفَّارَةَ الْمُتَظَاهِرِ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٥ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٦ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی وتەی خوای پەروەردگار ﷻ: [وَالَّذِينَ يَظَّاهَرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا]، گوتوویەتی: گوێبیست بووم تەفسیرەکەی ئەوەیە: پیاو زیهار لەگەڵ خێزانەکەی بکات، دواتر سوور بێت لەسەر هێشتنەوەی خێزانەکەی و ئەنجامدانی جیماع لەگەڵی، جا ئەگەر سوور بوو لەسەر ئەوە، ئەوە کەفارەتی زیهاری لەسەر واجب دەبێت، (بەڵام) ئەگەر ـ دوای زیهارەکە ـ تەڵاقی دا و سوور نەبوو لەسەر هێشتنەوە و ئەنجامدانی جیماع لەگەڵی، ئەوە کەفارەتی (زیهاری) لەسەر نییە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر دوای تەڵاقی زیهار هاوسەرگیری لەگەڵ کردەوە ئەوە نابێ جیماعی لەگەڵ بکات تاوەکوو کەفارەتی زیهار جێبەجێ دەکات.

١٦١٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَتَظَاهَرُ مِنْ أَمَتِهِ: إِنَّهُ إِنْ أَرَادَ أَنْ يُصِيبَهَا فَعَلَيْهِ كَفَّارَةُ الظِّهَارِ قَبْلَ أَنْ يَطَأَهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی زیهار لەگەڵ جارییەکەی دەکات، (گوتوویەتی): ئەگەر ویستی جیماعی لەگەڵ بکات، ئەوە لەسەری واجبە کەفارەتی زیهار جێبەجێ بکات بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات.

١٦٢٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَدْخُلُ عَلَى رَجُلٍ إِيلاَءٌ فِي تَظَاهُرِهِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مُضَارًّا، لاَ يُرِيدُ أَنْ يَفِيءَ مِنْ تَظَاهُرِهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئیلاء ناچێتە سەر زیهاری پیاو، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە بیەوێ زیان لە خێزانەکەی بدات و نەیەوێت زیهارەکەی بشکێنێت و بچێتە لای (لەو کاتەدا ئیلائیشی دەکەوێتە سەر).

١٦٢١- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً يَسْأَلُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ عَنْ رَجُلٍ قَالَ لامْرَأَتِهِ: كُلُّ امْرَأَةٍ أَنْكِحُهَا عَلَيْكِ مَا عِشْتِ، فَهِيَ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي، فَقَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ: يُجْزِيهِ مِنْ ذَلِكَ عِتْقُ رَقَبَةٍ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٨ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٧ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٤٨ في الطلاق، عن مالك به.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە پیاوێك بووە پرسیاری لە عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ کرد دەربارەی پیاوێك بە خێزانەکەی دەڵێت: هەر ئافرەتێکت بەسەر بێنم تا تۆ مابیت، ئەوە ئەو ئافرەتە لەسەر من وەك پشتی دایکم بێت، جا عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ گوتی: بە ئازادکردنی کۆیلەیەك واجبەکەی پێ پێکدێت (واتە زیهاری موعەلەق لەلای عوڕوە دادەمەزرێ و کەفارەتی لەسەرە کاتێ ئافرەتەکەی خواست).

## ٩- زیهاری کۆیلەکان[١]

**١٦٢٢-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ عَنْ ظِهَارِ الْعَبْدِ، فَقَالَ: نَحْوُ ظِهَارِ الْحُرِّ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُرِيدُ أَنَّهُ يَقَعُ عَلَيْهِ كَمَا يَقَعُ عَلَى الْحُرِّ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ کردووە دەربارەی زیهاری کۆیلە، ئەویش گوتوویەتی: وەك زیهاری کەسی ئازاد وایە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەبەستی ئەوەیە زیهاری دەکەوێتە سەر هەروەك چۆن زیهار دەکەوێتە سەر کەسی ئازاد.

**١٦٢٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَظِهَارُ الْعَبْدِ عَلَيْهِ وَاجِبٌ، وَصِيَامُ الْعَبْدِ فِي الظِّهَارِ شَهْرَانِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: زیهارکردنی کۆیلە (ئەحکامی زیهاری) لەسەر واجب دەکات، وە بەڕۆژووبونی کۆیلە لە زیهاردا دوو مانگە.

**١٦٢٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْعَبْدِ يَتَظَاهَرُ مِنِ امْرَأَتِهِ: إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ عَلَيْهِ إِيلاَءٌ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَوْ ذَهَبَ يَصُومُ صِيَامَ كَفَّارَةِ الْمُتَظَاهِرِ، دَخَلَ عَلَيْهِ طَلاَقُ الإِيلاَءِ، قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صِيَامِهِ[٤].

---

(١) ـ ظِهَارُ الْعَبِيدِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٩٩ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٠ في الطلاق، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠١ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی پیاوی كۆیلە كە زیهار دەكات لەگەڵ خێزانەكەی، گوتوویەتی: ئیلائی ناكەوێتە سەر، (بەڵام) ئەگەر بچێت بەڕۆژوو بێت بۆ كەفارەتی كەسی زیهاركەر (كە بریتییە لە دوو مانگ، وە ئیلائی كۆیلەش هەر بریتییە لە دوو مانگ) ئەوە تەڵاقی ئیلائی دەكەوێتە سەر بەر لەوەی لە ڕۆژووەكانی تەواو بێت.

## ١٠- ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرپشكبوون (بۆ جیابوونەوە یان مانەوە)[1]

**١٦٢٥-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلاَثُ سُنَنٍ، فَكَانَتْ إِحْدَى السُّنَنِ الثَّلاَثِ: أَنَّهَا أُعْتِقَتْ، فَخُيِّرَتْ فِي زَوْجِهَا، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ، وَدَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالْبُرْمَةُ تَفُورُ بِلَحْمٍ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ خُبْزٌ وَأُدْمٌ مِنْ أُدْمِ الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلَمْ أَرَ بُرْمَةً فِيهَا لَحْمٌ؟ فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، وَلَكِنْ ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، وَأَنْتَ لاَ تَأْكُلُ الصَّدَقَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ[2].

واتە: لە عائیشەی دایكی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: بەریرە سێ حوكم و بڕیاری شەرعی تیا جێبەجێ بوو، جا یەكێك لە حوكمەكان ئەوە بوو: ئازاد كرا و سەرپشك كرا لە مێردەكەی، وە (دووەمیان ئەوە بوو) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وەلاء و مافی میراتگرتن بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی دەكات، وە (سێیەمیشیان ئەوە بوو) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە (بۆماڵەوە) لە كاتێكدا مەنجەڵەكە پڕی گۆشت بوو، جا نان و پێخۆرێك لە پێخۆرەكانی ماڵەوە هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مەگەر ئەو مەنجەڵە گۆشتی تیا نەبوو بینیم؟ ئەوانیش گوتیان: بۆنا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام ئەوە گۆشتێكە كراوەتە صەدەقە بۆ بەریرە و تۆش صەدەقە ناخۆیت (بۆیە بۆمان

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْخِيَارِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٢ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٤٩أ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٩٥؛ وفي: ١٤٧٠؛ وابن حنبل: ٢٥٤٩١؛ والبخاري: ٥٠٩٧ في النكاح، وفي: ٥٢٧٩ في الطلاق؛ ومسلم: العتق: ١٤؛ والنسائي: ٣٤٤٧ في الطلاق؛ وابن حبان: ٥١١٦؛ والقابسي: ١٦٠، كلهم عن مالك به.

نەهێنایت)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: گۆشتەکە بۆ ئەو صەدەقەیە و بۆ ئێمە دیارییە (واتە بەریرە دەتوانێت بەنییەتی دیاری پێمان ببەخشێت).

١٦٢٦- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي الأَمَةِ تَكُونُ تَحْتَ الْعَبْدِ فَتَعْتِقُ: إِنَّ لَهَا الْخِيَارُ مَا لَمْ يَمَسَّهَا[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتە کۆیلەی لەژێر نیکاحی پیاوێکی کۆیلەدایە و ئافرەتەکە ئازاد دەبێت، دەیگوت: سەرپشکی بۆ هەیە (دەتوانێت هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ پیاوە کۆیلەکە ڕەت بکاتەوە) مادەم پیاوەکە (دوای ئازادبوونی ئافرەتەکە) جیماعی لەگەڵ نەکردبێت.

١٦٢٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ مَسَّهَا زَوْجُهَا، فَزَعَمَتْ أَنَّهَا جَهِلَتْ أَنَّ لَهَا الْخِيَارَ، فَإِنَّهَا تُتَّهَمُ وَلاَ تُصَدَّقُ بِمَا ادَّعَتْ مِنَ الْجَهَالَةِ، وَلاَ خِيَارَ لَهَا بَعْدَ أَنْ يَمَسَّهَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر مێردی ئافرەتە کۆیلەکە جیماعی لەگەڵ کردبوو (دوای ئازادبوونی ئافرەتەکە) و ئافرەتەکەش گوتی نەیزانیوە سەرپشکی بۆ هەیە (ئەگەرنا نەمدەهێشت جیماعم لەگەڵ بکات و هاوسەرگیرییەکەم ڕەت دەکردەوە)، ئەوە ئافرەتەکە تۆمەتبار دەکرێت (بەوەی دەیەوێ بەهانەیەك بدۆزێتەوە) و باوەڕی پێ ناکرێت بەوەی بانگەشەی بۆ دەکات لە نەزانینی ئەو بابەتە (چونکە بابەتەکە زۆر مەشهور و بەربڵاوە هەموو خەڵك دەیزانێت)، جا سەرپشکی بۆ نییە دوای ئەوەی پیاوەکەی جیماعی لەگەڵ کردووە.

١٦٢٨- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ مَوْلاَةً لِبَنِي عَدِيٍّ، يُقَالُ لَهَا: زَبْرَاءُ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ عَبْدٍ، وَهِيَ أَمَةٌ يَوْمَئِذٍ، فَعَتَقَتْ، قَالَتْ: فَأَرْسَلَتْ إِلَيَّ حَفْصَةُ ﷺ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَتْنِي، فَقَالَتْ: إِنِّي مُخْبِرَتُكِ خَبَرًا، وَلاَ أُحِبُّ أَنْ تَصْنَعِي شَيْئًا، إِنَّ أَمْرَكِ بِيَدِكِ، مَا لَمْ يَمَسَّكِ

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٠ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٩٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٠ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٩٦، كلهم عن مالك به.

زَوْجُكِ، فَإِنْ مَسَّكِ، فَلَيْسَ لَكِ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ، قَالَتْ، فَقُلْتُ: هُوَ الطَّلَاقُ، ثُمَّ الطَّلَاقُ، فَفَارَقَتْهُ ثَلاَثًا[1].

واتە: لە عورِوەی کوڕی زوبەیرەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئافرەتێکی خزمەتکار و کۆیلەی بەنو عەدی پێی دەگوترا: زەبڕاء هەواڵی پێ داوە بەوەی کاتی خۆی لەژێر نیکاحی پیاوێکی کۆیلەدا بووە، خۆیشی لەو ڕۆژگارەدا کۆیلە بوو، جا ئازاد کرا، دەڵێت: جا حەفصەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بەدوایدا ناردم و بانگی کردم و گوتی: من هەواڵێکت پێ دەدەم، بەڵام حەز ناکەم هیچ بکەیت (واتە حەز ناکەم جیا ببیتەوە)، کارەکەت بە دەستی خۆتەوەیە مادەم مێردەکەت جیماعی لەگەڵ نەکردبی، جا ئەگەر جیماعت لەگەڵ بکات ئەوە هیچت بە دەست نییە (ئەوە بابەتێکە پەیوەندی بە ژیانی تۆوە هەیە و ڕامگەیاند)، زەبڕاء دەڵێت: منیش گوتم: (هەڵبژاردنی من) تەڵاقە تەڵاقە تەڵاقە، جا بە سێ تەڵاق لێی جیا بۆیەوە.

**١٦٢٩**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، وَبِهِ جُنُونٌ أَوْ ضَرَرٌ، فَإِنَّهَا تُخَيَّرُ، فَإِنْ شَاءَتْ قَرَّتْ، وَإِنْ شَاءَتْ فَارَقَتْ[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر پیاوێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کرد، جا پیاوەکە شێتی هەبوو یان عەیبێکی هەبوو (عەیبێك زیان لە ژیانی هاوسەری بدات وەك پەککەوتویی عەوڕەت و ... هتد)، ئەوە ئافرەتەکە سەرپشك دەکرێت، ئەگەر ویستی دەمێنێتەوە، ئەگەریش ویستی لێی جیا دەبێتەوە.

**١٦٣٠**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الأَمَةِ تَكُونُ تَحْتَ الْعَبْدِ، ثُمَّ تَعْتِقُ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا أَوْ يَمَسَّهَا: إِنَّهَا إِنِ اخْتَارَتْ نَفْسَهَا فَلاَ صَدَاقَ لَهَا، وَهِيَ تَطْلِيقَةٌ، وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا[3].

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٠أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٤ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٩٧؛ وفي:١٣١١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٥ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٣٩ في النكاح، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٦ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کە لەژێر نیکاحی پیاوێکی کۆیلەدایە دواتر ئافرەتەکە ئازاد دەبێت بەر لەوەی پیاوەکە جیماعی لەگەڵ بکات و دەستی لێ بدات، گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە خۆی هەڵبژارد (واتە مێردەکەی هەڵنەبژارد و تەڵاقی هەڵبژارد)، ئەوە هیچ مارەییەکی بۆ نییە، (جیابوونەوەکەشی) بە یەك تەڵاق دەبێت، بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە.

**١٦٣١-** عَنْ مَالِكٍ ﷬، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷬، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: إِذَا خَيَّرَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ، فَاخْتَارَتْهُ، فَلَيْسَ ذَلِكَ بِطَلَاقٍ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷬: وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷬ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئیبنو شیهابەوە ﷬ گێڕاویەتەوە کە گوێبیستی بووە دەیگوت: ئەگەر پیاو خێزانەکەی سەرپشك کرد، خێزانەکەشی ئەوی هەڵبژارد (جیابوونەوەی نەویست)، ئەوە نابێتە تەڵاق.

ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بابەتەدا).

**١٦٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷬ فِي الْمُخَيَّرَةِ إِذَا خَيَّرَهَا زَوْجُهَا، فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا، فَقَدْ طَلُقَتْ ثَلَاثًا، وَإِنْ قَالَ زَوْجُهَا: لَمْ أُخَيِّرْكِ إِلاَّ وَاحِدَةً، فَلَيْسَ لَهُ ذَلِكَ، وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ دەربارەی ئافرەتی سەرپشککراو کاتێ مێردەکەی سەرپشکی دەکات (بەوەی بمێنێتەوە یان تەڵاقی بکەوێت) ئەویش خۆی هەڵبژارد (مێردەکەی هەڵنەبژارد و تەڵاقی هەڵبژارد)، گوتوویەتی: بە سێ تەڵاق تەڵاقی کەوتووە، جا ئەگەر مێردەکەی بڵێت: من تۆم سەرپشك نەکردووە تەنها لە یەك تەڵاق نەبێت، ئەوەی بۆ نییە (سێ تەڵاقی دەکەوێت)، ئەوەش چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بابەتەدا).

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٥٦٠ في الطلاق؛ وفي: ١٦٠٧ في الطلاق، عن مالك به.

**١٦٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ خَيَّرَهَا، فَقَالَتْ: قَدْ قَبِلْتُ وَاحِدَةً، وَقَالَ: لَمْ أُرِدْ هَذَا، وَإِنَّمَا خَيَّرْتُكِ فِي الثَّلاَثِ جَمِيعًا، أَنَّهَا لَمْ تَقْبَلْ إِلاَّ وَاحِدَةً، أَقَامَتْ عِنْدَهُ عَلَى نِكَاحِهَا، وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ فِرَاقًا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو خێزانەکەی سەرپشك بکات، ئافرەتەکەش بڵێت: یەك تەڵاقم قبووڵ کرد، پیاوەکەش بڵێت: من مەبەستم ئەوە نەبوو، بەڵکوو سەرپشکم کردی لە هەر سێ تەڵاقەکە (تا قبووڵی بکەیت و تەڵاقەکان بکەون)، ئەویش هیچی قبووڵ نەکرد تەنها یەك دانە نەبێت، ئەوە ئافرەتەکە لەسەر هاوسەرگیرییەکەی دەمێنێتەوە و ئەوە نابێتە جیابوونەوە.

## ١١- ئەوەی هاتووە دەربارەی خولع (خۆکڕینەوەی ژن لە مێردەکەی)[٢]

**١٦٣٤-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ عَنْ حَبِيبَةَ بِنْتِ سَهْلٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الصُّبْحِ، فَوَجَدَ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ عِنْدَ بَابِهِ فِي الْغَلَسِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: مَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: لاَ أَنَا وَلاَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ، لِزَوْجِهَا، فَلَمَّا جَاءَ زَوْجُهَا ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَذِهِ حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ قَدْ ذَكَرَتْ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَذْكُرَ، فَقَالَتْ حَبِيبَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُلُّ مَا أَعْطَانِي عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ: خُذْ مِنْهَا، فَأَخَذَ مِنْهَا، وَجَلَسَتْ فِي أَهْلِهَا[٣].

واتە: لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە لە حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصارییەوە ﷺ هەواڵی داوە ـ باسی خۆی بۆ کردووە ـ گوتوویەتی: کاتی خۆی لەژێر نیکاحی سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسدا بووە، جا پێغەمبەری

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٠٨ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْخَلْعِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٠ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥١أ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٧٧؛ وابن حنبل: ٢٧٤٨٤؛ والنسائي: ٣٤٦٢ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢٢٢٧ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٨٠؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٤٨؛ والقابسي: ٤٩٨، كلهم عن مالك به.

خوا ﷺ دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی و بینی حەبیبەی کچی سەهل بەو تاریکییە لەلای دەرگاکەیەتی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە کێیە؟ ئەویش گوتی: من حەبیبەی کچی سەهلم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چیتە؟ ئەویش گوتی: نە من و نە سابیتی کوڕی قەیس، (مەبەستی) مێردەکەی بوو، جا کاتێ مێردەکەی هات سابیتی کوڕی قەیس، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەوە حەبیبەی کچی قەیسە (خێزانتە) ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێت باسی کرد (دەربارەی تۆ)، جا حەبیبە گوتی: گشت ئەوەی پێی بەخشیوم لەلامە (هیچی نەفەوتاوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سابیتی کوڕی قەیسی فەرموو: لێی وەربگرە (ئەویش شتەکانی لێ وەرگرتەوە و دەستی لێ هەڵگرت و وازی لێ هێنا)، حەبیبەش لەماڵی باوکی دانیشت.

**١٦٣٥-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، عَنْ مَوْلَاةٍ لِصَفِيَّةَ بِنْتِ أَبِي عُبَيْدٍ، أَنَّهَا اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا بِكُلِّ شَيْءٍ لَهَا، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﵄ (١).

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئافرەتێکی کۆیلەی صەفیەی کچی ئەبو عوبەیدەوە گێڕاویەتەوە ـ باسی خۆی کردووە ـ (گوتوویەتی): خولعی کردووە و خۆی کڕیوەتەوە لە پیاوەکەی بە بەخشینی گشت ئەو شتانەی هەیبووە (گشتی داوەتە هاوسەرەکەی)، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ ئینکاری نەکرد (پێی کارێکی ناڕەوا نەبوو).

**١٦٣٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الْمُفْتَدِيَةِ الَّتِي تَفْتَدِي مِنْ زَوْجِهَا، أَنَّهُ إِذَا عُلِمَ أَنَّ زَوْجَهَا أَضَرَّ بِهَا، وَضَيَّقَ عَلَيْهَا، وَعُلِمَ أَنَّهُ ظَالِمٌ لَهَا، مَضَى الطَّلَاقُ، وَرَدَّ عَلَيْهَا مَالَهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: فَهَذَا الَّذِي كُنْتُ أَسْمَعُ، وَالَّذِي عَلَيْهِ أَمْرُ النَّاسِ عِنْدَنَا(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو ئافرەتەی خۆی دەکڕێتەوە لە مێردەکەی، گوتوویەتی: ئەگەر زانرا مێردەکەی دەیەوێت زیانی پێ بگەیەنێت و

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١١ في الطلاق؛ والشافعي: ١٣٨٥، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٢ في الطلاق، عن مالك به.

ئاستەنگی بۆ دروست بکات و زانرا ستەمی لێ دەکا، ئەوە تەڵاق جێبەجێ دەکرێ و دەبێ پیاوەکە ماڵ و سەروەتەکەش بۆ ئافرەتەکە بگەڕێنێتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بریتییە لەوەی گوێبیستی بووم و کاروباری خەڵکیش لەسەر ئەوەیە لەلای ئێمە.

**١٦٣٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِأَنْ تَفْتَدِيَ الْمَرْأَةُ مِنْ زَوْجِهَا بِأَكْثَرَ مِمَّا أَعْطَاهَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچی تیا نییە بەوەی ئافرەت خۆی لە مێردەکەی بکڕێتەوە بە زیاتر لەوەی پیاوەکە پێی داوە.

## ١٢- تەڵاقی ئەو ئافرەتەی خولع دەکات و خۆی دەکڕێتەوە[1]

**١٦٣٨-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ رُبَيِّعَ بِنْتَ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ، جَاءَتْ هِيَ وَعَمُّهَا إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا اخْتَلَعَتْ مِنْ زَوْجِهَا فِي زَمَانِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، فَلَمْ يُنْكِرْهُ، وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: عِدَّتُهَا عِدَّةُ الْمُطَلَّقَةِ[2].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ڕوبەیعی کچی موعەوەزی کوڕی عەفراء خۆی و مامی هاتن بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، جا ڕوبەیع هەواڵی پێ دا کە خولعی کردووە و خۆی کڕیوەتەوە لە مێردەکەی لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا ﷺ، جا ئەوە گەیشتەوە بە عوسمانی کوڕی عەففان و ﷺ نکوڵی لێ نەکرد، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەمەر ﷺ گوتی: عیدەکەی بریتییە لە عیدەی ئافرەتی تەڵاقدراو.

**١٦٣٩-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ، وَابْنَ شِهَابٍ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ: عِدَّةُ الْمُخْتَلِعَةِ مِثْلُ عِدَّةِ الْمُطَلَّقَةِ، ثَلاَثَةُ قُرُوءٍ[3].

---

(١) ـ طَلَاقُ الْمُخْتَلِعَةِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٢أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٥ في الطلاق؛ وفي: ١٦٦٢ في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٨٤٥٣ في الطلاق، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی سەعیدی كوڕی موسەیەب و سولەیمانی كوڕی یەسار و ئیبنو شیهاب ﷺ دەیانگوت: عیدەی ئەو ئافرەتەی خۆی لە مێردەكەی دەكڕێتەوە و خۆی جیا دەكاتەوە وەك عیدەی ئافرەتی تەڵاقدراوە، سێ قوڕئە.

**١٦٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الْمُفْتَدِيَةِ: إِنَّهَا لاَ تَرْجِعُ إِلَى زَوْجِهَا إِلاَّ بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ، فَإِنْ هُوَ نَكَحَهَا، فَفَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، لَمْ يَكُنْ لَهُ عَلَيْهَا عِدَّةٌ مِنَ الطَّلاَقِ الآخَرِ، وَتَبْنِي عَلَى عِدَّتِهَا الأُولَى.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو ئافرەتەی خۆی لە مێردەكەی دەكڕێتەوە و خۆی جیا دەكاتەوە، گوتوویەتی: ناگەڕێتەوە لای پیاوەكەی تەنها بە زەواجێكی نوێ نەبێت، جا ئەگەر زەواجی لەگەڵ كرد و (دووبارە) تەڵاقی دا بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بكات، ئەوە ئافرەتەكە لە تەڵاقی دووەمیدا عیدەی لەسەر نییە، (بەڵكوو) عیدەكەی لەسەر عیدەی یەكەم بینا دەكا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم لەو بابەتەدا.

**١٦٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا افْتَدَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ زَوْجِهَا بِشَيْءٍ عَلَى أَنْ يُطَلِّقَهَا، فَطَلَّقَهَا طَلاَقًا مُتَتَابِعًا نَسَقًا، فَذَلِكَ ثَابِتٌ عَلَيْهِ، فَإِنْ كَانَ بَيْنَ ذَلِكَ صُمَاتٌ، فَمَا أَتْبَعَهُ بَعْدَ الصُّمَاتِ فَلَيْسَ بِشَيْءٍ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەت بە شتێك خۆی لە مێردەكەی كڕیەوە لەسەر ئەوەی تەڵاقی بدات، جا ئەویش تەڵاقی دا بە چەند تەڵاقێكی لەدوای یەك و بەبێ پچڕان، ئەوە تەڵاقەكان لەسەری دەچەسپێن و دادەمەزرێن، جا ئەگەر لە نێوان تەڵاقەكان بێدەنگبوون هەبوو (واتە تەڵاقێكی دا دواتر ماوەیەكی باش بێدەنگ بوو دواتر تەڵاقی دیكەی دا)، ئەوە ئەو تەڵاقانەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٦ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٧ في الطلاق، عن مالك به.

دوای بێدەنگبوون گوتراون هیچ نین و حیسابیان بۆ ناکرێت (بەڵام هەر تەڵاقی دەکەوێت بە تەڵاقی یەکەم).

## ١٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی لیعان[1]

**١٦٤٢-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُوَيْمِرًا الْعَجْلاَنِيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَسَائِلَ، وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ، جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ، فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ عَاصِمٌ لِعُوَيْمِرٍ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا، فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا، فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ، حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ وَسَطَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ؟ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أُنْزِلَ فِيكَ، وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا، قَالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا، وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ تَلاَعُنِهِمَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًا، قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَكَانَتْ تِلْكَ بَعْدُ سُنَّةَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ هەواڵی پێ داوە (گوتوویەتی): عوەیمیری عەجلانی هات بۆ لای عاصمی کوڕی عەدی ئەنصاری و پێی گوت: ئەی عاصم بۆچوونت چییە دەربارەی پیاوێك کاتێ پیاوێکی دیکە لەگەڵ خێزانی خۆی ببینێت (زینا دەکەن)

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي اللِّعَانِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٨ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٦٠؛ وابن حنبل: ٢٢٨٧٨، وفي: ٢٢٨٩٤، وفي: ٢٢٩٠٢، وفي: ٢٢٩٠٢؛ والبخاري: ٥٢٥٩ في الطلاق، وفي: ٥٣٠٨ في الطلاق؛ ومسلم: اللعان: ١؛ والنسائي: ٣٤٠٢ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢٢٤٥ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٨٤؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٣٦؛ والدارمي: ٢٢٢٩ في النكاح؛ وشرح معاني الآثار: ٦١٤٦؛ والقابسي: ٦، كلهم عن مالك به.




ئایا بۆی هەیە بیكوژێت (كە بێگومان دواتریش خاوەنی كوژراوەكە) پیاوەكە دەكوژنەوە؟ یان چی بكات؟ ئەی عاصم پرسیارم بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكە دەربارەی ئەو بابەتە، جا عاصم پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی ئەو بابەتە، پێغەمبەری خواش ﷺ پرسیارەكە (یان تۆمەتەكەی) زۆر پێ ناخۆش بوو و بە عەیبەی دانا بەجۆرێك زۆر لەسەر عاصم ناخۆش و قورس بوو كاتێك ئەوە گوێبیست بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، جا كاتێ عاصم گەڕایەوە ناو ماڵ و منداڵی، عوەیمیر هات بۆ لای و گوتی: ئەی عاصم پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ گوتی؟ عاصمیش بە عوەیمیری گوت: هەرگیز بە چاكە و خێر نایەیتە لای من (هەر نەهامەتیت بۆ من)، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پرسیارەی پێ ناخۆش بوو كە لێم كرد، جا عوەیمیر گوتی: سوێند بە خوا واز ناهێنم تا پرسیاری لێ دەكەمەوە، جا عوەیمیر ڕووی كردە لای ماڵ و مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵكیدا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێی دەربارەی پیاوێك كە پیاوێكی دیكە لەگەڵ خێزانی خۆی ببینێت (زینا دەكەن) ئایا بۆی هەیە بیكوژێت (كە بێگومان دواتریش خاوەنی كوژراوەكە) پیاوەكە دەكوژنەوە؟ یان چی بكات؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دەربارەی تۆ و خێزانەكەت ئایەت دابەزیون، بڕۆ خێزانەكەت بێنە، سەهل دەڵێ: جا مولاعەنەیان كرد، منیش لەگەڵ خەڵكیدا بووم لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا كاتێ لە مولاعەنەكە بوونەوە عوەیمیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیهێڵمەوە لەلای خۆم من ئەوە دەكا درۆ و بوختانم بەسەرەوە كردووە، جا سێ بە سێ تەڵاقی دا، بەر لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ بكات (بە تەڵاقدان).

ئیمامی مالیك رحمه الله گوتوویەتی: ئیبنو شیهاب رحمه الله گوتوویەتی: ئەو شێوازە دوای ئەوە بوو بە شێواز و ڕێبازی ئەو ژن و مێردانەی مولاعەنە دەكەن.

١٦٤٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما؛ أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ، فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَانْتَفَلَ مِنْ وَلَدِهَا، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ[1].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٤ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨٧



واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێك مولاعەنەی لەگەڵ خێزانی کرد و خۆی بەری کرد لە منداڵی خێزانەکەی (بەوەی منداڵی ئەو نییە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لێکی جیا کردنەوە و منداڵەکەی لکاند بە ئافرەتەکەوە (واتە نەسەب و میرات تەنها لە نێوانی منداڵەکە و دایکی دەبێت، پیاوەکە پەیوەندی بە نەسەب و میراتیەوە نییە).

١٦٤٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ: قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٧ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٨ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٩ ﴾ النور [1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: خوای پەروەردگار ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٧ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٨ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٩ ﴾، واتە: [ئەو پیاوانەی تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ خێزانەکانیان و بێجگە لە خۆیان هیچ شایەتیێکیان نییە، ئەوە شایەتیدانی هەر یەك لەوان (بەمجۆرەیە): چوار سوێند بە خوا ﷻ بخوات کە بێگومان ئەو ڕاستگۆیە (کە دەڵێت خێزانەکەم زینای کردووە) * وە لە پێنجەم جاردا بڵێ: نەفرەتی خوا ﷻ لەسەر خۆم بێ ئەگەر لە درۆزنان بم * ئەو ئافرەتەش (کە تاوانبار کراوە لەلایەن مێردەکەیەوە) سزای (زینای) لەسەر لادەبات بەوەی کە چوار جار سوێند بخوات

---

في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٦٧؛ وابن حنبل: ٤٢٩٨، وفي: ٤٥٢٧، وفي: ٥٣١٢، وفي: ٥٤٠٠؛ والبخاري: ٥٣١٥ في الطلاق، وفي: ٦٧٤٨ في الفرائض؛ ومسلم: اللعان: ٨؛ والنسائي: ٣٤٧٧ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢٢٥٩ في الطلاق؛ والترمذي: ١٢٠٣ في الطلاق؛ وابن ماجه: ٢٠٧٩ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٨٨؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٥٣؛ والقابسي: ٢٣٢، كلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٠ في الطلاق، عن مالك به.




که بێگومان مێردەکەی لە درۆزنانە * وە لە پێنجەم جاردا بڵێت: خەشمی خوام لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەم لە ڕاستگۆیان بێت].

**١٦٤٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمُتَلاَعِنَيْنِ لاَ يَتَنَاكَحَانِ أَبَدًا، وَإِنْ أَكْذَبَ نَفْسَهُ جُلِدَ الْحَدَّ، وَأُلْحِقَ بِهِ الْوَلَدُ، وَلَمْ تَرْجِعْ إِلَيْهِ أَبَدًا، وَعَلَى هَذَا السُّنَّةُ عِنْدَنَا الَّتِي لاَ شَكَّ فِيهَا وَلاَ اخْتِلاَفَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە (دەربارەی ژن و مێردی مولاعەنەکار) لای ئێمە ئاوایە: ژن و مێردی مولاعەنەکار هەرگیز هاوسەرگیری ناکەنەوە (بۆ هەمیشەیی لە یەکدی حەڕامن)، جا ئەگەر پیاوەکە خۆی بەدرۆ بخاتەوە (بڵێ درۆم کرد و بوختانم پێ کرد) ئەوە قامچی سزای بوختانی لێ دەدرێت و منداڵەکە نەسەبی دەدرێتە پاڵ پیاوەکە، (بەڵام) ئافرەتەکە بۆ هەمیشەیی ناگەڕێتەوە لای، جا لەو بابەتەدا شێواز و ڕێبازەکە بەمجۆرەیە کە هیچ گومان و ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە.

**١٦٤٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا فَارَقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فِرَاقًا بَاتًّا، لَيْسَ لَهُ عَلَيْهَا فِيهِ رَجْعَةٌ، ثُمَّ أَنْكَرَ حَمْلَهَا، لاَعَنَهَا إِذَا كَانَتْ حَامِلاً، وَكَانَ حَمْلُهَا يُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ مِنْهُ إِذَا ادَّعَتْهُ، مَا لَمْ يَأْتِ دُونَ ذَلِكَ مِنَ الزَّمَانِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَلاَ يُعْرَفُ أَنَّهُ مِنْهُ.

قَالَ: فَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا، وَالَّذِي سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو لە خێزانەکەی جیا بۆیەوە بەجیابوونەوەیەکی یەکجاری، ئەوە پیاوەکە گەڕاندنەوەی خێزانەکەی بۆ نییە، (ئەگەر) دواتریش نکوڵی لە حەملی ئافرەتەکە کرد (گوتی لە من نییە)، ئەوە لیعانی لەگەڵ دەکات ئەگەر دووگیان بوو و لەوە دەچوو حەملەکە لە پیاوەکە بێت کاتێ ئافرەتەکە بانگەشەی ئەوە دەکات (دەڵێت ڕاست ناکات ئەو منداڵە لە پیاوەکەمە، ئەویش نکوڵی دەکات، ئەوە لیعان دێتە ئاراوە)، مادەم زەمانێکی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٤أ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٢ في الطلاق، عن مالك به.

بەسەردا نەهاتبێت کە گومان بکرێت تیایدا (ئاخۆ دەبێ هی پیاوێکی دیکە بێت یان هی مێردەکەی!) و نەزانرێت هی ئەوە (کەواتە مادەم کاتێکی زۆر تێ پەڕ نەبووبێت لیعان دروستە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە بەو شێوەیەیە و ئەوە بریتییە لەوەی گوێبیستی بووم لە زانایان.

**١٦٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا قَذَفَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ بَعْدَ أَنْ يُطَلِّقَهَا ثَلاَثًا، وَهِيَ حَامِلٌ يُقِرُّ بِحَمْلِهَا، ثُمَّ يَزْعُمُ أَنَّهُ قَدْ رَآهَا تَزْنِي قَبْلَ أَنْ يُفَارِقَهَا، جُلِدَ الْحَدَّ، وَلَمْ يُلاَعِنْهَا، وَإِنْ أَنْكَرَ حَمْلَهَا بَعْدَ أَنْ يُطَلِّقَهَا ثَلاَثًا، لاَعَنَهَا.

قَالَ: وَهَذَا الَّذِي سَمِعْتُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو تۆمەتی زینای دایە پاڵ خێزانی دوای ئەوەی سێ بە سێ تەڵاقی داوە، لە کاتێکدا ئافرەتەکە دووگیانە پیاوەکە دانی ناوە بە حەملەکەی (بەوەی حەملەکە هی خۆیەتی)، پیاوەکە گوتی بەر لەوەی تەڵاقی بدات بینیویەتی زینای کردووە، ئەوە پیاوەکە قامچی سزای (بوهتانی) لێ دەدرێت و لیعانی لەگەڵ ناکات (چونکە ئێستا کەسێکی بێگانە حیسابە و نەسەبی منداڵەکەش دەداتە پاڵ خۆی)، (بەڵام) ئەگەر پیاوەکە ئینکاری حەملی ئافرەتەکەی کرد (گوتی حەملەکە لە من نییە) دوای ئەوەی سێ بە سێ تەڵاقی داوە، ئەوە لیعانی لەگەڵ دەکات (چونکە هێشتا نەسەبی منداڵەکە یەکلایی نەبۆتەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بریتییە لەوەی گوێبیستی بووم.

**١٦٤٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْعَبْدُ بِمَنْزِلَةِ الْحُرِّ فِي قَذْفِهِ وَلِعَانِهِ، يَجْرِي مَجْرَى الْحُرِّ فِي مُلاَعَنَتِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَيْسَ عَلَى مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَةً حَدٌّ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٤ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: پیاوی کۆیلە وەك پیاوی ئازاد وایە لە تۆمەتبارکردنی کەسێك بە زینا و لە لیعاندا، بڕیارەکانی کەسی ئازادی بەسەر جێبەجێ دەبێ لە مولاعەنەکەیدا، تەنها ئەوە نەبێ سزای شەرعی لەسەر ئەو کەسە نییە کە تۆمەتی زینا دەداتە پاڵ ئافرەتێکی کۆیلە[1].

**١٦٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالأَمَةُ الْمُسْلِمَةُ، وَالْحُرَّةُ النَّصْرَانِيَّةُ وَالْيَهُودِيَّةُ، يُلاَعِنَ الْحُرَّ الْمُسْلِمَ، إِذَا تَزَوَّجَ إِحْدَاهُنَّ فَأَصَابَهَا، وَذَلِكَ أَنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴿٩﴾ ﴾ النور فَهُنَّ مِنَ الأَزْوَاجِ، وَعَلَى هَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئافرەتی کۆیلەی مسوڵمان و ئافرەتی ئازادی گاور و جوولەکە مولاعەنە لەگەڵ پیاوی ئازادی مسوڵمان دەکەن، (ئەوەش لەو کاتەدا دەبێت) ئەگەر پیاوی ئازادی مسوڵمان هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێك لەو ئافرەتانە کرد و جیماعی لەگەڵ کرد، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا (بەڕەهایی) دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ ﴿٩﴾ ﴾ واتە: [ئەو پیاوانەی تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان...]، جا ئەوانیش لە هاوسەرانن (کەواتە بۆیان هەیە)، جا بابەتەکە لای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

**١٦٥٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالعَبْدُ إِذَا تَزَوَّجَ الْمَرْأَةَ الْحُرَّةَ الْمُسْلِمَةَ، أَوِ الأَمَةَ الْمُسْلِمَةَ، أَوِ الْحُرَّةَ النَّصْرَانِيَّةَ، أَوِ الْيَهُودِيَّةَ لاَعَنَهَا[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: پیاوی کۆیلە ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی ئازادی مسوڵمان یان ئافرەتێکی کۆیلەی مسوڵمان یان ئافرەتێکی ئازادی گاور یان جوولەکە کرد مولاعەنەی دەکات (واتە بۆی دروستە و مولاعەنەکەی دادەمەزرێت).

---

(١) ـ تێبینی: کە دەگوترێت سزای شەرعی لەسەر نییە مەبەست پێی هەشتا قامچییەکەی بوهتانە، ئەگەرنا سزای لەسەرە و دەبێ سزا بدرێت و تەمێ بکرێت و بترسێنرێت و قسەکەی ڕەت بکرێتەوە، مادەم شاهێدی نییە، سزاکەش دادوەری شەرعی دیاری دەکات.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٥ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٦ في الطلاق، عن مالك به.



**١٦٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُلاَعِنُ امْرَأَتَهُ فَيَنْزِعُ، وَيُكَذِّبُ نَفْسَهُ بَعْدَ يَمِينٍ أَوْ يَمِينَيْنِ مَا لَمْ يَلْتَعِنْ فِي الْخَامِسَةِ: إِنَّهُ إِذَا نَزَعَ قَبْلَ أَنْ يَلْتَعِنَ جُلِدَ الْحَدَّ، وَلَمْ يُفَرَّقْ بَيْنَهُمَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی مولاعەنە لەگەڵ خێزانەکەی دەکات و (لەناو سوێندی لیعانکردن) پەشیمان دەبێتەوە و خۆی بەدرۆ دەخاتەوە دوای ئەوەی سوێندێك یان دوو سوێندی خواردووە مادەم لە لیعان نەگەیشتبێتە پێنجەم، گوتوویەتی: ئەگەر پەشیمان بۆیەوە دوای ئەوەی لیعانی کرد (واتە دوای ئەوەی هەندێك لە سوێندەکانی لیعانی خوارد) ئەوە قامچی سزای شەرعی لێ دەدرێت (کە بریتییە لە هەشتا قامچی بوهتان)، وە لەیەکدی جیا ناکرێنەوە (چونکە لیعانەکە تەواو نەبووە).

**١٦٥٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ، فَإِذَا مَضَتِ الثَّلاَثَةُ الأَشْهُرِ، قَالَتِ الْمَرْأَةُ: أَنَا حَامِلٌ، قَالَ: إِنْ أَنْكَرَ زَوْجُهَا حَمْلَهَا لاَعَنَهَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی خێزانەکەی تەڵاق دەدات، جا کاتێ سێ مانگ تێ پەڕ دەبێت ئافرەتەکە دەڵێت: من دووگیانم، گوتوویەتی: ئەگەر مێردەکەی نکوڵی بکات (بەوەی بڵێت منداڵەکە لە من نییە) ئەوە لیعان لەگەڵ ژنەکەی دەکات.

**١٦٥٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الأَمَةِ الْمَمْلُوكَةِ يُلاَعِنُهَا زَوْجُهَا ثُمَّ يَشْتَرِيهَا، إِنَّهُ لاَ يَطَؤُهَا، وَإِنْ مَلَكَهَا، وَذَلِكَ أَنَّ السُّنَّةَ مَضَتْ: أَنَّ الْمُتَلاَعِنَيْنِ لاَ يَتَرَاجَعَانِ أَبَدًا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئافرەتی کۆیلە کە هاوسەرەکەی لیعانی لەگەڵ بکات دواتریش بیکڕێتەوە، گوتوویەتی: نابێ جیماعی لەگەڵ بکات، هەرچەندە بووبێتە خاوەنیشی، لەبەر ئەوەی ڕێبازەکە ئاوا هاتووە: ژن و مێردی لیعانکەر هەرگیز ناگەڕێنەوە لای یەکدی (بۆ یەکدی حەڵاڵ نین لە ڕووی ژن و مێردایەتی).

**١٦٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا لاَعَنَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَلَيْسَ لَهَا إِلاَّ نِصْفُ الصَّدَاقِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر پیاو لیعانی لەگەڵ خێزانەكەی ئەنجام دا بەر لەوەی جیاعی لەگەڵ بكات، ئەوە لە نیوەی مارەیی زیاتر هیچی بۆ نییە.

## ١٤- میراتی منداڵی ئافرەتی مولاعەنەلەگەڵكراو[1]

**١٦٥٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ، وَوَلَدِ الزِّنَا: أَنَّهُ إِذَا مَاتَ وَرِثَتْهُ أُمُّهُ، حَقَّهَا فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى، وَإِخْوَتُهُ لأُمِّهِ حُقُوقَهُمْ، وَيَرِثُ الْبَقِيَّةَ مَوَالِي أُمِّهِ، إِنْ كَانَتْ مَوْلاَةً، وَإِنْ كَانَتْ عَرَبِيَّةً، وَرِثَتْ حَقَّهَا، وَوَرِثَ إِخْوَتُهُ لأُمِّهِ حُقُوقَهُمْ، وَكَانَ مَا بَقِيَ لِلْمُسْلِمِينَ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عورِوەی كوڕی زوبەیر ﷺ دەربارەی منداڵی ئافرەتی مولاعەنەكراو و دەربارەی منداڵی زینا دەیگوت: ئەگەر مرد دایكی میراتی لێ دەگرێ، پشكەكی لە قورئاندا باس كراوە (كە بریتییە شەشیەك یان سێیەك)، وە خوشك و براكانی لە دایك پشكی خۆیان میراتی لێ دەگرن (كە بریتییە لە شەشیەك ئەگەر یەك كەس بوو، یان سێیەك ئەگەر دوو و زیاتر بوون)، وە ماڵباتی ئازادكەرانی دایكی باقی میراتەكەی دیكە دەگرن ئەگەر (دایكی مردووەكە) كۆیلە ببوو، (بەڵام) ئەگەر ئازاد بووبێت و كۆیلە نەبووبێت ئەوە بەشەمیراتی خۆی دەگرێت و خوشك و براكانی لە دایكیش بەشی خۆیان دەگرن و ئەوەشی كە دەمێنێتەوە بۆ مسوڵمانانە (واتە بۆ خەزێنە و بەیتولمالی مسوڵمانانە).

**١٦٥٦-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَلَغَنِي عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، مِثْلُ ذَلِكَ، وَعَلَى ذَلِكَ أَدْرَكْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[3].

---

(١) ـ مِيرَاثُ وَلَدِ الْمُلاَعَنَةِ.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٧ في الطلاق؛ وفي: ٣٠٥٦ في الفرائض؛ والحدثاني: ٣٦٢ب في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣١٣١٦ في الفرائض، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٧ في الطلاق؛ وفي: ٣٠٥٦ في الفرائض؛ والحدثاني: ٣٦٢ب في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣١٣١٦ في الفرائض، كلهم عن مالك به.




واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ هەمان شتم پێ گەیشتووە، وە لەسەر ئەوەش گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (مەدینە).

## ١٥- تەڵاقی کچ[1]

**١٦٥٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِيَاسِ بْنِ الْبُكَيْرِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: طَلَّقَ رَجُلٌ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَنْكِحَهَا، فَجَاءَ يَسْتَفْتِي، فَذَهَبْتُ مَعَهُ أَسْأَلُ لَهُ، فَسَأَلَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَقَالاَ: لاَ نَرَى أَنْ تَنْكِحَهَا حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَكَ، قَالَ: فَإِنَّمَا طَلاَقِي إِيَّاهَا وَاحِدَةٌ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّكَ أَرْسَلْتَ مِنْ يَدِكَ مَا كَانَ لَكَ مِنْ فَضْلٍ[2].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیاسی کوڕی بوکەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك خێزانەکەی خۆی سێ بە سێ تەڵاق دا بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، دواتر پێی باش بوو هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە، جا هات پرسیاری کرد، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم پرسیارم بۆی دەکرد، جا پرسیاری لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و ئەبو هورەیرە ﷺ کرد، ئەوانیش گوتیان: بۆچوونمان وا نییە دروست بێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکەیت تا هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیکە دەکاتەوە، پیاوەکە گوتی: من یەك تەڵاقم داوە، ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: تۆ زیادەی خۆتت ڕەپێشی خۆت داوە (واتە: بە یەك تەڵاق بەتەواوی لێت جیا دەبێتەوە مادەم جیماعتان نەکردبێت، بۆیە دوو تەڵاقەکەی دیکە زیادەن کە خواردووتە).

**١٦٥٨-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا، قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا؟ قَالَ عَطَاءٌ: فَقُلْتُ: إِنَّمَا طَلاَقُ الْبِكْرِ وَاحِدَةٌ، فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ: إِنَّمَا أَنْتَ قَاصٌّ، الْوَاحِدَةُ تُبِينُهَا، وَالثَّلاَثَةُ تُحَرِّمُهَا، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ[3].

---

(١) ـ طَلَاقُ الْبِكْرِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٢٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٥ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨١ في الطلاق؛ والشافعي: ٤٦٦؛ وفي: ١٣٠٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٢ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٦ في الطلاق؛ والشافعي: ٤٦٧؛ وفي: ١٣٠٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ پرسیاری کرد دەربارەی پیاوێك کە خێزانەکەی خۆی سێ بە سێ تەڵاق بدات بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات؟ عەتاء دەڵێ: منیش گوتم: تەڵاقی کچ یەك دانەیە (بە یەك دانە بەیەکجاری تەڵاقی دەکەوێ، چ پێویست بەوە ناکات کە ئاخۆ یەك تەڵاقی خواردووە یان سێ)!، جا عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ پێی گوتم: تۆ تەنها چیرۆکگێڕەرەوە و ئامۆژگاریکاری (شەرعزان و زانا نیت، وردەکاری نازانی)، یەك تەڵاق بەتەواوی جیای دەکاتەوە (بەڵام ئەگەر بیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە پێویست ناکات هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیکە بکات، بەڵکوو دەتوانێت بە مارەکردنێکی نوێ و مارەییەکی نوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە)، (بەڵام هەرچی) سێ تەڵاقە ئەوە حەرامی دەکات (ناتوانێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە) تا هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی دیکە دەکات.

**١٦٥٩-** عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الأَشَجِّ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَعَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: فَجَاءَهُمَا مُحَمَّدُ بْنُ إِيَاسِ بْنِ الْبُكَيْرِ، فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَمَاذَا تَرَيَانِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ: إِنَّ هَذَا الأَمْرَ مَا لَنَا فِيهِ قَوْلٌ، فَاذْهَبْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَإِنِّي تَرَكْتُهُمَا عِنْدَ عَائِشَةَ ﷺ، فَسَلْهُمَا، ثُمَّ ائْتِنَا، فَأَخْبِرْنَا، فَذَهَبَ، فَسَأَلَهُمَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَفْتِهِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَدْ جَاءَتْكَ مُعْضِلَةٌ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: الْوَاحِدَةُ تُبِينُهَا، وَالثَّلاَثَةُ تُحَرِّمُهَا، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ مِثْلَ ذَلِكَ أَيْضًا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە بوکەیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەشەجەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە لە موعاویەی کوڕی ئەبو عەیاشی ئەنصارییەوە بەوەی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دانیشتبوو، دەڵێ:

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٠ في الطلاق؛ والشافعي: ١٣١٠؛ وأبو داود: الطلاق: ١٠، كلهم عن مالك به.

موحەممەدی کوڕی ئیاسی کوڕی بوکەیر ﷺ هات و گوتی: پیاوێکی خەڵکی دەشت خێزانەکەی سێ بە سێ تەڵاق داوە بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، جا چی دەڵێن (حوکمی چییە)؟ جا عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ گوتی: دەربارەی ئەو بابەتە ئێمە بۆچوونمان نییە، بڕۆ بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئەبو هورەیرە، من ئەوانم جێهێشت لەلای عائیشە (واتە لەلای عائیشە بوون) ﷺ، پرسیاریان لێ بکە و دواتر وەرە بۆ لای ئێمە و هەواڵەکە بە ئێمەش بدە، جا ڕۆیشت و پرسیاری لێ کردن، جا ئیبنو عەبباس ﷺ بە ئەبو هورەیرەی ﷺ گوت: ئەی ئەبو هورەیرە فەتوای بۆ بدە، پرسیارێکی قورست بۆ هاتووە، ئەبو هورەیرەش ﷺ گوتی: یەك تەڵاق بەتەواوی جیای دەکاتەوە، سێ تەڵاقیش (جیای دەکاتەوە و) حەڕامی دەکات تا هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی دیکە دەکات، ئیبنو عەبباسیش ﷺ هەمان شتی گوت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لەلای ئێمە لەسەر ئەو فەتوایەیە.

**١٦٦٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالثَّيِّبُ إِذَا مَلَكَهَا الرَّجُلُ، فَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا: إِنَّهَا تَجْرِي مَجْرَى الْبِكْرِ، الْوَاحِدَةُ تُبِينُهَا، وَالثَّلَاثُ تَحْرِمُهَا، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی بێوەژن کاتێ پیاو مارەی دەکات و جیماعی لەگەڵ ناکات حوکمەکەی وەك کچ وایە، یەك تەڵاق بەتەواوی جیای دەکاتەوە، سێ تەڵاقیش (جیای دەکاتەوە و) حەڕامی دەکات تا هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی دیکە دەکات.

## ١٦- تەڵاقی نەخۆش[2]

**١٦٦١-** أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﷺ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَوَرَّثَهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ مِنْهُ، بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣١ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ طَلَاقُ الْمَرِيضِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٧ في الطلاق؛ والشيباني:

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ خێزانەکەی خۆی بەتەواوی تەڵاق دا لە کاتێکدا عەبدوڕڕەحمان خۆی لە نەخۆشی مردندا بوو، جا عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ ئافرەتەکەی کردە میراتگری عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ، دوای تەواوبوونی عیدەکەی (چونکە تەڵاقەکە لە کاتی نەخۆشیی مردن بوو).

**١٦٦٢-** عَنِ الأَعْرَجِ ﷺ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ وَرَّثَ نِسَاءَ ابْنِ مُكْمِلٍ مِنْهُ، وَكَانَ طَلَّقَهُنَّ وَهُوَ مَرِيضٌ[1].

واتە: لە ئەعرەجەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ خێزانەکانی ئیبنو موکمیلی کردن بە میراتگری مێردەکەیان، لە کاتێکدا تەڵاقی دابوون کاتێ نەخۆش بوو.

**١٦٦٣-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: بَلَغَنِي أَنَّ امْرَأَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَأَلَتْهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا، فَقَالَ: إِذَا حِضْتِ ثُمَّ طَهُرْتِ، فَآذِنِينِي، فَلَمْ تَحِضْ حَتَّى مَرِضَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَلَمَّا طَهُرَتْ آذَنَتْهُ، فَطَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، أَوْ تَطْلِيقَةً لَمْ يَكُنْ بَقِيَ لَهُ عَلَيْهَا مِنَ الطَّلَاقِ غَيْرُهَا، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ يَوْمَئِذٍ مَرِيضٌ، فَوَرَّثَهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ مِنْهُ، بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عەبدوڕڕەحمان بووە دەیگوت: پێم گەیشتووە خێزانی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف داوای لە عەبدوڕڕەحمان کردووە تەڵاقی بدات، ئەویش گوتی: ئەگەر تووشی حەیز بوویت و دواتر پاك بوویەوە ئاگادارم بکەوە، جا هێشتا تووشی حەیز نەببوو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف نەخۆش کەوت، جا کاتێ پاك بۆیەوە عەبدوڕڕەحمانی ئاگادار کردەوە، جا بەیەکجاری تەڵاقی دا ـ یان یەك تەڵاقی دا کە لەو تەڵاقە زیاتری نەمابوو (پێشتر دوو تەڵاقی دابوو) ـ، لە کاتێکدا عەبدوڕڕەحمانی

---

٥٧٥ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٧أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٦ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٥ في الطلاق، عن مالك به.

کوڕی عەوف ﷺ لەو ڕۆژەدا نەخۆش بوو، جا (لەبەر ئەوەی لە حاڵەتی نەخۆشیی مردندا تەڵاقی دا) عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ ئافرەتەکەی کرد بە میراتگری، دوای تەواوبوونی عیدەکەی.

١٦٦٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ عِنْدَ جَدِّي حَبَّانَ، امْرَأَتَانِ: هَاشِمِيَّةٌ، وَأَنْصَارِيَّةٌ، فَطَلَّقَ الأَنْصَارِيَّةَ، وَهِيَ تُرْضِعُ، فَمَرَّتْ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ هَلَكَ عَنْهَا، وَلَمْ تَحِضْ، فَقَالَتْ: أَنَا أَرِثُهُ لَمْ أَحِضْ، فَاخْتَصَمَتَا إِلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، فَقَضَى لَهَا بِالْمِيرَاثِ، فَلاَمَتِ الْهَاشِمِيَّةُ عُثْمَانَ ﷺ، فَقَالَ عُثْمَانُ ﷺ: هَذَا عَمَلُ ابْنِ عَمِّكِ، هُوَ أَشَارَ عَلَيْنَا بِهَذَا، يَعْنِي عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ [1].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حەبانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: حەبانی باپیرم دوو خێزانی هەبوون: هاشمییە و ئەنصارییە بوون، جا ئەنصارییەی تەڵاق دا، لە کاتێکدا شیری دەدا بە منداڵ، جا ساڵێکی بەسەردا تێ پەڕی، دواتر حەبان وەفاتی کرد و ئەنصارییەش تووشی حەیز نەبوو (لەبەر شیردانەکە) جا گوتی: منیش میراتی لێ دەگرم خۆ تووشی حەیز نەبووم (عیدەم نەبینیوە)، جا هاشمییە و ئەنصارییە کێشەکەیان بردە لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ، ئەویش بڕیاری بۆ دا بەوەی میرات دەگرێ، جا هاشمییە لۆمەی ئیمامی عوسمانی ﷺ کرد، جا ئیمامی عوسمان ﷺ گوتی: ئەوە کردار و ڕێبازی کوڕی مامتە ئەو بەو شێوەیە ئاڕاستەی کردووین، واتە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ.

١٦٦٥- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ يَقُولُ: إِذَا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا وَهُوَ مَرِيضٌ، فَإِنَّهَا تَرِثُهُ [2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئیبنو شیهاب بووە دەیگوت: ئەگەر پیاو خێزانەکەی بە سێ تەڵاق تەڵاق دا لە کاتێکدا پیاوەکە لە نەخۆشیی وەفاتدا بوو، ئەوە ئافرەتەکە میراتی لێ دەگرێت.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٧ب في الطلاق؛ والشيباني: ٦١٠ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٢٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٧ في الطلاق، عن مالك به.

**١٦٦٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ طَلَّقَهَا وَهُوَ مَرِيضٌ قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَلَهَا نِصْفُ الصَّدَاقِ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَلاَ عِدَّةَ عَلَيْهَا، وَإِنْ دَخَلَ بِهَا ثُمَّ طَلَّقَهَا، فَلَهَا الْمَهْرُ كُلُّهُ، وَالْمِيرَاثُ، الْبِكْرُ وَالثَّيِّبُ فِي هَذَا عِنْدَنَا سَوَاءٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر پیاو خێزانەکەی تەڵاق دا بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، لە کاتێکدا پیاوەکە لە نەخۆشیی سەرەمەرگدا بوو، ئەوە ئافرەتەکە نیوەی مارەیی بۆ هەیە، وە میراتیشی بۆ هەیە، عیدەشی لەسەر نییە، وە ئەگەر جیماعی لەگەڵ کردبوو دواتر تەڵاقی دابوو، ئەوە گشت مارەییەکەی بۆ هەیە، وە میراتیشی بۆ هەیە، لەوەدا جیاوازی نییە لەلای ئێمە لە نێوان کچ و بێوەژندا.

## ١٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخششی تەڵاقدان[1]

**١٦٦٧**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﷺ طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ، فَمَتَّعَ بِوَلِيدَةٍ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە (گوتوویەتی): عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ خێزانێکی خۆی تەڵاق دا و ئافرەتێکی کۆیلەی پێ بەخشی.

**١٦٦٨**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لِكُلِّ مُطَلَّقَةٍ مُتْعَةٌ، إِلاَّ الَّتِي تُطَلَّقُ وَقَدْ فُرِضَ لَهَا صَدَاقٌ، وَلَمْ تُمَسَّ، فَحَسْبُهَا نِصْفُ مَا فُرِضَ لَهَا[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: گشت ئافرەتێکی تەڵاقدراو بەخششێکی بۆ هەیە، تەنها ئەو ئافرەتە نەبێت کە مارەیی بۆ داندراوە و جیماعیشی لەگەڵ نەکراوە، ئەوە نیوەی ئەو مارەییەی بۆی دیاری کراوە بەسیەتی.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي مُتْعَةِ الطَّلَاقِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٨ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨٨ في الطلاق؛ والشافعي: ٧٤١؛ وفي: ١١٤٢، كلهم عن مالك به.

**١٦٦٩-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّهُ قَالَ: لِكُلِّ مُطَلَّقَةٍ مُتْعَةٌ[١].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە رەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گشت ئافرەتێكی تەڵاقدراو ئەندازەیەك بەخششی بۆ هەیە.

**١٦٧٠-** قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللَّهُ: وَبَلَغَنِي عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ رَحِمَهُ اللَّهُ مِثْلُ ذَلِكَ.

واتە: ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێبێت گوتوویەتی: هەمان شتم لە قاسمی كوڕی موحەممەدەوە رەحمەتی خوای لێبێت پێ گەیشتووە.

**١٦٧١-** قَالَ مَالِكٌ رَحِمَهُ اللَّهُ: لَيْسَ لِلْمُتْعَةِ عِنْدَنَا حَدٌّ مَعْرُوفٌ فِي قَلِيلِهَا وَلاَ كَثِيرِهَا[٢].

واتە: ئیمامی مالیك رەحمەتی خوای لێبێت گوتوویەتی: هیچ ئەندازەیەكی دیاریكراومان نییە بۆ ئەندازەی بەخششی ئافرەتی تەڵاقدراو، نە لە كەمییەكەی و نە لە زۆرییەكەی.

## ١٨- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەڵاقی كۆیلە[٣]

**١٦٧٢-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، أَنَّ نُفَيْعًا مُكَاتَبًا كَانَ لأُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَوْ عَبْدًا لَهَا، كَانَتْ تَحْتَهُ امْرَأَةٌ حُرَّةٌ، فَطَلَّقَهَا اثْنَتَيْنِ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَأَمَرَهُ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْتِيَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَيَسْأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَلَقِيَهُ عِنْدَ الدَّرَجِ، آخِذًا بِيَدِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَسَأَلَهُمَا، فَابْتَدَرَاهُ جَمِيعًا، فَقَالاَ: حَرُمَتْ عَلَيْكَ، حَرُمَتْ عَلَيْكَ[٤].

واتە: لە سولەیمانی كوڕی یەسارەوە رەحمەتی خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): نوفەیع كۆیلەی نووسراوپێدراوی ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم بوو ـ یان كۆیلەی تەواوی بوو ـ جا خێزانێكی ئازادی هەبوو و تەڵاقی دا بە دوو تەڵاق، دواتر ویستی بیگەڕێنێتەوە، جا خێزانەكانی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرمانیان بە نوفەیع كرد

---

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٨ب في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي طَلَاقِ الْعَبْدِ.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٨ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٩ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٥٥ في الطلاق؛ وفي: ٥٥٦ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٦، كلهم عن مالك به.




بچێتە لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ و پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەو بابەتە، جا لەلای پەیژەکە گەیشت بە ئیمامی عوسمان ﷺ لە کاتێکدا ئیمامی عوسمان دەستی زەیدی کوڕی سابیتی گرتبوو، جا پرسیاری لە هەردووکیان کرد، جا هەردووکیان زوو وەڵامیان دایەوە و گوتیان: لەسەرت حەڕام بووە، لەسەرت حەڕام بووە (ناتوانیت بیگەڕێنیتەوە، چونکە تەڵاقی کۆیلە بریتییە لە دوو تەڵاق).

**١٦٧٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ نُفَيْعًا مُكَاتَبًا كَانَ لأُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ طَلَّقَ امْرَأَةً حُرَّةً تَطْلِيقَتَيْنِ، فَاسْتَفْتَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ، فَقَالَ: حَرُمَتْ عَلَيْكَ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): نوفەیع کۆیلەی نووسراوپێدراوی ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا ئافرەتێکی ئازادی تەڵاق دا بە دوو تەڵاق، جا پرسیاری لە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ کرد، (ئیمامی عوسمانیش ﷺ) گوتی: لەسەرت حەڕام بووە (خێزانت نەماوە، چونکە پیاوی کۆیلە دوو تەڵاقی هەیە).

**١٦٧٤-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ التَّيْمِيِّ ﷺ، أَنَّ نُفَيْعًا مُكَاتَبًا كَانَ لأُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، اسْتَفْتَى زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي طَلَّقْتُ امْرَأَةً حُرَّةً تَطْلِيقَتَيْنِ، فَقَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ: حَرُمَتْ عَلَيْكَ[2].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حاریسی تەیمییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): نوفەیع کۆیلەی نووسراوپێدراوی ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو، جا پرسیاری لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ کرد و گوتی: من ئافرەتێکی ئازادم تەڵاق داوە بە دوو تەڵاق (حوکمم چۆنە)؟ زەیدی کوڕی سابیتیش ﷺ گوتی: لەسەرت حەڕام بووە (خێزانت نەماوە، چونکە پیاوی کۆیلە تەنها دوو تەڵاقی هەیە).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٢ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٩أ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٧، عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٣٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٩ب في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٥، كلهم عن مالك به.

١٦٧٥- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا طَلَّقَ الْعَبْدُ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَتَيْنِ، فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْهِ، حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ، حُرَّةً كَانَتْ أَوْ أَمَةً، وَعِدَّةُ الْحُرَّةِ ثَلاَثُ حِيَضٍ، وَعِدَّةُ الأَمَةِ حَيْضَتَانِ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: کاتێ پیاوی کۆیلە خێزانەکەی تەڵاق دا بە دوو تەڵاق، ئەوە لێی حەڕام بووە تا مێردێکی دیکە دەکاتەوە، جا (جیاوازی نییە) ئافرەتەکە ئازاد بێت یان کۆیلە، وە عیدەی ئافرەتی ئازاد سێ حەیزە، عیدەی ئافرەتی کۆیلەش دوو حەیزە.

١٦٧٦- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَذِنَ لِعَبْدِهِ أَنْ يَنْكِحَ، فَالطَّلاَقُ بِيَدِ الْعَبْدِ، لَيْسَ بِيَدِ غَيْرِهِ مِنْ طَلاَقِهِ شَيْءٌ، فَأَمَّا أَنْ يَأْخُذَ الرَّجُلُ أَمَةَ غُلاَمِهِ، أَوْ أَمَةَ وَلِيدَتِهِ، فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: هەر کەسێك مۆڵەت بە کۆیلەکەی بدات ژن بێنێت، ئەوە تەڵاق بە دەستی کۆیلەکەیەتی (چونکە خوای پەروەردگار ﷻ خستوویەتە دەستی کەسەکە خۆی)، هیچ لە تەڵاقەکانی بە دەستی کەسی جگە لە خۆی نییە (با کەسەکە سەید و گەورە و خاوەنیشی بێت)، بەڵام هەرچی بردنی جارییەی کۆیلەکەیەتی یان بردنی جارییەی جارییەکەی، ئەوە تاوانی تیا نییە (چونکە ئەوان موڵکی گەورەکەن جا هەر شتێکیان هەبێ ئەوانیش موڵکی گەورەکەن).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٠ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٩ج في الطلاق؛ والشيباني: ٥٥٧ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٥٩د في الطلاق؛ والشيباني: ٥٦٠ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٤، كلهم عن مالك به.

## ١٩- نەفەقەی ئافرەتی کۆیلە کاتێ تەلاق دەدرێت لە کاتێکدا دووگیانە[١]

**١٦٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لَيْسَ عَلَى حُرٍّ وَلاَ عَبْدٍ طَلَّقَا مَمْلُوكَةً، وَلاَ عَلَى عَبْدٍ طَلَّقَ حُرَّةً طَلاَقًا بَائِنًا، نَفَقَةٌ، وَإِنْ كَانَتْ حَامِلاً، إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نە کەسی ئازاد نە کەسی کۆیلە کە ئافرەتێکی کۆیلە تەڵاق بدەن، وە نە کەسی کۆیلە کە ئافرەتێکی ئازاد تەڵاق بدات، نەفەقەیان لەسەر نییە، هەرچەندە ئافرەتەکەش دووگیان بێ، (بە مەرجێك) ئەگەر پیاوەکە ڕیجعە و گەڕاندنەوەی ئافرەتەکەی نەمابێت.

**١٦٧٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَيْسَ عَلَى حُرٍّ أَنْ يَسْتَرْضِعَ ابْنَهِ، وَهُوَ عِنْدَ قَوْمٍ آخَرِينَ، وَلاَ عَلَى عَبْدٍ أَنْ يُنْفِقَ مِنْ مَالِهِ عَلَى مَن لاَ يَمْلِكُ سَيِّدُهُ، إِلاَّ بِإِذْنِ سَيِّدِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچ کەسێکی ئازاد لەسەری واجب نییە دایەن و شیردەر بۆ منداڵەکەی بگرێت لە کاتێکدا منداڵەکەی لەلای خەڵکانێکی دیکەیە (واتە لە کاتێکدا کۆیلەی خەڵکی دیکەیە، دەبێ ئەوان ئەو شتانەی بۆ بکەن)، وە هیچ کۆیلەیەکیش لەسەری نییە لە سەروەتی خۆی مەسرەفی کەسێك و شتێك بکێشێت کە موڵکی گەورەکەی نییە، تەنها بە مۆڵەتی گەورەکەی نەبێ.

## ٢٠- عیدەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی ون دەکات[٣]

**١٦٧٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ فَقَدَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ تَدْرِ أَيْنَ هُوَ؟ فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ أَرْبَعَ سِنِينَ، ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، ثُمَّ تَحِلُّ[٤].

---

(١) ـ نَفَقَةُ الأَمَةِ إِذَا طُلِّقَتْ وَهِيَ حَامِلٌ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٤٩ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ عِدَّةُ الَّتِي تَفْقِدُ زَوْجَهَا.

(٤) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٠ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٠ في الطلاق، عن مالك به.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر ئافرەتێك پیاوەکەی ون بوو و نەیزانی لە کوێیە (نەیزانی ماوە یان نەماوە)؟ ئەوە چوار ساڵ چاوەڕێ دەکات، دواتر چوار مانگ و دە ڕۆژ عیدە دەبینێت، دواتر حەڵاڵ دەبێت (بۆ شووکردنەوە).

**١٦٨٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ تَزَوَّجَتْ بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا، فَدَخَلَ بِهَا زَوْجُهَا أَوْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا، فَلاَ سَبِيلَ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ إِلَيْهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا، وَإِنْ أَدْرَكَهَا زَوْجُهَا قَبْلَ أَنْ تَتَزَوَّجَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر (ئەو ئافرەتەی مێردەکەی چوار ساڵە ون بووە) دوای تەواوبوونی عیدەکەی مێردی کردەوە، جا مێردی (دووەمی) چ جیماعی لەگەڵ کردبێت یان جیماعی لەگەڵ نەکردبێت (مێردی یەکەمی پەیدا بۆیەوە)، ئەوە مێردی یەکەمی هیچ دەسەڵاتێکی بەسەردا نییە (تازە خێزانی ئەو نەماوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە، جا ئەگەر مێردەکەی هاتەوە و پێی ڕاگەیشت بەر لەوەی مێرد بکاتەوە، ئەوە ئەو لە هەموو کەس شایستەترە پێی (هەر خێزانی خۆیەتی).

**١٦٨١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَدْرَكْتُ النَّاسَ يُنْكِرُونَ الَّذِي قَالَ بَعْضُ النَّاسِ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، أَنَّهُ قَالَ: يُخَيَّرُ زَوْجُهَا الأَوَّلُ إِذَا جَاءَ فِي صَدَاقِهَا أَوْ فِي امْرَأَتِهِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە زانایان گەیشتووم ئینکاری و نکوڵییان کردووە لەوەی هەندێ لە خەڵکی فەتوای هەڵبەستراو دەدەنە پاڵ ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کە گوایە گوتبێتی: (دوای شووکردنەوەی ئافرەتەکە ئەگەر مێردی یەکەمی گەڕایەوە) ئەوە مێردی یەکەمی سەرپشك دەبێت لەوەی مارەیی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥١ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٢ في الطلاق، عن مالك به.




ئافرەتەکە وەربگرێت (لەبری ئافرەتەکە) یانیش ئافرەتەکە وەردەگرێتەوە (ئەو قسە هەڵبەستراوە).

**١٦٨٢**- [بلاغ] قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَبَلَغَنِي أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ فِي الْمَرْأَةِ يُطَلِّقُهَا زَوْجُهَا وَهُوَ غَائِبٌ عَنْهَا، ثُمَّ يُرَاجِعُهَا، فَلاَ يَبْلُغُهَا رَجْعَتُهُ، وَقَدْ بَلَغَهَا طَلاَقُهُ إِيَّاهَا، فَتَزَوَّجَتْ: أَنَّهُ إِنْ دَخَلَ بِهَا زَوْجُهَا الآخَرُ أَوْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا، فَلاَ سَبِيلَ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ الَّذِي كَانَ طَلَّقَهَا إِلَيْهَا.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ، فِي هَذَا وَفِي الْمَفْقُودِ[١].

واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: پێم گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەربارەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی تەڵاقی دەدات لە کاتێکدا پیاوەکە غائیبە (لە مەملەکەتێکی دیکەیە)، دواتر دەیگەڕێنێتەوە، جا هەواڵی گەڕاندنەوەکە ناگات بە ئافرەتەکە، لە کاتێکدا هەواڵی تەڵاقەکە گەیشتووە بە ئافرەتەکە، بۆیە ئافرەتەکە شووی کردەوە، گوتوویەتی: ئەگەر مێردی دووەم چ جیماعی لەگەڵ کردبێ یانیش جیماعی لەگەڵ نەکردبێ (مێردی یەکەم گەڕایەوە و گوتی من ڕیجعە و گەڕاندنەوەی ئافرەتەکەمم ئەنجام دابوو)، ئەوە مێردی یەکەم هیچ ڕێیەکی بۆ نییە و تەڵاقی داوە (تازە خێزانی ئەو نەماوە)[٢].

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە خۆشەویستترینی ئەوەیە لەلام کە گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو کەسە (واتە دەربارەی تەڵاقی غائیب) و دەربارەی پیاوی ونبوو.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٣ في الطلاق؛ وفي: ١٦٥٤ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: ئەو گێڕانەوەیە پشتڕاستکەرەوەی ئەوەی پێشووە کە گوتی: فەتوای هەڵبەستراوە بە دەمی ئیمامی عومەر ﵁ بەوەی پیاوی یەکەمی کردبێتە سەرپشك لە نێوان مارەیی و ئافرەتەکە، چونکە ئەگەر ڕاستبووایە لێرە شایستەتر بوو.

## ٢١- ئەوەی هاتووە دەربارەی قورئەكان لە عیدەی تەڵاق و دەربارەی تەڵاقی ئافرەتی حەیزدار[1]

**١٦٨٣- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ يُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ[2].**

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خێزانەكەی خۆی تەڵاق دا لە كاتێكدا لە حەیزدا بوو، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ پرسیاری ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: فەرمانی پێ بكە با بیگەڕێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی، دواتر لەلای خۆی بیهێڵێتەوە تا لە حەیز پاك دەبێتەوە، دواتر تووشی حەیز دەبێتەوە، دواتر پاك دەبێتەوە، دواتر ئەگەر ویستی دەیهێڵێتەوە (تەڵاقی نادات)، ئەگەر ویستیشی (تەڵاقی بدات) ئەوە تەڵاقی دەدات بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بكات، جا ئەوە بریتییە لەو كاتەی كە خوای پەروەردگار ﷻ فەرمانی كردووە ئافرەتی تێدا تەڵاق بدرێت (ئەوە شێوازی شەرعییە).

**١٦٨٤- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّهَا انْتَقَلَتْ حَفْصَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، حِينَ دَخَلَتْ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ.**

**قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَذُكِرَ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَتْ: صَدَقَ عُرْوَةُ، وَقَدْ جَادَلَهَا فِي ذَلِكَ نَاسٌ، فَقَالُوا: إِنَّ اللهَ ﷻ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾﴾ البقرة فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: صَدَقْتُمْ، وَتَدْرُونَ مَا الأَقْرَاءُ؟ إِنَّمَا الأَقْرَاءُ الأَطْهَارُ[3].**

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْأَقْرَاءِ فِي عِدَّةِ الطَّلَاقِ وَطَلَاقِ الْحَائِضِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦١ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٥٤ في الطلاق؛ والشافعي: ٤٦٣؛ وفي: ٩٤٥؛ وابن حنبل: ٥٢٩٩؛ والبخاري: ٥٢٥١؛ ومسلم: الطلاق: ١؛ والنسائي: ٣٣٩٠ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢١٧٩ في الطلاق؛ والدارمي: ٢٢٦٢ في الطلاق؛ والقابسي: ٢٣٣، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦١أ في الطلاق؛ والشيباني:

واتە: لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕاویەتەوە بەوەی (گوتوویەتی): عائیشە ﷺ حەفصەی کچی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری صددیقی (لە ماڵی مێردی) گواستەوە (بەو پێیەی عیدەی تەواو بووە) کاتێ کەوتە ناو خوێنی حەیزی سێیەمەوە (دوای ئەوەی مونزیری کوڕی زوبەیر تەڵاقی دابوو).

ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: جا ئەوە بۆ عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان باس کرا (کە ئاگای لە فەرموودەکانی عائیشە ﷺ هەیە) گوتی: عورووە ڕاست دەکات، (ئەو کات) هەندێك لە خەڵکیش مناقەشەیان لەگەڵ عائیشە ﷺ کرد دەربارەی ئەوە و گوتیان: خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەفەرمووێت: ﴿ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾﴾ [سێ قوڕء ]، عائیشەش ﷺ گوتی: ڕاست دەکەن، (بەڵام) دەزانن قوڕئەکان چین؟ قوڕئەکان بریتین لە پاکبوونەوەکان (سێ پاکبوونەوەکانیش هاتوونەتە دی: لەناو پاکی تەڵاقدراوە، ئەوە یەکیان، دواتر تووشی حەیزی یەکەم بووە و پاك بۆتەوە، ئەوە دوو پاکبوونەوە، دواتر تووشی حەیز بووە و پاك بۆتەوە و پاکبوونەوەکەی پڕ کردووە بە چوونە ناو حەیزی سێیەم، ئەوە سێ پاکیی ڕێك، سێ قوڕئەکان هاتوونەتە جێ).

**١٦٨٥**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ يَقُولُ: مَا أَدْرَكْتُ أَحَدًا مِنْ فُقَهَائِنَا، إِلاَّ وَهُوَ يَقُولُ هَذَا، يُرِيدُ قَوْلَ عَائِشَةَ ﷺ [1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ بوو دەیگوت: گەیشتبم بە هەر زانایێکی شەرعزانی خۆمان حەتمەن ئەو قسەیەی کردووە، مەبەستی قسەکەی عائیشەیە (واتە گشتیان گوتوویانە: سێ قوڕئەکان بریتین لە سێ پاکبوونەوە).

---

٦٠٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٨، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٧ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦١ب في الطلاق؛ والشافعي: ١٤١٩، كلهم عن مالك به.

١٦٨٦- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ الأَحْوَصَ هَلَكَ بِالشَّامِ، حِينَ دَخَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، وَقَدْ كَانَ طَلَّقَهَا، فَكَتَبَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ زَيْدٌ ﷺ: إِنَّهَا إِذَا دَخَلَتْ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ، وَبَرِئَ مِنْهَا، وَلاَ تَرِثُهُ وَلاَ يَرِثُهَا(١).

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەحوەص لە شام وەفاتی کرد کاتێ خێزانەکەی کەوتە ناو خوێنی حەیزی سێیەمەوە، لە کاتێکدا پێشتر تەڵاقی دابوو، جا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ نامەیەکی بۆ زەیدی کوڕی سابیت ﷺ نووسی پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو بابەتە: زەیدیش ﷺ بۆی نووسی: ئەگەر ئافرەتەکە کەوتە ناو خوێنی حەیزی سێیەم، ئەوە لە پیاوەکەی بەری بووە و پیاوەکەش لەو بەری بووە و میراتیش لە یەکدی ناگرن.

١٦٨٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، وَابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا دَخَلَتِ الْمُطَلَّقَةُ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَانَتْ مِنْ زَوْجِهَا، وَلاَ مِيرَاثَ بَيْنَهُمَا، وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْهَا(٢).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە قاسمی کوڕی موحەممەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا و ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕڕەحمان و سولەیمانی کوڕی یەسار و ئیبنو شیهابەوە ﷺ پێی گەیشتووە دەیانگوت: کاتێ ئافرەتی تەڵاقدراو دەچێتە ناو خوێنی حەیزی سێیەمەوە، ئەوە (بەتەواوی) لە هاوسەرەکەی جیا بۆتەوە و میراتیان لە نێواندا نییە و پیاوەکەش گەڕاندنەوەی ژنەکەی بۆ نییە.

١٦٨٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ، فَدَخَلَتْ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ، وَبَرِئَ مِنْهَا(٣).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٨ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٢ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٠٥ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٢١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٥٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٢أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٦٢ج في الطلاق، عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەگەر پیاو خێزانەکەی تەڵاق دا و کەوتە ناو خوێنی حەیزی سێیەمەوە، ئەوە (بەتەواوی) لە پیاوەکەی بەری بووە و پیاوەکەش لەو بەری بووە (بۆی هەیە شوو بکاتەوە).

١٦٨٩- أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ ﷺ كَانَا يَقُولَانِ: إِذَا طُلِّقَتِ الْمَرْأَةُ، فَدَخَلَتْ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَانَتْ مِنْهُ وَحَلَّتْ(١).

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەیانگوت: کاتێ ئافرەت تەڵاق درا و چووە ناو خوێنی حەیزی سێیەمەوە، ئەوە بەتەواوەتی لە پیاوەکە جیا بۆتەوە و حەڵاڵ بووە (بۆ پیاوی دیکە، چونکە قورء لەلای ئەوان پاکبوونەوەیە نەك حەیز)(٢).

١٦٩٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَابْنِ شِهَابٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: عِدَّةَ الْمُخْتَلِعَةِ ثَلَاثَةُ قُرُوءٍ(٣).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و ئیبنو شیهاب و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ پێی گەیشتووە دەیانگوت: عیدەی ئەو ئافرەتەی خولع دەکات و خۆی دەکڕێتەوە بریتییە لە سێ قورء.

١٦٩١- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ يَقُولُ: عِدَّةُ الْمُطَلَّقَةِ الْأَقْرَاءُ، وَإِنْ تَبَاعَدَتْ(٤).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئیبنو شیهاب ﷺ بووە دەیگوت: عیدەی ئافرەتی تەڵاقدراو بە قوڕئە، هەرچەندە قوڕئەکانیش لێك دوور بن.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٢ د في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: حیسابکردنی سێ قورئەکان کە بریتین لە سێ پاکبوونەوە بەو شێوەیەیە: دەبێ ئافرەت بەپاکییەتی تەڵاق بدرێت، جا ئەو پاکییەتییەی بۆ حیسابە، ئەوە یەك قورء ، ئینجا تووشی حەیز دەبێت و دواتر پاك دەبێتەوە، ئەوە دوو پاکبوونەوە دوو قورء ، دواتر تووشی حەیز دەبێت و پاك دەبێتەوە و دەبێ ئەو پاکبوونەوەیە تەواو بکات ئەوەش بەوە دەبێت بچێتە ناو حەیزی سێیەمەوە، جا کە چووە ناو حەیزی سێیەم دەبێتە سێ پاکبوونەوە، کە بریتییە لە سێ قورء.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦١٥ في الطلاق؛ وفي: ١٦٦٢ في الطلاق؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٩٢٨٩ في الصيام، وفي، ١٨٤٥٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٣ في الطلاق، عن مالك به.

**١٦٩٢-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، أَنَّ امْرَأَتَهُ سَأَلَتْهُ الطَّلاَقَ، فَقَالَ لَهَا: إِذَا حِضْتِ فَآذِنِينِي، فَلَمَّا حَاضَتْ آذَنَتْهُ، فَقَالَ: إِذَا طَهُرْتِ فَآذِنِينِي، فَلَمَّا طَهُرَتْ آذَنَتْهُ، فَطَلَّقَهَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی پیاوێك لە ئەنصارییەكان گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): خێزانەكەی داوای تەڵاقی لێ كرد، ئەویش پێی گوت: ئەگەر كەوتیتە ناو حەیز ئاگادارم بكەوە، جا كاتێ كەوتە ناو حەیز ئاگاداری كردەوە، جا پیاوەكە گوتی: ئەگەر پاك بوویتەوە ئاگادارم بكەوە، جا كاتێ پاك بۆیەوە ئاگاداری كردەوە، جا تەڵاقی دا.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم دەربارەی ئەو بابەتە.

## ٢٢- دەربارەی عیدەی ئافرەت لەماڵەكەیدا كاتێ تیایدا تەڵاق دەدرێت[2]

**١٦٩٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُ سَمِعَهُمَا يَذْكُرَانِ، أَنَّ يَحْيَى بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ طَلَّقَ ابْنَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَكَمِ الْبَتَّةَ، فَانْتَقَلَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْحَكَمِ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فقَالَتِ: اتَّقِ اللهَ وَارْدُدِ الْمَرْأَةَ إِلَى بَيْتِهَا، فَقَالَ مَرْوَانُ فِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ: إِنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ غَلَبَنِي، وَقَالَ مَرْوَانُ فِي حَدِيثِ الْقَاسِمِ: أَوَمَا بَلَغَكِ شَأْنُ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لاَ يَضُرُّكَ أَنْ لاَ تَذْكُرَ حَدِيثَ فَاطِمَةَ، فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنْ كَانَ بِكِ الشَّرُّ، فَحَسْبُكِ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ مِنَ الشَّرِّ[3].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٤ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ فِي عِدَّةِ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا إِذَا طُلِّقَتْ فِيهِ.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٧ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩١ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٤٦؛ والبخاري: ٥٣٢١ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢٢٩٥ في الطلاق، كلهم عن مالك به.



واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش گوێی لە قاسمی كوڕی موحەممەد و سولەیمانی كوڕی یەسار بووە باسیان دەكرد (دەیانگوت): یەحیای كوڕی سەعیدی كوڕی عاص كچی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حەكەمی بەیەكجاری تەڵاق دا، جا عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حەكەم ئافرەتەكەی (لە ماڵەكەی گواستەوە بە بەهانەی ئەوەی عیدەی تەواو بووە)، جا عائیشەی دایكی باوەڕداران بەدوای مەڕوانی كوڕی حەكەمیدا نارد كە لەو ڕۆژگارەدا گەورە و كاربەدەستی مەدینە بوو و پێی گوت: لە خوا بترسە و ئافرەتەكە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەكەی، جا (لە گێڕانەوەكەی سولەیماندا) مەڕوان گوتوویەتی: عەبدوڕڕەحمان بەسەرمدا زاڵ بوو، وە (لە گێڕانەوەی قاسمدا) گوتوویەتی: مەگەر بابەتی فاتیمەی كچی قەیست پێ نەگەیشتووە (كە لە ماڵی مێردی عیدەی نەكرد لە شوێنی دیكە عیدەی كرد)؟ عائیشەش گوتی: بابەتی فاتیمە باس نەكەیت بێزیانترە بۆت (بابەتی ئەو مەكە بەگشتی ئەو هۆكاری تایبەتی هەبوو، خراپییەك بوونی هەبوو، مەصڵەحەت لەوەدا بوو لە ماڵی مێردی نەمێنێتەوە)، مەڕوانیش گوتی: ئەگەر (هۆكارێكی) خراپت داناوە (بۆ گواستنەوەی فاتیمە و شەرعییەتدانی ئەو بابەتە) ئەوە هەمان خراپەی بەینی ئەو ژن و مێردە بەسە بۆت (تا شەرعییەت بدەیت بەوانیش).

١٦٩٤- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ بِنْتَ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ كَانَتْ تَحْتَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَطَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، فَانْتَقَلَتْ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ (١).

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): كچی سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل لەژێر نیكاحی عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عوسمانی كوڕی عەففاندا بوو، جا بە تەواوی تەڵاقی دا، ئافرەتەكەش لە خانووەكە ڕۆیشت، جا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ ئینكاری لە ئافرەتەكە كرد (پێی كارێكی ناڕەوا بوو، چونكە دەبێ تا عیدە تەواو دەبێ لە ماڵی مێردی بمێنێتەوە).

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٨ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٢ في الطلاق، عن مالك به.

**١٦٩٥-** عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ فِي مَسْكَنِ حَفْصَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ طَرِيقَهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَكَانَ يَسْلُكُ الطَّرِيقَ الأُخْرَى مِنْ أَدْبَارِ الْبُيُوتِ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَسْتَأْذِنَ عَلَيْهَا حَتَّى رَاجَعَهَا[١].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ خێزانێکی خۆی لە ماڵی حەفصەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ تەڵاق دا و ئەوێش ڕێگەکەی بوو بۆ مزگەوت، جا ڕێگەیەکی دیکەی دەگرتە بەر لە دواوەی خانووەکان، لە ترسی ئەوەی نەوەك بچێتە لای (تووشی ناشەرعی بێت) تا دواتر ڕیجعەی دەکات و دەیگەڕێنێتەوە.

**١٦٩٦-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ يُطَلِّقُهَا زَوْجُهَا، وَهِيَ فِي بَيْتٍ بِكِرَاءٍ، عَلَى مَنِ الْكِرَاءُ؟ فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ: عَلَى زَوْجِهَا، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَ زَوْجِهَا؟ قَالَ: فَعَلَيْهَا، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهَا؟ قَالَ: فَعَلَى الأَمِيرِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سەعیدی کوڕی موسەیەب پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی تەڵاقی دەدات، لە کاتێکدا ئافرەتەکە لە خانووێکی بەکرێ نیشتەجێیە، جا کرێیەکە لەسەر کێیە؟ سەعیدی کوڕی موسەیەبیش ﵀ گوتی: لەسەر مێردەکەیەتی، (پرسیارکەرەکە) گوتی: ئەگەر مێردەکەی نەیبوو (هەژار بوو)؟ (سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀) گوتی: ئەو کات لەسەر ئافرەتەکەیە، (پرسیارکەرەکە) گوتی: ئەگەر ئافرەتەکەش نەیبوو؟ (سەعیدی کوڕی موسەیەب ﵀) گوتی: لەسەر کاربەدەستە.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٩ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٥ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٥٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٠ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٤ في الطلاق، عن مالك به.




## ٢٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی نەفەقە و مەسرەفكێشانی ئافرەتی تەڵاقدراو[١]

**١٦٩٧-** عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﵂، أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، وَهُوَ غَائِبٌ بِالشَّامِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلُهُ بِشَعِيرٍ، فَسَخِطَتْهُ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ، وَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، اعْتَدِّي عِنْدَ عَبْدِ اللهِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ عِنْدَهُ، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي، قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ، ذَكَرْتُ لَهُ أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، وَأَبَا جَهْمِ بْنَ هِشَامٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَمَّا أَبُو جَهْمٍ، فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ، لاَ مَالَ لَهُ، انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، قَالَتْ: فَكَرِهْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَنَكَحْتُهُ، فَجَعَلَ اللهُ فِي ذَلِكَ خَيْرًا، وَاغْتَبَطْتُ بِهِ[٢].

واتە: لە فاتیمەی كچی قەیسەوە ﵂ گێردراوەتەوە (باسی خۆی كردووە گوتوویەتی): ئەبو عەمری كوڕی حەفص بەیەكجاری تەڵاقی دا لە كاتێكدا غائیب بوو لە شام بوو، جا (بۆ نەفەقە) جۆی بە وەكیلەكەی خۆیدا نارد، فاتیمەش توڕە بوو (پێی وا بوو شایستەی زیاترە)، وەكیلەكەش پێی گوت: تۆ هیچ نەفەقەیەكت لەسەر ئێمە نییە، (فاتیمەش جلەكانی دەرەوەی پۆشی) و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باس كرد، ئەویش پێی فەرموو: تۆ هیچ نەفەقەیەكت لەسەر (ئەبو عەمر) نییە (چونكە بەیەكجاری تەڵاق دراوی و حەملیشت نییە)، وە فەرمانی پێ كرد بەوەی لە ماڵی ئوم شەریك عیدە ببینێت، دواتر فەرمووی: (نانا، ئوم شەریك) ئافرەتێكە هاوەڵەكانم زۆر هاموشۆی دەكەن، لەلای عەبدوڵڵای كوڕی ئوم مەكتوم عیدەكەت بەسەر ببە، ئەو پیاوێكی كوێرە، لەلای ئەو دەتوانیت بەشێك لە جلەكانیشت دابنێی (ناتبینێت و نەزەر نییە)، جا كاتێ عیدەكەت تەواو بوو و حەڵاڵ بوویتەوە هەواڵم پێ بدە، جا دەڵێ: كاتێ حەڵاڵ بوومەوە (هەواڵم

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي نَفَقَةِ الْمُطَلَّقَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٣ في الطلاق؛ والشافعي: ٩١٠؛ وفي: ١٣٠٧؛ وفي: ١٣٢٥؛ وفي: ١٤٤٤؛ ومسلم: الطلاق: ٣٦؛ وأبو داود: ٢٢٨٤ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٠٤٩، وفي: ٤٢٩٠؛ والمنتقى لابن الجارود: ٧٥٩؛ والقابسي: ٣٧٩، كلهم عن مالك به.

پێ دا و) بۆم باس کرد بەوەی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهمی کوڕی هیشام هاتوونەتە داخوازیم (شوو بە کامیان بکەم؟)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: هەرچی ئەبو جەهمە دار لانادات لەسەر شانی (توندوتیژە)، وە هەرچی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیشە پیاوێکی هەژارە هیچ ماڵ و سەروەتێکی نییە (لەوانەیە ئیدارە نەکەیت لەگەڵ ئەو هەژارییە)، شوو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە، دەڵێ: جا پێم ناخۆش بوو، (دواتر بۆ جاری دووەم فەرمووی): شوو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە، دەڵێ: منیش شووم پێ کرد، جا خوای پەروەردگار ﷻ خێری زۆری تێ کرد، ئاواتەکانم لێی هاتنە جێ.

**١٦٩٨-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ شِهَابٍ يَقُولُ: الْمَبْتُوتَةُ لاَ تَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهَا، حَتَّى تَحِلَّ، وَلَيْسَتْ لَهَا نَفَقَةٌ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ حَامِلاً، فَيُنْفَقُ عَلَيْهَا حَتَّى تَضَعَ حَمْلَهَا[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە ئیبنو شیهاب ﷺ بووە دەیگوت: ئافرەتی سێ بە سێ تەڵاقدراو لە ماڵەکەی دەرناچێ تا حەڵاڵ دەبێتەوە (بۆ کەسێکی دیکە، بەهۆی تەواوبوونی عیدەکەی)، جا هیچ نەفەقەیەکی بۆ نییە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە دووگیانە، ئەو کات مەسرەفی دەکێشرێت تا حەملەکەی دادەنێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە بەو شێوەیە.

## ٢٤- عیدەی ئافرەتی کۆیلە لە تەڵاقی مێردەکەیدا[٢]

**١٦٩٩- [فتوى]** قَالَ مالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي طَلاَقِ الْعَبْدِ الأَمَةَ، إِذَا طَلَّقَهَا وَهِيَ أَمَةٌ، ثُمَّ عَتَقَتْ بَعْدُ، فَعِدَّتُهَا عِدَّةُ الأَمَةِ، لاَ يُغَيِّرُ عِدَّتَهَا عِتْقُهَا، كَانَتْ لَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ، أَوْ لَمْ تَكُنْ لَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ، لاَ تَنْتَقِلُ عِدَّتُهَا[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٦٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٣أ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ عِدَّةُ الأَمَةِ مِنْ طَلاَقِ زَوْجِهَا.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧١ في الطلاق؛ وفي: ١٦٧٢ في الطلاق، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە دەربارەی تەڵاقدانی پیاوی کۆیلە بۆ خێزانە کۆیلەکەی کاتێ تەڵاقی دەدات لە کاتێکدا هێشتا ئافرەتەکە کۆیلەیە، دواتر ئازاد دەکرێت، (بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە): عیدەکەی بریتییە لە عیدەی ئافرەتی کۆیلە، ئازادبوونەکەی عیدەکەی ناگۆڕێت، جا (جیاوازی نییە) مێردەکەی ڕیجعە و گەڕاندنەوەی بۆ هەبێت یان نا، عیدەکەی ناگۆڕێت.

**١٧٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِثْلُ ذَلِكَ الْحَدُّ يَقَعُ عَلَى الْعَبْدِ، ثُمَّ يَعْتِقُ بَعْدَ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ الْحَدُّ، فَإِنَّمَا حَدُّهُ حَدُّ عَبْدٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: حەد و سزای شەرعیش بەهەمان شێوەیە کاتێ دەکەوێتە سەر کۆیلە و دواتر ئازاد دەبێت دوای ئەوەی حەدی کەوتۆتە سەر (و هێشتا جێبەجێ نەکراوە)، ئەوە حەدەکەی بریتییە لە حەدی کۆیلە (چونکە لە حاڵەتی کۆیلایەتی کەوتۆتە سەری).

**١٧٠١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْحُرُّ يُطَلِّقُ الأَمَةَ ثَلاَثًا، وَتَعْتَدُّ حَيْضَتَيْنِ، وَالْعَبْدُ يُطَلِّقُ الْحُرَّةَ تَطْلِيقَتَيْنِ، وَتَعْتَدُّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاوی ئازاد بە سێ تەڵاق ئافرەتی کۆیلە تەڵاق دەدات (واتە سێ تەڵاقی بۆ هەیە) و ئافرەتەکەش دوو حەیز عیدە دەبینێت، پیاوی کۆیلەش بە دوو تەڵاق ئافرەتی ئازاد تەڵاق دەدات (واتە دوو تەڵاقی بۆ هەیە) و، ئافرەتەکەش سێ قوڕء عیدە دەبینێت.

**١٧٠٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ تَكُونُ تَحْتَهُ الأَمَةُ، ثُمَّ يَبْتَاعُهَا فَيُعْتِقُهَا، إِنَّهَا تَعْتَدُّ عِدَّةَ الأَمَةِ حَيْضَتَيْنِ، مَا لَمْ يُصِبْهَا، فَإِنْ أَصَابَهَا بَعْدَ مِلْكِهِ إِيَّاهَا قَبْلَ عِتَاقِهَا، لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا إِلاَّ الاِسْتِبْرَاءُ بِحَيْضَةٍ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧١ في الطلاق؛ وفي: ١٦٧٢ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٤ في الطلاق، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتێکی کۆیلەی لەژێر نیکاحدایە، دواتر دەیکڕێتەوە و ئازادی دەکات، گوتوویەتی: عیدەی ئافرەتی کۆیلە دەبینێت (کە بریتییە لە) دوو حەیز، مادەم جیماعی لەگەڵ نەکردبێت، جا ئەگەر جیماعی لەگەڵ کرد دوای بەدەستهێنان و کڕینەوەی بەر لە ئازادکردنی، ئەوە هیچ عیدەی لەسەر نییە تەنها ڕونبوونەوەی پاکیەتی ڕەحم نەبێت بە یەك حەیز (یەك حەیز دەوەستێت تا پاکیەتی ڕەحمی دەرکەوێت).

## ٢٥- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی عیدەی تەڵاق[١]

**١٧٠٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ طُلِّقَتْ، فَحَاضَتْ حَيْضَةً أَوْ حَيْضَتَيْنِ، ثُمَّ رَفَعَتْهَا حَيْضَتُهَا، فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ تِسْعَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ بَانَ بِهَا حَمْلٌ فَذَلِكَ، وَإِلاَّ اعْتَدَّتْ بَعْدَ التِّسْعَةِ الأَشْهُرِ، ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، ثُمَّ حَلَّتْ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: هەر ئافرەتێك تەڵاق درا و حەیزێك یان دوو حەیزی بینی، دواتر حەیزی نەما، ئەوە نۆ مانگ چاوەڕێ دەکات (بەشکوو حەیزی بێت)، جا ئەگەر دەرکەوت دووگیانە ئەوە عیدەکەی بە دانانی حەملەکەیەتی، (بەڵام) ئەگەر (حەمل دەرنەکەوت و حەیزیشی نەهات، ئەوە) دەبێ دوای نۆ مانگەکە سێ مانگ عیدە ببینێت، دواتر حەڵاڵ دەبێتەوە (بۆی دروستە شوو بکاتەوە).

**١٧٠٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: الطَّلاَقُ لِلرِّجَالِ، وَالْعِدَّةُ لِلنِّسَاءِ[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: تەڵاق بۆ پیاوانە و عیدەش بۆ ئافرەتانە.

---

(١) ـ جَامِعُ عِدَّةِ الطَّلَاقِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٥ في الطلاق؛ والشيباني: ٦١١ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٢٦، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٧ في الطلاق، عن مالك به.

**١٧٠٥-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: عِدَّةُ الْمُسْتَحَاضَةِ سَنَةٌ[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عیدەی ئافرەتی موستەحازە (واتە ئەو ئافرەتەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە) ساڵێكە.

**١٧٠٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْمُطَلَّقَةِ الَّتِي تَرْفَعُهَا حَيْضَتُهَا حِينَ يُطَلِّقُهَا زَوْجُهَا، أَنَّهَا تَنْتَظِرُ تِسْعَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ لَمْ تَحِضْ فِيهِنَّ اعْتَدَّتْ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ حَاضَتْ قَبْلَ أَنْ تَسْتَكْمِلَ الأَشْهُرَ الثَّلاَثَةَ، اسْتَقْبَلَتِ الْحَيْضَ، فَإِنْ مَرَّتْ بِهَا تِسْعَةُ أَشْهُرٍ قَبْلَ أَنْ تَحِيضَ، اعْتَدَّتْ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ حَاضَتِ الثَّانِيَةَ قَبْلَ أَنْ تَسْتَكْمِلَ الأَشْهُرَ الثَّلاَثَةَ، اسْتَقْبَلَتِ الْحَيْضَ، فَإِنْ مَرَّتْ بِهَا تِسْعَةُ أَشْهُرٍ قَبْلَ أَنْ تَحِيضَ، اعْتَدَّتْ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ حَاضَتِ الثَّالِثَةَ، كَانَتْ قَدِ اسْتَكْمَلَتْ عِدَّةَ الْحَيْضِ، فَإِنْ لَمْ تَحِضِ اسْتَقْبَلَتْ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، ثُمَّ حَلَّتْ، وَلِزَوْجِهَا عَلَيْهَا فِي ذَلِكَ الرَّجْعَةُ، قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ قَدْ بَتَّ طَلاَقَهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لەلای ئێمە دەربارەی ئەو ئافرەتەی تەڵاق دراوە و حەیزی هەڵگیرا و نەما كاتێ مێردەكەی تەڵاقی دا، ئاوایە: دەبێ نۆ مانگ چاوەڕێ بكات، جا ئەگەر لەو نۆ مانگەدا تووشی حەیز نەبوو ئەوە سێ مانگ (دوای ئەو نۆ مانگە) عیدە دەبینێت، جا ئەگەر تووشی حەیزێك بوو بەر لەوەی سێ مانگەكە تەواو بكات، ئەوە ڕوو لە حەیز دەكات (دەبێ سێ قوڕء ببینێت)، جا ئەگەر (لە دوای حەیزی یەكەم) نۆ مانگی بەسەردا تێ پەڕی بەر لەوەی تووشی حەیزی دووەم بێت، (دووبارە) سێ مانگی دیكە عیدە دەبینێت (دوای نۆ مانگەكە)، جا ئەگەر حەیزی دووەمی بینی بەر لەوەی سێ مانگەكە تەواو بكات، ئەوە ڕوو دەكاتە حەیز (دەبێ هەندێكی دیكە چاوەڕێ حەیزی دیكە بكات)، جا ئەگەر نۆ مانگی دیكەی بەسەردا تێ پەڕی بەر لەوەی حەیزی سێیەم ببینێ، ئەوە دەبێ سێ مانگی دیكە عیدە ببینێ، جا ئەگەر حەیزی سێیەمی بینی، ئەوە (زۆر باشە) عیدەی حەیزی تەواو كرد (بۆی هەیە شوو بكاتەوە)، بەڵام ئەگەر

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٦ في الطلاق؛ والشيباني: ٦١٤ في الطلاق؛ والدارمي: ٩١٤ في الطهارة؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ١٨٧٢١ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٨ في الطلاق، عن مالك به.

حەیزی سێیەمی نەبینی، ئەوە ڕوو دەکاتە سێ مانگی دیکە، دواتر حەڵاڵ دەبێت، جا بۆ مێردەکەشی گەڕاندنەوە هەیە (بەدرێژایی ئەو ماوەیە) بەر لەوەی حەڵاڵ بێتەوە، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە تەڵاقی یەکجارەکی دابێت.

**١٧٠٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: السُّنَّةُ عِنْدَنَا: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، وَلَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ، فَاعْتَدَّتْ بَعْضَ عِدَّتِهَا، ثُمَّ ارْتَجَعَهَا، ثُمَّ فَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، أَنَّهَا لاَ تَبْنِي عَلَى مَا مَضَى مِنْ عِدَّتِهَا، وَأَنَّهَا تَسْتَأْنِفُ مِنْ يَوْمَ طَلَّقَهَا عِدَّةً مُسْتَقْبَلَةً، وَقَدْ ظَلَمَ زَوْجُهَا نَفْسَهُ، وَأَخْطَأَ إِنْ كَانَ ارْتَجَعَهَا وَلاَ حَاجَةَ لَهُ بِهَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕێبازەکە لای ئێمە ئاوایە: پیاو ئەگەر خێزانەکەی تەڵاق دا و گەڕاندنەوەی بۆ هەبوو و ئافرەتەکە هەندێك لە عیدەکەی بەسەر برد، دواتر مێردەکەی گەڕاندیەوە، دواتر لێی جیا بۆیەوە و تەڵاقی دا بەر لەوەی جیماعی لەگەڵ بکات، ئەوە عیدەکەی بینا ناکات لەسەر ئەو عیدەی ڕابوریوە، (بەڵکوو) لە نوێوە عیدەیەکی لەمەودوا دەست پێ دەکاتەوە لەو ڕۆژەوەی تەڵاق دراوە، مێردەکەی ستەمی لە خۆی کردووە (چونکە خۆی تاوانبار کردووە عیدەی لەسەر ئافرەتەکە درێژ کردەوە بە گەڕاندنەوەی، پێویستیشی پێ نەبوو و هەر نیازی تەڵاقی هەبوو)، وە هەڵە و تاوانی کردووە ئەگەر گەڕاندبێتیەوە و پێویستیشی پێی نەبووبێ.

**١٧٠٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا أَسْلَمَتْ، وَزَوْجُهَا كَافِرٌ، ثُمَّ أَسْلَمَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا مَا دَامَتْ فِي عِدَّتِهَا، فَإِنِ انْقَضَتْ عِدَّتُهَا، فَلاَ سَبِيلَ لَهُ عَلَيْهَا، وَإِنْ تَزَوَّجَهَا بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا، لَمْ يُعَدَّ ذَلِكَ طَلاَقًا، وَإِنَّمَا فَسَخَهَا مِنْهُ الإِسْلاَمُ بِغَيْرِ طَلاَقٍ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: ئەگەر ئافرەت بوو بە مسوڵمان لە کاتێکدا مێردەکەی کافرە، دواتریش مێردەکەی مسوڵمان دەبێت، ئەوە مێردەکەی شایستەترە پێی مادەم ئافرەتەکە هێشتا لە عیدەدایە، (بەڵام) ئەگەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٧٩ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٠ في الطلاق، عن مالك به.

عیدەکەی تەواو بوو، ئەوە هیچ دەسەڵاتێکی بەسەردا نییە (زەواجەکە نەماوە)، جا ئەگەر (سەرلەنوێ) هاوسەرگیری لەگەڵ کردەوە دوای تەواوبوونی عیدەکەی، ئەوە (جیابوونەوەکە) نەبۆتە تەڵاق (واتە هەر سێ تەڵاقی ماون)، بەڵکوو ئیسلام زەواجەکەی هەڵوەشاندۆتەوە بەبێ تەڵاق.

## ٢٦- ئەوەی هاتووە دەربارەی دوو ناوبژیوانەکان (لە نێوان ژن و مێردی کێشەدار)[١]

١٧٠٩- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ فِي الْحَكَمَيْنِ اللَّذَيْنِ قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء، إِنَّ إِلَيْهِمَا الْفُرْقَةَ بَيْنَهُمَا وَالاجْتِمَاعَ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێم گەیشتووە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ﵁ دەربارەی دوو ناوبژیوانەکە کە خوای پەروەردگار ﷻ دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾ النساء، واتە: [وە ئەگەر ترسان لە تێکچوونی نێوانیان ـ واتە نێوان ژن و مێرد ـ ئەوە ناوبژیوانێك بنێرن لە خزمی پیاوەکە و ناوبژیوانێکیش لە خزمی ئافرەتەکە، جا ئەگەر دوو ناوبژیوانەکان چاکەیان بووێت خوا نێوان ژن و مێردەکە چاك دەکاتەوە، بەڕاستی خوا ﷻ هەمیشە زانا و ئاگادارە] (ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە) گوتوویەتی: جیابوونەوە و بەیەکەوەمانەوە بەدەستی ئەوانە (واتە ئەوان دەتوانن ئەو بڕیارانە بدەن).

١٧١٠- قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ الْحَكَمَيْنِ يَجُوزُ قَوْلُهُمَا بَيْنَ الرَّجُلِ وَامْرَأَتِهِ، فِي الْفُرْقَةِ وَالاجْتِمَاعِ[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْحَكَمَيْنِ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨١ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨١ في الطلاق، عن مالك به.





واتە: ئیمامی مالیك ﷀ گوتوویەتی: ئەوە چاكترینی ئەوەیە كە گوێبیستی بووم لە زانایان (كە بریتییە لەوەی): دوو ناوبژیوانەكان قسەیان دەڕوات و جێبەجێ دەكرێت لە نێوان پیاو و ئافرەتدا، لە جیابوونەوە و بەیەكەوەمانەوەدا.

## ٢٧- سوێندخواردنی پیاو بە تەڵاقی ئافرەتێك كە هێشتا هاوسەرگیری لەگەڵ نەكردووە[1]

**١٧١١**- عَنْ مَالِكٍ ﷀؒ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، وَعَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ، وَسَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، وَالْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَابْنَ شِهَابٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا حَلَفَ الرَّجُلُ بِطَلَاقِ الْمَرْأَةِ قَبْلَ أَنْ يَنْكِحَهَا، ثُمَّ أَثِمَ، إِنَّ ذَلِكَ لاَزِمٌ لَهُ إِذَا نَكَحَهَا[2].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێم گەیشتووە عومەری كوڕی خەتتاب و عەبدوڵڵای كوڕی عومەر و عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود و سالمی كوڕی عەبدوڵڵا و قاسمی كوڕی موحەممەد و ئیبنو شیهاب و سولەیمانی كوڕی یەسار ﷺ دەیانگوت: ئەگەر پیاو سوێندی بە تەڵاقی ئافرەتێكی دیاریكراو خوارد بەر لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ بكات، دواتر سوێندەكەی شكاند، ئەوە تەڵاقەكەی دەكەوێتە سەر كاتێ هاوسەرگیری لەگەڵ دەكات.

**١٧١٢**- عَنْ مَالِكٍ ﷀؒ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِيمَنْ قَالَ: كُلُّ امْرَأَةٍ أَنْكِحُهَا فَهِيَ طَالِقٌ، إِنَّهُ إِذَا لَمْ يُسَمِّ قَبِيلَةً أَوِ امْرَأَةً بِعَيْنِهَا، فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ[3].

قَالَ مَالِكٌ ﷀؒ: وَهَذَا أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ.

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێم گەیشتووە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی دەڵێت: گشت ئافرەتێك كە هاوسەرگیری لەگەڵ بكەم تەڵاقی كەوتبێت، گوتوویەتی: ئەگەر ناوی هۆزێك یان

---

(١) ـ يَمِيْنُ الرَّجُلِ بِطَلَاقِ مَا لَمْ يَنْكِحْ.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٤ في الطلاق، عن مالك به.




ئافرەتێکی بەدیاریکراوی نەهێنابێ، ئەوە هیچی لەسەر نییە (کاتێ هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کرد تەڵاقی ناکەوێت بەهۆی ئەو وتەیەی).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم (لەو بابەتەدا).

**١٧١٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لِامْرَأَتِهِ: أَنْتِ الطَّلَاقُ، وَكُلُّ امْرَأَةٍ أَنْكِحُهَا فَهِيَ طَالِقٌ، وَمَالُهُ صَدَقَةٌ، إِنْ لَمْ يَفْعَلْ كَذَا وَكَذَا، فَحَنِثَ، قَالَ: أَمَّا نِسَاؤُهُ فَطَلَاقٌ كَمَا قَالَ، وَأَمَّا قَوْلُهُ كُلُّ امْرَأَةٍ أَنْكِحُهَا فَهِيَ طَالِقٌ، فَإِنَّهُ إِذَا لَمْ يُسَمِّ امْرَأَةً بِعَيْنِهَا، أَوْ قَبِيلَةً، أَوْ أَرْضًا، أَوْ نَحْوَ هَذَا، فَلَيْسَ يَلْزَمُهُ ذَلِكَ، وَلْيَتَزَوَّجْ مَا شَاءَ، وَأَمَّا مَالُهُ فَلْيَتَصَدَّقْ بِثُلُثِهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی بە ئافرەتەکەی دەڵێت: تۆ تەڵاقت کەوتبێت، وە گشت ئافرەتێك کە هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم تەڵاقی کەوتبێت و ماڵەکەشم ببێتە خێر و صەدەقە، ئەگەر ئەو شتە و ئەو شتە نەکەم، (دواتریش) سوێندەکەی بشکێنێت و نەیباتە سەر، گوتوویەتی: هەرچی خێزانەکانیەتی ئەوە تەڵاقیان کەوتووە وەك چۆن گوتوویەتی، وە هەرچی وتەکەشیەتی کە گوتی: گشت ئافرەتێك کە هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم تەڵاقی کەوتبێت، ئەوە ئەگەر ناوی ئافرەتێك یان ناوی هۆزێك یان ناوی ناوچەیەك و شتێکی وای بەدیاریکراوی نەهێنابێت، ئەوە تەڵاقی ناکەوێتە سەر و با کێی دەیەوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، هەرچی دەربارەی ماڵ و سەروەتەکەشیەتی، ئەوە با سێیەکی بکات بە خێر و صەدەقە.

## ٢٨- ماوەی ئەو پیاوەی نەیتوانیوە جیماع لەگەڵ خێزانی بکات[1]

**١٧١٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَمَسَّهَا، فَإِنَّهُ يُضْرَبُ لَهُ أَجَلٌ سَنَةً، فَإِنْ مَسَّهَا، وَإِلاَّ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا[2].

---

(١) ـ أَجَلُ الَّذِي لَا يَمَسُّ امْرَأَتَهُ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٤ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٣٨ في النكاح، كلهم عن مالك به.

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: هەر كەسێك هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك بكات و نەتوانێت جیماعی لەگەڵ بكات (لەبەر خەلەلێك)، ئەوە ماوەی ساڵێكی بۆ دادەنرێت، جا ئەگەر جیماعی لەگەڵ كرد و توانی (ئەوە باشە)، ئەگەرنا لێك جیا دەكرێنەوە (بە داواكاری ئافرەتەكە).

**١٧١٥-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ ﷺ: مَتَى يُضْرَبُ لَهُ الأَجَلُ؟ أَمِنْ يَوْمِ يَبْنِي بِهَا؟ أَمْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ؟ فَقَالَ: بَلْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷺ كردووە (دەربارەی ئەو پیاوەی هێزی جیماعی نییە و ماوەی ساڵێكی بۆ دادەنرێت) گوتوویەتی: كەی ماوەكەی بۆ دادەنرێت؟ ئایا لەو ڕۆژەوەی دەیگوازێتەوە؟ یان لەو ڕۆژەی ئافرەتەكە شكاتەكە دەباتە لای حاكم و كاربەدەست؟ ئەویش گوتی: بەڵكوو لەو ڕۆژەی ئافرەتەكە شكاتەكە دەباتە لای حاكم و كاربەدەست.

**١٧١٦-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الَّذِي قَدْ مَسَّ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ اعْتَرَضَ عَنْهَا، فَإِنِّي لَمْ أَسْمَعْ أَنَّهُ يُضْرَبُ لَهُ أَجَلٌ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بەڵام هەرچی ئەو پیاوەیە كە جیماعی لەگەڵ خێزانەكەی كردووە (لە سەرەتادا هیچ كێشەی نەبووە)، دواتر ڕێگرێك دروست بووە و جیماعی پێ نەكراوە، ئەوە (دەربارەی ئەو كەسە) گوێبیست نەبووم و نەمزانیوە هیچ ماوەیەكی بۆ داندرابێت و نەمزانیوە لێك جیا بكرێنەوە.

## ٢٩- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی تەڵاق[٣]

**١٧١٧-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ مِنْ ثَقِيفٍ أَسْلَمَ وَعِنْدَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ، حِينَ أَسْلَمَ الثَّقَفِيُّ: أَمْسِكْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا، وَفَارِقْ سَائِرَهُنَّ[٤].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٦ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٨٧ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٤أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ جَامِعُ الطَّلاَقِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٥ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٣٠

واتە: لە ئیبنو شیابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێم گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی (هۆزی) سەقیفی فەرموو ـ کە مسوڵمان ببوو و دە خێزانی هەبوو ـ کاتێ مسوڵمان بوو پێی فەرموو: (بە هەڵبژاردنی خۆت) چواریان بهێڵەوە و لەوانەی دیکە جیا بەرەوە (تەڵاقیان بدە).

**١٧١٨-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَحُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَعُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كُلُّهُمْ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ طَلَّقَهَا زَوْجُهَا تَطْلِيقَةً أَوْ تَطْلِيقَتَيْنِ، ثُمَّ تَرَكَهَا حَتَّى تَحِلَّ، وَتَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ، فَيَمُوتَ عَنْهَا أَوْ يُطَلِّقَهَا، ثُمَّ يَنْكِحُهَا زَوْجُهَا الأَوَّلُ، فَإِنَّهَا تَكُونُ عِنْدَهُ عَلَى مَا بَقِيَ مِنْ طَلاَقِهَا[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ السُّنَّةُ عِنْدَنَا الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ بوو هەر یەکەیان دەیانگوت: گوێم لە ئەبو هورەیرە بووە دەیگوت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیگوت: هەر ئافرەتێك مێردەکەی یەك یان دوو تەڵاقی دا، دواتر وازی لێ هێنا تا حەڵاڵ بووەوە (عیدەی تەواو بوو) و مێردێکی دیکەی کردەوە، جا مێردەکەی مرد یان تەڵاقی دا، دواتر مێردی یەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ کردەوە، ئەوە ئافرەتەکە لەلای دەمێنێتەوە لەسەر ئەو تەڵاقانەی ماویەتی (واتە ئەگەر پێشتر دوو تەڵاقی دابێت، ئێستا یەك تەڵاقی ماوە، مێردکردنی دووەم تەڵاقەکان نوێ ناکاتەوە، چونکە دەیتوانی بەر لەوەی پیاوی دووەم بیهێنێت ئەو بە عەقدێکی نوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکات).

---

في النكاح؛ والشافعي: ١٤٠٧، كلهم عن مالك به.

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٥أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٦٦ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

**١٧١٩-** عَنْ ثَابِتِ بْنِ الأَحْنَفِ ﷺ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ وَلَدٍ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: فَدَعَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، فَجِئْتُهُ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا سِيَاطٌ مَوْضُوعَةٌ، وَإِذَا قَيْدَانِ مِنْ حَدِيدٍ، وَعَبْدَانِ لَهُ قَدْ أَجْلَسَهُمَا، فَقَالَ: طَلِّقْهَا وَإِلاَّ وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ، فَعَلْتُ بِكَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَقُلْتُ: هِيَ الطَّلاَقُ أَلْفًا، قَالَ: فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ، فَأَدْرَكْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، قَالَ: فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، فَتَغَيَّظَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، وَقَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ بِطَلاَقٍ، وَإِنَّهَا لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، قَالَ: فَلَمْ تُقْرِرْنِي نَفْسِي، حَتَّى أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ أَمِيرٌ عَلَيْهَا، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، وَبِالَّذِي قَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ: لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، وَكَتَبَ إِلَى جَابِرِ بْنِ الأَسْوَدِ الزُّهْرِيِّ، وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، يَأْمُرُهُ أَنْ يُعَاقِبَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَأَنْ يُخَلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَهْلِي، قَالَ: فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَجَهَّزَتْ صَفِيَّةُ امْرَأَةُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ امْرَأَتِي، حَتَّى أَدْخَلَتْهَا عَلَيَّ بِعِلْمِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، ثُمَّ دَعَوْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَوْمَ عُرْسِي لِوَلِيمَتِي، فَجَاءَنِي[1].

واتە: لە سابیتی کوڕی ئەحنەفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە زەواجی لەگەڵ ئافرەتێکی کۆیلە کرد (واتە مارەی کرد) کە منداڵی لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب هەبوو، دەڵێ: جا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب بانگی کردم، منیش چووم بۆ لای و بینیم چەندین قامچی لە زەوییەکە داناوە، وە دوو کەلەپچەی ئاسنینیش ئامادەن و دوو پیاوی کۆیلەی خۆیشی لەوێ دانیشاندبوو، جا گوتی: تەڵاقی بدە (واتە ئەو ئافرەتە کۆیلەیە تەڵاق بدە کە منداڵی لە عەبدوڕڕەحمانی باوکم هەیە) ئەگینا سوێند بەوەی سوێندی پێ دەخورێت ئاوا و ئاوات لێ دەکەم، دەڵێ: منیش گوتم: هەزار جار تەڵاق، دەڵێ: جا لەلای دەرچووم و لە ڕێگەی مەککە گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، دەڵێ: جا هەواڵم پێ دا بە حاڵی خۆم، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: ئەوە بە تەڵاق حیساب نییە و ئافرەتەکە لەسەرت حەرام نەبووە و بگەڕێوە بۆ لای خێزانەکەت (چونکە هەڕەشە و زۆریت لێ کراوە)، دەڵێ: جا ناخم هەر ئۆقرەی نەگرت (ترسام تەڵاقم

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٦ في الطلاق، عن مالك به.

کەوتبێت) تا چووم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ لە کاتێکدا گەورە و کاربەدەستی مەککە بوو، جا هەواڵی حاڵی خۆم و ئەوەیشی کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پێی گوتبووم پێم ڕاگەیاند، دەڵێ: ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ پێی گوتم: ئافرەتەکەت لەسەر حەڕام نەبووە و بگەڕێوە بۆ لای خێزانەکەت، وە نووسراوێکی بۆ جابری کوڕی ئەسوەدی زوهری نووسی کە گەورە و کاربەدەستی مەدینە بوو فەرمانی پێ کرد عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان سزا بدات و واز لە من و خێزانم بێنێت، دەڵێ: جا چووم بۆ مەدینە و صەفیەی خێزانی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خێزانەکەمی ڕازاندبۆیەوە (لەگەڵ خۆی هێنای) تا هێنای بۆ ماڵەوە بۆ لای من (ئەوەش گشتی) بە ئاگاداری عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بوو، دواتر عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ بانگێشت کرد لە ڕۆژی گواستنەوە بۆ نانی زەماوەندەکە (ئەویش بۆ داوەتەکەم هات).

**١٧٢٠**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ قَرَأَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ۝١﴾ الطلاق لِقُبُلِ عِدَّتِهِنَّ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يَعْنِي بِذَلِكَ: أَنْ يُطَلِّقَ فِي كُلِّ طُهْرٍ مَرَّةً[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بوو (ئەم ئایەتەی) دەخوێند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ۝١﴾، واتە: [ئەی پێغەمبەر ﷺ (ئەی بڕواداران) هەر کاتێك ویستتان خێزانەکانتان تەڵاق بدەن با تەڵاقیان بدەن لە عیدەکانیان] تەفسیری دەکرد دەیگوت: لە سەرەتای عیدەکانیان.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مەبەستی پێ ئەوەیە: لە هەر پاکبوونەوەیەك یەك تەڵاق بدات.

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٧ في الطلاق، عن مالك به.

**١٧٢١**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ ارْتَجَعَهَا قَبْلَ أَنْ تَنْقَضِيَ عِدَّتُهَا، كَانَ ذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ طَلَّقَهَا أَلْفَ مَرَّةٍ، فَعَمَدَ رَجُلٌ إِلَى امْرَأَتِهِ فَطَلَّقَهَا، حَتَّى إِذَا شَارَفَتِ انْقِضَاءَ عِدَّتِهَا، رَاجَعَهَا، ثُمَّ طَلَّقَهَا، ثُمَّ قَالَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ آوِيكِ إِلَيَّ، وَلاَ تَحِلِّينَ أَبَدًا، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة فَاسْتَقْبَلَ النَّاسُ الطَّلاَقَ جَدِيدًا مِنْ يَوْمِئِذٍ، مَنْ كَانَ طَلَّقَ مِنْهُمْ أَوْ لَمْ يُطَلِّقْ[١].

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: (کاتی خۆی) پیاو کاتێ خێزانەکەی تەڵاق بدابووایە و بیگەڕاندبایەوە بەر لەوەی عیدەکەی تەواو بێت، ئەو مافەی بۆ هەبوو، هەرچەندە هەزار جاریش تەڵاقی بدابووایە، جا پیاوێك بەئەنقەست خێزانەکەی تەڵاق دا و (وازی لێ هێنا) تا نزیك بوو عیدەکەی تەواو بێت گەڕاندیەوە و گوتی: نەخێر (نایەڵم خۆشی لە خۆت ببینی) سوێند بە خوا نە دەتگرمە خۆم و نە دەشهێڵم هەرگیز حەڵاڵ بیتەوە (بۆ مێردکردن بە کەسێکی دیکە)، جا خوای پەروەردگار ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴿٢٢٩﴾ ﴾، واتە: [تەڵاق (کە گەڕاندنەوەی لەدوا بێت) دوو جارە، دوای ئەوە ڕاگرتنە بەخۆشی یان ئازادکردن و تەڵاقدانە بەچاکی]، جا خەڵك لەو ڕۆژەوە لە نوێوە ڕوویان کردە تەڵاق، ئەوانەی تەڵاقیان دابوو وە ئەوانەشی کە تەڵاقیان نەدابوو (واتە سێ تەڵاق لە نوێوە بۆ گشتیان دامەزرا).

**١٧٢٢**- عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ ﷺ، أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثُمَّ يُرَاجِعُهَا، وَلاَ حَاجَةَ لَهُ بِهَا، وَلاَ يُرِيدُ إِمْسَاكَهَا كَيْمَا يُطَوِّلُ بِذَلِكَ عَلَيْهَا الْعِدَّةَ لِيُضَارَّهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ ﴿٢٣١﴾ ﴾ البقرة يَعِظُهُمُ اللهُ بِذَلِكَ[٢].

واتە: لە سەوری کوڕی زەیدی دەیلییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): (کاتی خۆی) پیاو خێزانەکەی تەڵاق دەدا، دواتر دەیگەڕاندەوە و پێویستیشی پێ نەبوو و نەشیدەویست

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٧ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٧ب في الطلاق؛ والشافعي: ٩٤٢؛ وفي: ١٤٥٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٦٩٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٧ج في الطلاق، عن مالك به.

بیهێڵێتەوە و (ژیانی لەگەڵ بباتەوە سەر)، بۆئەوەی بوو ماوەی عیدەی لەسەر درێژ بکاتەوە تا زیانی لێ بدات (نەتوانێت زوو شوو بکاتەوە)، جا خوای پەروەردگار ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ﴿٢٣١﴾﴾، واتە: [بۆ زیانلێدان ڕایانمەگرنەوە تا ستەمیان لێ بکەن، هەر کەسێك کاری وا بکات ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە]، خوای پەروەردگار بەوە ئامۆژگاری کردن.

**١٧٢٣**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ سُئِلاَ عَنْ طَلاَقِ السَّكْرَانِ؟ فَقَالاَ: إِذَا طَلَّقَ السَّكْرَانُ جَازَ طَلاَقُهُ، وَإِنْ قَتَلَ، قُتِلَ بِهِ(١).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێم گەیشتووە سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ پرسیاریان لێ کراوە دەربارەی تەڵاقی کەسی سەرخۆش (ئەوەی بە دەستی خۆی بە مادە بێهۆشکەرەکان خۆی سەرخۆش کردووە)؟ گوتوویانە: ئەگەر سەرخۆش تەڵاقی خوارد تەڵاقەکەی جێبەجێ دەبێت، وە ئەگەر کوشتنی ئەنجام دا ئەوە دەکوژرێتەوە (عوزر و بەهانەی نییە، چونکە خۆی بۆتە هۆکاری خۆبێهۆشکردن).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

**١٧٢٤**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا لَمْ يَجِدِ الرَّجُلُ مَا يُنْفِقُ عَلَى امْرَأَتِهِ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا(٢).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ أَدْرَكْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێم گەیشتووە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەیگوت: ئەگەر پیاو هیچی نەبوو مەسرەفی خێزانەکەی پێ بکێشێت و بژێوی بۆ دابین بکات، ئەوە لێك جیا دەکرێنەوە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٠ في الطلاق؛ وفي: ٢٣٣٠ في النذور والأيمان؛ والحدثاني: ٣٦٨ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٨أ في الطلاق، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەسەر ئەوە گەیشتووم بە زانایان لە شارەکەمان (مەدینە).

## ٣٠- عیدەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی دەمرێت کاتێ دووگیانە[1]

**١٧٢٥**- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ يُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: آخِرَ الأَجَلَيْنِ، وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِذَا وَلَدَتْ، فَقَدْ حَلَّتْ، فَدَخَلَ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ ﷺ: وَلَدَتْ سُبَيْعَةُ الأَسْلَمِيَّةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِنِصْفِ شَهْرٍ، فَخَطَبَهَا رَجُلَانِ: أَحَدُهُمَا شَابٌّ، وَالآخَرُ كَهْلٌ، فَحَطَّتْ إِلَى الشَّابِّ، فَقَالَ الشَّيْخُ: لَمْ تَحِلِّي بَعْدُ، وَكَانَ أَهْلُهَا غَيَبًا، وَرَجَا إِذَا جَاءَ أَهْلُهَا أَنْ يُؤْثِرُوهُ بِهَا، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: قَدْ حَلَلْتِ، فَانْكِحِي مَنْ شِئْتِ[2].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئەبو هورەیرە ﷺ پرسیاریان لێکرا دەربارەی ئافرەتی دووگیان کە پیاوەکەی دەمرێت (ئاخۆ عیدەکەی چۆن دەبێت)؟ ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: درێژترین ماوەیان عیدەکەیەتی (واتە ئەگەر دانانی حەملەکەی کەمتر بوو لە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەوە چوار مانگ و دە ڕۆژ دەبێ بوەستێت، وە ئەگەر دانانی حەملەکەی زیاتر بوو لە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەوە دەبێ چاوەڕێ بکات تا حەملەکەی دادەنێت، زۆرترینەکە ڕەچاو دەکرێت)، ئەبو هورەیرەش ﷺ گوتی: ئەگەر مندالّی بوو ئەوە حەلاڵ بۆتەوە، جا ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان هات بۆ لای ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو بابەتە؟ ئوممو سەلەمەش ﷺ گوتی: سوبەیعەی ئەسلەمییە بە نیو مانگ دوای وەفاتی مێردەکەی مندالّی بوو، جا دوو پیاو چوونە داخوازی: یەکێکیان گەنج بوو و ئەوەی

---

(١) ـ عِدَّةُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا إِذَا كَانَتْ حَامِلًا.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٢ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٩ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣١؛ وابن حنبل: ٢٦٧٥٨؛ والنسائي: ٣٥١٠ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٩٧؛ والقابسي: ٣٩٦، كلهم عن مالك به.




دیکەیان کامڵ بوو، جا دڵی کەوتە سەر گەنجەکە، بەتەمەنەکەش (بە سوبەیعە) ی گوت: تۆ هێشتا حەڵاڵ نەبوویتەوە (ناتوانی شوو بکەیت)، جا خانەوادەکەی سوبەیعە ئامادە نەبوون (ڕەنگە لە سەفەرێك بووبن)، جا پیاوە بەتەمەنەکە ئومێدی هەبوو کاتێ خانەوادەکەی دەگەڕێنەوە ئەو هەڵبژێرن و بیدەن بەو، ئینجا سوبەیعە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (پرسیاری ئەوەی لێ کرد)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: حەڵاڵ بوویتەوە، شوو بە هەر کەسێك بکە کە دەتەوێت.

**١٧٢٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ؛ أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ يُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا وَهِيَ حَامِلٌ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭭ: إِذَا وَضَعَتْ حَمْلَهَا، فَقَدْ حَلَّتْ، فَأَخْبَرَهُ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ عِنْدَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﭬ قَالَ: لَوْ وَضَعَتْ وَزَوْجُهَا عَلَى سَرِيرِهِ لَمْ يُدْفَنْ بَعْدُ، لَحَلَّتْ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی وەفات دەکات لە کاتێکدا دووگیانە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﭭ گوتی: ئەگەر حەملەکەی دانا، ئەوە حەڵاڵ بووە (دەتوانێت شوو بکات)، جا پیاوێك لە ئەنصارەکان کە لەلای بوو هەواڵی پێ دا و گوتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﭬ گوتی: ئەگەر حەملەکەی دانا لە کاتێکدا مێردەکەی (مردووە و) هێشتا لەسەر پێخەفی خۆیەتی و نەشاردراوەتەوە، ئەوە حەڵاڵ بووە (دەتوانێت شوو بکاتەوە).

**١٧٢٧**- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﭬ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةَ نُفِسَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ حَلَلْتِ، فَانْكِحِي مَنْ شِئْتِ[2].

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە هەواڵی داوە بەوەی سوبەیعەی ئەسلەمییە بە چەند شەوێك دوای مردنی مێردەکەی منداڵی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: حەڵاڵ بوویت، شوو بکە بە هەر کەسێك کە دەتەوێت.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٠ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٧٨ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٤، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٤ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٣؛ وابن حنبل: ١٨٩٣٧؛ والبخاري: ٥٣٢٠ في الطلاق؛ والقابسي: ٤٧٤، كلهم عن مالك به.

**١٧٢٨-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ اخْتَلَفَا فِي الْمَرْأَةِ تُنْفَسُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ ﷺ: إِذَا وَضَعَتْ مَا فِي بَطْنِهَا، فَقَدْ حَلَّتْ، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: آخِرَ الأَجَلَيْنِ، فَجَاءَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، فَقَالَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي، يَعْنِي أَبَا سَلَمَةَ، فَبَعَثُوا كُرَيْبًا، مَوْلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ يَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ، فَجَاءَهُمْ، فَأَخْبَرَهُمْ أَنَّهَا قَالَتْ: ولدت سُبَيْعَةُ الأَسْلَمِيَّةُ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِلَيَالٍ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: قَدْ حَلَلْتِ، فَانْكِحِي مَنْ شِئْتِ[1].

قَالَ مالِكٍ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ عِنْدَنَا.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ ڕاجیاییان کەوتە نێوان دەربارەی ئەو ئافرەتەی بە چەند شەوێك دوای وەفاتکردنی مێردەکەی منداڵی دەبێت (کە ئاخۆ عیدەکەی چۆنە)؟ جا ئەبو سەلەمە ﷺ گوتی: (عیدەکەی بەوە دەبێت) کاتێ منداڵەکەی ناو سکی دادەنێت، ئەوە حەڵاڵ بووە (دەتوانێت شوو بکاتەوە)، ئیبنو عەبباسیش ﷺ گوتی: دووەم ماوە (واتە ئەگەر دانانی حەملەکەی کەمتر بوو لە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەوە چوار مانگ و دە ڕۆژ دەبێ بوەستێت، ئەگەر دانانی حەملەکەشی زیاتر بوو لە چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەوە دەبێ چاوەڕێ بکات تا حەملەکەی دادەنێت)، جا ئەبو هورەیرە ﷺ هات و گوتی: من لەگەڵ (بۆچوونی) برازامم، واتە: ئەبو سەلەمە، جا کوڕەیبی خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیان نارد بۆ لای ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ تا پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەو بابەتە، جا هاتەوە لایان و هەواڵی پێ دان بەوەی ئوممو سەلەمە ﷺ گوتی: سوبەیعەی ئەسلەمییە بە چەند شەوێك دوای وەفاتی مێردەکەی منداڵی بوو، جا سوبەیعە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: حەڵاڵ بوویتەوە، شوو بە هەر کەسێك بکە کە دەتەوێت.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٦٩أ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٢؛ والنسائي: ٣٥١٤ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٩٦؛ والقابسي: ٤٩٣، كلهم عن مالك به.




ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە بڕیتییە لەو فەتوایەی بەردەوام زانایان لەسەری بوون لە شارەکەمان.

## ٣١- مانەوە لە ماڵەوە تا حەڵاڵ دەبێتەوە بۆ ئەو ئافرەتەی مێردەکەی دەمرێت[1]

**١٧٢٩-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، أَنَّ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكِ بنِ سِنَانٍ، وَهِيَ أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَخْبَرَتْهَا: أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ، فَإِنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِطَرَفِ الْقَدُومِ لَحِقَهُمْ، فَقَتَلُوهُ، قَالَتْ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي فِي بَنِي خُدْرَةَ، فَإِنَّ زَوْجِي لَمْ يَتْرُكْنِي فِي مَسْكَنٍ يَمْلِكُهُ، وَلاَ نَفَقَةٍ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَانْصَرَفْتُ حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْحُجْرَةِ، نَادَانِي رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَوْ أَمَرَ بِي فَنُودِيتُ لَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ قُلْتِ؟ فَرَدَّدْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ لَهُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي، فَقَالَ: امْكُثِي فِي بَيْتِكِ، حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ[2].

واتە: لە زەینەبی کچی عوجرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): فوڕەیعەی کچی مالیکی کوڕی سینان کە خوشکی ئەبو سەعیدی خودرییە ﷺ هەواڵی پێ داوە (باسی خۆی کردووە، گوتوویەتی): هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای لێ کردووە (مۆڵەتی بدات) بگەڕێتەوە بۆ لای خانەوادەی خۆی (چونکە مێردەکەی نەمابوو)، مێردەکەی دەرچووبوو بەدوای چەند کۆیلەیەکی خۆی کە ڕایانکردبوو، تا گەیشتبوون بە سەرەتای قەدوم (کە شوێنێکە لە نزیك مەدینە) پێیان گەیشتبوو، ئەوانیش کوشتبوویان، فوڕەیعە دەڵێت: جا داوام لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بەوەی مۆڵەتم بدات بگەڕێمەوە بۆ لای خانەوادەکەم لە نەوەی خودرە، چونکە

---

(١) ـ مَقَامُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا فِي بَيْتِهَا حَتَّى تَحِلَّ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٧ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧١ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٢٠٥؛ وأبو داود: ٢٣٠٠ في الطلاق؛ والترمذي: ١٢٠٤ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٢٩٢؛ والدارمي: ٢٢٨٧ في الطلاق؛ والقابسي: ٤٠٧، كلهم عن مالك به.



مێردەکەم لەناو خانووێك و نەفەقەیەك جێی نەهێشتم کە موڵکی خۆی بێت، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ (برۆ)، دەڵێ: منیش ڕۆیشتم تا گەیشتمە ژوورەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم ـ یان گوتی: فەرمانی کرد بانگ کرام بۆ خزمەتی ـ و فەرمووی: چیت گوت؟ دەڵێ: منیش (دووبارە) چیرۆکی مێردەکەمم بۆ گێڕایەوە، جا فەرمووی: لە ماڵەکەت بمێنەوە تا ئەو ماوەیەی لە قورئاندا هاتووە تەواو دەبێت، دەڵێ: جا لە خانووەکەدا عیدەی چوار مانگ و دە ڕۆژم بەسەر برد، دەڵێ: کاتێ سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان ؓ داهات، بەدوایدا ناردم و پرسیاری لێ کردم دەربارەی ئەوە، منیش هەواڵم پێ دا و شوێن (بڕیارەکە) کەوت و بڕیاری پێ دا (بۆ خەڵکی دیکە).

**١٧٣٠**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ؒ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ؓ كَانَ يَرُدُّ الْمُتَوَفَّى عَنْهُنَّ أَزْوَاجُهُنَّ مِنَ الْبَيْدَاءِ، يَمْنَعُهُنَّ الْحَجَّ[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ؒ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ؓ ئافرەتی مێردمردووی لە بەیداء (کە شوێنێکە لە قەراغی زولحولەیفە) دەگەڕاندنەوە، لە حەجکردن قەدەغەی دەکردن.

**١٧٣١**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ؒ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ السَّائِبَ بْنَ خَبَّابٍ تُوُفِّيَ، وَإِنَّ امْرَأَتَهُ جَاءَتْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ؓ، فَذَكَرَتْ لَهُ وَفَاةَ زَوْجِهَا، وَذَكَرَتْ لَهُ حَرْثًا لَهُمْ بِقَنَاةَ، وَسَأَلَتْهُ: هَلْ يَصْلُحُ لَهَا أَنْ تَبِيتَ فِيهِ؟ فَنَهَاهَا عَنْ ذَلِكَ، فَكَانَتْ تَخْرُجُ مِنَ الْمَدِينَةِ سَحَرًا، فَتُصْبِحُ فِي حَرْثِهِمْ، فَتَظَلُّ فِيهِ يَوْمَهَا، ثُمَّ تَدْخُلُ الْمَدِينَةَ إِذَا أَمْسَتْ، فَتَبِيتُ فِي بَيْتِهَا[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ؒ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی سائیبی کوڕی خەبباب وەفاتی کرد، جا خێزانەکەی هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ؓ و باسی وەفاتی مێردەکەی بۆ کرد و باسی ئەوەشی بۆ کرد کە

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٨ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٢ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨٣ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٠٩ في الطلاق، عن مالك به.




کشتوکاڵێکیان هەیە لە قەنات (کە شوێنێکە لە مەدینە، پێویستە لەوێ بمێنمەوە و ڕۆژانە کاری تێدا بکەم) جا پرسیاری لێ کرد: ئاخۆ بۆی دروستە شەو لەوێ بمێنێتەوە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ لێی قەدەغە کرد (گوتی: نابێت)، جا لە کاتی سەحەر لە مەدینە دەردەچوو و بەیانی لەناو زەوییەکەیان دەکردەوە و ڕۆژەکەی لەناو زەوییەکە بەسەر دەبرد، دواتر دەچووە ناو مەدینە کاتێ ئێوارە دادەهات، جا شەوی لە ماڵەوە دەکردەوە.

**١٧٣٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي الْمَرْأَةِ الْبَدَوِيَّةِ يُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، إِنَّهَا تَنْتَوِي حَيْثُ انْتَوَى أَهْلُهَا[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە دەربارەی ئافرەتی کۆچەری کە مێردەکەی دەمرێت (خانەوادەکەشی گەرمیان و کوێستان و جێگۆڕکێ دەکەن)، دەیگوت: لەو شوێنە دەمێنێتەوە کە خانەوادەکەی لێی دەمێننەوە (بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی نزیك لە ماڵی مێردەکەی گیرسانەوە، ئەوە دەبێ لە ماڵی مێردەکەی بمێنێتەوە نەك لەلای خانەوادەکەی).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە بەو شێوەیەیە.

**١٧٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَبِيتُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، وَلاَ الْمَبْتُوتَةُ، إِلاَّ فِي بَيْتِهَا[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئافرەتی مێردمردوو و ئافرەتی تەڵاقدراوی یەکجاری (لە کاتی عیدەدا) نابێ لە هیچ شوێنێك شەو بکاتەوە جگە لە ماڵەکەی خۆی.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٠ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٢ب في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٦، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٢أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٥٩ في الطلاق، كلهم عن مالك به.




## ٣٢- عیدەی ئەو ئافرەتەی منداڵی لە گەورەکەی هەیە و گەورەکەی دەمرێت[١]

**١٧٣٤-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﵀ يَقُولُ: إِنَّ يَزِيدَ بْنَ عَبْدِ الْمَلِكِ فَرَّقَ بَيْنَ رِجَالٍ وَبَيْنَ نِسَائِهِمْ، وَكُنَّ أُمَّهَاتِ أَوْلَادِ رِجَالٍ هَلَكُوا، فَتَزَوَّجُوهُنَّ بَعْدَ حَيْضَةٍ أَوْ حَيْضَتَيْنِ، فَفَرَّقَ بَيْنَهُمْ، حَتَّى يَعْتَدُّونَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، فَقَالَ الْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ: سُبْحَانَ اللهِ يَقُولُ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا ﴿٢٣٤﴾ ﴾ البقرة مَا هُنَّ مِنَ الأَزْوَاجِ[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە قاسمی کوڕی موحەممەد ﵀ بوو دەیگوت: یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك کۆمەڵە پیاوێکی لە ئافرەتەکانیان جیا کردنەوە، لە کاتێکدا ئافرەتەکان کۆیلەی منداڵبووی پیاوانێك بوون مردبوون و ئەو پیاوانە هاوسەرگیرییان لەگەڵ کردبوون دوای یەك یان دوو حەیز، جا لێکی جیا کردنەوە تاوەکوو چوار مانگ و دە ڕۆژ عیدە دەبینن، جا قاسمی کوڕ موحەممەد (ڕای لە کارەکە نەبوو) و گوتی: سبحان الله! خوای پەروەردگار ﷻ لە پەرتووکەکەیدا دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا ﴿٢٣٤﴾ ﴾، خۆ ئەوان زەوج نین (یەك حەیزیان بەسە).

**١٧٣٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ قَالَ: عِدَّةُ أُمِّ الْوَلَدِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا سَيِّدُهَا، حَيْضَةٌ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عیدە (واتە دەرکەوتنی پاکی ڕەحم)ی ئەو ئافرەتەی منداڵی لە گەورەکەی بووە و گەورەکەی مردووە، بریتییە لە حەیزێك (واتە تەنها حەیزێك دەوەستێت دواتر بۆی هەیە شوو بکاتەوە).

---

(١) ـ عِدَّةُ أُمِّ الْوَلَدِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا سَيِّدُهَا.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٣ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٣ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه الشيباني: ٥٩٦ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٠، عن مالك به.




**١٧٣٦- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: عِدَّةُ أُمِّ الْوَلَدِ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا سَيِّدُهَا، حَيْضَةٌ.**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.**

**قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ لَمْ تَكُنْ مِمَّنْ تَحِيضُ، فَعِدَّتُهَا ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ[١].**

واتە: لە قاسمی کوڕی مەحەممەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: عیدە (واتە دەرکەوتنی پاکی ڕەحم)ی ئەو ئافرەتەی منداڵی لە گەورەکەی بووە و گەورەکەی مردووە، بریتییە لە حەیزێك (واتە تەنها حەیزێك دەوەستێت دواتر بۆی هەیە شوو بکاتەوە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمەش ئاوایە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر لەوانە بوو کە حەیزی نەدەبینی (لەبەر بەتەمەنی یان هەر هۆکارێکی دیکە) ئەوە سێ مانگ دەوەستێت.

## ٣٣- عیدەی ئافرەتی کۆیلە کاتێ گەورەکەی یان مێردەکەی وەفات دەکات[٢]

**١٧٣٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ كَانَا يَقُولاَنِ: عِدَّةُ الأَمَةِ إِذَا هَلَكَ عَنْهَا زَوْجُهَا، شَهْرَانِ وَخَمْسُ لَيَالٍ[٣].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ دەیانگوت: عیدەی ئافرەتی کۆیلە کاتێ مێردەکەی دەمرێ، بریتییە لە دوو مانگ و پێنج شەو (واتە نیوەی ئافرەتی ئازاد).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٥ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٤أ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ عِدَّةُ الأَمَةِ إِذَا تُوُفِّيَ سَيِّدُهَا أَوْ زَوْجُهَا.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٦ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٤ب في الطلاق، عن مالك به.




**١٧٣٨-** عَنْ مَالِكٍ ﵀، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، مِثْلَ ذَلِكَ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش هەمان شتی لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕاوەتەوە.

**١٧٣٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الْعَبْدِ يُطَلِّقُ الأَمَةَ طَلَاقًا لَمْ يَبُتَّهَا فِيهِ، لَهُ عَلَيْهَا فِيهِ الرَّجْعَةُ، ثُمَّ يَمُوتُ وَهِيَ فِي عِدَّتِهَا مِنْ الطَّلَاقِ، إِنَّهَا تَعْتَدُّ عِدَّةَ الأَمَةِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، شَهْرَيْنِ وَخَمْسَ لَيَالٍ، وَإِنَّهَا إِنْ عَتَقَتْ وَلَهُ عَلَيْهَا رَجْعَةٌ، ثُمَّ تَخْتَرْ فِرَاقَهُ بَعْدَ الْعِتْقِ حَتَّى يَمُوتَ، وَهِيَ فِي عِدَّتِهَا مِنْ طَلَاقِهِ، اعْتَدَّتْ عِدَّةَ الْحُرَّةِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَذَلِكَ أَنَّهَا إِنَّمَا وَقَعَتْ عَلَيْهَا عِدَّةُ الْوَفَاةِ بَعْدَ مَا عَتَقَتْ، فَعِدَّتُهَا عِدَّةُ الْحُرَّةِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو پیاوە کۆیلەیەی ئافرەتی کۆیلە تەڵاق دەدات بەتەڵاقێك کە یەکجاری نییە و گەڕاندنەوەی بۆ هەیە، دواتر پیاوەکە دەمرێت لە کاتێکدا ئافرەتەکە لە عیدەی تەڵاقەکەدایە، گوتوویەتی: عیدەی ئافرەتی کۆیلەی پیاومردوو دەبینێت، دوو مانگ و پێنج شەو، وە ئەگەر ئافرەتەکە ئازاد کرا و پیاوەکەش گەڕاندنەوەی بۆ هەبوو، دواتر ئافرەتەکە دوای ئازادبوونی جیابوونەوەی هەڵبژارد تا پیاوەکە مرد، لە کاتێکدا ئافرەتەکە هێشتا لە عیدەی تەڵاقی پیاوەکەدایە، ئەوە عیدەی ئافرەتی ئازادی مێردمردوو دەبینێت، چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەوەش لەبەرئەوەیە عیدەی وەفاتی کەوتۆتە سەر دوای ئەوەی ئازاد بووە، کەواتە عیدەکەی بریتییە لە عیدەی ئافرەتی ئازاد.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە.

---

(١) ـ مقطوع ضعيف.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٨ في الطلاق، عن مالك به.



## ٣٤- ئەوەی هاتووە دەربارەی عەزل (ڕێگریكردن لە منداڵبوون)[١]

**١٧٤٠**- عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَرَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْعَزْلِ؟ فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ، فَأَصَبْنَا سَبْيًا مِنْ سَبْيِ الْعَرَبِ، فَاشْتَهَيْنَا النِّسَاءَ، وَاشْتَدَّتْ عَلَيْنَا الْعُزْبَةُ، وَأَحْبَبْنَا الْفِدَاءَ، فَأَرَدْنَا أَنْ نَعْزِلَ، فَقُلْنَا: نَعْزِلُ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا قَبْلَ أَنْ نَسْأَلَهُ؟ فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: مَا عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا، مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، إِلاَّ وَهِيَ كَائِنَةٌ[٢].

واتە: لە ئیبنو موحەیریزەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: چوومە ناو مزگەوت، ئەبو سەعیدی خودریم ﷺ بینی و لەلای دانیشتم و پرسیارم لێی كرد دەربارەی عەزل؟ ئەبو سەعیدی خودرییش ﷺ گوتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزای بەنو مەصتەڵەق دەرچووین، جا ئافرەتی عەرەبمان بوو بە قسمەت، ئێمەش حەزمان چووبووە ئافرەت و تەنیایی و بێخێزانی لەسەرمان قورس بوو و حەزمان لە دەسكەوتی فرۆشتنەوەی ئافرەتەكان بوو، جا ویستمان عەزل بكەین (چونكە ئەگەر ئافرەتەكان حەملیان پەیدا ببێت ئەوە دروست نابێت بفرۆشرێنەوە)، بۆیە گوتمان: (چۆن دەبێ) عەزل بكەین لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوماندایە بەر لەوەی پرسیاری لێ بكەین؟ جا پرسیارمان لێ كرد دەربارەی ئەوە؟ ئەویش فەرمووی: لەسەرتان واجب نییە خۆتان لە عەزل دوور بگرن، هیچ نەفسێك نییە بڕیاری دروستبوونی دەرچووبێت تا ڕۆژی دوایی، حەتمەن دروست دەبێت (ئێوە ناتوانن مەنعی بكەن، جا كە مەنع دەكەن كەواتە بڕیار نەدراوە خەلق بكرێت بۆیە دەتوانن مەنع بكەن).

**١٧٤١**- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَعْزِلُ[٣].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْعَزْلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٩ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٧ في الطلاق؛ وابن حنبل: ١١٦٦٥؛ والبخاري: ٢٥٤٢؛ وأبو داود: ٢١٧٢؛ والقابسي: ١٦١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح.





واتە: لە عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): عەزلی دەکرد (واتە مەنعی منداڵبوونی دەکرد).

**١٧٤٢-** عَنِ ابْنِ أَفْلَحَ، مَوْلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنْ أُمِّ وَلَدٍ لأَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّهُ كَانَ يَعْزِلُ[1].

واتە: لە ئیبنو ئەفلەحی خزمەتکاری ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە ئافرەتێکی کۆیلەی منداڵبووی لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): ئەبو ئەیوب مەنعی منداڵبوونی دەکرد.

**١٧٤٣-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّهُ كَانَ لاَ يَعْزِلُ، وَكَانَ يَكْرَهُ الْعَزْلَ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی منداڵبوونی مەنع نەکردووە و مەنعی پێ کارێکی ناپەسەند بووە.

**١٧٤٤-** عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرِو بْنِ غَزِيَّةَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا عِنْدَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، فَجَاءَهُ ابْنُ قَهْدٍ، رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، فَقَالَ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، إِنَّ عِنْدِي جَوَارِيَ لِي، لَيْسَ نِسَائِي اللاَّتِي أُكِنُّ بِأَعْجَبَ إِلَيَّ مِنْهُنَّ، وَلَيْسَ كُلُّهُنَّ يُعْجِبُنِي أَنْ تَحْمِلَ مِنِّي، أَفَأَعْزِلُ؟ فَقَالَ زَيْدٌ ﷺ: أَفْتِهِ يَا حَجَّاجُ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَغْفِرُ اللهُ لَكَ، إِنَّمَا نَجْلِسُ عِنْدَكَ لِنَتَعَلَّمَ مِنْكَ، قَالَ: أَفْتِهِ، قَالَ: فَقُلْتُ: هُوَ حَرْثُكَ، إِنْ شِئْتَ سَقَيْتَهُ، وَإِنْ شِئْتَ أَعْطَشْتَهُ، قَالَ: وَكُنْتُ أَسْمَعُ ذَلِكَ مِنْ زَيْدٍ ﷺ، فَقَالَ زَيْدٌ ﷺ: صَدَقَ[3].

واتە: لە حەجاجی کوڕی عەمری کوڕی غەزییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی لەلای زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دانیشتبوو، جا ئیبنو قەهد کە پیاوێکی خەڵکی یەمەن بوو هات بۆلای و گوتی: ئەی ئەبو سەعید، من چەند جارییەیەکم هەن

---

(١) ـ موقوف ضعيف.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٨٠أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣١ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٩ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٥٠ في النكاح، كلهم عن مالك به.

ئافرەتی خۆم لەبەر چاوم گەورەتر نین لەوان، حەزیش ناکەم گشتیان حەملیان لە من هەبێ، جا ئایا عەزل بکەم؟ زەیدیش ﷺ گوتی: فەتوای بۆ بدە ئەی حەجاج، دەڵێ: منیش گوتم: خوا عافوت کا، ئێمە بۆ ئەوە لەلای تۆ دادەنیشین تا لێتەوە فێر ببین، زەید ﷺ گوتی: فەتوای بۆ بدە، دەڵێ: منیش گوتم: ئەوە کێڵگەی خۆتە، ئەگەر حەز بکەیت ئاوی بدە (واتە منداڵ مەنع مەکە)، ئەگەر حەزیش بکەیت تونووی بکە (واتە مەنع بکە)، دەڵێ (گوتم): من ئەوەم لە زەیدەوە گوێ لێ بووە، جا زەید ﷺ گوتی: ڕاست دەکات.

**١٧٤٥-** عَنْ حُمَيْدِ بْنِ قَيْسٍ الْمَكِّيِّ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ، يُقَالُ لَهُ: ذَفِيفٌ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ الْعَزْلِ، فَدَعَا جَارِيَةً لَهُ، فَقَالَ: أَخْبِرِيهِمْ، فَكَأَنَّهَا اسْتَحْيَتْ، فَقَالَ: هُوَ ذَلِكَ، أَمَّا أَنَا فَأَفْعَلُهُ، يَعْنِي أَنَّهُ يَعْزِلُ[١].

واتە: لە حومەیدی کوڕی قەیسی مەکییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پیاوێکەوە کە پێی دەگوترا: زەفیف گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: پرسیار لە ئیبنو عەبباس کرا ﷺ دەربارەی عەزل (مەنعی منداڵبوون)، جا بانگی جارییەیەکی خۆی کرد و گوتی: هەواڵیان پێ بدە، جا وەك بڵێی جارییەکە شەرمی کرد، جا ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: بەم شێوەیە، هەرچی منم ئەنجامی دەدەم، واتە مەبەستی ئەوە بوو عەزل دەکات.

**١٧٤٦-** [**فتوى**] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَعْزِلُ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ الْحُرَّةَ إِلاَّ بِإِذْنِهَا، وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَعْزِلَ عَنْ أَمَتِهِ بِغَيْرِ إِذْنِهَا[٢]، وَمَنْ كَانَتْ تَحْتَهُ أَمَةُ قَوْمٍ، فَلَا يَعْزِلُ إِلاَّ بِإِذْنِهِمْ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پیاو نابێ ئافرەتی ئازاد لە منداڵبوون مەنع بکات تەنها بە مۆڵەتی خۆی نەبێت، (بەڵام) کێشە نییە ئافرەتی کۆیلەی خۆی لە منداڵبوون مەنع بکات بەبێ مۆڵەتی ئەو، وە هەرچی دەربارەی ئەو کەسەشە کە ئافرەتێکی کۆیلەی خەڵکانێکی لەژێر نیکاحدایە (ئافرەتەکە کۆیلەی خەڵکەکەیە)، ئەوە نابێ مەنعی منداڵبوون بکات تەنها بە مۆڵەتی خاوەنی ئافرەتەکە نەبێت.

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٢ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٨٠ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٣ في الطلاق، عن مالك به.

## ٣٥- ئەوەی هاتووە دەربارەی تەعزیەداری[1]

**١٧٤٧-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ هَذِهِ الأَحَادِيثَ الثَّلاَثَةَ: قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ ﷺ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ، خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ، فَدَهَنَتْ بِهِ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَحَتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا[2].

واتە: لە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە هەواڵی بەو سێ فەرموودەیە داوە: زەینەب گوتوویەتی: چووم بۆ لای ئوممو حەبیبەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەبو سوفیانی کوڕی حەڕبی باوکی وەفاتی کرد، جا ئوممو حەبیبە ﷺ داوای بۆنێکی خۆشی کرد کە زەردایەتی خەلوقی تیا بوو (کە جۆرێکە لە گوڵاو) یان شتێکی دیکە بوو (گرنگ ئەوەیە بۆنی خۆش بوو)، جا بۆنەکەی دا لە کچۆڵەیەك، دواتر (پاشماوەکەی دەستی) هێنا بە ڕوومەتەکانی، دواتر گوتی: سوێند بە خوا چ کارم بە بۆنی خۆش نییە تەنها ئەوە نەبێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: حەڵاڵ و ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا ﷻ و ڕۆژی دوایی هەبێت، لە سێ شەو زیاتر لەسەر هیچ مردووێك تازیەداری بکات، تەنها لەسەر مێرد نەبێت لەسەری واجبە چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەداری بکات.

**١٧٤٨-** قَالَتْ زَيْنَبُ: ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ، فَمَسَّتْ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ حَاجَةٌ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الإِحْدَادِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٧٥ في الطلاق؛ وابن حنبل: ٢٦٧٩٧، وفي: ٢٦٨٠٨؛ والبخاري: ١٢٨١ في الجنائز، وفي: ٥٣٣٤ في الطلاق؛ والترمذي: ١١٩٥ في الطلاق؛ وابن حبان: ٤٣٠٤؛ وأبي يعلى الموصلي: ٧١٥٦؛ والقابسي: ٣١٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبي يعلى الموصلي: ٧١٥٦، عن مالك به.

واتە: زەینەبی كچی ئەبو سەلەمە گوتوویەتی: دواتر چووم بۆ لای زەینەبی كچی جەحش ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ كاتێ براكەی وەفاتی كرد، جا داوای بۆنێكی خۆشی كرد و لە خۆی دا، دواتر گوتی: سوێند بەخوا چ كارم بە بۆنی خۆش نییە تەنها ئەوە نەبێ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: حەڵاڵ و ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا ﷻ و ڕۆژی دوایی هەبێت، لە سێ شەو زیاتر لەسەر هیچ مردووێك تازیەداری بكات، تەنها لەسەر مێرد نەبێت لەسەری واجبە چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەداری بكات.

**١٧٤٩-** قَالَتْ زَيْنَبُ: وَسَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنَيْهَا، أَفَتَكْحُلُهُمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا هِيَ: ﴿أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴿٢٣٤﴾﴾ البقرة وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ.

قَالَ حُمَيْدُ بْنُ نَافِعٍ ﷺ: فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ ﷺ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، دَخَلَتْ حِفْشًا، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلاَ شَيْئًا، حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَيْرٍ، فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعْرَةً، فَتَرْمِي بِهَا، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ، مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ[1].

قَالَ مالِكٍ ﷺ: وَالْحِفْشُ: الْبَيْتُ الرَّدِيءُ، وَتَفْتَضُّ، تَمْسَحُ بِهِ جِلْدَهَا كَالنُّشْرَةِ.

واتە: زەینەب گوتوویەتی: گوێم لە دایكم ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیگوت: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كچەكەم مێردەكەی وەفاتی كردووە و چاویشی زۆر ژان دەكات، جا ئایا كل بكاتە چاوەكانی، پێغەمبەری خواش ﷺ دوو جار یان سێ جار فەرمووی: نەخێر، هەموو جارەكان فەرمووی: نەخێر، (فەرمووی): ـ تازیەدارییەكەی تەنها ـ چوار مانگ و دە ڕۆژە (واتە ئەوەندەتان پێ زۆرە و خۆتان پێ ڕاناگیرێ!)، لە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧١٩ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٨؛ ومسلم: الطلاق: ٥٨؛ والنسائي: ٣٥٣٣ في الطلاق؛ وأبو داود: ٢٢٩٩ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

کاتێکدا هەر یەکێك لە ئێوە لە سەردەمی نەزانیدا لە کۆتایی ساڵدا قشپلی فڕێ دەدا (واتە یەك ساڵ تازیەداری دەکرد بەوپەڕی خۆپەرێشانکردن).

جا حومەیدی کوڕی نافیع ﷺ گوتوویەتی: جا بە زەینەبم گوت: بۆچی ئافرەتی تازیەدار قشپلی فڕێ دەدا لە کۆتایی ساڵدا (ئەوە چۆن بووە)؟ زەینەبیش ﷺ گوتی: کاتێ ئافرەت مێردەکەی وەفاتی دەکرد، دەچووە ناو خانووێکی زۆر ناڕێك و خراپ و خراپترین جلی دەپۆشی و هیچ گوڵاو و شتێکی خۆشی لە خۆی نەدەدا، تاوەکوو ساڵێك تێ دەپەڕی (بەسەر وەفاتکردنی مێردەکەی)، دواتر گوێدرێژێك یان بزنێك یان باڵندەیەك دەهێندرا و دەستی پێدا دەهێنا ـ یان شەرمگای خۆی پێ خاوێن دەکردەوە ـ جا کەم وا بوو ئەو کارە لەگەڵ شتێك بکات بژیێت حەتمەن گیانلەبەرەکە دەمرد، دواتر (لە کۆتایی ساڵەکە) قشپلی پێ دەدرا و ئەویش فڕێی دەدا (وەك هێمایێك بۆ تەواوبوون و تێپەڕاندنی ناڕەحەتی و حەڵاڵبوونەوە بۆ شووکردنەوە)، دواتر دەگەڕایەوە بۆ ئەو شتەی دەیەویست و پێی خۆش بوو لە بۆنی خۆش و شتی دیکە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: «الْحِفْشُ» واتە: ماڵی خراپە، «تَفْتَضُّ»یش واتە: دەستی دەهێنا بەسەر پێستەکەی وەك نوشتە (واتە بڕوایان وا بوو بەو دەستهێنانە بەسەر ئەو ئاژەڵە کارەکەیان زوو لە کۆڵ دەکاتەوە، وەك نوشتە).

**١٧٥٠**- عَنْ عَائِشَةَ، وَحَفْصَةَ ﷺ، زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيْتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ[1].

واتە: لە عائیشە و حەفصەی ﷺ خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویانە): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ و ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی بە خوا ﷻ و ڕۆژی دوایی هەبێت، لە سێ شەو زیاتر لەسەر هیچ مردووێك تازیەداری بکات، تەنها بۆ مێرد نەبێت (لەسەری واجبە چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەداری بکات).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٧٦ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٩٠ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٣٩؛ وابن حنبل: ٢٦٤٩٧؛ وابن حبان: ٤٣٠٢؛ والقابسي: ٢٦٣، كلهم عن مالك به.




**١٧٥١- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ لِامْرَأَةٍ حَادٍّ عَلَى زَوْجِهَا، اشْتَكَتْ عَيْنَيْهَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ مِنْهَا: اكْتَحِلِي بِكُحْلِ الْجَلَاءِ بِاللَّيْلِ، وَامْسَحِيهِ بِالنَّهَارِ[١].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئوممو سەلەمەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتێکی تازیەداری گوتووە کە مێردی مردبوو و چاوی ژانی هەبوو و ژانەکە گەلێك زۆر ببوو، پێی گوت: بەشەو کلی جەلاء بکەرە چاوت و بەڕۆژیش بیسڕەوە (چونکە تازیەت هەیە).

**١٧٥٢- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُمَا كَانَا يَقُولَانِ فِي الْمَرْأَةِ يُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا: إِنَّهَا إِذَا خَشِيَتْ عَلَى بَصَرِهَا مِنْ رَمَدٍ، أَوْ شَكْوٍ أَصَابَهَا، إِنَّهَا تَكْتَحِلُ، وَتَتَدَاوَى بِدَوَاءٍ أَوْ كُحْلٍ، وَإِنْ كَانَ فِيهِ طِيبٌ[٢].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە سالمی کوڕی عەبدوڵلا و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ پێی گەیشتووە دەربارەی ئەو ئافرەتەی مێردەکەی مردووە گوتوویانە: ئەگەر لە چاوەکانی ترسا لەبەر ئیلتیهاب و سوتانەوە یان ئێشێك کە تووشی بووە (بەهۆی گریان)، ئەوە بۆی هەیە کل بکاتە چاوەکانی و دەرمانێك یان کل بە چارەسەر بەکار بێنێت، هەرچەندە بۆنی خۆشیشی تیا بێت.

**١٧٥٣- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا كَانَتِ الضَّرُورَةُ، فَإِنَّ دِينَ اللهِ يُسْرٌ.**

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (بەڵێ) ئەگەر زەڕورەتێك هەبوو (بۆی دروستە)، چونکە ئایینی خوا ئاسانە.

**١٧٥٤- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ، اشْتَكَتْ عَيْنَيْهَا، وَهِيَ حَادٌّ عَلَى زَوْجِهَا عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، فَلَمْ تَكْتَحِلْ حَتَّى كَادَتْ عَيْنَاهَا تَرْمَصَانِ[٣].**

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢١ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٤ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٦أ في الطلاق؛ والشيباني: ٥٨٩ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): صەفییەی کچی ئەبو عوبەید چاوی زۆر ژانی هەبوو، لە کاتێکدا تازیەداری مێردەکەی بوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، جا (لەگەڵ ئەو حاڵەش) کلی نەکردە چاوی تا خەریك بوو چاوی جەڕاحەتی لێ بتکێت.

١٧٥٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: تَدَّهِنُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، بِالزَّيْتِ وَالشَّبْرَقِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، إِذَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ طِيبٌ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی مێردمردوو (لە ماوەی تازیەداریدا) بۆی هەیە زەیتی زەیتون و زەیتی کونجی و شتی لەو جۆرە بەکار بێنێ، (بە مەرجێك) ئەگەر بۆنی خۆشی تیا نەبێ.

١٧٥٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ تَلْبَسُ الْمَرْأَةُ الْحَادُّ عَلَى زَوْجِهَا شَيْئًا مِنَ الْحَلْيِ: خَاتَمًا، وَلاَ خَلْخَالاً، وَلاَ غَيْرَ ذَلِكَ مِنَ الْحَلْيِ، وَلاَ تَلْبَسُ شَيْئًا مِنَ الْعَصْبِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَصْبًا غَلِيظًا، وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا بِشَيْءٍ مِنَ الصِّبْغِ إِلاَّ بِالسَّوَادِ، وَلاَ تَمْتَشِطُ إِلاَّ بِالسِّدْرِ، وَمَا أَشْبَهَهُ مِمَّا لاَ يَخْتَمِرُ فِي رَأْسِهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتی تازیەدار بەسەر مێردەکەی هیچ خشڵێك ناپۆشێت: نە گوستیلە و نە خڵخاڵ و نە جگە لەوانەش لە خشڵ، هەروەها عەبای یەمەنی ناپۆشێت (کە بەر لە چنینی ڕەنگ دەکرێت)، تەنها هی ئەستور نەبێ (واتە ئەستور دروستە چونکە جوانی زۆری پێوە نییە)، وە نابێ جلی ڕەنگکراو بە هیچ ڕەنگێك بپۆشێت تەنها ڕەنگی ڕەش نەبێت، وە نابێ قژی بە هیچ شتێك شانە بکات بە جگە لە گیای سیدر و شتی لەو جۆرە کە نابێتە هەویر بەسەریەوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٦ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٧ في الطلاق؛ والحدثاني: ٣٧٦ب في الطلاق، عن مالك به.




**١٧٥٧-** عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، وَهِيَ حَادٌّ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ، وَقَدْ جَعَلَتْ عَلَى عَيْنَيْهَا صَبِرًا، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا أُمَّ سَلَمَةَ؟ فَقَالَتْ: إِنَّمَا هُوَ صَبِرٌ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: اجْعَلِيهِ فِي اللَّيْلِ، وَامْسَحِيهِ بِالنَّهَارِ[١].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆتە لای ئوم سەلەمە لە کاتێکدا تازیەدار بوو لەسەر وەفاتی ئەبو سەلەمە، جا ئالۆڤێرای لەسەر چاوەکانی دانابوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە ئەی ئوم سەلەمە؟ ئەویش گوتی: ئەوە ئالۆڤێرایە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەشەو دایبنێ و بەڕۆژیش بیسڕە (لایبەرە).

**١٧٥٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الإِحْدَادُ عَلَى الصَّبِيَّةِ الَّتِي لَمْ تَبْلُغِ الْمَحِيضَ، كَهَيْئَتِهِ عَلَى الَّتِي قَدْ بَلَغَتِ الْمَحِيضَ، تَجْتَنِبُ مَا تَجْتَنِبُ الْمَرْأَةُ الْبَالِغَةُ، إِذَا هَلَكَ زَوْجُهَا[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: تازیەداری (مردنی مێرد) لەسەر ئەو ئافرەتەی باڵغ نەبووە وەك ئەو ئافرەتە وایە کە باڵغ بووە، خۆی دوور دەگرێت لەو شتانەی ئافرەتی باڵغ خۆی لێ دوور دەگرێت، کاتێ مێردەکەی وەفات دەکات.

**١٧٥٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: تُحِدُّ الأَمَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، شَهْرَيْنِ وَخَمْسَ لَيَالٍ مِثْلَ عِدَّتِهَا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئافرەتی کۆیلە کاتێ مێردەکەی دەمرێ، بەهەمان شێوەی عیدەکەی، دوو مانگ و پێنج شەو تازیەداری دەکات.

**١٧٦٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: لَيْسَ عَلَى أُمِّ الْوَلَدِ إِحْدَادٌ، إِذَا هَلَكَ عَنْهَا سَيِّدُهَا، وَلاَ عَلَى أَمَةٍ يَمُوتُ عَنْهَا سَيِّدُهَا إِحْدَادٌ، وَإِنَّمَا الإِحْدَادُ عَلَى ذَوَاتِ الأَزْوَاجِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی منداڵی هەیە لە گەورەکەی تازیەداری لەسەر نییە کاتێ گەورەکەی دەمرێت، وە ئافرەتی

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٥ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٢٨ في الطلاق، عن مالك به.

کۆیلەش (کە منداڵی لە گەورەکەی نەبووە) تازیەداری لەسەر نییە کاتێ گەورەکەی دەمرێت، چونکە تازیەداری لەسەر ئافرەتانی خاوەن زەواجە (نەك ئەو ئافرەتانەی بە کڕین و موڵك حەڵاڵ بوون).

**١٧٦١- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تَقُولُ: تَجْمَعُ الْحَادُّ رَأْسَهَا بِالسِّدْرِ وَالزَّيْتِ[1].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگوت: ئافرەتی تازیەدار بۆی هەیە قژی شانە بکات بە سیدر و زەیت (بە مەرجێك بۆنی خۆشی تیا نەبێت).

---

(١) ـ موقوف ضعيف.



# پەرتووکی شیرخواردن[1]



---

(١) ـ كِتَابُ الرَّضَاع.

## ١- شیرپێدان بە منداڵی بچووك[1]

**١٧٦٢**- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵂، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂ أَخْبَرَتْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ عِنْدَهَا، وَأَنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ ﵂، قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أُرَاهُ فُلَانًا، لِعَمٍّ لِحَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ كَانَ فُلَانٌ حَيًّا، لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، دَخَلَ عَلَيَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: نَعَمْ، إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ[2].

واتە: لە عەمرەی كوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە عائیشەی دایكی باوەڕداران ﵂ هەواڵی پێ داوە بەوەی (جارێكیان) پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای بووە، جا عائیشە ﵂ گوێی لە دەنگی پیاوێك بوو لە ماڵی حەفصە ﵂ داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی دەكرد، عائیشە ﵂ دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە پیاوێكە داوای مۆڵەت دەكات بۆ ماڵی تۆ (ماڵی حەفصە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پێم وایە فڵانە، ناوی مامی شیری حەفصەی هێنا، جا عائیشە ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەواتە ئەگەر فڵان زیندوو بووایە، ناوی مامی شیری خۆی هێنا، ئایا دەیتوانی (وەك مەحرەم) بێت بۆ لام؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: شیردان مەحرەمییەت دروست دەكات وەك چۆن منداڵبوون (و نەسەب و ڕەچەڵەك) مەحرەمییەت دروست دەكات.

**١٧٦٣**- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﵀، عَنْ أَبِيهِ ﵀، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَ عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ، يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ عَلَيَّ، حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، قَالَتْ: فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّهُ عَمُّكِ فَأْذَنِي لَهُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ، وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، فَقَالَ: إِنَّهُ عَمُّكِ، فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ.

---

(١) ـ رَضَاعَةُ الصَّغِيرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٥ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨١ في الطلاق؛ والشيباني: ٦١٦ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٥٧؛ وابن حنبل: ٢٥٤٩٢؛ والبخاري: ٢٦٤٦ في الشهادات، وفي: ٣١٠٥ في فرض الخمس، وفي: ٥٠٩٩ في النكاح؛ ومسلم: الرضاع: ١؛ والنسائي: ٣٣١٣ في النكاح؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٨٦؛ والدارمي: ٢٢٤٧ في النكاح، كلهم عن مالك به.

قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: وَذَلِكَ بَعْدَ مَا ضُرِبَ عَلَيْنَا الْحِجَابُ.

وَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلَادَةِ[1].

واتە: لە هیشامی کوڕی عوڕوەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﵀ گێڕاویەتەوە، ئەویش لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: مامێکی شیریم هات و داوای مۆڵەتی کرد بێتە لام، منیش مۆڵەتم نەدا بێتە لام گوتم تا پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم دەربارەی ئەو بابەتە، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و پرسیارم لێ کرد دەربارەی ئەو بابەتە، ئەویش فەرمووی: ئەو مامتە مۆڵەتی بدە، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەت شیری بە من داوە خۆ پیاو شیری پێ نەداوم! ئەویش فەرمووی: مامتە، (دروستە) با بێتە لات.

عائیشە ﵂ گوتوویەتی: ئەو بابەتە دوای ئەوە بوو کە حیجاب و پەردەدانانمان لەسەر واجب کرا.

جا عائیشە ﵂ دەیگوت: شیردان مەحرەمییەت دروست دەکات وەك چۆن منداڵبوون (و نەسەب) مەحرەمییەت دروست دەکات.

**١٧٦٤-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵀، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ أَفْلَحَ، أَخَا أَبِي الْقُعَيْسِ، جَاءَ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهَا، وَهُوَ عَمُّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، بَعْدَ أَنْ نَزَلَ الْحِجَابُ، قَالَتْ: فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ عَلَيَّ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي صَنَعْتُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آذَنَ لَهُ عَلَيَّ[2].

واتە: لە عوڕوەی کوڕی زوبەیرەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ گێڕاویەتەوە هەواڵی پێ داوە بەوەی ئەفلەحی برای ئەبو قوعەیس هات داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی کرد، کە مامی بوو لە شیر، (ئەوە)

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٦ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٢ في الطلاق؛ والبخاري: ٥٢٣٩ في النكاح؛ وابن حبان: ٤١٠٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٧ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٣ في الطلاق؛ وابن حنبل: ٢٥٤٨٢؛ والبخاري: ٥١٠٣ في النكاح؛ ومسلم: الرضاع: ٣؛ والنسائي: ٣٣١٦ في النكاح؛ والقابسي: ٣٩، كلهم عن مالك به.

دوای ئەوە بوو ئایەتی حیجاب دابەزیبوو، عائیشە ﵂ دەڵێ: منیش مۆڵەتم پێ نەدا بێتە لام (پێم وا بوو مەحرەم نییە)، جا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە هەواڵم پێ دا بەوەی ئەنجامم داوە، ئەویش فەرمانی پێ کردم مۆڵەتی بدەم بێتە لام (چونکە مامە لە شیر و مەحرەمە).

**١٧٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا كَانَ فِي الْحَوْلَيْنِ وَإِنْ كَانَ مَصَّةً وَاحِدَةً فَهُوَ يُحَرِّمُ[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: ئەو شیرخواردنەی دەکەوێتە ماوەی دوو ساڵی، هەرچەندە یەك قومیش بێت مەحرەمییەت دروست دەکات.

**١٧٦٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَأَرْضَعَتْ إِحْدَاهُمَا غُلاَمًا، وَأَرْضَعَتِ الأُخْرَى جَارِيَةً، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ يَتَزَوَّجُ الْغُلاَمُ الْجَارِيَةَ، فَقَالَ: لاَ، اللِّقَاحُ وَاحِدٌ[٢].

واتە: لە عەمری کوڕی شەریدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك دوو خێزانی هەبن، یەکێکیان شیر بدات بە کوڕێك، ئەوەی دیکەشیان شیر بدات بە کچێك، پێی گوترا: ئایا دروستە کوڕەکە هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکە بکات؟ گوتی: نەخێر، ئاوەکە یەکە (واتە چونکە دایکی شیری هەردووکیان یەك مێردیان هەیە).

**١٧٦٧-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ كَانَ يَقُولُ: لاَ رَضَاعَةَ إِلاَّ لِمَنْ أُرْضِعَ فِي الصِّغَرِ، وَلاَ رَضَاعَةَ لِكَبِيرٍ[٣].

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٨ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٣أفي الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٢ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٣٩ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٤ في الطلاق؛ والشيباني: ٦١٩ في الطلاق؛ والشافعي: ١٤٦٠؛ والترمذي: ١١٤٩ في الرضاع، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤١ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٤أفي الطلاق؛ والشيباني: ٦١٥ في الطلاق، كلهم عن مالك به.



واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: شیردان (مەحرەمییەت دروست ناکات) تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە بەبچووکی شیری پێ دراوە، شیرپێدان بۆ گەورە نییە (مەحرەمییەت دانامەزرێنێت).

**١٧٦٨-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ أَرْسَلَتْ بِهِ، وَهُوَ يَرْضَعُ إِلَى أُخْتِهَا أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَتْ: أَرْضِعِيهِ عَشْرَ رَضَعَاتٍ حَتَّى يَدْخُلَ عَلَيَّ، قَالَ سَالِمٌ: فَأَرْضَعَتْنِي أُمُّ كُلْثُومٍ ثَلاَثَ رَضَعَاتٍ، ثُمَّ مَرِضَتْ، فَلَمْ تُرْضِعْنِي غَيْرَ ثَلاَثِ مَرَّاتٍ، فَلَمْ أَكُنْ أَدْخُلُ عَلَى عَائِشَةَ ﷺ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ أُمَّ كُلْثُومٍ لَمْ تُتِمَّ لِي عَشْرَ رَضَعَاتٍ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەواڵی داوەتێ بەوەی عائیشەی دایکی بڕواداران ﷺ (کاتی خۆی) ناردوویەتی بۆ لای خوشکەکەی کە ئوم کەلسومی کچی ئەبو بەکرە و پێی گوتووە: دە ژەم شیری بدەرێ تا بتوانێت (وەك مەحرەمێك) هاموشۆم بکات، سالم دەڵێت: جا ئوم کەلسوم سێ ژەم شیری پێ داوم، دواتر نەخۆش بووە، نەیتوانیوە لە سێ ژەم زیاترم پێ بدات، جا بۆیە ناچم بۆ لای عائیشە ﷺ (وەك مەحرەم)، لەبەرئەوەی ئوم کەلسوم دە ژەم شیرپێدانی بۆ تەواو نەکردووم (بۆیە دروست نییە).

**١٧٦٩-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ ﷺ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ حَفْصَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ أَرْسَلَتْ بِعَاصِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَعْدٍ إِلَى أُخْتِهَا فَاطِمَةَ بِنْتِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ تُرْضِعُهُ عَشْرَ رَضَعَاتٍ لِيَدْخُلَ عَلَيْهَا، وَهُوَ صَغِيرٌ يَرْضَعُ، فَفَعَلَتْ، فَكَانَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا[٢].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە صەفییەی کچی ئەبو عوبەید ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی حەفصەی دایکی باوەڕداران ﷺ عاصمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی نارد بۆ لای فاتیمەی کچی عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ خوشکی، تا دە

---

(١) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٠ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٦ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٣ في الطلاق؛ والشافعي: ١٠٨٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٢ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٦أ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٤ في الطلاق؛ والشافعي: ١٠٨٤، كلهم عن مالك به.




ژەم شیری پێ بدات بۆ ئەوەی بتوانێت (وەك مەحرەمێك) هاموشۆی بكات، لە كاتێكدا بچووك بوو، جا خوشكەكەی ئەنجامی دا، (دواتر عاصم وەك مەحرەم) دەچوو بۆ لای حەفصە (چونكە ببوو بە پوری شیری بۆی).

**١٧٧٠-** أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا مَنْ أَرْضَعَهُ أَخَوَاتُهَا، وَبَنَاتُ أَخِيهَا، وَلاَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا مَنْ أَرْضَعَهُ نِسَاءُ إِخْوَتِهَا[١].

واتە: عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ ئەو كەسانەی كە خوشكەكانی و كچی براكانی شیریان پێ دابوون بەمەحرەمییەت دەهاتن بۆ لای (چونكە دەبوو بە پوریان لە شیر)، بەڵام ئەو كەسانەی كە خێزانی براكانی شیریان پێ دابوون بەمەحرەمییەت نەدەهاتن بۆ لای.

**١٧٧١-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُقْبَةَ ﵀، أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ عَنِ الرَّضَاعَةِ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﵀: كُلُّ مَا كَانَ فِي الْحَوْلَيْنِ، وَإِنْ كَانَتْ قَطْرَةً وَاحِدَةً فَهُوَ يُحَرِّمُ، وَمَا كَانَ بَعْدَ الْحَوْلَيْنِ، فَإِنَّمَا هُوَ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ، قَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ عُقْبَةَ ﵀: ثُمَّ سَأَلْتُ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ ﵀، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ ﵀[٢].

واتە: لە ئیبراهیمی كوڕی عوقبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە سەعیدی كوڕی موسەیەب ﵀ كردووە دەربارەی شیردان، سەعیدیش ﵀ گوتوویەتی: هەر شیردانێك لە ماوەی دوو ساڵیدا بێت، هەرچەندە یەك دڵۆپیش بێت مەحرەمییەت دروست دەكات، ئەوەشی دوای دوو ساڵی بێت، ئەوە خواردنێكە و دەیخوات (مەحرەمییەت دروست ناكات)، ئیبراهیمی كوڕی عوقبە ﵀ گوتوویەتی: دواتر پرسیارم لە عوروەی كوڕی زوبەیر ﵀ كرد، ئەویش هەمان قسەی سەعیدی كوڕی موسەیەبی كرد ﵀.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٣ في الرضاع؛ والشيباني: ٦١٨ في الطلاق، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٤ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٧ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٠ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

**١٧٧٢**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: لاَ رَضَاعَةَ إِلاَّ مَا كَانَ فِي الْمَهْدِ، وَإِلاَّ مَا أَنْبَتَ اللَّحْمَ وَالدَّمَ[١].

واته: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب بوو ﷺ دەیگوت: شیردان (مەحرەمییەت دروست ناکات) تەنها ئەو شیردانە نەبێت کە لە ماوەی ناو بێشکەیە، هەروەها تەنها ئەو شیردانە نەبێت کە خوێن و گۆشت دروست دەکات (کە لە ماوەی گەشەی بچووکیدایە).

**١٧٧٣**- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: الرَّضَاعَةُ قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا يُحَرِّمُ، وَالرَّضَاعَةُ مِنْ قِبَلِ الرِّجَالِ تُحَرِّمُ[٢].

واته: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: شیردان کەمییەکەی و زۆرییەکەی مەحرەمییەت دروست دەکات، شیردان لەلای پیاوانیشەوە مەحرەمییەت دروست دەکات.

**١٧٧٤**- **[فتوى]** قَالَ يَحْيَى ﷺ: وسَمِعْتُ مَالِكًا ﷺ يَقُولُ: الرَّضَاعَةُ قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا، إِذَا كَانَ فِي الْحَوْلَيْنِ تُحَرِّمُ، فَأَمَّا مَا كَانَ بَعْدَ الْحَوْلَيْنِ، فَإِنَّ قَلِيلَهُ وَكَثِيرَهُ لاَ يُحَرِّمُ شَيْئًا، وَإِنَّمَا هُوَ بِمَنْزِلَةِ الطَّعَامِ[٣].

(فەتوا): یەحیا ﷺ گوتوویەتی: گوێم لە ئیمامی مالیك ﷺ بوو دەیگوت: شیردان کەمییەکەی و زۆرییەکەی، ئەگەر لە ماوەی دوو ساڵیدا بێت ئەوە مەحرەمییەت دروست دەکات، بەڵام هەرچی ئەو شیردانەیە کە لەدوای دوو ساڵییەوەیە، ئەوە زۆری و کەمییەکەی هیچ مەحرەمییەتێك دروست ناکات، بەڵکوو وەك خواردن وایە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٦ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٧أفي الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٨ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه الحدثاني: ٣٩١أ في الطلاق، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٨ في الرضاع، عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی شیرپێدان دوای گەورەبوون[1]

**١٧٧٥-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَضَاعَةِ الْكَبِيرِ؟ فَقَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَكَانَ تَبَنَّى سَالِمًا، الَّذِي يُقَالُ لَهُ: سَالِمٌ، مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، كَمَا تَبَنَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، وَأَنْكَحَ أَبُو حُذَيْفَةَ سَالِمًا، وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ ابْنُهُ، أَنْكَحَهُ بِنْتَ أَخِيهِ فَاطِمَةَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَهِيَ يَوْمَئِذٍ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأَوَلِ، وَهِيَ يَوْمَئِذٍ مِنْ أَفْضَلِ أَيَامَى قُرَيْشٍ، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ، فِي زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ مَا أَنْزَلَ، فَقَالَ: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْۚ ﴿٥﴾ ﴾ الأحزاب رُدَّ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْ أُولَئِكَ إِلَى أَبِيهِ، فَإِنْ لَمْ يُعْلَمْ أَبُوهُ رُدَّ إِلَى مَوْلاَهُ، فَجَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ، وَهِيَ امْرَأَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ، وَهِيَ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُنَّا نَرَى سَالِمًا وَلَدًا، وَكَانَ يَدْخُلُ عَلَيَّ، وَأَنَا فُضُلٌ، وَلَيْسَ لَنَا إِلاَّ بَيْتٌ وَاحِدٌ، فَمَاذَا تَرَى فِي شَأْنِهِ؟ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِيمَا بَلَغَنَا: أَرْضِعِيهِ خَمْسَ رَضَعَاتٍ، فَيَحْرُمُ بِلَبَنِهَا، وَكَانَتْ تَرَاهُ ابْنًا مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَأَخَذَتْ بِذَلِكَ عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، فِيمَنْ كَانَتْ تُحِبُّ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهَا مِنَ الرِّجَالِ، فَكَانَتْ تَأْمُرُ أُخْتَهَا أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَبَنَاتِ أَخِيهَا، أَنْ يُرْضِعْنَ مَنْ أَحَبَّتْ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهَا مِنَ الرِّجَالِ، وَأَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ، وَقُلْنَ: لاَ وَاللَّهِ مَا نَرَى الَّذِي أَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ سَهْلَةَ بِنْتَ سُهَيْلٍ، إِلاَّ رُخْصَةً مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي رَضَاعَةِ سَالِمٍ وَحْدَهُ، لاَ وَاللَّهِ لاَ يَدْخُلُ عَلَيْنَا بِهَذِهِ الرَّضَاعَةِ أَحَدٌ.

فَعَلَى هَذَا كَانَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ فِي رَضَاعَةِ الْكَبِيرِ[2].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە پرسیاری لێکرا دەربارەی شیردان بە کەسی گەورە؟ ئەویش گوتی: عورِوەی کوڕی زوبەیر ﷺ هەواڵی پێ دام (گوتی): ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الرَّضَاعَةِ بَعْدَ الْكِبَرِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٤٩ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٨ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٧ في الطلاق؛ والشافعي: ١٠٨١؛ وفي: ١٤٦٤؛ وفي: ١٤٦٥؛ وابن حنبل: ٢٦٢٢٢؛ وابن حبان: ٤٢١٥؛ والقابسي: ٤٠، كلهم عن مالك به.

خوا ﷺ و ئامادەی شەڕی بەدریش بووە، جا سالمی کردبوو بە کوڕی خۆی، پێی دەگوترا: سالمی کۆیلەی ئەبو حوزەیفە (کردبووی بە کوڕی خۆی) وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی کردبوو بە کوڕی خۆی، جا ئەبو حوزەیفە ژنی بۆ سالم هێنا و بە کوڕی خۆی دەزانی، کچی برای خۆی لێ مارەکرد (کە ناوی) فاتیمەی کچی وەلیدی کچی عوتبەی کچی ڕەبیعە بوو، لە کاتێکدا ئافرەتەکە لەو ڕۆژگارەدا لە ئافرەتە کۆچکەرەکان بوو، لەو ڕۆژگارەدا لە چاکترین ئافرەتی قوڕەیش بوو، جا کاتێ خوای پەروەردگار لە پەرتووکەکەیدا دەربارەی زەیدی کوڕی حاریسە ئەوەی دابەزاند کە دایبەزاند و فەرمووی: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ ۝٥ ﴾ ، گشت کەسێك لەوانەی کرابوون بە منداڵی کەسانێك (نەسەبەکەیان) گەڕێندرایەوە بۆ باوکی خۆیان، جا ئەگەر باوکی نەزاندرایە ئەوە دەدرایە پاڵ گەورەکەی، جا سەهلەی کچی سوهەیل کە خێزانی ئەبو حوزەیفە بوو و لە بەنو عامری کوڕی لوئەی بوو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە سالمان بە کوڕی خۆمان دەزانی بۆیە دەهات بۆ لامان، (جا ئێستا کە دەزانین ئەو نامەحرەمە) و منیش ئافرەتێکی خۆدەرخەرم (واتە لە ماڵەوە سەر و قۆڵم ڕووت دەکەم) و تەنها یەك ژووریشمان هەیە، جا بۆچوونت چییە دەربارەی (چارە چییە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: پێنج جار شیری پێ بدە (لە پەرداغێك یان دۆلکەیێك شتێك ...)، جا بوو بە مەحرەمی بەهۆی شیرەکەیەوە و سەهلە بە کوڕی شیری خۆی دەزانی، جا عائیشەی دایکی باوەڕداران ﵂ ئەوەی بەگشتی وەرگرتبوو (بەوەی بۆ هەموو کەسێك دروست بێت)، بۆ هەر کەسێك لە پیاوان کە پێویست با بچووبا بۆ لای، فەرمانی بە ئوم کولسومی کچی ئەبو بەکر و کچە براکانی دەکرد شیر بدەن بەو کەسانەی عائیشە پێویستی بایە بچنە لای لە پیاوان (بۆ فێربوونی زانستی شەرعی)، (بەڵام) خێزانەکانی دیکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتیان دەکردەوە لەوەی کەس لە خەڵکی بەو جۆرە شیرپێدانە بچنە لایان و دەیانگوت: نەخێر سوێند بە خوا پێمان وا نییە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بۆ سەهلەی کچی سوهەیل لە ڕوخسەت و مۆڵەتێکی تایبەتی پێغەمبەری خوا

ﷺ بۆ سالم زیاتر هیچ شتێکی دیکە بێت (واتە بابەتەکەیان بەلاوە تایبەت بوو بە سالم)، نەخێر سوێند بە خوا ﷻ کەس نابێ بێت بۆ لامان بەو جۆرە شیرخواردنە.

جا بۆچوونی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شیردان بە کەسی گەورە لەسەر ئەوە بوو (عائیشە پێی دروست بوو، ئەوانی دیکە پێیان دروست نەبوو).

**١٧٧٦**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَأَنَا مَعَهُ عِنْدَ دَارِ الْقَضَاءِ، يَسْأَلُهُ عَنْ رَضَاعَةِ الْكَبِيرِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي كَانَتْ لِي وَلِيدَةٌ، وَكُنْتُ أَطَؤُهَا، فَعَمَدَتِ امْرَأَتِي إِلَيْهَا، فَأَرْضَعَتْهَا، فَدَخَلْتُ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: دُونَكَ، فَقَدْ وَاللَّهِ أَرْضَعْتُهَا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: أَوْجِعْهَا، وَأْتِ جَارِيَتَكَ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ رَضَاعَةُ الصَّغِيرِ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی دینارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لە کاتێکدا من لەگەڵی بووم لەلای دادگا، پرسیاری لێ کرد دەربارەی شیرپێدانی کەسی گەورە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عەمەریش ﷺ گوتی: پیاوێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و گوتی: من ئافرەتێکی کۆیلەم هەبوو و سەرجێییم لەگەڵ دەکرد، جا خێزانەکەی من چوو شیری خۆی پێ دا، منیش چووم بۆ لای ئافرەتە کۆیلەکە، جا خێزانەکەم گوتی: بوەستە، سوێند بە خوا شیرم پێ داوە (لێت حەرام بووە)، جا ئیمامی عومەر ﷺ گوتی: لێی بدە (لەسەر ئەو کار و نییەت و فەتوایە ناڕەوایەی) و بچۆرە لای جارییەکەشت (کاری شەرعی لەگەڵ ئەنجام بدە و لێت حەرام نەبووە)، چونکە شیردانی مەحرەمییەت بریتییە لە شیردان بە بچووك (نەك گەورە).

**١٧٧٧**- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي مَصِصْتُ مِنْ امْرَأَتِي مِنْ ثَدْيِهَا لَبَنًا، فَذَهَبَ فِي بَطْنِي، فَقَالَ أَبُو مُوسَى ﷺ: لاَ أُرَاهَا إِلاَّ قَدْ حَرُمَتْ عَلَيْكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: انْظُرْ مَاذَا تُفْتِي بِهِ الرَّجُلَ؟ فَقَالَ أَبُو مُوسَى ﷺ: فَمَا تَقُولُ أَنْتَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: لاَ رَضَاعَةَ إِلاَّ مَا كَانَ فِي الْحَوْلَيْنِ.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٠ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٩ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٦ في الطلاق، كلهم عن مالك به.

فَقَالَ أَبُو مُوسَى ﷺ: لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ، مَا كَانَ هَذَا الْحَبْرُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك هات پرسیاری لە ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ کرد و گوتی: من مژەم لە شیری مەمکی خێزانم داوە و چۆتە ناو سکم (ئایا لێم حەرام دەبێ؟)، ئەبو موساش ﷺ گوتی: هیچ بۆچوونێکم نییە تەنها ئەوە نەبێت ئافرەتەکەت لەسەرت حەرام بووە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش ﷺ گوتی: سەیرکە بزانە چ فەتوایێك بۆ ئەو پیاوە دەدەی؟ ئەبو موساش ﷺ گوتی: کەواتە تۆ چی دەڵێیت؟ عەبدوڵڵای کوڕی موسعودیش ﷺ گوتی: شیردان مەحرەمییەت دانامەزرێنێت تەنها کاتێك نەبێت کە منداڵەکە لە دووساڵی تەمەنیدایە.

جا ئەبو موسا ﷺ گوتی: چیتر پرسیارم لێ مەکەن، هەتا ئەو زانایە مەزنە لەناوتاندا بێت.

## ٣- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی شیردان[٢]

**١٧٧٨**- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ[٣].

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شیردان مەحرەمییەت دروست دەکات چۆن منداڵبوون (و نەسەب) مەحرەمییەت دروست دەکات.

**١٧٧٩**- عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ الأَسَدِيَّةِ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهَا، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ، حَتَّى ذَكَرْتُ أَنَّ الرُّومَ وَفَارِسَ يَصْنَعُونَ ذَلِكَ فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ.

---

(١) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥١ في الرضاع، عن مالك به.

(٢) ـ جَامِعِ مَا جَاءَ فِي الرَّضَاعَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٢ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٨٩أ في الطلاق؛ والشيباني: ٦١٧ في الطلاق؛ والشافعي: ١٣١٩؛ وابن حنبل: ٢٤٢١٦، وفي: ٢٤٢٨٧؛ وأبوداود: ٢٠٥٥ في النكاح؛ والترمذي: ١١٤٧ في الرضاع؛ وابن حبان: ٤٢٢٣ في م١٠؛ والدارمي: ٢٢٤٩ في النكاح، كلهم عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَالْغِيلَةُ، أَنْ يَمَسَّ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ تُرْضِعُ[١].

واتە: لە جودامەی کچی وەهبی ئەسەدییەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ویستم نەهی لە «غیلە» بکەم تا بیرم کەوتەوە بەوەی فارس و ڕۆمەکان ئەوە ئەنجام دەدەن و زیان بە منداڵەکانیشیان ناگەیەنن.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: غیلە ئەوەیە پیاو جیماع لەگەڵ خێزانەکەی بکات لە کاتێکدا شیر دەدات بە منداڵ.

**١٧٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ مِمَّا يُقْرَأُ فِي الْقُرْآنِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلَيْسَ عَلَى هَذَا الْعَمَلُ[٢].

واتە: لە عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: یەکێك لەو بابەتانەی لە قوڕئان دابەزی (بریتیبوو لە): (عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ)، واتە: (دە جار شیردانی ئاشکرا مەحرەمییەت دروست دەکەن)، دواتر نەسخ کرایەوە و حوکمەکەی لابرا کرا بە پێنج جار شیرخواردن (بەڵام پێنج جارەکە لە قوڕئان دانەندرا، تەنها حوکمەکەی وەرگیرا)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد هێشتا دە جارەکە لە قوڕئاندا دەخوێندرایەوە (لەلایەن ئەو کەسانەی هێشتا نەسخەکەیان پێ نەگەیشتبوو).

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: کردار لەسەر ئەوە نییە (ئیشی پێ ناکرێ).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٣ في الرضاع؛ وابن حنبل: ٢٧٠٧٩، وفي: ٢٧٠٨٠؛ ومسلم: النكاح: ١٤٠؛ والنسائي: ٣٣٢٦ في النكاح؛ وأبو داود: ٣٨٨٢ في الطب؛ والترمذي: ٢٠٧٧ في الطب؛ والدارمي: ٢٢١٧ في النكاح؛ والقابسي: ٩٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ١٧٥٤ في الرضاع؛ والحدثاني: ٣٩١ في الطلاق؛ والشيباني: ٦٢٥ في الطلاق؛ والشافعي: ١٠٨٢؛ ومسلم: الرضاع: ٢٤؛ والنسائي: ٣٣٠٧ في النكاح؛ وأبو داود: ٢٠٦٢ في النكاح؛ والترمذي: الرضاع: ٣؛ وابن حبان: ٤٢٢١، وفي: ٤٢٢٢؛ والدارمي: ٢٢٥٣ في النكاح؛ والقابسي: ٣١١، كلهم عن مالك به.



# پەرتووكی مامەڵەكان[1]



---

١) - كِتَابُ الْبُيُوعِ.

## ١- ئەوەی دەربارەی بەیعی عوڕبان هاتووە[١]

**١٧٨١**-عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﵀، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ[٢].

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ﵀ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوك و باپیریەوە گێڕاویەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی بەیعی عوربانی کرد (لە فەرموودەی داهاتوو ڕوونکراوەتەوە بەیعی عوڕبان چییە).

**١٧٨٢**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ أَوْ يَتَكَارَى الدَّابَّةَ، ثُمَّ يَقُولُ لِلَّذِي اشْتَرَى مِنْهُ، أَوْ تَكَارَى مِنْهُ: أُعْطِيكَ دِينَارًا، أَوْ دِرْهَمًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَقَلَّ، عَلَى أَنِّي إِنْ أَخَذْتُ السِّلْعَةَ أَوْ رَكِبْتُ مَا تَكَارَيْتُ مِنْكَ، فَالَّذِي أَعْطَيْتُكَ هُوَ مِنْ ثَمَنِ السِّلْعَةِ، أَوْ مِنْ كِرَاءِ الدَّابَّةِ، وَإِنْ تَرَكْتُ ابْتِيَاعَ السِّلْعَةِ، أَوْ كِرَاءَ الدَّابَّةِ، فَمَا أَعْطَيْتُكَ لَكَ بَاطِلٌ بِغَيْرِ شَيْءٍ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەسەر بۆچوونی ئێمە شێوازەکەی بەیعی عوڕبان ئاوایە ـ والله أعلم ـ: پیاو کۆیلەیەك بکرێت یان ئاژەڵێك بەکرێ بگرێت، دواتر بەو کەسە بڵێت کە لێی کڕیوە یان لێی بەکرێ گرتووە: دینارێك یان درهەمێك یان زیاتر لەوە یان کەمترت پێ دەدەم، لەسەر ئەو بنەمایەی ئەگەر کاڵاکەم گێڕایەوە یان سواری ئەو وڵاغە بووم کە لە تۆم بەکرێ گرتووە، ئەوە ئەو پارەی داومە پێت با لە نرخی کاڵاکە یان کرێی ئاژەڵەکە حیساب بێت، وە ئەگەر کڕینی کاڵاکەم یان بەکرێگرتنی ئاژەڵەکەم واز لێ هێنا ئەوە ئەو پارەی پێم داوی بەبێ هیچ شتێك پوچەڵ دەبێتەوە (دەبێت بە هی تۆ).

تێبینی: ئەو مامەڵایە لە عادەتی ناوچەی ئێمە پێی دەگوترێت: «کەرانە».

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي بَيْعِ الْعُرْبَانِ.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢١٧ في البيوع؛ وابن حنبل: ٦٧٢٣؛ وأبو داود: ٣٥٠٢ في البيوع؛ وابن ماجه: ٢٢١٠ في التجارات، كلهم عن مالك به.

**١٧٨٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِأَنْ يَبْتَاعَ الْعَبْدَ التَّاجِرَ الْفَصِيحَ، بِالأَعْبُدِ مِنَ الْحَبَشَةِ أَوْ مِنْ جِنْسٍ مِنَ الأَجْنَاسِ، لَيْسُوا مِثْلَهُ فِي الْفَصَاحَةِ، وَلاَ فِي التِّجَارَةِ، وَالنَّفَاذِ وَالْمَعْرِفَةِ لاَ بَأْسَ بِهَذَا، أَنْ تَشْتَرِيَ مِنْهُ الْعَبْدَ بِالْعَبْدَيْنِ، أَوْ بِالأَعْبُدِ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ، إِذَا اخْتَلَفَ فَبَانَ اخْتِلاَفُهُ، فَإِنْ أَشْبَهَ بَعْضُ ذَلِكَ بَعْضًا حَتَّى يَتَقَارَبَ، فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ اثْنَيْنِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، وَإِنِ اخْتَلَفَتْ أَجْنَاسُهُمْ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەكە لای ئێمە ئاوایە: كێشە نییە لەوەی كۆیلەیەكی بازرگانی زمانپاراو بكرێت بە چەند كۆیلەیەكی حەبەشە یان لە هەر ڕەگەزێك كە وەكوو ئەو نەبن نە لە زمانپاراوی و نە لە بازرگانی و نە لە جێبەجێكردنی كاروبارەكان و نە لە شارەزاییدا، ئەوە هیچ كێشەی تیا نییە كۆیلەیەك لەو جۆرە بە دوو كۆیلە یان چەند كۆیلەیەك بكرێت بۆ ماوەكی دیاریكراو، جا ئەگەر (ڕاست دەرچوو) جیاواز بوون ئەوە جیاوازییەكە دەركەوتووە، (بەڵام) ئەگەر بەیەكدی دەچوون (لەو سیفاتانە) تا وایان لێ هات لە یەكدی نزیك دەكەوتنەوە (لەو سیفاتانە) ئەوە نابێ دووان بەرانبەر یەك دانە وەربگرێ بە كڕین و فرۆشتنی بەماوە، هەرچەندە ڕەگەزەكەشیان جیاواز بێت.

**١٧٨٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ تَبِيعَ مَا اشْتَرَيْتَ مِنْ ذَلِكَ، قَبْلَ أَنْ تَسْتَوْفِيَهُ، إِذَا انْتَقَدْتَ ثَمَنَهُ، مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهِ الَّذِي اشْتَرَيْتَهُ مِنْهُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها كێشە نییە لەوەی ئەو كۆیلەیە بفرۆشیت كە كڕیوتە بەر لەوەی وەریبگریت (چونكە تەنها لە خواردن نەهی كراوە لە فرۆشتنەوەی پێشی وەرگرتنی)، (بە مەرجێك) ئەگەر پارەكە لە جگە لەو كەسە وەربگریت كە لێت كڕیوە (واتە نەیفرۆشیتەوە بەو كەسەی لێت كڕیوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٣ في البيوع، عن مالك به.

١٧٨٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُسْتَثْنَى جَنِينٌ فِي بَطْنِ أُمِّهِ، إِذَا بِيعَتْ، لأَنَّ ذَلِكَ غَرَرٌ لاَ يُدْرَى أَذَكَرٌ هُوَ أَمْ أُنْثَى؟ أَحَسَنٌ أَمْ قَبِيحٌ؟ أَوْ نَاقِصٌ أَوْ تَامٌّ؟ أَوْ حَيٌّ أَوْ مَيِّتٌ؟ وَذَلِكَ يَضَعُ مِنْ ثَمَنِهَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ كۆرپەلەی ناو سك جیا بكرێتەوە لە دایكی، كاتێ دەفرۆشرێت، چونكە ئەوە فێڵ و زیانی تیایە نازانرێت ئایا نێرە یان مێیە؟ ئایا جوانە یان ناشرینە؟ ناتەواوە یان تەواوە؟ زیندووە یان مردووە؟ ئەو شتانە (واتە ئەگەر لایەنە نەرێنییەكان دەربچن) لە نرخەكەی دێننە خوارەوە.

١٧٨٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَبْتَاعُ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ بِمِئَةِ دِينَارٍ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يَنْدَمُ الْبَائِعُ، فَيَسْأَلُ الْمُبْتَاعَ أَنْ يُقِيلَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ يَدْفَعُهَا إِلَيْهِ نَقْدًا أَوْ إِلَى أَجَلٍ، وَيَمْحُو عَنْهُ الْمِئَةَ دِينَارٍ الَّتِي لَهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، وَإِنْ نَدِمَ الْمُبْتَاعُ، فَسَأَلَ الْبَائِعَ أَنْ يُقِيلَهُ فِي الْجَارِيَةِ أَوِ الْعَبْدِ، وَيَزِيدَهُ عَشَرَةَ دَنَانِيرَ نَقْدًا، أَوْ إِلَى أَجَلٍ أَبْعَدَ مِنَ الأَجَلِ الَّذِي اشْتَرَى إِلَيْهِ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَنْبَغِي، وَإِنَّمَا كُرِهَ ذَلِكَ، لأَنَّ الْبَائِعَ كَأَنَّهُ بَاعَ مِنْهُ مِئَةَ دِينَارٍ لَهُ إِلَى سَنَةٍ، قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ بِجَارِيَةٍ، وَبِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ نَقْدًا، أَوْ إِلَى أَجَلٍ أَبْعَدَ مِنَ السَّنَةِ، فَدَخَلَ فِي ذَلِكَ بَيْعُ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ إِلَى أَجَلٍ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی كۆیلەیەك دەكڕێت بە سەت دینار بە ماوەیەكی دیاریكراو (واتە لەسەر ئەو بنەمایەی فڵان كات پارەكەی بدات)، دواتر فرۆشیارەكە پەشیمان دەبێتەوە و داوا لە كڕیارەكە دەكات بەوەی پەشیمانبوونەوەكەی قبووڵ بكات (ئەویش لەبری ئەوە) دە دیناری پێ ببەخشێت بەنەقد بێت یان بەماوە، سەت دینارەكەشی لەسەر لابدات، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە هیچ كێشەی تیا نییە، (بەڵام) ئەگەر فرۆشیارەكە پەشیمان ببێتەوە و داوا لە كڕیارەكە بكات پەشیمانبوونەوەكەی قبووڵ بكات دەربارەی كۆیلە، (جا لە بری قبووڵكردنی پەشیمانبوونەوەكە) دە دیناری بۆ زیاد بكات بەنەقد یان تا

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٥ في البيوع، عن مالك به.

ماوەیەکی درێژتر لەو ماوەی (قەرارە پارەی) کڕینی کۆیلەکە بدات، ئەوە نابێت، لەبەر ئەوە نابێت چونکە وەك ئەوە وایە فرۆشیار سەت دیناری پێ بفرۆشێت بۆ ساڵێك، بەر لەوەی ساڵەکە بەسەر بچێت (لە هەمان کاتدا) بە دە دینار پێی بفرۆشێت بەنەقد یان تا ماوەیەکی درێژتر لە ساڵێك، جا ئەوە بابەتی فرۆشتنی زێڕ بە زێڕی بەماوەی دەکەوێتە ناو.

١٧٨٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَبِيعُ مِنَ الرَّجُلِ الْجَارِيَةَ بِمِئَةِ دِينَارٍ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يَشْتَرِيهَا بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ الثَّمَنِ الَّذِي بَاعَهَا بِهِ، إِلَى أَبْعَدَ مِنْ ذَلِكَ الأَجَلِ الَّذِي بَاعَهَا إِلَيْهِ، إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، وَتَفْسِيرُ مَا كَرِهَ مِنْ ذَلِكَ، أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ الْجَارِيَةَ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يَبْتَاعُهَا إِلَى أَجَلٍ أَبْعَدَ مِنْهُ، يَبِيعُهَا بِثَلاَثِينَ دِينَارًا إِلَى شَهْرٍ، ثُمَّ يَبْتَاعُهَا بِسِتِّينَ دِينَارًا إِلَى سَنَةٍ، أَوْ إِلَى نِصْفِ سَنَةٍ، فَصَارَ إِنْ رَجَعَتْ إِلَيْهِ سِلْعَتُهُ بِعَيْنِهَا، وَأَعْطَاهُ صَاحِبُهُ ثَلاَثِينَ دِينَارًا إِلَى شَهْرٍ، بِسِتِّينَ دِينَارًا إِلَى سَنَةٍ أَوْ إِلَى نِصْفِ سَنَةٍ، فَهَذَا لاَ يَنْبَغِي[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی جارییەیەك دەفرۆشێتە پیاوێك بە سەت دینار بەماوە، دواتر دەیکڕێتەوە بە زیاتر لەو نرخەی پێی فرۆشتووە بۆ ماوەی زیاتر لەو ماوەی جارییەکەی بۆلا فرۆشتووە، گوتوویەتی: ئەوە نابێت (دروست نییە)، جا ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە دروست نییە ئەوەیە: پیاو جارییەیەك بفرۆشێت (بەماوە) بۆ ماوەیەك، دواتر بیکڕێتەوە (بە ماوەی) دوورتر، (بۆ نموونە) بیفرۆشێت بە سی دینار (بە ماوە)ی مانگێك، دواتر بە شەست دینار بیکڕێتەوە بە ماوەی ساڵێك یان بە ماوەی نیو ساڵ، ئەوە وای لێ هات خودی کاڵاکەی خۆی بۆ گەڕایەوە و بەرانبەرەکەی سی دیناری دا بە ئەو (بە ماوە)ی مانگێك، لەبەرانبەر پێدانی شەست دینار (بە ماوە)ی ساڵێك یان نیو ساڵ، ئەوە نابێت و دروست نییە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٦ في البيوع، عن مالك به.

## ٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ماڵ و سەروەتی کەسی کۆیلە[١]

١٧٨٨- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: مَنْ بَاعَ عَبْدًا، وَلَهُ مَالٌ، فَمَالُهُ لِلْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَهُ الْمُبْتَاعُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ گوتوویەتی: هەر کەسێك کۆیلەیەکی کڕی و کۆیلەکە سەروەت و سامانی هەبوو، ئەوە سەروەت و سامانەکەی بۆ فرۆشیارەکەیە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە کڕیارەکە ئەو مەرجە دابنێت (بڵێت دەبێ سەروەتەکەشم لەگەڵ کۆیلەکە بدەیتێ).

١٧٨٩- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، أَنَّ الْمُبْتَاعَ إِذَا اشْتَرَطَ مَالَ الْعَبْدِ، فَهُوَ لَهُ نَقْدًا كَانَ أَوْ دَيْنًا، أَوْ عَرَضًا يُعْلَمُ أَوْ لاَ يُعْلَمُ، وَإِنْ كَانَ لِلْعَبْدِ مِنَ الْمَالِ أَكْثَرُ مِمَّا اشْتَرَى بِهِ، كَانَ ثَمَنُهُ نَقْدًا أَوْ دَيْنًا أَوْ عَرَضًا، وَذَلِكَ أَنَّ مَالَ الْعَبْدِ لَيْسَ عَلَى سَيِّدِهِ فِيهِ زَكَاةٌ، وَإِنْ كَانَتْ لِلْعَبْدِ جَارِيَةٌ اسْتَحَلَّ فَرْجَهَا، بِمِلْكِهِ إِيَّاهَا، وَإِنْ عَتَقَ الْعَبْدُ أَوْ كَاتَبَ تَبِعَهُ مَالُهُ، وَإِنْ أَفْلَسَ أَخَذَ الْغُرَمَاءُ مَالَهُ، وَلَمْ يُتْبَعْ سَيِّدُهُ بِشَيْءٍ مِنْ دَيْنِهِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە (ئەوەیە): ئەگەر کڕیار ماڵی کۆیلەی بەمەرج گرت (واتە مەرجی دانا کاتێ کۆیلەکەی کڕی سەروەتەکەشی ببێتە موڵکی خۆی)، ئەوە سەروەتەکە بۆ ئەوە، جا (سامانەکە) نەقد بێت یان قەرز بێت یان زەوی بێ، بزانرێ یان نەزانرێ، جا (دروستە) هەرچەندە کۆیلەکە ئەوەندە سەروەتەی هەبێت کە زیاتر بێت لەو نرخەی پێی کڕدراوە، چون یەکە پارەکەی (پێی کڕدراوە) نەقد بێت یان قەرز بێت یان زەوی بێت، ئەوەش لەبەر ئەوەی (ماڵی کۆیلە لەگەڵ کۆیلەکە حیسابە، بە چەندین بەڵگە کە بریتین لەمانە) لەسەر گەورەی کۆیلە واجب نییە زەکات لە ماڵی

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي مَالِ الْمَمْلُوكِ.

(٢) ـ موقوف صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٧ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٨ في البيوع، عن مالك به.




کۆیلە بدات، وە ئەگەر کۆیلەکە جارییەیەکی هەبوو، ئەوە بۆی حەڵاڵ دەبێت بە کڕینی، وە ئەگەر کۆیلەکە ئازاد بوو یان موکاتەبەی کردماڵەکە لەگەڵ خۆیەتی، وە ئەگەر کۆیلەکە مایەپوچ بوو خاوەن قەرزەکان ماڵەکەی دەبەن بۆ قەرزی کۆیلەکە ناچنە سەر گەورە و خاوەنەکەی.

## ٣- ئەوەی دەربارەی زەمانەت هاتووە[1]

**١٧٩٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، أَنَّ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ، وَهِشَامَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ كَانَا يَذْكُرَانِ فِي خُطْبَتِهِمَا عُهْدَةَ الرَّقِيقِ فِي الأَيَّامِ الثَّلَاثَةِ، مِنْ حِينِ يُشْتَرَى الْعَبْدُ أَوِ الْوَلِيدَةُ، وَعُهْدَةَ السَّنَةِ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): ئەبانی کوڕی عوسمان و هیشامی کوڕی ئیسماعیل (رحمهما الله) لە وتارەکانیاندا (دوو زەمانەتیان) باس کردووە: زەمانەتی کۆیلە لە سێ ڕۆژەکان (ی خیار الشرط) لەو کاتەوەی کۆیلەکە دەکڕدرێت (تا بزانرێت مەرجەکانی تیایە)، وە زەمانەتی ساڵێك.

**١٧٩١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَا أَصَابَ الْعَبْدُ أَوِ الْوَلِيدَةُ فِي الأَيَّامِ الثَّلَاثَةِ، مِنْ حِينِ يُشْتَرَيَانِ حَتَّى تَنْقَضِيَ الأَيَّامُ الثَّلَاثَةُ، فَهُوَ مِنَ الْبَائِعِ، وَإِنَّ عُهْدَةَ السَّنَةِ مِنَ الْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَالْبَرَصِ، فَإِذَا مَضَتِ السَّنَةُ، فَقَدْ بَرِئَ الْبَائِعُ مِنَ الْعُهْدَةِ كُلِّهَا[3].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ژن و پیاوی کۆیلەی تووشیان ببێ لەو سێ ڕۆژەدا، لەو کاتەی کڕدراون تا سێ ڕۆژەکە تەواو دەبێ، ئەوە لەسەر فرۆشیار حیسابە، زەمانەتی ساڵەکەش بۆ شێتی و گەڕی و بەڵەکییە، جا کاتێ ساڵەکە تەواو بوو، ئەوە فرۆشیارەکە لە هەموو زەمانەتەکان بەری دەبێت.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الْعُهْدَةِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢١٩ في البيوع؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٣٦٣١٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٠ في البيوع، عن مالك به.

**١٧٩٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَمَنْ بَاعَ عَبْدًا أَوْ وَلِيدَةً مِنْ أَهْلِ الْمِيرَاثِ، أَوْ غَيْرِهِمْ بِالْبَرَاءَةِ، فَقَدْ بَرِئَ مِنْ كُلِّ عَيْبٍ، وَلاَ عُهْدَةَ عَلَيْهِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَلِمَ عَيْبًا فَكَتَمَهُ، فَإِنْ كَانَ عَلِمَ عَيْبًا فَكَتَمَهُ، لَمْ تَنْفَعْهُ الْبَرَاءَةُ، وَكَانَ ذَلِكَ الْبَيْعُ مَرْدُودًا، وَلاَ عُهْدَةَ عِنْدَنَا إِلاَّ فِي الرَّقِيقِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هەر كەسێك كۆیلەیەكی پیاو یان ئافرەتی فرۆشت جا (كۆیلەكە) خاوەنی میرات بێت یان جگە لەوان بێت، بە مەرجی بەڕائەت لە عەیب (بەوەی ئەگەر عەیبیشی هەبوو بۆی نەگەڕێنێتەوە)، ئەوە لە گشت عەیبێك بەری دەبێت و زەمانەتی لەسەر نییە، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە بزانێ عەیبێك هەیە و شاردوویەتەوە، جا ئەگەر زانی عەیبێكی هەیە و شاردوویەتەوە، ئەوە بەڕائەت هیچ سوودی پێ ناگەیەنێ و مامەڵەكە ڕەتكراوەیە، وە لەلای ئێمە زەمانەت لە هیچ شتێكدا نییە جگە لە كۆیلە.

## ٤- عەیب لە كۆیلەدا[٢]

**١٧٩٣-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ بَاعَ غُلاَمًا لَهُ بِثَمَانِ مِئَةِ دِرْهَمٍ، وَبَاعَهُ بِالْبَرَاءَةِ، فَقَالَ الَّذِي ابْتَاعَهُ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: بِالْغُلاَمِ دَاءٌ لَمْ تُسَمِّهِ لِي، فَاخْتَصَمَا إِلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁، فَقَالَ الرَّجُلُ: بَاعَنِي عَبْدًا، وَبِهِ دَاءٌ لَمْ يُسَمِّهِ لِي، وَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﵁: بِعْتُهُ بِالْبَرَاءَةِ، فَقَضَى عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﵁، عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ أَنْ يَحْلِفَ لَهُ لَقَدْ بَاعَهُ الْعَبْدَ، وَمَا بِهِ دَاءٌ يَعْلَمُهُ، فَأَبَى عَبْدُ اللهِ أَنْ يَحْلِفَ، وَارْتَجَعَ الْعَبْدَ، فَصَحَّ عِنْدَهُ، فَبَاعَهُ عَبْدُ اللهِ ﵁ بَعْدَ ذَلِكَ بِأَلْفٍ وَخَمْسِ مِئَةِ دِرْهَمٍ[٣].

واتە: لە سالمی كوڕی عەبدوڵڵاوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵄ كۆیلەیەكی بە هەشت سەت درهەم فرۆشت بە مەرجی بەڕائەت لە عەیب، جا ئەو كەسەی لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەری ﵄ كڕی بە عەبدوڵڵای

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨١ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ الْعَيْبُ فِي الرَّقِيقِ.

(٣) ـ موقوف ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٢ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٤ في البيوع والتجارات والسلم، عن مالك به.

ﷺ گوت: کۆیلەکە نەخۆشییەکی هەیە تۆ بە منت نەگوت، جا کێشەکەیان برد بۆ لای عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ، جا پیاوەکە گوتی: کۆیلەیەکی پێ فرۆشتووم و نەخۆشییەکی هەیە بۆی باس نەکردووم، عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: بەبەڕائەت لە عەیب فرۆشتوومە، جا عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ بڕیاری بەسەر عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەرکرد بەوەی سوێندی بۆ بخوات کە کاتێ کۆیلەکەی فرۆشتووە هیچ نەخۆشییەکی نەبووە کە زانیبێتی، عەبدوڵڵاش ﷺ سوێندی نەخوارد و کۆیلەکەی گەڕاندەوە بۆ عەبدوڵڵا ﷺ، کۆیلەکەش لەلای عەبدوڵڵا ﷺ لە عەیبەکە چاك بۆیەوە و دوای ئەوە عەبدوڵڵا بە هەزار و پێنج سەت درهەم فرۆشتی.

**١٧٩٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ كُلَّ مَنِ ابْتَاعَ وَلِيدَةً فَحَمَلَتْ، أَوْ عَبْدًا فَأَعْتَقَهُ، وَكُلَّ أَمْرٍ دَخَلَهُ الْفَوَاتُ حَتَّى لاَ يُسْتَطَاعَ رَدُّهُ، فَقَامَتِ الْبَيِّنَةُ، إِنَّهُ قَدْ كَانَ بِهِ عَيْبٌ عِنْدَ الَّذِي بَاعَهُ، أَوْ عُلِمَ ذَلِكَ بِاعْتِرَافٍ أَوْ غَيْرِهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ يُقَوَّمُ وَبِهِ الْعَيْبُ الَّذِي كَانَ بِهِ يَوْمَ اشْتَرَاهُ، فَيُرَدُّ مِنَ الثَّمَنِ قَدْرُ مَا بَيْنَ قِيمَتِهِ صَحِيحًا، وَقِيمَتِهِ وَبِهِ ذَلِكَ الْعَيْبُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە ئەوەیە: هەر کەسێك ئافرەتێکی کۆیلە بکڕێت و حەملی پەیدا بێت، یان کۆیلەیەکی پیاو بکڕێت و ئازادی بکات، وە گشت بابەتێك کە فەوتانی بکەوێتە ناو کە نەتواندرێت کۆیلەکە ڕەت بکاتەوە و بەڵگەش هەبوو بەوەی ئەو کاتەی لەلای ئەو کەسە بووە کە فرۆشتوویەتی عەیبێکی هەبووە، یان ئەوە زانرا بەهۆی دانپێداهێنان یان شتی دیکە، ئەوە کۆیلەکە دەنرخێندرێت بەو عەیبەوەی هەیبووە بە نرخی ئەو ڕۆژەی فرۆشراوە، جا ئەو ئەندازەیە پارەی بۆ دەگەڕێندرێتەوە کە جیاوازە لە نێوان نرخی سەلامەت و نرخەکەی بەو عەیبەوە.

**١٧٩٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الْعَبْدَ، ثُمَّ يَظْهَرُ مِنْهُ عَلَى عَيْبٍ يُرَدُّ مِنْهُ، وَقَدْ حَدَثَ بِهِ عِنْدَ الْمُشْتَرِي عَيْبٌ آخَرُ: إِنَّهُ إِذَا كَانَ الْعَيْبُ الَّذِي

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٤ في البيوع، عن مالك به.

حَدَثَ بِهِ مُفْسِدًا، مِثْلُ الْقَطْعِ أَوِ الْعَوَرِ أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْعُيُوبِ الْمُفْسِدَةِ، فَإِنَّ الَّذِي اشْتَرَى الْعَبْدَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِنْ أَحَبَّ أَنْ يُوضَعَ عَنْهُ مِنْ ثَمَنِ الْعَبْدِ، بِقَدْرِ الْعَيْبِ الَّذِي كَانَ بِالْعَبْدِ يَوْمَ اشْتَرَاهُ، وُضِعَ عَنْهُ، وَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَغْرَمَ قَدْرَ مَا أَصَابَ الْعَبْدَ مِنَ الْعَيْبِ عِنْدَهُ، ثُمَّ يَرُدُّ الْعَبْدَ، فَذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ مَاتَ الْعَبْدُ عِنْدَ الَّذِي اشْتَرَاهُ، أُقِيمَ الْعَبْدُ وَبِهِ الْعَيْبُ الَّذِي كَانَ بِهِ يَوْمَ اشْتَرَاهُ، فَيُنْظَرُ كَمْ ثَمَنُهُ؟ فَإِنْ كَانَتْ قِيمَةُ الْعَبْدِ يَوْمَ اشْتَرَاهُ بِغَيْرِ عَيْبٍ، مِئَةَ دِينَارٍ، وَقِيمَتُهُ يَوْمَ اشْتَرَاهُ وَبِهِ الْعَيْبُ، ثَمَانُونَ دِينَارًا، وُضِعَ عَنِ الْمُشْتَرِي مَا بَيْنَ الْقِيمَتَيْنِ، وَإِنَّمَا تَكُونُ الْقِيمَةُ يَوْمَ اشْتُرِيَ الْعَبْدُ[(١)].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە دەربارەی ئەو کەسەی کۆیلەیەك دەکڕێت، دواتر عەیبێکی بۆ دەردەکەوێت کە بەهۆیەوە گەڕاندنەوە دروستە، جا لەلای کڕیاریش عەیبێکی دیکە دروست بوو، (حوکمەکەی ئاوایە): ئەگەر ئەو عەیبە نوێیەی بۆی پەیدا بووە عەیبێکی فاسید بوو وەك: دەستبڕین یان کوێری یان شتێکی هاوشێوەی ئەوانە لە عەیبی فاسید، ئەوە ئەو کەسەی کڕیویەتی سەرپشکە لە نێوان دوو شت: ئەگەر حەز بکات نرخی کۆیلەکەی بۆ دابشکێندرێت بەئەندازەی ئەو عەیبەی عەبدەکە هەیبووە لەو ڕۆژەی کڕیویەتی، ئەوە بۆی دادەشکێندرێت، وە ئەگەر حەز بکات غەرامە بدات بەئەندازەی ئەو عەیبەی کۆیلەکە تووشی بووە لەلای ئەو و بیگەڕێنێتەوە (بۆ فرۆشیارەکە) ئەوەشی بۆ هەیە، جا ئەگەر کۆیلەکە مرد لەلای ئەو کەسەی کڕیویەتی، ئەوە کۆیلەکە دەنرخێندرێت بەو عەیبەوەی هەیبووە لەو ڕۆژەی کڕیویەتی و سەیر دەکرێت نرخەکەی چەندە؟ جا ئەگەر نرخی کۆیلەکە لەو ڕۆژەی کڕیویەتی (بە نرخی) بێ عەیبی سەت دینار بێت و نرخەکەشی بە عەیبەوە لەو ڕۆژەی کڕیویەتی و عەیبی هەبووە هەشتا دینار بێت، ئەوە ئەندازەی نێوانی ئەو دوو نرخە لادەبرێت لەسەر کڕیارەکە، جا دەبێ نرخەکە بە حیسابی ئەو ڕۆژە بێ کە کۆیلەکەی تیادا کڕاوە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٥ في البيوع، عن مالك به.

١٧٩٦- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷬: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ مَنْ رَدَّ وَلِيدَةً مِنْ عَيْبٍ وَجَدَهُ بِهَا، وَقَدْ أَصَابَهَا: إِنَّهَا إِنْ كَانَتْ بِكْرًا، فَعَلَيْهِ مَا نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهَا، وَإِنْ كَانَتْ ثَيِّبًا، فَلَيْسَ عَلَيْهِ فِي إِصَابَتِهِ إِيَّاهَا شَيْءٌ، لأَنَّهُ كَانَ ضَامِنًا لَهَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە لەلای ئێمە (ئەوەیە): هەر کەسێك ئافرەتێکی کۆیلە (دوای کڕینی) بگەڕێنێتەوە بەهۆی عەیبێکەوە کە لێی دۆزیوەتەوە، لە کاتێکدا جیماعیشی لەگەڵ کردووە، ئەگەر کچ بووبێت، ئەوە لەسەری واجبە ئەو پارەیە بدات کە لە نرخەکەی کەمی کردووە (بەهۆی ئەو جیماعە)، وە ئەگەر ژن بوو، ئەوە هیچی لەسەر واجب نییە بەهۆی جیماعەکەی، چونکە زامنییەتی (زامنیيەکە بەر جیماعەکە دەکەوێت).

١٧٩٧- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷬: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، فِيمَنْ بَاعَ عَبْدًا أَوْ وَلِيدَةً أَوْ حَيَوَانًا بِالْبَرَاءَةِ، مِنْ أَهْلِ الْمِيرَاثِ أَوْ غَيْرِهِمْ، فَقَدْ بَرِئَ مِنْ كُلِّ عَيْبٍ فِيمَا بَاعَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَلِمَ فِي ذَلِكَ عَيْبًا فَكَتَمَهُ، فَإِنْ كَانَ عَلِمَ عَيْبًا فَكَتَمَهُ، لَمْ تَنْفَعْهُ تَبْرِئَتُهُ، وَكَانَ مَا بَاعَ مَرْدُودًا عَلَيْهِ(٢).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی ئەو کەسەی کۆیلەیەکی پیاو یان ئافرەت یان ئاژەڵێك دەفرۆشێت بە مەرجی بەرائەت لە عەیب (بەوەی نەگەڕێنرێتەوە بەهۆی عەیب)، خاوەن میرات بن یان غەیری ئەوان، ئەوە لە گشت عەیبێك بەری دەبێ لەو شتەی فرۆشتوویەتی، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە بزانێ عەیبێك هەیە و شاردبێتیەوە، جا ئەگەر زانی عەیبێکی هەیە و شاردوویەتەوە، ئەوە بەرائەت هیچ سوودی پێ ناگەیەنێ و ئەو شتەی فرۆشتوویەتی بۆی دەگەڕێندرێتەوە.

١٧٩٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷬: فِي الْجَارِيَةِ تُبَاعُ بِالْجَارِيَتَيْنِ، ثُمَّ يُوجَدُ بِإِحْدَى الْجَارِيَتَيْنِ عَيْبٌ تُرَدُّ مِنْهُ، قَالَ: تُقَامُ الْجَارِيَةُ الَّتِي كَانَتْ قِيمَةَ الْجَارِيَتَيْنِ، فَيُنْظَرُ كَمْ ثَمَنُهَا؟ ثُمَّ تُقَامُ الْجَارِيَتَانِ بِغَيْرِ الْعَيْبِ الَّذِي وُجِدَ بِإِحْدَاهُمَا، تُقَامَانِ صَحِيحَتَيْنِ سَالِمَتَيْنِ، ثُمَّ يُقْسَمُ ثَمَنُ الْجَارِيَةِ الَّتِي

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٣ في البيوع، عن مالك به.

بِيعَتْ بِالْجَارِيَتَيْنِ عَلَيْهِمَا، بِقَدْرِ ثَمَنِهِمَا، حَتَّى يَقَعَ عَلَى كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا حِصَّتُهَا مِنْ ذَلِكَ، عَلَى الْمُرْتَفِعَةِ بِقَدْرِ ارْتِفَاعِهَا، وَعَلَى الأُخْرَى بِقَدْرِهَا، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى الَّتِي بِهَا الْعَيْبُ، فَيُرَدُّ بِقَدْرِ الَّذِي وَقَعَ عَلَيْهَا مِنْ تِلْكَ الْحِصَّةِ، إِنْ كَانَتْ كَثِيرَةً أَوْ قَلِيلَةً، وَإِنَّمَا تَكُونُ قِيمَةُ الْجَارِيَتَيْنِ عَلَيْهِ يَوْمَ قَبْضِهِمَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷫ دەربارەی ئەو جارییەیەی بە دوو جارییە دەفرۆشرێت، دواتر لە یەکێك لە دوو جارییەکان عەیبێك هەیە کە بەهۆیەوە گەڕاندنەوە ڕێگە پێدراوە، گوتوویەتی: ئەو ئافرەتەی نرخی بە قەد دوو جارییەیە دەنرخێندرێت و سەیر دەکرێت نرخەکەی چەندە؟ دواتر دوو جارییەکان بەبێ ئەو عەیبەی کە ئێستا لە یەکێکیان دایە دەنرخێندرێن، بەساغ و سەلامەتی دەنرخێندرێن، دواتر نرخی ئەو جارییەیەی بە دوو جارییە فرۆشراوە دابەش دەکرێتە سەر دوو جارییەکە بەئەندازەی نرخەکەیان، تا پشکی جارییەکە دەکەوێتە سەر هەر یەکێك لە دوو جارییەکە، ئەوەی نرخی گرانترە بە ئەندازەی گرانییەکەی، ئەوەی تریشیان بەئەندازەی خۆی، دواتر سەیری ئەو جارییەیە دەکرێت کە عەیبی هەیە و ئەو ئەندازەیەی دەکەوێتە سەر جارییە عەیبدارەکە لە پشکەکە (واتە ئەو نرخە جیاوازەی عەیبەکە دروستی کردووە) دەگەڕێندرێتەوە (بۆ کڕیارەکە)، زۆر بێت یان کەم بێت، جا نرخاندنی دوو جارییەکانیش بەسەر فرۆشیارەکە لەو ڕۆژە حیسابە کە ڕۆژی وەرگرتنیان بووە.

**١٧٩٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷫ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الْعَبْدَ، فَيُؤَاجِرُهُ بِالإِجَارَةِ الْعَظِيمَةِ، أَوِ الْغَلَّةِ الْقَلِيلَةِ، ثُمَّ يَجِدُ بِهِ عَيْبًا يُرَدُّ مِنْهُ: إِنَّهُ يَرُدُّهُ بِذَلِكَ الْعَيْبِ، وَتَكُونُ لَهُ إِجَارَتُهُ وَغَلَّتُهُ، وَذَلِكَ الأَمْرُ الَّذِي كَانَتْ عَلَيْهِ الْجَمَاعَةُ بِبَلَدِنَا، وَذَلِكَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً ابْتَاعَ عَبْدًا، فَبَنَى لَهُ دَارًا، قِيمَةُ بِنَائِهَا ثَمَنُ الْعَبْدِ أَضْعَافًا، ثُمَّ وَجَدَ بِهِ عَيْبًا يُرَدُّ مِنْهُ، رَدَّهُ، وَلاَ يُحْسَبُ لِلْعَبْدِ عَلَيْهِ إِجَارَةٌ فِيمَا عَمِلَ لَهُ، فَكَذَلِكَ تَكُونُ لَهُ إِجَارَتُهُ، إِذَا آجَرَهُ مِنْ غَيْرِهِ، لأَنَّهُ ضَامِنٌ لَهُ، وَهَذَا الأَمْرُ عِنْدَنَا[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٧ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٨ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی كۆیلەیەك دەكڕێت و بە كرێیەكی زۆر یان كەم بەكرێی دەدات، دواتر عەیبێكی لێ دەدۆزێتەوە كە بەهۆیەوە دروستە بگەڕێندرێتەوە، گوتوویەتی: بەو عەیبە دەیگەڕێنێتەوە و كرێ و پارەی كاركردنەكەی بۆ كڕیارەكەیە، زانایان لەسەر ئەو فەتوایەن لە شارەكەمان، لەبەر ئەوەی ئەگەر پیاوێك كۆیلەیەك بكڕێت و كۆیلەكە خانووێكی بۆ دروست بكات، هەرچەندە نرخی بینای خانوەكە چەند جار بەقەد نرخی كۆیلەكە بێت، دواتر عەیبێكی لێ بدۆزێتەوە كە بەهۆیەوە دروست بێت بگەڕێندرێتەوە، ئەوە دەیگەڕێنێتەوە (بۆ خاوەنەكەی) و كرێ بۆ كۆیلەكە حیساب ناكرێت لەو ئیشەی بۆ كڕیارەكەی كردووە، كەواتە بەهەمان شێوە كرێكەشی بۆ ئەوە (واتە بۆ كڕیارەكەیە)، ئەگەر بەكرێ بیدات بە كەسێكی دیكە، چونكە زامنی كۆیلەكەیە (ئەگەر لەو ماوەیە شتێكی لێ بهاتبایە)، بابەتەكە لای ئێمە بەم شێوەیەیە.

**١٨٠٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا، فِيمَنِ ابْتَاعَ رَقِيقًا فِي صَفْقَةٍ وَاحِدَةٍ، فَوَجَدَ فِي ذَلِكَ الرَّقِيقِ عَبْدًا مَسْرُوقًا، أَوْ وَجَدَ بِعَبْدٍ مِنْهُمْ عَيْبًا، إِنَّهُ يُنْظَرُ فِيمَا وُجِدَ مَسْرُوقًا، أَوْ وَجَدَ بِهِ عَيْبًا، فَإِنْ كَانَ هُوَ وَجْهَ ذَلِكَ الرَّقِيقِ، أَوْ أَكْثَرَهُ ثَمَنًا، أَوْ مِنْ أَجْلِهِ اشْتَرَى، وَهُوَ الَّذِي فِيهِ الْفَضْلُ لَوْ سَلِمَ فِيمَا يَرَى النَّاسُ، كَانَ ذَلِكَ الْبَيْعُ مَرْدُودًا كُلُّهُ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي وُجِدَ مَسْرُوقًا، أَوْ وُجِدَ بِهِ الْعَيْبُ مِنْ ذَلِكَ الرَّقِيقِ، فِي الشَّيْءِ الْيَسِيرِ مِنْهُ، لَيْسَ هُوَ وَجْهَ ذَلِكَ الرَّقِيقِ، وَلاَ مِنْ أَجْلِهِ اشْتُرِيَ، وَلاَ فِيهِ الْفَضْلُ فِيمَا يَرَى النَّاسُ، رُدَّ ذَلِكَ الَّذِي وُجِدَ بِهِ الْعَيْبُ، أَوْ وُجِدَ مَسْرُوقًا بِعَيْنِهِ، بِقَدْرِ قِيمَتِهِ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي اشْتَرَى بِهِ أُولَئِكَ الرَّقِيقَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دەربارەی ئەو كەسەی لە یەك مامەڵەدا كۆمەڵە كۆیلەیەكی كڕی، جا لەناو كۆمەڵە كۆیلەكە كۆیلەیەكی دزراو هەبوو یان یەكێك لە كۆیلەكان عەیبێكی هەبوو، بابەتەكە لای ئێمە ئاوایە: سەیری ئەو كۆیلەیە دەكرێ كە دزراوە یان عەیبی هەیە، ئەگەر ئەو كۆیلەیە سەرەكییەكە بوو لە كۆمەڵە كۆیلەكە، یان نرخی گرانترین بوو، یان كۆمەڵە كۆیلەكە لەبەر بوونی ئەو كۆیلەیە كڕدرابوون و لەبەر چاوی خەڵكی ئەویان گرنگی زۆر زیاتر بوو ئەگەر

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٨٩ في البيوع، عن مالك به.

سەلامەت با و ئەو عەیبەی نەبا، ئەوە ئەو مامەڵەیە گشتی هەڵدەوەشێتەوە، وە ئەگەر ئەوەی دزرابوو یان عەیبێکی کەمی هەبوو، سەرەکی نەبوو لەناو ئەو کۆیلانە و لەپێناوی ئەو نەکڕدرابوون و لە چاوی خەڵکی گرنگی تایبەتی نەبوو، ئەوە تەنها ئەو کۆیلەیەی کە عەیبی هەیە یان دزراوە دەگەڕێندرێتەوە بە گوێرەی نرخی خۆی لە کۆی گشتیی نرخی کڕینی کۆمەڵە کۆیلەکە نرخەکەی دادەبەزێنرێت.

## ٥- چ دەکرێت دەربارەی ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی دەفرۆشرێت و مەرجی تیایە[١]

١٨٠١- عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعَودٍ ابْتَاعَ جَارِيَةً مِنِ امْرَأَتِهِ زَيْنَبَ الثَّقَفِيَّةِ، وَاشْتَرَطَتْ عَلَيْهِ أَنَّكَ إِنْ بِعْتَهَا فَهِيَ لِي بِالثَّمَنِ الَّذِي تَبِيعُهَا بِهِ، فَسَأَلَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ عَنْ ذَلِكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: لاَ تَقْرَبْهَا وَفِيهَا شَرْطٌ لأَحَدٍ[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ جارییەیەکی لە خێزانی خۆی زەینەبی سەقەفی کڕی، جا خێزانەکەی مەرجی لەسەر دانا بەوەی ئەگەر ویستت بیفرۆشیتەوە ئەوە بۆ منە بەو نرخەی دەتەوێت بیفرۆشیت (بەو مەرجە پێی فرۆشت)، جا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەربارەی ئەوە پرسیاری لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کرد، ئیمامی عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتی: نزیکی نەکەویتەوە لە کاتێکدا مەرجی کەسێکی تیا بێت (کە دژە لەگەڵ ئەوەی گرێبەستەکە دەیخوازێت و بەتەواوی نەبوویتە خاوەنی).

---

(١) ـ مَا يُفْعَلُ فِي الْوَلِيدَةِ إِذَا بِيعَتْ وَالشَّرْطُ فِيهَا.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩١ في البيوع؛ والحدثاني: ٣٢١أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٩٠ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

**١٨٠٢**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَطَأُ الرَّجُلُ وَلِيدَةً، إلاَّ وَلِيدَةً إِنْ شَاءَ بَاعَهَا، وَإِنْ شَاءَ وَهَبَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا، وَإِنْ شَاءَ صَنَعَ بِهَا مَا شَاءَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەیگوت: با پیاو جیماع لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی کۆیلە نەکات، تەنها ئەو ئافرەتە نەبێت کە (بەتەواوی موڵکی خۆیەتی و هیچ مەرجێکی کەسی پێوە نییە، بەشێوەیەك) ئەگەر ویستی بتوانێت بیفرۆشێت و ئەگەر ویستی بتوانێت بیکاتە دیاری و ئەگەر ویستی بتوانێت لەلای خۆی بیهێڵێتەوە و ئەگەر ویستی بتوانێت هەرچی لێ بکات کە خۆی دەیەوێت (هیچ بەربەستێکی لەبەردەم نەبێت).

**١٨٠٣**- قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِيمَنِ اشْتَرَى جَارِيَةً عَلَى شَرْطِ أَنَّهُ لاَ يَبِيعَهَا وَلاَ يَهَبَهَا، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الشُّرُوطِ، فَإِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لِلْمُشْتَرِي أَنْ يَطَأَهَا، وَذَلِكَ أَنَّهُ لاَ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَبِيعَهَا، وَلاَ أَنْ يَهَبَهَا، فَإِذَا كَانَ لاَ يَمْلِكُ ذَلِكَ مِنْهَا، فَلَمْ يَمْلِكْهَا مِلْكًا تَامًّا، لأَنَّهُ قَدِ اسْتُثْنِيَ عَلَيْهِ فِيهَا مَا مَلَكَهُ بِيَدِ غَيْرِهِ، فَإِذَا دَخَلَ هَذَا الشَّرْطُ، لَمْ يَصْلُحْ، وَكَانَ بَيْعًا مَكْرُوهًا[2].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی جارییەیەك دەکڕێت بە مەرجی ئەوەی نەیفرۆشێتەوە و نەیکات بە دیاری یان مەرجێکی لەو جۆرە (کە لەلایەن فرۆشیارەوە بۆی دابنرێت)، گوتوویەتی: کڕیار بۆی نییە جیماعی لەگەڵ بکات، لەبەر ئەوەی بۆی نییە بیفرۆشێت و بیکات بە دیاری، جا کە نەیتوانی ئەوە بکات، ئەوە بەتەواوی نەبۆتە موڵکی، چونکە هەندێ شتی تیادا هەڵاوێردنی بۆ کراوە (مەرجی بۆ داندراوە) بەدەستی کەسی دیکەوەیە، جا ئەگەر ئەو مەرجە هاتە ناو بابەتەکە، ئەوە (مامڵەکە) دروست نییە و مامەڵەیەکی قەدەغەکراوە (فاسیدە، چونکە مەرجەکە دژە لەگەڵ بنەمای گرێبەستەکە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢١ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٩١ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٣ في البيوع، عن مالك به.

## ٦- قەدەغەكردن لەوەی پیاو جیماع لەگەڵ ئافرەتێكی كۆیلە بكات (دوای كڕینی) لە كاتێكدا مێردی هەیە[١]

**١٨٠٤-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَامِرٍ ﵁ أَهْدَى لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ جَارِيَةً، وَلَهَا زَوْجٌ، ابْتَاعَهَا بِالْبَصْرَةِ، فَقَالَ عُثْمَانُ ﵁: لاَ أَقْرَبُهَا حَتَّى يُفَارِقَهَا زَوْجُهَا، فَأَرْضَى ابْنُ عَامِرٍ زَوْجَهَا، فَفَارَقَهَا[٢].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای كوڕی عامیر ﵁ جارییەیەكی كرد بە دیاری بۆ عوسمانی كوڕی عەففان ﵁، لە كاتێكدا جارییەكە مێردی هەبوو، لە بەصرە كڕیبووی، جا عوسمانی كوڕی عەففان ﵁ گوتی: لێی نزیك ناكەومەوە تاوەكوو مێردەكەی تەڵاقی نەدات، جا ئیبنو عامیر مێردەكەی ڕازی كرد و تەڵاقی دا (جا دوای ئەوە بۆ ئیمامی عوسمان حەڵاڵ بوو).

**١٨٠٥-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﵀، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ ﵁ ابْتَاعَ وَلِيدَةً، فَوَجَدَهَا ذَاتَ زَوْجٍ، فَرَدَّهَا[٣].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوفەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف ﵁ ئافرەتێكی كۆیلەی كڕی، جا (دوای ئەوەی) زانی خاوەن مێردە، بۆیە گەڕاندیەوە (چونكە ئەوە عەیب و كەموكوڕییە پێیان نەگوتووە).

---

(١) ـ النَّهْيُ عَنْ أَنْ يَطَأَ الرَّجُلُ وَلِيدَةً وَلَهَا زَوْجٌ.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٢ في البيوع؛ والشيباني: ٧٩٥ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٢٢٢أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٩٤ في البيوع والتجارات والسلم، عن مالك به.

## ٧- ئەوەی هاتووە دەربارەی بەروبوومی ئەو درەختەی دەفرۆشرێت (ئاخۆ بەروبوومی دارە فرۆشراوەكە بۆ كێیە؟)[١]

**١٨٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِّرَتْ، فَثَمَرُهَا لِلْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دارخورمای فرۆشت لە كاتێكدا تەلقیحی كردبوون، ئەوە بەرەكەی بۆ فرۆشیارە (تەنها دارەكە دەبێتە هی كڕیار)، تەنها لەو كاتە نەبێت كە كڕیارەكە مەرج دابنێت (بڵێت: بەرەكەشی بۆ منە، فرۆشیارەكەش بەوە ڕازی بێت).

## ٨- نەهیكردن لە كڕین و فرۆشتنی بەروبووم تا پێ دەگات[٣]

**١٨٠٧-** عَنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتنی بەروبووم تا پێ دەگات، نەهی لە فرۆشیار و كڕیار كردووە.

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي ثَمَرِ الْمَالِ يُبَاعُ أَصْلُهُ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٥ في البيوع؛ والحدثاني: ٢١٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٣ في البيوع؛ والشيباني: ٧٩٢ في البيوع والتجارات والسلم؛ وفي: ٧٩٣ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٨٧؛ وابن حنبل: ٥٣٠٦؛ والبخاري: ٢٢٠٤ في البيوع، وفي: ٢٧١٦ في الشروط؛ ومسلم: البيوع: ٧٧؛ وابن ماجه: ٢٢٢٨ في التجارات؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٧٩٧؛ والقابسي: ٢٣٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ النَّهْيُ عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٤ في البيوع؛ والشيباني: ٧٥٩ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٩٠؛ وابن حنبل: ٥٢٩٢؛ والبخاري: ٢١٩٤ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٦٧ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٩١؛ والدارمي: ٢٥٥٥ في البيوع؛ والقابسي: ٢٣٥، كلهم عن مالك به.

**١٨٠٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا تُزْهِيَ؟ فَقَالَ: حِينَ تَحْمَرُّ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ إِذَا مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ، فَبِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ؟[1].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتنی بەروبووم تا پێ دەگات، جا پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێگەیشتن چۆن؟ فەرمووی: كاتێ سوور دەبێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەیرت نەكردووە ئەگەر خوای پەروەردگار بەروبوومەكە لەناو ببات، ئەوە لە بەرانبەر چ شتێك یەكێك لە ئێوە پارە و پوڵ لە براكەی وەردەگرێت؟ (واتە ئەگەر بەر لە پێگەیشتن بەروبوومەكە لەناو چوو پارەی كڕیارەكە دەفەوتێت لەپای هیچ، كە ئەوەش ستەم و حەڕامە).

**١٨٠٩-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تَنْجُوَ مِنَ الْعَاهَةِ[2].

واتە: لە عەمرەی كچی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە فرۆشتنی بەروبووم تاوەكوو لە ئافات ڕزگار دەبێت.

**١٨١٠-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَيْعُ الثِّمَارِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلاَحُهَا مِنْ بَيْعِ الْغَرَرِ[3].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كڕین و فرۆشتنی بەروبووم بەر لە پێگەیشتنی جۆرێكە لە مامەڵەی نادیار (مامەڵەی نادیاریش حەڕامكراوە).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٩٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٤أفي البيوع؛ والشافعي: ٦٩٢؛ والبخاري: ١٤٨٨ في الزكاة، وفي: ٢١٩٨ في البيوع؛ ومسلم: المساقاة: ١١٥؛ والنسائي: ٤٥٢٦ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٩٠؛ وأبي يعلى الموصلي: ٣٧٤٠؛ والقابسي: ١٥١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٤ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٠ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٩٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٢ في البيوع، عن مالك به.

**١٨١١-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يَبِيعُ ثِمَارَهُ حَتَّى تَطْلُعَ الثُّرَيَّا[١].

واتە: لە زەیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەروبوومەکانی خۆی نەدەفرۆشت تاوەکوو ئەستێرەی سوڕەییا هەڵدەهات (چونکە لەو کاتە عادەتەن ئافات نەدەما).

**١٨١٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا فِي بَيْعِ الْبِطِّيخِ، وَالْقِثَّاءِ، وَالْخِرْبِزِ، وَالْجَزَرِ، إِنَّ بَيْعَهُ إِذَا بَدَا صَلاَحُهُ حَلاَلٌ جَائِزٌ، ثُمَّ يَكُونُ لِلْمُشْتَرِي مَا يَنْبُتُ حَتَّى يَنْقَطِعَ ثَمَرُهُ، وَيَهْلِكَ، وَلَيْسَ فِي ذَلِكَ وَقْتٌ يُؤَقَّتُ، وَذَلِكَ أَنَّ وَقْتَهُ مَعْرُوفٌ عِنْدَ النَّاسِ، وَرُبَّمَا دَخَلَتْهُ الْعَاهَةُ، فَقَطَعَتْ ثَمَرَتَهُ، قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ ذَلِكَ الْوَقْتُ، فَإِذَا دَخَلَتْهُ الْعَاهَةُ بِجَائِحَةٍ تَبْلُغُ الثُّلُثَ فَصَاعِدًا، كَانَ ذَلِكَ مَوْضُوعًا عَنِ الَّذِي ابْتَاعَهُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە دەربارەی فرۆشتنی شووتی (شفتی) و ترۆزی و گندۆرە (کاڵەك) و جێزەر (گێزەر)، ئاوایە: ئەگەر پێ گەیشتبوو کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ و دروستە، دواتر ئەوەی لە نوێوە دەڕوێت بۆ کڕیارەکەیە تا بەرهەمەکە تەواو دەبڕێت و نامێنێت و لەناو دەچێت، ئەوەش کاتێکی نییە بۆی دابنرێ، چونکە کاتەکەی لەلای خەڵکی زانراوە، وە ڕەنگە ئافاتێکی بکەوێتە ناو و بەرهەمەکە بەر لە کاتەکە نەمێنێت، جا ئەگەر ئافاتێك لێی دا و بەرهەمە لەناوچووەکە گەیشتە سێیەك و زیاتر، ئەوە لەسەر کڕیارەکە لادەبرێت (لە فرۆشیارەکە دەڕوات لەسەر ئەو حیسابەی باس کرا).

### ٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی فرۆشتنی بەروبووم بەسەر دارەوە[٣]

**١٨١٣-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرْخَصَ لِصَاحِبِ الْعَرِيَّةِ، أَنْ يَبِيعَهَا بِخَرْصِهَا[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٥أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٦١ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٤ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٥ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٦ في البيوع؛ والشيباني: ٧٥٧ في

واتە: لە زەیدی كوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بەو كەسەی خاوەنی خورمایە و هێشتا خورماكە بەسەر دارەوەیە بەوەی بەخەمڵاندن بیفرۆشێت.

**١٨١٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَرْخَصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا، فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، يَشُكُّ دَاوُدُ قَالَ: خَمْسَةٍ، أَوْ دُونَ خَمْسَةٍ[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە فرۆشتنی خورمای سەر دار بەخەمڵاندن، لەوەی كەمترە لە پێنج وەسق (واتە كەمتر لە چل تەنەكە)، یان لە پێنج وەسق (چل تەنەكە)، داود (كە یەكێكە لە ڕاوییەكان) بەگومانەوە گوتوویەتی: پێنج یان كەمتر لە پێنج.

**١٨١٥-** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا تُبَاعُ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا مِنَ التَّمْرِ، يُتَحَرَّى ذَلِكَ، وَيُخْرَصُ فِي رُؤُوسِ النَّخْلِ وَلَيْسَتْ لَهُ مَكِيلَةٌ، وَإِنَّمَا أُرْخِصَ فِيهِ، لأَنَّهُ أُنْزِلَ بِمَنْزِلَةِ التَّوْلِيَةِ وَالإِقَالَةِ وَالشِّرْكِ، وَلَوْ كَانَ بِمَنْزِلَةِ غَيْرِهِ مِنَ الْبُيُوعِ، مَا أَشْرَكَ أَحَدٌ أَحَدًا فِي طَعَامِهِ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ، وَلاَ أَقَالَهُ مِنْهُ، وَلاَ وَلاَّهُ أَحَدًا، حَتَّى يَقْبِضَهُ الْمُبْتَاعُ[2].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: خورما و ڕوتاب بەسەر دارەوە كە بە خورما و قەسپی وشك دەفرۆشرێت و هەوڵ دەدرێت بزانرێت چەندە و بەسەر دارەوە دەخەمڵێندرێت و پێوانەی نییە (چونكە ناتوانرێت لەسەر دار پێوانە بكرێت)، جا كە مۆڵەت دراوە تیایدا، لەبەرئەوەیە وەك تەولییە و ئیقالە

---

البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧٠٣؛ وابن حنبل: ٢١٦٦٩؛ والبخاري: ٢١٨٨ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ٦٠؛ وابن حبان: ٥٠٠١؛ والقابسي: ٢٣٧، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٦أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٥٨ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧٠٤؛ وابن حنبل: ٧٢٣٥؛ والبخاري: ٢٣٨٢ في المساقاة؛ ومسلم: البيوع: ٧١؛ والنسائي: ٤٥٤١ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٦٤ في البيوع؛ والترمذي: البيوع: ٦٢؛ وابن حبان: ٥٠٠٦، وفي: ٥٠٠٧؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٥٨؛ وأبي يعلى الموصلي: ٦٣٨٦؛ وشرح معاني الآثار: ٥٦٠٣؛ والقابسي: ١٥٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٧ في البيوع، عن مالك به.

و شەریکایەتی وایە (کە حیسابی لایەنی یارمەتی و چاکەکاریيان بۆ دەکرێت)، ئەگەر وەك کڕین و فرۆشتنی دیکە بووایە (کە مەبەست پێی قازانج و بازرگانییە)، ئەوە نەدەبوو هیچ کەسێك کەسی دیکە بکات بە هاوبەش لە خواردنەکەی تا وەریدەگرێت، وە ئیقالە و پەشیمانبوونەوەشی قبووڵ نەدەکرد، وە کەسیشی نەدەکرد بە سەرپەرشتیاری مامەڵەکە، تا کڕیارەکە وەریدەگرێت.

## ١٠- (بڕیار دەربارەی) ئافات لە کڕین و فرۆشتنی بەروبووم و دانەوێڵەدا(١)

**١٨١٦-** عَنْ أَبِي الرِّجَالِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهَا تَقُولُ: ابْتَاعَ رَجُلٌ ثَمَرَ حَائِطٍ، فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَعَالَجَهُ، وَقَامَ فِيهِ، حَتَّى تَبَيَّنَ لَهُ النُّقْصَانُ، فَسَأَلَ رَبَّ الْحَائِطِ أَنْ يَضَعَ لَهُ، أَوْ أَنْ يُقِيلَهُ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَفْعَلَ، فَذَهَبَتْ أُمُّ الْمُشْتَرِي إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَأَلَّى أَنْ لاَ يَفْعَلَ خَيْرًا، فَسَمِعَ بِذَلِكَ رَبُّ الْحَائِطِ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هُوَ لَهُ(٢).

واتە: لە ئەبو ریجال موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانی دایکیەوە ﷺ گێراویەتەوە بەوەی گوێبیستی بووە دەیگوت: پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەروبوومی بێستانێکی کڕی، جا ڕێکی خست و هەڵسا بە کارکردن تێیدا، تا بۆی دەرکەوت زۆر زەرەری کردووە (بەهۆی ئافات)، جا داوای لە خاوەن بێستانەکە کرد هەندێك لە پارەکەی لەسەر هەڵبگرێ یان پەشیمانبوونەوەی لێ قبووڵ بکات و مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە، خاوەنی بێستانەکەش سوێندی خوارد کە کاری وا نەکات (نە پارەکەی لەسەر سووك بکات و نە پەشیمانبوونەوەشی لێ قبووڵ بکات)، جا دایکی کڕیارەکە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەری خواش

---

(١) ـ الْجَائِحَةُ فِي بَيْعِ الثِّمَارِ وَالزَّرْعِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٧ في البيوع؛ والشافعي: ٧٠٩، كلهم عن مالك به.

ﷺ فەرمووی: سوێندی خواردووە کاری چاك نەکات!! جا خاوەنی بێستانەکە ئەو قسەیەی بیستەوە و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ڕازی بووم) ئەو مافەی بۆ هەیە (واتە لابردنی بەشێك لە نرخەکە، یان قبووڵکردنی پەشیمانبوونەوە).

١٨١٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ ﷺ قَضَى بِوَضْعِ الْجَائِحَةِ[١].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَعَلَى ذَلِكَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ﷺ بڕیاری دا بە هەڵگرتن و لابردنی نرخی ئەو بەروبوومەی ئافات لێی داوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە لەسەر ئەوەیە.

١٨١٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْجَائِحَةُ الَّتِي تُوضَعُ عَنِ الْمُشْتَرِي: الثُّلُثُ فَصَاعِدًا، وَلاَ يَكُونُ فِيمَا دُونَ ذَلِكَ جَائِحَةً.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بەروبوومە ئافاتبردووەی لادەدرێت لەسەر کڕیار (و لەسەر ئەو حیساب ناکرێت): بریتییە لە سێیەك (واتە ئەگەر ئەندازەکەی گەیشتە سێیەك)، جا ئەوەی لەوە کەمتر بوو ئافات نییە (وەك ئەوەی باڵندە و گیاندار تۆزێکی لێ بخوات).

## ١١- ئەوەی دروستە لە جیاکردنەوە و هەڵاوێردنی هەندێك لە بەروبووم (لە کاتی فرۆشتندا)[٢]

١٨١٩- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ كَانَ يَبِيعُ ثَمَرَ حَائِطِهِ، وَيَسْتَثْنِي مِنْهُ[٣].

---

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠٩ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ فِي اسْتِثْنَاءِ الثَّمَرِ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٨ في البيوع؛ والشيباني:




واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ بەروبوومی بێستانەکەی دەفرۆشت و هەندێکی جیا دەکردەوە (واتە دەیگوت: هەمووی دەفرۆشم تەنها ئەوەندە نەبێت).

**١٨٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّ جَدَّهُ مُحَمَّدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ بَاعَ ثَمَرَ حَائِطٍ لَهُ، يُقَالُ لَهُ: الأَفْرَاقُ، بِأَرْبَعَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، وَاسْتَثْنَى مِنْهُ بِثَمَانِ مِئَةِ دِرْهَمٍ تَمْرًا(1).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): باپیرم موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم ﷺ بەروبوومی بێستانێکی خۆی کە پێی دەگوترا: ئەفراق، بە چوار هەزار درهەم فرۆشتی و هەندێکی لێ جیا کردەوە (نەیفرۆشت) بای هەشت سەت درهەم بوو (کە نەدەگەیشتە سێیەکی کۆی گشتی بەروبوومەکە).

**١٨٢١-** عَنْ أَبِي الرِّجَالِ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَارِثَةَ ﷺ، أَنَّ أُمَّهُ عَمْرَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ كَانَتْ تَبِيعُ ثِمَارَهَا، وَتَسْتَثْنِي مِنْهَا(2).

واتە: لە ئەبو ریجال موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): دایکم عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان بەروبوومی بێستانەکەی خۆی دەفرۆشت و هەڵاوێردانی لە هەندێکی دەکرد (واتە هەندێکی نەدەفرۆشت و جیای دەکردەوە).

**١٨٢٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا بَاعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ، أَنَّ لَهُ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مِنْ ثَمَرِ حَائِطِهِ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ ثُلُثِ الثَّمَرِ، لاَ يُجَاوِزُ ذَلِكَ، وَمَا كَانَ دُونَ الثُّلُثِ، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ(3).

---

٧٦٤ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٨أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٢ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٨ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٣ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٣ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە (ئەوەیە): کەسێك ئەگەر بەروبوومی بێستانەکەی خۆی فرۆشت بۆی هەیە تا سێیەکی بەروبوومەکە هەڵاوێردنی تێدا بکات (واتە هەندێکی نەفرۆشێت)، لەوە تێ نەپەڕێنێت، ئەوەی کەمتر بێت لە سێیەك کێشە نییە.

**١٨٢٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الرَّجُلُ يَبِيعُ ثَمَرَ حَائِطِهِ، وَيَسْتَثْنِي مِنْ ثَمَرِ حَائِطِهِ ثَمَرَ نَخْلَةٍ أَوْ نَخلاَتٍ يَخْتَارُهَا، وَيُسَمِّي عَدَدَهَا، فَلاَ أَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا، لأَنَّ رَبَّ الْحَائِطِ إِنَّمَا اسْتَثْنَى شَيْئًا مِنْ ثَمَرِ حَائِطِ نَفْسِهِ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ شَيْءٌ احْتَبَسَهُ مِنْ حَائِطِهِ، وَأَمْسَكَهُ لَمْ يَبِعْهُ، وَبَاعَ مِنْ حَائِطِهِ مَا سِوَى ذَلِكَ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە کە کەسێك بەروبوومی بێستانەکەی بفرۆشێت و بەروبوومی دارخورمایێك یان چەند دارخورمایێك کە خۆی دیارییان بکات جیا بکاتەوە (بڵێت: تەنها ئەوەیان لەگەڵدا نەبێت، نایفرۆشم)، هیچ کێشەی نییە، چونکە خاوەنی بێستانەکە شتێك لە بەروبوومی بێستانەکەی خۆی جیا دەکاتەوە، ئەوە شتێکە لە بێستانەکەی خۆی حیجزی دەکات و دەیگرێتەوە نایفرۆشێت، جگە لەوە ئەوەی دیکە دەفرۆشێت لە بێستانەکەی (کارێکی زۆر ئاساییە هیچی نادروستی نەکردووە).

## ١٢- ئەوەی قەدەغەکراوە لە فرۆشتنی خورمادا[2]

**١٨٢٤-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: التَّمْرُ بِالتَّمْرِ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ عَامِلَكَ عَلَى خَيْبَرَ يَأْخُذُ الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ادْعُوهُ لِي، فَدُعِيَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَتَأْخُذُ الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ يَبِيعُونَنِي الْجَنِيبَ بِالْجَمْعِ صَاعًا بِصَاعٍ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنْ بَيْعِ التَّمْرِ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٥ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٩ في البيوع؛ والشيباني: ٨٢١ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەتائی کوڕی یەسارەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (فرۆشتنی) خورما بە خورما دەبێ وەکوو یەکدی بن، جا پێی گوترا: فەرمانبەرەکەت لە خەیبەر یەك صاع (خورمای چاك) بە دوو صاع خورما وەردەگرێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بانگی بکەن بۆم، جا بۆی بانگ کرا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا یەك صاع خورما بە دوو صاع وەردەگری؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای جەنیبم پێ نافرۆشن (کە جۆرە خورمایێکی چاکە) بە خورمای جەمع (کە جۆرێکی خراپە) صاعێك بە صاعێك، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: خورما جەمعەکەی خۆتان بە پارە بفرۆشە، بە پارەکەی خورما جەنیبەکە بکڕە (واتە خورما خراپەکەی خۆت بە نرخی خۆی بفرۆشە و خورمای باشیش بە نرخی خۆی بکڕە).

**١٨٢٥**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭭ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ، فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟ فَقَالَ: لاَ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ، وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاَثَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَفْعَلْ، بِعِ الْجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيبًا[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریی و ئەبو هورەیرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە (گوتویانە): پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی کردە کاربەدەست بەسەر خەیبەرەوە، جا خورمای جەنیبی بۆ هێنا (کە خورمایەکی دەرەجە یەکە)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئایا گشت خورمای خەیبەر ئاوایە؟ ئەویش گوتی: نەخێر، واللە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە یەك صاع لەو خورمایە بە دوو صاع و دوو صاعیش بە سێ صاع دەگۆڕینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاوا نەکەیت، خورما جەمعەکە (کە جۆرە خراپەکەیە) بە پارە بفرۆشە، دواتر خورما جەنیبەکە (کە جۆرە چاکەکەیە) بە پارەکە بکڕە (ئەگینا دەبێتە ڕیبا).

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٩أفي البيوع؛ والشيباني: ٨٢٢ في الصرف وأبواب الربا؛ والبخاري: ٢٢٠١ في البيوع: ٨٩ئ، وفي: ٢٣٠٢ في الوكالة: ٣ئ، وفي: ٤٢٤٤ في المغازي: ٤١ئ؛ ومسلم: المساقاة: ٩٥؛ والنسائي: ٤٥٥٣ في البيوع؛ وابن حبان: ٥٠٢١؛ والقابسي: ٣٩٤، كلهم عن مالك به.

**١٨٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّ زَيْدًا أَبَا عَيَّاشٍ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَأَلَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ عَنِ الْبَيْضَاءِ بِالسُّلْتِ؟ فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ ﷺ: أَيَّتُهُمَا أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْبَيْضَاءُ، فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ سَعْدٌ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُسْأَلُ عَنِ اشْتِرَاءِ التَّمْرِ بِالرُّطَبِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): زەید، ئەبو عەییاش ﷺ هەواڵی پێ داوە بەوەی پرسیاری لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ کردووە دەربارەی گۆڕینەوەی جۆی ئاسایی بە جۆی کێوی؟ سەعدیش ﷺ گوتی: کامیان چاکترە؟ گوتی: جۆی ئاسایی، جا سەعد نەهی لێکرد و گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو پرسیاری لێکرا دەربارەی کڕینی خورمای وشك بە خورمای تەڕ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا خورمایە تەڕەکە کەم دەکات کاتێ وشك دەبێتەوە؟ گوتیان: بەڵێ، جا قەدەغەی لێ کرد (چونکە وەکوو یەکدی دەرناچن، لە ڕووی ئەندازەوە).

## ١٣- ئەوەی هاتووە دەربارەی موزابەنە و موحاقەلە[2]

**١٨٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ.

وَالْمُزَابَنَةُ: بَيْعُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً، وَبَيْعُ الْكَرْمِ بِالزَّبِيبِ كَيْلاً[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٠ في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٥ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧١٩؛ وابن حنبل: ١٥١٥، وفي: ١٥٤٤؛ والنسائي: ٤٥٤٥ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٥٩ في البيوع؛ والترمذي: ١٢٢٥ في البيوع؛ وابن ماجه: ٢٢٨٤ في التجارات؛ وابن حبان: ٤٩٩٧، وفي: ٥٠٠٣؛ وأبي يعلى الموصلي: ٧١٢، وفي: ٨٢٥؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٠٦٩١ في البيوع والأقضية، وفي: ٣٦٢٣٤؛ والقابسي: ٣٨٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الْمُزَابَنَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣١ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٨ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧١٢؛ وابن حنبل: ٣٩٤، وفي: ٤٥٢٨، وفي: ٥٢٩٧، وفي: ٥٣٠٧، وفي: ٥٨٦٢؛ والبخاري: ٢١٧١ في البيوع، وفي: ٢١٨٥ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ٧٢؛ والنسائي: ٤٥٣٤ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٨٠ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٩٨؛ والقابسي: ٢٣٦، كلهم عن مالك به.




واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﭭ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە كڕین و فرۆشتنی موزابەنە.

ئیمامی مالیك ﭬ گوتوویەتی: موزابەنە بریتییە لە: فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشك بەپێوانەكردن، وە فرۆشتنی دیكەی بە مێوژ بەپێوانەكردن (بۆیە حەڕام كراوە چونكە دیار نییە خورما تەڕەكە و ترێیەكە كە وشك دەبنەوە وەكوو خورما وشكەكە و مێوژەكە هەمان ئەندازە دەردەچێت یان نا).

**١٨٢٨**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُحَاقَلَةِ.

وَالْمُزَابَنَةُ: اشْتِرَاءُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ فِي رُؤُوسِ النَّخْلِ، وَالْمُحَاقَلَةُ: كِرَاءُ الأَرْضِ بِالْحِنْطَةِ[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە موزابەنە و موحاقەلە، موزابەنە بریتییە لە: كڕینی خورمای تەڕ بەسەر دارخورماوە بە خورمای وشك، موحاقەلەش بریتییە لە: بەكرێدانی زەوی بە گەنم (و خۆراكی دیكە).

**١٨٢٩**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ.

وَالْمُزَابَنَةُ: اشْتِرَاءُ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، وَالْمُحَاقَلَةُ: اشْتِرَاءُ الزَّرْعِ بِالْحِنْطَةِ، وَاسْتِكْرَاءُ الأَرْضِ بِالْحِنْطَةِ[2].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە موزابەنە و موحاقەلە.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣١أفي البيوع؛ والشيباني: ٧٨٠ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧١٣؛ وابن حنبل: ١١٠٣٥، وفي: ١١٠٦٧، وفي: ١١٥٩٤؛ والبخاري: ٢١٨٦ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ١٠٦؛ وابن ماجه: ٢٤٨٠ في الأحكام؛ وأبو يعلى الموصلي: ١١٩١؛ والقابسي: ١٥٨، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥١٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣١أفي البيوع؛ والشيباني: ٧٨٠ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧١٣؛ وابن حنبل: ١١٠٣٥، وفي: ١١٠٦٧، وفي: ١١٥٩٤؛ والبخاري: ٢١٨٦؛ ومسلم: البيوع: ١٠٦؛ وابن ماجه: ٢٤٨٠ في الأحكام؛ وأبو يعلى الموصلي: ١١٩١؛ والقابسي: ١٥٨، كلهم عن مالك به.

موزابەنە بریتییە لە: کڕینی خورمای تەڕ بەسەر دارخورماوە بە خورمای وشك، موحاقەلەش بریتییە لە: کڕینی کشتوکاڵ بە گەنم و بەکرێگرتنی زەوی بە گەنم (و خۆراکی دیکە).

**١٨٣٠-** قَالَ ابْنُ شِهَابٍ ﷺ: فَسَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ عَنِ اسْتِكْرَاءِ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[١].

واتە: ئیبنو شیهاب ﷺ گوتوویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ کرد دەربارەی بەکرێگرتنی زەوی بە زێڕ و زیو، گوتی: هیچ کێشە لەوەدا نییە (بەڵام بە خواردن دروست نییە).

**١٨٣١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَتَفْسِيرُ الْمُزَابَنَةِ: أَنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنَ الْجِزَافِ الَّذِي لاَ يُعْلَمُ كَيْلُهُ، وَلاَ وَزْنُهُ، وَلاَ عَدَدُهُ، ابْتِيعَ بِشَيْءٍ مُسَمًّى مِنَ الْكَيْلِ أَوِ الْوَزْنِ أَوِ الْعَدَدِ، وَذَلِكَ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: يَكُونُ لَهُ الطَّعَامُ الْمُصَبَّرُ الَّذِي لاَ يُعْلَمُ كَيْلُهُ مِنَ الْحِنْطَةِ أَوِ التَّمْرِ أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأَطْعِمَةِ، أَوْ تَكُونُ لِلرَّجُلِ السِّلْعَةُ مِنَ الْحِنْطَةِ أَوِ النَّوَى أَوِ الْقَضْبِ أَوِ الْعُصْفُرِ، أَوِ الْكُرْسُفِ، أَوِ الْكَتَّانِ أَوِ الْقَزِّ، أَوْ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ السِّلَعِ، لاَ يُعْلَمُ كَيْلُ شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ، وَلاَ وَزْنُهُ وَلاَ عَدَدُهُ، فَيَقُولُ الرَّجُلُ لِرَبِّ تِلْكَ السِّلْعَةِ: كِلْ سِلْعَتَكَ هَذِهِ، أَوْ مُرْ مَنْ يَكِيلُهَا، أَوْ زِنْ مِنْ ذَلِكَ مَا يُوزَنُ، أَوْ اعْدُدْ مِنْ ذَلِكَ مَا كَانَ يُعَدُّ، فَمَا نَقَصَ مِنْ كَذَا وَكَذَا صَاعًا، لِتَسْمِيَةٍ يُسَمِّيهَا، أَوْ وَزْنِ كَذَا وَكَذَا رِطْلاً، أَوْ عَدَدِ كَذَا وَكَذَا، فَمَا نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ، فَعَلَيَّ غُرْمُهُ، حَتَّى أُوفِيَكَ تِلْكَ التَّسْمِيَةَ، فَمَا زَادَ عَلَى تِلْكَ التَّسْمِيَةِ فَهُوَ لِي، أَضْمَنُ مَا نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ، عَلَى أَنْ يَكُونَ لِي مَا زَادَ. فَلَيْسَ ذَلِكَ بَيْعًا، وَلَكِنَّهُ الْمُخَاطَرَةُ وَالْغَرَرُ وَالْقِمَارُ يَدْخُلُ هَذَا، لأَنَّهُ لَمْ يَشْتَرِ مِنْهُ شَيْئًا بِشَيْءٍ أَخْرَجَهُ، وَلَكِنَّهُ ضَمِنَ لَهُ مَا سُمِّيَ مِنْ ذَلِكَ الْكَيْلِ أَوِ الْوَزْنِ أَوِ الْعَدَدِ، عَلَى أَنْ يَكُونَ لَهُ مَا زَادَ عَلَى ذَلِكَ، فَإِنْ نَقَصَتْ تِلْكَ السِّلْعَةُ مِنْ تِلْكَ التَّسْمِيَةِ، أَخَذَ مِنْ مَالِ صَاحِبِهِ مَا نَقَصَ بِغَيْرِ ثَمَنٍ، وَلاَ هِبَةٍ طَيِّبَةٍ بِهَا نَفْسُهُ، فَهَذَا يُشْبِهُ الْقِمَارَ، وَمَا كَانَ مِثْلُ هَذَا مِنَ الأَشْيَاءِ، فَذَلِكَ يَدْخُلُهُ[٢].

---

(١) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣١ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٩ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٧١٤؛ وفي: ١٢٤٢؛ والنسائي: ٣٨٩٣ في المزارعة، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٢ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷬ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە موزابەنە، ڕوونکردنەوەی موزابەنەش ئەوەیە: هەر شتێکی لەگۆترە کە پێوان و کێشان و ژمارەی نەزانرێت بە شتێك بفرۆشرێت کە پێوان یان کێشان یان ژمارەی بزانرێت و دیاریکراو بێت، بەوەی کەسێك کە ڕوسە و ئەندازەیەك خۆراکی وەك گەنم یان خورما یان هاوشێوەی ئەوانەی هەیە کە ئەندازەکەی دیار نییە، یان کەسەکە کاڵایەکی وەك گەنم یان ناوکەخورما یان سەوزە یان عوصفور (گیاگەزنە، کە گوڵێکی نارنجییە) یان لۆکە یان کەتان یان حەریر یان شتێکی لەو جۆرە کاڵایانەی هەبێت، کە پێوان و کێشان و ژمارەی ئەو شتە نەزانرێت، جا کەسەکەش بە خاوەنی ئەو کاڵایە بڵێت: ئەو کاڵایەت بپێوە یان فەرمان بە کەسێك بکە بیپێوێت یان ئەوەی دەکێشرێت بیکێشە یان ئەوەی دەژمێردرێت بیژمێرە، جا ئەگەر لەوەندە و لەوەندە صاعە کەمتر بوو، ناوی ژمارەیەك دەهێنێ (لەوە کەمتر بوو) یان لە کێشی ئەوەندە و ئەوەندە ڕیتلە کەمتر بوو یان لە ژمارەی ئەوەندە و ئەوەندە کەمتر بوو، ئەوە کەمییەکەی لەسەر منە و بۆتی تەواو دەکەم (واتە هەر بەو ئەندازەیە حیسابی دەکەم هەرچەندە کەمتریش بێت)، وە ئەوەی لەو ژمارەیە زیاتر بوو بۆ خۆمە، (واتە) زامنی ئەوە دەبم کە کەمە لەسەر ئەو مەرج و بنەمایەی زیادەکە بۆ من بێت (ئەگەر زیاد بوو)، ئەوە بەیع نییە، بەڵکوو خەتەر و نادیاری و قومارە دەکەوێتە ناویەوە، چونکە شتێکی نەکڕیەوە بە شتێك، بەڵکوو ئەوەی خستۆتە سەر خۆی کە ناوی هێنراوە لە پێوان و کێشان و ژمارەدا لەسەر ئەوەی زیاد لەوە بۆ ئەو بێت بەبێ پارە و بەبێ دیارییێکی پێخۆشی خۆی، ئەوە وەك قومار وایە، ئەوەی وەك ئەو شتانە بێت قومار دەکەوێتە ناویەوە.

**١٨٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَمِنْ ذَلِكَ أَيْضًا: أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: لَهُ الثَّوْبُ أَضْمَنُ لَكَ مِنْ ثَوْبِكَ هَذَا كَذَا وَكَذَا ظِهَارَةَ قَلَنْسُوَةٍ، قَدْرُ كُلِّ ظِهَارَةٍ كَذَا وَكَذَا، لِشَيْءٍ يُسَمِّيهِ، فَمَا نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ، فَعَلَيَّ غُرْمُهُ حَتَّى أُوفِيَكَهُ، وَمَا زَادَ فَلِي، أَوْ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: أَضْمَنُ لَكَ مِنْ ثِيَابِكَ هَذِهِ كَذَا وَكَذَا قَمِيصًا، ذَرْعُ كُلِّ قَمِيصٍ كَذَا وَكَذَا، فَمَا نَقَصَ مِنْ ذَلِكَ، فَعَلَيَّ غُرْمُهُ، وَمَا زَادَ عَلَى ذَلِكَ فَلِي، أَوْ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ لَهُ الْجُلُودُ مِنْ جُلُودِ الْبَقَرِ أَوِ الإِبِلِ: أُقَطِّعُ جُلُودَكَ هَذِهِ نِعَالاً عَلَى إِمَامٍ يُرِيهِ إِيَّاهُ، فَمَا نَقَصَ مِنْ مِئَةِ زَوْجٍ، فَعَلَيَّ غُرْمُهُ، وَمَا زَادَ فَهُوَ لِي




بِمَا ضَمِنْتُ لَكَ، وَمِمَّا يُشْبِهُ ذَلِكَ، أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ عِنْدَهُ حَبُّ الْبَانِ: اعْصُرْ حَبَّكَ هَذَا، فَمَا نَقَصَ مِنْ كَذَا وَكَذَا رِطْلاً، فَعَلَيَّ أَنْ أُعْطِيَكَهُ، وَمَا زَادَ فَهُوَ لِي، فَهَذَا كُلُّهُ وَمَا أَشْبَهَهُ مِنَ الأَشْيَاءِ أَوْ ضَارَعَهُ مِنَ الْمُزَابَنَةِ الَّتِي لاَ تَصْلُحُ وَلاَ تَجُوزُ، وَكَذَلِكَ أَيْضًا إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ لَهُ الْخَبَطُ أَوِ النَّوَى أَوِ الْكُرْسُفُ أَوِ الْكَتَّانُ أَوِ الْقَضْبُ أَوِ الْعُصْفُرُ: أَبْتَاعُ مِنْكَ هَذَا الْخَبَطَ بِكَذَا وَكَذَا صَاعًا مِنْ خَبَطٍ يُخْبَطُ مِثْلَ خَبَطِهِ، أَوْ هَذَا نَوًى بِكَذَا وَكَذَا صَاعًا مِنْ نَوًى مِثْلِهِ، وَفِي الْعُصْفُرِ وَالْكُرْسُفِ، وَالْكَتَّانِ وَالْقَضْبِ مِثْلَ ذَلِكَ، فَهَذَا كُلُّهُ يَرْجِعُ إِلَى مَا وَصَفْنَا مِنَ الْمُزَابَنَةِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: یەکێکی دیکە (لە مامەڵەی موزابەنە کە حەرامە) ئەوەیە: کەسێك بە کەسێك ـ کە جل و بەرگ و پۆشاکی هەیە ـ بڵێت: من لەبەرانبەر ئەو پۆشاکەت ئەوەندە و ئەوەندە کڵاو و جامانەت بۆ زامن دەکەم و پێت دەدەم، ئەندازەی هەر کڵاو و جامانەیەکیش ئەوەندە و ئەوەندە بێت، ناوی بێنێت (قیاس و ئەندازەکە بێنێت)، جا ئەگەر (هێنام) لەوە کەمتر بوو، ئەوە کەمییەکەی لەسەر خۆمە بۆت تەواو دەکەم، ئەوەی زیادیش بوو بۆ خۆمە، یان کەسێك بە کەسێك بڵێت: لەبەرانبەر ئەو پۆشاکەت ئەوەندە و ئەوەندە قەمیس و کراسە ئامادە دەکەم، ئەندازە و قیاسی هەر قەمیسێك ئەوەندە و ئەوەندە بێت، جا ئەگەر (هێنام) لەوە کەمتر بوو، ئەوە کەمییەکەی لەسەر خۆمە بۆت تەواو دەکەم، ئەوەی زیادیش بوو بۆ خۆمە، یان کەسێك بە کەسێك ـ کە پێستەی هەنە، پێستەی مانگا و وشتر ـ بڵێت: ئەو پێستانەی تۆ (بۆ خۆم دەبەم) دەیانکەم بە نەعل (و سەت جووت لە نەعلەکانت دەدەمێ)، لەسەر شێوازێك کە پێی پیشان بدات (بە چ جۆر و قیاسێك دروستیان دەکات)، جا ئەگەر لە سەت جووت کەمتر دەرچوو، ئەوە کەمییەکەی لەسەر خۆمە (بۆت تەواو دەکەم)، ئەوەی زیادیش بوو (واتە ئەگەر پێستەکان نەعلەی زیاتریان لێ دەرچوو) بۆ خۆمە لەسەر ئەو بنەمایەی ئەوەم داوە بە تۆ کە بڕیارم دابوو، وە یەکێکی دیکە لەوەی وەکوو ئەو بابەتەیە ئەوەیە: کەسێك بە کەسێك ـ کە دەنکی درەختی بانی هەبێت ـ بڵێت: ئەو دەنکانەی خۆت بگوشە (و بیکە بە ڕۆن)، جا ئەوەی کەمتر بوو لەوەندە و لەوەندە ڕتڵە (یان

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٣ في البيوع، عن مالك به.




تەنەکە)، ئەوە لەسەر منە (چەندی کەمتر بوو کێشە نییە) هەمان پارەت دەدەمێ، وە ئەوەی زیاد بوو (بە هەمان پارە، بەبێ زیادکردن) بۆ من بێت، جا گشت ئەو بابەتانە و ئەوەی لەو بابەتانەش دەچن لە شتەکان یان لە موزابەنە دەچێ کە نابێت و دروست نییە، بە هەمان شێوە: ئەگەر کەسێك بە کەسێك ـ کە گەڵا یان دەنکی بەری درەخت یان لۆکە یان کەتان یان سەوزە یان گیاگەزنەی هەبێت ـ بڵێت: ئەو گەڵایانە بە ئەوەندە و ئەوەندە صاعەی هەمان گەڵا لێت دەکڕم، یان بڵێت: ئەو دەنکانە بە ئەوەندە و ئەوەندە صاعەی هەمان دەنك لێت دەکڕم، بۆ گیاگەزنەکە و لۆکە و کەتان و سەوزەکەش هەمان شت بڵێت، ئەوە گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی باسمان کرد لە موزابەنە (کە حەڕامە و دروست نییە).

## ١٤- بابەتی جۆراوجۆری کڕین و فرۆشتنی بەروبووم[١]

**١٨٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى ثَمَرًا مِنْ نَخْلٍ مُسَمَّاةٍ، أَوْ حَائِطٍ مُسَمًّى، أَوْ لَبَنًا مِنْ غَنَمٍ مُسَمَّاةٍ، إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، إِذَا كَانَ يُؤْخَذُ عَاجِلاً يَشْرَعُ الْمُشْتَرِي فِي أَخْذِهِ عِنْدَ دَفْعِهِ الثَّمَنَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ رَاوِيَةِ زَيْتٍ يَبْتَاعُ مِنْهَا رَجُلٌ بِدِينَارٍ أَوْ بِدِينَارَيْنِ، وَيُعْطِيهِ ذَهَبَهُ وَيَشْتَرِطُ عَلَيْهِ أَنْ يَكِيلَ لَهُ مِنْهَا، فَهَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ، فَإِنِ انْشَقَّتِ الرَّاوِيَةُ، فَذَهَبَ زَيْتُهَا، فَلَيْسَ لِلْمُبْتَاعِ إِلاَّ ذَهَبُهُ، وَلاَ يَكُونُ بَيْنَهُمَا بَيْعٌ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەروبوومی دارخورمایێکی دیاریکراو یان بێستانێکی دیاریکراوی کڕی، یان شیری بزنێکی دیاریکراوی کڕی، ئەوە هیچ کێشەی تیا نییە، (بە مەرجێك) ئەگەر بەخێرایی وەربگیرێ، کڕیار لە کاتی پارەدانەکە دەست بکات بە وەرگرتنی شتەکە، ئەوە وەکوو ئەو تێرە زەیتە وایە کە پیاوێك هەندێ زەیتی ناوی بە دینارێك یان دوو دینار بکڕێت و پارەکەی خۆی بدات و مەرجی لەسەر دابنێت بەوەی زەیتەکەی بۆ بکێشێت، ئەوە (دروستە و) هیچ کێشەی تیا نییە، جا ئەگەر تێرەکە دڕا و زەیتەکە

---

(١) ـ جَامِعُ بَيْعِ الثَّمَرِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٤ في البيوع، عن مالك به.

ڕژا، ئەوە كڕیارەكە جگە لە پارەكەی خۆی هیچ شتێكی بۆ نییە و كڕین و فرۆشتن لە نێوانیان ڕووی نەداوە.

١٨٣٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَمَّا كُلُّ شَيْءٍ كَانَ حَاضِرًا يُشْتَرَى عَلَى وَجْهِهِ مِثْلُ اللَّبَنِ إِذَا حُلِبَ، وَالرُّطَبِ يُسْتَجْنَى، فَيَأْخُذُ الْمُبْتَاعُ يَوْمًا بِيَوْمٍ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ، فَإِنْ فَنِيَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفِيَ الْمُشْتَرِي مَا اشْتَرَى، رَدَّ عَلَيْهِ الْبَائِعُ مِنْ ذَهَبِهِ بِحِسَابِ مَا بَقِيَ لَهُ، أَوْ يَأْخُذُ مِنْهُ الْمُشْتَرِي سِلْعَةً، بِمَا بَقِيَ لَهُ، يَتَرَاضَيَانِ عَلَيْهَا، وَلاَ يُفَارِقُهُ حَتَّى يَأْخُذَهَا، فَإِنْ فَارَقَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ مَكْرُوهٌ، لأَنَّهُ يَدْخُلُهُ الدَّيْنُ بِالدَّيْنِ، وَقَدْ نُهِيَ عَنِ الْكَالِئِ بِالْكَالِئِ، فَإِنْ وَقَعَ فِي بَيْعِهِمَا أَجَلٌ، فَإِنَّهُ مَكْرُوهٌ، وَلاَ يَحِلُّ فِيهِ تَأْخِيرٌ وَلاَ نَظِرَةٌ، وَلاَ يَصْلُحُ إِلاَّ بِصِفَةٍ مَعْلُومَةٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَيَضْمَنُ ذَلِكَ الْبَائِعُ لِلْمُبْتَاعِ، وَلاَ يُسَمَّى ذَلِكَ فِي حَائِطٍ بِعَيْنِهِ، وَلاَ فِي غَنَمٍ بِأَعْيَانِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیكﷺ گوتوویەتی: هەر شتێك كە ئامادە بێ و وەك خۆی (بەبێ گۆڕانكاری) بفرۆشرێت وەك (فرۆشتنی) شیر كاتێ دەدۆشرێت، وە ڕوتاب كاتێ لێ دەكرێتەوە، جا كڕیار (ئەندازەیەك بكڕێت) و ڕۆژ بە ڕۆژ ببیات (گشتی بە یەك جار نەبات)، هیچ كێشەی نییە، جا ئەگەر نەما پێش ئەوەی كڕیارەكە تەواوی ئەوە بباتەوە كە كڕیویەتی، ئەوە فرۆشیار بەگوێرەی ئەوەی ماوە پارەی كڕیارەكە دەگەڕێنێتەوە، یان كڕیارەكە كاڵایێكی لێ وەردەگرێت كە لەسەری ڕێك بكەون لەبری ئەوەی ماویەتی، وە نابێ لێی جیا بێتەوە تا وەریدەگرێت، چونكە ئەگەر لێی جیا بۆیەوە، ئەوە ناپەسەندە و دروست نییە، چونكە (گۆڕینەوەی) قەرز بە قەرزی دەكەوێتە ناو، قەرز بە قەرزیش نەهی لێ كراوە (حەڕامە)، جا ئەگەر كڕین و فرۆشتنەكەیان ماوەی كەوتە ناو، ئەوە دروست نییە و دواخستن و چاوەڕێكردن حەڵاڵ و دروست نییە، جا (سەلەم و كڕین و فرۆشتنی بەماوە دروست نییە) تەنها بە سیفەتی دیاریكراو و زانراو نەبێت، كە كڕیار بیخاتە ئەستۆی خۆی بۆ فرۆشیار، ناشبێ ناوی بێستانێك یان مەڕێكی دیاریكراو بهێنرێ (لە سەلەمدا).

١٨٣٥- **[فتوى]** وَسُئِلَ مَالِكٌ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَشْتَرِي مِنَ الرَّجُلِ الْحَائِطَ فِيهِ أَلْوَانٌ مِنَ النَّخْلِ مِثْلَ الْعَجْوَةِ وَالْكَبِيسِ وَالْعَذْقِ، وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ أَلْوَانِ التَّمْرِ، فَيَسْتَثْنِي مِنْهَا ثَمَرَ النَّخْلَةِ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٤ في البيوع، عن مالك به.

أَوِ النَّخَلَاتِ يَخْتَارُهَا مِنْ نَخْلِهِ؟ فَقَالَ مَالِكٌ ﷺ: ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ إِذَا صَنَعَ ذَلِكَ تَرَكَ ثَمَرَ النَّخْلَةِ مِنَ الْعَجْوَةِ، وَمَكِيلَةُ ثَمَرِهَا خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، وَأَخَذَ مَكَانَهَا ثَمَرَ نَخْلَةٍ مِنَ الْكَبِيسِ، وَمَكِيلَةُ ثَمَرِهَا عَشَرَةُ آصُعٍ، فَإِنْ أَخَذَ الْعَجْوَةَ الَّتِي فِيهَا خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، وَتَرَكَ الَّتِي فِيهَا عَشَرَةُ آصُعٍ مِنَ الْكَبِيسِ، فَكَأَنَّهُ اشْتَرَى الْعَجْوَةَ بِالْكَبِيسِ مُتَفَاضِلاً، وَذَلِكَ مِثْلُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ بَيْنَ يَدَيْهِ صُبَرٌ مِنَ التَّمْرِ، قَدْ صَبَّرَ الْعَجْوَةَ، فَجَعَلَهَا خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، وَجَعَلَ صُبْرَةَ الْكَبِيسِ عَشَرَةَ آصُعٍ، وَجَعَلَ صُبْرَةَ الْعَذْقِ اثْنَيْ عَشَرَ صَاعًا، فَأَعْطَى صَاحِبَ التَّمْرِ دِينَارًا عَلَى أَنَّهُ يَخْتَارُ، فَيَأْخُذُ أَيَّ تِلْكَ الصُّبَرِ شَاءَ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ[1].

(فەتوا): وە ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە بێستانێك لە کەسێك دەکڕێت کە چەندین جۆر لە خورمای تیایە، عەجوە و کەبیس و عەزق و جگە لەوانە لە جۆرەکانی خورما جا (لە فرۆشتنەکەدا) هەندێکی جیا بکاتەوە لە بەروبوومی دارخورمایەك یان چەندین دارخورما کە دیاری بکات لە دارخورماکان؟ جا ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە نابێت و دروست نییە، چونکە ئەگەر ئەوە ئەنجام بدات (بۆ نموونە) جیاکردنەوەکەی لە درەختی عەجوە بێ و پێوانەی بەرهەمەکەی پازدە صاع بێت و لە جێگەی ئەوە دارخورمایەك لە کەبیس وەربگرێت کە پێوانەی بەروبوومەکەی دە صاعە، جا ئەگەر ئەو عەجوەی وەرگرت کە پازدە صاع بەرهەمی تیایە، وە دەستبەرداری ئەوە بێ کە دە صاع بەرهەمی تیایە، ئەوە وەك ئەوە وایە عەجوەی بە کەبیس کڕیبێت بەزیادە، ئەوەش وەکوو ئەوە وایە کەسێك بە کەسێك بڵێت: ـ کە چەند ڕوسەیەك لە خورمای لەبەر دەم بێت و عەجوەی کردبێتە ڕوسەیەك و پازدە صاعی دانابێت و ڕوسەی کەبیسی دانابێت دە صاع بێت و ڕوسەی عەزقی دانابێت دوازدە صاع بێت، جا کڕیارەکە بڵێت: (دینارێکت پێ دەدەم) جا دینارێك بدات بە خاوەنی خورماکان لەسەر ئەوەی بۆ خۆی خورما هەڵبژێرێت و لە کام ڕوسەی بوێ ببیات، ئیمامی مالیك گوتوویەتی: ئەوە نابێت و دروست نییە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٦ في البيوع، عن مالك به.




**١٨٣٦- [فتوى]** قَالَ: وَسُئِلَ مَالِكٌ عَنِ الرَّجُلِ يَشْتَرِي الرُّطَبَ مِنْ صَاحِبِ الْحَائِطِ، فَيُسْلِفُهُ الدِّينَارَ، مَاذَا لَهُ إِذَا ذَهَبَ رُطَبُ ذَلِكَ الْحَائِطِ؟ قَالَ مَالِكٌ ﷺ: يُحَاسِبُ صَاحِبَ الْحَائِطِ، ثُمَّ يَأْخُذُ مِنْهُ مَا بَقِيَ لَهُ مِنْ دِينَارِهِ، إِنْ كَانَ أَخَذَ بِثُلُثَيْ دِينَارٍ رُطَبًا، أَخَذَ ثُلُثَ الدِّينَارِ الَّذِي بَقِيَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ أَخَذَ ثَلَاثَةَ أَرْبَاعِ دِينَارِهِ رُطَبًا، أَخَذَ الرُّبُعَ الَّذِي بَقِيَ لَهُ، أَوْ يَتَرَاضَيَانِ بَيْنَهُمَا، فَيَأْخُذُ بِمَا بَقِيَ لَهُ مِنْ دِينَارِهِ عِنْدَ صَاحِبِ الْحَائِطِ مَا بَدَا لَهُ إِنْ أَحَبَّ أَنْ يَأْخُذَ تَمْرًا أَوْ سِلْعَةً سِوَى التَّمْرِ، أَخَذَهَا بِمَا فَضَلَ لَهُ، فَإِنْ أَخَذَ تَمْرًا أَوْ سِلْعَةً أُخْرَى، فَلَا يُفَارِقْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَ ذَلِكَ مِنْهُ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی ڕوتاب لە خاوەنی بێستانێك دەکڕێت و پێشتر دینارێکی دەداتێ (و بای هەندێك لە دینارەکە خورما دەبات)، جا چی بۆ هەیە ئەگەر ڕوتابی ئەو بێستانە نەما (بەر لەوەی بای تەواوی دینارەکە ڕوتاب ببات)؟ ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: حیساب لەگەڵ خاوەن بێستانەکە دەکات، دواتر ئەوەندەی ماوە لە دینارەکەی خۆی وەریدەگرێتەوە، ئەگەر بای دوو لەسەر سێی دینارەکە ڕوتابی بردبوو، ئەوە یەك لەسەر سێی دینارەکە وەردەگرێتەوە کە ماویەتی، وە ئەگەر بای سێ لەسەر چواری دینارەکە خورمای وەرگرتبوو، ئەوە یەك لەسەر سێی دینارەکە وەردەگرێتەوە کە ماویەتی، یان هەردووکیان ڕازی دەبن و ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی ماوەتەوە لە دینارەکە لەلای خاوەن بێستانەکە بەوەی ئەگەر کڕیارەکە حەزی کرد خورما یان کاڵایێکی دیکە وەربگرێت، ئەوە وەریدەگرێت، جا ئەگەر ڕازی بوو خورما یان کاڵایێکی دیکە وەربگرێت ئەوە نابێ لێی جیا بێتەوە تاوەکوو لێی وەردەگرێ (ئەگینا دروست نییە).

**١٨٣٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا هَذَا بِمَنْزِلَةِ أَنْ يُكْرِيَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ رَاحِلَتَهُ بِعَيْنِهَا، أَوْ يُؤَاجِرَ غُلَامَهُ الْخَيَّاطَ أَوِ النَّجَّارَ أَوِ الْعَمَّالَ لِغَيْرِ ذَلِكَ مِنَ الأَعْمَالِ، أَوْ يُكْرِيَ مَسْكَنَهُ، وَيَسْتَلِفَ إِجَارَةَ ذَلِكَ الْغُلَامِ، أَوْ كِرَاءَ ذَلِكَ الْمَسْكَنِ، أَوْ تِلْكَ الرَّاحِلَةِ، ثُمَّ يَحْدُثُ فِي ذَلِكَ حَدَثٌ بِمَوْتٍ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ، فَيَرُدُّ رَبُّ الرَّاحِلَةِ، أَوِ الْعَبْدِ أَوِ الْمَسْكَنِ إِلَى الَّذِي سَلَّفَهُ مَا بَقِيَ مِنْ كِرَاءِ الرَّاحِلَةِ، أَوْ إِجَارَةِ الْعَبْدِ، أَوْ كِرَاءِ الْمَسْكَنِ، يُحَاسِبُ صَاحِبَهُ بِمَا اسْتَوْفَى مِنْ ذَلِكَ، إِنْ كَانَ اسْتَوْفَى نِصْفَ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٧ في البيوع، عن مالك به.

حَقِّهِ، رَدَّ عَلَيْهِ النِّصْفَ الْبَاقِيَ الَّذِي لَهُ عِنْدَهُ، وَإِنْ كَانَ أَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرَ، فَبِحِسَابِ ذَلِكَ، يَرُدُّ إِلَيْهِ مَا بَقِيَ لَهُ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی پێشوو باس کرا وەك ئەوە وایە کەسێك وڵاغی کەسێك بەکرێ بگرێت، یان کۆیلە بەرگدوورەکەی یان دارتاشەکەی یان حەمباڵەکەی کەسەکە بۆ کارێك بەکرێ بگرێت، یان خانووی کەسەکە بەکرێ بگرێت و پێشەکی پارەی کرێی کۆیلەکە یان کرێی خانوەکە یان ئاژەڵەکە بدات، دواتر بابەتی مردن یان هەر شتێکی دیکە ڕوو بدات (کە بەهۆیەوە بابەتەکە پەکی دەکەوێت)، ئەوە خاوەنی ئاژەڵەکە یان کۆیلەکە یان خانووەکە ئەوەی ماوە دەیگەڕێنێتەوە لە کرێی ئاژەڵەکە یان کۆیلەکە یان خانووەکە (کە بەئەنجام نەگەیشتووە)، لەگەڵ مامەڵەکارەکەی بەرانبەری حیسابی دەکات، ئەگەر نیوەی حەقەکەی وەرگرتبوو، ئەوە ئەو نیوەیەی بۆ دەگەڕێنێتەوە کە ماوە، وە ئەگەر کەمتر بوو لەوە یان زیاتر بوو، ئەوە بەگوێرەی خۆیەتی، چەندی ماوە ئەوەندەی بۆ دەگەڕێنێتەوە (لە کرێیە پێشەکییەکە).

١٨٣٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَصْلُحُ التَّسْلِيفُ فِي شَيْءٍ مِنْ هَذَا، يُسَلَّفُ فِيهِ بِعَيْنِهِ، إِلاَّ أَنْ يَقْبِضَ الْمُسَلِّفُ مَا سَلَّفَ فِيهِ عِنْدَ دَفْعِهِ الذَّهَبَ إِلَى صَاحِبِهِ، يَقْبِضُ الْعَبْدَ أَوِ الرَّاحِلَةَ أَوِ الْمَسْكَنَ، أَوْ يَبْدَأُ فِيمَا اشْتَرَى مِنَ الرُّطَبِ، فَيَأْخُذُ مِنْهُ عِنْدَ دَفْعِهِ الذَّهَبَ إِلَى صَاحِبِهِ، لاَ يَصْلُحُ أَنْ يَكُونَ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ تَأْخِيرٌ وَلاَ أَجَلٌ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە هیچ شتێك لەوانە پێشەکی پارەدان دروست نییە کە پێشەکی پارەدانەکە بۆ شتێکی دیاریکراو بێت، حەتمەن دەبێ ئەو کەسەی پێشەکی پارەکە دەدات بۆ شتەکە دەبێ شتەکە وەربگرێت لە کاتی پارەدان بە بەرانبەرەکەی، دەبێ کۆیلەکە یان ئاژەڵەکە یان خانووەکە وەربگرێت، یان دەبێ لە کاتی تەسلیمکردنی پارەکە بە بەرانبەرەکەی دەست بە بردنی بەشێك

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٢٩ في البيوع، عن مالك به.




لە ڕوتابەکە بکات کە کرێویەتی (ئەگەر شتەکە لەوانە بێت بەش بەش بکرێت)، نابێ و دروست نییە دواخستن و ماوە بکەوێتە ناو ئەو شتانە.

**١٨٣٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ، أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: أُسَلِّفُكَ فِي رَاحِلَتِكَ فُلَانَةَ أَرْكَبُهَا فِي الْحَجِّ، وَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْحَجِّ أَجَلٌ مِنَ الزَّمَانِ، أَوْ يَقُولَ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الْعَبْدِ أَوِ الْمَسْكَنِ، فَإِنَّهُ إِذَا صَنَعَ ذَلِكَ، كَانَ إِنَّمَا يُسَلِّفُهُ ذَهَبًا، عَلَى أَنَّهُ إِنْ وَجَدَ تِلْكَ الرَّاحِلَةَ صَحِيحَةً لِذَلِكَ الأَجَلِ الَّذِي سَمَّى لَهُ، فَهِيَ لَهُ بِذَلِكَ الْكِرَاءِ، وَإِنْ حَدَثَ بِهَا حَدَثٌ مِنْ مَوْتٍ أَوْ غَيْرِهِ رَدَّ عَلَيْهِ ذَهَبَهُ، وَكَانَتْ عَلَيْهِ عَلَى وَجْهِ السَّلَفِ عِنْدَهُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەوەی ناپەسەندە (دروست نییە) ئەوەیە: کەسێك بە کەسێك بڵێت: پێشەکی پارەت پێ دەدەم بۆ فڵان وڵاغت تا سواری ببم بۆ حەج، لە کاتێکدا لە نێوان ئەو کاتە و کاتی حەج ماوەیەك کات هەبێت (هێشتا کاتەکەی مابێت)، یان بۆ کۆیلە و خانوو هەمان شت بڵێت، جا ئەگەر بیەوێ ئەوە ئەنجام بدات (بەشێوەیەکی دروست) ئەوە دەبێ پێشتر پێشەکی زێڕی پێ بدات لەسەر ئەوەی ئەگەر سوارییەکەی بۆ ئەو کاتەی کە باسی کردبوو و ناوی هێنابوو ساغ و ئامادە بوو، ئەوە تەواوە ئەوەی بۆ هەیە بەو کرێیە، وە ئەگەر شتێك لە (وڵاغەکە) ڕووی دا وەك مردن و شتی دیکە، ئەوە دەبێ ئەو زێڕەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە (دەکا پارەکەی) کە بەقەرز لەلای بووە.

**١٨٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا فَرَقَ بَيْنَ ذَلِكَ الْقَبْضُ، مَنْ قَبَضَ مَا اسْتَأْجَرَ أَوِ اسْتَكْرَى، فَقَدْ خَرَجَ مِنَ الْغَرَرِ وَالسَّلَفِ الَّذِي يُكْرَهُ، وَأَخَذَ أَمْرًا مَعْلُومًا، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الْعَبْدَ أَوِ الْوَلِيدَةَ فَيَقْبِضَهُمَا، وَيَنْقُدَ أَثْمَانَهُمَا، فَإِنْ حَدَثَ بِهِمَا حَدَثٌ مِنْ عُهْدَةِ السَّنَةِ، أَخَذَ ذَهَبَهُ مِنْ صَاحِبِهِ الَّذِي ابْتَاعَ مِنْهُ، فَهَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ، وَبِهَذَا مَضَتِ السُّنَّةُ فِي بَيْعِ الرَّقِيقِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: تەنها وەرگرتن جیاوازی دروست کردووە (واتە بەهۆی وەرگرتنەوە مامەڵەکە دروستی وەرگرتووە)، هەر کەسێك

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٠ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣١ في البيوع، عن مالك به.

ئەو شتەی وەرگرت کە بەکرێی گرتووە، ئەوە لە نادیاری و سەلەمی نادروست دەرچووە و بابەتێکی زانراو و ڕوونی جێبەجێ کردووە، جا نموونەی ئەوە وەك ئەوە وایە کەسێك کۆیلەیەکی پیاو یان ئافرەت بکرێت و پارەکەی بەنەقد و کاش بدات، جا ئەگەر ڕووداوێکی قەدەری بەسەر هات (وەك مردن و پەککەوتن و شتی لەو جۆرە) و پارەی خۆی لە بەرانبەرەکەی وەربگرێتەوە کە لێی کڕیوە، ئەوە هیچ کێشەی تیا نییە و ڕێباز و مامەڵەی مسوڵمانان هەر بەو شێوەیە هاتووە دەربارەی کڕین و فرۆشتنی کۆیلە.

**١٨٤١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنِ اسْتَأْجَرَ عَبْدًا بِعَيْنِهِ، أَوْ تَكَارَى رَاحِلَةً بِعَيْنِهَا إِلَى أَجَلٍ، يَقْبِضُ الْعَبْدَ أَوِ الرَّاحِلَةَ إِلَى ذَلِكَ الأَجَلِ، فَقَدْ عَمِلَ بِمَا لاَ يَصْلُحُ، لاَ هُوَ قَبَضَ مَا اسْتَكْرَى أَوِ اسْتَأْجَرَ، وَلاَ هُوَ سَلَّفَ فِي دَيْنٍ يَكُونُ ضَامِنًا عَلَى صَاحِبِهِ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ[1].

(فەتوا): واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر کەسێك کۆیلەیەك بەدیاریکراوی بەکرێ بگرێت یان ئاژەڵێك بەدیاریکراوی بەکرێ بگرێت بۆ ماوەیەك (واتە بۆ کاتێك کە هێشتا نەهاتووە)، جا کۆیلەکە و ئاژەڵەکە وەربگرێت تا ئەو ماوەیە (دەست پێ دەکات)، ئەوە کارێکی نادروستی کردووە، نە ئەو کەسەی بەکرێی گرتووە ئەو شتەی وەرگرتووە کە بەکرێی گرتووە (چونکە ڕاستە ئێستا وەریگرتووە بەڵام هێشتا کاتی معامەلەکەیان نەهاتووە، پێشتر وەریگرتووە)، نە ئەو کەسەشی کە بەکرێی داوە سەلەمی کردووە لە شتێك کە بکەوێتە ئەستۆی و زامنی بێت تا (کاتی دێت و) هاوڕێکەی وەریدەگرێت (جا ئەوانە ڕوویان نەداوە کەواتە بابەتەکە نە سەلەمە و نە بەکرێگرتنە، بۆیە دروست نییە).

## ١٥- کڕین و فرۆشتنی میوە[2]

**١٨٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ مَنِ ابْتَاعَ شَيْئًا مِنَ الْفَاكِهَةِ مِنْ رَطْبِهَا أَوْ يَابِسِهَا، فَإِنَّهُ لاَ يَبِيعُهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ، وَلاَ يُبَاعُ شَيْءٌ مِنْهَا بَعْضُهُ بِبَعْضٍ، إِلاَّ يَدًا

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٣ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ بَيْعُ الْفَاكِهَةِ.

بِيَدٍ، وَمَا كَانَ مِنْهَا مِمَّا يَيْبَسُ، فَيَصِيرُ فَاكِهَةً يَابِسَةً تُدَّخَرُ، وَتُؤْكَلُ، فَلاَ يُبَاعُ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ إِلاَّ يَدًا بِيَدٍ، وَمِثْلاً بِمِثْلٍ، إِذَا كَانَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ، فَإِنْ كَانَ مِنْ صِنْفَيْنِ مُخْتَلِفَيْنِ، فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُبْتَاعَ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ يَصْلُحُ إِلَى أَجَلٍ، وَمَا كَانَ مِنْهَا مِمَّا لاَ يَيْبَسُ وَلاَ يُدَّخَرُ، وَإِنَّمَا يُؤْكَلُ رَطْبًا كَهَيْئَةِ الْبِطِّيخِ وَالْقِثَّاءِ وَالْخِرْبِزِ، وَالْجَزَرِ وَالأُتْرُجِّ، وَالْمَوْزِ وَالرُّمَّانِ، وَمَا كَانَ مِثْلَهُ، وَإِنْ يَبِسَ لَمْ يَكُنْ فَاكِهَةً بَعْدَ ذَلِكَ، فَلَيْسَ هُوَ مِثْلُ مَا يُدَّخَرُ، وَيَكُونُ فَاكِهَةً، قَالَ: فَأَرَاهُ حَقِيقًا أَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا لَمْ يَدْخُلْ فِيهِ شَيْءٌ مِنَ الأَجَلِ، فَإِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: هەر کەسێك میوەیەکی تەڕ یان وشکی کڕی، ئەوە نابێ بیفرۆشێ تا وەریدەگرێ، وە نابێ هیچ لە میوە پێك بفرۆشرێت، تەنها دەست بە دەست نەبێت، وە ئەوەی لە میوەدا وشك دەبێتەوە و دەبێتە میوەیەکی وشککراوەی هەڵگیراو و دەخورێت، ئەوە نابێ هەندێکی بە هەندێکی دیکە بفرۆشرێت تەنها دەست بە دەست و هاوکێشان و پێوان نەبێت، (بە مەرجێك) ئەگەر لە یەك جۆر بوون، جا ئەگەر لە دوو جۆری جیاواز بوون، ئەوە کێشە نییە بەوەی دوو بەرانبەر یەك بکڕدرێت (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، (بەڵام) نابێ دوا بخرێ، وە ئەوەی وشك نابێتەوە و هەڵناگیرێت لە میوەدا، وە بەتەڕی دەخورێت وەك گندۆرە (کاڵەك) و دەرۆزی (ترۆزی) و خیربز (کە جۆرێکە لە گندۆرە)، هەروەها لیمۆ و مۆز و هەنار، ئەوانەی وەکوو ئەمانەشن کە ئەگەر وشك بکرێنەوە نابنە میوە (پێیان ناگوترێت میوە)، وەکوو ئەوە نییە کە هەڵدەگیرێ و هەر میوەیە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆچوونم وایە شایستەیە دروست بێ دوو بەرانبەر یەك وەربگیری (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، ئەگەر ماوە و دواخستنی نەکەوێتە ناو، ئەوە کێشەی نییە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٤ في البيوع، عن مالك به.

## ١٦- كڕین و فرۆشتنی زێڕ و زیوی خام و لەسكەدراو[١]

**١٨٤٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ السَّعْدَيْنِ أَنْ يَبِيعَا آنِيَةً مِنَ الْمَغَانِمِ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، فَبَاعَا كُلَّ ثَلاَثَةٍ بِأَرْبَعَةٍ عَيْنًا، أَوْ كُلَّ أَرْبَعَةٍ بِثَلاَثَةٍ عَيْنًا، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَرْبَيْتُمَا، فَرُدَّا[٢].

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە دوو سەعدەكان كرد (سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص و سەعدی كوڕی عوبادە) بەوەی قاپێكی غەنیمەت كە لە زێڕ بوو یان زیو بوو بفرۆشن، ئەوانیش فرۆشتیان، هەر سێ (مسقاڵێك لە قاپە زێڕەكە یان زیوەكە) بە چوار دیناری زێڕ (ئەگەر زێڕ بووبێت) یان بە چوار درهەمی زیو (ئەگەر زیو بووبێت) فرۆشتیان، یان هەر چوار مسقاڵێكیان بە سێ دیناری زێڕ و درهەمی زیو دابوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ڕیباتان كردووە، جا گەڕاندیانەوە (كەواتە نابێ گۆڕینەوەی زێڕ و زیوی خام و قالب بەزیاد و كەم بگۆڕدرێتەوە بە زێڕ و زیوی لەسكەدراو).

**١٨٤٤-** عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، لاَ فَضْلَ بَيْنَهُمَا[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینار بە دینار (كە لە زێڕ بووە)، درهەمیش بە درهەم (كە لە زیو بووە)، نابێ زیادەیان لە نێوان بێت (لە كاتی گۆڕینەوە).

---

(١) ـ بَيْعُ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ تِبْرًا وَعَيْنًا.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٢ في البيوع، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٢أفي البيوع؛ والشيباني: ٨١٦ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٨٨٢؛ وابن حنبل: ٨٩٢٣؛ والنسائي: ٤٥٦٧ في البيوع؛ وابن حبان: ٥٠١٢؛ والقابسي: ١٩٢، كلهم عن مالك به.




**١٨٤٥**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا شَيْئًا غَائِبًا بِنَاجِزٍ[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ مەگۆڕنەوە بە زێڕ، تەنها وەكوو یەكدی نەبێ (واتە دەبێ ئەندازەیان وەكوو یەكدی بێ) و هەندێك لە هەندێكی دیكە زیاتر دامەنێن، وە زیویش مەگۆڕنەوە بە زیو، تەنها وەكوو یەكدی نەبێ و هەندێك لە هەندێكی دیكە زیاتر دامەنێن، وە (لە زێڕ و زیودا) غائیب بە حازر مەگۆڕنەوە (چونكە دەبێ دەست بە دەست بێت و لە یەك مەجلیسدا بێت).

**١٨٤٦**- عَنْ مُجَاهِدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، فَجَاءَهُ صَائِغٌ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَصُوغُ الذَّهَبَ، ثُمَّ أَبِيعُ الشَّيْءَ مِنْ ذَلِكَ بِأَكْثَرَ مِنْ وَزْنِهِ، فَأَسْتَفْضِلُ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ عَمَلِ يَدِي، فَنَهَاهُ عَبْدُ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَجَعَلَ الصَّائِغُ يُرَدِّدُ عَلَيْهِ الْمَسْأَلَةَ، وَعَبْدُ اللهِ ﷺ يَنْهَاهُ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، أَوْ إِلَى دَابَّةٍ يُرِيدُ أَنْ يَرْكَبَهَا، ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، لاَ فَضْلَ بَيْنَهُمَا، هَذَا عَهْدُ نَبِيِّنَا إِلَيْنَا، وَعَهْدُنَا إِلَيْكُمْ[٢].

واتە: لە موجاهیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: من لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر بووم ﷺ، جا زێڕینگەرێك هات بۆ لای و گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان من زێڕ دەكەم بە خشڵ دواتر بە زێڕی زیاتر لە وەزنی خۆی دەیفرۆشم، بەقەد ئیشی دەستی خۆم زێڕی زیادی دەخەمە سەر، جا عەبدوڵڵا ﷺ قەدەغەی كرد لەوە، زێڕینگەرەكەش هەر پرسیارەكەی بۆ دووبارە دەكردەوە، عەبدوڵڵاش ﷺ

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٣ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٥ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٦٧١؛ وفي: ٨٨٣؛ والبخاري: ٢١٧٧ في البيوع؛ ومسلم: المساقاة: ٧٥؛ والنسائي: ٤٥٧٠ في البيوع عن طريق قتيبة؛ وابن حبان: ٥٠١٦؛ والمنتقى لابن الجارود: ٦٤٨؛ والقابسي: ٢٥٩، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٤ في البيوع؛ والشافعي: ١١٨٤؛ والنسائي: ٤٥٦٨ في البيوع؛ وشرح معاني الآثار: ٥٧٥٨؛ والقابسي: ١٥٣، كلهم عن مالك به.

قەدەغەی لێ دەكرد، تا گەیشتە دەرگای مزگەوت یان تا گەیشتە لای ئەو وڵاغەی دەیەویست سواری بێت، دواتر عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ گوتی: دینار بە دینار، درهەم بە درهەم، نابێ زیادەیان لە نێوان بێ، ئەوە وەسیێتی پێغەمبەری خوایە ﷺبۆ ئێمە و وەسیێتی ئێمەشە بۆ ئێوە.

**١٨٤٧-** وَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنْ جَدِّهِ مَالِكِ بْنِ أَبِي عَامِرٍ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَبِيعُوا الدِّينَارَ بِالدِّينَارَيْنِ، وَلاَ الدِّرْهَمَ بِالدِّرْهَمَيْنِ(١).

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە باپیریەوە مالیكی كوڕی ئەبو عامیرەوە پێی گەیشتووە عوسمانی كوڕی عەففان ﷺگوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: دینارێك مەگۆڕنەوە بە دوو دینار و درهەمێكیش مەگۆڕنەوە بە دوو درهەم.

**١٨٤٨-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ بَاعَ سِقَايَةً مِنْ ذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ بِأَكْثَرَ مِنْ وَزْنِهَا، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذَا، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ ﷺ: مَا أَرَى بِمِثْلِ هَذَا بَأْسًا، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ: مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ مُعَاوِيَةَ؟ أَنَا أُخْبِرُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَيُخْبِرُنِي عَنْ رَأْيِهِ، لاَ أُسَاكِنُكَ بِأَرْضٍ أَنْتَ بِهَا، ثُمَّ قَدِمَ أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ إِلَى مُعَاوِيَةَ ﷺ: أَنْ لاَ يَبِيعَ ذَلِكَ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَزْنًا بِوَزْنٍ(٢).

واتە: لە عەتائی كوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﷺگۆزەیەكی زێڕ یان زیوی بە زیاتر لە كێشی خۆی فرۆشت، ئەبو دەرداء ﷺ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺبوو ئەوەی حەرام كرد، تەنها بەئەندازەی یەكدی نەبێ (واتە دەبێ لە كێشاندا وەكوو یەكدی بن)، موعاویەش ﷺ گوتی: من كێشە لەوەدا نابینم (ڕەنگە پێی وا بووبێ ڕیبایەكە تەنها لە زێڕ و

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٣٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٣أفي البيوع؛ وشرح معاني الآثار: ٥٧٥٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤١ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٨ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ١٢٠٩؛ وابن حنبل: ٢٧٥٧١؛ والنسائي: ٤٥٧٢ في البيوع، كلهم عن مالك به.

زیوی لەسکەدراوە)، جا ئەبو دەرداء ﷺ گوتی: کێ حەق بە من دەدات و سەرم دەخات بەسەر موعاویەی؟ من هەواڵی پێ دەدەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئەویش بۆچوونی خۆیم پێ دەڵێ! لە شوێنێك نابم تۆی لێ بێ، دواتر ئەبو دەرداء ﷺ هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بۆ موعاویەی نووسی و فەرمانی کرد: ئەو کڕین و فرۆشتنە نەکات، تەنها وەکوو یەك نەبێ، بە هەمان کێشان.

**١٨٤٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالذَّهَبِ أَحَدُهُمَا غَائِبٌ، وَالآخَرُ نَاجِزٌ، وَإِنِ اسْتَنْظَرَكَ إِلَى أَنْ يَلِجَ بَيْتَهُ، فَلاَ تُنْظِرْهُ، إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمُ الرَّمَاءَ، وَالرَّمَاءُ، هُوَ الرِّبَا(١).**

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: زێڕ مەگۆڕنەوە بە زێڕ، تەنها وەکوو یەکدی نەبێ و هەندێك لە هەندێکی دیکە زیاتر دامەنێن، وە زیویش مەگۆڕنەوە بە زیو، تەنها وەکوو یەکدی نەبێ و هەندێك لە هەندێکی دیکە زیاتر دامەنێن، وە زیو بە زێڕ مەگۆڕنەوە کە یەکێکیان ئامادە نەبێت و ئەوەی دیکەیان ئامادە بێت (چونکە دەبێ دەست بە دەست و لە یەك مەجلیسدا بێت)، جا ئەگەر (کەسێك زێڕ یان زیوەکەی لێ وەرگرتی و) داوای لێ کردی چاوەڕێی بکەیت تا دەچێتە ماڵەوە (زێڕ یان زیوەکەت بۆ بێنێت)، ئەوە چاوەڕێی مەکە (واتە ئەو مامەڵەیە نەکەیت)، من لە ڕەماء لێتان دەترسم، ڕەماء بریتییە لە ڕیبا.

**١٨٥٠- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا شَيْئًا مِنْهَا غَائِبًا بِنَاجِزٍ، وَإِنِ اسْتَنْظَرَكَ إِلَى أَنْ يَلِجَ بَيْتَهُ، فَلاَ تُنْظِرْهُ، إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمُ الرَّمَاءَ، وَالرَّمَاءُ، هُوَ الرِّبَا(٢).**

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٦ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٣ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ١٠٧٣، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٦أ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٤ في

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: زێڕ مەگۆڕنەوە بە زێڕ، تەنها وەکوو یەکدی نەبێ و هەندێك لە هەندێکی دیکە زیاتر دامەنێن، وە زیویش مەگۆڕنەوە بە زیو، تەنها وەکوو یەکدی نەبێ (لە هەمان مەجلیسدا) و هەندێك لە هەندێکی دیکە زیاتر دامەنێن، وە (لە زێڕ و زیودا) غائیب بە حازر مەگۆڕنەوە (چونکە دەبێ دەست بە دەست و لە یەك مەجلیسدا بێت)، جا ئەگەر (کەسێك زێڕ یان زیوەکەی لێ وەرگرتی و) داوای لێ کردی چاوەڕێی بکەیت تا دەچێتە ماڵەوە (زێڕ یان زیوەکەت بۆ بێنێت)، ئەوە چاوەڕێی مەکە (ئەو مامەڵەیە نەکەیت)، من لە ڕەماء لێتان دەترسم، ڕەماء بریتییە لە ڕیبا.

**١٨٥١**- وَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، وَالصَّاعُ بِالصَّاعِ، وَلاَ يُبَاعُ كَالِئٌ بِنَاجِزٍ(١).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﷺ پێی گەیشتووە گوتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: (لە زێڕ و زیو و پارەدا دەبێ) دینار بە دینار و درهەم بە درهەم بێت، (لە خواردنیشدا) صاع بە صاع بێت (بەبێ ئەوەی یەکێکیان زیاتر بێت)، غائیبیش بە حازر نادرێت (بەڵکوو دەبێت لە هەمان مەجلیسدا هەردوولا وەربگیرێن).

**١٨٥٢**- عَنْ أَبِي الزِّنَادِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: لاَ رِبًا إِلاَّ فِي ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، أَوْ مَا يُكَالُ أَوْ يُوزَنُ مِمَّا يُؤْكَلُ أَوْ يُشْرَبُ(٢).

واتە: لە ئەبو زینادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: ڕیبا نییە تەنها لەوانە نەبێت: لە زێڕ یان لە زیو، یان لەوەی دەپێورێن یان لەوەی دەکێشرێن لەو شتانەی دەخورێن و دەخورێنەوە.

---

الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٥ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٧ في البيوع؛ والشيباني: ٨٢٠ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.




**١٨٥٣-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: قَطْعُ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ مِنَ الْفَسَادِ فِي الأَرْضِ[١].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: بڕین و (پارچەپارچەکردنی) زێڕ و زیو بەشێکە لە فەسادینانەوە و تێکدان لە زەویدا.

**١٨٥٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، جِزَافًا، إِذَا كَانَ تِبْرًا أَوْ حَلْيًا قَدْ صِيغَ، فَأَمَّا الدَّرَاهِمُ الْمَعْدُودَةُ، وَالدَّنَانِيرُ الْمَعْدُودَةُ، فَلاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَشْتَرِيَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ جِزَافًا، حَتَّى يُعْلَمَ وَيُعَدَّ، فَإِنِ اشْتُرِيَ ذَلِكَ جِزَافًا، فَإِنَّمَا يُرَادُ بِهِ الْغَرَرُ حِينَ يُتْرَكُ عَدُّهُ، وَيُشْتَرَى جِزَافًا، وَلَيْسَ هَذَا مِنْ بُيُوعِ الْمُسْلِمِينَ، فَأَمَّا مَا كَانَ يُوزَنُ مِنَ التِّبْرِ وَالْحَلْيِ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُبَاعَ ذَلِكَ جِزَافًا، وَإِنَّمَا ابْتِيَاعُ ذَلِكَ جِزَافًا، كَهَيْئَةِ الْحِنْطَةِ وَالتَّمْرِ وَنَحْوِهِمَا مِنَ الأَطْعِمَةِ الَّتِي تُبَاعُ جِزَافًا، وَمِثْلُهَا يُكَالُ، فَلَيْسَ بِابْتِيَاعِ ذَلِكَ جِزَافًا بَأْسٌ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە لەوەی کەسێك زێڕ بە زیو بکڕێت و زیو بە زێڕ بکڕێت بەگۆترە، ئەگەر قالب یان خشڵ بێت، بەڵام هەرچی درهەمی ژمێردراو و دیناری ژمێردراوە، ئەوە بۆ کەس نییە هیچ شتێك لەوانە بەگۆترە بکڕێت تا دەزاندرێت چەندە و دەژمێردرێت، جا ئەگەر بەگۆترە کڕا، ئەوە تەنها مەبەست پێی فێڵە کاتێ ناژمێردرێت و بەگۆترە دەفرۆشرێت، جا ئەوە لە مامەڵەی مسوڵمانان نییە، بەڵام هەرچی ئەوەیە کە دەکێشرێت لە قالب و خشڵ، ئەوە کێشە نییە بەگۆترە بفرۆشرێت، وە کڕینی قالب و خشڵ بەگۆترە وەك گەنم و خورما و هاوشێوەکانیەتی لە خۆراك کە بەگۆترە دەفرۆشرێن، وە ئەوەی دەشپێورێت بە هەمان شێوەیە، بەگۆترە کڕینی کێشەی تیا نییە.

**١٨٥٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى مُصْحَفًا أَوْ سَيْفًا أَوْ خَاتَمًا، وَفِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ ذَهَبٌ أَوْ فِضَّةٌ بِدَنَانِيرَ أَوْ دَرَاهِمَ، فَإِنَّ مَا اشْتُرِيَ مِنْ ذَلِكَ وَفِيهِ الذَّهَبُ بِدَنَانِيرَ، فَإِنَّهُ يُنْظَرُ إِلَى

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٧أفي البيوع؛ والشيباني: ٨٢٩ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٦ في البيوع، عن مالك به.

قِيمَتِهِ، فَإِنْ كَانَتْ قِيمَةُ ذَلِكَ الثُّلُثَيْنِ، وَقِيمَةُ مَا فِيهِ مِنَ الذَّهَبِ الثُّلُثَ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ يَكُونُ فِيهِ تَأْخِيرٌ، وَمَا اشْتُرِيَ مِنْ ذَلِكَ بِالْوَرِقِ مِمَّا فِيهِ الْوَرِقُ، نُظِرَ إِلَى قِيمَتِهِ، فَإِنْ كَانَ قِيمَةُ ذَلِكَ الثُّلُثَيْنِ، وَقِيمَةُ مَا فِيهِ مِنَ الْوَرِقِ الثُّلُثَ، فَذَلِكَ جَائِزٌ لاَ بَأْسَ بِهِ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ يَدًا بِيَدٍ، وَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ مِنْ أَمْرِ النَّاسِ عِنْدَنَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك موصحەفێكی قورئان یان شمشێرێك یان ئەنگوستیلەیەك بە دینار یان بە درهەم بكڕێت (لە كاتێكدا دینار لە زێڕ دروست كراوە و درهەمیش لە زیو دروست كراوە) شتەكەش (واتە موصحەفی قورئانەكە یان شمشێرەكە یان ئەنگوستیلەكە) زێڕ یان زیوی تیا بێت، ئەوە ئەو شتەی بە دینار كڕیویەتی و زێڕی تیایە، سەیری نرخەكەی دەكرێت، ئەگەر نرخی شتەكە دوو لەسەر سێ بوو و نرخی ئەو زێڕەی تیایەتی سێیەك بوو، ئەوە دروستە و كێشەی نییە، (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت و دواخستنی تیا نەبێت، وە ئەو شتەی بە زیو كڕاوە (واتە بە درهەم كڕاوە) و زیوی تیایە، سەیری نرخەكەی دەكرێت، ئەگەر نرخی شتەكە دوو لەسەر سێ بوو و نرخی ئەو زیوەی تیایەتی سێیەك بوو، ئەوە دروستە و كێشەی نییە، (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، جا لەلای ئێمە بەردەوام كاروباری خەڵكی ئاوا ڕۆیشتووە.

## ١٧- ئەوەی دەربارەی گۆڕینەوەی دراو هاتووە[2]

١٨٥٦- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ النَّصْرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ الْتَمَسَ صَرْفًا بِمِئَةِ دِينَارٍ، قَالَ: فَدَعَانِي طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ ﷺ، فَتَرَاوَضْنَا، حَتَّى اصْطَرَفَ مِنِّي، وَأَخَذَ الذَّهَبَ يُقَلِّبُهَا فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: حَتَّى يَأْتِيَنِي خَازِنِي مِنَ الْغَابَةِ، وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَسْمَعُ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: وَاللَّهِ لاَ تُفَارِقْهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٧ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الصَّرْفِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٤٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٥ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٧ في




واتە: لە مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسانی نەصرییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ویستم پارچە زێڕێك بە سەت دینار بگۆڕمەوە، دەڵێ: جا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺبانگی کردم (تا لێم بکڕێت، بۆم بگۆڕێتەوە)، جا بێنەوبەردە و معامەلەمان کرد تا ڕازی بوو بۆم بگۆڕێتەوە، جا زێڕەکەی وەرگرت و لە ناو دەستی هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکرد، دواتر گوتی: (سەبرم لەسەر بگرە) تا فەرمانبەرەکەم لە غابە دێتەوە (کە شوێنێکە لە نزیك مەدینە، پارەکە لەلای ئەوە)، جا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوێی لێ بوو و گوتی: سوێند بە خوا لێی جیانا بیتەوە تاوەکوو لێی وەردەگری، دواتر گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: (فرۆشتنی) زێڕ بە زیو ڕیبایە، تەنها دەست بە دەست نەبێت، گەنم بە گەنم ڕیبایە تەنها دەست بە دەست نەبێت، خورما بە خورما ڕیبایە تەنها دەست بە دەست نەبێت، جۆ بە جۆ ڕیبایە تەنها دەست بە دەست نەبێت.

**١٨٥٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: إِذَا اصْطَرَفَ الرَّجُلُ دَرَاهِمَ بِدِينَارٍ، ثُمَّ وَجَدَ فِيهَا دِرْهَمًا زَائِفًا، فَأَرَادَ رَدَّهُ، انْتَقَضَ صَرْفُ ذَلِكَ الدِّينَارِ، وَرَدَّ إِلَيْهِ وَرِقَهُ، وَأَخَذَ إِلَيْهِ دِينَارَهُ، وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: وَإِنِ اسْتَنْظَرَكَ إِلَى أَنْ يَلِجَ بَيْتَهُ، فَلاَ تُنْظِرْهُ، فَهُوَ إِذَا رَدَّ عَلَيْهِ دِرْهَمًا مِنْ صَرْفٍ بَعْدَ أَنْ يُفَارِقَهُ كَانَ بِمَنْزِلَةِ الدَّيْنِ، أَوِ الشَّيْءِ الْمُسْتَأْخِرِ، فَلِذَلِكَ كُرِهَ ذَلِكَ، وَانْتَقَضَ الصَّرْفُ، وَإِنَّمَا أَرَادَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنْ لاَ يُبَاعَ الذَّهَبُ وَالْوَرِقُ، وَالطَّعَامُ كُلُّهُ عَاجِلاً بِآجِلٍ، فَإِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ تَأْخِيرٌ، وَلاَ نَظِرَةٌ، وَإِنْ كَانَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ أَوْ مُخْتَلِفَةً أَصْنَافُهُ[1].

(فەتوا):واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك چەند درهەمێکی بە دینارێك گۆڕییەوە (کە درهەم لە زیوە و دینار لە زێڕە)، دواتر لەناو درهەمەکان درهەمێکی خراپی دۆزییەوە و ویستی بیگەڕێنێتەوە، ئەوە گۆڕینەوەی ئەو دینارە هەڵوەشاوەتەوە و دەبێ زیوەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە و دینارەکەی لێ وەرگرێتەوە (واتە

---

الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٦٦٠؛ وفي: ٧١٦؛ وابن حنبل: ٣١٤؛ والبخاري: ٢١٧٤ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٤٨ في البيوع؛ وابن حبان: ٥٠١٣؛ وأبو يعلى الموصلي: ٢٣٤؛ والقابسي: ١٠، كلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٠ في البيوع، عن مالك به.

مامەڵەکە گشتی هەڵدەوەشێتەوە ئەگینا دەبێتە ڕیبا)، جا ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە نادروستە ئەوەیە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێڕ بە زیو ڕیبایە تەنها دەست بە دەست نەبێ، وە عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر (کەسێك) داوای لێ کردی چاوەڕێی بکەی تا دەچێتە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی، ئەوە چاوەڕێی مەکە.

جا ئەگەر لە گۆڕینەوەکەدا درهەمێکی گەڕاندەوە دوای ئەوەی لێی جیا بۆتەوە، ئەوە وەك قەرز یان شتی دواخراو وایە، بۆیە بە ناپەسەند و نادروست داندراوە و گۆڕینەوەکە هەڵدەوەشێتەوە، جا ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ویستوویەتی زێڕ و زیو و خواردن هیچ کامیان حازر بە ناحازر نەفرۆشرێن، چونکە هیچ شتێك لەوانە نابێ دواخستن و چاوەڕێکردنی تێدا بێ، هەرچەندە لە یەك جۆر بن یان جۆریان جیاواز بێت.

## ١٨- کێشانە و پێوانەکردن بۆ یەکدی[1]

**١٨٥٨**- عَنْ يَزِيدَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قُسَيْطٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يُرَاطِلُ الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، فَيُفْرِغُ ذَهَبَهُ فِي كِفَّةِ الْمِيزَانِ، وَيُفْرِغُ صَاحِبُهُ الَّذِي يُرَاطِلُهُ ذَهَبَهُ فِي كِفَّةِ الْمِيزَانِ الأُخْرَى، فَإِذَا اعْتَدَلَ لِسَانُ الْمِيزَانِ أَخَذَ وَأَعْطَى[2].

واتە: لە یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قوسەیتەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی سەعیدی کوڕی موسەیەبی ﷺ بینیوە زێڕی بە زێڕ کێشاوە، زێڕی خۆی دەخستە ناو لایێکی تەرازوو و بەرانبەرەکەشی زێڕی خۆی دەخستە ناو لایەکەی دیکەی تەرازوو، جا کاتێ زمانەی تەرازووەکە ڕاست دەبوو زێڕی بەرانبەری وەردەگرت و هی خۆیشی دەدا بەو.

---

(١) ـ الْمُرَاطَلَةُ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٣٩ في البيوع؛ والشيباني: ٨١٩ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

**١٨٥٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي بَيْعِ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، أَوِ الْوَرِقِ بِالْوَرِقِ مُرَاطَلَةً، أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، أَنْ يَأْخُذَ أَحَدَ عَشَرَ دِينَارًا، بعَشَرَةِ دَنَانِيرَ يَدًا بِيَدٍ، إِذَا كَانَ وَزْنُ الذَّهَبَيْنِ سَوَاءً عَيْنًا بِعَيْنٍ، وَإِنْ تَفَاضَلَ الْعَدَدُ، وَالدَّرَاهِمُ أَيْضًا فِي ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الدَّنَانِيرِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی فرۆشتنی زێڕ بە زێڕ یان زیو بە زیو بەكێشان، كێشەی تیا نییە، بەوەی كەسەكە یازدە دیناری زێڕ بەرانبەر بە دە دینار دەست بە دەست وەربگرێت، (بە مەرجێك) ئەگەر كێشی دوو زێڕەكان وەكوو یەكدی بێت هەرچەندە لە ژمارەشدا زیاتر بن، درهەمیش (كە لە زیوە) لەوەدا وەكوو دینارە (ژمارە گرنگ نییە، وەزن گرنگە).

**١٨٦٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ رَاطَلَ ذَهَبًا بِذَهَبٍ، أَوْ وَرِقًا بِوَرِقٍ، فَكَانَ بَيْنَ الذَّهَبَيْنِ فَضْلُ مِثْقَالٍ، فَأَعْطَى صَاحِبَهُ قِيمَتَهُ مِنَ الْوَرِقِ أَوْ مِنْ غَيْرِهَا، فَلاَ يَأْخُذُهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ قَبِيحٌ، وَذَرِيعَةٌ إِلَى الرِّبَا، لأَنَّهُ إِذَا جَازَ لَهُ أَنْ يَأْخُذَ الْمِثْقَالَ بِقِيمَتِهِ، حَتَّى كَأَنَّهُ اشْتَرَاهُ عَلَى حِدَتِهِ، جَازَ لَهُ أَنْ يَأْخُذَ الْمِثْقَالَ بِقِيمَتِهِ مِرَارًا، لأَنْ يُجِيزَ ذَلِكَ الْبَيْعَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ صَاحِبِهِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَوْ أَنَّهُ بَاعَهُ ذَلِكَ الْمِثْقَالَ مُفْرَدًا، لَيْسَ مَعَهُ غَيْرُهُ لَمْ يَأْخُذْهُ بِعُشْرِ الثَّمَنِ الَّذِي أَخَذَهُ بِهِ، لأَنْ يُجَوِّزَ لَهُ الْبَيْعَ، فَذَلِكَ الذَّرِيعَةُ إِلَى إِحْلاَلِ الْحَرَامِ، وَالأَمْرُ الْمَنْهِيُّ عَنْهُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك زێڕی (بۆ كەسێك) بە زێڕ كێشا (واتە زێڕی بە زێڕ گۆڕییەوە بەكێشان)، یان زیو بە زیو، جا لە نێوان دوو زێڕەكەدا یەك مسقاڵی زیاد هەبوو و نرخی مسقاڵەكەی بە زیو یان بە شتێكی دیكە دا بە بەرانبەرەكەی، ئەوە نابێ وەریبگرێ، چونكە ئەوە شتێكی زۆر ناڕێك و ناڕەوایە و ڕێگەیەكە سەر ڕادەكێشێت بۆ ڕیبا، چونكە ئەگەر بۆی دروست بێت مسقاڵەكە وەربگرێت و بیگێڕێتەوە بە دانی نرخەكەی وەك ئەوەی بەتەنها كڕیبێتی، ئەوە بۆشی دروست دەبوو مسقاڵەكەی چەند جار بە نرخی خۆی وەربگرێت، تا ڕێگە بەو كڕین و فرۆشتنەی نێوانیان بدات و كارەكە تێ پەڕێت.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٣ في البيوع، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئەو مسقاڵەی بەتەنها بفرۆشتبا هیچی دیکەی لەگەڵ نەبا، ئەوە بە دەیەکی ئەو پارەیەش وەرینەدەگرت کە (ئێستا) پێی وەرگرتووە، بەس بۆ ئەوەی کڕین و فرۆشتنەکە تێ پەڕێت و جێبەجێ بێت (ئەوەی کردووە و ڕازی بووە)، ئەوەش ڕێگەیەکە بۆ حەلاڵکردنی حەڕام، وە بریتییە لەو کارەی کە ڕێگری لێ کراوە (کەواتە بە هیچ شێوەیەك دروست نییە).

١٨٦١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُرَاطِلُ الرَّجُلَ، وَيُعْطِيهِ الذَّهَبَ الْعُتُقَ الْجِيَادَ، وَيَجْعَلُ مَعَهَا تِبْرًا ذَهَبًا غَيْرَ جَيِّدَةٍ، وَيَأْخُذُ مِنْ صَاحِبِهِ ذَهَبًا كُوفِيَّةً مُقَطَّعَةً، وَتِلْكَ الْكُوفِيَّةُ مَكْرُوهَةٌ عِنْدَ النَّاسِ، فَيَتَبَايَعَانِ ذَلِكَ مِثْلاً بِمِثْلٍ، إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ: أَنَّ صَاحِبَ الذَّهَبِ الْجِيَادِ أَخَذَ فَضْلَ عُيُونِ ذَهَبِهِ فِي التِّبْرِ الَّذِي طَرَحَ مَعَ ذَهَبِهِ، وَلَوْلاَ فَضْلُ ذَهَبِهِ عَلَى ذَهَبِ صَاحِبِهِ لَمْ يُرَاطِلْهُ صَاحِبُهُ بِتِبْرِهِ ذَلِكَ إِلَى ذَهَبِهِ الْكُوفِيَّةِ، وَإِنَّمَا مَثَلُ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَ ثَلاَثَةَ آصُعٍ مِنْ تَمْرٍ عَجْوَةٍ، بِصَاعَيْنِ وَمُدٍّ مِنْ تَمْرٍ كَبِيسٍ، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا لاَ يَصْلُحُ، فَجَعَلَ صَاعَيْنِ مِنْ كَبِيسٍ، وَصَاعًا مِنْ حَشَفٍ، يُرِيدُ أَنْ يُجِيزَ بِذَلِكَ بَيْعَهُ، فَذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُ الْعَجْوَةِ لِيُعْطِيَهُ صَاعًا مِنَ الْعَجْوَةِ بِصَاعٍ مِنْ حَشَفٍ، وَلَكِنَّهُ إِنَّمَا أَعْطَاهُ ذَلِكَ لِفَضْلِ الْكَبِيسِ، أَوْ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: بِعْنِي ثَلاَثَةَ آصُعٍ مِنَ الْبَيْضَاءِ بِصَاعَيْنِ وَنِصْفٍ مِنْ حِنْطَةٍ شَامِيَّةٍ، فَيَقُولُ: هَذَا لاَ يَصْلُحُ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَيَجْعَلُ صَاعَيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ شَامِيَّةٍ، وَصَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، يُرِيدُ أَنْ يُجِيزَ بِذَلِكَ الْبَيْعَ فِيمَا بَيْنَهُمَا، فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيُعْطِيَهُ بِصَاعٍ مِنْ شَعِيرٍ، صَاعًا مِنْ حِنْطَةٍ بَيْضَاءَ، لَوْ كَانَ ذَلِكَ الصَّاعُ مُفْرَدًا، وَإِنَّمَا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، لِفَضْلِ الشَّامِيَّةِ عَلَى الْبَيْضَاءِ، فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ، وَهُوَ مِثْلُ مَا وَصَفْنَا مِنَ التِّبْرِ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کێشانی گۆڕینەوە لەگەڵ بەرانبەرەکەی بکات و جۆری زێڕی چاکی بداتێ و قالبە زێڕێکی خراپیشی لەگەڵ دابنێت و زێڕی کوفی پارچە پارچەش لە بەرانبەرەکەی وەربگرێ و زێڕە کوفییەکە لەلای خەڵکی ناپەسەند و نەویستراو بێ، جا زێڕەکان بەیەکدی بفرۆشن بە یەك

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٥ في البيوع، عن مالك به.

کێشان (بێ زیاد و کەم لە وەزندا)، ئەوە دروست نییە (لەبەرئەوەی قالبە زێڕێکی خراپی تێ خستووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ڕوونکردنەوەی ئەوەی قەدەغە کراوە لەو بابەتەدا ئەوەیە: خاوەنی زێڕە چاکەکە چاکی زێڕەکەی خۆی دەست خستووە لە ڕێگەی قالبە زێڕە خراپەکەی کە خستوویەتە ناویەوە، جا ئەگەر چاکی زێڕەکەی ئەو نەبێ بەسەر زێڕی بەرانبەرەکەی ئەوە بەرانبەرەکەی ڕازی نەدەبوو گۆڕینەوەی لەگەڵ بکات بە وەرگرتنی قالبە زێڕەکەی ئەو لەگەڵ زێڕە کوفییەکەی خۆی، جا نموونەی ئەوە وەك کەسێك وایە بیەوێ سێ صاع لە خورمای عەجوە بە دوو صاع و یەك مود لە خورمای کەبیس بکڕێت، جا پێی دەگوترێت: ئەوە نابێت و دروست نییە، ئەویش (بۆ خۆدزینەوە لەو حەڕامە) دەچێ دوو صاع لە کەبیس و صاعێك لە حەشەف (کە جۆرێکی خراپە) دادەنێ، دەیەوێ بەو جۆرە مامەڵەکەی بەڕێ بکات و حەلاڵی بکات، ئەوەش دروست نییە، چونکە خاوەنی خورما عەجوەکە صاعێك لە عەجوەی پێ نادات بەرانبەر صاعێك لە حەشەف، بەڵکوو لەبەر چاکی خورما کەبیسەکە عەجوەکەی دەداتێ، یان کەسێك بە کەسێك بڵێت: سێ صاع گەنمم پێ بفرۆشە بە دوو صاع و نیو لە گەنمی شامی، ئەویش بڵێ: ئەوە دروست نییە (حەڕامە نایکەم) تەنها وەکوو یەکدی نەبێ (دەبێ پێوانەیان وەکوو یەکدی بێ ئینجا دەیکەم)، جا دوو صاع لە گەنمی شامی و صاعێك لە جۆ دابنێت و (بیکاتە سێ صاع) بیەوێ بەوە مامەڵەکەی نێوانیان بڕوێنن و حەلاڵی بکەن، ئەوە نابێ و دروست نییە، چونکە صاعێك لە گەنمی ناداتێ بەرانبەر صاعێك لە جۆ ئەگەر ئەو صاعە بەجیا بێت، جا کە دەیداتێ لەبەر چاکی گەنمە شامییەکەیە بەسەر گەنمی خۆی، جا ئەوە دروست نییە، ئەوە وەك ئەو بابەتەیە کە لە قالبە زێڕەکەدا باسمان کرد.

١٨٦٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَكُلُّ شَيْءٍ مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَالطَّعَامِ كُلِّهِ الَّذِي لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُبَاعَ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يُجْعَلَ مَعَ الصِّنْفِ الْجَيِّدِ مِنْهُ، الْمَرْغُوبِ فِيهِ، الشَّيْءُ الرَّدِيءُ الْمَسْخُوطُ، لِيُجَازَ بِذَلِكَ الْبَيْعُ، وَلِيُسْتَحَلَّ بِذَلِكَ مَا نُهِيَ عَنْهُ، مِنَ الأَمْرِ الَّذِي لاَ يَصْلُحُ إِذَا جُعِلَ ذَلِكَ مَعَ الصِّنْفِ الْمَرْغُوبِ فِيهِ، وَإِنَّمَا يُرِيدُ صَاحِبُ ذَلِكَ، أَنْ يُدْرِكَ بِذَلِكَ فَضْلَ جَوْدَةِ مَا يَبِيعُ، فَيُعْطِي الشَّيْءَ الَّذِي لَوْ أَعْطَاهُ وَحْدَهُ، لَمْ يَقْبَلْهُ صَاحِبُهُ، وَلَمْ يَهْمُمْ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا يَقْبَلُهُ

مِنْ أَجْلِ الَّذِي يَأْخُذُ مَعَهُ، لِفَضْلِ سِلْعَةِ صَاحِبِهِ عَلَى سِلْعَتِهِ، فَلاَ يَنْبَغِي لِشَيْءٍ مِنَ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَالطَّعَامِ، أَنْ يَدْخُلَهُ شَيْءٌ مِنْ هَذِهِ الصِّفَةِ، فَإِنْ أَرَادَ صَاحِبُ الطَّعَامِ الرَّدِيءِ أَنْ يَبِيعَهُ بِغَيْرِهِ، فَلْيَبِعْهُ عَلَى حِدَتِهِ، وَلاَ يَجْعَلُ مَعَ ذَلِكَ شَيْئًا، فَلاَ بَأْسَ بِهِ إِذَا كَانَ كَذَلِكَ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر شتێك لە زێڕ و زیو و خواردن کە نابێ بفرۆشرێن تەنها هاوکێشان و پێوان نەبن، ئەوە نابێ لەگەڵ جۆری چاکی ویستراو شتی خراپی نەویستراو بخرێتە پاڵی تاوەکوو مامەڵەکە بەڕێ بکرێت و بەوە ئەوەی قەدەغە کراوە حەڵاڵ بکرێت (ئاوا دروست نییە)، جا یەکێك لەوەی دروست نییە ئەوەیە ئەگەر ئەوە لەگەڵ جۆری ویستراو و چاك داندرا و خاوەنەکەی مەبەستی بوو زیادە چاکی ئەو خواردنەی دەیفرۆشێت بەدەستی بێنێت، جا شتێکی وای لەگەڵ دەدات ئەگەر بەتەنها بیدات بەرانبەرەکەی قبووڵی ناکات و وەرناگرێت و گوێی پێ نادات، بەڵکوو کە وەریدەگرێت تەنها لەبەر ئەوەیانە کە لەگەڵیەتی (کە بریتییە لە جۆرە چاکەکە)، لەبەر چاکی کاڵای هاوڕێکەیەتی بەسەر کاڵای خۆی، جا نابێ هیچ شتێك لە زێڕ و زیو و خواردن هیچ شتێکی لەم جۆرەی لەگەڵ تێکەڵ بکرێت، جا ئەگەر خاوەنی خواردنە خراپەکە ویستی بە خواردنێکی دیکەی بفرۆشێتەوە، ئەوە با بەتەنها بیفرۆشێتەوە و با هیچ شتێکی لەگەڵ تێکەڵ نەکات، ئەگەر بەم جۆرە بوو ئەوە کێشەی تێدا نییە.

## ١٩- بەیعی عینە[٢] و هاوشێوەکانی[٣]

**١٨٦٣**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا، فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەیعی عینە لەلای مالیکییەکان بریتییە لەو مامەڵەیەی شتی تێدا دەفرۆشرێتەوە بە نرخی زیاتر لە خۆی، جا ئەو فەرموودانەی ئیمامی مالیك هێناویەتی ئەو مانایە لەخۆیان دەگرن، واتە کاتێ کەسێك کە شتێکی کڕیوە دەیفرۆشێتەوە بەر لەوەی وەریبگرێت بۆ ئەوەیەتی چونکە نرخی زیاتری پێ دراوە.

(٣) ـ الْعِينَةُ وَمَا يُشْبِهُهَا.

(٤) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٠ في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٧ في

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خواردنێکی کڕی، با نەیفرۆشێتەوە تاوەکوو وەریدەگرێت.

**١٨٦٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا، فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خواردنێکی کڕی، با نەیفرۆشێتەوە تاوەکوو وەریدەگرێت.

**١٨٦٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ نَبْتَاعُ الطَّعَامَ، فَيَبْعَثُ عَلَيْنَا مَنْ يَأْمُرُنَا بِانْتِقَالِهِ مِنَ الْمَكَانِ الَّذِي ابْتَعْنَاهُ فِيهِ، إِلَى مَكَانٍ سِوَاهُ، قَبْلَ أَنْ نَبِيعَهُ[2].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنمان دەکڕی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی دەنارد تا فەرمانمان پێ بکات بە گواستنەوەی خواردنەکە لەو شوێنەی تیایدا کڕیومانە بۆ شوێنێکی دیکە، بەر لەوەی بیفرۆشینەوە (تاوەکوو وەرگرتن حاصڵ ببێ).

---

البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٩٢٥؛ وابن حنبل: ٣٩٦، وفي: ٥٣٠٩؛ والبخاري: ٢١٢٦ في البيوع، وفي: ٢١٣٦ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ٣٢؛ وأبو داود: ٣٤٩٢ في البيوع؛ وابن ماجه: ٢٢٤٥ في التجارات؛ والدارمي: ٢٥٥٩ في البيوع؛ والقابسي: ٢٣٨، كلهم عن مالك به.

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٥٩ في البيوع؛ والشافعي: ٩٢٦؛ والنسائي: ٤٥٩٦ في البيوع؛ والقابسي: ٢٨٧، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٠ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٨ في البيوع والتجارات والسلم؛ وابن حنبل: ٣٩٥، وفي: ٥٩٢٤؛ ومسلم: البيوع: ٣٣؛ والنسائي: ٤٦٠٥ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٤٩٣ في البيوع؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٨٠٠؛ والقابسي: ٢٣٩، كلهم عن مالك به.

١٨٦٦- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷺ ابْتَاعَ طَعَامًا، أَمَرَ بِهِ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ لِلنَّاسِ، فَبَاعَ حَكِيمٌ الطَّعَامَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفِيَهُ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: لاَ تَبِعْ طَعَامًا ابْتَعْتَهُ حَتَّى تَسْتَوْفِيَهُ[١].

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ خواردنێکی کڕی کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ فەرمانی پێ کردبوو بۆ خەڵکی بکڕێ، جا حەکیم خواردنەکەی فرۆشتەوە بەر لەوەی وەریبگرێت، جا ئەوە گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، جا بۆی گەڕاندەوە و گوتی: خواردنێك مەفرۆشە کە کڕیوتە تا وەریدەگریت.

١٨٦٧- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ صُكُوكًا خَرَجَتْ لِلنَّاسِ فِي زَمَانِ مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ مِنْ طَعَامِ الْجَارِ، فَتَبَايَعَ النَّاسُ تِلْكَ الصُّكُوكَ بَيْنَهُمْ، قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفُوهَا، فَدَخَلَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ، وَرَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَقَالاَ: أَتُحِلُّ بَيْعَ الرِّبَا يَا مَرْوَانُ؟ فَقَالَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ، وَمَا ذَاكَ؟ فقَالَ: هَذِهِ الصُّكُوكُ تَبَايَعَهَا النَّاسُ، ثُمَّ بَاعُوهَا، قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفُوهَا، فَبَعَثَ مَرْوَانُ الْحَرَسَ يَتْبَعُونَهَا، يَنْتَزِعُونَهَا مِنْ أَيْدِي النَّاسِ، وَيَرُدُّونَهَا إِلَى أَهْلِهَا[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی: لە زەمانی مەڕوانی کوڕی حەکەمدا وەرەقەی بایەع و ئەڕزاق لە خۆراکی جار (کە شوێنێك بوو لە کەنار دەریا) بۆ خەڵکی دەرچوو، جا خەڵکی لە نێوانی خۆیان کڕین و فرۆشتنیان بەو وەرەقەی بایەعە دەکرد بەر لەوەی بایەعەکە وەربگرن، جا زەیدی کوڕی سابیت و ﷺ پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتن بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم و گوتیان: ئایا مامەڵەی ڕیبا حەڵاڵ دەکەی ئەی مەڕوان؟ ئەویش گوتی: پەنا دەگرم بە خوا، بۆ چی بووە؟ گوتیان: (بۆ مەگەر ئاگات لێ نییە) ئەو ئەڕزاق و بایەعەی کە خەڵك کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکات، دواتر دەیفرۆشنەوە بەر لەوەی

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٠ج في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٦ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤١ في البيوع، عن مالك به.

وەریبگرن، جا مەڕوان پاسەوانەکانی نارد تا بەدواداچوون بکەن جا لە خەڵکیان دەسەندەوە و بۆ خاوەنەکانیان دەگێڕایەوە.

**١٨٦٨-عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً أَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَ طَعَامًا مِنْ رَجُلٍ إِلَى أَجَلٍ، فَذَهَبَ بِهِ الرَّجُلُ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يَبِيعَهُ الطَّعَامَ إِلَى السُّوقِ، فَجَعَلَ يُرِيهِ الصُّبَرَ، وَيَقُولُ لَهُ: مِنْ أَيِّهَا تُحِبُّ أَنْ أَبْتَاعَ لَكَ؟ فَقَالَ الْمُبْتَاعُ: أَتَبِيعُنِي مَا لَيْسَ عِنْدَكَ؟ فَأَتَيَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ لِلْمُبْتَاعِ: لاَ تَبْتَعْ مِنْهُ مَا لَيْسَ عِنْدَهُ، وَقَالَ لِلْبَائِعِ: لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ[١].**

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی: پیاوێك ویستوویەتی خۆراكێك لە پیاوێك بكڕێت بەماوە (بەوەی كەسەكە دواتر خۆراكەكەی بداتێ)، جا ئەو كەسەی ویستوویەتی خۆراكەكەی پێ بفرۆشێت بردوویەتی بۆ بازاڕ و هەر ڕوسەی (خەڵكی) پێ پیشان داوە و گوتوویەتی حەز دەكەیت لە كامیانت بۆ بكڕم؟ كڕیارەكەش گوتوویەتی: ئایا شتێكم پێ دەفرۆشیت كە خۆت نیتە؟! جا هاتوون بۆ لای عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ و ئەوەیان بۆ باس كردووە، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش ﷺ بە كڕیارەكەی گوتووە: شتێكی لێ مەكڕە كە نەیبێت، وە بە فرۆشیارەكەشی گوت: شتێك مەفرۆشە كە نەتبێت.

**١٨٦٩- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ جَمِيلَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُؤَذِّنَ يَقُولُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: إِنِّي رَجُلٌ أَبْتَاعُ مِنَ الأَرْزَاقِ الَّتِي تُعْطَى النَّاسُ بِالْجَارِ، مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ أُرِيدُ أَنْ أَبِيعَ الطَّعَامَ الْمَضْمُونَ عَلَيَّ إِلَى أَجَلٍ، فَقَالَ لَهُ سَعِيدٌ: أَتُرِيدُ أَنْ تُوَفِّيَهُمْ مِنْ تِلْكَ الأَرْزَاقِ الَّتِي ابْتَعْتَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ[٢].**

واتە: لە یەحیای كوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە جەمیلی كوڕی عەبدوڕڕەحمانی بانگبێژ بووە بە سەعیدی كوڕی موسەیەبی دەگوت: من پیاوێكم ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ ئەو ئەڕزاق و خۆراكانە دەكڕمەوە

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤١أفي البيوع؛ والشيباني: ٨٢٤ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.

کە لە جار دەدرێت (کە شوێنێکە لە کەنار دەریا)، دواتر دەمەوێ ئەو خۆراکە بفرۆشمەوە کە بەماوە کڕیومە (واتە پارەم داوە بەڵام هێشتا وەرمنەگرتووە جا بەر لەوەی خواردنەکەم بۆ بێت دەیفرۆشمەوە)، سەعیدیش پێی گوت: ئایا دەتەوێ لەو خۆراکەیان پێ بدەیتەوە کە (بەماوە) کڕیوتە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، جا سەعید قەدەغەی لێ کرد.

**١٨٧٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ: أَنَّهُ مَنِ اشْتَرَى طَعَامًا بُرًّا أَوْ شَعِيرًا، أَوْ سُلْتًا أَوْ ذُرَةً، أَوْ دُخْنًا أَوْ شَيْئًا مِنَ الْحُبُوبِ الْقِطْنِيَّةِ، أَوْ شَيْئًا مِمَّا يُشْبِهُ الْقِطْنِيَّةَ، مِمَّا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ أَوْ شَيْئًا مِنَ الأُدُمِ كُلِّهَا: الزَّيْتِ، وَالسَّمْنِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَلِّ، وَالْجُبْنِ، وَالشِّيرَقِ، وَاللَّبَنِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الأُدْمِ، فَإِنَّ الْمُبْتَاعَ لاَ يَبِيعُ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ، حَتَّى يَقْبِضَهُ وَيَسْتَوْفِيَهُ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە ئەو بابەتەی کۆدەنگی لەسەرە و ڕاجیایی تیا نییە ئەوەیە: هەر کەسێك خواردنێك بکڕێت (وەك): گەنم یان جۆ یان جۆی کێوی و گەنمی شامی یان شەندەری یان شتێك لەو دانەوێڵانەی هەڵدەگیرێن، یان شتێك لەو دانەوێڵانەی لەوانە دەچن کە هەڵدەگیرێن، لەوانەی زەکاتیان تێدا واجبە، یان شتێك لە هەر پێخۆرێك (وەك): زەیت و ڕۆن و هەنگوین و دۆشاو و پەنیر و ڕۆنی کونجی و شیر و هاوشێوەی ئەوانە لە پێخۆر، کەسی کڕیار نابێ هیچێك لەوانە بفرۆشێت تاوەکوو وەریدەگرێت.

## ٢٠- ئەوەی ناپەسەند و نادروستە لە کڕینی خواردن بەماوە (بەوەی پارەدانەکەی دوا بخرێت)[٢]

**١٨٧١**- عَنْ أَبِي الزِّنَادِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ يَنْهَيَانِ أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ حِنْطَةً بِذَهَبٍ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يَشْتَرِيَ بِالذَّهَبِ تَمْرًا، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الذَّهَبَ[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يُكْرَهُ مِنْ بَيْعِ الطَّعَامِ إِلَىٰ أَجَلٍ.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٣ في البيوع؛ والشيباني:

واتە: لە ئەبو زینادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ بووە قەدەغەیان دەکرد لەوەی کەسێك گەنم بە زێڕێك بفرۆشێت بۆ ماوەیەك (واتە قەرار بێ دوای ماوەیەك پارەی زێڕەکە وەربگرێت)، دواتر خورما بەو زێڕە بکڕێت بەر لەوەی زێڕەکە وەربگرێت.

**١٨٧٢-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ فَرْقَدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا بَكْرِ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَبِيعُ الطَّعَامَ مِنَ الرَّجُلِ بِذَهَبٍ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يَشْتَرِي بِالذَّهَبِ تَمْرًا قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الذَّهَبَ، فَكَرِهَ ذَلِكَ وَنَهَى عَنْهُ[١].

واتە: لە کەسیری کوڕی فەڕقەدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم ﷺ کردووە دەربارەی ئەو کەسەی خواردن دەفرۆشێتە کەسێك بە زێڕ بەماوە (بۆ نموونە مانگێکی دیکە زێڕەکەی بداتێ)، دواتر بە پارەکە خورما بکڕێت بەر لەوەی زێڕەکە وەربگرێت، جا پێی ناپەسەند بوو و قەدەغەی لێ کرد.

**١٨٧٣-** عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، بِمِثْلِ ذَلِكَ[٢].

واتە: هەمان شت لە ئیبنو شیهابەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

**١٨٧٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا نَهَى سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَسُلَيْمَانُ بْنُ يَسَارٍ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، وَابْنُ شِهَابٍ عَنْ أَنْ لاَ يَبِيعَ الرَّجُلُ حِنْطَةً بِذَهَبٍ، ثُمَّ يَشْتَرِي الرَّجُلُ بِالذَّهَبِ تَمْرًا، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الذَّهَبَ مِنْ بَائِعِهِ الَّذِي اشْتَرَى مِنْهُ الْحِنْطَةَ، فَأَمَّا أَنْ يَشْتَرِيَ بِالذَّهَبِ الَّتِي بَاعَ بِهَا الْحِنْطَةَ إِلَى أَجَلٍ تَمْرًا، مِنْ غَيْرِ بَائِعِهِ الَّذِي بَاعَ مِنْهُ الْحِنْطَةَ، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ الذَّهَبَ، وَيُحِيلَ الَّذِي اشْتَرَى مِنْهُ التَّمْرَ عَلَى غَرِيمِهِ الَّذِي بَاعَ مِنْهُ الْحِنْطَةَ بِالذَّهَبِ الَّتِي لَهُ عَلَيْهِ فِي ثَمَرِ التَّمْرِ، فَلاَ بَأْسَ بِذَلِكَ.

---

٧٧١ في البيوع والتجارات والسلم؛ ومصنف ابن أبي شيبة: ٢٠٧٥١ في البيوع والأقضية، كلهم عن مالك به.

(١) ـ مقطوع صحيح.

(٢) ـ مقطوع صحيح.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَقَدْ سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، فَلَمْ يَرَوْا بِهِ بَأْسًا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: سەعیدی کوڕی موسەیەب و سولەیمانی کوڕی یەسار و ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم و ئیبنو شیهاب بۆیە قەدەغەیان کردووە لەوەی نابێ کەسێك گەنم بە زێڕ (ی قەرز) بفرۆشێت و دواتر کەسەکە خورما بە هەمان زێڕەکە بکڕێت بەر لەوەی زێڕەکە لەو کەسە وەربگرێت کە گەنمی لەو کڕیوە، جا یان دەبێ بە هەمان ئەندازەی ئەو زێڕەی کە گەنمەکەی پێ فرۆشتووە خورما بکڕێت لە کەسێکی جگە لەو کەسەی گەنمەکەی پێ فرۆشتووە، بەر لەوەی پارەکە وەربگرێت، دواتر ئەو کەسەی خورمای لێ کڕیوە بنێرێتە لای قەرزدارەکەی خۆی کە بە ئەندازەی ئەو زێڕەی خاوەنی خورماکە خورمای پێ فرۆشتووە گەنمی لەو کڕیبوو، ئەوە (بەو شێوەیە) کێشەی تیا نییە.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: پرسیارم دەربارەی ئەوە لە زیاتر لە زانایێك کردووە، هیچیان پێیان وا نەبووە کێشە هەبێت.

## ٢١- سەلەم لە خواردندا[٢]

**١٨٧٥**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّهُ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِأَنْ يُسَلِّفَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي الطَّعَامِ الْمَوْصُوفِ بِسِعْرٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، مَا لَمْ يَكُنْ فِي زَرْعٍ لَمْ يَبْدُ صَلاَحُهُ، أَوْ تَمْرٍ لَمْ يَبْدُ صَلاَحُهُ[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: کێشە نییە و دروستە کەسێك سەلەم لەگەڵ کەسێکی دیکە بکات لە خواردنی وەسفکراودا (بەوەی پێشەکی پارە بدات، بە مەرجێك) بە نرخێکی دیاریکراو و بۆ ماوەیەکی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٣أ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ السُّلْفَةُ فِي الطَّعَامِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٤ في البيوع، عن مالك به.




دیاریكراو بێت، مادەم لە دانەوێڵەیەكدا نەبێت كە هێشتا پێ نەگەیشتووە، یان لە خورمایەكدا نەبێت كە هێشتا پێ نەگەیشتووە.

١٨٧٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَنْ سَلَّفَ فِي طَعَامٍ بِسِعْرٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَحَلَّ الأَجَلُ، فَلَمْ يَجِدِ الْمُبْتَاعُ عِنْدَ الْبَائِعِ وَفَاءً مِمَّا ابْتَاعَ مِنْهُ، فَأَقَالَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُ إِلاَّ وَرِقَهُ أَوْ ذَهَبَهُ أَوِ الثَّمَنَ الَّذِي دَفَعَ إِلَيْهِ بِعَيْنِهِ، وَإِنَّهُ لاَ يَشْتَرِي مِنْهُ بِذَلِكَ الثَّمَنِ شَيْئًا حَتَّى يَقْبِضَهُ مِنْهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا أَخَذَ غَيْرَ الثَّمَنِ الَّذِي دَفَعَ إِلَيْهِ، أَوْ صَرَفَهُ فِي سِلْعَةٍ غَيْرِ الطَّعَامِ الَّذِي ابْتَاعَ مِنْهُ، فَهُوَ بَيْعُ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَقَدْ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ نَدِمَ الْمُشْتَرِي، فَقَالَ لِلْبَائِعِ: أَقِلْنِي وَأُنْظِرُكَ بِالثَّمَنِ الَّذِي دَفَعْتُ إِلَيْكَ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، وَأَهْلُ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ عَنْهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَمَّا حَلَّ الطَّعَامُ لِلْمُشْتَرِي عَلَى الْبَائِعِ، أَخَّرَ عَنْهُ حَقَّهُ عَلَى أَنْ يُقِيلَهُ، فَكَانَ ذَلِكَ بَيْعَ الطَّعَامِ إِلَى أَجَلٍ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ أَنَّ الْمُشْتَرِيَ حِينَ حَلَّ الأَجَلُ، وَكَرِهَ الطَّعَامَ، أَخَذَ بِهِ دِينَارًا إِلَى أَجَلٍ، وَلَيْسَ ذَلِكَ بِالإِقَالَةِ، وَإِنَّمَا الإِقَالَةُ مَا لَمْ يَزْدَدْ فِيهِ الْبَائِعُ، وَلاَ الْمُشْتَرِي، فَإِذَا وَقَعَتْ فِيهِ الزِّيَادَةُ بِنَسِيئَةٍ إِلَى أَجَلٍ، أَوْ بِشَيْءٍ يَزْدَادُهُ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ، أَوْ بِشَيْءٍ يَنْتَفِعُ بِهِ أَحَدُهُمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ بِالإِقَالَةِ، وَإِنَّمَا تَصِيرُ الإِقَالَةُ إِذَا فَعَلاَ ذَلِكَ بَيْعًا، وَإِنَّمَا أُرْخِصَ فِي الإِقَالَةِ وَالشِّرْكِ، وَالتَّوْلِيَةِ مَا لَمْ يَدْخُلْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ زِيَادَةٌ أَوْ النُّقْصَانُ، أَوْ النَّظِرَةُ، فَإِنْ دَخَلَ ذَلِكَ زِيَادَةٌ أَوْ نُقْصَانٌ أَوْ نَظِرَةٌ، صَارَ بَيْعًا يُحِلُّهُ مَا يُحِلُّ الْبَيْعَ، وَيُحَرِّمُهُ مَا يُحَرِّمُ الْبَيْعَ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی خواردن بەسەلەم دەكڕێ (واتە پێشەكی پارە دەدات) بە نرخێكی دیاریكراو بۆ كاتێكی دیاریكراو، جا كاتەكە دێت و شتە كڕدراوەكەی دەست ناكەوێت لەلای فرۆشیارەكە و ئەویش پەشیمانبوونەوەی كڕیارەكە قبووڵ دەكات و مامەڵەكە هەڵدەوەشێنێتەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆی نییە هیچی لێ وەربگرێت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧٣ في البيوع، عن مالك به.

جگە لە زیوەکەی خۆی یان زێڕەکەی خۆی یان خودی ئەو پارەیەی داویەتی، وە بۆشی نییە هیچ لەو خواردنەی بەو پارەیە لێ بکڕێت تاوەکوو پارەکە وەردەگرێتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر پارەیەکی جگە لەو پارەیە وەربگرێت کە داویەتی، یان بیگۆڕێت بۆ کاڵایێکی جگە لەو خواردنەی کڕیویەتی، ئەوە دەکاتە فرۆشتنی خواردن بەر لە وەرگرتنی، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی خواردن بەر لە وەرگرتنی.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر کڕیارەکە پەشیمانبۆیەوە و بە فرۆشیارەکەی گوت: پەشیمانبوونەوەم قبووڵ بکە و مامەڵەکە هەڵبوەشێنەوە منیش چاوەڕێت دەکەم و زیاتر لەسەرت ڕادەوەستم بۆ ئەو پارەیەی پێم داوی، ئەوە دروست نییە، زانایان قەدەغەیان لێ کردووە، لەبەرئەوەی کاتێ ساتی تەسلیمکردنی ئەو خواردنە هاتووە کە کڕیار لەسەر فرۆشیارەکە هەیەتی، کڕیار حەقی خۆی دوا خستووە (کە بریتییە لە وەرگرتنەوەی پارەکەی) بۆ ئەوەی فرۆشیار پەشیمانبوونەوەی قبووڵ بکات، ئەوەش بریتییە لە فرۆشتنی خواردن بۆ ماوەیەك بەر لەوەی وەربگیرێت.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ڕوونکردنەوەی ئەوە بەم شێوەیەیە: کڕیار کاتێ کاتەکەی دێت و خواردنەکەی بەدڵ نییە فرۆشیار دینارێك وەربگرێت لە ماوەی داهاتوودا، جا ئەوە ئیقالە و پەشیمانی قبووڵکردن نییە، بەڵکوو (ئیقالە) پەشیمانی قبووڵکردن ئەوەیە کڕیار و فرۆشیار هیچ پارە و شتێك زیاد نەکەن، جا کە زیادەی تێ کەوت بە دواخستن بۆ ماوەیەك، یان بە شتێکی زیادە کە یەکێکیان بەسەر ئەوەی دیکە زیادی بکات (و ڕاستەوخۆ لێی وەربگرێت) یان شتێك زیاد بکرێت یەکێکیان سوودمەند بن لێی، ئەوانە هیچیان ئیقالە و پەشیمانی قبووڵکردن نین، بەڵکوو ئەو کات دەبێتە ئیقالە ئەگەر مامەڵەکەیان بەیع بێت، جا کە مۆڵەت دراوە بە ئیقالە و شەراکەت و کردنە سەرپەرشتیاری مامەڵەت لەو کاتەیە کە مامەڵەکە هیچ زیادە و نەقوستان و چاوەڕێکردن و دواخستنی تێدا نەبێ، جا ئەگەر زیادە و نەقوستان و چاوەڕێکردن و دواخستنی تێ کەوت، ئەوە دەبێتە بەیعێکی




وا ئەو شتانە حەڵاڵ دەکات کە بۆ بەیع حەڵاڵە وە ئەوە حەرام دەکات کە لە بەیع حەرامە (دەبێتە بەیع نەك سەلەم).

**١٨٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ سَلَّفَ فِي حِنْطَةٍ شَامِيَّةٍ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَأْخُذَ مَحْمُولَةً بَعْدَ مَحِلِّ الأَجَلِ، وَكَذَلِكَ مَنْ سَلَّفَ فِي صِنْفٍ مِنَ الأَصْنَافِ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَأْخُذَ خَيْرًا مِمَّا سَلَّفَ فِيهِ أَوْ أَدْنَى بَعْدَ مَحِلِّ الأَجَلِ، وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ يُسَلِّفَ الرَّجُلُ فِي حِنْطَةٍ مَحْمُولَةٍ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَأْخُذَ شَعِيرًا أَوْ شَامِيَّةً، وَإِنْ سَلَّفَ فِي تَمْرٍ عَجْوَةٍ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَأْخُذَ صَيْحَانِيًّا أَوْ جَمْعًا، وَإِنْ سَلَّفَ فِي زَبِيبٍ أَحْمَرَ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَأْخُذَ أَسْوَدَ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ كُلُّهُ بَعْدَ مَحِلِّ الأَجَلِ، إِذَا كَانَتْ مَكِيلَةُ ذَلِكَ سَوَاءً بِمِثْلِ كَيْلِ مَا سَلَّفَ فِيهِ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك سەلەم لە گەنمی شامی بکات، ئەوە کێشە نییە دوای هاتنی کاتەکە گەنمی دیکە وەربگرێت، بە هەمان شێوە هەر کەسێك سەلەمی لە جۆرێك لە جۆرەکانی خواردن کرد، ئەوە کێشە نییە دوای هاتنی کاتەکە چاکتر یان خراپتر لەوە وەربگرێت کە سەلەمی تیا کردووە، جا ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە بەو شێوەیەیە: کەسەکە سەلەم لە گەنم بکات، ئەوە کێشە نییە جۆ یان گەنمی شامی وەربگرێت، وە ئەگەر سەلەمی لە خورمای عەجوە کرد، ئەوە کێشە نییە لەوەی خورمای صەیحانی (کە جۆرێکی باشترە لە عەجوە) یان جەمع (کە جۆرێکی خراپە) وەربگرێت، وە ئەگەر سەلەمی لە مێوژی سۆر کرد، ئەوە کێشە نییە هی ڕەش وەربگرێت، ئەگەر گشت ئەوانە دوای هاتنی کاتەکە بوو، (بە مەرجێك) ئەگەر ئەندازە و پێوانەی ئەوە هەمان ئەندازە و پێوانەی ئەوە بێت کە سەلەمی تیا کردووە.

## ٢٢- فرۆشتنی خواردن بە خواردن بەبێ زیادە لە نێوانیان[1]

**١٨٧٨-** أَنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ ﷺ قَالَ: فَنِيَ عَلَفُ حِمَارِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، فَقَالَ لِغُلاَمِهِ: خُذْ مِنْ حِنْطَةِ أَهْلِكَ، فَابْتَعْ بِهَا شَعِيرًا، وَلاَ تَأْخُذْ إِلاَّ مِثْلَهُ[2].

---

(١) ـ بَيْعُ الطَّعَامِ بِالطَّعَامِ لَا فَضْلَ بَيْنَهُمَا.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٥ في البيوع، عن مالك به.

واتە: سولەیمانی کوڕی یەسار ﷺ گوتوویەتی: عەلەفی گوێدرێژی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ نەما و تەواو بوو، جا بە خزمەتکارەکەی گوت: هەندێك لە گەنمیماڵەوە هەڵگرە و جۆی پێ بکڕە، لە ئەندازەی خۆی زیاتر وەرنەگری (چونکە پێی وا بووە یەك جنس حیسابن).

**١٨٧٩-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الأَسْوَدِ بْنِ عَبْدِ يَغُوثَ، فَنِيَ عَلَفُ دَابَّتِهِ، فَقَالَ لِغُلاَمِهِ: خُذْ مِنْ حِنْطَةِ أَهْلِكَ طَعَامًا، فَابْتَعْ بِهَا شَعِيرًا، وَلاَ تَأْخُذْ إِلاَّ مِثْلَهُ[١].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبدی یەغوس عەلەفی ئاژەڵەکەی بڕا، جا بە خزمەتکارەکەی گوت: هەندێك لە گەنمی ماڵەوە هەڵگرە و جۆی پێ بکڕە، لە ئەندازەی خۆی زیاتر وەرنەگری (چونکە پێی وا بووە یەك جنس حیسابن).

**١٨٨٠-** عَنِ ابْنِ مُعَيْقِيبٍ الدَّوْسِيِّ ﷺ، مِثْلُ ذَلِكَ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَهُوَ الأَمْرُ عِنْدَنَا.

واتە: لە ئیبنو موعەیقیبەوە ﷺ هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتەکە لای ئێمە ئاوایە (نابێ زیادە لە نێوان گەنم و جۆ هەبێت).

**١٨٨١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ تُبَاعَ الْحِنْطَةُ بِالْحِنْطَةِ، وَلاَ التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَلاَ الْحِنْطَةُ بِالتَّمْرِ، وَلاَ التَّمْرُ بِالزَّبِيبِ، وَلاَ الْحِنْطَةُ بِالزَّبِيبِ، وَلاَ شَيْءٌ مِنَ الطَّعَامِ كُلِّهِ، إِلاَّ يَدًا بِيَدٍ، فَإِنْ دَخَلَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ الأَجَلُ لَمْ يَصْلُحْ، وَكَانَ حَرَامًا، وَلاَ شَيْءَ مِنَ الأَدْمِ كُلِّهَا، إِلاَّ يَدًا بِيَدٍ[٣].

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٧٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٥أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٠ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨١ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە (ئەوەیە): نابێ گەنم بە گەنم و خورما بە خورما و گەنم بە خورما و خورما بە مێوژ و گەنم بە مێوژ و هیچ خۆراكێك بەیەكدی بفرۆشرێن، حەتمەن دەبێ دەست بە دەست بێت، جا ئەگەر ماوە كەوتە ناو یەكێك لەمانە ئەوە دروست نییە و حەرامە، وە نابێ هیچ پێخۆرێكیش (وەك ڕۆن و دۆشاو و سركە ... هتد) بفرۆشرێت حەتمەن دەبێ دەست بە دەست بێت (نابێ ماوەی تێدا بێت).

١٨٨٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يُبَاعُ شَيْءٌ مِنَ الطَّعَامِ وَالأُدْمِ، إِذَا كَانَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ: اثْنَانِ بِوَاحِدٍ، لاَ يُبَاعُ مُدُّ حِنْطَةٍ بِمُدَّيْ حِنْطَةٍ، وَلاَ مُدُّ تَمْرٍ بِمُدَّيْ تَمْرٍ، وَلاَ مُدُّ زَبِيبٍ بِمُدَّيْ زَبِيبٍ، وَلاَ مَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْحُبُوبِ وَالأُدْمِ كُلِّهَا، إِذَا كَانَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ، وَإِنْ كَانَ يَدًا بِيَدٍ، إِنَّمَا ذَلِكَ بِمَنْزِلَةِ الْوَرِقِ بِالْوَرِقِ، وَالذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَلاَ يَحِلُّ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ الْفَضْلُ، وَلاَ يَحِلُّ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ وَيَدًا بِيَدٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هیچ خواردن و پێخۆرێك ئەگەر لە یەك جۆر بوون دوو بەرانبەر یەك نافرۆشرێن (واتە نابێ یەكیان لەوەی دیكە زیاتر بێت)، یەك مود لە گەنم نافرۆشرێت بە دوو مود لە گەنم، وە مودێك لە خورما نافرۆشرێت بە دوو مود لە خورما، وە مودێك لە مێوژ نافرۆشرێت بە دوو مود لە مێوژ، بە هەمان شێوە ئەوانەی وەكوو ئەمانەشن لە خواردن و پێخۆر ئەگەر یەك كۆمەڵە و جۆربوون (دەبێ یەك ئەندازەییان لێ بێتە جێ) هەرچەندە دەست بە دەستیش بن، چونكە ئەوە وەكوو زیو بە زیو و زێڕ بە زێڕ وایە، زیادەش لە هیچێك لەوانە حەڵاڵ نییە، تەنها لەو كاتەدا نەبێت كە ئەندازەیان یەكە و دەست بە دەستن.

١٨٨٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا اخْتَلَفَ مَا يُكَالُ أَوْ يُوزَنُ مِمَّا يُؤْكَلُ أَوْ يُشْرَبُ، فَبَانَ اخْتِلاَفُهُ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ بَأْسَ أَنْ يُؤْخَذَ صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ بِصَاعَيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ، وَصَاعٌ مِنْ تَمْرٍ بِصَاعَيْنِ مِنْ زَبِيبٍ، وَصَاعٌ مِنْ حِنْطَةٍ بِصَاعَيْنِ مِنْ سَمْنٍ، فَإِذَا كَانَ الصِّنْفَانِ مِنْ هَذَا مُخْتَلِفَيْنِ، فَلاَ بَأْسَ بِاثْنَيْنِ مِنْهُ بِوَاحِدٍ أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ يَدًا بِيَدٍ، فَإِنْ دَخَلَ فِي ذَلِكَ الأَجَلُ فَلاَ يَحِلُّ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٣ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر جیاواز بوون ئەو شتانەی دەپێوران یان دەکێشران لەو شتانەی دەخوران یان دەخورانەوە و جیاوازییەکەیان ڕوون و دیار بوو، ئەوە کێشە نییە لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێ، وە کێشە نییە لەوەی یەك صاع لە خورما بەرانبەر دوو صاع لە گەنم وەربگیرێ، وە صاعێك لە خورما بەرانبەر دوو صاع لە مێوژ وەربگیرێ، وە صاعێك لە گەنم بەرانبەر دوو صاع لە ڕۆن وەربگیرێت، جا ئەگەر دوو جۆرەکان لەو جۆرە جیاوازانە بوون، ئەوە کێشە نییە لەوەی دوویان بە یەك یان زیاتر بدرێت (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، جا ئەگەر کات و دواخستن و ماوەی تێ کەوت ئەوە حەڵاڵ نییە (حەرامە و ڕیبایە).

**١٨٨٤- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ تَحِلُّ صُبْرَةُ الْحِنْطَةِ، بِصُبْرَةِ الْحِنْطَةِ، وَلاَ بَأْسَ بِصُبْرَةِ الْحِنْطَةِ، بِصُبْرَةِ التَّمْرِ يَدًا بِيَدٍ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لاَ بَأْسَ أَنْ تُشْتَرَى الْحِنْطَةُ بِالتَّمْرِ جِزَافًا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دروست و حەڵاڵ نییە ڕوسەیەك لە گەنم بفرۆشرێت بە ڕوسەیەك لە گەنم (چونکە ڕاستە هەردووکیان یەك ڕوسەن، بەڵام ڕوسەکان وەکوو یەك نابن لە کاتێکدا یەك جۆرن)، بەڵام کێشە نییە لە فرۆشتنی ڕوسەیەك لە گەنم بە ڕوسەیەك لە خورما دەست بە دەست، چونکە کێشە نییە لەوەی گەنم بە خورما بفرۆشرێت لە گۆترە (چونکە دوو جۆری جیاوازن زیاد و کەمی تێدا دروستە).

**١٨٨٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكُلُّ مَا اخْتَلَفَ مِنَ الطَّعَامِ وَالأُدْمِ فَبَانَ اخْتِلاَفُهُ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُشْتَرَى بَعْضُهُ بِبَعْضٍ جِزَافًا يَدًا بِيَدٍ، فَإِنْ دَخَلَهُ الأَجَلُ فَلاَ خَيْرَ فِيهِ، وَإِنَّمَا اشْتِرَاءُ ذَلِكَ جِزَافًا كَاشْتِرَاءِ بَعْضِ ذَلِكَ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ جِزَافًا، وَذَلِكَ أَنَّكَ تَشْتَرِي الْحِنْطَةَ بِالْوَرِقِ جِزَافًا، وَالتَّمْرَ بِالذَّهَبِ جِزَافًا، فَهَذَا حَلاَلٌ لاَ بَأْسَ بِهِ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: گشت خۆراکێك و پێخۆرێك کە جیاواز بن و جیاوازییەکەیان دەربکەوێ و ڕوون بێت، هیچ کێشە نییە لەوەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٥ في البيوع، عن مالك به.

هەندێكی بە هەندێكی دیكەی بەگۆترە بكڕدرێت دەست بە دەست، جا ئەگەر ماوەی كەوتە ناو (واتە دەست بە دەست نەبوو) ئەوە خێری تیا نییە (حەڕامە)، جا كڕینی ئەوەی كە بەگۆترە حەڵاڵە، لەبەرئەوەیە وەكوو یەكێك لەو خۆراكانەیە كە بە زێڕ یان زیو دەكڕدرێن بەگۆترە، چونكە تۆ گەنم بەگۆترە دەكڕی بە زیو، وە خورما بەگۆترە دەكڕی بە زێڕ، ئەوە حەڵاڵە كێشەی نییە.

**١٨٨٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ صَبَّرَ صُبْرَةَ طَعَامٍ، وَقَدْ عَلِمَ كَيْلَهَا، ثُمَّ بَاعَهَا جِزَافًا، وَكَتَمَ الْمُشْتَرِيَ كَيْلَهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، فَإِنْ أَحَبَّ الْمُشْتَرِي أَنْ يَرُدَّ ذَلِكَ الطَّعَامَ عَلَى الْبَائِعِ، رَدَّهُ بِمَا كَتَمَهُ كَيْلَهُ وَغَرَّهُ، وَكَذَلِكَ كُلُّ مَا عَلِمَ الْبَائِعُ كَيْلَهُ، وَعَدَدَهُ مِنَ الطَّعَامِ، وَغَيْرِهِ، ثُمَّ بَاعَهُ جِزَافًا، وَلَمْ يَعْلَمِ الْمُشْتَرِي ذَلِكَ، فَإِنَّ الْمُشْتَرِيَ إِنْ أَحَبَّ أَنْ يَرُدَّ ذَلِكَ عَلَى الْبَائِعِ رَدَّهُ، وَلَمْ يَزَلْ أَهْلُ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ عَنْ ذَلِكَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر كەسێك ڕوسە خۆراكێك دابنێت و بزانێت پێوانەی چەندە، دواتر بەگۆترە بیفرۆشێت و پێوانەكەی لە كڕیار بشارێتەوە، ئەوە دروست نییە، جا ئەگەر كڕیار حەزی كرد خواردنەكە بۆ فرۆشیارەكە بگەڕێنێتەوە، ئەوە دەیگەڕێنێتەوە بەهۆی ئەوەی پێوانەكەی لێ شاردۆتەوە و فێڵی لێ كردووە، بە هەمان شێوە گشت شتێك فرۆشیار پێوانە و ژمارەی بزانێت لە خواردن و غەیری خواردن، دواتر بەگۆترە بیفرۆشێت و كڕیار ئەوە نەزانێت، ئەوە كڕیار ئەگەر حەزی كرد بیگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیار ئەوە دەیگەڕێنێتەوە و بۆی هەیە، جا بەردەوام زانایان ڕێگرییان لەو بابەتە كردووە.

**١٨٨٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ خَيْرَ فِي الْخُبْزِ قُرْصٍ بِقُرْصَيْنِ، وَلاَ عَظِيمٍ بِصَغِيرٍ، إِذَا كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ أَكْبَرَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَمَّا إِذَا كَانَ يُتَحَرَّى أَنْ يَكُونَ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ وَإِنْ لَمْ يُوزَنْ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: خێر و چاكە و دروستی و حەڵاڵی نییە نە لە گۆڕینەوەی یەك سەموون بە دوو سەموون و نە لە گۆڕینەوەی سەموونی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٧ في البيوع، عن مالك به.

گەوره بە سەموونی بچووك، ئەگەر هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان گەورەتر بن، بەڵام ئەگەر (زۆر باش) هەوڵ بدات وەکوو یەکدی بن، ئەوە کێشە نییە بەیەکدی بفرۆشرێن هەرچەندە نەشکێشرێن (مادەم وێناچێ یەکێکیان گەورەتر بێت).

١٨٨٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَصْلُحُ مُدُّ زُبْدٍ وَمُدُّ لَبَنٍ، بِمُدَّيْ زُبْدٍ، وَهُوَ مِثْلُ الَّذِي وَصَفْنَا مِنَ التَّمْرِ الَّذِي يُبَاعُ صَاعَيْنِ مِنْ كَبِيسٍ، وَصَاعًا مِنْ حَشَفٍ بِثَلاَثَةِ آصُعٍ مِنْ عَجْوَةٍ، حِينَ قَالَ لِصَاحِبِهِ: إِنَّ صَاعَيْنِ مِنْ كَبِيسٍ بِثَلاَثَةِ آصُعٍ مِنَ عَجْوَةٍ، لاَ يَصْلُحُ، فَفَعَلَ ذَلِكَ لِيُجِيزَ بَيْعَهُ، وَإِنَّمَا جَعَلَ صَاحِبُ اللَّبَنِ اللَّبَنَ مَعَ زُبْدِهِ، لِيَأْخُذَ فَضْلَ زُبْدِهِ عَلَى زُبْدِ صَاحِبِهِ، حِينَ أَدْخَلَ مَعَهُ اللَّبَنَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ یەك مود زبدە (کەرە) و یەك مود شیر بە دوو مود زبدە بدرێت، ئەوە هەمان ئەو شتەیە کە لە خورمادا باسمان کرد کە نابێ دوو صاع لە خورمای جۆری کەبیس و صاعێك لە خورمای حەشەف بفرۆشرێت بە سێ صاع لە خورمای عەجوە، کاتێ بە بەرانبەرەکەی دەڵێت: دوو صاع لە کەبیس بە سێ صاعی عەجوەیە، ئەوە دروست نییە (نایکەم چونکە ڕیبایە)، (ئەویش دوای ئەوە دەیکات بە سێ صاع، دوو صاع لە کەبیس و صاعێك لە حەشەف، جا) ئەوەی کردووە تاوەکوو مامەڵەکەی حەڵاڵ بکات و جێبەجێ ببێت، جا خاوەنی شیرەکەش (لە مەسەلەی خۆمان) شیری لەگەڵ زبدە داناوە تاوەکوو چاکی زبدەکەی خۆی بەسەر زبدەی بەرانبەرەکەی وەربگرێتەوە و قەرەبوو بکاتەوە کاتێ شیری لەگەڵ دادەنێت.

١٨٨٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالدَّقِيقُ بِالْحِنْطَةِ، مِثْلاً بِمِثْلٍ لاَ بَأْسَ بِهِ، وَذَلِكَ لأَنَّهُ أَخْلَصَ الدَّقِيقَ فَبَاعَهُ بِالْحِنْطَةِ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلَوْ جَعَلَ نِصْفَ الْمُدِّ مِنْ دَقِيقٍ، وَنِصْفَهُ مِنْ حِنْطَةٍ، فَبَاعَ ذَلِكَ بِمُدٍّ مِنْ حِنْطَةٍ، كَانَ ذَلِكَ مِثْلَ الَّذِي وَصَفْنَا لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ أَنْ يَأْخُذَ فَضْلَ حِنْطَتِهِ الْجَيِّدَةِ، حِينَ جَعَلَ مَعَهَا الدَّقِيقَ، فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٨٩ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (فرۆشتنی) ئارد بە گەنم كە هاوكێشان و پێوان بن كێشەی نییە، لەبەر ئەوەی چونكە ئاردەكە تەنها ئاردە (گەنم و شتی دیكەی لەگەڵ نییە) و ئاردەكەی بە گەنم فرۆشتووە بە هەمان كێشان و پێوان، جا ئەگەر نیو مود لە ئارد دابنێت و نیوەكەی دیكەشی لە گەنم و بیفرۆشێت بە یەك مود لە گەنم، ئەوە هەمان ئەو شتەیە كە باسمان كرد و گوتمان دروست نییە، چونكە ویستوویەتی زیادە چاكی گەنمەكەی خۆی وەربگرێتەوە و بۆی بگەڕێتەوە كاتێ ئاردی لەگەڵ دادەنێ، جا ئەوە نابێت و دروست نییە (ڕیبایە).

## ٢٣- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی كڕین و فرۆشتنی خواردن[١]

١٨٩٠- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي رَجُلٌ أَبْتَاعُ الطَّعَامَ يَكُونُ مِنَ الصُّكُوكِ بِالْجَارِ، فَرُبَّمَا ابْتَعْتُ مِنْهُ بِدِينَارٍ وَنِصْفِ دِرْهَمٍ، أَفَأُعْطِي بِالنِّصْفِ طَعَامًا، فَقَالَ سَعِيدٌ: لاَ، وَلَكِنْ أَعْطِ أَنْتَ دِرْهَمًا، وَخُذْ بَقِيَّتَهُ طَعَامًا[٢].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو مەریەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پرسیاری لە سەعیدی كوڕی موسەیەب ﷺ كردووە و گوتوویەتی: من پیاوێكم خۆراك و ئەرزاقی بایەعی جار (كە شوێنێكە لە كەنار دەریا) دەكڕمەوە، جا جاری وا هەیە خۆراك دەكڕم بای دینارێك و نیو درهەمە، جا ئایا بای نیو درهەمەكە خۆراك بدەم (بیگەڕێنمەوە)، سەعید گوتی: نەخێر، بەڵكوو تۆ درهەمێكی تەواو بدە و بۆ ئەوەی دەمێنێتەوە (كە نیو درهەمەكەیە) خواردن وەربگرە.

١٨٩١- أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ سِيرِينَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَبِيعُوا الْحَبَّ فِي سُنْبُلِهِ حَتَّى يَبْيَضَّ[٣].

واتە: موحەممەدی كوڕی سیرین ﷺ دەیگوت: دانەوێڵە لەناو گوڵەكەی مەفرۆشن تاوەكوو سپی دەبێت (واتە تا دانەوێڵەكە ڕەق دەبێت).

---

(١) ـ جَامِعُ بَيْعِ الطَّعَامِ.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٦ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٦أ في البيوع، عن مالك به.





**١٨٩٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: مَنِ اشْتَرَى طَعَامًا بِسِعْرٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَلَمَّا حَلَّ الأَجَلُ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِ الطَّعَامُ لِصَاحِبِهِ: لَيْسَ عِنْدِي طَعَامٌ، فَبِعْنِي الطَّعَامَ الَّذِي لَكَ عَلَيَّ إِلَى أَجَلٍ، فَيَقُولُ صَاحِبُ الطَّعَامِ: هَذَا لاَ يَصْلُحُ، قَدْ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ حَتَّى يُسْتَوْفَى، فَيَقُولُ الَّذِي عَلَيْهِ الطَّعَامُ لِغَرِيمِهِ: فَبِعْنِي طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ حَتَّى أَقْضِيَكَهُ، فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ إِنَّمَا يُعْطِيهِ طَعَامًا ثُمَّ يَرُدُّهُ إِلَيْهِ، فَيَصِيرُ الذَّهَبُ الَّذِي أَعْطَاهُ ثَمَنَ الطَّعَامِ الَّذِي كَانَ لَهُ عَلَيْهِ، وَيَصِيرُ الطَّعَامُ الَّذِي أَعْطَاهُ مُحَلِّلاً فِيمَا بَيْنَهُمَا، وَيَكُونُ ذَلِكَ إِذَا فَعَلاَهُ بَيْعَ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: هەر كەسێك خۆراكێكی كڕی بە نرخێكی دیاریكراو بۆ ماوەیەكی دیاریكراو (بۆ نموونە ڕێك كەوتن بیست ڕۆژی دیكە خۆراكەكەی بۆ بێنێت)، جا كاتێ كاتەكە هات، ئەو كەسەی خۆراكی لەسەرە بە هاوڕێكەی بڵێت: هیچ خۆراكێكم لەلا نییە و ئەو خۆراكەی لەسەر من هەتە پێم بفرۆشەوە بەماوە (واتە لەسەر ئەو بنەمایەی دواتر خواردنەكەم بدەیتێ)، خاوەنی خواردنەكەش بڵێت: ئەوە دروست نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە و حەڕامی كردووە خواردن بفرۆشرێتەوە بەر لەوەی وەربگیرێت، جا ئەو كەسەی خواردنەكەی لەسەرە بە خاوەن قەرزەكەی بڵێت: كەواتە خۆراكێكم پێ بفرۆشە بۆ ماوەیەك تا من خۆراكەكەت بدەمەوە، ئەوەش نابێت، چونكە خۆراكی دەداتێ دواتر بۆی دەگەڕێنێتەوە، وای لێ دێ ئەو زێڕەی داویەتی دەبێتە پارەی ئەو خۆراكەی لەسەر كەسەكەیە، وە ئەو خۆراكەی پێی داوە (لە ڕووكەشدا) دەبێتە حیلەیەك بۆ ڕێپێدانی ئەوەی دەیانەوێ، (بەڵام) ئەگەر واش بكەن ئەوە دەبێتە فرۆشتنی خواردن بەر لەوەی وەربگیرێ (ئەوەش حەڕامە).

**١٨٩٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي رَجُلٍ لَهُ عَلَى رَجُلٍ طَعَامٌ ابْتَاعَهُ مِنْهُ، وَلِغَرِيمِهِ عَلَى رَجُلٍ طَعَامٌ مِثْلُ ذَلِكَ الطَّعَامِ، فَقَالَ الَّذِي عَلَيْهِ الطَّعَامُ لِغَرِيمِهِ: أُحِيلُكَ عَلَى غَرِيمٍ لِي، عَلَيْهِ مِثْلُ الطَّعَامِ الَّذِي لَكَ عَلَيَّ، بِطَعَامِكَ الَّذِي لَكَ عَلَيَّ، قَالَ مَالِكٌ ﵀: إِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الطَّعَامُ، إِنَّمَا هُوَ طَعَامٌ ابْتَاعَهُ، فَأَرَادَ أَنْ يُحِيلَ غَرِيمَهُ بِطَعَامٍ ابْتَاعَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، وَذَلِكَ بَيْعُ الطَّعَامِ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٢ في البيوع، عن مالك به.

قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى، فَإِنْ كَانَ الطَّعَامُ سَلَفًا حَالاًّ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُحِيلَ بِهِ غَرِيمَهُ، لأَنَّ ذَلِكَ لَيْسَ بِبَيْعٍ، وَلاَ يَحِلُّ بَيْعُ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى، لِنَهْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ قَدِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِالشِّرْكِ وَالتَّوْلِيَةِ وَالإِقَالَةِ فِي الطَّعَامِ وَغَيْرِهِ[1].

قَالَ مَالِكٌ ؒ: وَذَلِكَ أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ أَنْزَلُوهُ عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ، وَلَمْ يُنْزِلُوهُ عَلَى وَجْهِ الْبَيْعِ، وَذَلِكَ مِثْلُ الرَّجُلِ يُسَلِّفُ الدَّرَاهِمَ النُّقَّصَ، فَيُقْضَى دَرَاهِمَ وَازِنَةً فِيهَا فَضْلٌ، فَيَحِلُّ لَهُ ذَلِكَ وَيَجُوزُ، وَلَوِ اشْتَرَى مِنْهُ دَرَاهِمَ نُقَّصًا بِوَازِنَةٍ، لَمْ يَحِلَّ ذَلِكَ، وَلَوِ اشْتَرَطَ عَلَيْهِ حِينَ أَسْلَفَهُ وَازِنَةً، وَإِنَّمَا أَعْطَاهُ نُقَّصًا لَمْ يَحِلَّ لَهُ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ؒ دەربارەی كەسێك كە خۆراكێكی لەسەر كەسێك هەبێت كە لێی كڕیوە، وە قەرزدارەكەشی هەمان خۆراكی لەسەر كەسێكی دیكە هەبێت، جا ئەوەی خۆراكەكەی لەسەرە بە خاوەن قەرزەكەی بڵێت: دەتنێرم بۆ سەر قەرزارەكەم، هەمان خۆراكی لەسەرە كە تۆ لەسەر من هەتە، (دەتنێرم بۆ وەرگرتنەوەی) ئەو خۆراكەی تۆ لەسەر من هەتە، ئیمامی مالیك ؒ گوتوویەتی: ئەگەر ئەو كەسەی خۆراكەكەی لەسەرە خۆراكێك بێت كڕیبێتی (واتە بە كڕین و فرۆشتن كەوتبێتە سەری) و بیەوێت خاوەنی قەرزەكەی بۆ خۆراكێك بنێرێت كە (بە هەمان شێوە) كڕیبێتی، ئەوە نابێت و دروست نییە و ئەوە فرۆشتنی خواردنە بەر لە وەرگرتنی.

(بەڵام) ئەگەر خۆراكەكە سەلەم بوو و كاتی هاتبوو (كڕین و فرۆشتنی غەیری سەلەم نەبوو)، ئەوە كێشە نییە لەوەی خاوەنی قەرزەكەی بنێرێت (بۆ وەرگرتنی خۆراكەكەی)، چونكە ئەوە كڕین و فرۆشتن نییە (جۆرەكەی بەیع نییە بەڵكوو سەلەمە)، وە فرۆشتنی خواردن بەر لە وەرگرتنی دروست نییە، لەبەر قەدەغەكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بابەتە، بەڵام زانایان كۆكن لەسەر ئەوەی كێشە نییە لە هاوبەشیكردنی مامەڵەت و كردنە سەرپەرشتیاری مامەڵەت و پەشیمانی قبووڵكردن لە مامەڵەت لە خۆراك و جگە لە خۆراكیش (چونكە ئەو شتانە وەك یارمەتی حیسابن نەك بەیع و بازرگانی).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٣ في البيوع، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەش لەبەر ئەوەیە زانایان ئەو بابەتانەیان بە ڕوانگەی چاکەکاری داناوە، بە ڕوانگەی بازرگانییان دانەناوە، ئەوە وەك ئەوە وایە کەسێك درهەمی نەقص بەقەرز بدات و درهەمی تەواو وەربگرێتەوە زیادەی تیا بێت (واتە قەرزدارەکە بەپێخۆشی خۆی درهەمی تەواوی بۆ بگەڕێنێتەوە) ئەوەی بۆ حەڵاڵ و دروستە (چونکە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن نییە)، (بەڵام) ئەگەر درهەمی نەقصی لێ بکڕێت بە درهەمی تەواو، ئەوە حەڵاڵ نییە (چونکە مەبەست پێی بازرگانییە)، وە ئەگەر کاتێ بەقەرزیش پێی دەدات مەرجی گەڕاندنەوەی درهەمی تەواوی لەسەر دابنێت دیسان بۆی حەڵاڵ نییە (لە بابەتی یارمەتی و چاکەکاری دەردەچێت و حەڕامە و ڕیبایە).

١٨٩٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِمَّا يُشْبِهُ ذَلِكَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْمُزَابَنَةِ، وَأَرْخَصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا مِنَ التَّمْرِ، وَإِنَّمَا فُرِقَ بَيْنَ ذَلِكَ، أَنَّ الْمُزَابَنَةِ بَيْعٌ عَلَى وَجْهِ الْمُكَايَسَةِ وَالتِّجَارَةِ، وَأَنَّ بَيْعَ الْعَرَايَا عَلَى وَجْهِ الْمَعْرُوفِ لاَ مُكَايَسَةَ فِيهِ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی (لە دروستی و نادروستی) لەوە دەچێت ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە مامەڵەی موزابەنە (کە بریتییە لە کڕین و فرۆشتن بەخەمڵاندن بەبێ کێشان و پێوان) و ڕێگەی داوە بە مامەڵەی عەڕایا لە خورما بەخەمڵاندن، جا کە جیاوازییان لە نێوان کراوە لەبەرئەوەیە مامەڵەی موزابەنە بۆ زاڵبوون و بازرگانییە، (بەڵام) مامەڵەی عەڕایا بۆ چاکەخوازی و یارمەتیدانی یەکدییە، زاڵبوون و بازرگانی تیا نییە.

١٨٩٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي أَنْ يَشْتَرِيَ رَجُلٌ طَعَامًا بِرُبُعٍ أَوْ بِثُلُثٍ أَوْ بِكِسْرٍ مِنْ دِرْهَمٍ، عَلَى أَنْ يُعْطَى بِذَلِكَ طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ، وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَبْتَاعَ الرَّجُلُ طَعَامًا بِكِسْرٍ مِنْ دِرْهَمٍ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ يُعْطَى دِرْهَمًا، وَيَأْخُذُ بِمَا بَقِيَ لَهُ مِنْ دِرْهَمِهِ سِلْعَةً مِنَ السِّلَعِ، لأَنَّهُ أَعْطَى الْكِسْرَ الَّذِي عَلَيْهِ فِضَّةً، وَأَخَذَ بِبَقِيَّةِ دِرْهَمِهِ سِلْعَةً، فَهَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٥ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٦ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ کەسێك بە چارەکێك یان سێیەکێك یان بەشێك لە درهەمێك خۆراکێك بکڕێت لەسەر ئەوەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا خۆراکەکەی پێ بدرێت (واتە دروست نییە پارە بدات و کاتێکی دیکە خواردنەکە وەربگرێت)، (بەڵام) کێشە نییە کەسێك خواردنێك بە بەشێك لە درهەمێك بکڕێت لەسەر ئەوەی دواتر بەشە درهەمەکە بدات، دواتر (خاوەنی خۆراکەکە) درهەمێکی پێ بدرێت و (خاوەنی درهەمەکەش) کاڵاییێك لە کاڵاکان ببات لەبری ئەوەی ماوەتەوە لە درهەمەکە، چونکە ئەو کەسەی بەشە درهەمە زیوەکەی لەسەرە بەشەکە دەدات و بەوەی دەشمێنێتەوە لە درهەمەکە کاڵاییێك دەبات، جا ئەوە کێشەی نییە.

١٨٩٦- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ عِنْدَ الرَّجُلِ دِرْهَمًا، ثُمَّ يَأْخُذُ مِنْهُ بِرُبُعٍ أَوْ بِثُلُثٍ أَوْ بِكِسْرٍ مَعْلُومٍ، سِلْعَةً مَعْلُومَةً، فَإِذَا لَمْ يَكُنْ فِي ذَلِكَ سِعْرٌ مَعْلُومٌ، وَقَالَ الرَّجُلُ: آخُذُ مِنْكَ بِسِعْرِ كُلِّ يَوْمٍ، فَهَذَا لاَ يَحِلُّ، لأَنَّهُ غَرَرٌ، يَقِلُّ مَرَّةً، وَيَكْثُرُ مَرَّةً، وَلَمْ يَفْتَرِقَا عَلَى بَيْعٍ مَعْلُومٍ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە بەوەی کەسێك درهەمێك لەلای کەسێك دابنێت، دواتر بای چواریەکی درهەمەکە یان سێیەکی یان بەشێکی دیکەی دیاریکراو کاڵاییێکی دیاریکراو بکڕێت (دروستە مادەم کاڵا و پارەکە دیاریکراو بێت)، جا ئەگەر نرخەکە دیاریکراو نەبوو و کەسەکە گوتی: کاڵات بەو درهەمە لێ دەکڕم بە نرخی هەر ڕۆژێك (واتە ئەو ڕۆژەی کاڵاکەت لێ دەکڕم بە بەشێك لە درهەمەکە کاڵاکە لەو ڕۆژەدا نرخی چەند بوو بەوەندە دەیبەم تا درهەمەکە تەواو دەبێت)، ئەوە حەڵاڵ نییە، چونکە نادیاری تیایە، جارێك (نرخەکە) کەم دەبێت، جارێك زیاد دەبێت، وە لەیەکدی جیا نەبوونەتەوە لەسەر مامەڵەیەکی دیاریکراو (بۆیە دروست نییە).

١٨٩٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ بَاعَ طَعَامًا جِزَافًا، وَلَمْ يَسْتَثْنِ مِنْهُ شَيْئًا، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ مِنْهُ شَيْئًا، فَإِنَّهُ لاَ يَصْلُحُ لَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ مِنْهُ شَيْئًا، إِلاَّ مَا كَانَ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مِنْهُ، وَذَلِكَ الثُّلُثُ فَمَا دُونَهُ، فَإِنْ زَادَ عَلَى الثُّلُثِ، صَارَ ذَلِكَ إِلَى الْمُزَابَنَةِ، وَإِلَى مَا يُكْرَهُ، فَلاَ يَنْبَغِي




لَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ مِنْهُ شَيْئًا إِلاَّ مَا كَانَ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مِنْهُ، وَلاَ يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَسْتَثْنِيَ مِنْهُ إِلاَّ الثُّلُثَ، فَمَا دُونَهُ، وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك خۆراکێکی بەگۆترە فرۆشت و هیچی لێ جیا نەکردەوە، دواتر پێی باش بوو هەندێکی بکڕێتەوە، ئەوە بۆی نییە هیچی لێ بکڕێتەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە مافی جیاکردنەوەی هەیە تیایدا، کە بریتییە لە سێیەك و کەمتر، جا ئەگەر زیاتری کرد لە سێیەك، ئەوە پەڕیوەتەوە بۆ مامەڵەی موزابەنە و ئەوەی کە ناپەسەندە، کەواتە بۆی نییە هیچی لێ بکڕێتەوە تەنها ئەوەندە نەبێت کە بۆی دروستە جیای بکاتەوە و هەڵاوێردنی بۆ بکات، وە بۆشی دروست نییە جیاکردنەوە و هەڵاوێردن بکات تەنها لە سێیەك و کەمتر نەبێت، جا ئەوە بابەتێکە لەلای ئێمە ڕاجیایی تیا نییە.

## ٢٤- قۆرخکاری و خۆمەڵاسدان بۆ گرانبوونی شت[2]

١٨٩٨- أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لاَ حُكْرَةَ فِي سُوقِنَا، لاَ يَعْمِدُ رِجَالٌ بِأَيْدِيهِمْ فُضُولٌ مِنْ أَذْهَابٍ إِلَى رِزْقٍ مِنْ رِزْقِ اللهِ نَزَلَ بِسَاحَتِنَا، فَيَحْتَازُونَهُ عَلَيْنَا، فَيَحْتَكِرُونَهُ، وَلَكِنْ أَيُّمَا جَالِبٍ جَلَبَ عَلَى عَمُودِ كَبِدِهِ فِي الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ، فَذَلِكَ ضَيْفُ عُمَرَ ﷺ، فَلْيَبِعْ كَيْفَ شَاءَ اللهُ، وَلْيُمْسِكْ كَيْفَ شَاءَ اللهُ[3].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوویەتی: قۆرخکاری لە بازاڕی ئێمەدا (ڕێپێدراو) نییە، کەسانێك نەکەن زێڕ و پارەی زیاد بدەن بە ڕزق و ڕۆزییەك لە ڕۆزییەکانی خوا ﷻ کە خستوویەتە ناومان و لەسەر ئێمە گلی بدەنەوە و قۆرخی بکەن، بەڵام هەر هاوردەکارێك بەماندووبوونی خۆی لە زستان و هاوین شتانێك هاوردە بکات، ئەوە میوانی عومەرە ﷺ، چۆن خوا دەیەوێت با بیفرۆشێت و چۆنیش

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٧ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ الْحُكْرَةُ وَالتَّرَبُّصِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٨ في البيوع، عن مالك به.

خوا دەیەوێت با بیگرێتەوە (واتە كاڵای ماندووبوونی خۆیەتی، چۆن دەیفرۆشێت با بیفرۆشێت، چونكە ئەگەر وا نەبێت خەڵك شت هاوردە ناكات).

١٨٩٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ مَرَّ بِحَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ، وَهُوَ يَبِيعُ زَبِيبًا لَهُ بِالسُّوقِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: إِمَّا أَنْ تَزِيدَ فِي السِّعْرِ، وَإِمَّا أَنْ تُرْفَعَ مِنْ سُوقِنَا[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بەلای حاتەبی كوڕی ئەبو بەلتەعەدا تێ پەڕی، لە كاتێكدا مێوژی خۆی لە بازاڕ (بە هەرزانتر) دەفرۆشت، جا عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ پێی گوت: یان نرخ زیاد بكە، یان لە بازاڕی ئێمە بڕۆ (چونكە دوكاندارەكانی خەڵكی بازاڕ زەرەر دەكەن و ناكۆكی دروست دەبێت، بۆیە دەبێ بە نرخێكی مەعقول بفرۆشرێت).

١٩٠٠- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ كَانَ يَنْهَى عَنِ الْحُكْرَةِ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە ئیمامی عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ قۆرخكاری قەدەغە كردووە.

## ٢٥- ئەوەی دروستە لە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ و قەرز تیایدا[٣]

١٩٠١- عَنْ حَسَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ بَاعَ جَمَلاً لَهُ، يُدْعَى عُصَيْفِيرًا، بِعِشْرِينَ بَعِيرًا إِلَى أَجَلٍ[٤].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٩٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٧ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٩ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٠ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ مَا يَجُوزُ مِنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ وَالسَّلَفِ فِيهِ.

(٤) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٨أفي البيوع؛ والشيباني: ٨٠٠ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٨٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلییەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ وشترێکی (مەزنی) خۆی کە پێی دەگوترا عوصەیفیر فرۆشتی بە بیست وشتری (بچووك) بەماوە.

١٩٠٢- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ اشْتَرَى رَاحِلَةً بِأَرْبَعَةِ أَبْعِرَةٍ مَضْمُونَةٍ عَلَيْهِ، يُوفِيهَا صَاحِبَهَا بِالرَّبَذَةِ(١).

واتە: لە نافیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ وشترێکی بە چوار وشتر کڕی بەوەی قەرز بێت لەسەری لە (گوندی) ڕەبزە بیاندات بە خاوەنەکەی.

١٩٠٣- عَنْ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ اثْنَيْنِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ(٢).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پرسیاری لە ئیبنو شیهاب کردووە دەربارەی کڕین و فرۆشتنی دوو ئاژەڵ بە یەك ئاژەڵ بەماوە (بەقەرز، بەوەی یەکێکیان دواتر ئاژەڵەکەی خۆی بدات بە بەرانبەرەکەی)، گوتوویەتی: کێشەی تیا نییە (دروستە).

١٩٠٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِالْجَمَلِ بِالْجَمَلِ مِثْلِهِ، وَزِيَادَةِ دَرَاهِمَ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ بَأْسَ بِالْجَمَلِ بِالْجَمَلِ مِثْلِهِ، وَزِيَادَةِ دَرَاهِمَ، الْجَمَلُ بِالْجَمَلِ يَدًا بِيَدٍ، وَالدَّرَاهِمُ إِلَى أَجَلٍ، قَالَ: وَلاَ خَيْرَ فِي الْجَمَلِ بِالْجَمَلِ مِثْلِهِ، وَزِيَادَةِ دَرَاهِمَ، الدَّرَاهِمُ نَقْدًا، وَالْجَمَلُ إِلَى أَجَلٍ، وَإِنْ أَخَّرْتَ الْجَمَلَ وَالدَّرَاهِمَ، فَلاَ خَيْرَ فِي ذَلِكَ أَيْضًا(٣).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی تیایە ئەوەیە: کێشە نییە لە فرۆشتنی وشتر بە وشتر وەکوو خۆی (لە ژمارەدا)

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٨ب في البيوع؛ والشيباني: ٨٠١ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٨١، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٨ج في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٥ في البيوع، عن مالك به.




لەگەڵ درهەم (و پارە)ش دەست بە دەست (واتە کەسێك وشترێك بفرۆشێت بە وشترێك و هەندێ پارە، دەست بە دەست)، وە کێشە نییە لە فرۆشتنی وشتر بە وشتری وەکوو خۆی (لە ژمارەدا) لەگەڵ هەندێ پارە، وشترەکان دەست بە دەست بن و پارەکە بۆ ماوەیەکی دیکە بێت (ئەوەیان دروستە)، وە گوتوویەتی: بەڵام هیچ چاکییێك نییە لە فرۆشتنی وشتر بە وشتری وەکوو خۆی و هەندێ پارە، پارەکەش کاش بێت و وشترەکە بۆ ماوەیەکی دیکە بێت (ئەوە دروست نییە)، وە ئەگەر وشتر و پارەکەشت دوا خست بۆ ماوەیەکی دیکە ئەوە دیسان چاکەی تیا نییە (و هەر دروست نییە).

**١٩٠٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ يَبْتَاعَ الْبَعِيرَ النَّجِيبَ بِالْبَعِيرَيْنِ، أَوْ الأَبْعِرَةِ مِنَ الْحَمُولَةِ مِنْ حَاشِيَةِ الإِبِلِ، وَإِنْ كَانَتْ مِنْ نَعَمٍ وَاحِدَةٍ، فَلاَ بَأْسَ أَنْ يُشْتَرَى مِنْهَا اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، إِذَا اخْتَلَفَتْ فَبَانَ اخْتِلاَفُهَا، وَإِنْ أَشْبَهَ بَعْضُهَا بَعْضًا، وَاخْتَلَفَتْ أَجْنَاسُهَا، أَوْ لَمْ تَخْتَلِفْ، فَلاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە لەوەی (کەسێك) وشترێکی چاك بە دوو وشتر یان چەند وشترێکی کەمسوودتر بکرێت، هەرچەندە لە یەك جۆریش بن هەر کێشەی تیا نییە (دروستە) بەوەی دوو دانە بکڕدرێن بە یەك دانە بەماوە، (بە مەرجێك) ئەگەر جیاواز بوون (لە ڕووی سوودەوە) و جیاوازییەکەیان ڕوون و ئاشکرا بوو، (بەڵام) ئەگەر لە یەکدی دەچوون (بەوەی لە سووددا وەکوو یەکدی بوون) جا جۆریان جیاواز بێ یان جیاواز نەبێ، ئەوە نابێ دوو دانەیان بە یەك دانە وەربگیرێ بەماوە.

**١٩٠٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ: أَنْ يُؤْخَذَ الْبَعِيرُ بِالْبَعِيرَيْنِ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا تَفَاضُلٌ فِي نَجَابَةٍ وَلاَ رِحْلَةٍ، فَإِذَا كَانَ هَذَا عَلَى مَا وَصَفْتُ لَكَ، فَلاَ يُشْتَرَى مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ تَبِيعَ مَا اشْتَرَيْتَ مِنْهَا، قَبْلَ أَنْ تَسْتَوْفِيَهُ مِنْ غَيْرِ الَّذِي اشْتَرَيْتَهُ مِنْهُ، إِذَا انْتَقَدْتَ ثَمَنَهُ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٧ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەوەی دروست نییە لەو بابەتە ئەوەیە: یەك وشتر بە دوو وشتر وەربگیرێن و جیاوازییان لە نێواندا نەبێ لە ڕووی چاکی و هەڵگرتنی بار و شتومەك، جا ئەگەر بەم شێوەیە بوو کە بۆم باس کردیت، ئەوە نابێ دوو دانەیان بە یەك دانە بکڕدرێت بەماوە، وە کێشە نییە لەوەی ئەو ئاژەڵە بفرۆشیتە کەسێکی جگە لەو کەسەی لێت کڕیوە بەر لەوەی وەریبگریت، (بە مەرجێك) ئەگەر پارەکەی کاش بوو (واتە ڕاستەوخۆ پارەکەت بەکاش دابوو).

**١٩٠٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ سَلَّفَ فِي شَيْءٍ مِنَ الْحَيَوَانِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَوَصَفَهُ، وَحَلاَّهُ، وَنَقَدَ ثَمَنَهُ، فَذَلِكَ جَائِزٌ، وَهُوَ لاَزِمٌ لِلْبَائِعِ وَالْمُبْتَاعِ عَلَى مَا وَصَفَا وَحَلَّيَا، وَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ مِنْ عَمَلِ النَّاسِ الْجَائِزِ بَيْنَهُمْ، وَالَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَهْلُ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك سەلەم لە هەر ئاژەڵێکدا بکات بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و (بەتەواوی) وەسفی ئاژەڵەکە بکات و پارەکە بەکاش بدات، ئەوە دروستە و (کڕین و فرۆشتنەکە) بۆ فرۆشیار و کڕیار لەسەر ئەو وەسفەی کردوویانە دادەمەزرێ، خەڵکی بەردەوام ئەوە کاری دروستیان بووە، زانایانی شارەکەشمان بەردەوام لەسەر ئەوە بوون (بەوەی فەتوایان داوە ئەو مامەڵەیە بەو شێوەیە دروستە).

## ٢٦- ئەوەی دروست نییە لە کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵدا[٢]

**١٩٠٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ، وَكَانَ بَيْعًا يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الْجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتَجَ الَّتِي فِي بَطْنِهَا[٣].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٠٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٩ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٧ في البيوع والتجارات والسلم؛ والبخاري: ٢١٤٣ في البيوع؛ والنسائي: ٤٦٢٥ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٤٧؛ وأبو يعلى الموصلي: ٥٨٢١؛ والقابسي: ٢٤٠، كلهم عن مالك به.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە كڕین و فرۆشتنی بێچووی ناو سك، كە جۆرە كڕین و فرۆشتنێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا، كەسی وا هەبوو وشتری دەكڕی تا دایكەكەی دەزێت، دواتر ئەوەش دەزێت كە لە سكی دایكەكەدایە (واتە فەرخەی ئەو فەرخەیان دەكڕی كە هێشتا لەدایك نەبووە! پێغەمبەری خواش ﷺ حەڕامی كرد).

**١٩٠٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لاَ رِبًا فِي الْحَيَوَانِ، وَإِنَّمَا نُهِيَ مِنَ الْحَيَوَانِ عَنْ ثَلاَثَةٍ: الْمَضَامِينِ، وَالْمَلاَقِيحِ، وَحَبَلِ الْحَبَلَةِ، فَالْمَضَامِينُ: مَا فِي بُطُونِ إِنَاثِ الإِبِلِ، وَالْمَلاَقِيحُ: مَا فِي ظُهُورِ الْجِمَالِ[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسویەبەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ئاژەڵ ڕیبای تیا نییە، بەڵام لە ئاژەڵدا نەهی لە سێ شت كراوە (واتە حەڕام كراون بەڵام ڕیبا نین، كە بریتین لەمانە): مەزامین و مەلاقیح و حەبەلی حەبەلە، جا مەزامین ئەو بێچووەیە كە لە ناو سكی ئاژەڵی مێدایە، مەلاقیحیش ئەو تۆوەیە كە لە پشتی ئاژەڵی نێردایە (حەبەلی حەبەلەش بێچووی بێچووە كە هێشتا نە خۆی و نە بێچووەكە لەدایك نەبووە، ئەو سێ مامەڵەیە حەڕامن).

**١٩١٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي أَنْ يَشْتَرِيَ أَحَدٌ شَيْئًا مِنَ الْحَيَوَانِ بِعَيْنِهِ، إِذَا كَانَ غَائِبًا عَنْهُ، وَإِنْ كَانَ قَدْ رَآهُ وَرَضِيَهُ عَلَى أَنْ يَنْقُدَ ثَمَنَهُ لاَ قَرِيبًا وَلاَ بَعِيدًا.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بۆ كەس نییە هیچ ئاژەڵێكی دیاریكراو بكڕێت ئەگەر لێی غائیب بوو (لە شوێنێكی دیكە بوو)، هەرچەندە بینیبێتی و پێی ڕازی بوبێت و پارەكەشی بەكاش دابێت، (ئاژەڵە غائیبەكە) چ نزیك بێت یان دوور بێت (هەر دروست نییە، مادەم لەوێ نییە).

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٩أ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٦ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

**١٩١١- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا كُرِهَ ذَلِكَ، لأَنَّ الْبَائِعَ يَنْتَفِعُ بِالثَّمَنِ، وَلاَ يُدْرَى هَلْ تُوجَدُ تِلْكَ السِّلْعَةُ عَلَى مَا رَآهَا الْمُبْتَاعُ أَمْ لاَ؟ فَلِذَلِكَ كُرِهَ ذَلِكَ، وَلاَ بَأْسَ بِهِ، إِذَا كَانَ مَضْمُونًا مَوْصُوفًا**[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو (جۆرە مامەڵەیە) بۆیە حەڕام كراوە، چونكە فرۆشیار سوود لە پارەكە وەردەگرێت و بەكاری دەهێنێت، لە كاتێكدا نازانرێت ئایا ئەو كاڵایە بەو شێوەیە بەردەست دەبێت كە كڕیار بینیویەتی؟ لەبەر ئەوە حەڕام كراوە، (بەڵام) كێشە نییە ئەگەر وەسف كرابێت و لە ئەستۆ گیرابێت (واتە فرۆشیار لەجیاتی ئەوەی ئاژەڵەكە بەدیاریكراوی باس بكات، با بڵێت: من وشترێكت بۆ دێنم ئاوا و ئاوا بێت، چونكە ئەگەر ئەو وشترەش نەمێنێت یەكێكی دیكەی ئاوای بۆ پەیدا دەكات).

## ٢٧- كڕین و فرۆشتنی ئاژەڵی زیندوو بە گۆشت[٢]

**١٩١٢-عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِاللَّحْمِ**[٣].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە كڕین و فرۆشتنی ئاژەڵی زیندوو بە گۆشت (واتە حەڕامی كردووە ئاژەڵ بە گۆشت بگۆڕدرێتەوە).

**١٩١٣-عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ يَقُولُ: مِنْ مَيْسِرِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، بَيْعُ الْحَيَوَانِ بِاللَّحْمِ بِالشَّاةِ وَالشَّاتَيْنِ**[٤].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١١ في البيوع؛ وفي: ٢٦١٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ بَيْعُ الْحَيَوَانِ بِاللَّحْمِ.

(٣) ـ حسن لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٠ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٣ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

(٤) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٠أفي البيوع؛ والشيباني: ٧٨٢ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

واتە: لە داودی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ بووە دەیگوت: یەکێك لە قومارەکانی خەڵکی سەردەمی نەفامی بریتی بوو لە کڕین و فرۆشتنی گۆشت بە بزنێك و دوو بزن.

١٩١٤- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: نُهِيَ عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِاللَّحْمِ.

قَالَ أَبُو الزِّنَادِ ﷺ: فَقُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً اشْتَرَى شَارِفًا بِعَشْرِ شِيَاهٍ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: إِنْ كَانَ اشْتَرَاهَا لِيَنْحَرَهَا، فَلاَ خَيْرَ فِي ذَلِكَ.

قَالَ أَبُو الزِّنَادِ ﷺ: وَكُلُّ مَنْ أَدْرَكْتُ مِنَ النَّاسِ يَنْهَوْنَ عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِاللَّحْمِ.

قَالَ أَبُو الزِّنَادِ ﷺ: وَكَانَ ذَلِكَ يُكْتَبُ فِي عُهُودِ الْعُمَّالِ، فِي زَمَانِ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، وَهِشَامِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ يَنْهَوْنَ عَنْ ذَلِكَ[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی دەیگوت: نەهی کراوە لە کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵ بە گۆشت.

ئەبو زیناد ﷺ دەڵێت: منیش بە سەعیدی کوڕی موسەیەبم گوت: ئەی چی دەڵێی دەربارەی کەسێك وشترێك بە دە بزن و مەڕ دەکڕێت؟ سەعید ﷺ گوتی: ئەگەر دەیکڕێ بۆ ئەوەی سەری ببڕێت، ئەوە هیچ چاکەی تێدا نییە (واتە دروست نییە و دەکا گۆشتی بە ئاژەڵ کڕیوە).

ئەبو زیناد ﷺ گوتوویەتی: گەیشتبم بە هەر کەسێك (لە زانایان) نەهییان کردووە لە کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵ بە گۆشت (واتە حەڕامیان کردووە).

ئەبو زیناد ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتە لە سەردەمی ئەبانی کوڕی عوسمان و هیشامی کوڕی ئیسماعیل بۆ فەرمانبەرەکان دەنووسرا و نەهییان لێ دەکرد لەو بابەتە.

---

(١) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١٥ في البيوع؛ وفي: ٢٦١٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٠ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٨١ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

## ٢٨- كڕین و فرۆشتنی گۆشت بە گۆشت[١]

**١٩١٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي لَحْمِ الإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْوُحُوشِ، أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَى بَعْضُهُ بِبَعْضٍ، إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَزْنًا بِوَزْنٍ، يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ بَأْسَ بِهِ وَإِنْ لَمْ يُوزَنْ، إِذَا تَحَرَّى أَنْ يَكُونَ مِثْلاً بِمِثْلٍ يَدًا بِيَدٍ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە كۆدەنگی لەسەرە دەربارەی گۆشتی وشتر و مانگا و مەڕ و بزن و هاوشێوەكانیان لە ئاژەڵان، ئەوەیە: نابێ هەندێك بە هەندێكی دیكە مامەڵەیان پێوە بكرێت حەتمەن دەبێ وەكوو یەكدی بن و كێشیان وەكوو یەكدی بێت و دەست بە دەست بێت، وە كێشەی تیا نییە ئەگەر نەشكێشرێت ئەگەر بەباشی هەوڵ درا وەكوو یەكدی بێت و دەست بە دەست بێت.

**١٩١٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِلَحْمِ الْحِيتَانِ، بِلَحْمِ الإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ مِنَ الْوُحُوشِ كُلِّهَا، اثْنَيْنِ بِوَاحِدٍ، وَأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ يَدًا بِيَدٍ، فَإِنْ دَخَلَ ذَلِكَ الأَجَلُ، فَلاَ خَيْرَ فِيهِ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كێشە نییە لە فرۆشتنی گۆشتی ماسی بە گۆشتی وشتر یان مانگا یان مەڕ و بزن و گشت هاوشێوەكانی لە ئاژەڵان، دوو دانە بە یەك دانە، زیاتریش لەوە، دەست بە دەست، جا ئەگەر ماوەی كەوتە ناو ئەوە هیچ چاكەیەكی تیا نییە (دروست نییە).

**١٩١٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَأَرَى لُحُومَ الطَّيْرِ كُلَّهَا مُخَالِفَةً لِلُحُومِ الأَنْعَامِ، وَالْحِيتَانِ، فَلاَ أَرَى بَأْسًا بِأَنْ يُشْتَرَى بَعْضُ ذَلِكَ بِبَعْضٍ مُتَفَاضِلاً يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ يُبَاعُ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ إِلَى أَجَلٍ[٤].

---

(١) ـ بَيْعُ اللَّحْمِ بِاللَّحْمِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦١٩ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٠ في البيوع، عن مالك به.

(٤) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢١ في البيوع، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پێم وایە گۆشتی گشت باڵندەیەك جیاوازە لەگەڵ گۆشتی ئاژەڵ و ماسی، بۆیە نابینم کێشە هەبێت بەوەی دەست بە دەست بەیەکدی بفرۆشرێن با یەکێکیشیان زیاتر بێت، (بەڵام) نابێ هیچێك لەوانە بەماوە بفرۆشرێت.

## ٢٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی پارەی سەگ[1]

١٩١٨- عن أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ[2].

يَعْنِي بِمَهْرِ الْبَغِيِّ: مَا تُعْطَاهُ الْمَرْأَةُ عَلَى الزِّنَا، وَحُلْوَانُ الْكَاهِنِ رَشْوَتُهُ، وَمَا يُعْطَى عَلَى أَنْ يَتَكَهَّنَ.

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصارییەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە پارەی سەگ و پارەی ئافرەتی زیناکار و پارەی کەسی کاهین و فاڵچی (واتە ئەمانە پارەکانیان حەڕام و پیسە).

(مَهْرُ الْبَغِيّ) واتە: ئەوەی ئافرەت پێی دەدرێت لەسەر زینا، (حُلْوَانُ الْكَاهِن)یش واتە: ئەوەی دەدرێت بە فاڵچی لەسەر ئەوەی فاڵ بکات و هەواڵی غەیب بدات (کە درۆیە و نایزانێ و کاری لەگەڵ شەیتانە).

١٩١٩- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: أَكْرَهُ ثَمَنَ الْكَلْبِ الضَّارِي وَغَيْرِ الضَّارِي، لِنَهْيِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ[3].

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي ثَمَنِ الْكَلْبِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥١ في البيوع؛ والشافعي: ٦٨٢؛ وفي: ١٠٧٧؛ والبخاري: ٢٢٣٧ في البيوع عن طريق عبد الله بن يوسف، وفي: ٢٢٨٢ في الإجارة؛ ومسلم: المساقاة: ٣٩؛ والقابسي: ٥٧، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥١ في البيوع؛ والشافعي: ٦٨٢؛ وفي: ١٠٧٧؛ والبخاري: ٢٢٣٧ في البيوع عن طريق عبد الله بن يوسف، وفي: ٢٢٨٢ في الإجارة؛ ومسلم: المساقاة: ٣٩؛ والقابسي: ٥٧، كلهم عن مالك به.




(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: پارەی سەگی ڕاو و سەگی غەیری ڕاو بە حەڕام دەزانم، لەبەر نەهیکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پارەی سەگ (بەڕەهایی).

## ٣٠- قەرز و کڕین و فرۆشتنی کاڵا بە کاڵا[١]

**١٩٢٠**- عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعٍ وَسَلَفٍ[٢].

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە فرۆشتن و قەرز بەیەکەوە (وەك بڵێت: ئەو شتەت بەوەندە پێ دەفرۆشم وە دەبێ تۆش ئەوەندە پارەم بەقەرز بدەیتێ).

**١٩٢١**- قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: آخُذُ سِلْعَتَكَ بِكَذَا وَكَذَا، عَلَى أَنْ تُسْلِفَنِي كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ عَقَدَا بَيْعَهُمَا عَلَى هَذَا، فَهُوَ غَيْرُ جَائِزٍ، فَإِنْ تَرَكَ الَّذِي اشْتَرَطَ السَّلَفَ، مَا اشْتَرَطَ مِنْهُ، كَانَ ذَلِكَ الْبَيْعُ جَائِزاً[٣].

واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە ئەوەیە: کەسێك بە کەسێك بڵێت: کاڵاکەی تۆ دەبەم بەوەندە و بەوەندە، لەسەر ئەوەی فڵانە شت و فڵانە شتم بەقەرز پێ بفرۆشیت، جا ئەگەر کڕین و فرۆشتنەکەیان لەسەر ئەو مەرجە ئەنجام دا، ئەوە دروست نییە، جا ئەگەر وازیان لە مەرجی قەرزەکە هێنا کە دایاننابوو، ئەوە کڕین و فرۆشتنەکە دروستە.

**١٩٢٢**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُشْتَرَى الثَّوْبُ مِنَ الْكَتَّانِ أَوِ الشَّطَوِيِّ أَوِ الْقَصَبِيِّ بِالأَثْوَابِ مِنَ الإِتْرِيبِيِّ، أَوِ الْقَسِّيِّ أَوِ الزِّيقَةِ، أَوِ الثَّوْبِ الْهَرَوِيِّ أَوِ الْمَرْوِيِّ بِالْمَلاَحِفِ الْيَمَانِيَّةِ، وَالشَّقَائِقِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، الْوَاحِدُ بِالاثْنَيْنِ أَوِ الثَّلاَثَةِ يَدًا بِيَدٍ، أَوْ إِلَى أَجَلٍ، وَإِنْ كَانَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ، فَإِنْ دَخَلَ فِي ذَلِكَ نَسِيئَةٌ، فَلاَ خَيْرَ فِيهِ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَصْلُحُ حَتَّى يَخْتَلِفَ فَيَبِينَ اخْتِلاَفُهُ، فَإِذَا أَشْبَهَ بَعْضُ ذَلِكَ بَعْضًا، وَإِنِ اخْتَلَفَتْ أَسْمَاؤُهُ، فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ اثْنَيْنِ

---

(١) ـ السَّلَفِ وَبَيْعِ الْعُرُوضِ بَعْضِهَا بِبَعْضٍ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٤ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٥ في البيوع، عن مالك به.



بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، وَذَلِكَ أَنْ يَأْخُذَ الثَّوْبَيْنِ مِنَ الْهَرَوِيِّ، بِالثَّوْبِ مِنَ الْمَرْوِيِّ أَوِ الْقُوهِيِّ إِلَى أَجَلٍ، أَوْ يَأْخُذَ الثَّوْبَيْنِ مِنَ الْفُرْقُبِيِّ بِالثَّوْبِ مِنَ الشَّطَوِيِّ فَإِذَا كَانَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ عَلَى هَذِهِ الصِّفَةِ، فَلاَ يُشْتَرَى مِنْهَا اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ.

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە لەوەی یەك پۆشاکی کەتان یان شەتەوی یان قەصەبی (کە سێ جۆری چاکن) بکڕدرێن بە چەندین پۆشاکی ئیتریبی و قەسسی و زیقە (کە جۆری باش نین)، یان پۆشاکی هەرەوی یان مەڕوی بە چەندین ڕۆب و خاولی یەمەنی و بێجامەی خراپ و هاوشێوەی ئەوانە بدرێت، یەك دانە بە دوو یان سێ دانە بە دەست بە دەست یان بەماوە، وە ئەگەر لە یەك جۆر بن و ماوەی کەوتە ناو ئەوە هیچ چاکەیەکی تیا نییە (حەڕامە)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: دروست نییە هەتاوەکوو جیاوازییەکەیان بەڕوونی دەرنەکەوێ، جا ئەگەر لە یەکدی چوون هەرچەندە ناویشیان جیاواز بێت، نابێ دوو دانە بە یەك دانە وەربگرێت بەماوە، وەك ئەوەی دوو پۆشاکی هەرەوی لە بەرانبەر یەك پۆشاکی مەڕوی یان قوهی وەربگرێت بەماوە، یان دوو پۆشاکی فورقوبی بەرانبەر یەك پۆشاکی شەتەوی وەربگرێت، جا ئەگەر ئەو جۆرانە بەم شێوەیە بوون (کە جۆرەکانیان زۆر لێك نزیکن)، ئەوە نابێ دوو دانە بەرانبەر یەك دانە وەربگیرێت بەماوە (بەوەی یەکێکیان دوا بخرێت).

**١٩٢٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ أَنْ تَبِيعَ مَا اشْتَرَيْتَ مِنْهَا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَسْتَوْفِيَهُ، مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهِ الَّذِي اشْتَرَيْتَهُ مِنْهُ، إِذَا انْتَقَدْتَ ثَمَنَهُ[1].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کێشە نییە لەو شتانەی کە پێشتر باس کرا (لە پۆشاك) کە کڕیوتە بەوەی بیفرۆشیتەوە کەسێکی جگە لەو کەسەی لێت کڕیوە بەر لەوەی وەریبگریت، (بە مەرجێك) ئەگەر پارەکەی کاش بوو (واتە ڕاستەوخۆ پارەکەت بەنەقد و کاش دابوو).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٤٧٣ في البيوع؛ وفي: ٢٦٢٧ في البيوع، عن مالك به.

## ٣١- سەلەم لە کاڵادا[١]

**١٩٢٤-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﵀، أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﵄، وَرَجُلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ رَجُلٍ سَلَّفَ فِي سَبَائِبَ فَأَرَادَ بَيْعَهَا قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَهَا؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﵄: تِلْكَ الْوَرِقُ بِالْوَرِقِ، وَكَرِهَ ذَلِكَ[٢].

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ بوو لە کاتێکدا پیاوێك پرسیاری لێ دەکرد دەربارەی کەسێك سەلەم بکات لە سەبیبە (کە جۆرە پۆشاکێکی تەنکە)، جا بیەوێ بیانفرۆشێتەوە بەر لەوەی وەریان بگرێت (ئایا دروستە)؟ ئیبنو عەبباس ﵄ گوتی: ئەوە فرۆشتنی زیو بە زیوە (واتە کەسەکە فرۆشتویەتە هەمان کەس، مەبەست بە مامەڵەکەش فرۆشتنی پۆشاکەکە نەبووە، بەڵکوو ویستوویانە پارەی زیادە وەربگرن و بە فێڵی فرۆشتنی پۆشاکەکە و دەستاودەستپێکردنی).

**١٩٢٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَذَلِكَ فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، أَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يَبِيعَهَا مِنْ صَاحِبِهَا الَّذِي اشْتَرَاهَا مِنْهُ، بِأَكْثَرَ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي ابْتَاعَهَا بِهِ، وَلَوْ أَنَّهُ بَاعَهَا مِنْ غَيْرِ الَّذِي اشْتَرَاهَا مِنْهُ، لَمْ يَكُنْ بِذَلِكَ بَأْسٌ[٣].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوەی ئێمە تێی دەگەین ـ والله أعلم ـ (لەو فەرموودەی پێشتردا) ئەوەیە: کەسەکە ویستوویەتی پۆشاکەکە بفرۆشێتە هەمان ئەو خاوەنەی کە لێی کڕیوە، بە نرخێکی زیاتر لەوەی پێی کڕیوە (نادروستییەکە لێرەیە)، (بەڵام) ئەگەر بیفرۆشتبا بە کەسێکی جگە لەو کەسەی کە لێی کڕیوە، ئەوە کێشە نەبوو (دروست بوو).

**١٩٢٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا، فِيمَنْ سَلَّفَ فِي رَقِيقٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ أَوْ عُرُوضٍ، فَإِذَا كَانَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ مَوْصُوفًا، فَسَلَّفَ فِيهِ إِلَى أَجَلٍ، فَحَلَّ الأَجَلُ، فَإِنَّ

---

(١) ـ السُّلْفَةُ فِي الْعُرُوضِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري، ٢٦٢٨ في البيوع؛ والحدثاني، ٢٥١أفي البيوع، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٢٩ في البيوع؛ والشافعي: ١١١٤، عن مالك به.




الْمُشْتَرِيَ لاَ يَبِيعُ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ مِن الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْهُ، بِأَكْثَرَ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي سَلَّفَهُ فِيهِ، قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَ مَا سَلَّفَهُ فِيهِ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا فَعَلَهُ فَهُوَ الرِّبَا، صَارَ الْمُشْتَرِي إِنْ أَعْطَى الَّذِي بَاعَهُ دَنَانِيرَ أَوْ دَرَاهِمَ، فَانْتَفَعَ بِهَا، فَلَمَّا حَلَّتْ عَلَيْهِ السِّلْعَةُ وَلَمْ يَقْبِضْهَا الْمُشْتَرِي، بَاعَهَا مِنْ صَاحِبِهَا بِأَكْثَرَ مِمَّا سَلَّفَهُ فِيهَا، فَصَارَ أَنْ رَدَّ إِلَيْهِ مَا سَلَّفَهُ وَزَادَهُ مِنْ عِنْدِهِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی ئەو کەسەی کۆیلەیەك یان وڵاغێك یان کاڵایێك بەقەرز دەکڕێت، ئەگەر ئەو شتانە وەسفکراو بوون و بەقەرز کڕینی، جا کە ساتی دانی پارەکە هات، ئەوە نابێ کڕیارەکە هیچ شتێك لەمانە بەو کەسە بفرۆشێت کە لێی کڕیوە بە زیاتر لەو پارەیەی بەقەرز پێی کڕیوە بەر لەوەی ئەو شتە وەربگرێت کە بەقەرز کڕیویەتی، چونکە ئەگەر وا بکات ئەوە ڕیبایە، وای لێ دێ کڕیارەکە ئەگەر دینار یان درهەم بدات بەو کەسەی فرۆشتوویەتی و کەسەکە سوود لە پارەکان وەرگرێت، جا کە کاتی تەسلیمکردنی کاڵاکە هات و کڕیارەکە وەرینەگرت و بە زیاتر فرۆشتیەوە بە هاوەڵەکەی، ئەوە دەکا ئەو پارەی بۆ گەڕاوەتەوە کە قەرزی پێ ئەنجام دابوو لەگەڵ ئەوە زیادەشی خستۆتە سەر (کەواتە هەمان کاڵای فرۆشتەوە بە زیاتر لەوەی بەقەرز پێی کڕیوە بەر لەوەی وەریبگرێت، ئەوەش ڕیبایە و حەڕامە).

**١٩٢٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنْ سَلَّفَ ذَهَبًا أَوْ وَرِقًا فِي حَيَوَانٍ أَوْ عَرْضٍ، إِذَا كَانَ مَوْصُوفًا إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، ثُمَّ حَلَّ الأَجَلُ، فَإِنَّهُ لاَ بَأْسَ أَنْ يَبِيعَ الْمُشْتَرِي تِلْكَ السِّلْعَةَ مِنَ الْبَائِعِ، قَبْلَ أَنْ يَحِلَّ الأَجَلُ وَبَعْدَ مَا يَحِلُّ بِعَرْضٍ مِنَ الْعُرُوضِ يُعَجِّلُهُ، وَلاَ يُؤَخِّرُهُ، بَالِغًا مَا بَلَغَ ذَلِكَ الْعَرْضُ، إِلاَّ الطَّعَامَ، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ أَنْ يَبِيعَهُ حَتَّى يَقْبِضَهُ، وَلِلْمُشْتَرِي أَنْ يَبِيعَ تِلْكَ السِّلْعَةَ مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهِ الَّذِي ابْتَاعَهَا مِنْهُ، بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، أَوْ عَرْضٍ مِنَ الْعُرُوضِ، يَقْبِضُ ذَلِكَ وَلاَ يُؤَخِّرُهُ، لأَنَّهُ إِذَا أَخَّرَ ذَلِكَ قَبُحَ، وَدَخَلَهُ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْكَالِئِ بِالْكَالِئِ، وَالْكَالِئُ بِالْكَالِئِ: أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ دَيْنًا لَهُ عَلَى رَجُلٍ بِدَيْنٍ عَلَى رَجُلٍ آخَرَ[2].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٠ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣١ في البيوع، عن مالك به.



(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك پێشەکی زێڕ یان زیو بۆ ئاژەڵێك یان کاڵایێك بدات، ئەگەر (ئاژەڵ و کاڵایەکە) وەسفکراو بێت بۆ کاتێکی دیاریکراو، دواتر کاتەکە بێت، ئەوە کێشە نییە، بەر لەوەی کاتەکەی بێت یان دوای هاتنی کاتەکەی کڕیارەکە ئەو کاڵایە بە هەر کاڵایێك لە کاڵاکان بفرۆشێتەوە فرۆشیارەکە کە ڕاستەوخۆ بیدات و دوا نەخات، جا کاڵایەکە بگاتە هەر چەندێك (هەر دروستە)، تەنها خواردن نەبێت، حەڵاڵ و دروست نییە بیفرۆشێت تا وەریدەگرێت، وە بۆ کڕیارەکە دروستە ئەو کاڵایە بە زێڕ یان زیو یان بە کاڵایێك لە کاڵاکان بفرۆشێتە جگە لەو کەسەی لێی کڕیوە (بە مەرجێك) ڕاستەوخۆ وەریبگرێت و دوای نەخات و تاخیری نەکات، چونکە ئەگەر دوای خست ناڕەوایە و ئەوەی دەکەوێتە ناو کە بە ناپەسەند و نادروست داندراوە و نەهی لێ کراوە کە بریتییە لە (فرۆشتنی) قەرز بە قەرز، جا فرۆشتنی قەرز بە قەرزیش ئەوەیە: کەسێك قەرزی خۆی کە لەسەر کەسێکە بیفرۆشێت بە قەرزێکی دیکە کە لەسەر کەسێکی دیکەیە.

**١٩٢٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنْ سَلَّفَ فِي سِلْعَةٍ إِلَى أَجَلٍ، وَتِلْكَ السِّلْعَةُ مِمَّا لاَ يُؤْكَلُ، وَلاَ يُشْرَبُ، فَإِنَّ الْمُشْتَرِيَ يَبِيعُهَا مِمَّنْ شَاءَ، بِنَقْدٍ أَوْ عَرْضٍ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوْفِيَهَا مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهَا الَّذِي اشْتَرَاهَا مِنْهُ، وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَبِيعَهَا مِنَ الَّذِي ابْتَاعَهَا مِنْهُ، إِلاَّ بِعَرْضٍ يَقْبِضُهُ وَلاَ يُؤَخِّرُهُ، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ كَانَتِ السِّلْعَةُ لَمْ تَحِلَّ فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يَبِيعَهَا مِنْ صَاحِبِهَا بِعَرْضٍ مُخَالِفٍ لَهَا، بَيِّنٍ خِلاَفُهُ يَقْبِضُهُ وَلاَ يُؤَخِّرُهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك بەسەلەم پێشەکی پارەی کاڵایێك بدات بۆ ئەوەی ماوەیەکی دیکە کاڵایەکە وەربگرێت، کاڵایەکە لەو شتانە بوو کە ناخورێ و ناخورێتەوە، ئەوە کڕیارەکە بۆی هەیە بەر لەوەی وەریبگرێت بیفرۆشێتەوە هەر کەسێك کە بیەوێت جگە لەو کەسەی کە لێی کڕیوە، بە پارەی نەقد بێت یان بە کاڵایێکی بدات (هەر بۆی دروستە)، (بەڵام) بۆی نییە بیفرۆشێتەوە ئەو کەسەی لێی کڕیوە تەنها بە کاڵایێك نەبێت کە ڕاستەوخۆ وەریبگرێت و دوای

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٢ في البيوع، عن مالك به.




نەخات (بەڵام بە پارە دروست نییە)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر کاڵایەکە کاتی تەسلیمکردنی نەهاتبوو، ئەوە کێشە نییە بیفرۆشێتەوە خاوەنەکەی بە کاڵایێکی دیکە (جیاواز لەو کاڵایە)، جیاوازییەکەیان ڕوون بێت و ڕاستەوخۆ وەریبگرێت و دوای نەخات.

**١٩٢٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِيمَنْ سَلَّفَ دَنَانِيرَ أَوْ دَرَاهِمَ، فِي أَرْبَعَةِ أَثْوَابٍ مَوْصُوفَةٍ إِلَى أَجَلٍ، فَلَمَّا حَلَّ الأَجَلُ، تَقَاضَى صَاحِبَهَا، فَلَمْ يَجِدْهَا عِنْدَهُ، وَوَجَدَ عِنْدَهُ ثِيَابًا دُونَهَا مِنْ صِنْفِهَا، فَقَالَ لَهُ الَّذِي عَلَيْهِ الأَثْوَابُ: أُعْطِيكَ بِهَا ثَمَانِيَةَ أَثْوَابٍ مِنْ ثِيَابِي هَذِهِ، إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، إِذَا أَخَذَ تِلْكَ الأَثْوَابَ الَّتِي يُعْطِيهِ قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا، قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَإِنْ دَخَلَ ذَلِكَ الأَجَلُ، فَإِنَّهُ لاَ يَصْلُحُ، وَإِنْ كَانَ ذَلِكَ قَبْلَ مَحِلِّ الأَجَلِ، فَإِنَّهُ لاَ يَصْلُحُ أَيْضًا، إِلاَّ أَنْ يَبِيعَهُ ثِيَابًا لَيْسَتْ مِنْ صِنْفِ الثِّيَابِ الَّتِي سَلَّفَهُ فِيهَا[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك دینار یان درهەم پێشەکی بەسەلەم بدات بۆ کڕینی چوار پۆشاکی وەسفکراو بۆ کاتێکی دیاریکراو، جا کاتێ کاتەکە هات خاوەنی پۆشاکەکە (کە کڕیارەکەیە) بێت وەریبگرێت و لەلای نەبێت و نەیبێت، جا پۆشاکی دیکەی لەلا دەست بکەوێت کە کەمنرختر و کوالێتی کەمتر بێت لە هەمان جۆر، جا ئەو کەسەی پۆشاکەکەی لەسەرە (کە دەبێ بیدات) پێی بڵێت: لە بری چوار پۆشاکەکە هەشت پۆشاکت لەوە دەدەمێ، ئیمامی (مالیك ﷺ) گوتوویەتی: ئەوە کێشەی تیا نییە، (بە مەرجێك) ئەگەر ئەو پۆشاکانە کە پێی دەدات وەریبگرێت بەر لەوەی جیا ببنەوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ئەگەر ماوەی کەوتە ناو، ئەوە نابێت و دروست نییە (جا ئەوە باسی ئەوە بوو ئەگەر کاتەکەی هاتبوو)، وە ئەگەر ئەوە ڕووی دا بەر لەوەی کاتەکەی بێت، ئەوە دیسان نابێت و دروست نییە، تەنها ئەوە نەبێت پۆشاکێکی دیکەی پێ بفرۆشێت لەو جۆرە پۆشاکە نەبێت کە سەلەمی تیا کردووە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٣ في البيوع، عن مالك به.

## ٣٢- کڕین و فرۆشتنی مس و ئاسن و هاوشێوەکانیان لەوانەی دەکێشرێن[١]

**١٩٣٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَا كَانَ مِمَّا يُوزَنُ مِنْ غَيْرِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، مِنَ النُّحَاسِ، وَالشَّبَهِ، وَالرَّصَاصِ، وَالآنُكِ، وَالْحَدِيدِ، وَالْقَضْبِ، وَالتِّينِ، وَالْكُرْسُفِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، مِمَّا يُوزَنُ، فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُؤْخَذَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُؤْخَذَ رِطْلُ حَدِيدٍ بِرِطْلَيْ حَدِيدٍ، وَرِطْلُ صُفْرٍ بِرِطْلَيْ صُفْرٍ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو شتانەی دەکێشرێن جگە لە زێڕ و زیو، وەك: مس و مسی زەرد و قوڕقشم و قوڕقوشمی ڕەش و سەوزە و هەنجیر و لۆکە و هاوشێوەکانیان لەوانەی دەکێشرێن، کێشە نییە لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت لە یەك جۆردا (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، وە کێشە نییە لەوەی یەك ڕتڵ ئاسن بە دوو ڕتڵ ئاسن وەربگیرێت، وە یەك ڕتڵ سفر بە دوو ڕتڵ سفر وەربگیرێت.

**١٩٣١-[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ خَيْرَ فِيهِ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، فَإِذَا اخْتَلَفَ الصِّنْفَانِ مِنْ ذَلِكَ، فَبَانَ اخْتِلاَفُهُمَا، فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، فَإِنْ كَانَ الصِّنْفُ مِنْهُ يُشْبِهُ الصِّنْفَ الآخَرَ، وَإِنِ اخْتَلَفَا فِي الاِسْمِ مِثْلُ الرَّصَاصِ، وَالآنُكِ، وَالشَّبَهِ، وَالصُّفْرِ، فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ[٣].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (بەڵام) چاکە و دروستی لەوەدا نییە دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت بەماوە (بەوەی دەست بە دەست نەبێت، یەکێکیان دوا بخرێت)، جا ئەگەر جۆرەکەیان جیاواز بوو و جیاوازییەکە بەڕوونی دەردەکەوت، ئەوە کێشە نییە لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت بەماوە، جا ئەگەر جۆرێکیان لە جۆرەکەی دیکە دەچوو (هەمان کانزا و مەواد بوو) هەرچەندە

---

(١) ـ بَيْعُ النُّحَاسِ وَالْحَدِيدِ وَمَا أَشْبَهَهُمَا مِماَ يُوزَنُ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٤ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٥ في البيوع، عن مالك به.

ناویشیان جیاواز بێت وەك: قورقوشم و قورقوشمی ڕەش و مسی زەرد و سفر، ئەوە من پێم ناپەسەندە و بە نادروستی دەزانم لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت.

**١٩٣٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَا اشْتَرَيْتَ مِنْ هَذِهِ الأَصْنَافِ كُلِّهَا، فَلاَ بَأْسَ أَنْ تَبِيعَهُ قَبْلَ أَنْ تَقْبِضَهُ مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهِ الَّذِي اشْتَرَيْتَهُ مِنْهُ، إِذَا قَبَضْتَ ثَمَنَهُ، إِذَا كُنْتَ اشْتَرَيْتَهُ كَيْلاً أَوْ وَزْنًا، فَإِنِ اشْتَرَيْتَهُ جِزَافًا، فَبِعْهُ مِنْ غَيْرِ الَّذِي اشْتَرَيْتَهُ، بِنَقْدٍ أَوْ إِلَى أَجَلٍ، وَذَلِكَ أَنَّ ضَمَانَهُ مِنْكَ إِذَا اشْتَرَيْتَهُ جِزَافًا، وَلاَ يَكُونُ ضَمَانُهُ مِنْكَ، إِذَا اشْتَرَيْتَهُ وَزْنًا حَتَّى تَزِنَهُ وَتَسْتَوْفِيَهُ، وَهَذَا أَحَبُّ مَا سَمِعْتُ إِلَيَّ فِي هَذِهِ الأَشْيَاءِ كُلِّهَا، وَهُوَ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ أَمْرُ النَّاسِ عِنْدَنَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەوەی دەیکڕیت لە گشت ئەو جۆرە شتانە، ئەوە کێشە نییە لەوەی بەر لەوەی وەریبگریت بیفرۆشیتەوە بە جگە لەو کەسەی لێت کڕیوە، (بە مەرجێك) ئەگەر ڕاستەوخۆ و بێ دواخستن پارەکە وەربگریت، ئەوە ئەگەر بەپێوان و کێشان کڕیبێتت، وە ئەگەر بەگۆترە کڕیبێتت، ئەوە بۆت هەیە بیفرۆشیتە جگە لەو کەسەی لێت کڕیوە، جا بەنەقد و کاش بێت یان بەماوە (هەر دروستە)، ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە زەمانەتەکەی دەبێتە هی تۆ ئەگەر بەگۆترە بیکڕیت، بەڵام زەمانەتەکە نابێتە هی تۆ ئەگەر بەکێشان بیکڕیت تا دەیکێشیت و وەریدەگریت، جا ئەوە خۆشەویستترین و چاکترینی ئەوەیە کە گوێبیستی بووم دەربارەی گشت ئەو شتانە، وە لەلای ئێمە بەردەوام کاروباری خەڵکی لەسەر ئەوە ڕۆیشتووە.

**١٩٣٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِيمَا يُكَالُ أَوْ يُوزَنُ مِمَّا لاَ يُؤْكَلُ وَلاَ يُشْرَبُ مِثْلُ: الْعُصْفُرِ، وَالنَّوَى، وَالْخَبَطِ، وَالْكَتَمِ، وَمَا يُشْبِهُ ذَلِكَ، أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِأَنْ يُؤْخَذَ مِنْ كُلِّ صِنْفٍ مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ يَدًا بِيَدٍ، وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ مِنْهُ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، فَإِنِ اخْتَلَفَ الصِّنْفَانِ فَبَانَ اخْتِلاَفُهُمَا، فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُؤْخَذَ مِنْهُمَا اثْنَانِ بِوَاحِدٍ إِلَى أَجَلٍ، وَمَا اشْتُرِيَ مِنْ هَذِهِ الأَصْنَافِ كُلِّهَا، فَلاَ بَأْسَ بِأَنْ يُبَاعَ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى، إِذَا قَبَضَ ثَمَنَهُ مِنْ غَيْرِ صَاحِبِهِ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِنْهُ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٦ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٧ في البيوع، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو شتانەی دەپێورێن یان دەکێشرێن لەو شتانەی ناخورێن و ناخورێنەوە وەك: گیاگەزنە و دەنك و گەڵا و کەتەم و هاوشێوەی ئەوانە، کێشە نییە لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت لە یەك جۆردا (بە مەرجێك) دەست بە دەست بێت، وە نابێ دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت لە یەك جۆردا بەماوە (بەوەی دواتر لە ماوەیەکی دیاریکراو تەسلیم بکرێت، ئەوە نابێت)، جا ئەگەر دوو جۆری جیاواز بوون و جیاوازییەکەیان ڕوون بوو، ئەوە کێشە نییە لەوەی دوو بەرانبەر یەك وەربگیرێت بەماوە، وە ئەوەی دەکڕدرێت لە گشت ئەو جۆرە شتانە، ئەوە کێشە نییە لەوەی بفرۆشرێت بەر لە وەرگرتنی، (بە مەرجێك) ئەگەر ڕاستەوخۆ و بێ دواخستن پارەکە وەربگرێت لە (کڕیارێکی) جگە لەو کەسەی ئەو لێی کڕیوە.

**١٩٣٤- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَكُلُّ شَيْءٍ يَنْتَفِعُ بِهِ النَّاسُ مِنَ الْأَصْنَافِ كُلِّهَا، وَإِنْ كَانَتِ الْحَصْبَاءَ أَوِ الْقَصَّةَ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِمِثْلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ فَهُوَ رِبًا، وَوَاحِدٌ مِنْهُمَا بِمِثْلِهِ، وَزِيَادَةُ شَيْءٍ مِنَ الْأَشْيَاءِ إِلَى أَجَلٍ فَهُوَ رِبًا**[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: گشت شتێك کە خەڵك سوودی لێ ببینێ هەر جۆرە شتێك بێت، هەرچەندە چەگر و گێچیش بێت، کاتێ یەکێك لەو دووانە بە دوو هێندەی خۆی بدرێت، ئەوە ڕیبایە، وە هەر یەکێك لەو دووانە بە هێندەی خۆی بدرێت لەگەڵ (وەرگرتنی) شتێکی زیادە لە شتەکان بەماوە، ئەوە ڕیبایە (بەڵام ئەگەر بەماوە نەبێت و بەنەقد و کاش بێت دروستە).

## ٣٣- نەهیکردن و قەدەغەکردنی دوو مامەڵە لەناو یەك مامەڵەدا[2]

**١٩٣٥- عَنْ مَالِكٍ ﵀؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ**[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٣٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ النَّهْيُ عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٠ في البيوع، عن مالك به.




واتە: لە ئیمامی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە دوو مامەڵە لەناو یەك مامەڵەدا.

**١٩٣٦- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ: أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَجُلٍ: ابْتَعْ لِي هَذَا الْبَعِيرَ بِنَقْدٍ، حَتَّى أَبْتَاعَهُ مِنْكَ إِلَى أَجَلٍ، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، فَكَرِهَهُ وَنَهَى عَنْهُ[1].**

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس كردم بەوەی پێی گەیشتووە پیاوێك بە پیاوێكی گوتووە: ئەو وشترەم بەپارەی كاش بۆ بكڕە، تا من لێت بكڕمەوە بەماوە، جا پرسیار دەربارەی ئەو بابەتە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ كرا، ئەویش بە ناپەسەندی دانا و قەدەغەی لێ كرد.

**١٩٣٧- وَحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ: أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ ﷺ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ اشْتَرَى سِلْعَةً بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ نَقْدًا، أَوْ بِخَمْسَةَ عَشَرَ دِينَارًا إِلَى أَجَلٍ، فَكَرِهَ ذَلِكَ وَنَهَى عَنْهُ[2].**

واتە: یەحیا ﷺ گوتوویەتی: ئیمامی مالیك ﷺ بۆی باس كردم بەوەی پێی گەیشتووە قاسمی كوڕی موحەممەد ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی كەسێك كە كاڵایێكی بە دە دینار كڕی بێت بەنەقد و كاش، یان بە پازدە دینار بەماوە (واتە كاڵاكەی بردبێت لە كاتێكدا ئەگەری ئەو دوو مامەڵەیە لەبەر دەستە و یەكلایی نەكراوەتەوە)، بۆیە بە ناپەسەندی زانی و قەدەغەی لێ كرد.

**١٩٣٨- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ ابْتَاعَ سِلْعَةً مِنْ رَجُلٍ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ نَقْدًا، أَوْ بِخَمْسَةَ عَشَرَ دِينَارًا إِلَى أَجَلٍ، قَدْ وَجَبَتْ لِلْمُشْتَرِي بِأَحَدِ الثَّمَنَيْنِ، إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي ذَلِكَ، لأَنَّهُ إِنْ أَخَّرَ الْعَشَرَةَ، كَانَتْ خَمْسَةَ عَشَرَ إِلَى أَجَلٍ، وَإِنْ نَقَدَ الْعَشَرَةَ كَانَ إِنَّمَا اشْتَرَى بِهَا الْخَمْسَةَ عَشَرَ الَّتِي إِلَى أَجَلٍ[3].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی كەسێك كە دەیەوێ كاڵایێك لە كەسێك بە دە دینار بەنەقد و كاش یان بە پازدە دینار بەماوە بكڕێت و بە یەكێك

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٦٥ في البيوع؛ وفي: ٢٦٣٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٤٢أ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤١ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٢ في البيوع، عن مالك به.

لە نرخەکان ببێتە هی کڕیار، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە نابێت (دروست نییە)، چونکە ئەگەر (بە دە دینار بیکڕێت و) دە دینارەکە دوا بخات، دەبێتە پازدە بە دواخستن، وە ئەگەر دە دیناری بەنەقد و کاش پێ بدات دەکا بەو دە دینارە پازدە دینارەکەی کڕیوە کە بەماوە بوو (ئەوەش نابێت و دروست نییە بۆ ڕێگریکردن لە کەوتنە ناو حەڕام و مامەڵەی نادروست).

**١٩٣٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ اشْتَرَى مِنْ رَجُلٍ سِلْعَةً بِدِينَارٍ نَقْدًا، أَوْ بِشَاةٍ مَوْصُوفَةٍ إِلَى أَجَلٍ، قَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْبَيْعُ بِأَحَدِ الثَّمَنَيْنِ، إِنَّ ذَلِكَ مَكْرُوهٌ، لاَ يَنْبَغِي، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ، وَهَذَا مِنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایێك دەکڕێت بە دینارێك بەکاش و نەقد یان بە بزنێکی وەسفکراوی بەماوە، کە مامەڵەکەی کەوتبێتە سەر بە یەکێك لەو دوو شتانە، گوتوویەتی: ئەوە ناپەسەندە و نابێت (حەڕامە)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە دوو مامەڵە لەناو یەك مامەڵەدا، ئەوەش دوو مامەڵەیە لەناو یەك مامەڵەدا.

**١٩٤٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ قَالَ لِرَجُلٍ: أَشْتَرِي مِنْكَ هَذِهِ الْعَجْوَةَ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، أَوِ الصَّيْحَانِيَّ عَشَرَةَ آصُعٍ، أَوِ الْحِنْطَةَ الْمَحْمُولَةَ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، أَوِ الشَّامِيَّةَ عَشَرَةَ آصُعٍ بِدِينَارٍ، قَدْ وَجَبَتْ لِي إِحْدَاهُمَا، إِنَّ ذَلِكَ مَكْرُوهٌ لاَ يَحِلُّ، وَذَلِكَ أَنَّهُ قَدْ أَوْجَبَ لَهُ عَشَرَةَ آصُعٍ صَيْحَانِيًّا، فَهُوَ يَدَعُهَا، وَيَأْخُذُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا مِنَ الْعَجْوَةِ، أَوْ تَجِبُ عَلَيْهِ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا مِنَ الْحِنْطَةِ الْمَحْمُولَةِ، فَيَدَعُهَا، وَيَأْخُذُ عَشَرَةَ آصُعٍ مِنَ الشَّامِيَّةِ، فَهَذَا أَيْضًا مَكْرُوهٌ لاَ يَحِلُّ، وَهُوَ أَيْضًا يُشْبِهُ مَا نُهِيَ عَنْهُ مِنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ، وَهُوَ أَيْضًا مِمَّا نُهِيَ عَنْهُ أَنْ يُبَاعَ مِنْ صِنْفٍ وَاحِدٍ مِنَ الطَّعَامِ اثْنَانِ بِوَاحِدٍ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە بە کەسێك دەڵێت: ئەو پازدە صاعە خورمایە عەجوەیەت لێ دەکڕم، یان دە صاع لەو خورمایە صەیحانییەت

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٣ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٤ في البيوع، عن مالك به.

لێ دەکڕم، یان ئەو پازدە صاعە گەنمەت لێ دەکڕم یان ئەو دە صاعە گەنمە شامییەت لێ دەکڕم، بە دینارێك، با جۆرێکیان ببێت بە هی من، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: ئەوە ناپەسەندە و حەڵاڵ نییە، لەبەر ئەوەی (بە هەمان پارە) دە صاع لە خورمای صەیحانی بۆتە هی ئەو (کە یەکێکە لە باشترین جۆرەکانی خورما)، لە کاتێکدا ئەو وازی لێ دەهێنێت و پازدە صاع لە خورمای عەجوە دەبات، یان پازدە صاع لە گەنم دەبێتە هی ئەو و وازی لێ دێنێت و دە صاع لە گەنمی ڕەشی شامی دەبات، جا ئەوە ناپەسەندە و حەڵاڵ نییە، وە ئەوە دیسان وەك ئەوەیە کە نەهی لێ کراوە لە دوو مامەڵە لەناو یەك مامەڵەدا، وە هەروەها بەشێکە لەوەی نەهی لێ کراوە بەوەی دوو بەرانبەر یەك بفرۆشرێت لە یەك جۆر خۆراکدا (کەواتە ئەو بابەتە چەندین جۆر مامەڵەی ناپەسەند و نادروست دەیگرێتەوە).

## ٣٤- مامەڵەی دەرەنجام نادیار[١]

**١٩٤١-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﵀، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە مامەڵەی نادیار (کە بریتییە لەو مامەڵەیەی سەرەنجامی دیار نییە، وەك کڕینی ماسی لەناو ڕووبار، یان باڵندە لە ئاسمان، ئەو جۆرە مامەڵانە حەرامن، چونکە دەرەنجامەکەی دیار نییە).

**١٩٤٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَمِنْ بَيْعِ الْغَرَرِ وَالْمُخَاطَرَةِ، أَنْ يَعْمِدَ الرَّجُلُ قَدْ ضَلَّتْ دَابَّتُهُ، أَوْ أَبَقَ غُلَامُهُ، وَثَمَنُ الشَّيْءِ مِنْ ذَلِكَ خَمْسُونَ دِينَارًا، فَيَقُولُ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُ مِنْكَ بِعِشْرِينَ دِينَارًا، فَإِنْ وَجَدَهُ الْمُبْتَاعُ ذَهَبَ مِنَ الْبَائِعِ ثَلَاثُونَ دِينَارًا، وَإِنْ لَمْ يَجِدْهُ ذَهَبَ الْبَائِعُ مِنَ الْمُبْتَاعِ بِعِشْرِينَ دِينَارًا.

---

(١) ـ بَيْعُ الْغَرَرِ.

(٢) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٥٠١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٢٥ في البيوع؛ والشيباني: ٧٧٥ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَفِي ذَلِكَ أَيْضًا عَيْبٌ آخَرُ، إِنَّ تِلْكَ الضَّالَّةَ، إِنْ وُجِدَتْ، لَمْ يُدْرَ أَزَادَتْ أَمْ نَقَصَتْ، أَمْ مَا حَدَثَ بِهَا مِنَ الْعُيُوبِ، فَهَذَا أَعْظَمُ الْمُخَاطَرَةِ[1].

(فەتوا): واتە: جۆرێك لە كڕین و فرۆشتنی نادیار و بەفیڕۆدان و ماڵ خستنە خەتەر ئەوەیە: پیاوێك كە وڵاغەكەی ون بووە یان كۆیلەكەی هەڵاتووە و نرخی پەنجا دینارە، كەسێك پێی دەڵێت: من شتەكەت بە بیست دینار لێ دەكڕم، جا ئەگەر كڕیارەكە بیدۆزێتەوە ئەوە سی دینار لە فرۆشیارەكە دەفەوتێ (چونكە نرخی پەنجا دینار بوو، ئەو بە بیستی دابوو)، وە ئەگەر كڕیارەكە نەیدۆزێتەوە ئەوە بیست دینار لە كڕیار دەفەوتێ.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو مامەڵەیە خەلەل و عەیبێكی دیكەشی تیایە، (ئەویش ئەوەیە) ئەو شتە ونبووە ئەگەر بدۆزرێتەوە (لەلایەن كڕیارەوە) نازانرێت زیادی كردووە یان كەمی كردووە، یان عەیبی نوێی لێ پەیدا بووە یان نا، كەواتە ئەوە گەورەترین مامەڵەی نادیار و بەفیڕۆدانی سەروەتە (كە حەڕامكراوە).

**١٩٤٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّ مِنَ الْمُخَاطَرَةِ وَالْغَرَرِ اشْتِرَاءَ مَا فِي بُطُونِ الإِنَاثِ مِنَ النِّسَاءِ وَالدَّوَابِّ، لأَنَّهُ لاَ يُدْرَى أَيَخْرُجُ أَمْ لاَ يَخْرُجُ؟ فَإِنْ خَرَجَ لَمْ يُدْرَ أَيَكُونُ حَسَنًا أَمْ قَبِيحًا؟ أَمْ تَامًّا أَمْ نَاقِصًا؟ أَمْ ذَكَرًا أَمْ أُنْثَى؟ وَذَلِكَ كُلُّهُ يَتَفَاضَلُ، إِنْ كَانَ عَلَى كَذَا، فَقِيمَتُهُ كَذَا، وَإِنْ كَانَ عَلَى كَذَا، فَقِيمَتُهُ كَذَا[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە: كڕین و فرۆشتنی بەفیڕۆدان و نادیار (كە دوو مامەڵەی حەڕام كراون) بریتین لە كڕینی ئەوەی لەناو سكی مێیینەدایە لە ئافرەت و ئاژەڵان، چونكە نازانرێت بەزیندوویێتی دەردەچێت یان نا؟ جا ئەگەر (بەزیندوویش) لەدایك بوو نازانرێت جوان و ڕێكە یان ناشیرن و ناڕێكە؟ تەواوە یان نەقوستانە؟ نێرە یان مێیە؟ ئەوانەش گشتی جیاوازن (نرخ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٥ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٦ في البيوع، عن مالك به.

دەگۆڕن)، ئەگەر بەم شێوەیە بێ ئەوە نرخەکەی ئەوەندەیە، وە ئەگەر بەم شێوەیە بێ ئەوە نرخەکەی بەوەندەیە (نرخەکان جیاوازن).

١٩٤٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَنْبَغِي بَيْعُ الإِنَاثِ، وَاسْتِثْنَاءُ مَا فِي بُطُونِهَا، وَذَلِكَ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: ثَمَنُ شَاتِي الْغَزِيرَةِ ثَلاَثَةُ دَنَانِيرَ، فَهِيَ لَكَ بِدِينَارَيْنِ، وَلِي مَا فِي بَطْنِهَا، فَهَذَا مَكْرُوهٌ، لأَنَّهُ غَرَرٌ وَمُخَاطَرَةٌ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فرۆشتنی ئاژەڵی مێیە و جیاکردنەوەی ئەوەی لەناو سکیەتی (لە بێچوو) نابێ و دروست نییە، بەوەی کەسێك بە کەسێك بڵێت: نرخی بزنە بەشیرەکەی من سێ دینارە، با بە دوو دینار بۆ تۆ بێت و بێچووەکەی ناو سکی بۆ من بێت، ئەوە ناپەسەند و حەرامکراوە، چونکە بریتییە لە کڕین و فرۆشتنی نادیار و بەفیڕۆدان (کە حەرامکراون).

١٩٤٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ يَحِلُّ بَيْعُ الزَّيْتُونِ بِالزَّيْتِ، وَلاَ الْجُلْجُلاَنِ بِدُهْنِ الْجُلْجُلاَنِ، وَلاَ الزُّبْدِ بِالسَّمْنِ، لأَنَّ الْمُزَابَنَةَ تَدْخُلُهُ، وَلأَنَّ الَّذِي يَشْتَرِي الْحَبَّ وَمَا أَشْبَهَهُ بِشَيْءٍ مُسَمًّى مِمَّا يَخْرُجُ مِنْهُ، لاَ يَدْرِي أَيَخْرُجُ مِنْهُ أَقَلُّ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَكْثَرُ؟ فَهَذَا غَرَرٌ وَمُخَاطَرَةٌ[1].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِنْ ذَلِكَ أَيْضًا، اشْتِرَاءُ حَبِّ الْبَانِ بِالسَّلِيخَةِ، فَذَلِكَ غَرَرٌ، لأَنَّ الَّذِي يَخْرُجُ مِنْ حَبِّ الْبَانِ هُوَ السَّلِيخَةُ، وَلاَ بَأْسَ بِحَبِّ الْبَانِ بِالْبَانِ الْمُطَيَّبِ، لأَنَّ الْبَانَ الْمُطَيَّبَ قَدْ طُيِّبَ وَنُشَّ، وَتَحَوَّلَ عَنْ حَالِ السَّلِيخَةِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەروەها حەڵاڵ نییە زەیتون بە زەیتی زەیتون بفرۆشرێت، وە حەڵاڵ نییە کونجی ناو چڵتوك بە ڕۆنی کونجی بفرۆشرێت، وە حەڵاڵ نییە زبدە (کەرە) بە ڕۆن بفرۆشرێت، چونکە موزابەنە و نادیاری دەکەوێتە ناو، هەروەها چونکە ئەو کەسەی دەنکەکە و هاوشێوەکانی دەکرێت لە بەرانبەر شتێك کە لێوەی پەیدا دەبێت (وەك ڕۆن)، نازانێ ئایا کەمتر یان زیاتری لێ پەیدا دەبێ؟ ئەوە نادیاری و بەفیڕۆدانە.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٧ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٨ في البيوع، عن مالك به.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوە یەکێکی دیکە لەو جۆرە مامەڵەیە بریتییە لە کڕینی دەنکی درەختی بان بە ڕۆنەکەی (واتە گۆڕینەوەی دەنکی بان بە ڕۆنی دەنکی هەمان درەخت)، ئەوە مامەڵەی نادیارە (حەڕامە)، چونکە ئەوەی لە دەنکی درەختی بان دەردەچێت بریتییە لەو ڕۆنە (کە پێی کڕدراوە)، (بەڵام) کێشە نییە لە فرۆشتنی دەنکی درەختی بان بە دەنکی بانی پاڵفتەکراو، چونکە دەنکی بانی خۆشکراو و پاڵفتەکراو پاك کراوەتەوە و تێکەڵ کراوە و لەسەر حاڵەتی ڕۆنایەتی نەماوە.

**١٩٤٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ بَاعَ سِلْعَةً مِنْ رَجُلٍ، عَلَى أَنَّهُ لاَ نُقْصَانَ عَلَى الْمُبْتَاعِ، إِنَّ ذَلِكَ بَيْعٌ غَيْرُ جَائِزٍ، وَهُوَ مِنَ الْمُخَاطَرَةِ، وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنَّهُ كَأَنَّهُ اسْتَأْجَرَهُ بِرِبْحٍ، إِنْ كَانَ فِي تِلْكَ السِّلْعَةِ، وَإِنْ بَاعَ بِرَأْسِ الْمَالِ أَوْ بِنُقْصَانٍ، فَلاَ شَيْءَ لَهُ، وَذَهَبَ عَنَاؤُهُ بَاطِلاً، فَهَذَا لاَ يَصْلُحُ، وَلِلْمُبْتَاعِ فِي هَذَا أُجْرَةٌ بِمِقْدَارِ مَا عَالَجَ مِنْ ذَلِكَ، وَمَا كَانَ فِي تِلْكَ السِّلْعَةِ مِنْ نُقْصَانٍ أَوْ رِبْحٍ، فَهُوَ لِلْبَائِعِ وَعَلَيْهِ، وَإِنَّمَا يَكُونُ ذَلِكَ إِذَا فَاتَتِ السِّلْعَةُ وَبِيعَتْ، فَإِنْ لَمْ تَفُتْ، فُسِخَ الْبَيْعُ بَيْنَهُمَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایێك لە کەسێك دەکڕێت لەسەر ئەو بنەمایەی نابێ کڕیارەکە زەرەری بکەوێتە سەر و نابێ (لەو کاڵایە) زەرەر بکات، گوتوویەتی: ئەوە دروست نییە و جۆرێکە لە مامەڵەی سامان خستنە خەتەر و بەفیڕۆدان، جا ڕوونکردنەوەکەی بەم شێوەیەیە: ئەو بابەتە وەك ئەوە وایە کەسێکی بەکرێ گرتبێت بۆ قازانج، (بەو مەرجەی کرێیەکەی پێ بدات) ئەگەر قازانج کەوتە ناو کاڵایەکە، (بەڵام) ئەگەر بە مایەی خۆی فرۆشتبوویەوە یان بە کەمتر، ئەوە (کەسە بەکرێگیراوەکە) هیچی بۆ نەبێ و ماندووبوونەکەی بێهوودە بڕوات، ئەوە نابێت و دروست نییە، (بەڵکوو) بۆ ئەو کەسە کرێیەك هەیە بەگوێرەی ئەوەی ئەنجامی داوە، وە هەر کەمکردن و زەرەرێك یان قازانجێك لە کاڵاکەدا ڕووی دابێت، ئەوە (زەرەرەکە) لەسەر فرۆشیارەکەیە و (قازانجەکەش) بۆ ئەوە، جا ئەو (بڕیارە بەو شێوەیە) لە کاتێکدا دەبێت ئەگەر کاڵایەکە نەما

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٤٩ في البيوع، عن مالك به.

و فرۆشرا، (بەڵام) ئەگەر كاڵاكە هەر مابوو، ئەوە مامەڵەكە هەڵدەوەشێتەوە لە نێوانیان (چونكە ئەسڵەن مامەڵەكە دروست نییە).

**١٩٤٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا أَنْ يَبِيعَ رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ سِلْعَةً يَبُتُّ بَيْعَهَا، ثُمَّ يَنْدَمُ الْمُشْتَرِي، فَيَقُولُ لِلْبَائِعِ: ضَعْ عَنِّي، فَيَأْبَى الْبَائِعُ، وَيَقُولُ: بِعْ وَلاَ نُقْصَانَ عَلَيْكَ، فَهَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ، لأَنَّهُ لَيْسَ مِنَ الْمُخَاطَرَةِ، وَإِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ وَضَعَهُ لَهُ، وَلَيْسَ عَلَى ذَلِكَ عَقَدَا بَيْعَهُمَا، وَذَلِكَ الَّذِي عَلَيْهِ الأَمْرُ عِنْدَنَا[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە كە كەسێك كاڵایێك بە كەسێك بفرۆشێت و مامەڵەكە ببڕێنێتەوە، دواتر كڕیارەكە پەشیمان ببێتەوە و بە فرۆشیار بڵێت: مامەڵەكەم لەسەر لاببە (بۆمی هەڵوەشێنەوە و پەشیمانیم قبووڵ بكە)، فرۆشیاریش ڕازی نەبێت و بڵێت: بیفرۆشە و زەرەرەكەی لەسەر تۆ نییە (من زەرەرەكە دەدەم)، ئەوە كێشەی نییە، چونكە لە مامەڵەی موخاتەڕە (واتە سامان خستنە خەتەر و بەفیڕۆدان) نییە، بەڵكوو شتێكە بۆ ئەوی داناوە (وەك دیاری یارمەتی دەدات) و ئەوە گرێبەست نییە لە نێوانیاندا، جا بابەتەكە لەلای ئێمە لەسەر ئەوەیە (بەوەی دروست بێت).

## ٣٥- مولامەسە و موونابەزە[٢]

**١٩٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ[٣].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالْمُلاَمَسَةُ: أَنْ يَلْمِسَ الرَّجُلُ الثَّوْبَ، وَلاَ يَنْشُرُهُ، وَلاَ يَتَبَيَّنُ مَا فِيهِ، أَوْ يَبْتَاعَهُ لَيْلاً، وَلاَ يَعْلَمُ مَا فِيهِ، وَالْمُنَابَذَةُ: أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ ثَوْبَهُ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، عَلَى غَيْرِ تَأَمُّلٍ مِنْهُمَا، وَيَقُولُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: هَذَا بِهَذَا، فَهَذَا الَّذِي نُهِيَ عَنْهُ مِنَ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٠ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ الْمُلاَمَسَةُ وَالْمُنَابَذَةُ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه الشافعي: ١٠٧٦؛ وابن حنبل: ٨٩٢٢؛ والبخاري: ٢١٤٦ في البيوع؛ والقابسي: ٩٩، كلهم عن مالك به.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە مامەڵەی مولامەسە و مونابەزە (واتە حەڕامی کردووە).

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مولامەسە ئەوەیە: کەسێك دەست بخاتە سەر پۆشاکێك و لێکی نەکاتەوە و بۆی ڕوون نەبێتەوە ناوەوەی چۆنە، یان بەتاریکی شەو بیکڕێت و نەزانێت چۆنە.

مونابەزەش ئەوەیە: کەسێك پۆشاکەکەی خۆی بۆ کەسێکی دیکە هەڵبدات و ئەویشیان پۆشاکەکەی خۆی بۆ ئەوەی دیکەیان هەڵبدات بەبێ تێڕامانی هیچ یەکێکیان، جا هەردووکیان بڵێن: ئەوە بەوە (واتە کڕین و فرۆشتنەکە بکەوێتە سەر ئەو گۆڕینەوە)، ئا ئەوە بریتییە لەوەی کە حەڕام کراوە و قەدەغەی لێ کراوە لە مولامەسە و مونابەزەدا.

**١٩٤٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي السَّاجِ الْمُدْرَجِ فِي جِرَابِهِ، أَوِ الثَّوْبِ الْقُبْطِيِّ الْمُدْرَجِ فِي طَيِّهِ، إِنَّهُ لاَ يَجُوزُ بَيْعُهُمَا، حَتَّى يُنْشَرَا، وَيُنْظَرَ إِلَى مَا فِي أَجْوَافِهِمَا، وَذَلِكَ أَنَّ بَيْعَهُمَا مِنْ بَيْعِ الْغَرَرِ، وَهُوَ مِنَ الْمُلاَمَسَةِ[١].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی شاڵی هەڵگیراو لەناو بەرگی خۆی یان پۆشاکی قوبتی پێچراو، گوتوویەتی: کڕین و فرۆشتنیان دروست نییە، تا دەکرێنەوە و سەیری ناوەوەیان دەکرێت، چونکە کڕین و فرۆشتنیان (بەم شێوەیە) جۆرێکە لە کڕین و فرۆشتنی نادیار، کە بریتییە لە مولامەسە (کە حوکمەکەی حەڕامە).

**١٩٥٠- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَبَيْعُ الأَعْدَالِ عَلَى الْبَرْنَامَجِ، مُخَالِفٌ لِبَيْعِ السَّاجِ فِي جِرَابِهِ، وَالثَّوْبِ فِي طَيِّهِ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، فَرَقَ بَيْنَ ذَلِكَ الأَمْرُ الْمَعْمُولُ بِهِ، وَمَعْرِفَةُ ذَلِكَ فِي صُدُورِ النَّاسِ، وَمَا مَضَى مِنْ عَمَلِ الْمَاضِينَ فِيهِ، وَأَنَّهُ لَمْ يَزَلْ مِنْ بُيُوعِ النَّاسِ الْجَائِزَةِ بَيْنَهُمْ، الَّتِي لاَ يَرَوْنَ بِهَا بَأْسًا، لأَنَّ بَيْعَ الأَعْدَالِ عَلَى الْبَرْنَامَجِ عَلَى غَيْرِ نَشْرٍ، لاَ يُرَادُ بِهِ الْغَرَرُ، وَلَيْسَ يُشْبِهُ الْمُلاَمَسَةَ[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٥ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: فرۆشتنی باری بازرگانی (کە گشتی لێك ناکرێتەوە، چونکە ناکرێت و سەختە ئەو هەمووە لێك بکرێتەوە، بەڵکوو بە گوتن و خوێندنەوەی زانیارییەکان دەربارەی کاڵایەکە دەفرۆشرێت لە نێوان بازرگاناندا) جیاوازە لەگەڵ فرۆشتنی شاڵ لەناو بەرگی خۆی و پۆشاکی پێچراو و هاوشێوەکانی (کە فرۆشتنیان حەڕامە بەبێ لێککردنەوە)، کارپێکردن و زانراوییەکەی لەناو خەڵکانی چینی یەکەم و کرداری پێشینەکان شتەکەی جیا کردۆتەوە، بەردەوام یەکێك بووە لە کڕین و فرۆشتنە جائیز و دروستەکان لە نێو خەڵکیدا، کە پێیان وا نەبووە کێشەی هەبێت، چونکە فرۆشتنی باری بازرگانی بەبێ لێککردنەوە و واڵاکردن مەبەست پێی فێڵ نییە و وەك مولامەسە نییە.

## ٣٦- مامەڵەی قازانجکردن[1]

**١٩٥١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا فِي الْبَزِّ يَشْتَرِيهِ الرَّجُلُ بِبَلَدٍ، ثُمَّ يَقْدَمُ بِهِ بَلَدًا آخَرَ، فَيَبِيعُهُ مُرَابَحَةً، إِنَّهُ لاَ يَحْسِبُ فِيهِ أَجْرَ السَّمَاسِرَةِ، وَلاَ أَجْرَ الطَّيِّ، وَلاَ الشَّدِّ، وَلاَ النَّفَقَةَ، وَلاَ كِرَاءَ بَيْتٍ، فَأَمَّا كِرَاءُ الْبَزِّ فِي حُمْلاَنِهِ، فَإِنَّهُ يُحْسَبُ فِي أَصْلِ الثَّمَنِ، وَلاَ يُحْسَبُ فِيهِ رِبْحٌ، إِلاَّ أَنْ يُعْلِمَ الْبَائِعُ مَنْ يُسَاوِمُهُ بِذَلِكَ كُلِّهِ، فَإِنْ رَبَّحُوهُ عَلَى ذَلِكَ كُلِّهِ بَعْدَ الْعِلْمِ بِهِ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە دەربارەی قوماش کە کەسێك لە شارێك بیکڕێت، دواتر بیهێنێت بۆ شارێکی دیکە و (بیەوێ) بەقازانج بیفرۆشێت، ئەوە نە کرێی دەلاڵ و نە کرێی پێچانەوە و بەستن و نە کرێی مەسرەف و نە کرێی خانوو حیساب ناکات (کاتێ دەڵێتە کەسێك بەوەندە کڕیومە بە قازانجی ئەوەندە پێت دەفرۆشم، کەواتە نابێت کرێی ئەو شتانە بخاتە سەر ئەو کەسەی قازانجی دەداتێ)، بەڵام هەرچی کرێی هەڵگرتنی قوماشەکەیە ئەوە لە ئەسڵ و بنچینەی پارەکە حیساب دەکرێت و هیچ قازانجێکی تێدا حیساب

---

(١) ـ بَيْعُ الْمُرَابَحَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٦ في البيوع، عن مالك به.

ناکرێت، تەنها لەو کاتە نەبێت فرۆشیارەکە گشت شتەکە بە کەسەکە بڵێت و بۆی ڕوون بکاتەوە (بڵێت: خۆم بەوەندە کڕیومە ئەوەندەشم لە فلان شت و فلان شت داوە و بۆم کەوتۆتە ئەوەندە)، جا ئەگەر لەسەر گشت ئەو مەسرەفانەشەوە قازانجیان دایێ دوای زانیاری هەبوون بە بابەتەکە، ئەوە کێشەی تیا نییە (ئەگەرنا نابێت مەسرەفێك کە لە ئەسڵی پارەکە حیساب نەکرێت ئەو وەگەڵی بخات و بڵێت خۆی بەوەندەیە و تۆش بۆ هەر پارچەیە ئەوەندە قازانجەم بدەرێ).

**١٩٥٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الْقِصَارَةُ، وَالْخِيَاطَةُ، وَالصِّبَاغُ، وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْبَزِّ، يُحْسَبُ فِيهِ الرِّبْحُ كَمَا يُحْسَبُ فِي الْبَزِّ، فَإِنْ بَاعَ الْبَزَّ، وَلَمْ يُبَيِّنْ شَيْئًا مِمَّا سَمَّيْتُ، إِنَّهُ لاَ يُحْسَبُ لَهُ فِيهِ رِبْحٌ، فَإِنْ فَاتَ الْبَزُّ، فَإِنَّ الْكِرَاءَ يُحْسَبُ، وَلاَ يُحْسَبُ عَلَيْهِ رِبْحٌ، فَإِنْ لَمْ يَفُتِ الْبَزُّ، فَالْبَيْعُ مَفْسُوخٌ بَيْنَهُمَا، إِلاَّ أَنْ يَتَرَاضَيَا عَلَى شَيْءٍ مِمَّا يَجُوزُ بَيْنَهُمَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە هەرچی کورتکردنەوە و دوورین و بۆیەکردن و هاوشێوەی ئەو شتانەیە (کە جاری وایە بۆ قوماشەکان ئەنجام دەدرێت)، ئەوە وەك خودی قوماشەکە وایە، قازانجی تێدا حیساب دەکرێت وەك چۆن لە خودی قوماشەکە حیساب دەکرێت، جا ئەگەر قوماشەکەی فرۆشت و هیچی ڕوون نەکردەوە لەوەی ناوم هێنان، ئەوە قازانجی بۆ حیساب ناکرێت تیایدا، جا ئەگەر قوماشەکە (بەر لە پارەدانەکە لەلای کڕیار) نەما و فەوتا، ئەوە کرێیەکان حیساب دەکرێن بەڵام قازانجیان لەسەر حیساب ناکرێت، جا ئەگەر قوماشەکە نەفەوتابوو، ئەوە مامەڵەکە هەڵوەشاوەتەوە لە نێوانیان (چونکە نابێ ڕوونی نەکاتەوە)، تەنها لە کاتێك نەبێت هەردووکیان ڕازی بن لەسەر شتێك کە دروست بێت بۆ هەردووکیان (بەڵام شتەکە پەکی کەوتبێت لەسەر ڕەزامەندی هەردووکیان، ئەو کات مادەم ڕەزامەندی هەیە دروست دەبێت).

**١٩٥٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الْمَتَاعَ بِالذَّهَبِ أَوْ بِالْوَرِقِ، وَالصَّرْفُ يَوْمَ اشْتَرَاهُ عَشَرَةُ دَرَاهِمَ بِدِينَارٍ، فَيَقْدَمُ بِهِ بَلَدًا فَيَبِيعُهُ مُرَابَحَةً، أَوْ يَبِيعُهُ حَيْثُ اشْتَرَاهُ مُرَابَحَةً عَلَى صَرْفِ ذَلِكَ الْيَوْمِ الَّذِي بَاعَهُ فِيهِ، فَإِنَّهُ إِنْ كَانَ ابْتَاعَهُ بِدَرَاهِمَ، وَبَاعَهُ بِدَنَانِيرَ، أَوِ ابْتَاعَهُ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٧ في البيوع، عن مالك به.




بِدَنَانِيرَ، وَبَاعَهُ بِدَرَاهِمَ، وَكَانَ الْمَتَاعُ لَمْ يَفُتْ، فَالْمُبْتَاعُ بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَخَذَهُ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَهُ، فَإِنْ فَاتَ الْمَتَاعُ كَانَ لِلْمُشْتَرِي بِالثَّمَنِ الَّذِي ابْتَاعَهُ بِهِ الْبَائِعُ، وَيُحْسَبُ لِلْبَائِعِ الرِّبْحُ عَلَى مَا اشْتَرَاهُ بِهِ، عَلَى مَا رَبَّحَهُ الْمُبْتَاعُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە کاڵایێك بە زێڕ یان زیو دەکڕێت، لە کاتێکدا گۆڕینەوەی دراو لەو ڕۆژەی کڕیویەتی دە درهەم بە یەك دینار بووە، جا کاڵاکە دەبات بۆ شار و ناوچەیەك و بە مامەڵەی قازاج دەیفرۆشێت (دەڵێتە کڕیار من بەوەندە کڕیومە تۆش بۆ هەر یەکێك لە کاڵایەکە ئەوەندە قازانجەم بدەرێ پێت دەفرۆشم)، یان لە هەمان ئەو شوێنەی کڕیویەتی بەقازانج بیفرۆشێت لەسەر بنەمای بۆڕصەی دراوی ئەو ڕۆژە (واتە ئەگەر هەر لە ناوچەی خۆی گۆڕینەوە و بۆڕصەی پارە گۆڕابوو و لە قازانجی ئەو دەشکایەوە ئەگەر بە هەمان پارەی خۆشی دابایەوە)، ئەگەر بە درهەم کڕیبێتی بە دینار بیداتەوە، یان بە دینار کڕیبێتی و بە درهەم بیداتەوە و کاڵاکەش نەفەوتابێ، ئەوە کڕیار سەرپشکە: ئەگەر حەز بکا وەریدەگرێ و ئەگەر حەزیش بکا وازی لێ دێنێ، وە ئەگەر کاڵایەکە فەوتا (دوای کڕینی لەلایەن کڕیارەوە)، ئەوە بە هەمان جۆری ئەو پارەیە بۆ کڕیارەکەیە کە فرۆشیارەکە پێی کڕیوە، وە قازانج بۆ فرۆشیارەکە حیساب دەکرێت لەسەر ئەو پارەیەی پێی کڕیوە، (قازانجەکەش) لەسەر ئەو بنەمایەیە کە کڕیار دەیدات و پێی ڕازییە و ڕێك کەوتوون.

١٩٥٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِذَا بَاعَ رَجُلٌ سِلْعَةً قَامَتْ عَلَيْهِ بِمِئَةِ دِينَارٍ، لِلْعَشَرَةِ أَحَدَ عَشَرَ، ثُمَّ جَاءَهُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّهَا قَامَتْ عَلَيْهِ بِتِسْعِينَ دِينَارًا، وَقَدْ فَاتَتِ السِّلْعَةُ، خُيِّرَ الْبَائِعُ، فَإِنْ أَحَبَّ فَلَهُ قِيمَةُ سِلْعَتِهِ يَوْمَ قُبِضَتْ مِنْهُ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْقِيمَةُ أَكْثَرَ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي وَجَبَ لَهُ بِهِ الْبَيْعُ أَوَّلَ يَوْمٍ، فَلاَ يَكُونُ لَهُ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، وَذَلِكَ مِئَةُ دِينَارٍ وَعَشَرَةُ دَنَانِيرَ، وَإِنْ أَحَبَّ ضُرِبَ لَهُ الرِّبْحُ عَلَى التِّسْعِينَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الَّذِي بَلَغَتْ سِلْعَتُهُ مِنَ الثَّمَنِ أَقَلَّ مِنَ الْقِيمَةِ، فَيُخَيَّرُ فِي الَّذِي بَلَغَتْ سِلْعَتُهُ، وَفِي رَأْسِ مَالِهِ وَرِبْحِهِ، وَذَلِكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ دِينَارًا[٢].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥٩ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك کاڵایێکی فرۆشت بەوەی بە سەت دینار لەسەری کەوتووە، جا داوای کرد بۆ هەر دە دینارێك یازدە دیناری پێ بدرێت (تا قازانجێك بکات)، دواتر هات و گوتی (هەڵە بووم): بە نەوەت دینار لەسەرم کەوتووە و کاڵاکەش نەمابوو و فەوتا بوو، ئەوە فرۆشیارەکە سەرپشکە: ئەگەر حەز بکات نرخی کاڵاکەی خۆی بۆ هەیە لەو ڕۆژەی لێی وەرگیراوە، تەنها لەو کاتە نەبێت کە نرخەکەی زیاتر بێت لەو پارەی یەکەم جار مامەڵەکەی لەسەر دامەزراوە، لەو کاتەدا لەوە زیاتری بۆ نییە، کە بریتییە لە سەت و دە دینار، وە ئەگەر حەزیش بکات قازانجی بۆ دادەندرێت لەسەر بنەمای نەوەت دینارەکە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کاڵایەکەی نرخی کەمی کردبێت لە نرخەکەی پێشوو، ئەو کات سەرپشکە لە نێوان ئەو نرخەی ئێستا کاڵایەکە هەیەتی و لە نێوان سەرمایە و قازانجەکەی، کە بریتییە لە نەوەت و نۆ دینار.

١٩٥٥- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنْ بَاعَ رَجُلٌ سِلْعَةً مُرَابَحَةً، فَقَالَ: قَامَتْ عَلَيَّ بِمِئَةِ دِينَارٍ، ثُمَّ جَاءَهُ بَعْدَ ذَلِكَ أَنَّهَا قَامَتْ عَلَيْهِ بِمِئَةٍ وَعِشْرِينَ دِينَارًا، خُيِّرَ الْمُبْتَاعُ، فَإِنْ شَاءَ أَعْطَى الْبَائِعَ قِيمَةَ السِّلْعَةِ يَوْمَ قَبَضَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَعْطَى الثَّمَنَ الَّذِي ابْتَاعَ بِهِ عَلَى حِسَابِ مَا رَبَّحَهُ، بَالِغًا مَا بَلَغَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ أَقَلَّ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي ابْتَاعَ بِهِ السِّلْعَةَ، فَلَيْسَ لَهُ أَنْ يُنَقِّصَ رَبَّ السِّلْعَةِ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي ابْتَاعَهَا بِهِ، لأَنَّهُ قَدْ كَانَ رَضِيَ بِذَلِكَ، وَإِنَّمَا جَاءَ رَبُّ السِّلْعَةِ يَطْلُبُ الْفَضْلَ، فَلَيْسَ لِلْمُبْتَاعِ فِي هَذَا حُجَّةٌ عَلَى الْبَائِعِ، بِأَنْ يَضَعَ مِنَ الثَّمَنِ الَّذِي ابْتَاعَ بِهِ عَلَى الْبَرْنَامَجِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر کەسێك ویستی کاڵایێك بەقازانج بفرۆشێت و گوتی: بە سەت دینار لەسەرم کەوتووە (قازانجیان پێ دا و مامەڵەکە بڕایەوە)، دواتر دوای ئەوە هات و گوتی (هەڵە بووم): بە سەت و دە دینار لەسەرم کەوتووە، ئەوە کڕیار سەرپشکە: ئەگەر ویستی نرخی کاڵایەکە بەپێی ئەو ڕۆژەی وەریگرتووە دەیدات بە فرۆشیارەکە، وە ئەگەر ویستی ئەوە هەمان ئەو پارەیە دەدات بە فرۆشیارەکە کە پێی کڕیوە و قازانجی داوەتێ، جا بگاتە هەر چەند، تەنها لەو کاتە نەبێت کە نرخی کاڵاکە کەمتر بووبێتەوە لەو نرخەی کاڵاکەی پێ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٠ في البيوع، عن مالك به.

کڕیوە، ئەوە لەو کاتەدا کڕیار بۆی نییە پارە کەمتر بکاتەوە بۆ خاوەن کاڵایەکە لەو نرخەی پێی کڕیوە، چونکە کڕیارەکە خۆی بەو نرخە ڕازی بووە، خاوەنی ماڵەکە هاتووە داوای زیاتر دەکات (کەواتە چۆن دەبێ کەمتری بدرێتەوە)، جا کڕیار لەو بابەتەدا بەڵگە و بەهانەی نییە بەسەر فرۆشیارەکەوە بەوەی لەو پارەیە کەم بکاتەوە کە بە زانیاری تەواوی بازرگانی کڕیوەتی (و خۆی ڕازی بووە).

## ٣٧- کڕین و فرۆشتن لەسەر باری بازرگانی[١]

**١٩٥٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الْقَوْمِ يَشْتَرُونَ السِّلْعَةَ الْبَزَّ، أَوِ الرَّقِيقَ، فَيَسْمَعُ بِهِ الرَّجُلُ، فَيَقُولُ لِرَجُلٍ مِنْهُمْ: الْبَزُّ الَّذِي اشْتَرَيْتَ مِنْ فُلاَنٍ، قَدْ بَلَغَنِي صِفَتُهُ وَأَمْرُهُ، فَهَلْ لَكَ أَنْ أُرْبِحَكَ فِي نَصِيبِكَ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُرْبِحُهُ، وَيَكُونُ شَرِيكًا لِلْقَوْمِ مَكَانَهُ، فَإِذَا نَظَرَ إِلَيْهِ رَآهُ قَبِيحًا وَاسْتَغْلاَهُ، قَالَ مَالِكٌ: ذَلِكَ لاَزِمٌ لَهُ، وَلاَ خِيَارَ لَهُ فِيهِ، إِذَا كَانَ ابْتَاعَهُ عَلَى بَرْنَامَجٍ وَصِفَةٍ مَعْلُومَةٍ[٢].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی کۆمەڵە کەسێك کە کاڵایێك (بەهاوبەشی دەکڕن) جا قوماش بێت یان کۆیلە، جا کەسێك گوێی لەو بابەتە بێت و بە یەکێك لە شەریکەکان بڵێت: ئەو قوماشەی لە فڵانت کڕیوە سیفەت و ڕوونکردنەوەکەیم پێ گەیشتووە، جا ئایا پشکی خۆتم پێ دەفرۆشیت ئەگەر ئەوەندە و ئەوەندە قازانجەت پێ بدەم؟ ئەویش بڵێت: بەڵێ، جا ئەویش قازانجەکەی بداتێ و لەجیاتی ئەو ببێتە شەریك لەگەڵ کۆمەڵە کەسەکە، جا ئەگەر دواتر سەیری شتەکە بکات و ببینێت خراپە و بە گرانی بزانێت، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: مامەڵەکە پێوەی پەیوەست بووە و کەوتۆتە سەری و جێبەجێ بووە و سەرپشکی بۆ نییە، (بە مەرجێك) ئەگەر لەسەر بنەمای زانیاری و سیفەتی زانراو بوو بێت.

---

(١) ـ الْبَيْعُ عَلَى الْبَرْنَامَجِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦١ في البيوع، عن مالك به.

١٩٥٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀ فِي الرَّجُلِ يَقْدَمُ لَهُ أَصْنَافٌ مِنَ الْبَزِّ، وَيَحْضُرُهُ السُّوَّامُ، وَيَقْرَأُ عَلَيْهِمْ بَرْنَامَجَهُ، وَيَقُولُ: فِي كُلِّ عَدْلٍ كَذَا وَكَذَا مِلْحَفَةً بَصْرِيَّةً، وَكَذَا وَكَذَا رَيْطَةً سَابِرِيَّةً، ذَرْعُهَا كَذَا وَكَذَا، وَيُسَمِّي لَهُمْ أَصْنَافًا مِنَ الْبَزِّ بِأَجْنَاسِهِ، وَيَقُولُ: اشْتَرُوا مِنِّي عَلَى هَذِهِ الصِّفَةِ، فَيَشْتَرُونَ الأَعْدَالَ عَلَى مَا وَصَفَ لَهُمْ، ثُمَّ يَفْتَحُونَهَا، فَيَسْتَغْلُونَهَا وَيَنْدَمُونَ، قَالَ مَالِكٌ: ذَلِكَ لاَزِمٌ لَهُمْ إِذَا كَانَ مُوَافِقًا لِلْبَرْنَامَجِ الَّذِي بَاعَهُمْ عَلَيْهِ.

قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَهَذَا الأَمْرُ الَّذِي لَمْ يَزَلْ عَلَيْهِ النَّاسُ عِنْدَنَا يُجِيزُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِذَا كَانَ الْمَتَاعُ مُوَافِقًا لِلْبَرْنَامَجِ، وَلَمْ يَكُنْ مُخَالِفًا لَهُ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﵀ دەربارەی ئەو کەسەی چەندین جۆر لە قوماشی بۆ دێت و مامەڵەچی ئامادە دەبن و زانیاری بارەکانیان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دەڵێت: هەر بارێك ئەوەندە و ئەوەندە سەرچەفە بەصرییەی تیایە وە ئەوەندە و ئەوەندە سەرچەفی تەنکی تیایە، درێژی و قیاسیان ئەوەندە و ئەوەندەیە، جا ناوی چەندین قوماشیان بۆ بێنێت بە جۆرەکانیانەوە و بڵێت: لەسەر ئەو سیفەتانە لێم بکڕن، جا بارەکانی لێ بکڕن لەسەر ئەو سیفەتەی بۆی باس کردوون، دواتر بیکەنەوە و پێیان گران بێت و پەشیمان ببنەوە، ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: مامەڵەکە کەوتۆتە سەریان و پێوەی پابەند بوون ئەگەر کۆك بوو لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە لەسەری کڕیبوویان.

ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: جا لەلای ئێمە بەردەوام خەڵکی لەسەر ئەوە بوون و لە نێوانی خۆیان بەجائیزی جێبەجێیان کردووە، (بە مەرجێك) ئەگەر کاڵایەکان کۆك بن لەگەڵ زانیارییەکە و پێچەوانەی نەبن.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٢ في البيوع؛ وأبو مصعب الزهري: ٢٦٦٣ في البيوع، عن مالك به.




## ٣٨- مامەڵەی سەرپشكبوون (سەرپشكی لە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەدا)(١)

**١٩٥٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، إِلاَّ بَيْعَ الْخِيَارِ(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو مامەڵەكارەكان (كڕیار و فرۆشیار) هەر یەكێكیان سەرپشكە لە بەرانبەر هاوڕێكەی مادەم لێك جیا نەبوونەتەوە (و لە هەمان مەجلیسی كڕین و فرۆشتنەكەن كە تیایدا پێك هاتوون، بەڵام ئەگەر لێك جیا بوونەوە ئەوە سەرپشكبوونیان بۆ نییە بۆ هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەكە) تەنها لە فرۆشتنی مەرجی سەرپشكیدا نەبێ (واتە ئەگەر مەرجیان دانا دوای چەند ڕۆژێكیش هەر سەرپشك بن، ئەوە هەر بۆیان هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو مەرجەیان دانەنا تەنها لە مەجلیسی بەیعەكە بۆیان هەیە).

**١٩٥٩- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: وَلَيْسَ لِهَذَا عِنْدَنَا حَدٌّ مَعْرُوفٌ، وَلاَ أَمْرٌ مَعْمُولٌ بِهِ فِيهِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﵀ گوتوویەتی: لەلای ئێمە بۆ بابەتی مەرجی سەرپشكبوون هیچ سنوورێكی دیاریكراو و هیچ شتێكی كارپێكراو نییە (واتە لای ئێمە مەرجی سەرپشكبوون خۆی نابینێتەوە لە سێ ڕۆژ، نەخێر، بەڵكوو بەپێی ڕێككەوتنە).

**١٩٦٠-** أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﵁ كَانَ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا بَيِّعَيْنِ تَبَايَعَا، فَالْقَوْلُ مَا قَالَ الْبَائِعُ، أَوْ يَتَرَادَّانِ(٣).

---

(١) ـ بَيْعُ الْخِيَارِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٢ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٥ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٦٥٤؛ وفي: ١٠٧٤؛ وابن حنبل: ٣٩٣؛ والبخاري: ٢١١١ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ٤٣؛ والنسائي: ٤٤٦٥ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٤٥٤ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩١٦؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٨٢٢؛ والقابسي: ٢٤١، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٥ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٦ في البيوع والتجارات والسلم، عن مالك به.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەیگێڕایەوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مامەڵەکارێك کڕین و فرۆشتن لەگەڵ یەکدی بکەن، (جا کاتێ جیاوازییان بکەوێتە نێوان هیچ شاهیدێك و بەڵگە و نووسراوێکیشیان لە نێواندا نەبێت) ئەوە قسە قسەی فرۆشیارە (دەبێ قسەی ئەو وەربگیرێ)، یانیش مامەڵەکە هەڵبوەشێننەوە.

١٩٦١- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِيمَنْ بَاعَ مِنْ رَجُلٍ سِلْعَةً، فَقَالَ الْبَائِعُ عِنْدَ مُوَاجَبَةِ الْبَيْعِ: أَبِيعُكَ عَلَى أَنْ أَسْتَشِيرَ فُلاَنًا، فَإِنْ رَضِيَ، فَقَدْ جَازَ الْبَيْعُ، وَإِنْ كَرِهَ فَلاَ بَيْعَ بَيْنَنَا، فَيَتَبَايَعَانِ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ يَنْدَمُ الْمُشْتَرِي قَبْلَ أَنْ يَسْتَشِيرَ الْبَائِعُ: إِنَّ ذَلِكَ الْبَيْعَ لاَزِمٌ لَهُمَا، عَلَى مَا وَصَفَا، وَلاَ خِيَارَ لِلْمُبْتَاعِ، وَهُوَ لاَزِمٌ لَهُ، إِنْ أَحَبَّ الَّذِي اشْتَرَطَ لَهُ الْخِيَارَ أَنْ يُجِيزَهُ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایێك بۆ کەسێك بفرۆشێت و فرۆشیارەکە لە کاتی گرێبەستەکەدا بڵێت: پێت دەفرۆشم لەسەر ئەوەی پرس بە فڵان بکەم، ئەگەر ئەو ڕازی بوو ئەوە فرۆشتنەکە جێبەجێ دەکرێ، ئەگەریش پێی باش نەبوو ئەوە کڕین و فرۆشتنمان لە نێواندا نییە، جا لەسەر ئەو بنەمایە ڕێککەوتنەکە ئەنجام بدەن، دواتر کڕیارەکە پەشیمان ببێتەوە بەر لەوەی فرۆشیارەکە پرس بە کەسەکە بکات، گوتوویەتی: ئەو مامەڵەیە لەسەر کڕیارەکە دادەمەزرێت لەسەر ئەو وەسفانەی کردوویانە و سەرپشکی بۆ کڕیارەکە نییە، مامەڵەکە لەسەری دادەمەزرێت ئەگەر ئەو کەسەی سەرپشکبوونی بۆ خۆی کردۆتە مەرج ویستی مامەڵەکە بڕوێنێت و جێبەجێی بکات (واتە سەرپشکی تەنها بۆ فرۆشیارەکە هەیە، چونکە تەنها ئەو سەرپشکبوونی بۆ خۆی بە مەرج گرتووە، ئەوەی دیکەیان ئەو مەرجەی دانەنا).

١٩٦٢- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي السِّلْعَةَ مِنَ الرَّجُلِ، فَيَخْتَلِفَانِ فِي الثَّمَنِ، فَيَقُولُ الْبَائِعُ: بِعْتُكَهَا بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، وَيَقُولُ الْمُبْتَاعُ: ابْتَعْتُهَا مِنْكَ بِخَمْسَةِ دَنَانِيرَ، إِنَّهُ يُقَالُ لِلْبَائِعِ: إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِهَا لِلْمُشْتَرِي بِمَا قَالَ، وَإِنْ شِئْتَ فَاحْلِفْ بِاللَّهِ مَا بِعْتَ سِلْعَتَكَ إِلاَّ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٦ في البيوع، عن مالك به.

بِمَا قُلْتَ، فَإِنْ حَلَفَ، قِيلَ لِلْمُشْتَرِي: إِمَّا أَنْ تَأْخُذَ السِّلْعَةَ بِمَا قَالَ الْبَائِعُ، وَإِمَّا أَنْ تَحْلِفَ بِاللَّهِ مَا اشْتَرَيْتَهَا إِلاَّ بِمَا قُلْتَ، فَإِنْ حَلَفَ بَرِئَ مِنْهَا، وَذَلِكَ أَنَّ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مُدَّعٍ عَلَى صَاحِبِهِ(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە دەربارەی ئەو كەسەی كاڵایێك لە كەسێك دەكڕێت و جیاوازییان دەكەوێتە ناو لە نرخەكەیدا، جا فرۆشیار بڵێت: بە دە دینار پێم فرۆشتیت، كڕیاریش بڵێت: بە پێنج دینار لێم كڕیت، ئەوە بە فرۆشیار دەگوترێت: ئەگەر حەز دەكەیت بەو نرخە بیدە بە كڕیارەكە كە كڕیارەكە دەیڵێت، یان ئەگەر حەز بكەیت سوێند بە خوا بخۆ بەوەی پێت نەفرۆشتووە تەنها بەو نرخە نەبێت كە دەیڵێیت، جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە بە كڕیارەكە دەگوترێت: یان كاڵاكە بەو نرخە ببە كە فرۆشیار دەیڵێت، یانیش سوێند بە خوا بخۆ بەوەی لێت نەكڕیوە تەنها بەو نرخە نەبێت كە دەیڵێیت، جا ئەگەر سوێندی خوارد، ئەوە لێی بەری دەبێ (مامەڵەكە هەڵدەوەشێتەوە)، ئەوە لە كاتێكدایە كە هەردووكیان سكاڵاكار بن لەسەر یەكدی (جا لێرەدا هەردووكیان دەبن بە سكاڵالێكراو و سوێندخواردنیش بۆ سكاڵالێكراوە، بۆیە لێرەدا هەردووكیان سوێند دەخۆن).

## ٣٩- ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕیبا لە قەرزدا(٢)

١٩٦٣- عَنْ عُبَيْدٍ أَبِي صَالِحٍ، مَوْلَى السَّفَّاحِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: بِعْتُ بَزًّا لِي مِنْ أَهْلِ دَارِ نَخْلَةَ، إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ أَرَدْتُ الْخُرُوجَ إِلَى الْكُوفَةِ، فَعَرَضُوا عَلَيَّ أَنْ أَضَعَ عَنْهُمْ بَعْضَ الثَّمَنِ، وَيَنْقُدُونِي، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ فَقَالَ: لاَ آمُرُكَ أَنْ تَأْكُلَ هَذَا وَلاَ تُوكِلَهُ(٣).

واتە: لە عوبەید ئەبو صاڵحی خزمەتكاری سەفاحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: قوماشێكی خۆمم بەماوە فرۆشتە كەسانێكی ناوچەی دارولنەخلە (كە شوێنی قوماشفرۆشان بوو)، دواتر ویستم بچم بۆ كوفە، جا پێشنیاریان بۆ كردم بەوەی

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٧ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا جَاءَ فِي الرِّبَا فِي الدَّيْنِ.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٨ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٣ في البيوع؛ والشيباني: ٧٦٩ في البيوع والتجارات والسلم، كلهم عن مالك به.

هەندێ لە پارەکەیان لەسەر لاببەم و ئەوانیش پێش هاتنی کاتی خۆی (کە پێشتر لەسەری ڕێك کەوتبووین) پارەکەی دیکەم بدەنێ، جا دەربارەی ئەوە پرسیارم لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ کرد، ئەویش گوتی: فەرمانت پێ ناکەم ئەو پارەیە بخۆیت و دەرخواردی کەسیشی بدەیت (واتە حەڕامە، چونکە لە بابەتی: «ضع وتعجل»ـە).

**١٩٦٤**- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ الدَّيْنُ عَلَى الرَّجُلِ إِلَى أَجَلٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ صَاحِبُ الْحَقِّ، وَيُعَجِّلُهُ الآخَرُ، فَكَرِهَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، وَنَهَى عَنْهُ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی کەسێك کە قەرزی لەسەر کەسێکی دیکە هەیە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، جا خاوەن مافەکە هەندێك لە قەرزەکەی لەسەر لادەبات و سووك دەکات قەرزارەکەش دانەوەی قەرزەکەی بۆ پێش دەخات، جا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ بە ناپەسەندی دانا و قەدەغەی لێ کرد (واتە پێی حەڕام بوو).

**١٩٦٥**- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الرِّبَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ يَكُونَ لِلرَّجُلِ عَلَى الرَّجُلِ الْحَقُّ إِلَى أَجَلٍ، فَإِذَا حَلَّ الأَجَلُ، قَالَ: أَتَقْضِي أَمْ تُرْبِي؟ فَإِنْ قَضَى أَخَذَ، وَإِلاَّ زَادَهُ فِي حَقِّهِ، وَأَخَّرَ عَنْهُ فِي الأَجَلِ[2].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە گوتوویەتی: ڕیبا لە سەردەمی نەفامیدا ئەوەبوو کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك بوو بەوەی لە فڵان کاتدا بیداتەوە، جا کە کاتەکە دەهات، خاوەن قەرزەکە دەیگوت: ئایا قەرزەکە دەدەیتەوە یان زیادی بکەم؟ جا ئەگەر بیدابایەوە وەریدەگرتەوە، ئەگەرنا زیادی دەکرد و کاتەکەی بۆ دوا دەخست.

**١٩٦٦**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالأَمْرُ الْمَكْرُوهُ الَّذِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا: أَنْ يَكُونَ لِلرَّجُلِ عَلَى الرَّجُلِ الدَّيْنُ إِلَى أَجَلٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ الطَّالِبُ، وَيُعَجِّلُهُ الْمَطْلُوبُ، وَذَلِكَ عِنْدَنَا بِمَنْزِلَةِ الَّذِي

---

(١) ـ موقوف حسن. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٦٩ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٣أ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٠ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٣ب في البيوع، عن مالك به.

يُؤَخِّرُ دَيْنَهُ بَعْدَ مَحِلِّهِ عَنْ غَرِيمِهِ، وَيَزِيدُهُ الْغَرِيمُ فِي حَقِّهِ، قَالَ: فَهَذَا الرِّبَا بِعَيْنِهِ لاَ شَكَّ فِيهِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بابەتە ناپەسەند و حەرامەکە کە ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە ئەوەیە: کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك هەبێت بۆ کاتێك، جا خاوەن و داواکاری قەرزەکە هەندێك لە قەرزەکە کەم بکاتەوە و قەرزار و داوالێکراوەکەش دانەوەی قەرزەکەی بۆ پێش بخات، ئەو بابەتە لەلای ئێمە وەك ئەو کەسە وایە کە قەرزەکەی خۆی لە کاتەکەی خۆی دوا دەخات بۆ قەرزارەکەی و قەرزارەکەش قەرزەکەی بۆ زیاد دەکات، گوتوویەتی: ئەوە خودی ڕیبایە گومانی تێدا نییە.

١٩٦٧- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ عَلَى الرَّجُلِ مِئَةُ دِينَارٍ إِلَى أَجَلٍ، فَإِذَا حَلَّتْ، قَالَ لَهُ الَّذِي عَلَيْهِ الدَّيْنُ: بِعْنِي سِلْعَةً يَكُونُ ثَمَنُهَا مِئَةَ دِينَارٍ نَقْدًا، بِمِئَةٍ وَخَمْسِينَ إِلَى أَجَلٍ، قَالَ مَالِكٌ: هَذَا بَيْعٌ لاَ يَصْلُحُ، وَلَمْ يَزَلْ أَهْلُ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ عَنْهُ.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا كُرِهَ ذَلِكَ، لأَنَّهُ إِنَّمَا يُعْطِيهِ ثَمَنَ مَا بَاعَهُ بِعَيْنِهِ، وَيُؤَخِّرُ عَنْهُ الْمِئَةُ الأُولَى إِلَى الأَجَلِ الَّذِي ذَكَرَ لَهُ آخِرَ مَرَّةٍ، وَيَزْدَادُ عَلَيْهِ خَمْسِينَ دِينَارًا فِي تَأْخِيرِهِ عَنْهُ، فَهَذَا مَكْرُوهٌ، لاَ يَصْلُحُ، وَهُوَ أَيْضًا يُشْبِهُ حَدِيثَ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ فِي بَيْعِ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا حَلَّتْ دُيُونُهُمْ، قَالُوا لِلَّذِي عَلَيْهِ الدَّيْنُ: إِمَّا أَنْ تَقْضِيَ، وَإِمَّا أَنْ تُرْبِيَ، فَإِنْ قَضَى أَخَذُوا، وَإِلاَّ زَادُوهُمْ فِي حُقُوقِهِمْ، وَزَادُوهُمْ فِي الأَجَلِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی سەت دینار قەرزی لەسەر کەسێکە بۆ کاتێك، جا کاتێ کاتەکە هات ئەو کەسەی قەرزەکەی لەسەرە (بە خاوەنی قەرزەکە) بڵێت: کاڵایێك کە نرخەکەی سەت دیناری کاش بێت بە سەت و پەنجا دینار پێم بفرۆشە بەماوە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە مامەڵەیەکە نابێت و دروست نییە و زانایان بەردەوام قەدەغەیان لێ کردووە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەبەرئەوە قەدەغە کراوە چونکە پارەی شتەکەی داوەتێ (ڕازی بووە شتەکەی لێ بکڕێت) و سەت دینارەکەی لێ دوا خستووە بۆ

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧١ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٢ في البيوع، عن مالك به.

ئەو كاتەی كۆتا جار بۆی باس كردووە و پەنجا دیناریشی لە پێناوی دواخستنی زیاد كردووە، جا ئەوە قەدەغەكراوە، نابێت و (حەڕامە)، وە ئەوە لە هەمان مامەڵەی جاهیلی دەچێت كە لە فەرموودەی زەیدی كوڕی ئەسلەمدا هاتووە دەربارەی مامەڵەی خەڵكی سەردەمی نەفامی بەوەی كاتێ كاتی دانەوەی قەرزەكانیان دەهات، بەو كەسەیان دەگوت كە قەرزەكەی لەسەر بوو: یان قەرزەكە بدەرەوە، یان زیادی بكە و ڕیبای بخە سەر، جا ئەگەر بیدابایەوە، ئەوە وەریاندەگرتەوە، ئەگەرنا لە مافەكەی خۆیان زیاتریان دەكرد و ماوەشیان بۆ زیاد دەكردن.

## ٤٠- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی قەرز و حەواڵەكردن (بۆ وەرگرتنەوەی قەرز لە كەسێكی دیكە)[١]

**١٩٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دواخستنی قەرز لەلایەن كەسی دەوڵەمەند و هەبووەوە ستەمە، وە ئەگەر تەحویل و ڕەوانەكران بۆ لای دەوڵەمەندێك (تاوەكوو قەرزەكە لەبری قەرزارەكە بداتەوە و قەرزارەكە فەرمانی بەوە كرد) ئەوە بڕۆن بۆ لای (قەرزەكەتان لەو وەرگرنەوە، چونكە تەحویل دروستە).

**١٩٦٩-** عَنْ مُوسَى بْنِ مَيْسَرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً يَسْأَلُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي رَجُلٌ أَبِيعُ بِالدَّيْنِ، فَقَالَ سَعِيدٌ ﷺ: لاَ تَبِعْ إِلاَّ مَا آوَيْتَ إِلَى رَحْلِكَ[٣].

---

(١) ـ جَامِعُ الدَّيْنِ وَالْحَوْلِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٤ في البيوع؛ وابن حنبل: ١٠٠٠٣؛ والبخاري: ٢٢٨٧ في الحوالات؛ ومسلم: المساقاة: ٣٣؛ والنسائي: ٤٦٩١ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٤٥؛ وابن حبان: ٥٠٥٣، وفي: ٥٠٩٠؛ والدارمي: ٢٥٨٦ في البيوع؛ وأبي يعلى الموصلي: ٦٢٩٨، وفي: ٦٣٤٤؛ والقابسي: ٣٥٤، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٥ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٤أ في البيوع؛ والشيباني: ٨٢٥ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.




واتە: لە موسای کوڕی مەیسەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە پیاوێك بوو پرسیاری لە سەعیدی کوڕی موسەیەب ﷺ دەکرد و گوتی: من کەسێکم شت بەقەرز دەفرۆشم، سەعیدیش ﷺ گوتی: شت نەفرۆشیت تەنها ئەوە نەبێت کە دەگاتەوە دەستت (واتە نەکەی شت بفرۆشیت لە کاتێکدا نەگەیشتۆتە دەستت و وەرتنەگرتووە).

١٩٧٠- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَشْتَرِي السِّلْعَةَ مِنَ الرَّجُلِ عَلَى أَنْ يُوَفِّيَهُ تِلْكَ السِّلْعَةَ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، إِمَّا لِسُوقٍ يَرْجُو نَفَاقَهُ، وَإِمَّا لِحَاجَةٍ فِي ذَلِكَ الزَّمَانِ الَّذِي اشْتَرَطَ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُخْلِفُهُ الْبَائِعُ عَنْ ذَلِكَ الأَجَلِ، فَيُرِيدُ الْمُشْتَرِي رَدَّ تِلْكَ السِّلْعَةِ عَلَى الْبَائِعِ: إِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ لِلْمُشْتَرِي، وَإِنَّ الْبَيْعَ لاَزِمٌ لَهُ، وَلَوْ أَنَّ الْبَائِعَ لَوْ جَاءَ بِتِلْكَ السِّلْعَةِ قَبْلَ مَحِلِّ الأَجَلِ، لَمْ يُكْرَهِ الْمُشْتَرِي عَلَى أَخْذِهَا[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایێك لە کەسێك دەکرێت لەسەر ئەوەی کاڵایەکەی بۆ کاتێکی دیاریکراو (بۆ نموونە سێ مانگی دیکە) بۆ دەستەبەر بکات، یان (بۆ ئەوەیەتی دواتر بیفرۆشێت، چونکە) لە بازار سەرفیاتی باشە و ئومێدی پێ هەیە، یان بۆ ئەوەیەتی چونکە لەو کاتەدا پێویستیەتی کە مەرجی لەسەر داناوە بۆی دەستەبەر بکات (کڕیارەکە بۆ ئەو مەبەستانە وەرگرتنی کاڵاکەی کردۆتە مەرج لەو کاتەدا)، دواتر فرۆشیارەکە لەو کاتە بەڵێنەکەی بەجێ ناگەیەنێ (بەمەش مەبەستەکەی دەفەوتێت)، جا کڕیارەکە دەیەوێت کڕینی کاڵاکە ڕەت بکاتەوە بەسەر فرۆشیارەکە، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: کڕیار ئەوەی بۆ نییە و مامەڵەکە پێوەی پەیوەست بووە و بۆی دامەزراوە، جا ئەگەر فرۆشیارەکە بەر لە کاتەکەی خۆی (بە لە تەواوبوونی سێ مانگەکە) کاڵایەکە بێنێت، ئەوە کڕیارەکە زۆری لێ ناکرێت بە وەرگرتنی (دەتوانێت وەرینەگرێت، بۆیە کاتێ زیاتریش دوای بخات مامەڵەکە هەڵناوەشێتەوە و پێکانی مەبەستی کڕیارەکە مەرج نییە و مامەڵەکە دامەزراوە).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٦ في البيوع، عن مالك به.

**١٩٧١- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الَّذِي يَشْتَرِي الطَّعَامَ فَيَكْتَالُهُ، ثُمَّ يَأْتِيهِ مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنْهُ، فَيُخْبِرُ الَّذِي يَأْتِيهِ، أَنَّهُ قَدِ اكْتَالَهُ لِنَفْسِهِ وَاسْتَوْفَاهُ، فَيُرِيدُ الْمُبْتَاعُ أَنْ يُصَدِّقَهُ، وَيَأْخُذَهُ بِكَيْلِهِ: أَنَّهُ مَا بِيعَ عَلَى هَذِهِ الصِّفَةِ بِنَقْدٍ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ، وَمَا بِيعَ عَلَى هَذِهِ الصِّفَةِ إِلَى أَجَلٍ، فَإِنَّهُ مَكْرُوهٌ، حَتَّى يَكْتَالَهُ الْمُشْتَرِي الآخَرُ لِنَفْسِهِ، وَإِنَّمَا كُرِهَ الَّذِي إِلَى أَجَلٍ لأَنَّهُ ذَرِيعَةٌ إِلَى الرِّبَا، وَيُتَخَوَّفُ أَنْ يُدَارَ ذَلِكَ عَلَى هَذَا الْوَجْهِ بِغَيْرِ كَيْلٍ، وَلاَ وَزْنٍ، فَإِنْ كَانَ إِلَى أَجَلٍ، فَهُوَ مَكْرُوهٌ، وَلاَ اخْتِلاَفَ فِيهِ عِنْدَنَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی خۆراکێك دەکڕێت و دەیپێوێت، دواتر کەسێك دێت لێی بکڕێت ئەویش هەواڵ دەداتە ئەو کەسەی هاتۆتە لای بەوەی ئەو خۆی پێشتر خۆراکەکەی بۆ خۆی پێواوە و تەواوە، جا کڕیار دەیەوێ باوەڕی پێ بکات و بە پێوانەی ئەو وەریبگرێت، جا ئەوەی بەو سیفەتە بفرۆشرێت بەنەقد، کێشەی نییە، وە ئەوەی بەماوە بفرۆشرێت بەو سیفەتە، ئەوە ناپەسەند و نادروستە، تا کڕیارەکەی دیکە بۆ خۆی دەیپێوێت، جا تەنها لەبەر ئەوە بە نادروست داندراوە چونکە سەر ڕادەکێشێت بۆ ڕیبا، وە ترس هەیە لەوەی (وای لێ بێت) ئەو مامەڵانە ئەنجام بدرێن بەبێ پێوان و کێشان، جا ئەگەر بەماوە بوو ئەوە نادروست و ناپەسەندە و هیچ ڕاجیایی تیا نییە لەلای ئێمە.

**١٩٧٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُشْتَرَى دَيْنٌ عَلَى رَجُلٍ غَائِبٍ، وَلاَ حَاضِرٍ، إِلاَّ بِإِقْرَارٍ مِنَ الَّذِي عَلَيْهِ الدَّيْنُ، وَلاَ عَلَى مَيِّتٍ، وَإِنْ عَلِمَ الَّذِي تَرَكَ الْمَيِّتُ، وَذَلِكَ أَنَّ اشْتِرَاءَ ذَلِكَ غَرَرٌ، لاَ يُدْرَى أَيَتِمُّ أَمْ لاَ يَتِمُّ؟.

قَالَ: وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ: أَنَّهُ إِذَا اشْتَرَى دَيْنًا عَلَى غَائِبٍ، أَوْ مَيِّتٍ، أَنَّهُ لاَ يُدْرَى مَا يَلْحَقُ الْمَيِّتَ مِنَ الدَّيْنِ الَّذِي لَمْ يُعْلَمْ بِهِ، فَإِنْ لَحِقَ الْمَيِّتَ دَيْنٌ، ذَهَبَ الثَّمَنُ الَّذِي أَعْطَى الْمُبْتَاعُ بَاطِلاً.

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَفِي ذَلِكَ أَيْضًا عَيْبٌ آخَرُ: أَنَّهُ اشْتَرَى شَيْئًا لَيْسَ بِمَضْمُونٍ لَهُ، وَإِنْ لَمْ يَتِمَّ ذَهَبَ ثَمَنُهُ بَاطِلاً، فَهَذَا غَرَرٌ لاَ يَصْلُحُ.

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٧ في البيوع، عن مالك به.




(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نابێ قەرزێکی سەر کەسێکی غائیب یان کەسێکی ئامادە بکڕدرێت، تەنها بە دانپێدانانی خۆی نەبێت (دوای دانپێدانان دروستە)، وە نابێ قەرزی سەر مردووش بکڕدرێت، هەرچەندە ئەو پارەش بزانێت کە مردووەکە جێی هێشتووە، چونکە کڕینی ئەوە نادیاری و جەهالەتی تیایە، نازاندرێت پارەکەی تەواو دەگەڕێتەوە یان نا؟

گوتوویەتی: جا ڕوونکردنەوەی ئەوەی ناپەسەندە لەو بابەتە بەو شێوەیەیە: ئەگەر قەرزێکی سەر کەسێکی غائیب یان مردوو بکڕێت، نازانێت (دواتر) چەند قەرزی نەزاندراو بە ماڵی مردووەکەوە پەیوەست دەبێت، جا ئەگەر قەرزی (زۆر) لکا بە مردووەکەوە (دەرکەوت قەرزی زۆری دیکەی کردووە)، ئەوە ئەو پارەی کڕیارەکە داویەتی بەبێ هوودە دەڕوات.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەو بابەتە خەلەل و عەیبێکی دیکەشی تیایە کە بریتییە لەوەی: شتێکی کڕیوە زەمانەت و زامنی نییە، جا ئەگەر پارەی قەرزەکەی تەواو نەبوو (تەواو بەشی نەکرد) ئەوە پارەکەی بەبێ هوودە دەڕوات، ئەوەش نادیاری و جەهاڵەتی تیایە و دروست نییە.

**١٩٧٣- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَإِنَّمَا فُرِقَ بَيْنَ أَنْ لاَ يَبِيعَ الرَّجُلُ إِلاَّ مَا عِنْدَهُ، وَأَنْ يُسَلِّفَ الرَّجُلُ فِي شَيْءٍ لَيْسَ عِنْدَهُ أَصْلُهُ، أَنَّ صَاحِبَ الْعِينَةِ، إِنَّمَا يَحْمِلُ ذَهَبَهُ الَّتِي يُرِيدُ أَنْ يَبْتَاعَ بِهَا، فَيَقُولُ هَذِهِ عَشَرَةُ دَنَانِيرَ، فَمَا تُرِيدُ أَنْ أَشْتَرِيَ لَكَ بِهَا؟ فَكَأَنَّهُ يَبِيعُ عَشَرَةَ دَنَانِيرَ نَقْدًا، بِخَمْسَةَ عَشَرَ دِينَارًا إِلَى أَجَلٍ، فَلِهَذَا كُرِهَ هَذَا، وَإِنَّمَا تِلْكَ الدُّخْلَةُ وَالدُّلْسَةُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: (کاتێ کە دەبینی) جیاوازی کراوە لە نێوان ئەوەی کەسێك شت نەفرۆشێت تەنها ئەوە نەبێت کە هەیبێت و لەلای بێت، وە لە نێوان ئەوەی کەسێك سەلەم بکات و پارە وەربگرێت بۆ شتێك کە نییەتی (واتە بۆچی ئەوەی یەکەمیان دروست نییە و ئەوەی دووەمیان دروستە؟)، جیاوازییەکە ئەوەیە: خاوەنی مامەڵەی عینە (کە ئەوەی یەکەمیانە کە باس کرا)

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٧٩ في البيوع، عن مالك به.

پارە زێڕەکەی هەڵدەگرێت کە دەیەوێت شتی پێ بکرێت و (بە کەسێك) دەڵێت: ئەوە دە دینارە جا دەتەوێت چیت بۆ پێ بکڕم؟ (شتەکەی نییە دەیکڕێت تا دواتر بەماوە بە گرانتر پێی بفرۆشێتەوە)، جا وەك ئەوە وایە دە دیناری نەقدی فرۆشتبێت بە پازدە دیناری بەماوە، بۆیە ئەو مامەڵە بە نادروست داندراوە، ئەوە نییەت و ڕێچکەیەکە بۆ ڕیبا، وە فرتوفێڵیشە.

## ٤١- ئەوەی هاتووە دەربارەی کردنە هاوبەشی مامەڵە و کردنە سەرپەرشتیاری مامەڵە و پەشیمانی قبووڵکردن لە مامەڵەدا[1]

١٩٧٤- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَبِيعُ الْبَزَّ الْمُصَنَّفَ، وَيَسْتَثْنِي ثِيَابًا بِرُقُومِهَا، إِنَّهُ إِنِ اشْتَرَطَ أَنْ يَخْتَارَ مِنْ ذَلِكَ الرَّقْمَ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَرِطْ أَنْ يَخْتَارَ مِنْهُ حِينَ اسْتَثْنَى، فَإِنِّي أَرَاهُ شَرِيكًا فِي عَدَدِ الْبَزِّ الَّذِي اشْتُرِيَ مِنْهُ، وَذَلِكَ أَنَّ الثَّوْبَيْنِ يَكُونُ رَقْمُهُمَا سَوَاءً، وَبَيْنَهُمَا تَفَاوُتٌ فِي الثَّمَنِ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە قوماشی جۆراوجۆر بفرۆشێت و جیاکردنەوە و هەڵاوێردان لە هەندێك لە قوماشە نەخشدارەکان بکات (و بڵێت: گشتی دەفرۆشم تەنها هەندێك لە قوماشە نەخشدارەکان نەبێت)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر مەرجی دانا بەوەی لە قوماشە نەخشدارەکان هەڵبژاردن بکات، ئەوە کێشەی نییە (دروستە)، (بەڵام) ئەگەر لەو کاتەی هەڵاوێردنی کرد مەرجی دانەنا بەوەی هەڵبژاردن بکات و لێی هەڵبژێرێت، ئەوە من پێم وایە دەبێتە هاوبەش و شەریك لە ژمارەی ئەو قوماشانەی لێی دەکڕێن (بۆ نموونە ئەگەر پۆشاك و قوماشەکان سی بن و ئەو هەڵاوێردن لە دە دانەیان بکات، ئەوە سێیەك بۆ ئەوە و دوو لەسەر سێش بۆ کڕیارە)، لەبەر ئەوەی جاری وا هەیە دوو پۆشاك نەخشەکەیان وەکوو یەکە و نرخیشیان جیاوازە (بۆیە بەرەهایی دەبن بە شەریك لە گشت پۆشاکەکان بەپێی پشکی هەڵاوێردنی دروست).

---

(١) ـ مَا جَاءَ فِي الشَّرِكَةِ وَالتَّوْلِيَةِ وَالإِقَالَةِ.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٠ في البيوع، عن مالك به.




**١٩٧٥- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: الأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لاَ بَأْسَ بِالشِّرْكِ وَالتَّوْلِيَةِ وَالإِقَالَةِ فِي الطَّعَامِ وَغَيْرِهِ، قَبَضَ ذَلِكَ أَوْ لَمْ يَقْبِضْ، إِذَا كَانَ ذَلِكَ بِالنَّقْدِ، وَلَمْ يَكُنْ فِيهِ رِبْحٌ، وَلاَ وَضِيعَةٌ، وَلاَ تَأْخِيرٌ، فَإِنْ دَخَلَ ذَلِكَ رِبْحٌ أَوْ وَضِيعَةٌ أَوْ تَأْخِيرٌ مِنْ وَاحِدٍ مِنْهُمَا، صَارَ بَيْعًا يُحِلُّهُ مَا يُحِلُّ الْبَيْعَ، وَيُحَرِّمُهُ مَا يُحَرِّمُ الْبَيْعَ، وَلَيْسَ بِشِرْكٍ وَلاَ تَوْلِيَةٍ وَلاَ إِقَالَةٍ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لەلای ئێمە کێشە نییە لە کردنە هاوبەشی و کردنە سەرپەرشتیار و پەشیمانی قبووڵکردن لە مامەڵەی خۆراك و شتی دیکە، وەریگرتبێت یان وەرینەگرتبێت، (بە مەرجێك) ئەگەر مامەڵەکە بە پارەی نەقد و کاش کرابێت و نە قازانج و نە زەرەر و نە دواخستنی تێ نەکەوتبێت، جا ئەگەر قازانج یان زەرەر یان دواخستن کەوتە ناو تەرەفێکی مامەڵەکە، ئەوە دەبێتە مامەڵەیەك هەموو ئەو شتانە حەڵاڵ دەکات کە مامەڵە حەڵاڵی دەکات، وە هەموو ئەو شتانە حەرام دەکات کە مامەڵە حەرامی دەکات و هاوبەشی و کردنە سەرپەرشتیاری و پەشیمانی قبووڵکردن نییە (کارەکە بڕاوەتەوە).

**١٩٧٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: مَنِ اشْتَرَى سِلْعَةً بَزًّا أَوْ رَقِيقًا، فَبَتَّ بِهِ، ثُمَّ سَأَلَهُ رَجُلٌ أَنْ يُشَرِّكَهُ، فَفَعَلَ، وَنَقَدَا الثَّمَنَ صَاحِبَ السِّلْعَةِ جَمِيعًا، ثُمَّ أَدْرَكَ السِّلْعَةَ شَيْءٌ يَنْتَزِعُهَا مِنْ أَيْدِيهِمَا، فَإِنَّ الْمُشَرَّكَ يَأْخُذُ مِنَ الَّذِي أَشْرَكَهُ الثَّمَنَ، وَيَطْلُبُ الَّذِي أَشْرَكَ بَيِّعَهُ الَّذِي بَاعَهُ السِّلْعَةَ بِالثَّمَنِ كُلِّهِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُشَرَّكُ عَلَى الَّذِي أَشْرَكَهُ بِحَضْرَةِ الْبَيْعِ، وَعِنْدَ مُبَايَعَةِ الْبَائِعِ الأَوَّلِ، وَقَبْلَ أَنْ يَتَفَاوَتَ ذَلِكَ، أَنَّ عُهْدَتَكَ عَلَى الَّذِي ابْتَعْتُ مِنْهُ، وَإِنْ تَفَاوَتَ ذَلِكَ، وَفَاتَ الْبَائِعَ الأَوَّلَ، فَشَرْطُ الآخَرِ بَاطِلٌ، وَعَلَيْهِ الْعُهْدَةُ[٢].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك کاڵایێکی کڕی قوماش بێ یان کۆیلە بێ، جا بەتەواوی مامەڵەکەی بڕاندەوە، دواتر داوای لە کەسێك کرد لەگەڵی ببێتە شەریك و ئەویش ئەنجامی دا و بەیەکەوە پارەی نەقد و کاشیان دا بە خاوەن کاڵایەکە، دواتر شتێك لە کاڵایەکە دەرکەوت (بەوەی مافی کەسێکی پێوە بێت و هی فرۆشیارەکە نەبووبێت، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی)

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨١ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٢ في البيوع، عن مالك به.




کاڵایەکەیان لەدەست دەربێنێت، ئەوە ئەو کەسەی کراوەتە هاوبەش پارەی خۆی لەو کەسە وەردەگرێتەوە کە لە پارەکەدا کردوویەتی بە هاوبەش، وە ئەو کەسەش کە هاوبەشییەکەی ئەنجام داوە داوای گشت پارەکەی خۆی لە فرۆشیارەکەی دەکاتەوە کە کاڵایەکەی پێ فرۆشتووە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ئەو کەسەی شەریکایەتییەکەی ئەنجام داوە مەرج دابنێت لەسەر ئەو کەسەی دەیکاتە شەریکی خۆی لە کاتی مامەڵەکەدا لە کاتی بینینی فرۆشیاری یەکەم و بەر لەوەی شتەکە ڕوو بدات (مەرج دابنێت) بەوەی بەرپرسیارییەتی لەسەر ئەو کەسە بێت کە من لێم کڕیوە (هەر شتێك ڕوو بدات من بەرپرسیار نیم، ئەوە ئەو کاتە بەرپرسیارییەتەکە دەکەوێتە سەر فرۆشیاری یەکەم)، وە ئەگەر شتەکە ڕووی دا و فرۆشیاری یەکەم لەدەست چوو ئەوە مەرجی کەسی دووەم باتڵە و بەرپرسیارییەتی هەر لەسەرە.

**١٩٧٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لِلرَّجُلِ: اشْتَرِ هَذِهِ السِّلْعَةَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ، وَانْقُدْ عَنِّي، وَأَنَا أَبِيعُهَا لَكَ: إِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، حِينَ قَالَ: انْقُدْ عَنِّي وَأَنَا أَبِيعُهَا لَكَ، وَإِنَّمَا ذَلِكَ سَلَفٌ يُسْلِفُهُ إِيَّاهُ، عَلَى أَنْ يَبِيعَهَا لَهُ، وَلَوْ أَنَّ تِلْكَ السِّلْعَةَ هَلَكَتْ، أَوْ فَاتَتْ، أَخَذَ ذَلِكَ الرَّجُلُ الَّذِي نَقَدَ الثَّمَنَ مِنْ شَرِيكِهِ مَا نَقَدَ عَنْهُ، فَهَذَا مِنَ السَّلَفِ الَّذِي يَجُرُّ مَنْفَعَةً[1].

**(فەتوا)**: واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی بە کەسێك دەڵێت: ئەو کاڵایە بکڕە بە هاوبەشیان و پارەکە لە جیاتی من بدە و منیش دواتر کاڵاکەت بۆ دەفرۆشم (بەقازانج)، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوە نابێت و دروست نییە کاتێ دەڵێت: پارە کاشەکە لە جیاتی من بدە و دواتر من کاڵاکەت بۆ دەفرۆشم، (چونکە) ئەوە قەرزپێدانە لەسەر (مەرجی) ئەوەی دواتر بۆی بفرۆشێت، جا ئەگەر ئەو کاڵایە لەناو چوو یان فەوتا، ئەوە ئەو کەسەی پارە کاشەکەی داوە ئەو پارەیە لە شەریك و هاوبەشەکەی وەردەگرێتەوە کە لە جیاتی ئەو داویەتی، جا ئەوە یەکێکە لەو قەرزانەی سوود و قازانج ڕادەکێشێت (ئەوەش ڕیبایە و نابێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٣ في البيوع، عن مالك به.




١٩٧٨- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً ابْتَاعَ سِلْعَةً، فَوَجَبَتْ لَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَشْرِكْنِي بِنِصْفِ هَذِهِ السِّلْعَةِ، وَأَنَا أَبِيعُهَا لَكَ جَمِيعًا، كَانَ ذَلِكَ حَلاَلاً لاَ بَأْسَ بِهِ، وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ، أَنَّ هَذَا بَيْعٌ جَدِيدٌ، بَاعَهُ نِصْفَ السِّلْعَةِ، عَلَى أَنْ يَبِيعَ لَهُ النِّصْفَ الآخَرَ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك كاڵایێك بكڕێت و ببێتە هی ئەو، دواتر كەسێك پێی بڵێت: بمكە هاوبەش و شەریكی خۆت لەو كاڵایە و من گشتیت بۆ دەفرۆشم، ئەوە حەڵاڵە و كێشەی نییە، جا ڕوونكردنەوەی ئەوە بەو شێوەیەیە: ئەوە مامەڵەیەكی نوێیە، نیوەی كاڵاكەی فرۆشتووە لەسەر ئەوەی نیوەكەی دیكەی بۆ بفرۆشێت (كەواتە كێشەی نییە)[2].

## ٤٢- ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیفلاسبوون و مایەپووچبوونی قەرزدار[3]

١٩٧٩- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ مَتَاعًا، فَأَفْلَسَ الَّذِي ابْتَاعَهُ مِنْهُ، وَلَمْ يَقْبِضِ الَّذِي بَاعَهُ مِنْ ثَمَنِهِ شَيْئًا، فَوَجَدَهُ بِعَيْنِهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، وَإِنْ مَاتَ الَّذِي ابْتَاعَهُ، فَصَاحِبُ الْمَتَاعِ فِيهِ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ[4].

واتە: لە ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حاریسی كوڕی هیشامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك كاڵایێكی فرۆشت و ئەو كەسەی كاڵایەكەی لێ كڕیوە ئیفلاسی كرد و مایەپووچ بوو و ئەو كەسەش كە فرۆشتوویەتی هیچ پارەیەكی كاڵاكەی وەرنەگرتبوو (كڕیارەكە هیچی نەدابوو)، جا فرۆشیارەكە خودی كاڵایەكەی لەلای كڕیارە موفلیسەكە بینییەوە، ئەوە ئەو لەپێشتر و شایستەترە (لە خەڵكی دیكە و خاوەن قەرزەكان

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ تێبینی: بەڵام لەلای ئیمامی شافیعی دروست نییە، چونكە دوو مامەڵەیە لەناو یەك مامەڵەدا.

(٣) ـ مَا جَاءَ فِي إِفْلَاسِ الْغَرِيمِ.

(٤) ـ صحيح لغيره. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٤ب في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٧ في البيوع والتجارات والسلم؛ وأبو داود: ٣٥٢٠ في البيوع عن طريق عبد الله بن مسلمة، كلهم عن مالك به.

ئەگەر قەرزداریش بێت)، جا ئەگەر ئەو کەسە مرد کە کاڵایەکەی کڕیوە، ئەوە ئەوکات خاوەنی کاڵاکە وەك قەرزارەکانە (لەپێشتر نییە).

**١٩٨٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَفْلَسَ، فَأَدْرَكَ الرَّجُلُ مَالَهُ بِعَيْنِهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئیفلاسی کرد و مایەپووچ بوو و (فرۆشیار) گەیشت بە خودی ماڵەکەی خۆی لەلای کەسە مایەپووچەکە (کە لێی کڕیبوو و پارەی نەدابوو)، ئەوە ئەو شایستەتر و لەپێشترە بە ماڵەکەی خۆی لە کەسێکی دیکە (کەواتە دەتوانێ ماڵەکەی خۆی بباتەوە).

**١٩٨١-** **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي رَجُلٍ بَاعَ مِنْ رَجُلٍ مَتَاعًا، فَأَفْلَسَ الْمُبْتَاعُ، فَإِنَّ الْبَائِعَ إِذَا وَجَدَ شَيْئًا مِنْ مَتَاعِهِ بِعَيْنِهِ أَخَذَهُ، وَإِنْ كَانَ الْمُشْتَرِي قَدْ بَاعَ بَعْضَهُ، وَفَرَّقَهُ، فَصَاحِبُ الْمَتَاعِ أَحَقُّ بِهِ مِنَ الْغُرَمَاءِ، لاَ يَمْنَعُهُ مَا فَرَّقَ الْمُبْتَاعُ مِنْهُ، أَنْ يَأْخُذَ مَا وَجَدَ بِعَيْنِهِ، فَإِنِ اقْتَضَى مِنْ ثَمَنِ الْمُبْتَاعِ شَيْئًا، فَأَحَبَّ أَنْ يَرُدَّهُ وَيَقْبِضَ مَا وَجَدَ مِنْ مَتَاعِهِ، وَيَكُونَ فِيمَا لَمْ يَجِدْ أُسْوَةَ الْغُرَمَاءِ فَذَلِكَ لَهُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی کەسێك کە کاڵایێك لە کەسێك دەکڕێت و کڕیارەکە ئیفلاس دەکات، گوتوویەتی: ئەگەر فرۆشیار شتێك لە خودی کاڵایەکەی خۆی (لەلای کڕیارە موفلیسەکە) دۆزییەوە ئەوە دەیباتەوە، وە ئەگەر کڕیارەکە هەندێکی فرۆشتبوو و بەش بەشی کردبوو، ئەوە خاوەنی کاڵایەکە لە خاوەن قەرزەکان شایستەتر و لەپێشترە بە کاڵایەکە، جا بەشبەشکردنی کاڵاکە لەلایەن کڕیارەکە ڕێگری ناکات لەوەی خودی ئەو کاڵایە بباتەوە کە دەستی کەوتۆتەوە، جا ئەگەر کڕیارەکە پێشتر هەندێك لە پارەی کاڵایەکەی دابوو، ئەوە ئەگەر حەزی کرد پارەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە و ئەو بەشە لە کاڵایەکە وەربگرێتەوە

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٤ج في البيوع؛ والشافعي: ١٥٢٨؛ وأبو داود: ٣٥١٩ في البيوع؛ وابن حبان: ٥٠٣٦؛ والقابسي: ٥١٠، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٨ في البيوع، عن مالك به.




کە دەستی کەوتۆتەوە و دواتریش بۆ ئەو بەشە لە کاڵایەکەی خۆی کە دەست نەکەوتۆتەوە ببێتە هاوتای خاوەن قەرزەکان (وەك ئەوان داواکار و وەرگرەوەی مافەکەی بێت) ئەوە بۆی هەیە[١].

**١٩٨٢- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمَنِ اشْتَرَى سِلْعَةً مِنَ السِّلَعِ غَزْلاً أَوْ مَتَاعًا أَوْ بُقْعَةً مِنَ الأَرْضِ، ثُمَّ أَحْدَثَ فِي ذَلِكَ الْمُشْتَرِي عَمَلاً بَنَى الْبُقْعَةَ دَارًا، أَوْ نَسَجَ الْغَزْلَ ثَوْبًا، ثُمَّ أَفْلَسَ الَّذِي ابْتَاعَ ذَلِكَ، فَقَالَ رَبُّ الْبُقْعَةِ: أَنَا آخُذُ الْبُقْعَةَ وَمَا فِيهَا مِنَ الْبُنْيَانِ، إِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ لَهُ، وَلَكِنْ تُقَوَّمُ الْبُقْعَةُ وَمَا فِيهَا، مِمَّا أَصْلَحَ الْمُشْتَرِي، ثُمَّ يُنْظَرُ كَمْ ثَمَنُ الْبُقْعَةِ؟ وَكَمْ ثَمَنُ الْبُنْيَانِ مِنْ تِلْكَ الْقِيمَةِ؟ ثُمَّ يَكُونَانِ شَرِيكَيْنِ فِي ذَلِكَ، لِصَاحِبِ الْبُقْعَةِ بِقَدْرِ حِصَّتِهِ، وَيَكُونُ لِلْغُرَمَاءِ بِقَدْرِ حِصَّةِ الْبُنْيَانِ[٢].

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ ذَلِكَ: أَنْ تَكُونَ قِيمَةُ ذَلِكَ كُلِّهِ أَلْفَ دِرْهَمٍ وَخَمْسَمِئَةِ دِرْهَمٍ، فَتَكُونُ قِيمَةُ الْبُقْعَةِ خَمْسَمِئَةِ دِرْهَمٍ، وَقِيمَةُ الْبُنْيَانِ أَلْفَ دِرْهَمٍ، فَيَكُونُ لِصَاحِبِ الْبُقْعَةِ الثُّلُثُ، وَيَكُونُ لِلْغُرَمَاءِ الثُّلُثَانِ.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەر کەسێك کاڵایێك لە کاڵاکان بکڕێ سوف بێت یان شتومەك یان پارچەیەك لە زەوی، دواتر کڕیارەکە کارێکی نوێی لە شتەکەدا ئەنجام دا (بۆ نموونە) لە پارچە زەوییەکە خانووی دروست کرد، یان سوف و بەنەکەی چنی و کردی بە جلوبەرگ، دواتر ئەو کەسەی ئەو شتەی کڕیوە موفلیس بوو، جا خاوەنی پارچە زەوییەکە گوتی: من پارچە زەوییەکە و ئەوەی تیایەتی لە خانوو و بینا وەریدەگرم، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەوەی بۆ نییە، بەڵکوو پارچە زەوییەکە و ئەوەی تیایەتی کە کڕیارەکە دروستی کردووە دەخەمڵێندرێت، دواتر سەیر دەکرێت نرخی پارچە زەوییەکە چەندە؟ وە نرخی بینایەکان لەو نرخەدا چەندە؟ دواتر خاوەنی پارچە زەوییەکە و خاوەنی قەرزەکان لەوەدا دەبن بە شەریك، خاوەنی پارچە زەوییەکە بەگوێرەی پشکی خۆی بۆ هەیە

---

(١) ـ تێبینی: بەڵام ئیمامی شافیعی گوتوویەتی: لە هەردوو حاڵەتدا خاوەنی کاڵاکە لە خاوەن قەرزەکان لەپێشترە.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٨٩ في البيوع، عن مالك به.

(كە بریتییە لە نرخی پارچە زەوییەكە)، وە خاوەنی قەرزەكانیش پشكی پارەی خانووەكانیان بۆ هەیە.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا ڕوونكردنەوەی ئەو بابەتە بەم شێوەیەیە (بۆ نموونە): نرخی گشتی (پارچە زەوییەكە و بینایەكانی ناوی) هەزار و پێنج سەت درهەم بێت، جا (لەو نرخەدا) قیمەتی پارچە زەوییەكە پێنج سەت درهەم بێت و قیمەتی بینایەكانیش هەزار درهەم بێت، ئەوە خاوەنی زەوییەكە سێیەكی بۆ هەیە و خاوەنی قەرزەكانیش دوو لەسەر سێیان بۆ هەیە.

١٩٨٣- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَكَذَلِكَ الْغَزْلُ وَغَيْرُهُ مِمَّا أَشْبَهَهُ، إِذَا دَخَلَهُ هَذَا، وَلَحِقَ الْمُشْتَرِي دَيْنٌ لاَ وَفَاءَ لَهُ، وَهَذَا الْعَمَلُ فِيهِ[1].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا سوف و شتی دیكەی هاوشێوەی ئەویش (كە بكرێ گۆڕانكارییان بەسەر بهێندرێت و بكرێن بە شتی دیكە) هەمان حوكمی هەیە، ئەگەر ئەو بابەتەی تێ كەوت و كڕیارەكە قەرزی كەوتبووە سەر و نەیدابۆیەوە، جا كردارەكە ئەوەیە تیایدا (دەبێ ئاوا مافەكان جیا بكرێنەوە و دابەش بكرێن كە پێشتر باس كرا).

١٩٨٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا مَا بِيعَ مِنَ السِّلَعِ الَّتِي لَمْ يُحْدِثْ فِيهَا الْمُبْتَاعُ شَيْئًا، إِلاَّ أَنَّ تِلْكَ السِّلْعَةَ نَفَقَتْ، وَارْتَفَعَ ثَمَنُهَا، فَصَاحِبُهَا يَرْغَبُ فِيهَا، وَالْغُرَمَاءُ يُرِيدُونَ إِمْسَاكَهَا، فَإِنَّ الْغُرَمَاءَ يُخَيَّرُونَ بَيْنَ أَنْ يُعْطُوا رَبَّ السِّلْعَةِ الثَّمَنَ الَّذِي بَاعَهَا بِهِ، وَلاَ يُنَقِّصُوهُ شَيْئًا، وَبَيْنَ أَنْ يُسَلِّمُوا إِلَيْهِ سِلْعَتَهُ، قَالَ: وَإِنْ كَانَتِ السِّلْعَةُ قَدْ نَقَصَ ثَمَنُهَا، فَالَّذِي بَاعَهَا بِالْخِيَارِ، إِنْ شَاءَ أَنْ يَأْخُذَ سِلْعَتَهُ، وَلاَ تِبَاعَةَ لَهُ فِي شَيْءٍ مِنْ مَالِ غَرِيمِهِ، فَذَلِكَ لَهُ، وَإِنْ شَاءَ أَنْ يَكُونَ غَرِيمًا مِنَ الْغُرَمَاءِ يُحَاصُّ بِحَقِّهِ، وَلاَ يَأْخُذُ سِلْعَتَهُ، فَذَلِكَ لَهُ[2].

(فەتوا): ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: جا هەرچی ئەوەیە كە دەفرۆشرێت لەو كاڵایەی كە كڕیار هیچ شتی نوێی تێدا ئەنجام نەداوە، تەنها ئەوە نەبێ كاڵاكە

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٠ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩١ في البيوع، عن مالك به.

ڕەواجی پەیدا کردووە و نرخی بەرزبۆتەوە و خاوەنەکەی حەزی لێیەتی و خاوەنی قەرزەکانیش دەیانەوێ بیهێڵنەوە (تا لەبری قەرزەکەیان ببێت بە بەشی خۆیان و خاوەنەکەی وەرینەگرێتەوە)، ئەوە قەرزارەکان سەرپشکن لە نێوان ئەوەی نرخی شتەکە بدەنە ئەو کەسەی فرۆشتوویەتی و هیچی لێ کەم نەکەنەوە، وە لە نێوان ئەوەی کاڵایەکەی تەسلیم بکەن، ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: وە ئەگەر کاڵایەکە نرخەکەی خۆی کەم کردبوو، ئەوە ئەو کەسەی فرۆشتوویەتی سەرپشکە: ئەگەر بیەوێ کاڵایەکە وەربگرێتەوە و هیچی بۆ نەبێ لە ماڵی قەرزارەکەی (واتە ئەو نرخەی لێ وەرنەگرێتەوە کە کەمی کردووە) ئەوە ئەوەی بۆ هەیە، وە ئەگەر ویستی ببێت بە یەکێك لە قەرزارەکان و بە مافی خۆی پشکداری بکات و کاڵایەکە وەرنەگرێت، ئەوەشی بۆ هەیە.

١٩٨٥- **[فتوى]** وقَالَ مَالِكٌ ﷺ فِيمَنِ اشْتَرَى جَارِيَةً أَوْ دَابَّةً، فَوَلَدَتْ عِنْدَهُ، ثُمَّ أَفْلَسَ الْمُشْتَرِي، فَإِنَّ الْجَارِيَةَ أَوِ الدَّابَّةَ وَوَلَدَهَا لِلْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَرْغَبَ الْغُرَمَاءُ فِي ذَلِكَ، فَيُعْطُونَهُ حَقَّهُ كَامِلاً، وَيُمْسِكُونَ ذَلِكَ[١].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی جارییەیەك یان ئاژەڵێك دەکڕێت و لەلای ئەو منداڵ و بێچووی دەبێت، دواتر کڕیارەکە موفلیس و مایەپووچ دەبێت (لە کاتێکدا هێشتا پارەی جارییە یان ئاژەڵەکەی نەداوە)، ئەوە جارییە و ئاژەڵەکە لەگەڵ منداڵەکە و بێچووەکە بۆ فرۆشیارەکەیە، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە خاوەنی قەرزەکان تەماحیان تێدا بێت و تەواوی ماف و حەقەکە بدەن بە فرۆشیارەکە و جارییە و ئاژەڵەکە بۆ خۆیان گل دەنەوە.

## ٤٣- ئەوەی دروستە لە قەرزدا[٢]

١٩٨٦- عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَكْرًا، فَجَاءَتْهُ إِبِلٌ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ أَبُو رَافِعٍ ﷺ: فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ،

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٢ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا يَجُوزُ مِنَ السَّلَفِ.

فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ فِي الإِبِلِ إِلاَّ جَمَلاً خِيَارًا رَبَاعِيًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً[١].

واتە: لە ئەبو ڕافیعی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی تازەپێگەیشتووی بەقەرز وەرگرت، جا هەندێ وشتری زەکات هاتن، ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم وشترێکی تازەپێگەیشتوو بدەمەوە پیاوەکە کە لێی قەرز کردبوو، دەڵێ: منیش گوتم: لەناو وشترەکان هیچ وشترێکی تازەپێگەیشتووم نەدۆزیەوە تەنها وشتری چاك و کامڵی شەشساڵە نەبێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بیدەرێ، چونکە چاکترینی خەڵکی ئەوانەن کە بەجوانترین و چاکترین شت و شێواز قەرز دەدەنەوە.

**١٩٨٧- عَنْ مُجَاهِدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: اسْتَسْلَفَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ مِنْ رَجُلٍ دَرَاهِمَ، ثُمَّ قَضَاهُ دَرَاهِمَ خَيْرًا مِنْهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، هَذِهِ خَيْرٌ مِنْ دَرَاهِمِي الَّتِي أَسْلَفْتُكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: قَدْ عَلِمْتُ، وَلَكِنْ نَفْسِي بِذَلِكَ طَيِّبَةٌ[٢].**

واتە: لە موجاهیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ هەندێك درهەمی لە پیاوێك قەرز کرد، دواتر درهەمی چاکتری بۆ بردەوە، جا پیاوەکە گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ئەو درهەمانە زۆر چاکترن لەوەی من بە قەرز دام بە تۆ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: دەزانم، بەڵام بەوە موڕتاحترم.

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٥ في البيوع؛ والشيباني: ٨٢٧ في الصرف وأبواب الربا؛ والشافعي: ٤٠٦؛ وفي: ٦٧٥؛ وابن حنبل: ٢٧٢٢٥؛ ومسلم: المساقاة: ١١٨؛ والنسائي: ٤٦١٧ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٣٤٦ في البيوع؛ والترمذي: ١٣١٨ في البيوع؛ وشرح معاني الآثار: ٥٧٣٣؛ والقابسي: ١٧٢، كلهم عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٤ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٥أفي البيوع؛ والشيباني: ٨٢٦ في الصرف وأبواب الربا، كلهم عن مالك به.




**١٩٨٨- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: لاَ بَأْسَ بِأَنْ يُقْبِضَ مَنْ أُسْلِفَ شَيْئًا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ أَوِ الطَّعَامِ أَوِ الْحَيَوَانِ مِمَّنْ أَسْلَفَهُ ذَلِكَ، أَفْضَلَ مِمَّا أَسْلَفَهُ، إِذَا لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ عَلَى شَرْطٍ مِنْهُمَا أَوْ عَادَةٍ، فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ عَلَى شَرْطٍ أَوْ وَأْيٍ أَوْ عَادَةٍ، فَذَلِكَ مَكْرُوهٌ، وَلاَ خَيْرَ فِيهِ، قَالَ: وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى جَمَلاً رَبَاعِيًا خِيَارًا مَكَانَ بَكْرٍ اسْتَسْلَفَهُ، وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ اسْتَسْلَفَ دَرَاهِمَ، فَقَضَى خَيْرًا مِنْهَا، فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ عَلَى طِيبِ نَفْسٍ مِنَ الْمُسْتَسْلِفِ، وَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ عَلَى شَرْطٍ وَلاَ وَأْيٍ وَلاَ عَادَةٍ، كَانَ ذَلِكَ حَلاَلاً لاَ بَأْسَ بِهِ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كێشە نییە بەوەی ئەو كەسەی شتێكی لێ قەرز كراوە لە زێڕ یان زیو یان خواردن یان ئاژەڵ چاكتر وەربگرێتەوە لەوەی بەقەرز داویەتی، ئەگەر لەسەر بنەمای بە مەرجگرتن نەبێت لە نێوانیان یان نەریتەكە وا نەبێت، جا ئەگەر لەسەر بنەمای بەمەرجگرتن یان وەعد و بەڵێن یان نەریت بوو، ئەوە ناپەسەندە و هیچ چاكەی تیا نییە (حەڕامە و ڕیبایە)، گوتوویەتی: (جا كە دەڵێین لە جگە لەو حاڵەتانە دروستە) لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێكی شەشساڵەی دایەوە قەرز لەبری وشترێكی تازەپێگەیشتوو كە قەرزی كردبوو، وە لەبەر ئەوەی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ هەندێك درهەمی قەرز كرد و هی چاكتری دایەوە، جا ئەگەر بابەتەكە لەسەر بنەمای پێخۆشبوونی خودی قەرزارەكە بوو، لەسەر بنەمای مەرج و بەڵێن و عادەت نەبوو، ئەوە حەڵاڵە و هیچ كێشەی تیا نییە.

## ٤٤- ئەوەی دروست نییە لە قەرزدا[2]

**١٩٨٩-** عَنْ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ فِي رَجُلٍ أَسْلَفَ رَجُلاً طَعَامًا، عَلَى أَنْ يُعْطِيَهُ إِيَّاهُ فِي بَلَدٍ آخَرَ، فَكَرِهَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، وَقَالَ: فَأَيْنَ الْحَمْلُ، يَعْنِي حُمْلاَنَهُ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٥ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ السَّلَفِ.

(٣) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٦ في البيوع، عن مالك به.

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بەوەی پێی گەیشتووە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی خواردنێك بەقەرز لە کەسێك وەردەگرێت لەسەر ئەو بنەمایەی لە شارێکی دیکە بیداتەوە، گوتوویەتی: حەڕامە، وە گوتوویەتی: ئەدی بار، واتە: تەکلیفی بارکردن (واتە بە حەڕامی داناوە چونکە جگە لەوەی دەبێ قەرزەکە بداتەوە دەبێ خواردنەکەش بە مەسرەف بباتە ئەو شارە، کەواتە ئەو قەرزە مەنفەعەتێکی دیکەی ڕاکێشا، ئەوەش دروست نییە).

**١٩٩٠**- وَحَدَّثَنِي عَنْ مَالِكٍ ﷺ؛ أَنَّهُ بَلَغَهُ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَسْلَفْتُ رَجُلاً سَلَفًا، وَاشْتَرَطْتُ عَلَيْهِ أَفْضَلَ مِمَّا أَسْلَفْتُهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: فَذَلِكَ الرِّبَا، قَالَ: فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ ﷺ: السَّلَفُ عَلَى ثَلاَثَةِ وُجُوهٍ: سَلَفٌ تُسْلِفُهُ تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللهِ، فَلَكَ وَجْهُ اللهِ، وَسَلَفٌ تُسْلِفُهُ تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ صَاحِبِكَ، فَلَكَ وَجْهُ صَاحِبِكَ، وَسَلَفٌ تُسْلِفُهُ لِتَأْخُذَ خَبِيثًا بِطَيِّبٍ، فَذَلِكَ الرِّبَا، قَالَ: فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ؟ قَالَ: أَرَى أَنْ تَشُقَّ الصَّحِيفَةَ، فَإِنْ أَعْطَاكَ مِثْلَ الَّذِي أَسْلَفْتَهُ قَبِلْتَهُ، وَإِنْ أَعْطَاكَ دُونَ الَّذِي أَسْلَفْتَهُ، فَأَخَذْتَهُ أُجِرْتَ، وَإِنْ أَعْطَاكَ أَفْضَلَ مِمَّا أَسْلَفْتَهُ طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ، فَذَلِكَ شُكْرٌ شَكَرَهُ لَكَ، وَلَكَ أَجْرُ مَا أَنْظَرْتَهُ(١).

واتە: لە ئیمامی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە پێی گەیشتووە بەوەی: پیاوێك هاتووە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ و گوتوویەتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان من قەرزێکم دا بە کەسێك و مەرجی گەڕاندنەوەی چاکتر لە قەرزەکەی خۆمم لەسەر دانا، عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ﷺ گوتی: ئەوە ڕیبایە، کابراش گوتی: ئەی چۆن فەرمانم پێ دەکەی ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان؟ عەبدوڵڵاش ﷺ گوتی: قەرز سێ جۆرە: قەرزێك ئەوەیە لە پێناوی خوا بیدەیت، ئەوە پاداشتی خوات بۆ هەیە، وە قەرزێك هەیە دەیدەیت مەبەستت چاکە و پیاوەتیکردنە لەگەڵ هاوڕێکەت، وە قەرزێك هەیە دەیدەیت تاوەکوو ماڵی پیس بە ماڵی خاوێن وەربگری، ئەوە ڕیبایە، کابرا گوتی: ئەی چۆن فەرمانم پێ دەکەی ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان؟ گوتی: بۆچوونم وایە پەڕاوی گرێبەستەکە بدڕێنی (عەقدەکە هەڵوەشێنیتەوە کە

---

(١) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٦أفي البيوع، عن مالك به.

مەرجە ڕیبایەکەی تیایە)، جا ئەگەر کابرا هەمان قەرزی تۆی دایەوە وەریبگریت و ڕازی بیت، وە ئەگەر کەمتر و خراپتر لە قەرزەکەی تۆی دایەوە و وەرتگرت ئەوە پاداشت دەدرێیتەوە (لە دواڕۆژ، چونکە بە کەمتر ڕازی بووی)، وە ئەگەر بەپێخۆشی دڵی خۆی چاکتر لە قەرزەکەی تۆی دایەوە ئەوە سوپاسگوزارییەکە سوپاسی تۆی پێ کردووە، وە پاداشتی چاوەڕێکردنیشت بۆ هەیە (ئەگەر چاوەڕێی بکەیت و ماوەی دانەوەی بۆ درێژ بکەیتەوە).

**١٩٩١**- عَنْ نَافِعٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: مَنْ أَسْلَفَ سَلَفًا فَلاَ يَشْتَرِطْ إِلاَّ قَضَاءَهُ[1].

واتە: لە نافیعەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە بەوەی گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ بووە دەیگوت: هەر کەسێك قەرزێکی دا با هیچ شتێك بە مەرج دانەنێت تەنها دانەوەی قەرزەکە نەبێت.

**١٩٩٢**- أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﵁ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَسْلَفَ سَلَفًا فَلاَ يَشْتَرِطْ أَفْضَلَ مِنْهُ، وَإِنْ كَانَتْ قَبْضَةً مِنْ عَلَفٍ فَهُوَ رِبًا[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﵁ دەیگوت: هەر کەسێك قەرزێکی دا، با باشتر و زیاتر لە قەرزەکە داوا نەکات، هەرچەندە مشتە عەلەفێکیش بێت هەر ڕیبایە.

**١٩٩٣**- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﵀: الأَمْرُ الْمُجْتَمَعُ عَلَيْهِ عِنْدَنَا: أَنَّ مَنِ اسْتَسْلَفَ شَيْئًا مِنَ الْحَيَوَانِ بِصِفَةٍ وَتَحْلِيَةٍ مَعْلُومَةٍ، فَإِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، وَعَلَيْهِ أَنْ يَرُدَّ مِثْلَهُ، إِلاَّ مَا كَانَ مِنَ الْوَلاَئِدِ، فَإِنَّهُ يُخَافُ فِي ذَلِكَ الذَّرِيعَةُ إِلَى إِحْلاَلِ مَا لاَ يَحِلُّ فَلاَ يَصْلُحُ، وَتَفْسِيرُ مَا كُرِهَ مِنْ ذَلِكَ، أَنْ يَسْتَسْلِفَ الرَّجُلُ الْجَارِيَةَ فَيُصِيبُهَا مَا بَدَا لَهُ، ثُمَّ يَرُدُّهَا إِلَى صَاحِبِهَا بِعَيْنِهَا، فَذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ وَلاَ يَحِلُّ، وَلَمْ يَزَلْ أَهْلُ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ عَنْهُ، وَلاَ يُرَخِّصُونَ فِيهِ لأَحَدٍ[3].

---

(١) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٨ في البيوع؛ والشيباني: ٨٢٨ في الصرف وأبواب الربا، عن مالك به.

(٢) ـ ضعيف. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٩٩ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٠ في البيوع، عن مالك به.

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: ئەو بابەتەی لەلای ئێمە کۆدەنگی لەسەرە ئەوەیە: هەر کەسێك ئاژەڵێك بە قەرز وەربگرێت بە سیفەتێکی دیاریکراو، ئەوە هیچ کێشەی تیا نییە و لەسەریەتی هاوشێوەکەی بگەڕێنێتەوە، تەنها ئافرەتی کۆیلە نەبێت (قەرزی تیا نییە)، چونکە ترس هەیە لەوەی ئەو کارە ببێتە هۆکاری حەڵاڵکردنی ئەو شتانەی حەڵاڵ نین (وەك سەیرکردنی عەورەت، تا بزانرێ عەیبدار نییە)، بۆیە دروست نییە، جا ڕوونکردنەوەی حەرامییەکەی بریتییە لەوەی پیاوێك جارییەیێك بەقەرز وەربگرێت و لەگەڵی جووت ببێت ئەوەندەی پێی باشە، دواتر خودی جارییەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەوە دروست نییە و حەڵاڵ نییە، بەردەوام زانایان نەهییان لەوە کردووە و فەتوای حەرامییان داوە و بۆ هیچ کەسێك مۆڵەتیان نەداوە.

## ٤٥- ئەوەی نەهی لێ کراوە و قەدەغە کراوە لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتندا[١]

**١٩٩٤-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەس لە ئێوە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن بەسەر مامەڵە و کڕین و فرۆشتنی کەسی دیکەوە نەکات.

**١٩٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ تَلَقَّوُا الرُّكْبَانَ لِلْبَيْعِ، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلاَ تُصَرُّوا الإِبِلَ وَالْغَنَمَ، فَمَنِ ابْتَاعَهَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْلُبَهَا، إِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعًا مِنْ تَمْرٍ[٣].

---

(١) ـ مَا يُنْهَى عَنْهُ مِنَ الْمُسَاوَمَةِ وَالْمُبَايَعَةِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٦٥١ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٧ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٤ في البيوع والتجارات والسلم؛ والشافعي: ٨٣٩؛ ومسلم: البيوع: ٧؛ وأبو داود: ٣٤٣٦ في البيوع؛ وابن ماجه: ٢١٨٩ في التجارات؛ وابن حبان: ٤٩٦٥؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٨٠١؛ والقابسي: ٢٤٢، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٧أفي البيوع؛ والشافعي: ٩٢٣؛ وابن حنبل: ٨٩٢٤، وفي: ١٠٠٠٥؛ والبخاري: ٢١٥٠ في البيوع؛ ومسلم: البيوع: ١١؛ والنسائي: ٤٤٩٦ في البيوع؛ وأبو




واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ کڕینی شتومەك خۆتان مەگەیەننە کاروان (بەر لەوەی بگاتە شار و دێهات، تا بەهۆیەوە هەرزان لە دەستیان دەربێنن و خۆتان لە شار بەگرانی بیفرۆشنەوە)، وە با کەس لە ئێوە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن بەسەر مامەڵە و کڕین و فرۆشتنی کەسی دیکەوە نەکات، وە (لە مەزاددا بەفێڵ) نرخ بەسەر یەکدییەوە زیاد مەکەن، وە با کەسی شارنشین دەلاڵی بۆ گوندنشین نەکات، وە شیر قەتیس مەکەن لە گوانی وشتر و مەڕ و ماڵاتدا (تا بەفێڵ وا نیشانی بدەن شیری زۆرە)، هەر کەسێك دوای قەتیسکردنی شیر ئەو ئاژەڵەی کڕی و (زانی فێڵی لێ کراوە) ئەوە دوای دۆشینی ئاژەڵەکە یەك لەو دوو شتانەی بۆ هەیە: ئەگەر پێی ڕازی بوو با بیهێڵێتەوە، ئەگەر پێشی ڕازی نەبوو با بیگەڕێنێتەوە لەگەڵ صاعێك لە خورما (لە جیاتی شیرە دۆشراوەکە).

**١٩٩٦- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَتَفْسِيرُ قَوْلِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فِيمَا نُرَى، وَاللهُ أَعْلَمُ، لاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، أَنَّهُ إِنَّمَا نَهَى أَنْ يَسُومَ الرَّجُلُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ، إِذَا رَكَنَ الْبَائِعُ إِلَى السَّائِمِ، وَجَعَلَ يَشْتَرِطُ وَزْنَ الذَّهَبِ، وَيَتَبَرَّأُ مِنَ الْعُيُوبِ، وَمَا أَشْبَهَ هَذَا مِمَّا يُعْرَفُ بِهِ، أَنَّ الْبَائِعَ قَدْ أَرَادَ مُبَايَعَةَ السَّائِمِ، فَهَذَا الَّذِي نَهَى عَنْهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: لێکدانەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی: ((کەس کڕین و فرۆشتن بەسەر کڕین و فرۆشتنی کەسەوە نەکا))، بە بۆچوونی ئێمە ـ والله أعلم ـ ئاوایە: نەهی لەوە کراوە کەسێك کڕین و فرۆشتن بەسەر کڕین و فرۆشتنی براکەیەوە بکات کاتێ فرۆشیار دڵی کەوتۆتە سەر درێژەپێدانی مامەڵەکە لەگەڵ کڕیارەکە و خەریکە مەرج دادەنێت پارەکە بکێشرێت و خۆی بەری دەکات لە عەیبەکان و هاوشێوەی ئەو شتانە کە ڕازیبوونی هەردوولا دەردەخەن و فرۆشیار دەیەوێت مامەڵە لەگەڵ کڕیاردا بکات، ئەوە بریتییە لەوەی نەهی لێ کراوە ـ والله أعلم ـ.

---

داود: ٣٤٤٣ في البيوع؛ وابن حبان: ٤٩٧٠؛ والقابسي: ٣٥٣، كلهم عن مالك به.

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٣ في البيوع، عن مالك به.




**١٩٩٧- [فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَلاَ بَأْسَ بِالسَّوْمِ بِالسِّلْعَةِ تُوقَفُ لِلْبَيْعِ، فَيَسُومُ بِهَا غَيْرُ وَاحِدٍ، قَالَ: وَلَوْ تَرَكَ النَّاسُ السَّوْمَ عِنْدَ أَوَّلِ مَنْ يَسُومُ بِهَا، أُخِذَتْ بِشِبْهِ الْبَاطِلِ مِنَ الثَّمَنِ، وَدَخَلَ عَلَى الْبَاعَةِ فِي سِلَعِهِمُ الْمَكْرُوهُ، وَلَمْ يَزَلِ الأَمْرُ عِنْدَنَا عَلَى هَذَا(١).

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: كێشە نییە مامەڵەی كاڵایەك بكرێت كە بۆ فرۆشتن داندراوە، بەوەی زیاتر لە كەسێك مامەڵە بكەن، گوتوویەتی: ئەگەر خەڵك مامەڵە بۆ ئەو كەسە واز لێ بێنن كە سەرەتا مامەڵە دەكات، ئەوە شتومەكەكە بە نرخی نارەوا دەبرێت و خراپی دێتە سەر فرۆشیاران لە كاڵاكانیان (واتە خەڵك سەیر دەكات ئەوەی پێشی خۆی چەند هەرزان بڵێت و ڕێك نەكەون ئەوەی دواتر هەرزانتر داوا دەكات، ئەوەش لەگەڵ حەق یەك ناگرێتەوە)، جا بابەتەكە بەردەوام ئاوا بووە لای ئێمە (واتە نەهییەكە دەگەڕێنینەوە بۆ تەداخولكردن دوای ڕێككەوتن).

**١٩٩٨-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ؛ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ النَّجْشِ(٢).

قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَالنَّجْشُ أَنْ تُعْطِيَهُ بِسِلْعَتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثَمَنِهَا، وَلَيْسَ فِي نَفْسِكَ اشْتِرَاؤُهَا، فَيَقْتَدِيَ بِكَ غَيْرُكَ.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە نەجەش.

ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: نەجەش ئەوەیە: نرخی زیاتر بدەیت بە كاڵایەك، لە كاتێكدا لە دڵی خۆت مەبەستی كڕینت نییە، تا خەڵكی دیكە چاوت لێ دەكات (و یەكێكیان پێوە دەبێت و تێ دەكەوێت).

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٤ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٣ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٨ج في البيوع؛ والشافعي: ٨٣٥؛ وابن حنبل: ٥٨٦٣، وفي: ٥٨٧٠، وفي: ٦٤٥١؛ والبخاري: ٢١٤٢ في البيوع، وفي: ٦٩٦٣ في الحيل؛ ومسلم: البيوع: ١٣؛ والنسائي: ٤٥٠٥ في البيوع؛ وابن ماجه: ٢١٩١ في التجارات؛ وابن حبان: ٤٩٦٨؛ وأبي يعلى الموصلي: ٥٧٩٦، كلهم عن مالك به.

## ٤٦- بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکان[١]

**١٩٩٩-** عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ ﵄؛ أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ، قَالَ: فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لاَ خِلاَبَةَ[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە (گوتوویەتی): پیاوێك باسی ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە مامەڵەدا فێڵی لێ دەکرێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر مامەڵەت کرد بڵێ: فێڵ نییە (واتە با بەرانبەرەکەت بزانێ تۆ شارەزاییت باش نییە و با بە مامەڵەی برایەتی نێوان مسوڵمانان مامەڵەت لەگەڵ بکات و زیرەکایەتی لەبەرچاو نەگرێت)، دەڵێ: جا پیاوەکە کاتێ مامەڵەی دەکرد دەیگوت: با بەبێ فێڵ بێت (جا کەسەکە ئەگەر چاکی مسوڵمانەتی تێدا مابێت بیری دەکەوێتەوە فێڵی لێ ناکات).

**٢٠٠٠-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ ﵀ يَقُولُ: إِذَا جِئْتَ أَرْضًا يُوفُونَ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ، فَأَطِلِ الْمُقَامَ بِهَا، وَإِذَا جِئْتَ أَرْضًا يُنَقِّصُونَ الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ، فَأَقْلِلِ الْمُقَامَ بِهَا[٣].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﵀ گێڕدراوەتەوە گوێی لە سەعیدی کوڕی موسەییەب ﵀ بووە دەیگوت: ئەگەر چوویتە ناوچەیەك حەقی پێوان و کێشانیان دەدا (واتە فێڵیان لە کێشان و پێواندا نەدەکرد) ئەوە زۆر تیایدا بمێنەوە، وە ئەگەر چوویتە ناوچەیەك حەقی پێوان و کێشانیان نەدەدا ئەوە کەم تیایدا بمێنەوە.

**٢٠٠١-** عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ ﵀، أَنَّهُ سَمِعَ مُحَمَّدَ بْنَ الْمُنْكَدِرِ ﵀ يَقُولُ: أَحَبَّ اللهُ عَبْدًا سَمْحًا إِنْ بَاعَ، سَمْحًا إِنِ ابْتَاعَ، سَمْحًا إِنْ قَضَى، سَمْحًا إِنِ اقْتَضَى[٤].

---

(١) ـ جَامِعُ الْبُيُوعِ.

(٢) ـ صحيح. أخرجه الحدثاني: ٢٥٨ في البيوع؛ والشيباني: ٧٨٨ في البيوع والتجارات والسلم؛ والبخاري: ٢١١٧ في البيوع، وفي: ٦٩٦٤ في الحيل؛ والنسائي: ٤٤٨٤ في البيوع؛ وأبو داود: ٣٥٠٠ في البيوع؛ وابن حبان: ٥٠٥٢؛ والقابسي: ٢٨٨، كلهم عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٦ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٨أفي البيوع، عن مالك به.

(٤) - مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٧ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٨ب في البيوع، عن مالك به.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە گوێی لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیر ﷺ بووە دەیگوت: خوای پەروەردگار ﷻ بەندەیەکی خۆش دەوێت لێبووردە بێت کاتێ فرۆشتن ئەنجام دەدات (بەوەی بە کەم ڕازی بێت)، لێبووردە بێت کاتێ کڕین ئەنجام دەدات (بەوەی زیاتر یان حەقی تەواو بدات بە فرۆشیار و مەصڵەحەتی ئەو ڕەچاو بکات)، لێبووردە بێت کاتێ قەرز و مافەکان دەگەڕێنێتەوە (بەوەی شتی باش بگەڕێنێتەوە، ئەگەر بتوانێ دیاریشی لەگەڵ بگەڕێنێتەوە)، لێبووردە بێت کاتێ قەرز وەردەگرێتەوە (بەوەی لە هەندێکی خۆش بێت، یان چاوپۆشی لە درێژکردنەوەی کاتی دانەوەی قەرزەکە بکات).

**٢٠٠٢- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِي الإِبِلَ أَوِ الْغَنَمَ، أَوِ الْبَزَّ أَوِ الرَّقِيقَ أَوْ شَيْئًا مِنَ الْعُرُوضِ جِزَافًا: إِنَّهُ لاَ يَكُونُ الْجِزَافُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يُعَدُّ عَدًّا[1].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو پیاوەی وشتر یان مەڕ و بزن یان قوماش یان کۆیلە یان هەر کەلوپەلێك بەگۆترە دەکڕێت، گوتوویەتی: گۆترە لە شتێکدا نابێت و دروست نییە کە بە ژمارە بژمێردرێت (جا ئەو شتانەی باس کرا دەژمێردرێن بۆیە گۆترەیان تێدا دروست نییە).

**٢٠٠٣- [فتوى] قَالَ مَالِكٌ ﷺ فِي الرَّجُلِ يُعْطِي الرَّجُلَ السِّلْعَةَ يَبِيعُهَا، وَقَدْ قَوَّمَهَا صَاحِبُهَا قِيمَةً، فَقَالَ: إِنْ بِعْتَهَا بِهَذَا الثَّمَنِ الَّذِي أَمَرْتُكَ بِهِ فَلَكَ دِينَارٌ، أَوْ شَيْءٌ يُسَمِّيهِ لَهُ يَتَرَاضَيَانِ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ تَبِعْهَا فَلَيْسَ لَكَ شَيْءٌ، إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ، إِذَا سَمَّى ثَمَنًا يَبِيعُهَا بِهِ، وَسَمَّى أَجْرًا مَعْلُومًا إِذَا بَاعَ أَخَذَهُ، وَإِنْ لَمْ يَبِعْ فَلاَ شَيْءَ لَهُ[2].**

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کاڵایەك دەدات بە کەسێك تا بیفرۆشێت، لە کاتێکدا خاوەنەکەی نرخی داناوە و دەڵێ: ئەگەر فرۆشتت بەو نرخەی فەرمانم پێ کردووی ئەوە دینارێك بۆ تۆ، یان ناوی شتێکی بۆ بێنێ کە لەسەری ڕێك بکەون، (بەڵام) ئەگەر نەتفرۆشت هیچت بۆ نییە، گوتوویەتی: ئەوە هیچ کێشەی نییە ئەگەر پارەیەکی دیاری کرد پێی بفرۆشێت و کرێیەکی

---

(١) - أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٨ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧٠٩ في البيوع، عن مالك به.

دیاریکراویشی بۆ دانا کە ئەگەر فرۆشتی وەریبگرێت و ئەگەر نەیفرۆشت هیچی بۆ نەبێت (گرنگ ئەوەیە کرێیەکە دیاریکراو بێت).

٢٠٠٤- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: وَمِثْلُ ذَلِكَ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: إِنْ قَدَرْتَ عَلَى غُلَامِي الآبِقِ، أَوْ جِئْتَ بِجَمَلِي الشَّارِدِ، فَلَكَ كَذَا وَكَذَا، فَهَذَا مِنْ بَابِ الْجُعْلِ وَلَيْسَ مِنْ بَابِ الإِجَارَةِ، وَلَوْ كَانَ مِنْ بَابِ الإِجَارَةِ لَمْ يَصْلُحْ[1].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: بە هەمان شێوەیە کە کەسێك بە کەسێك دەڵێت: ئەگەر توانات شکا بەسەر کۆیلە هەڵاتووەکەم و گەڕاندتەوە یان وشترە هەڵاتووەکەمت هێنایەوە، ئەوە و ئەوە بۆ تۆ، ئەوە لە بابەتی دەستخۆشانە و پاداشتە (جوعالە) لە بابەتی بەکرێگرتن نییە، ئەگەر لە بابەتی بەکرێگرتن بووایە دروست نەدەبوو.

٢٠٠٥- **[فتوى]** قَالَ مَالِكٌ ﷺ: فَأَمَّا الرَّجُلُ يُعْطى السِّلْعَةَ، فَيُقَالُ لَهُ: بِعْهَا وَلَكَ كَذَا وَكَذَا فِي كُلِّ دِينَارٍ لِشَيْءٍ يُسَمِّيهِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لاَ يَصْلُحُ، لأَنَّهُ كُلَّمَا نَقَصَ دِينَارٌ مِنْ ثَمَنِ السِّلْعَةِ، نَقَصَ مِنْ حَقِّهِ الَّذِي سَمَّى لَهُ، فَهَذَا غَرَرٌ لاَ يَدْرِي كَمْ جَعَلَ لَهُ[2].

(فەتوا): واتە: ئیمامی مالیك ﷺ گوتوویەتی: هەرچی ئەوەیە کەسێك کاڵاییێکی پێ بدرێت و پێی بگوترێت: بیفرۆشە (بە هەر چەند فرۆشتت) لە هەر دینارێك ئەوەندە و ئەوەندەت بۆ هەیە (بۆ نموونە لە هەر دینارێك دوو درهەمت بۆ هەیە)، ئەوە دروست نییە، چونکە هەر دینارێك لە نرخی کاڵاکە کەم بکات لە مافی ئەویش کەم دەکات کە بۆی دیاری کردووە، ئەوە نادیاری تیایە و دیار نییە چەندی بۆ داناوە (دیاریکراو نییە و دەگۆڕێت).

٢٠٠٦- وحَدَّثَنِي مَالِكٌ ﷺ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الرَّجُلِ يَتَكَارَى الدَّابَّةَ، ثُمَّ يُكْرِيهَا بِأَكْثَرَ مِمَّا تَكَارَاهَا بِهِ، فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِذَلِكَ[3].

---

(١) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٠ في البيوع، عن مالك به.

(٢) ـ أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١١ في البيوع، عن مالك به.

(٣) ـ مقطوع صحيح. أخرجه أبو مصعب الزهري: ٢٧١٢ في البيوع؛ والحدثاني: ٢٥٨د في البيوع، عن مالك به.




واتە: (یەحیا ﷬ گوتوویەتی:) ئیمامی مالیك ﷬ لە ئیبنو شیهابەوە ﷬ بۆی گێڕامەوە بەوەی پرسیاری لە ئیبنو شیهاب ﷬ کردووە دەربارەی ئەو کەسەی ئاژەڵێك بەکرێ دەگرێت و دواتر بە زیاتر لەوەی بەکرێی گرتووە بەکرێی دەداتەوە، گوتوویەتی: کێشەی نییە (دروستە).




## ناوەڕۆك

